# برایانی کارامازۆف

## (١)

### فیۆدۆر داستاییڤسکی

وەرگێڕانی
ئەمین گەردیگلانی









**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

- **برایانی کارامازۆف (١)**
- **نووسینی:** فیۆدۆر داستاییێفسکی
- **وەرگێڕانی:** ئەمین گەردیگلانی
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال رواندزی
- **بەرگ:** ئاسۆ مامزادە
- **پیتچنین:** شاسەنەم
- **ژمارەی سپاردن:** ١٣٥٩
- **نرخ:** ١٥٠٠
- **چاپی یەکەم :** ٢٠٠٧
- **تیراژ:** ١٥٠٠
- **چاپخانە:** چاپخانەی خانی (دهۆك)

**زنجیرەی کتێب (٢٦٦)**





www.mukiryani.com :ماڵپەڕ

info@mukiryani.com :ئیمەیل

# ناوەڕۆک



## (بەرگی یەکەم)

# پێشەکی وەرگێڕ

کەی دەکا شەرح و بەیاناتی ڕمووزی دەردی دڵ
ڕووڕەشی هەروەک دەوات و دووزبانی وەک قەڵەم
"نالی"

دۆستۆیۆڤسکی نووسەر و خوڵقێنەری چەند ڕۆمانی بەرز و بەناوبانگە و یەکێ لەو نووسەرە دیار و جیهانییانەیە کە بەرهەمی بە زۆربەی زمانە زیندووەکانی جیهان وەرگێڕدراونەتەوە.

دۆستۆیۆڤسکی لە مانگی ژوئەنی ساڵی ١٨٧٨ دەست دەکا بە نووسینی ڕۆمانی "برایانی کارامازۆف" نزیکەی دوو مانگ بەر لە مردنی، واتە ئۆکتۆبری ١٨٨٠ تەواوی دەکات.

ئەم ڕۆمانەی برایانی کارامازۆف لە چاو هەموو بەرهەمەکانی دیکەی نووسەر، خاوەنی جیاوازییەکی تایبەتە و بە پێی گەڵاڵەیەکی وردبینانە و دارشتنێکی ئاگادارانە نووسیویەتی. خوێنەر هەر ئەوەندە چاوێک بە پێڕستی بەند و بەشەکانی ئەو ڕۆمانەدا بخشێنێ، بۆی دەردەکەوێ دۆستۆیۆڤسکی چەندەی گرینگی بە زنجیرەی ڕووداوەکان داوە و چەندە ئاگادارانە پێکەوەی گرێ داون و تێکی هەڵکێشاون.

دۆستۆیۆڤسکی لە ٢١ی سێپتامبری ١٨٨٠ نامەیەک بۆ شاعیر و ڕەخنەگری ئیسلاو، ئیوان ئاکساکۆف دەنووسێ و لەو نامەیەدا دەڵێ: "بڕوام پێ بکە زۆر سەرقاڵم و تەنانەت فریای سەر خوراندن ناکەوم. شەو و ڕۆژ خەریکم و دەمهەوێ ڕۆمانی برایانی کارامازۆف تەواو کەم. سەرلەبەری چیرۆکەکە لە زەینی خۆمدا دێنم و دەبەم و هەڵیدەسەنگێنم. ئەو بەرهەمە بە

لامەوە زۆر گرینگ و بەنرخە، چونکە بەشێکی زۆر گەورە لە ڕۆحی خۆمم لەویدا گونجاندووە."

منیش دوای خوێندنەوەی ئەو ڕۆمانە مەزن و فەلسەفی و ڕەوانناسی و کۆمەڵناسییە و لە سەریەک ژیاننامەیی، بڕیارمدا وەریگێڕمەوە. دوای بیر کردنەوە و خۆ هەڵکوشین و زۆرەبانی لەگەڵ هەست و توانایی خۆم، قۆڵم لێ هەڵماڵی و دەستمکرد بە وەرگێڕانی.

پێشتر وەرگێڕانەکەی "ڕامینی موستەقیم"م خوێندبۆوە و بەڕاستی شوێنی لە سەر ڕۆح و هەستم دانابوو. هەر ئەو کاتە لە دڵی خۆمدا گوتم بریا وەرگێڕدرایەتە سەر زمانی کوردی و خوێنەری کوردیش چێژی لەو ڕۆمانە گرینگ و هونەراوییە وەرگرتایە. بەڵام ئەو کات بە بیریشمدا نەدەهات خۆم وەریگێڕمەوە. چەند ساڵ دواتر وەرگێڕانەکەی "موشفیقی هەمەدانی"شم خوێندوەوە و ئەوەندەی دیکە خولیای ئەو ڕۆمانە بووم، بەڵام هەرچەندی بیرم لێدەکردەوە، نەمدەزانی چۆن خۆ لە قەرەی دەم و وەریگێڕمەوە. بیرم دەکردەوە: ئەوە گریمان وەرمگێڕایەوە، چۆنی چاپکەم؟ چاپی ڕۆمانێکی دووبەرگی و گەورەی ئاوا کوا لە توانایی مندایە و دەمزانی هیچ کەسێک و هیچ چاپخانەیەک لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان خەرجی ماڵییەکەی وەئەستۆ ناگرێ. بۆیە لە بڕیارەکەم پاشگەز دەبوومەوە و دڵسارد و هیوابڕاو، ناچار دەبوو ئەو تاسە و ئاواتە لە ناخی خۆمدا بنێژم.

بەڵامم خوا دەرووی ڕووناکی بۆ کردمەوە و ترووسکەی هیوا لە باشووری کوردستانەوە بەرەو ڕۆحم دارژا و هیوابارانی کردم. ئاگادار کرام کە "دەزگای توێژینەوە و بڵاو کردنەوەی موکوریانی" لە هەولێری دێرین، گرینگییەکی تەواو بەو بەرهەمانە دەدا و چاپیدەکا. بۆیە وەرگێڕانەکەی "عینایەتی شەکیباپوور"یشم خوێندەوە، بەڵام ئەو زۆر شوێنی ڕۆمانەکەی هەڵپەڕتاوتبوو. پاشان وەرگێڕانەکەی "ساڵح حوسێنی"م خوێندەوە و وەک سەرچاوەی وەرگێڕانەکە دامنا و پێموایە لە هەر سێ وەرگێڕانەکەی دیکە بەهێزتر و ئەمانەتدارترە. هەروەها خوێندنەوەی وتارە بەناوبانگەکەی

"سۆمەرێست موام" لە سەر برایانی کارامازۆف کە لە کتێبی "سەبارەت بە ڕۆمان و کورتە چیرۆک"دایە زیاتری لەگەڵ دۆستۆیۆڤسکی و بەرهەمەکانی ئاشنا کردم.

شیاوی باسە هیچ کام لەو چوار وەرگێڕانە بۆ سەر زمانی فارسی لە زمانی سەرەکی، واتە ڕووسییەوە نەکراون و هەموویان لە ئینگلیزییەوە وەریانگێڕاوەتەوە. بەڵام بەو حاڵەشەوە شیرینی و جوانکاری و وردەکاریی دۆستۆیۆڤسکی هەروا بەرچاوە، بەڵام دووریش نییە زۆر لە جوانی و وردەکارییەکانی لە قەڵەم کەوتبێ.

من بۆ وەرگێڕانی ئەو شاکارە جیهانییە ئەگەرچی وەرگێڕانەکەی "ساڵح حوسێنی"م کردە بنەما، بەڵام لە زۆر شوێندا کەڵکم لە وەرگێڕانی "موشفیق هەمەدانی" و "ڕامینی موستەقیم"یش وەرگرتووە. هیوادارم توانیبێتم وەرگێڕێکی ئەمانەتدار بم و ئەگەر چەوتی و لاڕێ بوونێکیش لە کارەکەمدا بوو، خاوەن ڕایان بە گەورەیی خۆیان بمبوورن و هەڵە و پەڵەم بۆ ڕاست بکەنەوە.

لە کۆتاییدا زۆر سپاسی بنەماڵەی شاسەنەم (محەمەدئەمین، ڕەحیم و مریەم) دەکەم کە بۆ پیتچنینی ئەم کتێبە هەوڵێکی زۆریان داوە.

"وەرگێڕی کوردی"

# ڕۆژژمێری ژیان و بەرهەمی فیۆدۆر دۆستۆیۆڤسکی

١٨٢١: ٣٠ ئۆکتۆبر فیۆدۆر میخائیلۆویچ دۆستۆیۆڤسکی لە مۆسکۆ لە دایک بووە. باوکی ئاندرۆیۆویچ، پزیشکی ئەرتەش بوو.

١٨٣٨ـ ١٨٣٣: دۆستۆیۆڤسکی لە قوتابخانەی شەوانەڕۆژی تێکەڵاو دەست دەکا بە خوێندن.

١٨٣٧: مانگی مەی فیۆدۆر دۆستۆیۆڤسکی و برا گەورەکەی میخائیل دەچنە سێنپترزبۆرگ. هەر لە پایزی ئەو ساڵەدا دۆستۆیۆڤسکی لە یانەی ئامادەییی قوتابخانەی شەوانەڕۆژی بۆ کاپیتانی کۆستۆمارۆف وەردەگیرێ.

١٨٣٨: مانگی ئووت. دۆستۆیۆڤسکی خوێندنی کۆلیجی ئەفسەران تەواو دەکات و دەبێتە کادیری ئەندازیاریی ئەرتەش.

١٨٤٤: کتێبی «ئۆژنی گراندە»ی باڵزاک وەردەگێڕێتەوە.

١٨٤٥: مانگی مەی دۆستۆیۆڤسکی ڕۆمانی (لێقەوماوان) تەواو دەکا. لە لایەن نیکراسۆف و بلیسنێکییەوە دەناسرێ. پایزی ئەو ساڵە دۆستۆیۆڤسکی بۆ کۆڕی بلیسینکی ڕێگای دەکرێتەوە.

١٨٤٦: ژانوییە لە پیتربورگسکی ئیسبورنیک (جونگ پیترزبورگ)دا وتارێکی نیکراسۆف سەبارەت بە تایبەتمەندییەکانی ڕۆمانی (لێقەوماوان) بڵاو دەبێتەوە.

فیورییەی ئەو ساڵە کورتە چیرۆکی «مرۆڤی دوو ڕوو» بڵاو دەکاتەوە.

ئۆکتۆبری ئەو ساڵە کورتە چیرۆکی «کاکی پرۆخارچین» بڵاو دەکاتەوە.

١٨٤٧: لە سەرەتای ساڵدا. دۆستۆیۆڤسکی لە کۆڕی بلیسێنکی دێتە دەرێ و لەوان دوورە پەرێز دەبێ. ئاوریل و جوولای ئەو ساڵە چوار چیرۆکی دۆستۆیۆڤسکی لە گۆڤاری «پیترزبورگ کرونیکل» بەشی هەواڵەکانی پیترزبورگدا چاپ دەکرێن.

بەهاری ئەو ساڵە لەگەڵ کۆمەڵەی پیتراشفسکی (میخائیل پیتراشفسکی کە یەکێ لە شۆڕشگێڕانی سووسیال دیموکراتی ڕووسیی سەدەی نۆزدە بوو) کەین و بەینی پەیدا کرد.

لە ماوەی نێوان ئۆکتۆبر تا نوامبردا ڕۆمانی «ژنی خاوەنماڵی» بڵاو کردەوە.

١٨٤٨: مانگی دیسامبر، کتێبی «شەوە سپییەکان»ی بڵاو کردەوە.

١٨٤٩: «نیتۆچۆ کانزاوانوا» چاپ دەکا.

٢٣ی ئاوریل، دۆستۆیۆڤسکی وەک ئەندامی گرووپی پیتراشفسکی قۆڵبەست دەکرێ. لە ٢٩ی ئاوریل هەتا ١٦ی نوامبر- دادگایی کردنی پیتراشفسکی و دارودەستەکەی درێژەی دەبێ. تاوانبارانی سەرەکی کە دۆستۆیۆڤسکی یەکێ لەوان بوو، بە ئیعدام مەحکووم دەکرێن.

٢٢ی دیسامبری ئەو ساڵە حوکمەکەیان لە گۆڕەپانی سمینووسکی دەخوێندرێتەوە و هەموو شتێک ئامادە دەکرێ بۆ گوللەباران کردنیان. هەر بۆیە تەنیا فەرمانێکی ئەرتەش دەیتوانی ژیانیان بێنێتە کۆتایی. بەڵام لە دوایین ساتدا تاوانباران پلەیەک لە حوکمەکەیان بۆ دادەشکێ و گوللەباران ناکرێن.

٢٤ی دیسامبر «نیوەشەو» تاوانباران کە دۆستۆیۆڤسکیش لەگەڵ ئەوان دەبێ، بە زنجیر و سندمەوە دیانبەن بۆ بەندیخانەی سیبیریا.

٢٨٥٠: ٢٣ی ژانوییە دۆستۆیۆڤسکی ڕادەگوێزن بۆ بەندیخانەی «ئەمسەک».

١٨٤٥- ١٨٥٠ مانگی فێوریيە دوای تەواو کردنی ماوەی حوکمەمەی وەک سەربازی سیفر لە گوردانی حەوتەمی پیادە نیزام لە «سمی پالاتینیسک» دەستبەسەر دەکرێ.

١٨٥٩ هەتا ١٨٥٤: خەریکی خزمەتی سەربازی دەبێ.

١٨٥٦: مانگی مارس داوای لێبووردنی لێدەکرێ. مانگی ئۆکتۆبر پلەی ملازمی لە ئەرتەشدا پێدەدرێ.

١٨٥٧: مانگی فیوریە لەگەڵ ماریا دیمیتریۆ نائیسایووا، کە بێوەژنێکی شۆخ و کۆنەژنی کارمەندێکی گومرک بوو زەماوەند دەکا. زەماوەندەکەیان لە شاری کۆزنتسک بەڕێوەدەچێ.

١٨٥٩: مانگی مارس. دۆستۆیۆڤسکی واز لە ڕیزەکانی ئەرتەش دێنێ. دێتە دەرێ. هەر لەو مانگەدا چیرۆکی «خەونی مامەگیان» بڵاو دەکاتەوە. مانگی نوامبر و دیسامبر، «گوندی ئیپیتانچیکۆ و دانیشتوانی» بڵاو دەکاتەوە.مانگی جوولای ئەو ساڵە دۆستۆیۆڤسکی دەچێ بۆ «توور» کە پایز و زستان لەوێ تێپەڕ بکا. نیوەی دووهەمی دیسامبر دەچێ بۆ سین پیترزبورگ.

١٨٦٠: مانگی سپتامبر لە ڕۆژنامەی ڕوسکی میر (دنیای ڕووسیا) بەشی یەکەمی «ماڵی مردووەکان» چاپ و بڵاو دەکاتەوە.

١٨٦٠: یەکەم کۆمەڵە بەرهەمی دۆستۆیۆڤسکی لە دوو بەرگدا لە شاری مۆسکۆ چاپ دەکرێ.

١٨٦١: مانگی ژانوییە. یەکەم ژمارەی «وەریما» (زەمەن) بە هاوکاریی «میخائیل»ی برای بە چاپ دەگەیێنێ. هەر لەو گۆڤارەدا بەشی یەکەمی چیرۆکی «ڕەنجاوەکان» بڵاو دەکاتەوە.

١٩٦٢ـ ١٨٦١: گۆڤاری زەمەن ماڵی مردووەکان چاپ دەکا. مانگی مەی نامیلکەی سیاسیی زایکینۆسکی بە ناوی «ڕووسیای جوان» بڵاو دەکاتەوە. لە پێوەندی لەگەڵ ئەو بەرهەمەدا دۆستۆیۆڤسکی دەچێتە سەردانی چیرنیشیۆسکی.

مانگی ژوئەن: دۆستۆیۆڤسکی دەچێ بۆ هەندەران و لەگەڵ هەرزێن و باکونین ئاشنا دەبێ.

١٨٦٣: مانگی فیوریە مارس یادداشتەکانی زستانیی سەبارەت بە بیر و باوەڕی هاوینی بە چاپ گەیاند. مانگی مەی گۆڤاری «زەمەن» دادەخرێ. مانگی ئووت ـ ئوکتوبر دۆستۆیۆڤسکی ئەو چەند مانگە لە هەندەران تێپەڕ دەکات.

١٨٦٤: مانگی ژانویە میخائیل دۆستۆیۆڤسکی ئیجازەنامەی چاپی گۆڤاری «ئەپووک» (دەوران) وەردەگرێ. هەتا بتوانێ زیانی ئابوونەی گۆڤاری (زەمەن) قەرەبوو بکاتەوە. مانگی مارس. یەکەم ژمارەی گۆڤاری «ئەپووک» کە بەشی یەکەمی «یادداشتە نهێنییەکانی» تێدا بوو بڵاوکرایەوە. مانگی ئاوریل ماریا دیمیتریۆنا دۆستۆیۆڤسکی کۆچی دوایی دەکات. مانگی جولای ئەو ساڵە میخائیلی براشی دەمرێ.

١٨٦٥: «تیمساح» و «ڕووداوی نائاسایی» بڵاو دەکاتەوە. مانگی ژوئەن گۆڤاری ئەپووکیش دادەخرێ. جوولای و ئۆکتۆبری ئەو ساڵە دۆستۆیۆڤسکی بۆ جاری دووهەم بەرەو هەندەران وەڕێ دەکەوێ.

١٨٦٦: ڕۆمانی «جینایات و مکافات» بڵاو دەکرێتەوە. ئۆکتۆبری ئەو ساڵە دۆستۆیۆڤسکی بەرهەمێکی تازە بە ناوی «قومارباز» بە کچە خێرانووس (ئاننا گریگوریۆنا ئیسنیتکینا دەنووسێتەوە. فیوریەی ئەو مانگە لەگەڵ ئاننا گریگوریۆنا ئیسنیتکینا زەماوەند دەکا.

١٨٦٧: ئاوریل هەتا ژوئەن سەردانی شاری دێرسیدن و بادن و بازل و ژنێو و میلان و فلۆرانس دەکات.

١٨٦٨: ڕۆمانی «گەمژە» چاپ دەکات.

١٨٧٠: کورتە چیرۆکی «مێردی ئەبەدی» بڵاودەکاتەوە.

١٨٧١: مانگی جوولای. دۆستۆیۆڤسکی دەگەڕێتەوە بۆ شاری سینپیترزبورگ. دەستدەکا بە نووسینی «بەسوخرە گیراوەکان» و ئەو ڕۆمانە لە ساڵی ١٨٧٢دا تەواو دەکا.

١٨٧٢: هاوینەکەی لە «ئیستار یاروسا» تێپەڕ دەکا. پاشان هەر ئەوێ دەبێتە شوێنی هاوینە بۆی.

١٨٧٣: دەبێتە سەرنووسەری حەوتەنامەی «گراز هیدانین» (شارۆمەند).

کۆمەڵە وتارەکانی لە ژێر ناوی (بیرەوەرییەکانی نووسەرێک) لەودا چاپ دەکا.

١٨٧٤: مانگی مارس دۆستۆیۆڤسکی واز لە سەرنووسەری گۆڤاری شارۆمەند دێنێ.

١٨٧٥: مانگی ژانویە ڕۆمانی (لاوی ناکام) دەنووسێ.

١٨٧٦: «بیرەوەرییەکانی نووسەرێک» دەگاتە چاپی دووهەم. بەڵام ئەمجارە بە شێوەی گۆڤارێکی سەربەخۆ هەر بەو ناوەوە. لە ژمارەی مانگی سپتامبردا لە گۆڤاری ناوبراودا کورتە چیرۆکی «خاکەڕاو لەخۆبردوو» چاپ دەکا.

١٨٧٧: مانگی دیسامبر بۆ ئەندامێتی ئەکادیمیای زانست (لە بەشی زمان و ئەدەبیاتی ڕووس) هەڵدەبژێردرێ.

١٨٨٠ ـ ١٨٧٩: برایانی کارامازۆف چاپ و بڵاو دەکاتەوە.

١٨٨٠: مانگی مەی ـ ژوئەن لە ڕێوڕەسمی پەردە هەڵگرتن لە سەر کۆتەڵی پووشکین لە مۆسکۆ بەشداری دەکا و وتارێکی گرینگ و مێژوویی دەخوێنێتەوە. هەر لەو ڕێوڕەسمەدا دۆستۆیۆڤسکی دوو جار شێعرە بەناوبانگەکەی پووشکین «مزگێنیدەر» دەخوێنێتەوە. ٨ی ژوئەنی ئەوساڵە دۆستۆیۆڤسکی لە دووهەمین کۆبوونەوەی ئەنجومەنی ئەدەبیی ڕووسیادا سەبارەت بە پووشکین مژولیایش دەکا.

١٨٨١: لە سەرەتای مانگی ژانویەدا دۆستۆیۆڤسکی لێکۆڵینەوە لە سەر یەکەم ژومارەی (بیرەوەرییەکانی نووسەرێک) کە داگری ڕاڤە و شیکاریی ئەو لەو ساڵەدا بوو کاری کرد. ٢٨ی ژانویە (٩ی فیوریە) فیۆدۆر میخائیلۆویچ دۆستۆیۆڤسکی کۆچی دوایی دەکات.

**پێشکەشە بە:**
**ئانا گریگورێونا دۆستۆیۆڤسکی**

«ئامین، ئامین، بە ئێوە دەڵێم ئەگەر دەنکە گەنم بکەوێتە زەوی و نەمرێ، بە تەنیا دەمێنێتەوە بەڵام ئەگەر بمرێ، بەرهەمی زۆر دەبێ.

(ئینجیلی یوحەننا، بەشی دوازدەهەم، ئایەتی بیست و چوار)

## لە نووسەرەوە

ئەگەر بمهەوێ بێمە سەر باسی پاڵەوانی ڕۆمانەکەم، ئالکسی فیۆدۆرۆویچ کارامازۆف، تا ڕادەیەک دەستم لە گۆزەدا دەمێنێ. بەو واتایە، هەرچەندە ئالکسی فیودورۆویچ وەک پاڵەوان دەستنیشان دەکەم، بەڵام دەزانم ئەو لە هیچ بارێکەوە مرۆڤێکی مەزن نییە. هەر بۆیە ناچارم پرسیارگەلێکی لەم شێوەیە پێشبینی بکەم: «جەنابی ئالکسی فیۆدۆرۆویچ کارامازۆف لەبەر چ خووخدەیەکی بەرچاو وەک پاڵەوان هەڵبژاردووە؟ چ کارێکی باش و شیاوی کردووە؟ لە لای کێ و بەچی ناوبانگی دەرکردووە؟ بۆچی منی خوێنەر کاتی خۆم بەلای ئەو و چۆنییەتیی ژیانییەوە بەفیڕۆ بدەم؟» پرسیاری ئاخر لە هەموویان گرینگترە، چونکە وڵامێکم جگە لەوە نییە کە «ڕەنگە هەر لە ڕێگەی ڕۆمانەکەوە بەوە بگەی.» دەی ئەوە گریمان ڕۆمانەکەت خوێندەوە و پێی نەگەیشتی، کەوایە لە سەر ئەو باوەڕە نابی کە ئالکسی فیۆدۆرۆویچ خووخدەیەکی بەرچاوی هەیە. بۆیە ئەوە دەڵێم چونکە لەبەر تاڵیی ڕووداوەکە پێشبینی دەکەم، ئەو لە لای من خووخدەیەکی بەرچاوی هەیە. بەڵام زۆر بە گومانم لەوەی کە بڵێی بتوانم ئەو شتە بە خوێنەر بسەلمێنم یان نا. ڕاستییەکەی ئەوەیە، ئەگەر ئیجازە بفەرموون، ئەو پاڵەوانی یەکەمی ڕۆمانەکەیە. بەڵام بە شێوەیەکی لێڵ و نادیار. هەر بەڕاستیش لەم سەردەمەی ئێمەدا چاوەڕوانیی ڕوون و ئاشکرا لە مرۆڤگەلی سەیر و سەمەرە دەکرێ. بە دڵنیاییەوە دەتوانم بڵێم شتێک هەتا ڕادەیەک دیار و بەرچاوە: ئەم مرۆڤە، مرۆڤێکی سەیر و تەنانەت لە کەس نەچوو، بەڵام سەیر و سەمەرەیی و لە کەس نەچوونی بە جێی ئەوەی سەر بە خێر و بێر بێ، بنۆسی گرفت و چەرمەسەرییە. بە تایبەت لەو جێیەدا کە هەموو دەیانهەوێ شتە چکۆڵەکان لە سەر یەک هەڵچنن و لە شێواوییەکی گشتیدا بە مانایەکی

سەرەکی و هاوڕایی بگەن. لە زۆر لایەنەوە مرۆڤی جیاواز و لەکەس نەچوو لە بازنەی شتە وردەکاندا دەخولێتەوە، یانی بوونەوەرێکی جیاوازە. وانییە؟

چاکە، ئەگەر لەگەڵ ڕای ئاخردای و بە ڕاستی دەزانی، لە وڵامدا بڵێ «وانییە» ئەوسا من، لە سەر ئیزنی ئێوە سەبارەت بە گرنگایەتیی پاڵەوانی ڕۆمانەکەم، ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، لەوانەیە زۆر دڵگەرمتر بم. چونکە وانییە کە مرۆڤی جیاواز و لەکەس نەچوو هەمیشە لە جەغزی شتە وردەکان و شتە سەرەکییەکان بەدوور بێ. بەڵکو بە پێچەوانە، بە دڵنیاییەوە دەڵێم مرۆڤێکی وا کاکڵی سەرەکیی لە ناخ و ڕواڵەتی خۆیدا هەڵگرتووە. ئیتر مرۆڤی هاوزەمەنی مەعلووم نییە بۆ بە شێوەی کاتی لێی دابڕاون، وەک ئەوەی لە چنگ گێژەڵووکەیەکدا بن.

لەگەڵ ئەوشدا ئەگەر گیروگرفتی دیکە نەبوایە خۆم لە گێژاوی ئەم باسە بێ پێز و قەڵبە نەدەخست، زۆر سادە و بەبێ پێشەکی دەمگوت «ئەگەر پێیان خۆش بێ دەیخوێننەوە.» گیرو گرفتیش ئەوەیە دوو ڕۆمانم هەیە و سەربردەیەک. ڕۆمانی سەرەکی ڕۆمانی دووهەمە. چونکە کرداری پاڵەوان لەم زەمانەدایە،. یانی ئێستا. ڕووداوەکانی ڕۆمانی یەکەم سێزدە ساڵ لەمەوبەر قەوماوە. ڕەنگە نەتوانین بڵێین ڕۆمانیشە. بەڵکو ساتێکە لە ساتەکانی ژیانی پاڵەوانێک لە سەردەمی لاویەتیدا. بەڵام بەبێ ئەم ڕۆمانەی یەکەم هیچم پێناکرێ، چونکە زۆربەی ڕووداوەکانی ڕۆمانی دووهەم بەبێ ڕۆمانی یەکەم هیچ واتایەکیان نییە. بەڵام بەو پێیە دژواریی سەرەکی لەوەش کە هەیە ئاڵۆزتر دەبێ: ئەگەر من، یانی کەسی ژیاننامەنووس، تێبگەم کە تەنانەت ڕۆمانێکم بۆ پاڵەوانێکی ئاوا پڕ شوورەیی و چرووک زایە دەبێ، چۆن بە دوو ڕۆمانەوە خۆم دەردەخەم و چۆن لە ڕوانگەی خۆمەوە ئەو نەترسی و ڕوو هەڵماڵدراوییە بەیان کەم و بینوێنم؟

چونکە هیچ ڕێگە چارەیەکم بۆ پەیدا نابێ، دێمە سەر ئەوەی بەبێ هیچ چارەسەرێک بەسەریدا تێپەڕم. هەڵبەت، خوێنەری وریا زۆر زوو تێدەگا کە هەر لەسەرەتاوە دەمویست بەو ئاکامە بگەم و ئەویش لەگەڵ من بەهۆی

فەوتانی کات و وشەی بێکاکڵ ڕقی هەڵدەستێ. لە وەڵامی ئەم وتەیەدا بە پانەوە دەڵێم وشەگەلی بێ کاکڵ و کاتی گرانباییم سەرەتا لە ڕووی ئەدەب و حەیا و دووهەم لەبەر وریایی خەریک بوو زایە دەکرد. لەوانەشە بڵێ «لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو لە پێشدا ئاگاداری کردووینەتەوە.» لە ڕاستیدا خۆشحاڵم کە ڕۆمانەکە بە دوو شێوە گێڕانەوە دابەشبووە. «بە یەکییەتییەکی گشتی و پێویستەوە.» دوای ئاشنا بوون لەگەڵ یەکەم ڕۆمان، خوێنەر ئەو کاتە بڕیار دەدا کە خوێندنەوەی ڕۆمانی دووهەم بایی زەحمەتەکەی دەبێ یان نا؟ هەڵبەت هیچ کەس بەڵێنیی نەداوە کە لە دووهەمین لاپەڕەی ڕۆمانی یەکەمدا دەتوانێ کتێبەکە وەلانێ و بەلایدا نەچێتەوە. بەڵام ئەو کاتە خوێنەر گەلێکی دلۆڤان دێنە گۆڕێ کە سەداسەد بە پێویستی دەزانن ڕۆمانەکە تا کۆتایی بخوێننەوە، نەکا لە نێوبژیوانیی بێ لایەنانەیاندا تووشی هەڵە ببن.

هەموو ڕەخنەگرانی ڕووسیش، بۆ وێنە ئاوان، لە هەمبەر ئەو جۆرە مرۆڤانەدا بە شێوەیەک دڵم ئاو دەخواتەوە. لەگەڵ بوونی ویژدان و وردبینی، دەتوانم دیارییەکی زۆر باش و شیاویان پێشکەش بکەم، کە هەر لە سەرەتای ڕۆمانەکەوە دەستی لێ‌هەڵگرن. هەموو پێشەکییەکەش هەر ئەمەیە. سەداسەدیش لە سەر ئەو باوەڕم کە زایە بووە. بەڵام چونکە نووسراوە و تۆمار کراوە، چاکتر وایە بمێنێتەوە.

ئێستاش با بچینە سەر دەقی ڕۆمانەکە.

(١)

## فیۆدۆر پاولۆویچ کارامازۆف

ئالکسی فیۆدۆرۆویچ کارامازۆف سێهەمین کوڕی فیۆدۆر پاولۆویچ کارامازۆف یەکێ لە خاوەن مەزراکانی شاری ئێمە ـ بوو. فیۆدۆر پاولۆویچ خاوەنی زەوی و زارێکی زۆر بوو و لە سەردەمی خۆیدا پیاوێکی بە ناوبانگ بوو. هەر بۆیە هێشتاکەش یادی لە دڵماندا زیندووە و هۆیەکەشی مەرگە دڵتەزێن و پڕ لە ڕازەکەیەتی کە سێزدە ساڵ لەمەوبەر ڕوویدا. کە لە شوێنی خۆیدا بەخەست و خۆڵی باسیدەکەم. ئێستا هەر ئەوەندە دەڵێم کە ئەو مالیکە ـ کە تاقە ڕۆژێکیشی لە ملکەکەی خۆیدا ڕانەبواردووە ـ مرۆڤێکی سەیر و سەمەرە بوو. بەڵام هاوچەشن و هاو شێوەی مرۆڤگەلێکی خوێڕی و شەڕانی بوو، لەگەڵ ئەوەشدا گەمژەی وەک ئەو زۆرن. بەڵام ئەو لەو جۆرە گەوجە پیاوانە بوو کە زۆریان ئاگا لە کاروباری خۆیان هەیە و خۆیان وا نیشان دەدەن کە چاو برسی نین. بۆ وێنە فیۆدۆر باولۆویچ لە هیچەوە دەستی پێکردبوو. زەوی و زارەکەی لە هی هەموو کەس کەمتر بوو. لە سەر سفرە و خوانی خەڵکی دادەنیشت و وەک قرنوو پێیانەوە دەنووسا، کاتێکیش کە مرد سەد هەزار ڕۆبلی لە پاش بەجێما. لەگەڵ ئەوەشدا لەو شارەدا لەوی گەلحۆتر تێدا نەبوو. ئەوەی لەو دەوەشایەوە گەمژەیی و حەپۆلی نەبوو ـ زۆربەی ئەو جۆرە مرۆڤانە وریا و بەهۆشن ـ بەڵکو جۆرێک ساویلکەیی بوو. ئەوەش تایبەتمەندیی وڵاتی باب و باپیرانی ئەوە و بۆیە ئەویش یەکێک لە گەوجترین و گێلترین پیاوانی ناوچەکە بوو.

ئەو دوو جاری زەماوەند کردبوو و سێ کوڕی هەبوو. کوڕە گەورەکەی ناوی دیمیتری بوو لە ژنی یەکەمی بوو. دووانەکەی دیکەش ئیوان و ئالکسی لە

ژنی دووهەمی بوون. ژنی یەکەمی ئادلایدا ئیوانا، کچی بنەماڵەیەکی ماماناوەندی و نەجیم بوو. بنەماڵەی میۆسۆف خاوەنی زەوی و زار بوون و زۆربەی خەڵک بەخیلیی پێ دەبردن. بەڵام ئەو کچە میراتگر و جوانکیلە و وریا و چاوکراوەیە کە لە بەرەی ئێستادا وێنەی زۆرە و لە بەرەی پێشووشدا جاروبار وێنەی ئەو هەڵدەکەوت، چۆن بوو شووی بەو پیاوە خوێڕی و پنجڵە کرد، نازانم بڵێم چی. کچێکی جوان و جحێڵم دەناسی کە زۆر خاوەن هەست و دڵناسک بوو، دوای چەند ساڵ دڵداری کردن لەگەڵ پیاوێک کە دەیتوانی زۆر بە سانایی زەماوەندی لەگەڵ بکا، بەڵام کۆسپ و تەگەرەی بە دەستی خۆی ساز کرد و لە شەوێکی باران و لەنگێزەدا خۆی لە هەڵدێرێکەوە هاویشتە نێو چۆمێکی قووڵەوە و خۆی کوشت. ئەوەش لەبەر ئەوەی بە حەز و مگێزی خۆی بگا و وەک ئۆفیلیا (گراوەکەی هاملێت) ناوبانگ دەرکا. ڕاستییەکەشی ئەگەر ئەو هەڵدێرە، یانی ئەو شوێنەی بۆ خۆ کوشتن هەڵیبژارد بوو ئەوەندە بەرز نەبوایە و چۆمەکەشی تەنک بوایە و ڕۆخەکەش دڵگیر و شاعیرانە نەبوایە، لەوانەبوو ئەم خۆ کوژییە ڕوو نەدا. ئەم وتەیە پێچ و پەنای تێدا نییە و لەوانەیە لە دوو سێ بەرەی پێشووماندا لە ڕووسیە ڕووداوی وا زۆر قەومابێ. هەر بۆیە کردەوەی ئادلایدا ئیوانا میۆسۆف بێگومان ڕەنگدانەوەی بیر و باوەڕی ڕۆژاوایییەکان بووە.دڵناسکی و تۆرانێک بۆتە هۆی ئەو زەماوەندە و ئەویش لە نەبوونی ئازادیی زەینییەوە سەرچاوە دەگرێ. ڕەنگە ویستبێتی بە جۆرێک سەربەخۆیی ژنانە بگا و پشت لە هەموو داب و نەریت و مەزنایەتیی بنەماڵەکەیان بکا. ئەوەشمان لەبیر نەچێ، ڕەنگە لە دنیای خەیاڵی خۆیدا بەوە دڵخۆش بووبێ کە فیۆدۆر پاولۆویچ، لەگەڵ ئەوەی پیاوێکی دێزە و حەپۆلە بەڵام ڕووهەڵماڵدراوی و لە بنەوەبڕی و گزیکاریی ئەو تایبەتی سەردەمی پێشکەوتنە. بەڵام لە ڕاستیدا حەنەکچییەکی بەدخوو بووە و هیچی تر. چێژی ئەو زەماوەندەش بۆ ئادلایدا ئەوە بوو کە ڕەدوو بکەوێ، بۆیە فریوی خواردبوو. ئەو کاتەش فیۆدۆر پاولۆویچ بە قازانجی بوو کە ئەو حەزلێکردوویی و زەماوەندە بکا. چۆنکە زۆر پڕ هەوەس و چاو برسی و تۆڵاز بووە، ویستوویەتی هەرچۆنێکە داهاتوویەکی باش بۆخۆی مسۆگەر بکا. چی لەوە خۆشترە کە خۆی بە بنەماڵەیەکی نەجیمزادەوە هەڵواسێ و لەو ڕێگایەوە

بە ماڵ و سامانێکی باش بگا. خۆشەویستیی دوو سەرەش هەر نەبوو. ئادلایدا ئیوانا ئەگەرچی زۆر جوان و دڵڕفێن بوو، بەڵام وەک بووک و زاوا هەر نەدەچوون. ئەوەش لە ژیانی فیۆدۆر پاولۆویچدا شتێکی دەگمەن بوو، کە بۆی هەڵکەوتبوو. چۆنکە پیاوێکی داوێن تەڕ بوو و ژنێک تۆزقاڵێ ڕووی خۆشی بۆ بنواندبایە ملی خۆی دەشکاند و دەکەوتە دوای. بەڵام لەوە دەچوو ئادلایدا تەنیا ژنێک بێ کە لەگەڵ چێژ و هەوەسی ئەودا سازگار نەبوو.

ئادلایدا هەر زۆر زوو دوای ڕەدوو کەوتنەکەی بۆی دەرکەوت کە هیچ هەستێکی جگە لە سووکایەتی دەرهەق بە مێردەکەی نییە. چونکە پێیان وابوو بنەماڵەی میۆسۆف خێرا جیازیی کچە ڕەدوو کەوتووەکەیان دەدەن و مەسلەت دەکەن، بووک و زاوا ژیانێکی بێ سەرەوبەرە و شپرێویان دەست پێکرد و بەردەوام خەریکی قڕە و هەرا بوون. دەڵێن ئادلایدا ئیوانا زۆر لە فیۆدۆر پاولۆویچ نەجیمتر و قورساختر بووە. پارەی جیازیی کچە بیست و پێنج هەزار ڕۆبل بووە و فیۆدۆر پاولۆویچ دەستی بە سەردا گرتووە و کچە چاوی پێی نەکەوتۆتەوە. زۆریشی هەوڵدابوو ئەو زەوی و خانووبەرە نوقلییەی شار کە بەشێک لە جیازیی کچە بوو، بە ناوی خۆیەوە تاپۆ بکا. زۆری پێ داکێشا بوو و بەجارێ کچەی جاڕز کردبوو. بە هەڕەشە و گوڕەشە ژیانی لێ کردبووە زەقنەمووت. بۆیە کچە بە ئاواتەوە بوو ڕزگاری ببێ لە چنگی. منجڕی و تەماحی لە ڕادە بەدەری هێندە بێ شەرمانە بوو پیاو بێزی لێی هەڵدەستا. بەڵام بەوە چاکبوو بنەماڵەی ئادلایدا ئیوانا زوو پێیان زانی و دەرووی تەماحەکەیان ئاخنی. هەموو خەڵکی بە گەورە و چووکەوە زانیبوویان کە ئەو ژن و مێردە وەک مشک و پشیلە وان و بیست و چوار سەعاتە خەریکی شەڕ و دەمەقاڵێن. بەڵام وا هاتبوو کە هەمیشە فیۆدۆر پاولۆویچ کوتانی دەخوارد، هۆیەکەشی ئەوە بوو ژنە زۆر ئاڵەتی و نەترس و کەم تاقەت بوو و بەژن و قەڵافەتیشی زەلام و بەخۆوە. لە ئاکامدا پشت لە هەموو شتێک دەکا و لەگەڵ قوتابییەکی ماڵ بە کوڵ هەڵدەگیرێ و میتیای سێ ساڵانە بە سەر مێردەکەیدا بەجێدێڵێ. فیۆدۆر پاولۆویچیش زۆر زوو ماڵەکەی دەکاتە گازینۆ و دەستدەکا بە مەی نۆشین و ڕابواردن. جارجاریش بە هەموو شارەکانی پارێزگادا بە سواری دەڕۆیشت و باسی دڵڕەقی و جەفای ئادلایدا ئیوانای دەکرد و دەگریا. جاری

وابوو باسی شتی وای دەکرد کە هیچ پیاوێک لە ڕووی هەڵنایە ئاوا باسی ژیانی ژن و مێردایەتیی خۆی بکا. لەوە دەچوو تەنیا بەوە دڵی ئاو بخواتەوە کە خۆی مەزڵووم و لیقەوماو نیشانبدات و بەسەرهاتەکانی خۆی بە تام و چێژەوە بگێڕێتەوە.

گاڵتەچی پێیان دەگوت: «فیۆدۆر پاولۆویچ، نێوچاوانەکەت هێناویەتی، ئاخر بەو هەموو خەم و پەژارەیەوە زۆر شاد و خۆشحاڵ دیاری.» زۆر کەسیش دەیانگوت لە گێڕانی دەوری قەشمەرجاڕی خۆشحاڵی و ئەگەر خۆشت وا نیشاندەدەی کە ئاگات لەو حاڵوباڵە پێکەنینییەت نییە، بۆ ئەوەیە کە پێکەنینیتری بکەی. بەڵام کەس نازانێ ڕەنگە ئەو کردەوە و ئاکارەشی بە هۆی ساویلکەییەوە بووبێ. ئاخری ژنە هەڵگیراوەکەی دەدۆزێتەوە. ژنەتیوەیان لە شاری پترزبورگ دیتبوو. لەگەڵ ئەو تەلەبە بەڕەڵلایە چۆتە ئەوێ و ژیانێکی ئازادانە و بێ قەید و بەندی دەست پێکردووە. فیۆدۆر پاولۆویچ کتوپڕ دێتە سەر ئەوەی خۆی تەیار کا و بڕوا بۆ پترزبورگ. جا بۆچی دەچوو، خۆشی نەیدەزانی. ئەگەر غیرەتی وەبەر خۆی بنایە بەڕاستی دەچوو. بەڵام ئێستاکە بڕیاری دابوو بچێ، بە هەقی خۆی دەزانی چەن پێکی دیکە بخواتەوە و هێز و گوڕێکی بێتەوە بەر. هەر لەو کاتەدا هەواڵی مردنی ئادلایدا ئیوانا لە پترزبورگ بە بنەماڵەی میۆسۆف دەگا. هێندێ دەڵێن بە شێوەیەکی کتوپڕ لە قوژبنێکدا بە نەخۆشیی بڵفەتە (تاعوون) مردووە. هێندێکیش دەڵێن لە برسانا مردووە. فیۆدۆر پاولۆویچ دەڵێن لەو کاتەدا کە هەواڵی مەرگی ژنەکەی پێگەیشتووە مەست بووە. هەڵدێتە سەر شەقام و هاوار دەکا و دەست بۆ ئاسمان هەڵدەبڕێ: «خودایە گیان! ئێستا ئیزن بفەرموو ئەم بەندە هەژارەت بە دڵێکی بێ خەم و ئەرخەیانەوە کۆچی دوایی بکا.» بەڵام دیسان بڕێ کەس دەڵێن وەک منداڵێکی گچکە دەگریا، ئەوەندەش بە سۆزەوە دەگریا کە زۆر کەس دڵیان بۆی دەسووتا. لەوانەیە هەردوو لاش ڕاست بکەن. یانی بۆ ڕزگار بوونی خۆی شاد بووە و بۆ ئەو ژنەش کە بۆتە مایەی ڕزگاریی بە دڵ گریاوە. زۆر سروشتییە، مرۆڤ، تەنانەت تاوانباران زیاتر لەوەی کە ئێمە بیری لێدەکەینەوە ساویلکە و سایلۆحن. ئێمەش هەر واین.

# (٢)
# لە چنگ کوڕە گەورەکەی ڕزگار دەبێ

زۆر بە سانایی دەتوانی بیهێنیتە بەرچاوی خۆت مرۆڤێکی ئاوا ئەگەر ببێتە باوک، چ باوکێکی لێدەردێ و منداڵەکانی چۆن دەعاملێنێ. لە باوکایەتیدا ڕێژەیەک دوور لەو چاوەڕوانییە نەبوو، کە بوومان. ئەو کوڕەی کە لە ئادلایدا ئیوانا بووی، بەڕەڵڵای دەرک و کۆڵانان دەکا، ئەویش نەک لەبەر داخ لە دڵی و قین، بەڵکو بە شێوەیەکی ئاسایی لە بیر خۆی بردبۆوە و دەتگوت کوڕی هەر نییە. لەولاشەوە بە فرمێسک هەڵوەراندن و کوڕووزانەوە عالەمی وەڕەز کردبوو و ماڵەکەی کردبووە زەلکاوی خراپەکاری. گریگۆری کە نۆکەرێکی بەوەفای بنەماڵەکەیان بوو، میتیای سێ ساڵانەی خستبووە ژێر باڵ و پەڕی خۆی. ئەگەر گریگۆری بەو منداڵۆچکە بەستەزمانە ڕانەگەیشتایە، کەسێک نەبوو تەنانەت جلوبەرگی لێبگۆڕێ.

تەنانەت خزم و کەسانی دایکیشی لە سەرەتاوە لە بیریان بردبۆوە. ئاغای میۆسۆفی باوەگەورەشی، باوکی ئادلایدا ئیوانا، نەمابوو. ژنەکەشی، دایەگەورەی میتیا، چووبوو بۆ مۆسکۆ و زۆر نەخۆش بوو. کچەکانیشی شوویان کردبوو. میتیا ماوەی ساڵێک لە ماڵی گریگۆریی پیر دەمێنێتەوە و چاوەدێریی لێدەکرێ. ئەگەر باوکیشی وەبیری بکەوتایەتەوە ـ کە هەر ناکرێ بە یەکجاری لە بیری بردبێتەوە ـ بیبردایە بۆ ماڵەکەی خۆی، لێی دەبووە مڵۆزم و ژیانی پێ تاڵ دەکرد. تا ئەوەی یەکێ لە ئامۆزاکانی ئادلایدای خوالێخۆشبوو، پیووتێر ئەلکساندرۆویچ میۆسۆف لە پاریس دەگەڕێتەوە. دواتر ساڵانێکی زۆر لە هەندەران دەژی. بەڵام ئەو کاتە لاو بووە و لە نێو بنەماڵەی میۆسۆفدا بە ڕۆشنبیر و فەڕەنگیخوو ناوبانگ دەردەکا، چونکە

هەندەران گەڕاوە و پێتەختی وڵاتانی دیوە. نزیک بە کۆتاییی تەمەنی دەبێتە لیبراڵێک کە لە دەیەی چل و پەنجادا برەوی هەبوو. لە دەورانی چالاکیی ڕامیارییدا دەبێتە لیبراڵێکی هەژدە عەیاری سەردەمی خۆی و ئاو ناپاڵێوێ، لە ڕووسیە و لە هەندەران بۆی هەڵکەوتووە، لە نزیکەوە پرۆدوون[1] و باکوونین[2] ببینێ و لەگەڵیان دانیشێ. لە ساڵانی کۆتایی تەمەنیدا زۆر تامەزرۆ بوو سەبارەت بە سێ ڕۆژ شۆڕشی فیورییەی ١٨٤٨ی پاریس بدوێ و گوتوویەتی خۆم هێندەی نەمابوو لە شەڕی ساخلووەکاندا بەشداری بکەم. یەکێ لە شیرینترین بیرەوەرییەکانی سەردەمی لاویشی هەر ئەوە بووە. مڵکێکی سەربەخۆی بوو بە هەزار ڕەعیەتەوە. ئەو مڵکە بەشکۆیە لە نزیک شارەکەی ئێمە هەڵکەوتبوو. لەگەڵ زەوی و زاری پەرستگا بەناوبانگەکەمان هاوسنوور بوو. پیووتێر ئەلکساندرۆویچ هێشتا پێی نەنابووە مڵکەکەیەوە، دەست دەکا بە دۆسیە سازکردن بۆ ماسی گرتن و دار بڕین لە لێڕەوار. بە باشی نازانم کامیان. لە مەقامی شارۆمەندی فەرهەنگیدا بە ئەرکی خۆی دەزانی لەگەڵ قەشەکان یەککەوێ. بە بیستنی بەسەرهاتی ئادلایدا ئیوانا، کە وەبیری دێ سەردەمێک حەزی لێدەکرد، دوای ئەوەش لە ژیانی میتیا ئاگادار دەبێ و لەگەڵ ئەوەی زۆری ڕق لە فیۆدۆر پاولۆویچ بووە، لەگەڵی ئاشنا دەبێ و ڕوو ڕاست پێی دەڵێ کە دەمهەوێ ئەو منداڵە پەروەردە بکەم. ماوەیەک دواتر دەیگوت کاتێ ناوی میتیام هێنا، فیۆدۆر پاولۆویچ تا ماوەیەک چاوی تێبڕیم و دەتگوت نازانێ باسی کامە منداڵ دەکەم. لەوە دەچوو بە بیستنی ئەوەی کە منداڵێکی لە ماڵ دایە تووشی سەرسووڕمان بووبێ. لەوانەیە ئەو باسە زێدەڕەویشی تێدا کرابێ، بەڵام زۆر لە ڕاست دەچێ.

بەڵام ڕاستت دەوێ، فیۆدۆر پاولۆویچ هەموو تەمەنی خۆی شەیدای ئەکتەری بووە و پێیخۆش بووە لە ناکاو دەورێکی چاوەڕوان نەکراو بگێڕێ. سەیر ئەوەیە جاری وایە بۆ ئەو کارە، جگە لەوەی هیچ تەمایەکی نەبووە، بە

---

1- پی.جی. پرۆدوون (١٨٦٥ ـ ١٨٠٩) سوسیالیستی فەڕەنسی

2- م. ا. باکوونین (١٨٧٦ ـ ١٨١٤) ئانارشیستی بەناوبانگی ڕوسی

زەرەدیشی تەواو بووە. جا ئەو تایبەتمەندییەش لە زۆربەی مرۆڤەکاندا هەیە. تەنانەت مرۆڤی زۆر وریا، بەڵام نەک وەکو فیۆدۆر پاولۆویچ. پیووتێر ئەلکساندرۆویچ دەسەڵاتدارانە دێتە پێشێ و سەرپەرشتیی منداڵەکە وەئەستۆ دەگرێ. میراتی دایکیشی کە زەوییەک و خانووبەرەیەک بووە، بە فیۆدۆر پاولۆویچ دەسپێرێ. میتیا دەچێتە ماڵی مامی دایکی و ئەوان سەرپەرشتیی دەکەن. بەڵام چونکە پیووتێر ئەلکساندرۆویچ ژن و منداڵی نەبووە، دوای وەرگرتنی بەهرە و داهاتی مڵکەکانی بەپەلە دەگەڕێتەوە بۆ پاریس، میتیاش دەسپێرێ بە پوورێکی لە مۆسکۆ. ئەویش دوای ئەوەی لە پاریس بە یەکجاری نیشتەجێ دەبێ، کوڕەی لەبیر دەچێتەوە. بەتایبەت شۆڕشی فیوریە کە دێتە پێشێ وای کارتێدەکا کە هەتا ئاخری تەمەنی لەبیری ناچێتەوە. پووری مۆسکۆیی دەمرێ و میتیا بە یەکێ لە کچە شووکردووەکانی دەسپێرن. پێموایە میتیا بۆ چورامین جار ماڵەکەی دەگۆڕدرێ. لەم بارەوە لەوە زیاتری لە سەر ناڕۆم. چونکە دواتر سەبارەت بە کوڕە نۆبەرەی فیۆدۆر پاولۆویچ زۆرم قسە بۆ گوتن پێیە، ئێستا دەبێ باسی شتە بنەڕەتییەکان بکەم سەبارەت بە ئەو. کە بەبێ ئەوە چیرۆکەکەم دەستی پێنەدەکرد.

سەرەتا ئەوەش بڵێم، ئەم «دیمیتری فیۆدۆر پاولۆویچ»ە لە سێ کوڕی فیۆدۆر پاولۆویچ تەنیا کوڕێک بوو کە لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە مڵکی هەیە و ئەگەر بگاتە تەمەنی یاسایی لە سەر پێی خۆی ڕادەوەستێ. دەورانی مێر منداڵی و لاوی بە دژواری ڕادەبوێرێ. قوتابخانەی دوا ناوەندی تەواو دەکا و دەچێتە فێرگەی نیزامییەوە، پاشان دەچێ بۆ قەفقازیا. پلەی دەچێتە سەرێ و لە سەر ئەوەی دوئێل دەکا ڕوتبەکەی لێدەستێننەوە. ماوەیەک هەوڵدەدا و ڕوتبە وەردەگرێتەوە. ژیانێکی بێسەرە وبەرە دەگرێتە بەر و دەستدەکا بە هەڵەخەرجی. بەر لەوەی بە تەمەنی یاسایی بگا، هیچ یارمەتی و پارەیەکی لە لایەن باوکییەوە پێناگا. کاتێکیش دەگاتە تەمەنی یاسایی دەکەوێتە ژێر قەرز و قۆڵەوە. ئەنجا بۆ پێڕاگەیشتنی مڵکەکەی دێتەوە بۆ شارەکەی ئێمە و ئەو کاتە

باوکی دەبینێ و دەیناسێتەوە. بەڵام باوکی خۆش ناوێ و ماوەیەکی کەم لە لای دەمێنێتەوە. زۆر لە ڕۆیشتن پەلە دەکا و هەر ئەوەندەی پێدەکرێ بڕێ پارە وەرگرێ و سەبارەت بە بەرهەم و داهاتی ملکەکەی لەگەڵ باوکی گرێبەستێک ئیمزا بکا. هەڵبەت لە دەستی نەدەهات بۆ داهات و بەرهەمی ملکەکەی سیاییەک لە باوکی بستێنێ. (کە بۆ باسکردن دەبێ) ئەو کاتە فیۆدۆر پاولۆویچ بۆ هەوەڵین جار دانی پێدانا کە (ئەوەش بۆ باسکردن دەبێ) ڕای میتیا سەبارەت بە ملک وماڵەکەی ڕایەکی هەڵەیە. میتیا پێیوابوو داراییەکەی زۆر لەوە زیاترە کە بە ڕواڵەت دیارە. هەر بۆیە باوکی زوو کەوتە بیری دارشتنی پیلانێک بۆ ئەوەی ماڵ و ملکەکەی لە چنگ دەرهێنێ. فیۆدۆر پاولۆویچ دەیزانی کوڕەکەی گێژوولکە و هەڵەشەیە و لەگەڵ ئەوەشدا ئاڵەتی و کەم تاقەت و هەڵەخەرجە. ئەگەر بەبێ ماندوو بوون پارەی وەدەست کەوێ کەیفی ساز دەبێ. هەر بۆیە باوکە ڕێگای فێڵ دەگرێتە بەر و بەیناوبەین بڕێ پارەی بۆ دەنێرێ. لە ئاکامدا دوای چوار ساڵ کە میتیا کاسەی سەبری پڕ دەبێ و دەگەڕێتەوە بۆ شارە چکۆلەکەی ئێمە، تاکو حیسابەکانی لەگەڵ باوکی یەکلایی بکاتەوە، بە واق وڕمانەوە بۆی دەردەکەوێ کە پارەی تەواوی ملک و ماڵەکەی بە شێوەی نەغد لە باوکی وەرگرتووە و لەوانەیە پێشی قەرزدار بێ. بەو گرێبەستەی کە بە ویستی خۆی چەن ساڵ لەمەوبەر ئیمزای کردبوو، مافی بە سەر هیچ شتێکەوە نەماوە و ناتوانێ نارەزایەتیش دەرببڕێ. کوڕەی فەقیر هیوابڕاو دەبێ کە دەبینێ باوکی ئاوا فێڵی لێکردووە، وەک شێت و هاری لێدێ. لە ڕاستیدا هەر ئەو کارە دەبێتە هۆی قەومانی کارەساتێک کە گێڕانەوەی دەبێتە دەستپێکی ڕۆمانی یەکەم، یان چاکتر بڵێم ڕواڵەتی دەرەکیی چیرۆکەکە دادەڕێژێ. بەڵام بەرلەوەی بێمە سەر ڕۆمانەکە کە بە پێویستی دەزانم برێکیش سەبارەت بە دوو کوڕەکەی دیکەی فیۆدۆر پاولۆویچ و بنە و بنەچەکیان بدوێم.

(٣)

## ژن هێنانی دووهەم و خاوخێزانی دووهەم

فیۆدۆر پاولۆویچ ماوەیەک دوای ئەوەی لە چنگ میتیای چوار ساڵانە نەجاتی دەبێ، ژن دێنێتەوە. زەماوەندی دووهەمی هەشت ساڵ دەوام دێنێ. ئەو ژنەشی کە ناوی سۆفیا ئیوانا بوو، ژنێکی جوان و ژیکەڵە و جحێڵ بوو و لە پارێزگایەکیترەوە هێنا بووی. یانی لەوێ کارێکی دەبێ و لەگەڵ جوولەکەیەک دەچێ. لەگەڵ ئەوەی فیۆدۆر پاولۆویچ خەریکی مەی نۆشین و کاری ناپەسند دەبێ، ساتێک لە کۆ کردنەوەی ماڵی دنیا خافڵ نابێ و لە کاروباری بازرگانی و ماڵ پێکەوەناندا سەرکەوتوو دەبێ و بێئەوەی تووشی دڕدۆنگی و بیرەبیرە بێ کاروباری خۆی بەڕێوە بردووە. سۆفیا ئیوانا کچی مجێورێکی گومناو بووە و هەر لە منداڵییەوە هەتیو و بێکەس بووە. لە ماڵی بێوەژنێکی دەوڵەمەند ژیاوە کە ژنی ژنێراڵ ورووخۆف بووە، ئەو ژنە لەگەڵ ئەوەدا کە سایەچەور و دەستودڵباز بوو، زۆری هەوڵ بۆ بارهێنانی سۆفیا دا و لە ڕادەبەدەریش ئازاری دەدا. من لە هەموو شتێک ئاگادارنیم. تەنیا ئەوەندەم بیستووە کە ئەو کچە هەژارەی هێندە ئازار دەدا، بەستەزمانە ڕۆژێک خۆی هەڵدەواسێ کە لە چنگ ئەو ژیانە تاڵە ڕزگاری بێ، بەڵام ژنە فریای دەکەوێ و ناهێڵێ بخنکێ. سۆفیای ژیکەڵە کە لە جوانی و ئارامیدا وەک مەڕی پێغەمبەر وابوو لە ماڵی ئەو ژنە حەسانەوەی نەبوو. وەک دەڵێن ئەو ژنە دڵڕەق و بێ بەزەییش نەبوو، بەڵام لەبەر بێکاری ئەوەندەی پرتە و بۆڵە کردووە و سۆفیای ئازار داوە.

فیۆدۆر پاولۆویچ دەچێتە خوازبێنی. دوای ئەوەی لەمەڕ ئەوەوە پرسیار و ڕاوێژ دەکەن بە زاوایەتی قەبووڵی ناکەن. بەڵام دیسان وەک ژن هێنانی پێشووی، کچەی بەستەزمان و هەتیو هەڵدەفریوێنێ و هەڵیدەگرێ. شکی تێدانییە ئەگەر کچە تۆزە ناسیاوییەکی سەبارەت بە فیۆدۆر پاولۆویچ بووبوایە شووی پێنەدەکرد.بەڵام چونکە خەڵکی شارێکیتر بووە، کچێکی شازدە ساڵان چووزانێ چ جۆرە پیاوێکە. جگە لەوەی پێیوابێ لە ئەشکەوتا بێ چاکترە لەوەی لە ماڵی ئەو ژنە زاڵم و بە پرتە و بۆڵەیەدا بژی. هەر بۆیە کچە لە دەست مار هەڵدێ و پەنا بۆ ئاور دەبا. بەڵام ئەمجارەیان دەکەوێتە داوی پیاوێکی دڵڕەقەوە.

فیۆدۆر پاولۆویچ ئەمجارە تەنانەت فلسێکی پێنابڕێ. چونکە ژنە زۆری ڕق هەڵدەستێ و بەجارێ لە دین دەردەچێ. هیچیان ناداتێ بەجێیخۆی، تووک و نزاشیان لێدەکا. بەڵام ئەمجارە فیۆدۆر پاولۆویچ چاوی لە جیازی و شتی وا نەبوو. جوانیی لەڕادە بەدەری کچە و لەویش گرینگتر ڕواڵەتی پاک و منداڵانەی کچە هۆشی لێبڕیبوو. ئەوەش بۆ پیاوی داوێن تەڕ و گەندەڵ کە تا ئێستا هەر تۆڵاز و چاو لەوەڕێن بووە و وەدوای ئافرەتی نەرمونۆڵ و ژیکەڵە کەوتووە، وەک حەوت مێشی لە کونێکدا دۆزیبێتەوە وابوو. دواتر بە پێکەنینێکی قیزەونانەوە گوتوویە «ئەو چاوە جوانانە وەک خەنجەری دەبان جەرگی بڕیم.» ئەوەش بۆ پیاوێکی خوێڕی و تۆڵازی وەک ئەو جگە لە هەوا و هەوەس هیچ مانایەکی دیکەی نییە. چونکە سۆفیا هیچ جیازی و ماڵێکی نەبوو و بە قسەی خۆی ئەوی لە چنگ مەرگ ڕزگار کردبوو. ڕۆژی مارەبڕان خۆی ون دەکا و تەواوی داب و نەریتەکانی ژن هێنان و ژن و مێردایەتی پایەماڵ دەکا. ئەو کاتە سۆفیا هەستدەکا کە سووکایەتیی پێکراوە، بەڵام لەبەر شەرمەونی و حەیابەخۆیی هیچ ناڵێ و ئەویش بەجارێ شووی لێهەڵدەکێشێ. تا وای لێدێ ژنانی بەستۆکە و لەش فرۆش دێنێتە ماڵێ و لەبەر چاوی ژنەکەی کایە و دەسبازیان لەگەڵ دەکا. با بێمە سەر باسی گریگۆری، نۆکەری ساویلکە و پیر و پێچەقێن و دەمدرێژی فیۆدۆر

پاولۆویچ؟ گریگۆری چونکە نێوانێکی وای لەگەڵ خاتوونی پێشوو ئادلایدا ئیوانا نەبوو، لایەنگریی لە خاتوونی تازە دەکرد. جاری وابوو فیۆدۆر پاولۆویچی سەرکۆنە دەکرد، کە ئەوەش لە نۆکەری بنەماڵە نەدەوەشایەوە. تەنانەت جارێک هەموو بادە و پەرداخەکان پێکدا دەدا و ژنانی سەڵیتە لە ماڵەکە وەدەر دەنێ. لە ئاکامدا ئەو ژنە جوان و جحێڵ و نامرادە،کە لە منداڵییەوە ژێر چەپۆکە و چارە ڕەش بووە تووشی ئەو نەخۆشینە پیسە دەبێ، کە زیاتر ژنانی لادێی تووشی دەبن و دەڵێن «جندۆکە دەستی لێ‌وەشاندوون» جاری وابوو دوای گوشار و هێرشی ژانە سەر وەک شێت و هاری لێدەهات و قسەی دەپەڕاند. بەڵام بەو حاڵەشەوە دوو کوڕی لە فیۆدۆر پاولۆویچ بوو. ئیوان و ئالکسی. ئیوان ساڵی یەکەمی زەماوەندەکەیان لە دایکبوو و ئالکسی سێ ساڵ دواتر کاتێ دەمرێ ئالکسی چوار ساڵانە دەبێ. ئەگەرچی زۆریش جێی سەرسووڕمانە، بەڵام لە تەواوی ماوەی تەمەنیدا دایکی هەر لە بیر بووە. هەڵبەت وەک خەون. دوای مەرگی سۆفیا ئیوانا، ئالکسی و ئیوانیش وەک میتیای برا گەورەیان بە سەر دێ و باوکە تەواو لە بیریان دەباتەوە و دەچێ بە دوای کەیف و نەهەنگی خۆیدا. دەکەونە ژێر چاوەدێریی گریگۆری و لە ژوورەکەی ئەودا دەژین. لەو سەروبەندەدا دەبێ کە پیرێژنە زاڵمەکەی وا دایکیانی بار هێنابوو، دەیاندۆزێتەوە. پیرێژنە هێشتا زیندوو بوو و ئەو هەشت ساڵە نەیتوانیبوو ئەو سووکایەتییە لە بیر بەرێتەوە کە دەرهەقی کرابوو. لە تەوای ئەو ماوەیەدا خەریکی پەیدا کردنی شوێنی ژیان و شێوەی بەڕێوەچوونی سۆفیا بووە و بە بیستنی هەواڵی نەخۆشینەکەی و شوێنی نالەباری ژیانی، دوو سێ جار بە دەنگی بەرز بە دەرو جیرانەکانی گوتووە «خودا شوکور، با وای لێبێ. لەبەر سپڵەیی، خودا ئاوای لێکرد.»

ڕاست سێ مانگ دوای مەرگی سۆفیا ئیوانا پیرێژنە سەرو سەکوتی لە شارەکەی ئێمە دەر دەکەوێ و ڕاست بەرەو ماڵی فیۆدۆر پاولۆویچ مل پێوە دەنێ. نۆ سەعاتێک لە شارەکەی ئێمە دەمێنێتەوە، بەڵام زۆر کاران جێ‌بەجێ

دەکا. شەوێ فیۆدۆر پاولۆویچ بە مەستی دێتەوە بۆ ماڵێ. پیرێژنە هەشت ساڵ بوو چاوی پێی نەکەوتبوو. دەڵێن لەگەڵ هاتنە ژوورێ دوو دانە شەقە زللەی باش لە فیۆدۆر پاولۆویچ دەدا. تووکە سەری دەگرێ و سێ جار بە حیسابی دەیکوتێ. دوای ئەوە بەبێ هیچ قسەیەک بەرەو ژوورەکەی گریگۆری سەر پێوە دەنێ و سۆراخی دوو کوڕەکە دەگرێ. لەگەڵ یەکەم چاو پێکەوتن کە بە گیانی پیس و جل و بەرگی چڵکنەوە دەیانبینێ، چەپۆکێکیش بە سەری گریگۆری دەدا و پاشان دەستی کوڕەکان دەگرێ و لەگەڵ خۆی دەیانبا. ئەوان هەروەک خۆیان لە پلاسێک دەپێچێ و دەیانخاتە نێو فایتوونەکەوە و بەرەو شارەکەی خۆی وەڕێدەکەوێ. گریگۆری وەک کۆیلەیەکی وەفادارچەپۆکەکە نۆشی گیان دەکا و زمانی ناگەڕێ. کاتێکیش کە پیرێژن هەتا لای فایتوونەکە بەڕێی دەکا، دەست بە سینگەوە دەگرێ و بە هەستێکی گەرموگوڕەوە دەڵێ: «خودا جەزای بەخێرتان بداتەوە» پیرێژنە هەروا کە دەڕۆیشت و دوور دەکەوتەوە هەرای کردبوو «هەرچی دەیڵێی بیڵێ گێلە پیاو، هەر کارێک بکەی تۆ هەر گەمژە و حەپۆلی.»

فیۆدۆر پاولۆویچ کاتێ بیر دەکاتەوە دەبینێ خراپیش نییە. منداڵەکانی لە کۆڵ کەوتووە. بە شێوەیەکی فەڕمیش ڕەزایەت دەدا کە منداڵەکانی لای ژنی ژینڕاڵ بن و بەڵێن دەدا خەرجی خوێندنەکەیان دابین بکا. باسی ئەو شەپلاخانەش کە خواردبووی هەر جێیەک دەچوو دەیگێڕایەوە.

خوداوڕاستان دوای ئەوە پیرێژنە دەمرێ. بەڵام لە وەسیەتنامەکەیدا بۆ هەرکام لە کوڕەکان هەزار ڕۆبڵ میرات دادەنێ. «بۆ خەرجی خوێندنیان بەو شەرتەی وای دابەشکەن بەشی هەتا تەمەنی بیست و یەک ساڵییان بکا. چونکە بۆ ئەو جۆرە منداڵانە کەم نییە هیچ، لێشیان سەروزیادە. ئەگەر خەڵکی گوێ بە ماڵ و پارەی خۆیان نادەن و دەیفەوتێنن کەیفی خۆیانە و...» من خۆم وەسیەتنامەکەم نەخوێندۆتەوە. بەڵام بیستوومە دەڵێن زۆر سەیری نووسیوە و تەنانەت شێوەی نووسینەکەشی جێی سەرسووڕمان بووە. میراتگری سەرەکی ئەو، یەفیم پترۆویچ پۆلیانۆف، سەرۆکی لیژنەی ناوچەکە

بووه. پیاوێکی دروست و حیسابی دەبێ. نامەیەک بۆ فیۆدۆر پاولۆویچ دەنووسێ و تێدەگا تاقە فلسێکی لە چنگ دەرنایە بۆ خەرجی خوێندنی منداڵەکانی (ئەگەرچی فیۆدۆر پاولۆویچ قەت بە شێوەی ڕاستەوخۆ لەوە خۆی نەدەبوارد، بەڵام بە شێوەیەکیکە خووی پێگرتبوو لەو بارەوە گوێی خۆی لێدەخەواند و لە ڕاستیدا جاری وابوو دڵی زۆر ناسک دەبۆوە.) هەر بۆیە ئەو منداڵە هەتیوانە سەرنجی ڕادەکێشن و خۆشی دەوێن، بە تایبەت کوڕە چکۆلەکەیان ئالکسی، کە ماوەیەکی زۆر وەک ئەندامێکی بنەماڵەکەی لەگەڵ ئەوان دەژیا. داوا لە خوێنەری بەڕێز دەکەم هەر لەم سەرەتایەوە ئەو خاڵە لەبەر چاو بگرێ. بەڵام کوڕەکان لەبەر خوێندن و بارهاتنیان، لە هەموو کەس زیاتر چاکەی یەفیم پترۆویچ لە چاویاندا بوو، چونکە مرۆڤێکی زۆر دڵفراوان و خاوەن بەزەیی بوو. ئەو دوو هەزار ڕۆبڵەی دایکی کە بۆ خەرجی خوێندنی ئەو منداڵانەی دانا بوو، دەستی لێنادا و کاتێ دەگەنە تەمەنی یاسایی بەهرەیان دێتە سەر و دەبێتە دوو هێندە. بە خەرجی خۆی پێیان دەخوێنێ و لانیکەم یەکێ هەزار ڕۆبڵیان بۆ خەرج دەکا. جارێ ناچمە سەرباسی سەردەمی مێر منداڵی و لاوێتییان و جگە لە لە چەن ڕووداوی گرینگ کە پێویستە ئاوڕی لێبدرێتەوە. کوڕە گەورەکەیان ئیوان هەر ئەوەندە دەڵێم خەمۆک و ئاگا لەخۆ بووە و ئەگەرچی دوور لە شەرمنی بارهاتووە. لە تەمەنی دە ساڵاندا تێدەگا لە ماڵی خۆیان ناژی و لە سەر سفرەی خەڵکییە و خێری پێدەکەن و بەخێری خۆیان بەخێوی دەکەن. باوکیشیان پیاوێکە بۆ ئەوە نابێ قسەی لەگەڵ بکەی؟ تەنانەت دانیشتن لەگەڵی مایەی شەرمەزارییەو... ئەو کوڕە زۆر زوو، هەر بەمنداڵی (لانیکەم وا دەڵێن) زۆر زیرەک بووە و مێشکێکی تایبەتی بووە بۆ فێربوون و تێگەیشتن. لە ڕاستیدا نازانم بۆ، بەڵام کاتێک دەگاتە تەمەنی سێزدە ساڵی بنەماڵەکەی یەفیم پترۆویچ بەجێدێڵێ و دەچێ بۆ قوتابخانەیەکی دوا ناوەندی لە مۆسکۆ. لە ماڵی مامۆستایەکی بە ئەزموون و بەناوبانگ، کە دۆستی لەمێژینەی یەفیم پترۆویچ بووە، نیشتەجێ دەبێ. ئیوان دواتر بەو ئاکامە دەگا کە یەفیم

پترۆویچ ئاشقی چاکەکاری بووە. چونکە پێیوابوو کوڕە مێشک و زەینێکی بەهرەداری هەیە و دەبێ مامۆستایەکی بە ئەزموون و زانا پەروەردەی بکا. بەڵام ئیوان کە قوتابخانەی دواناوەندی تەواو دەکا و دەچێتە زانکۆ یەفیم پترۆویچ و ئەو مامۆستایە هیچکامیان نەماون. چونکە یەفیم پترۆویچ فریا نەکەوتبوو ئەو پارەیەی لە میراتی دایکی بە ئیوان و ئالکسی بڕا بوو و بەشی هەرکامیان لە هەزارەوە بووبووە دوو هەزار ڕۆبڵ بە دەستیان بگەیەنێ و لەبەر ئەوەی سیستمی ئیداریی ڕووسیە گێرەوکێشەی زۆری بەدواوە بووە، وەرگرتنی ئەو پارەیە وەدرەنگ دەکەوێ و ئیوان دوو ساڵی سەرەتای زانکۆ زۆر بە دژواری و دەستەنگی ڕادەبوێرێ. شیاوی باسە تەنانەت نامەیەکیشی بۆ باوکی نەنووسی داوای یارمەتیی لێبکا. ڕەنگە لەبەر غورروور، یان ڕق و قین، یان ڕەنگە دڵی خەبەری پێدابێ کە باوکێکی وا قەت یارمەتیی نادا و ڕووشکاو دەبێ. کوڕە هیوابڕاو نابێت و کارێک پەیدا دەکا. سەرەتا دەستدەکا بەوانە گوتنەوە بە نرخێکی هەرزان و پاشان بە نووسینی ڕووداوی کۆڵان و شەقام لە ڕۆژنامەکاندا بە ناوی «شایەدی عەینی» دەیانگوت ئەو نووسراوانەی هێندە سەرنجڕاکێش و ڕەخنەگرانە بوون، زۆر زوو ناوبانگی دەرکرد. تەنیا ئەوە ئیوانی لە باوەڕ و کردەوەدا لە خوێندکارە دەستەنگ و چارە ڕەشەکانی دیکە جیا دەکردەوە، کە بە دەوری نووسینگەی ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا دەخولانەوە و نەیاندەتوانی جگە لە داواکاریی زۆر بۆ کۆپی هەڵگرتن لە نووسراوە و کتێبان و وەرگێڕانی دەق لە زمانی فەڕەنسییەوە، بیر لە شتێکی دیکە بکەنەوە. ئیوان فیۆدۆر پاولۆویچ دوای ئەوەی جارێک پێوەندیی لەگەڵ سەرنووسەری ڕۆژنامە و گۆڤارەکان دەگرت، ئیتر دەستی هەڵنەدەگرت. لە ساڵانی کۆتاییی زانکۆدا وتاری زۆر باش سەبارەت بە مەبەستگەلی تایبەت و گشتی بڵاو دەکاتەوە و لە ئاکامدا لە کۆڕە ئەدەبییەکاندا دەناسرێ. بەڵام لە دوایین ساڵی زانکۆدا دەتوانێ بیروڕای خوێنەران بۆ لای خۆی ڕاکێشی، هەتا ئەو ڕادەیە کە دەکەوێتە بەر سەرنجی زۆربەی خەڵک و لە بیریان ناچێتەوە کە ئەو ڕووداوە، ڕووداوێکی سەیر و

سەمەرە بووە. ئیوان فیۆدۆر پاولۆویچ دوای تەواو کردنی وانەکانی زانکۆی، بەو دوو هەزار ڕۆبڵەی کە بوویەتی، خۆی ساز دەکا بچێ بۆ هەندەران، کە لە گۆڤارێکدا وتارێکی زۆر سەیر بڵاو دەکاتەوە. ئەویش سەبارەت بە شتێک کە تێنەدەگەیشت. چونکە خوێندکاری زانستی سروشتی بووە، سەرنجی خەڵکی ڕادەکێشێ. وتارەکە سەبارەت بە بابەتێکە کە ئەو کاتە باسی ڕۆژ بووە. ڕەخنە گرتن لە بارودۆخی دادگای کلێسە. ئەو دوای نووسینی چەن بیروڕا لە سەر ئەم بابەتە بیروڕای خۆشی بڵاو دەکاتەوە. شتێک کە زیاتر وتارەکە زەق دەکاتەوە، زمانی نووسینی ئەو بووە و کۆتایی هاتنی چاوەڕوان نەکراو. زۆربەی کلێسە نشینان، ئیوان بە لایەنگری وەفاداری خۆیان دەزانن و بە ئەو هەموو ڕابردووەوە لایەنگرانی ئایینی و کافران کە پێیاندا هەڵدەدان لەگەڵیان هاودەنگ دەبوون. لە ئاکامدا تاقمێک لە وردبین و مووقەڵێشان دەڵێن وتارەکە تەنیا چزەبزە و تیتاڵ و گاڵتەیەکی جەسوورانەیە. با ئەوەشم لە بیر نەچێ، کاتێ وتارەکە لەو کاتەدا دەگاتە پەرستگا بە ناوبانگەکەی نزیک ئێمە و دانیشتوانی پەرستگاکە کە مەسەلەی دادگا کلێسەییەکانیان بەلاوە گرینگ بوو، هەموو واقیان وڕمابوو. کە ناوی نووسەرەکەیان زانی ئەوەندەی دیکە تامەزرۆ بوون و پێیان خۆش بوو کە خەڵکی شارەکەمانە و کوڕی فیۆدۆر پاولۆویچە. هەر خوداوڕاستان لەو کاتەدا نووسەر وەک مووت لێ هەڵپڕوزاندبێ، لە پەنای ئێمە قوت بۆوە.

لە بیرمە ئەو کاتە بە دڕدۆنگییەوە ئەو پرسیارەم لە خۆم کرد، کە ئیوان فیۆدۆر پاولۆویچ بۆ هاتۆتەوە بۆ ئەم شارە. هۆی ئەم دیدارە پڕ لە چارەنووسەم هیچکات بۆ ڕوون نەبۆوە، کە بووە هۆی گەلێ ڕووداوی تاڵ و ناخۆش. پێم سەیر بوو کە لاوێکی ئاوا زانا و خوێندەوار و بادیهەوا و بە ڕواڵەت هێمن و خۆگر، لە ناکاو بگەڕێتەوە بۆ ماڵێکی ئاوا پڕ لە شوورەیی و دیدەنی لە باوکێک بکا کە ڕێزەیەک خۆشەویستیی باوکانەی لە دڵدا نەبووە و لەوانەیە هەر نەشی ناسیێتەوە، چونکە قەت پێی وا نەبووە کوڕی بووە، قەتی فلسێک نەداوەتێ، تەنانەت زۆر جار ترسی ڕێدەنیشت کە ئیوان و ئالکسی

بێن و داوای پارەی لێبکەن. کەچی زۆر سەیرە ئەو کوڕە لاوە هاتبوو بۆ ماڵی باوکێکی ئاوا و ماوەی دوو مانگ لەوێ ماوە و بە جوانی پێکەوە سازا بوون. ئەم ڕووداوەی دوایی بووبووە هۆی سەرسوڕمانی زۆر کەس و تەنانەت خۆشم. بە هەڵکەوت پیووتێر ئەلکساندرۆ میۆسۆف، ئامۆزای ژنە پێشووەکەی فیۆدۆر پاولۆویچ، کە لە پێشدا باسمانکرد، بۆ سەردانی ملکەکەی هاتبۆوە. لە پاریسەوە هاتبۆوە، کە ئەوێ بووبووە شوێنی نیشتەجێ بوونی هەمیشەیی بۆی. لە بیرمە کاتێ پیووتێر ئەلکساندر لەگەڵ ئیوان ئاشنا بوو، ـ لەڕادەبەدەر سەرنجی ڕاکێشا و جاری وابوو سەبارەت بە بیر و باوەڕ لەگەڵ یەک دەکەوتنە مشتومڕ ـ لە هەموو کەس زیاتر تووشی سەرسوڕمان بووبوو.

دەیگوت: «لەخۆ بابییە، قەتی گرفتی ماڵی نابێ،

ئەگەر بیهەوێ بچێ بۆ هەندەران ئەو پارەیەی هەیەتی لێی سەروزیادە. لێرە چ دەکا؟ هەموو کەس دەزانن بۆ پارە نەهاتووە، چونکە باوکی نایداتێ، ئەگەر پارەشی لە پێستە گامێش دابێ. وەشوێن ئارەق خواردنەوە و هەڵەخەرجیش ناکەوێ، لەگەڵ ئەوەشدا باوکی بەبێ ئەو لێی دەقەومێ. پێکەوە چاک سازاون.» ڕاستییەکەشی هەر ئەوە بوو، کوڕە سەیری کارتێکەری لە سەر باوکی هەبوو. لەوە دەچوو دوای هاتنی ئەو باوکی گۆڕابێ و کەمتر بەلای کاری ناحەزدا دەڕۆیشت. جاریوابوو گوێ لە مشتی کوڕەکەی بوو و ئەوی دەیگوت بە قسەی دەکرد. زۆر جاریش تەواو خۆی بادەدا و ئەوی پێی خۆش بوایە دەیکرد.

دواتر بۆم دەرکەوت ئیوان فیۆدۆرۆویچ لە سەر داوای برا گەورەکەی دیمیتری فیۆدۆر پاولۆویچ هاتووە بۆ لای باوکی، جاری یەکەمی بوو چاوی پێیدەکەوت. ئەگەرچی پێشتر بەر لەوەی مۆسکۆ بەجێ بێڵێ سەبارەت بە باسێکی گرینگ کە زیاتر مەڕبووت بە دیمیتری فیۆدۆر پاولۆویچ بوو نەک خۆی، نامەی بۆ نووسیبوو. لە کاتی خۆیدا خوێنەر خۆی سەر لەو باسە دەردێنێ. لەگەڵ ئەوەشدا، کاتێ ئاگاداری ئەو بارودۆخە تایبەتەش بووم،

هەروا هەستمدەکرد ئیوان فیۆدۆر پاولۆویچ مرۆڤێکی دەغەڵە و هاتنەکەیم بە فێڵوتەڵەکەیەک دەزانی.

ئەوەشم لەبیر نەچێ، ئیوان فیۆدۆر پاولۆویچ ئەو کاتە وەک ناوبژیوانێک بۆ ئاشت کردەنەوەی باوکی و برا گەورەکەی - دیمیتری فیۆدۆر پاولۆویچ - کە کێشەیان لێپەیدا بووبوو و تەنانەت دیمیتری دەیویست لە دادگا شکایەت لە باوکی بکا.

شایانی باسە ئەندامی ئەو بنەماڵەیە یەکەم جار بوو ئاوا یەک دەکەوتن، تەنانەت هێندێکیان لە ماوەی تەمەنیاندا یەکتریان نەدیبوو. برا چکۆلەکەیان ئالکسی فیۆدۆر پاولۆویچ ساڵێک دەبوو هاتبوو بۆ لای ئێمە و لە پێش هەموویاندا هاتبوو. ئەم برایەیان، هێنانی بۆ نێو ڕۆمانەکە لەو سەرەتایەوە، بە کارێکی دژوار دەزانم. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ برێ زانیاری سەبارەت بە ئەو بەدەستەوە بدەم. ئەگەر تەنیا بۆ گێڕانەوەی ڕاستییەکی سەیریش بێ. ئەویش ئەوەیە دەبێ پاڵەوانی داهاتووی ڕۆمانەکەم بە جل و بەرگی مریدانەوە بناسێنم. ئەرێ پارەکە هات بۆ پەرستگاکەی ئێمە و گوایە دەیویست هەتا ئاخری تەمەنی لە قوژبنی ئەو کلێسەیەدا گۆشەنشین بێ.

## (٤)

## کوڕی سێهەم، ئالیووشا

ئالیووشا بیست ساڵی تەمەن بوو. هەر لەو کاتەدا ئیوانی براشی بیست و چوار ساڵانە و برا گەورەکەشی دیمیتری بیست و حەوت ساڵی تەمەن بوو. بەر لە هەموو شتێک شایانی باسە ئەو کوڕە لاوە، یانی ئالیووشا، ئایینی نەبوو، لانیکەم بە بڕوای من کوڕێکی دیندار نەبوو. چاکتریشە هەر لەم سەرەتایەوە بیروڕای خۆم سەبارەت بە ئەو بەبێ کەموکووڕی دەرببڕم. ئەو یەکەم لایەنگری مرۆڤایەتی بوو، ئەگەر ژیانی تەرکە دنیاییشی بۆخۆی هەڵبژاردبوو، لەبەر ئەوە بوو کە گیانی خۆی لە تاریکی و تاوان ڕزگار بکات و بە نووری ئەشق و خوداپەرستی بگا. هۆیەکەشی ئەوە بوو کە ئەو ژیانە تەرکە دنیاییەی هەڵبژارد و لەبەر چاوی شیرین بوو، لەوێ پیاوێکی پەیدا کرد کە پێی وابوو لە ئاوی شەو پاکترە. ئەویش پیرە قەشەی بەناوبانگی ناوچەکەمان باوە زووسیما بوو. ئالیووشا بە جۆرێک ئاشقی باوە زووسیما بووبوو، بوو بە مریدێکی سەر لە پێناوی. قسەی تێدانییە کە تەنانەت ئەو سەردەمەش مرۆڤێکی زۆر سەیر بوو. ڕاستییەکەی هەر لە سەر پشتی لانکەوە وابوو. ئەوەشم لەبیر نەچێ کاتێ لە تەمەنی چوار ساڵانەییدا دایکی دەمرێ، هەتا ئاخری تەمەنی لە بیری ناچێتەوە. دەموچاوی و لاواندنەوەی هەمیشە لەبەر چاوی بوو. هەموو کەس دەزانێ منداڵ ئەو جۆرە بیرەوەرییانە لە تەمەنی کەمتر لە چوار ساڵیشەوە، تەنانەت لە دوو ساڵانەوە لەوانەیە لە زەینیدا بمێنێتەوە. بەڵام لە بیر نەچوونەوەی هەتا ئاخری تەمەنی مەحاڵە. وەک خاڵ و پەڵەی ڕووناک لە ناخی تاریکیدا. وەک لەتێکی بڕدراو لە

وێنەیەکی گەورە کە هەموو ڕەنگەکانی کاڵ بووبێتەوە و بزر بووبێ جگە لەو لەتە بڕدراوە. وەک ئەوەی هەر ئێستا لەگەڵیدا بێ. وەبیری دێ ئێوارەیەکی کڕ و کپی هاوین پەنجێرەکە کرابۆوە و تیشکی دەمەو زەردەپەڕ (تیشکی خوار و خێچی خۆری ئێوارەی چاکتر لە شتەکانی دیکە لەبیر مابوو) کەوتبووە سەر سووچێکی وەتاغی پەیکەرەی پیرۆز و لە هەمبەر پەیکەرەی پیرۆزدا لەنتەرێک هەڵکرابوو.دایکی لە بەردەمی پەیکەرەکەدا چۆکی دادابوو هون هون دەگریا. توند توند بە سینگییەوە گوشیبوو ئێشی پێدەگەیاند و خەریک بوو دۆعای بۆ سەلامەتیی ئەو دەکرد و لەبەر دایکی دوو دنیا دەپاڕایەوە. بە سەر هەر دوو دەستییەوە گرتبووی و بۆلای پەیکەرەکەی ڕاداشتبوو وەک بیهەوێ بیخاتە ئامێزی ئەو حەزرەتەوە... لە پڕ دایەنەکەی بە هەلاتن دێت و ترساوانە منداڵەکەی لە دەست دەڕفێنێ.

ئالیووشا لەو کاتەدا ئەدگاری دایکی بۆ هەمیشە لە زەینیدا تۆمار کردبوو. هەر وەک خۆی دەیگوت ئەگەرچی ئەدگار و قەلافەتی دایکم خەمبار و پەشۆکاو بوو بەلام پاکی و شکۆیەتی تایبەتی هەبوو. بەلام قەت باسی ئەو بیرەوەرییانەی نەدەکرد. ئەو بە منداڵیش و تەنانەت کاتی لاویش زۆربڵەییی و چەقەسرۆییی نەدەکرد. زۆر نەدوێن بوو. ئەویش نەک لەبەر حەیا و شەرمێونی، بە پێچەوانە، لەبەر شتێکی جیاواز، جۆرێک خۆ خواردنەوە و گۆشەگیری. گیرۆدەی خولیاکانی ناخی خۆی بوو و بە تەواوی لە خەڵک دابڕابوو. تەنیا بیری لەو دڵەڕاوکێیانەی خۆی دەکردەوە و زۆری بەلاوە گرینگ بوو. واش نەبوو خەڵکی لەبیر بچێتەوە، زۆر خەڵک خۆشەویست بوو. لە ناخی خۆیدا دەرهەق بە خەڵک گەشبین بوو. لەگەڵ ئەوەشدا هیچ کەس بە چاوی گەمژە لە ئالیووشای نەدەڕوانی. ئەدگاری جۆرێک بوو، لەگەڵ ئەوەی چاوت پێیدەکەوت هەستتدەکرد ئەگەر بگاتە ئەوپەڕی دەسەلاتیش حوکم بە سەر کەسدا ناکا. هەتا ئاخری تەمەنیشی هەر لەو بارە ما و ئیزنی بە خۆی نەدا ڕەخنە لە خەڵک بگرێ. قەتیش کەسی لە سەر کارێک سەرکۆنە و مەحکووم نەکرد. لەوە دەچوو بە تەواوی خۆی دابێتە دەست زاتی بێشەرێک.

بۆیـە جـاری وابـوو زووڕە زووڕ دەگریـا و خۆنـەویـستییەکـەی گـەیـشتبووە ڕادەیـەک لـە تـافی لاویدا هـیچ کـەس وهـیچ شـتێک ئـەوی تووشـی ترسـان و سەرسوڕمان نەکرد. لە تەمەنی بیست ساڵیدا کە هات بۆ ماڵی باوکی، ماڵێک کە ناوەندی کاری دزێو و پیس بوو، چونکە بە حەیا و داوێن پاک بوو، سەری دەبەر خۆیدا بوو و متەقی نەکرد و ـ لەو شوێنە کە تەنانەت چاو هەڵێنان و ڕوانینیش دژوار و ئازاراوی بوو ـ بەبێ ئەوەی خۆی شلوێ بکا، سەری دادەخست و کەسی تاوانبار نەدەکرد. باوکی بە هۆی نالەباری و چاو برسییەتیی ڕابردووەوە دڵناسک و تۆرەنۆک بووبوو. سەرەتا بە شێوەیەکی ڕەشبینانە و بە ڕوویەکی تاڵەوە لە گەڵی بەرەوڕوو دەبوو. دەیگوت: «کەم قسە دەکا و زۆر بیر دەکاتەوە» بەڵام زۆر زوو، هێشتا دوو حەوتووی نەخایاندبوو، دەستیکرد بە لە باوەش گرتن و ماچکردنی، ئەویش بە گریان و فرمێسک هەڵوەراندن و هەستێکی ئاوێتەی مەستییەوە. بەوحاڵەشەوە دیار بوو خۆشەویستییەکی ڕاستەقینە و قووڵ دەرهەق بە ئەو لە دڵیدایە. خوشەویستییەک کە تاکو ئێستا نەیتوانیبوو دەرهەق بە هیچ کەس دەریبڕێ. لە ژیانی خۆیدا کەسی هەتا ئەو ڕادەیە خۆش نەویستبوو.

ئالیووشا هەر جێیەک دەچوو لە دڵی خەڵکدا جێی خۆی دەکردەوە و هەر لە منداڵیشەوە وابوو. کاتێ چووە ماڵی ڕاهێنەر و بژێودەرەکەی واتە یەفیم پترۆویچ، وا لە دڵی ئەندامی خێزانەکەیدا جێی خۆی کردەوە، وەک منداڵی ماڵێ چاویان لێدەکرد. بەو تەمەنە کەمەوە پێی نایە ئەو ماڵە و ناتوانین بڵێین بۆ ڕاکێشانی سەرنجیان فێڵ و تەڵەکەیەکی لە ژێر سەردا بووبێ. وەدەست هێنانی دڵی خەڵکی بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ و نەخوازراو، یەکێ لە تایبەتمەندییە ڕۆحییەکانی ئەو بوو. هەر تەبیعەتی وابوو. لە قوتابخانەش هەروا بوو، هەرچەند لەو منداڵانە دەچوو کەهاوپۆلەکانیان باوەڕیان پێناکەن و جاری وایە گاڵتەشیان پێدەکەن و تەنانەت لێیان بێزار دەبن. بۆ وێنە، ئەو مرۆڤێکی خەیاڵاوی بوو هەر بە تەنیا دەگەڕا. هەر لە منداڵییەوە پێی خۆشبوو ڕێگای خۆی بگرێتە بەر و بۆ دەرس خوێندن بخزێتە قوژبنێک. لەگەڵ

ئەوەشدا هاوڕێکانی زۆریان خۆش دەویست و لە هەموو ماوەی دەرس خوێندنیدا خۆشەویستی هەمووان بوو.

زۆری دڵ بە گەشت و سەیران و گاڵتە و یارییەوە نەبوو، بەڵام هەر بە یەکجار دیتن بۆت دەردەکەوت مرۆڤێکی مڕومۆچ و ڕووتاڵ نییە. بە پێچەوانە ڕوو خۆش و بە تاقەت بوو. قەتیش پێی خۆش نەبوو خۆی بنوێنێ. ڕەنگە هەر لەبەر ئەوەش بووبێ قەت لە هیچ کەس نەدەترسا. بۆیە هاوپۆلەکانی زۆر زوو بۆیان دەرکەوت، بەو نەترسانەی خۆی نانازێ و هەر دەڵێی خەبەریشی لەو بێباکی و جەسوورییەی خۆی نییە. قەت قسە و جنێوی بە دڵەوە نەدەگرت. جاری وابوو سەعاتێک دوای دەمقڕە، هەروەک هیچ شتێ ڕووی نەدابێ، لەگەڵ ئەو کەسە دەکەوتە قسە و پێکەنین کە جنێوی پێدابوو. ئەوەندە بە ڕووخۆشی و لەخۆ ڕادیوییەوە وەڵامی پرسیارەکانی دەداوە و چاوپۆشیی لە جنێو و ناونیتکە دەکرد، کە هەموو منداڵەکان خۆشیان دەویست و بەغیلییان پێدەبرد. خووخدەیەکی تایبەتیی بوو کە تەوای هاوپۆلەکانی سەریان لێی سووڕمابوو. ئەویش ئەوە بوو کارێکی دەکرد هەموو گاڵتەی پێبکەن. ئەو گاڵتە پێکردنەش لەبەر ناجسنی و دێزەیی نەبوو، بەو گاڵتە و گەپانە کەیفیان ساز دەبوو و جۆرێ سەرگەرمییان ساز دەکرد و پێیان ڕادەبوارد. ئەو خووخدە تایبەتەشی ئەوە بوو، شەرم و فدێت و پاکداوێنییەکەی لە ڕادەبەدەر بوو. نەیدەتوانی قسە و باس سەبارەت بە ژنان تامڵ بکا. هێندێ قسە و قسەلۆکیش لە نێو قوتابخانەکاندا هەیە کە بە داخەوە بە هیچ شێوەیەک ناکرێ لە نێویان بەری. کوڕانی دڵ و دەروون پاک، کە هێشتا دەمیان بۆنی شیری خاوی لێدێ، جاری وایە لە نێو خۆیاندا، بە دەنگی بەرز قسەی وا دەکەن کە تەنانەت سەربازانی نێو سەربازخانە لەڕوویان هەڵنایە و ئیزن بەخۆیان نادەن لەو جۆرە قسانە بکەن. ئەوەش هیچ، زۆر شت هەیە کە سەربازان نەدەیزانن و نە بیستوویانە، کەچی منداڵانی چینی دەوڵەمەند و خوێندەوار بنێشتە خۆشەی سەر دەمیانە. مێبازی و داوێن پیسی، کە هێشتا زۆریان ماوە بیگەنێ، بەڵام بیستوویانە و جاری وایە وەک

شتێکی بەتام و چێژ و بێوێنە و ئازایانە بە شیاوی دەزانن. کاتێ باسی ئەو شتانەیان دەکرد، دەیاندی ئالیووشا کارامازۆف توند گوێی خۆی گرتووە. هێندێ جار دەورەیان دەدا و دەستیان پێلەسەر گوێچکە لادەبرد و لەو قسە ڕەق و تاڵانەیان دەدا بە گوێیدا. ئەویش خۆی بە زەویدا دەدا و دەتلایەوە، بێ ئەوەی قسەیەکی ناخۆشی بەدەمدا بێ، هەوڵی دەدا خۆی بشارێتەوە و لە بێدەنگیدا گوێی لە ناونیتکە و قسە ناخۆشەکانیان بێ. بەڵام ئاخری دەستیان لەکۆڵ کردەوە و ئیتر سەرکۆنە و قسەی تاڵیان وەلا نا، لەوە بەدواوە بە چاوێکی تەشەراوی لێیان دەڕوانی. ئالیووشا هەمیشە قوتابییەکی باش و زیرەک بوو، بەڵام قەت یەکەم نەبوو.

کاتێ یەفیم پترۆویچ کۆچی دوایی کرد، ئالیووشا دوو ساڵی مابوو قوتابخانەی دواناوەندی تەواو بکا. ژنەکەشی چونکە دڵی بڕوای نەدەدا لەو شوێنە بمێنێتەوە، دوای مردنی مێردەکەی بە خاووخێزانەوە، کە هەموو ژن و کچ بوون، بۆ نیشتەجێ بوون و مانەوەی هەتاهەتایی چوون بۆ ئیتالیا. بەر لە ڕۆیشتن سپاردی بە دوو ژنی خزمی یەفیم پترۆویچ. ئالیووشا قەتی ئەو ژنانە نەدیبوو. خۆشی نەیدەزانی دەبێ چۆناوچۆن لەگەڵ ئەوان بژی. لە ڕاستیدا قەت گوێی لەوە نەبوو چۆن و لە سەر خەرجی کێ دەخوێنێ. لەوبارەوە ڕاست بە پێچەوانەی ئیوانی برای بوو کە دوو ساڵی سەرەتای زانکۆی زۆر بە دژواری و دەستەنگی ڕابوارد و بە هەوڵ و تێکۆشانی خۆی لە سەر پێی خۆی ڕاوەستا. هەر لە منداڵیشەوە لەگەڵ تاڵی و سوێری ئاشنا بوو و دەیزانی بە خەرجی بەخێوکەرەکەی دەژی. بەڵام ئەم دیاردەیە ئەگەر بە خووخدەی ئالیووشاوە دیاریش بێ، بە بڕوای من، جێی ئیراد نییە. چونکە هەرکەسێ بەحاڵ ئالیووشا بناسێ تێدەگا ئەو لەو لاوانەیە ئەگەر - هەتا ڕادەیەکی زۆر ئایینییە - لەپڕ خەزێنەیەکی گەورەش بدۆزێتەوە، ئەگەر داوای لێبکەن بەبێ دوو دڵی دەیبەخشێ، جا بۆیە خێر و چاکەکاری بێ یان لە سەر داخوازیی کەسێکی فێڵەباز. لەسەریەک، لەوە دەچوو بایەخی پارە نەزانێ. هەڵبەت بە مانا ڕەواڵەتییەکەی. قەت داوای گیرفان پووڵیی نەدەکرد، ئەگەر

پێشیان دەدا، زۆری گوێ نەدەدایە، یان خێرا لە ئاوی دەکرد، یان چەن حەوتوو لە گیرفانیدا ڕایدەگرت و نەیدەزانی چیی لێبکا.

پیووتێر ئەلکساندر میۆسۆف، کە لەمەڕ پارەوە زۆر دروستکار بوو. هەروەها بۆرژوایەکی زۆر وردبین بوو، دواتر کە ئالیووشای ناسی، ئەم قسەیەی کرد: «ئێستا ڕەنگە لە دنیادا یان لەوانەیە لەم شارە ملوێنییەدا کەسێک هەبێ بەبێ هیچ پارەیەک و بە دەست و گیرفانی خاڵی بگەڕێ و تووشی زیان نەبێ و لە سەرمانا و لە برسانا نەمرێ. چونکە خێرا خواردەمەنی و ماڵی پێدەدەن، ئەگەر نەشیدەنێ بۆخۆی شوێنێک دەدۆزێتەوە، بۆیە ئەوە بە زەحمەت و سووکایەتیی نازانێ و دڵی خۆی پێوە ناڕەحەت ناکا. ڕاگرتن و بەخێو کردنی ئەو نابێتە هۆی زەحمەت و ئازار، بەڵکو بە پێچەوانە لەوانەیە ببێتە هۆی شادی و خۆشیش. ئالیووشا قوتابخانەی دواناوەندیی تەواو نەکرد. ساڵێک بەر لە تەواوکردنی دەورەکەی، لە ناکاو بەو ژنانەی خاوەن ماڵی دەڵێ دەمەوێ بۆ جێبەجێ کردنی پلانێک کە لە زەینمدایە بچم بۆ لای باوکم، ئەوان پێیان ناخۆش بوو و ڕۆیشتنەکەیان بە دڵ نەبوو. خەرجی سەفەرەکەی گران نەبوو و ئەو ژنانە نەیان هێشت ، کاتژمێرەکەی بە بارمتە دانێ، کە یادگارییەک بوو بنەماڵەی یەفیم پترۆویچ کاتی ڕۆیشتن بۆ هەندەران پێیان دابوو. ئەو دوو ژنە زۆر بە دەست و دڵبازی پارەیان پێدا و تەنانەت جل و بەرگ و مەلافەی تازەشیان بۆ کڕی، بەڵام نیوەی پارەکەی پێدانەوە و گوتی دەمەوێ بە کەرەسەی دەرەجەسێ سەفەر بکەم. لەگەڵ ئەوەی گەیشتە شار لە وەڵامی باوکیدا متەقی نەکرد کە لێی پرسیبوو بۆ بەر لە تەواو کردنی دەورەکەت هاتووی. وەک دەگێڕنەوە زۆر مات و سەرکز دیار بوو. زۆر زووش دەرکەوت بە دوای گۆڕی دایکیدا دەگەڕێ. لەو کاتەدا ددانی پێدانا کە مەبەست لەو سەردانەی هەر ئەوە بووە. بەڵام ناکرێ بڵێین تەواوی هۆیەکەی هەر ئەوە بووە. لەوانەیە خۆشی تێنەگەیشتبێ و نەیدەزانی بڵێ چی. نەشی دەزانی چ شتێک لە ناخیدا سەری هەڵداوە و بەرەو ئەو دنیا نەناسراو و ڕێگا تازەیە هانی داوە. فیۆدۆر پاولۆویچ نەیدەتوانی گۆڕی ژنی

دووهـەمـی نیشان کوڕەکـەی بـدا. چونکـە لـەو کاتـەوە کـە ناشـتبوویان قـەت نـەچووبـووە سـەر گـۆڕەکـەی و وردە وردە لـە بیـری چووبـۆوە لـە کـوێ ناشتوویانە.

شـیاوی باسـە، فیـۆدۆر پـاولۆویچ لـەمـەوبـەر بـۆ مـاوەیـەک لـەم شـارە ڕۆیشتبوو. یانی سێ چوار ساڵ دوای مەرگی ژنەکەی ڕۆیشت بۆ باشووری ڕووسیا. لە ئاکامدا چەن ساڵێک لە (ئۆدسا) نیشتەجێ دەبێ. سەرەتا بە وتەی خۆی لەگەڵ «تاقمێکی زۆر ژن و پیاو و منداڵی جوولەکەی لە چینی خوارێی کۆمەڵ» ئاشنا دەبێ و پاشان «لە لایەن جوولەکەی دەوڵـەمـەند و هـەژارەوە وەک یەک» وەردەگیرێ و جێی خۆی لـە دڵیانـدا دەکاتـەوە. وەک دەڵێن لـەو مـاوەیـەدا زۆر چـاک فێـری سـووت و سـەلـەم و پـارە کۆکردنـەوە بـوو. لـە ئاکامیشدا سێ سـاڵ بـەر لـە هـاتنی ئالیووشـا بـۆ شـارەکـەی ئێمـە، گـەڕاوە. ئـەوانـەی زووتـر دیتبوویـان بۆیـان دەرکـەوت زۆر بـەسـاڵاچوو دەنـوێنێ، ئەگەرچی پیرە پیاو نەبوو. کردەوەشی لە چاو ڕابردوو قورساختر نـەبووبـوو هیچ، بەڵکو زۆریش هەڵە و هەرزانە هەڵسوکەوتی دەکرد. ئەو ڕێوییە پیرە بۆ ئەوەی خـەڵکیش فێری کـاری خوێڕییانـە بکـا زۆری حـەولـدا. تـۆڵازی و چـاو برسی بوونەکەی لە جاران زیاتر بووبوو. لە ماوەیەکی کورتدا چەند مەیخانـە و گازینۆی کردەوە و ئاشکرا دیار بوو لەوانەیە سەد هەزار ڕۆبڵی پارە ببێ. زۆربەی دانیشتوانی شار و ناوچەکە زۆر زوو کەوتنە ژێر قـەرزی ئـەوەوە و بە سووت و سەلەم زۆربەی خـەڵکی تووشـی چارەڕەشـی و مـاڵوێرانی کـرد. لەم دواییيانەدا تەواو بافیشی لە خۆی کردبوو و لەبەر دەوڵەمەندی وا سـەری لێ شێوابوو سەروبەری کاری خۆی نەدەزانی. دایمە سەرخۆش بوو. ئـەگـەر گریگۆری نەبوایە، ـ نۆکەرەکەی کە پیرە پیاوێکی دنیا دیتـوو بـوو، ئاگاداریی لێدەکرد ـ لـەوانـەبوو خۆی تووشـی زۆر دەردەسـەریی گـەورە بکـا. هـاتنی ئالیووشا لەباری ئەخلاقییەوە کاری تێکرد. ئەتگوت لەو پیاوە زوو پیر بووەدا شتێک ژیاوەتەوە کە ماوەیەکی زۆر بوو لە ناخیدا ویشک بووبوو.

زۆر جارکە تەماشای ئالیووشای دەکرد دەیگوت: «دەزانی ڕاست لە دایکە جندۆکە دیتووەکەی دەچێ» وەختی خۆشی هەر ئەوەی بە دایکی ئالیووشا دەگوت. «جندۆکە دیتوو» دەیگوت جندۆکە دەستیان لێوەشاندووە. گریگۆری قەبری «جندۆکە دیتووی» نیشان ئالیووشا دا. بردی بۆ گۆڕستانی شارەکەمان و لە سووچێک قەبرێکی بە کێلی هەرزانبابییەوە نیشاندا کە پاک و خاوێن ڕاگیرابوو، ناوی مردووەکە و تەمەن و ڕێکەوتی مردنەکەی لە سەر هەڵکەندرابوو. لە خوارووشەوە چوارێنەیەک، کە زۆربەی خەڵک لە چینی مامناوەندیی کۆمەڵ لە سەر کێلی مردووەکانیان دەینووسن. ئالیووشا خێرا تێگەیشت چەقاندنی ئەو کێلە کاری گریگۆرییە. بە پارەی خۆی ئەو کێلەی لە سەر گۆڕی «جندۆکە دیتوو»ی بەستەزمان چەقاندبوو. هەڵبەت دوای ئەوەی کێلەکە دەچەقێنێ، فیۆدۆر پاولۆویچ زۆریشی پرتە و بۆڵە بەسەردا دەکا. کاتێ دەچێ بۆ ئودسا گۆڕەکە یەکجاری لەبیر دەباتەوە. ئالیووشا بە دیتنی قەبرەکەی دایکی ئەو هەستە قوڵپدەرەی ناخی دەرنەبڕی و تەنیا گوێی لە گریگۆری گرتبوو کە بە وردی باسی گۆڕەکە و دانانی کێلەکەی دەکرد. سەری داخستبوو و بەبێ ئەوەی قسەیەک بکا ملی ڕێی گرت و ڕۆیی. دوای ئەوە، ڕەنگە ئەو ساڵە بە لای گۆڕستانەکەدا نەچۆوە. بەڵام ئەو ڕووداوە چکۆلە کاری لە فیۆدۆر پاولۆویچ کرد، دڵی نەرم بوو لەپڕدا هەزار ڕۆبلی برد و دای بە کڵێسەکەی خۆمان، بۆ خێری ژنەکەی، بەڵام نەک بۆ ژنی دووهەمی، دایکی ئالیووشا، «جندۆکە دیتوو» بەڵکو بۆ ژنەکەی یەکەمی واتە ئادلایدا ئیوانا، کە زۆری لێدەدا. ئێوارەی ئەو ڕۆژەش مەستیکرد و لەبەر چاوی ئالیووشا دەستیکرد بە جنێودان بە قەشەکانی کلێسە. خۆی مرۆڤێکی بێ دین بوو، دەتوانم بڵێم قەت مۆمێکی هەرزانباییشی لەبەر دەمی پەیکەری پیرۆزدا هەڵنەکردبوو. ئەو جۆرە مرۆڤانە جاری وایە تووشی گۆڕان و هەڵچوونێکی سەیر دەبن و ئەو کتوپڕ گۆڕانەش شتێکی سروشتییە.

پێشتر گوتم، قەڵافەتێکی هەڵمساو و پیرانەی هەبوو، لەو کاتەدا دیار بوو کە ژیانێکی ڕابواردووە. پێستی بەرچاوی شۆڕ ببوونەوە چاوە چکۆلەکانی

ئەوەندەی دیکە زیت و پڕ گومان و تەشەراویی دەنواند، لەگەڵ ئەوەشدا چرچ و لۆچی دەموچاوە قەڵەوەکەی و بەرخەبەبەی بەر چەناگە تیژەکەی وەک دەڵەمە شۆڕ بووبۆوە و قەڵافەتی دزێو و سەیر و هەوەساویی دەنواند. لەگەڵ ئەوەشدا دەمێکی زل و لچی داچۆڕاوی هەبوو کە لەو نێوانەدا ددانە ڕەش و ڕزیوەکانی وەدەر دەکەوتن. کاتێ قسەی دەکرد تفی دەپرژاند. پێیخۆش بوو هەمیشە تانە لە دەموچاوی خۆی بدا، بەڵام بە بڕوای من زۆری بە دڵ بوو. ئەو زۆر جار تاریفی لووتی خۆی دەکرد کە زۆر گەورە نەبوو، بەڵکو باریک و چکۆلە و قەڵەنگی بوو. دەیگوت: «لووتی ڕۆمی، بە بەرخەبەبەی شۆڕەوە قەڵافەتی ڕەچەڵەکی لە مێژینەی ڕۆمیانی پێداوم.» بۆیە پۆزی پێوە لێدەدا.

ئالیووشا ماوەیەک دوای ئەوەی چووە سەر گۆڕی دایکی، لەپڕ گوتبووی دەیهەوێ بچێتە کلێسە و قەشەکانیش پێیان خۆشە وەک مرید وەریبگرن. هەروەها گوتبووی ئاواتی گەورەم ئەوەیە و باوەگیان ئەگەر ئیزنم پێبدەی دەچمە کلێسە. فیۆدۆر پاولۆویچ دەیزانی زووسیمای پیر، کە خەریکی چلەکێشانە، کارتێکردنێکی تایبەتی لە سەر کوڕە ساویلکەکەی بووە.

دوای گوێ گرتن لە ئالیووشا لە بێدەنگییەکی خەیاڵاویدا بەبێ ئەوەی داخوازی کوڕەکەی تووشی سەرسوڕمانی بکا، گوتی: «هەڵبەت ئەو لە هەموو قەشەکان بەشەڕەفترە، دەی!... ئێستا دەتەوێ بچی بۆ ئەوێ کوڕم؟» نیوە سەرخۆش بوو، لەپڕ بزەیەکی سەرخۆشانە نیشتە سەر لێوی، کە فێڵ و گزەیەکی ئاوێتەی تەگبیری پێوە دیار بوو. «ئەرێ!... لە دڵم چەقیبوو بەوە دەگەی. باوەڕ دەکەی؟ دەی ڕاست بچووبای بۆ لای . چاکە خۆ تۆ دوو هەزار ڕۆبڵت پارە هەیە، بۆ جیازی ژن هێنانت. کوڕە پاکەکەم! منیش قەت بەجێت ناهێڵم و یارمەتیت دەدەم. هەرچەندێکیان پارە ویست؟ ئەگەر بیانهەوێ، دەیاندەمێ. بەڵام ئەگەر نەیانهەوێ بۆ لە خۆڕا ناڕەحەتیان بکەین؟ دەڵێی چی؟ دەزانی خۆ تۆ ڕۆژانە بە قەت چۆلەکەیەکت خەرجی هەیە. حەوتووی دوو دانەت لێ زیادە. دەزانی لە نزیک کلێسەکە لە دەرەوەی شار

شوێنێکی لێیە، منداڵیش دەزانێ کەسی لێنییە. جگە لە «ژنانی کلێسە» یانی هەر بەو ناوە ناسراون. بە بڕوای من، سی ژن دەبن. خۆم لەوێ بووم. دەزانی، خۆشە ها ناخۆش نییە. بۆ بێتاقەتی باشە. خراپییەکەی لەوەدایە هەموو ڕووسین ژنی فەرەنساییی لێنییە. هەڵبەت دەتوانن ژنی فەڕەنسیش بێنن. زۆر زوو دەتوانن بیهێنن. پارەی زۆریان هەیە. ئەگەر بۆنی پارەیان پێبگا بەتاو دێن. چاکە لێرە ئەو شتانە وەبەر چاو نایەن، تەنیا دووسەد قەشەن، کە زۆریش بە شەڕەفن. ڕۆژوو دەگرن. دەزانم تۆ چیت لە دڵدایە. ئەرێ... دەتەوێ ببیتە پیاوی ئایینی. ئالیووشا دەزانی زۆرت بۆ بەداخەوەم. باوەڕ دەکەی هەر بە ڕاستی زۆرم خۆش دەوێی؟ چاکە، هەلێکی باشە. بۆ ئێمەی تاوانبار دەپاڕێیەوە، لێرە زۆرمان تاوان و سەرپێچی کردووە. هەمیشە لەبیری ئەوەدا بووم کێ دوعام بۆ دەکا، بڵێی کەسێک لەم دنیایەدا ببێ ئەو کارە بکا. کوڕە خۆشەویستەکەم، لەو بارەوە زۆر گەمژەم. باوەڕ ناکەی؟ زۆر گەوجم. لەو بارەوە خۆم زۆر بە گەمژە دەزانم، دایمە بیر دەکەمەوە ـ جاروبار، نەک هەمیشە، بیر دەکەمەوە ئەگەر بمرم مەحاڵە شەیتان لە بیریان بچێتەوە بە قەڵانگ بەرەو دۆزەخ ڕامکێشن. ئەو کاتە سەرم سووڕ دەمێنێ ـ قەڵانگ؟ قەڵانگیان لە کوێ بوو؟ لەچی؟ قەڵانگی ئاسنین! لە کوێ دروستی دەکەن؟ بڵێی کوورە و شتی وایان هەبێ؟ مریدەکانی کلێسە ڕەنگە پێیان وابێ دۆزەخ بنمیچی هەیە. ئەگەر بڕوام بە دۆزەخیش ببێ، بەڵام دۆزەخی سەر ئاوەڵام پێ ڕازاوەتر و ماقووڵانەترە. مەبەستم ئەوەیە زۆر خۆشترە. لە ئاکامدا تۆفیری نییە بنمیچی هەبێ یان نەیبێ. قەڵانگیش هەر نییە و ئەگەر نەشبێ تێک دەتەپێ. کە ئەوەش مەحاڵە، چونکە ئەو کاتە ئیتر هیچ کەس نابێ بەرەو دۆزەخم ڕاکێشێ، ئەگەر بەرەو دۆزەخیشم ڕانەکێشن، کەوایە لە دنیادا عەداڵەتی چی؟ ئەگەر وایە ئەم دنیایە هەروا گۆترەیە، بەڵام وا نابێ، دەبێ ئەو قەڵانگ و قولاپە بۆ گیان من دروستبکەن. تەنیا بۆ گیانی من. چونکە تۆ نازانی چەندە ڕابردوویەکی ڕەشم هەیە ئالیووشا.»

ئالیووشا بە سەرنجێکی گەرم و دڵۆڤانەوە بە باوکی گوت:

«بەڵام لەویٚ قەڵانگ و شتی وا هەر نییە.»

– ئەریٚ، ئەریٚ، تەنیا سێبەری قەڵانگەکە دەبیندریٚ. دەزانم، دەزانم. فەڕانسەییەک ئاوا باسی دۆزەخ دەکا. «سێبەری[3] عەڕەبانەچییەکم دی، بە سێبەری ڕنەکێک، سێبەری عەرەبانەیەکی دەسڕییەوە.»

ڕۆڵە گیان تۆ چووزانی قەڵانگیان نییە؟ لەگەڵ مریدان بژیی، هەوایەکی دیکە لە کەللەت دەدا. بەڵام برۆ با لە کلێسە بەو ڕاستییە بگەی، ئەو کاتە وەرەوە و بۆم بگێڕەوە. چونکە سەفەر کردن بۆ ئەو دنیا ئاسانتر دەبیٚ ئەگەر پیاو بزانیٚ چۆنە و چییە. جگە لەوەش، بۆ تۆ زۆر چاکترە بەجێی ئەوەی لەگەڵ من هاونشین بی لەگەڵ پیرە پیاوێکی خەرەفاو و ئەو سەڵیتە جحێڵانە و مریدەکانی کلێسە ڕایبوێری، ئەگەرچی وەک فریشتە وای و هیچ شتێک لەڕیٚ هەتڵەت ناکا. دڵنیام لەوێش هیچ شتێک کاریگەریی لە سەر تۆ نابیٚ. هەر لەبەر ئەوەشە باوەڕم پێت هەیە، بۆیە ئیزنت دەدەم بچی. چونکە هیوام پێتە. شوکور خاوەن ئەقڵ و کەماڵی. لە دەرەوە و ناوەوە هەڵدەقرچێی، لەویٚ چاک دەبییەوە و دەگەڕێیتەوە. منیش چاوەڕوانتم. هەستدەکەم تۆ تەنیا بوونەوەرێکی لەم دنیایەدا کە مەحکوومت نەکردووم. ڕۆڵە خۆشەویستەکەم، هەست بەوە دەکەم، دەزانی. جگە لەوەش چارەیەکی ترم نییە.

فیۆدۆر پاولۆویچ دەستیکرد بە گریان، دڵناسک بوو. تاوانبار و دڵناسک.

---

3– وەرگیراو لە (دوانەلێک دژی ئانەئید) نووسراوەی شارێل پراوێل.

# (٥)

## پیرانی کلێسە

ڕەنگە هێندێ لە خوێنەرانم پێیان وابێ ئەم پاڵەوانە لاوەی من، مرۆڤێکی نەخۆش و مردەلۆخە و ڕێوەڵەیە یان لاوێکی وردیلە و ڕەنگ پەڕیو و سیلدارە. بە پێچەوانە، ئالیووشا لەم کاتەدا لاوێکی نۆزدە ساڵانەی جوان بارهاتووی، کوڵمە سوور و چاوگەش و لەش ساغ بوو. زۆریش قەڵافەتێکی ڕێک و پێک و جوانی هەبوو. لاوێکی جوانچاک و دەستە. تووکە سەری خورمایی، دەموچاوێکی جوان و تۆزێ درێژۆکە و هێلکەیی. چاوانی گەورە و هەنگوینی و گەش. زۆر خەیاڵاوی بوو و بە ڕواڵەت زۆر هێدی و لەسەرەخۆ دیار بوو. ڕەنگە پێم بڵێن کوڵمەی سوور و عیرفان و دینداری پێکەوە ناسازگارن، بەڵام بە بڕوای من ئالیووشا لە هەموویان ڕاست و بێ کرێژتر بوو. دڵپاک و ئاکارجوان. بێگومان لە کلێسەدا زۆری بڕوا بە مۆجزە بووە بەڵام پێموایە مۆجزات هیچکات نابێتە لەمپەری سەر ڕێگای مرۆڤی ڕاست و دروست و هەقبین. ئەوە مۆجزات نییە کە هەقبینان بەرەو باوەڕ ڕێنوێنی دەکا. هەقبینی ڕاستەقینە ئەگەر مرۆڤێکی بە بیر و باوەڕیش نەبێ، بەردەوام وزە و توانای ئەوەی دەبێ کە بڕوای بە ئەوپەڕی سروشت نەبێ. ئەگەریش لەگەڵ مۆجزەیەک بە شێوەی ڕاستەقینەیەکی حاشاهەڵنەگر بەرەوڕووبێ، بەجێی قەبووڵکردنی ڕاستەقینە، باوەڕ بە هۆش و هەستی خۆی ناکا. ئەگەریش قەبووڵیبکا، وەک ڕاستەقینەیەکی سروشت قەبووڵیدەکا، کە هەتا ئەو کاتە گوێی پێنەداوە. ئیمان لە ناخی مرۆڤی هەقبیندا، لە مۆجزەوە

سەرچاوە ناگرێ بەڵکو مۆجزە لە ئیمانەوە سەرچاوە دەگرێ. کاتێ کە مرۆڤێکی هەقبین ئیمان دێنێ، ئەو کاتە زاتی هەقبینی وای لێدەکا ئەوپەڕی سروشتیش قەبووڵبکا. تۆماس ڕەسووڵ گوتی: هەتا بە چاوی خۆم نەیبینم ئیمان ناهێنم، بەڵام هەرکە چاوی پێیکەوت، گوتی: «خولقێنەری من و خودای من!» بێژی مۆجزە وای لێکردبێ ئیمان بێنێ؟ بەلانی زۆرەوە نا، بەڵکو بەو هۆیەوە ئیمانی هێنا چونکە دەیویست ئیمان بێنێ، ڕەنگە کاتێکیش کە گوتی: «تا بە چاوی خۆم نەیبینم ئیمان ناهێنم» لە ناخی دڵەوە ئیمانی هێنابوو.

ڕەنگە پێمبڵێن کە ئالیووشا گەوج و نەفام بووە و خوێندنی تەواو نەکردووە و... هتد. ئەوە کە خوێندنی تەواو نەکرد، بەجێی خۆی، بەڵام ئەگەر بڵێن گەوج بوو یان تەوەزەل زۆر بێئینسافییە. ئەوەی لە پێشدا گوتم دیسان دەیڵێمەوە. ئەو بۆیە پێی نایە ئەو ڕێگایەوە کە ئەوسەردەمە پێیوابوو بەردەبازێکە بۆ پەڕینەوە لە تاریکییەوە بەرەو ڕووناکی. جگە لەوە، تا ڕادەیەکیش وەک بەرەی پێشوو بیری دەکردەوە ـ یانی کردەوەی جوان و هەقخواز. بە دوای هەقیقەتەوە بوو باوەڕی تەواویشی پێی هەبوو. دەیویست بە گیان و دڵ لەو پێناوەدا خزمەت بکا. تینووی خزمەتکردن و یارمەتیدانی خەڵک بوو. حازر بوو لەو پێناوەدا هەموو شتێکی بەخت بکا، تەنانەت گیانیشی. ئەم لاوانە بەداخەوە ڕەنگە تێنەگەن کە گیان بەخت کردن ساناترین شێوەی لێبوردووییە. بەڵام بۆ وێنە بەختکردنی پێنج ـ شەش ساڵ تەمەنی لاوێتیان لە ڕێگای خوێندنی جیددی و دژواردا ـ بە هۆی سەد هێندە بوونی توانایی خزمەتکردن بە هەقیقەت و مەرامەکەیان ـ لە توانای زۆربەیاندا نییە. ڕێگایەک کە ئالیووشا هەڵیبژارد ڕێگایەک بوو کە بە پێچەوانەی ڕێبازەکەی بوو، بەڵام تینوایەتیی گەیشتنی خێرا بە ئامانج، هەڵبژاردنی ئەو تینوایەتییە بوو. هەر ئەوەی کە لە ئەندێشەی جیددیی خۆیدا، بڕوای بە بوونی خودا و هەرمانی کرد و بە شێوەیەکی سروشتی کتووپڕ بە خۆی گوت: «دەمەوێ بۆ هەرمان بژیم و هیچ چەشنە سازشتێکیش کارم تێناکا. هەر بەو شێوەیە ئەگەر پێی وابوایە کە خودا و هەرمان نییە، لەڕێوە دەبووە کافر یان

سۆسیالیست. (چونکە سۆسیالیسم تەنیا بزوتنەوەی کرێکاری یان دەوڵەتی چوارەم نییە، بەر لە هەموو شتێک بزووتنەوەیەکی کافرانەیە، بەو ڕەنگ و ڕووەی کە کافریخوازی ئەمرۆیی بەخۆیەوە گرتووە، دەتوانین بڵێین بەبێ دەست تێوەردانی خودا دروستبووە. نەک لە زەوییەوە سەرکەوتن بەرەو بەهەشت، بەڵکو دانانی بەهەشتێکە لە سەر زەوی.) ئالیووشا نەیدەتوانی بە شێوەی پێشوو بژی. ئەو جۆرە ژیانە بۆ ئەو سەیر و مەحاڵ بوو. نووسراوە: «ئەگەر دەتهەوێ بە کەماڵ بگەی ئەوی هەتە بیدە بە فەقیر و هەژاران و وەرە وەدوای من کەوە.» ئالیووشا لە دڵ خۆیا گوتی: «ناتوانم بەجێی هەموو خەڵک دوو ڕۆبڵ بدەم و بەجێی ئەوەی وەدوای کەوم، بە تەنیا بچم بۆ نوێژی شەوانە.» ڕەنگە بیرەوەریی منداڵیی، کلێسەکەی ئێمەی وەبیر هێنابێتەوە،چونکە دایکی زۆر جار لەگەڵ خۆی دەیبرد بۆ پاڕانەوەی شەوانە. ڕەنگە تیشکە خواروخێچەکانی خۆر لە کاتی ئێوارەدا و پەیکەرەی پیرۆز، کە دایکە چارەڕەشە «جندۆکە دیتووە»کەی لەبەر دەمی ڕایگرتبوو، هەروا لە زەینیدا مابێ. بە بیرکردنەوە لەو شتانە ڕەنگە هاتبێ بۆلای ئێمە تاکو بزانێ دەتوانێ، «هەموو شتێکی» بەختکا یان تەنیا «دوو ڕۆبڵ»، بۆیە چوو بۆ لای پیری کلێسە.

ئەم پیرەی کلێسە، هەروەک لە پێشدا گوتم، زووسیمای پیر بوو. باش وایە تۆزێ پێداکێشم و بڵێم، «پیری کلێسە» لە پەرستگاکانی ڕووسیە چدەکەن، بەداخەوە لەم بارەوە تەواو بڕوام بە خۆم نییە و ڕەنگە نەتوانم. لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵدەدەم بە چەند ڕەستەیەک شتێک ڕوون کەمەوە. خاوەنڕایانی ئەم بوارە لە سەر ئەو باوەڕەن کە دامەزرانی «پیرانی کلێسە» زۆر نییە و لەو پەرستگایانەی ئێمەدا ناگاتە سەد ساڵ. ئەگەرچی لە ڕۆژهەڵات، بە تایبەت لە (سیناوئاتووس) زیاتر لە هەزار ساڵە هەیە. دەڵێن: زەمانی زۆر زوو لە ڕووسیاش هەبووە. بەڵام بەهۆی ئەو بەڵاو ئاپۆرانەوە کە تووشی ڕووسیا بوو ـ تاتارەکان، شەڕی ناوخۆ، پچڕانی پێوەندی لەگەڵ ڕۆژهەڵات دوای لە نێو چوونی قوستەنتەنییە ـ ئەم دامەزرانەش لە نێو چوون. لە ئاخری و

ئۆخریی سـەدەی ڕابـردوودا بـە دەسـتی پیـاوێکی ئـاینی کـە نـاوی پایسی ولیچکفسکی و هەر بەو ناوەش بەناوبانگ بوو، بە هاوکاریی مریدەکانی لـە نێو ئێمەدا دایانمەزراند. بەڵام هەتا ئەمڕۆ، تەنانـەت دوای سـەدەیـەک تـەنیا لـە چەند کلێسە ماوە و هێندێ جاریش وەک شتێکی تازە داهـاتوو لـە ڕووسـییا تـاڕادەیـەک ئیدانـەیـان کـردووە. ئـەم دامـەزراوەیـە بـە تایبـەت لـە کلێسـەی بەناوبانگی «کۆزلسکایا ئاپتینا» شکڵی گرت. نازانم بڵێم چۆن و کـەنگێ هاتـە کڵێسەی ئێمەشەوە. تا ئێستا سێ کەس لەو پیرانە لەم کلێسەی ئێمـە بـوون، زووسیما دوایین کەسیانە. بەڵام ئەویش لەبەر پیری و بێهێزی پێی لە لێواری قەبرە و کەسیش نییە لە جێی ئەوی دانێن. ئـەم مەسـەلـەیـەش بۆ کلێسـەکـەی ئێمە مەسەلـەیەکی گرینگ بـوو. چونکـە تـا ئـەو کاتـە بـە شـێوەیـەکی فـەرمی ناسراو بوو: کلێسەکەی ئێمە نەیاد کردنەوەی بۆ قەشـە و مرۆڤـە ئایینییـەکان دەگرت، نە پەیکەرەی مۆجزە نوێنی لێبوو. نە وڵاتپارێزی و بـەرخۆدان و خزمەتی مێژوویی لە ڕێگای وڵاتدا پێوە دیاربوو، تـەنانـەت ئـاوڕی لـەو داب و نەریتە بەشکۆیانەش نەدەدا کە پێوەندیی بە مێژوومانەوە هەبوو. وتـاردان لـە لایـەن پیرانـەوە، کـە زیـارەتکـەران بۆ بیستنی لـە هـەمـوو لایـەکـەوە هـەزاران فەرسەخیان ڕێ دەبڕی ـ لە سەرانسەری ڕووسیا ـ شکڵی گرتبوو و خەڵک بە چاوی ڕێزەوە تەماشایان دەکرد.

ئـەو پیرانـە چکارە بـوون؟ پیری کلێسە کـەسـێک بـوو کـە گیـان و تاسـەی مریدی بە گیان و تاسەی خۆیـەوە گرێدەدا. مرۆڤی عـارف دوای هـەڵبژاردن، واز لە تاسەی خۆی دێنێ و تەسلیمی ئەوی دەکا، تـەسلیم بـوونێکی تـەواو و لەنێوچونێکی ڕاستەقینە. ئـەو ئـەم ڕێگایـە، ئـەو مـەکتـەبی بـە تـەواوی لـە نێو چوونـە، بـە هیـوای زاڵبـوون بـە سـەر خۆیدا و زاڵبـوون بـە سـەر هـەوەسـی خوازەڵۆکدا هەڵدەبژێرێ. تاکو پاش تەمەنێک سەردانەواندن و فەرمانبەری، بە ڕزگارییـەکی تـەواو یـانی ڕزگـاری لـەخۆی بگـا و لـە دەسـت چـارەنووسـی ئـەوانـەی کـە ژیانیـان بـەبێ دۆزینـەوەی خۆیـان ڕابـواردووە، هـەڵێ. بناغـەی پیرانـی کلێسە لـە سـەر گریمانـە ڕۆنـەنراوە، بـەڵکو لـە ڕۆژهـەڵات بـەهـۆی

بەردەوام بوونێکی هەزارساڵەوە دامەزرامەوە. دەرۆست بوون لە هەمبەر پیری کلێسەدا وەک فەرمانبردن نییە، کە هەمیشە لە پەرستگا ڕووسییەکان بووە، بەڵێندان و دەرۆست بوون بۆ مرید، تۆبە کردن لە سەر دەستی پیری کلێسەدایە و دەبێ بڕوای بەو پێوەندییە ڕۆحییە لە پسان نەهاتووە هەبێ.

بۆ وێنە دەگێڕنەوە لە سەردەمی مەسیحییەتدا، یەکێ لە مریدەکان کە بە قسەی پیرەکەی ناکا، کلێساکەی لە سووریا بەجێدێڵێ و دەچێ بۆ میسر. لەوێ دوای تێپەڕکردنی کەندوکۆسپێکی زۆر دەگاتە ئەو جێگایەی کە شایانی ئەوە بێ لە ڕێگای خودادا ڕەنجبکێشێ و مەرگەکەی وەک مەرگی شەهیدی ڕێگای دین وابێ. قەشەکانی کلێسە لەگەڵ ئەوەی وەک پیاوی خودا چاوی لێدەکەن، بەڕێزەوە بە خاکی دەسپێرن. مجێوری کلێسەکە هەتا هات بڵێ «ئەی وسڵ دەرنەکردووەکان دوور کەونەوە.» دارەتەرمی هەڵگری تەرمی شەهید لەجێی خۆی بەرز دەبێتەوە و لە کلێسەکە فڕیدەرێتە دەرێ و سێجار پاتە دەبێتەوە. لە ئاکامیشدا بۆیان دەرکەوت ئەو مرۆڤە پیرۆزە بەڵێنی و پەیمانی شکاندووە و مرادەکەی بەجێ هێشتووە، بەڵام هەرچەندە کاری چاک و گەورەشی کردبێ، بەبێ لێبوردنی پیرەکەی عەفوو ناکرێ. تەنیا دوای ئەوەی پیری کلێسە لێی خۆشبوو ڕێوڕەسمی ئەسپەردەکردن بەڕێوەچوو. ئەمەش، هەڵبەت حەقایەتێکی کۆنە و بەس. بەڵام ئەمەش نموونەیەکی نوێ. مریدێک لە ناکاو لە لایەن پیرەکەیەوە فەرمانی پێدەدرێ (ئاتووس) کە شوێن و داڵدەی بووە بەجێبێڵێ و سەرەتا بچێتە ئۆرشەلیم بۆ زیارەتی شوێنە پیرۆزەکان و پاشان بڕوا بەرەو باکوور، بۆ سیبیریا: «جێگای تۆ ئەوێیە نەک ئێرە» مریدی بێچارە لە تاوانا دەچێ بۆ لای قەشەیەکی گەورە لە قوستەنتەنییە. بۆ ڕزگار بوون لە ژێر باری فەرمان و گوێڕایەڵی پەنا بۆ ئەو دەبا، بەڵام قەشە دەڵێ من هیچ تەنانەت هیچ هێزێک لە دنیادا نییە و نابێ، کە بتوانێ تۆ ڕزگار کا. جگە لەو پیرەی کە ئەو ئەرکەی لە سەر شانی تۆ داناوە. بەم شێوەیە پیرانی کلێسە لە هێندێ لایەنەوە توانایییەکی لەڕادە بەدەریان پێدراوە. هەر بۆیە لە زۆربەی کلێسەکانی ئێمەدا ئەو دامەزراوەیە سەرەتا دژ

بە جەفاکاری ڕاوەستا. هەر لەو سەروبەندەدا پیرانی کلێسە لە نێو خەڵکدا ڕێزێکی زۆریان وەدەستهێناو لەبەر چاوی خەڵک شیرین بوون. پۆل پۆل مرۆڤی گەوج و هەروەها کەسایەتیی ناسراو، هاتن بۆلای پیرانی ئێمە. هەتا دان بە تاوان و کردەوەیاندا بنێن و تۆبە بکەن. بە دیتنی ئەو بارودۆخە ئەوانەی دژی پیرانی کلێسە بوون ناڕەزایەتییان دەربڕی. کە ڕێ و ڕەسمی تۆبە کردن و دان بە تاواندانانیان، لەخۆوە و بە ئارەزووی دڵی خۆیان بەڕێوەدەبەن و تۆبە کردن لە سەر دەستی پیری کلێسە، بە هۆی مریدەکانی یا خەڵکی ڕەشۆکییەوە وەک ئەرکێکی پیرۆز و ئایینی ناچێ. لەگەڵ ئەوەشدا دامەزرانی ڕێکخراوەی پیرانی کلێسە جێی خۆی کردەوە و ئێستاش لە پەرستگاکانی ڕووسیا برەوی هەیە. ڕەنگە ئەوەش هۆیەکی باش بێ بۆ زیندوو کردنەوەی ئەخلاقی مرۆڤایەتی و ڕزگار کردنی خەڵک بێ لە کۆیلەیی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وەک دوو ڕێیانێک وایە و بەشێک لە خەڵکیش بەرەو ئاکارێکی شەیتانی و لەخۆ دەرچوون دەبا.

زووسیمای پیر شەست و پێنج ساڵی تەمەن بوو، کوڕە جووتیار بوو. کاتی لاوی دەچێتە ئەرتەشەوە و بە پلەی ملازم لە قەفقازیا خزمەت دەکا. بێگومان بە ئاکار و خووخدەی تایبەت و ڕۆحییەکەی خۆی شوێنی لە سەر ئالیووشا دانا. ئالیووشا لە حوجرەی ئەو پیرەدا دەژیا کە زۆری خۆشدەویست و ئیزنی پێدەدا خزمەتی بکا، ئەوەشمان لەبیر نەچێ ئالیووشا ئەو کاتە کە لە کلێسە دەژیا، هیچ ئەرکێکی لە سەر شان نەبوو و دەیتوانی هەرکوێی پێ خۆشە بچێ، بەڕۆژدا لە کلێسەش نەمایەتەوە گرینگ نەبوو. ئەگەر جل و بەرگی ڕاهیبانەشی لەبەر دەکرد، خۆی حەزی پێدەکرد و دەیویست لەگەڵ کەسانی دیکەی نێو کلێسەکە هاوڕەنگ بێ. وادیار بوو پیرەکەی زۆری کار تێکردبوو. باوە زووسیما دەیانگوت لە ساڵانی زووەوە هێندەی خەڵکی جۆراوجۆر دیتووە، کە هاتوون بۆ تۆبە کردن و لە لای ئەو دانیان بە تاوانەکانیاندا ناوە، لەگەڵ چاو پێکەوتنی کەسەکە دەیزانی چیی دەوێ و چ شتێک ڕۆحی ئازار دەدا. جاری وابوو زیارەتکەرانی وا تووشی

سەرسووڕمان دەكرد، لەوانەبوو شێت بن، هێشتا زمانیان نەگەڕابوو لە مەبەستیان دەگەیشت.

ئالیووشا زۆر جار دیتبووی ئەو كەسانەی بۆ یەكەمجار دێنە زیارەتی باوە زووسیما بە ترس و لەرزەوە دەچوونە ژووری، بەڵام كاتی گەڕانەوە شاد و دڵخۆش و لێو بە بزە دەهاتنە دەرێ. ئالیووشا بە تایبەت ئەوە چاك تێگەیشتبوو كە باوە زووسیما نەك تووڕە نابێ و نێو چاوانی تێك نانێ،بە پێچەوانە هەمیشە ڕوو خۆش و لێو بە بزەیە. مریدەكانی دەیانگوت ڕێزێكی زۆر بۆ تاوانبار دادەنێ و هەرچەندە تاوانی زیاتر بێ ئەو زۆرتری ڕێز بۆ دادەنێ. هەتا كۆتایی تەمەنی، بێگومان لە نێو مریدەكانیدا كەسانێك بوون كە زۆریان ڕق لێی بوو و بەخیلییان پێدەبرد. بەڵام ژمارەیان كەم بوو و قەت زمانیان نەدەگەڕا. هەرچەند كەسانێكیان لەنێودا بوو كە لە نێو كلێسەكەدا خاوەن شكۆ و پلە و پایە بوون، بۆ وێنە ڕاهیبێكی پیر كە بە هۆی ڕۆژوو گرتن و بێدەنگی و لەسەرەخۆیی ناوبانگی دەركردبوو. بەڵام زۆربەی ڕاهیبەكان لایەنگری باوە زووسیما بوون و لە ناخی دڵەوە خۆشیان دەویست. تاقمێك تەواو گیان لە پێناوی بوون و ئاشكرا دەیانگوت ـ ئەگەرچی بە دەنگێكی بەرز نەبوو ـ شكی تێدا نییە پیاوی خودایە. چونكە دەیاندی پێی لە لێوی گۆڕە و لە كۆتاییی تەمەنی نزیك بۆتەوە، چاوەڕوان بوون لە داهاتوویەكی نزیكدا مۆجزەیەكی وا بنوێنێ ببێتە هۆی شانازی بۆ كلێسای ناوچەكە. ئالیووشا ئیمانێكی تەواوی بە هێزی مۆجزەئاسای پیرەكەی هەبوو. ڕاست ئەو جۆرەی كە ئیمانی بە هەقایەتی فڕێدرانە دەرێی تابووتەكە لە كلێسە هەبوو. زۆر كەسی دەدەی كە منداڵ و كەس‌وكاری نەخۆشیان دێنا كە باوە زووسیما دەستیان بە سەردا بێنێ و دۆعایان بۆ بكا، كاتێ دەڕۆیشتن، زۆر زوو دەهاتنەوە و بە چاوی فرمێسكاوییەوە دەكەوتن بە سەر كەوشەكانی پیردا و لە بەر چاكبوونەوەی نەخۆشەكەیان سپاسیان لێدەكرد.

ئالیووشا قەتیش ئەو پرسیارەی بەزەین نەدەگەیشت و بیریشی لێ نەدەكردەوە، كە ئەو نەخۆشانە بەڕاستی بە دۆعای باوە زووسیما چاك

بوونەوە، یان نەخۆشینەکە ماوەی خۆی تێپەڕاندووە و نەخۆشەکە چاک بۆتەوە، چونکە باوەڕێکی تەواوی بە توانایی ڕۆحیی پیرەکەی هەبوو، کاتێ تاریفی بەناوبانگی و شکۆی ئەوی دەبیست کەیفی دەکرد و دەتگوت تاریفی خۆی دەکەن. کاتێ باوە زووسیما وەدەر دەکەوت و دەچوونە نێو کۆڕی زیارەتکەرانەوە، ئالیووشا دەکەوتە دڵەکوتێ و زەردەی دەگرت، خەڵکی ڕەش و ڕووت لە هەموو ناوچە و مەڵبەندەکانی ڕووسیاوە دەهاتن و بە ئاواتەوە بوون پیر ببینن و داوای متفەڕکی لێبکەن. لەبەر دەمیدا چۆکیان دادەدا و دەگریان، لاقیان ماچدەکرد، خۆڵی بەر پێکەیان ماچدەکرد و هاواریان لێ هەڵدەستا، ژنان منداڵەکانیان بۆلای ڕادەداشت و نەخۆشی ترساو و شێت و فێداریان دێنا بۆلای. پیر قسەی لەگەڵ دەکردن. دۆعایەکی کورتی بە سەردا دەخوێندن، دەستێکی بەسەریاندا دەهێنا و ئیزنی دەدان برۆن. لەم دواییانەدا نەخۆشی وای کز و لاواز کردبوو، هێندێ جار نەیدەتوانی لە حوجرەکەی بێتە دەرێ و زیارەتکەران جاری وابوو چەن ڕۆژ چاوەڕوانی هاتنەدەرەوەی دەبوون. ئالیووشا پێی سەیر نەبوو کە بۆ ئەوەندەیان خۆش دەوێ و کاتێ دەیبینن لەبەر پێیدا سەر لە عەرزی دەسوون و دەگرین. ئاخ! دەیزانی کە بۆ ڕۆحی پاک و سادەی خەڵکی ڕەشۆکی و خاکەڕای ڕوسیا، کە لە ژێر باری خەم و کاری گراندا پشتیان چەماوەتەوە، بە تایبەت لە دەست زوڵم و زۆر و تاوانی لەڕادەبەدەری خۆیان و هەموو خەڵکی دنیاوە زاڵە هاتوون، بۆ دۆزینەوەی شتێک یان کەسێکی پیرۆز بە دڵ تامەزرۆن. تاکو کڕنۆشی بۆ بەرن و کەوشەکانی ماچبکەن و بیپەرستن. هەر بەوەش ئۆقرە دەگرن و دڵیان ئاو دەخواتەوە.

لە نێو ئێمەدا تاوان و زوڵم و وازی وازی بوون هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا لە جێگایەکی ئەم سەرزەوییە پان و بەرینە مرۆڤێکی پیرۆز و مەزن هەیە، ئەو هەقیقەتی لەدەستدایە. هەقیقەت دەناسێ، کەوایە هەقیقەت لە سەر زەوی نەمردووە و سەرچاوەی هەقیقەت ڕۆژێک دێ بۆ لامان و هەر وەک بەڵێنی دراوە بە سەر جیهاندا ڕادەگا و عادلانە حوکمات دەکا. ئالیووشا دەیزانی کە

ئەوە ڕاست ئەو شتەیە کە هەموو خەڵک بە ئەقڵ و ڕۆح هەستی پێدەکەن. ئەوەشی بە باشی دەزانی، بەڵام بڕوای وەک ئەو خەڵکە ڕەشۆکی و سادانە وابوو کە دەگریان و ژنانی نەخۆش منداڵەکانیان بۆ لای پیرەکەیان ڕادەداشت، لە سەر ئەو باوەڕەش بوو کە زووسیمای پیر جێنشینی خودایە لە سەر زەوی و هەڵگری هەقیقەتی خوداییە. لە سەر ئەو باوەڕەش بوو کە زووسیما لە پاش مەرگی شکۆیەکی لەڕادە بەدەر دەبەخشێ بە کلێسەکە و ئالیووشا لە خەیاڵی خۆیدا ئەوەی وەک ڕۆژ لێ ڕوون بوو، لەم دواییيانەشدا گڕی ئەو ئەشقە ڕۆحییە لە دڵیدا جارلەگەڵ جار پتر بڵێسەی لێ هەڵدەستا. ئەو تۆزکاڵێکیش لەوە دوودڵ نەبوو کە ئەو پیرەی لە هەمبەریدا وێستاوە پێشەوایەکی بێ هاوتایە.

ئەو خەیاڵە شیرینەی لە دڵی ئالیووشادا شەپۆلی دەدا ئەوە بوو: «ئەو پیرۆز و پاکە. ڕازی ڕۆژی پەسڵان و زیندوو بوونەوەی هەموانی لە دڵدایە. هەر ئەو هێز و وزەیەی ڕۆژێک هەقیقەت لە سەر زەوی مسۆگەر دەکا و تەواوی مرۆڤەکان پاک و پیرۆز دەبن و یەکتریان خۆشدەوێ، ئیتر هەژار و دەوڵەمەند، کەس و ناکەس، نامێنێ و هەموو بە تێکڕایی دەبنە ڕۆڵەی خودا و گەورەیی ڕاستەقینەی مەسیح ئاشکرا دەبێ.»

هاتنی دوو برای کە هەتا ئەو کاتە هیچیانی نەدیبوو و نەیدەناسین، گوایە زۆری کار تێکرد. لەگەڵ براگەورەکەی دیمیتری فیۆدۆرۆویچ (کە درەنگتر هات) زۆر زووتر لە ئیوان فیۆدۆرۆویچ بووە هاوڕێ، ئەگەرچی لەگەڵ ئەو دایکیشیان یەک نەبوو. زۆری ئیوانی برای خۆش دەویست. ئیوان دوو مانگ دەبوو هاتبوو بۆ شار، ئەگەرچی زۆربەی کات یەکتریان دەدی، بەڵام هێشتا زۆر دانوویان پێکەوە نەدەکوڵا. ئالیووشا لە خۆیا بێدەنگ و هێدی بوو، دەتگوت چاوەڕوانی شتێکە و هەست بە شەرمەزاری دەکا. بەڵام تێگەیشت ئیوانی برای سەرەتا زۆر سەیر چاوی لێدەکا و تێی دەفکرێ، وا دیارە زووش دەستی لەو سەرنج و تێڕامانە هەڵگرت. ئالیووشا بە حەپەسانەوە تێگەیشت. سەرەتا چاوپۆشی و سەرساردیی براکەی بە هۆی جیاوازیی

تەمەن و بەتایبەت جیاوازیی خوێندەواری زانی. بەڵام ئەو بیرە هەڵیگرت کە نەکا نەبوونی وردبینی و هاودڵی ئیوان بە هۆی شتێکی نامۆوە بێ. هەمیشە پێیوابوو ئیوان بیر لە شتێک دەکاتەوە و (مەبەستێکی دەروونی و گرینگ) هەوڵدەدا بۆ گەیشتن بە ئامانجێک، کە لەوانەیە دەست پێڕاگەیشتنی زۆر دژوار بێ و هەر ئەوەش بۆتە هۆی ئەوەی کە بیر لە ئەو ناکاتەوە. ئالیووشا ئەوەشی لەخۆی دەپرسی نەکا بیرمەندی بێدین دەرهەق بە من کە مریدێکی گەوج و حەپۆلم ڕقی لە دڵدا بێ. سوور سوور دەیزانی کە براکەی کافرە. ئەگەر ئەو قینەشی لە دڵدایە، بەڵام بە دڵنییەوە نەدەگرت. لەگەڵ ئەوەشدا تووشی واق و ڕمانێکی سەیر بووبوو کە خۆشی نەیدەزانی چییە و لە ناخەوە ئازاری دەدا. چاوەڕێ بوو براکەی لێی نزیکتر بێتەوە. دیمیتری برای بە ڕێزێکی زۆر و خۆشەویستییەکی قووڵەوە باسی ئیوانی دەکرد. ئالیووشا دەیزانی هەموو ئەو شتانەی کە لەم دواییانەدا پێوەندییەکی زۆر نزیک و باشی لە نێوان ئەو دوو برایەدا دامەزراندووە ئیوانە. باسکردنی پڕ لە خۆشەویستیی دیمیتری، لەبەر چاوی ئالیووشا سەرنج ڕاکێشتر بوو، چونکە دیمیتری لە چاو ئیوان تا ڕادەیەک خوێندەوارتر بوو. دوو برا بە شێوەیەکی سروشتی بووبوونە دوانە لێکدژ و وا لە هەمبەر یەکتردا چەقیبوون. کە دۆزینەوەی دوو مرۆڤی وەک یەک نەچوو زۆر دژوار دەبوو.

هەر لەو سەردەمەدا بوو کە کۆبوونەوەیەکی ئەندامانی ئەم بنەماڵە ئاڵۆزە لە حوجرەکەی پیری کلێسەدا پێکهات کە بەو شێوەیە کاری کردە سەر ئالیووشا. بەهانەی پێکهێنانی ئەو کۆبوونەوەیەش بەهانەیەکی درۆیینە بوو. لەم کاتەدا بوو کێشەی نێوان دیمیتری فیۆدۆرۆویچ لەگەڵ باوکی گەورە بۆوە و بەجارێ لەبەر چاوی یەکتری تاڵبوون. فیۆدۆر پاولۆویچ وەک دەڵێن یەکەم کەس بووە کە وادیارە بە گاڵتە پێشنیاری کردووە هەموویان لە حوجرەکەی باوە زووسیما کۆببنەوە و بێئەوەی دەستەوداوێنی ئەو بن و ڕاستەوخۆ کارەکەیان بۆ جێبەجێ بکا، بەئەدەبانە و لەسەرەخۆ لە ژێر سایەی ئاشتیخوازانەی هەنتەشی پیردا لەگەڵ یەک پێکبێن. دیمیتری کە بە

عومری خۆی باوە زووسیمای نەدیبوو. بۆیە لەوە بەگومان بوو کە باوکی بۆ ترساندنی ئەو کۆڕێکی وای وەڕێ خستووە. بەڵام چونکە بە هۆی هێندێ ئاکاری ناحەز لەگەڵ باوکی چەنجار کێشەیان لێ پەیدا بووبوو، لە دڵەوە خۆی سەرکۆنە دەکرد، بۆیە ئامادە بوو ئەم کۆڕە بۆ ئاشت بوونەوەیان ساز بکرێ. دەبێ ئەوەشمان لەبیر نەچێ کە ئەو وەک ئیوان فیۆدۆرۆویچ لە لای باوکی نەبوو. لەوسەری شاری بە تەنیا دەژیا. خوداوڕاستان پیۆتیر ئەلکساندرۆویچ لەو کاتەدا هاتبوو بۆ شار. مەبەستەکەی پێخۆش بوو. ئەم ئازادیخوازەی سالانی چل و پەنجا کە پیاوێکی ڕووناکبیر و بێدین بوو، لەوانەیە بۆ بێتاقەتی و سەرگەرمی ڕووی لەوێ کردبێ. ئاواتی دیتنی کلێسە و «پیاوی پیرۆز» لە ناکاو سەرتاپای داگرت. چونکە پەروەندەی شکایەتەکەی لە کلێسە سەبارەت بە سنوور و مافی داربڕین و ماسیگرتن لە ڕووبار بە هیچ کوێ نەگەیشتبوو، ئەوەی کردە بیانوو بۆ دیتنی پیر، تاکو بە شێوەیەکی دۆستانە کارەکەی یەکلایی بکاتەوە. بۆیە کەسێک کە بەو بۆنەیەوە بچێ و کارێکی ئاوا شایانی لە دەست بێ، ڕێزی لێدەگیرێ و بە خۆشەویستییەوە پێشوازی لێدەکرێ، نەک ئەوەی لەخۆڕا مل پێوەنێ و وەژوور کەوێ. ئەگەرچی لەم دواییانەدا پیر کەمتر لە حوجرەکەی دەهاتە دەرێ و نەخۆشی وای لێکردبوو ئیزنی دیدارە ئاساییەکان نەدا. کەسانێک لە نێو کلێسەکەدا چاویان تێوەی بوو و ئاگادارییان لێدەکرد. لە ئاکامدا ئیزنی ئەو دیدارەیدا و ڕۆژەکەی دیاریکرا.

بە بزەیەکەوە بە ئالیووشای گوت: «کێ منی کردۆتە حاکمی ئەوانە؟»

لەوەش زیاتر هیچی نەگوت.

ئالیووشا بە بیستنی هەواڵی ئەو دیدارە زیاتر تووشی دڵەوڕێزە بوو. لە نێوان گرووپی شەڕکەر و شەڕخوازدا دیمیتری برای تەنیا کەسێک بوو کە ئەو کۆڕی مشتوومڕەی پێ بە ڕاست بوو. ئەوانی دیکە هەر لەخۆڕاوە، یا بۆ سووکایەتی کردن بە پیر دەهاتن. ئالیووشا باش لەوە دەگەیشت. ئیوانی برای و میۆسۆف بۆ قوتەقوت و جلفبازاڕی دەهاتن. چونکە باوکیشی زۆری دڵ

بە ڕشقنجاڕییەوە بوو. ئالیووشا ئەگەرچی هیچی نەدەگوت، بەڵام زۆر چاک لە خووخدەی باوکی دەگەیشت. دیسان دەیڵێمەوە ئالیووشا بە پێچەوانەی بیرکردنەوەی خەڵکی زۆریش گەمژە و ساویلکە نەبوو. بە دڵێکی خەمبارەوە چاوەڕوانی ڕۆژی دیاریکراو بوو. بێگومان لە تەنیاییدا هەمیشە بیری لە کێشە و ئاژاوەی بنەماڵەکەیان دەکردەوە و دەیویست چارەیەکی بۆ بدۆزێتەوە. بەڵام دڵەخورپەی سەرەکیی ئالیووشا لە تاوی باوە زووسیما بوو. خەمی گەورەیی و شکۆی ئەوی بوو. دەترسا بە شێوەیەک سووکایەتیی پێبکرێ. بەتایبەت لە قسەی تەوساوی و ناو ئاخنداری میۆسۆف و شاتوشووتی پڕ لە فێڵ و بەدەمارانەی ئیوانی زانکۆ دیتوو دەترسا. ئالیووشا دڵی لە هیچ شتێک نەدەحەسایەوە. تەنانەت دەیویست بەجۆرێک بە گوێی پیر هەڵێنێ و لە مەبەستی ئەوانی تێگەیێنێ. بەڵام دوای ماوەیەک بیرکردنەوە و دان بەخۆداگرتن پەشیمان دەبۆوە. تەنیا ڕۆژێ بەر لە دیدارەکە بە دۆستێکدا هەواڵی نارد بۆ دیمیتریی برای کە زۆری خۆش دەوێ و چاوەڕوانە بەڵێنی خۆی بەرێتە سەر. دیمیتری واقی ورمابوو چونکە وەبیری نەدەهاتەوە بەڵێنییەکی دابێ. بەڵام بە نامە وەڵامی دایەوە کە هەوڵدەدا خۆی ڕاگرێ و گرژی نەنوێنێ. بەڵام لەگەڵ ئەوەی ڕێزێکی زۆری بۆ پیر و ئیوانی برای هەیە، لە سەر ئەو باوەڕەیە کە ئەم دیدارە یان تەڵەکەیە یان مەڵحەکەیەکی بێبایەخ. لە کۆتاییشدا نووسیبووی:

- بەڵام ڕازیم زمانم بە بڕین بچێ و دەرهەق بە پیاوێکی خودا کە ڕێزێکی زۆرت بۆی هەیە زمان درێژی نەکەم.

ئەم نامەیە ئەو جۆرەی پێویستە دڵی ئالیووشای نەگەشاندەوە.

# (١)

## دەگەنە نێو کلێساکە

ڕۆژێکی خۆش و گەرموگوڕی مانگی ئووت بوو. ئاخافتن لەگەڵ پیر کەوتۆتە کاتژمێر یازدە و نیوی سەر لە بەیانی، هەر خێرا دوای نوێژێکی دەرنگوەخت ئەو کاتەیان دانابوو. ئەوانەی دەبوو لەو کۆڕەدا بەشداربیکەن نەهاتبوون. بەڵام ڕاست لە کۆتایی دانیشتنەکەدا هاتن. سەرەتا فایتوونێکی ڕازاوە و سەرئاوەڵا، کە ئەسپی ڕەسەن و گرانبایی ڕایان دەکێشا. میۆسۆف و بۆرە خزمێکی کە لاوێکی بیست ساڵان بوو، بە ناوی فێمیچ گاڵگانۆف گەیشتنێ. ئەو کوڕە لاوە خۆی ئامادە کردبوو بچێتە زانکۆ. میۆسۆف لەگەڵ ئەو کوڕە لاوە دەژیا و هەوڵی دەداو هانی دا بچێ بۆ هەندەران و بڕواتە، زانستگای زووریخ یان ژێنا. ئالیووشا هێشتا دوودڵ بوو. پەرۆش و خەمبار بوو. فێمیچ گاڵگانۆف مرۆڤێکی جوانچاک و ڕێکوپێک و تاڕادەیەک کەڵەگەت بوو. جاروبار سەیر دەکەوتە گۆمی بیر و خەیاڵەوە و مات دەبوو، وەک هەموو مرۆڤێکی مات و پەرێشان هێندێجار بە واقوڕماوی چاوی لە کەسێک دەبڕی. بێدەنگ بوو و تا ڕادەیەکیش شپرێو. بەڵام هێندێجار کە لەگەڵ کەسێک تەنیا دەکەوت. زۆربڵێ و ڕوو هەڵماڵدراو بوو. هەر لەخۆڕا پێدەکەنی. بەڵام شادییەکەی هەروەک لەپڕ پەیدا دەبوو، ئاواش خێرا ون دەبوو. هەمیشە خەریکی پشوودان بوو و تەنانەت جل و بەرگی دەوڵەمەندانەی لەبەر دەکرد و بڕێکی پارە و دارایی سەربەخۆ بوو، بەڵام چاوی تێر نەدەبوو. یەکێ لە دۆستەکانی ئالیووشا بوو.

بە فایتوونێکی کۆنە و چەپرەک و گەورە، کە دوو ئەسپی زەردی پیر ڕایاندەکێشا. زۆر لە دوای فایتوونەکەی میۆسۆف، فیۆدۆر پاولۆویچ و ئیوانی کوڕی هاتن. دیمیتری فیۆدۆرۆویچ ئەگەرچی عەسری ڕۆژی پێشوو لە کاتی کۆبوونەوەکە ئاگادار کرابوو، بەڵام وەدرەنگ کەوتبوو. ئەو کەسانەی بۆ کۆڕەکە هاتبوون، فایتوونەکانیان لە لای هوتێلەکە و دوور لە گۆڕەپانەکە ڕاگرت و بە پێیان بەرەو دەروازەی کلێساکە وەڕێکەوتن. جگە لە فیۆدۆر پاولۆویچ، هیچکام لەو کەسانەی دیکە کلێساکەیان نەدیبوو، میۆسۆفیش نزیکەی سی ساڵ دەبوو پێی نەنابووە کلێساوە. بەوردی و هێمنانە چاوێکی بە دەوروبەری خۆیدا گێڕا. بەڵام جگە لە کلێسە و ماڵانی دەوروبەری پەرستگاکە شتێکی سەیر و بەرچاو نەکەوتە بەر ڕوانینە مووقلێشانەکەی، لەوە دەچوو کلێسە و خانووبەرکانی دەورووبەری سەرنجیان ڕانەکێشا بێ. دوایین کەسانی نوێژکەر بە سەری ڕووتی و خاچ کێشان لە پەرستگاکە هاتنە دەرێ، زۆربەیان خەڵکی ڕەشووڕووت و لە چینی خوارووی کۆمەڵ بوون و چەن کەسێکی دەوڵەمەند و پیاو ماقووڵیشیان لەگەڵ بوو، دوو سێ ژن و ژێنراڵێکی زۆر پیریش لە هوتێلەکەوە هاتبوون و خەڵکی ناوچەکە نەبوون. بەرلەوەی بگەنە نێو کلێساکە کەوتنە گەمارۆی سواڵکەر و پارسەکانەوە، بەڵام هیچکام دەستیان بۆ گیرفانیان نەچوو. تەنیا گاڵگانۆفی لاو دراوێکی دە کۆپکیی لە جزدانەکەی دەرهێنا و تووڕە و حەپەساو ـ خودا دەزانێ لەبەرچی! ـ دای بە پیرێژنێک و بەپەلە گوتی: «بەشیبکەن لە نێوان خۆتاندا.» بە هیچکام لە هاوڕێکانیشی سەبارەت بەوە هیچی نەگوت، ئیتر حەپەسانەکەی بێهۆ بوو؛ بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەست و لاق تێکەڵهاتنەکەی زیاتر بوو.

سەیر بوو دەتگوت هیچکەس چاوەڕوانی هاتنیان نییە و لەگەڵ ڕێز و پێشوازی بەرەوڕوو نەبوون، ئەگەرچی یەکیان لەم بەینانەدا هەزار ڕۆبڵی پێشکەش بە کلێسە کردبوو. یەکێکی دیکەشیان خاوەنی ملکێکی زۆر و دەوڵەمەند و خاوەن فەرهەنگ بوو کە هەموو شتێکی کلێساکە بە جۆرێک پێوەندیی بە ئەوەوە بوو. چونکە بڕیاری دادگا لەوانە بوو مافی ماسیگرتن بدا

بە ئەو. لەگەڵ ئەوەشدا هیچکام لە دانیشتوانی فەرمیی کلێسەکە نەهاتنە پێشوازییان.

میۆسۆف کە شێواو و پەرۆش دیار بوو، چاوێکی لە کێلی ئەو قەبرانەی لای کلێسەکە کرد و هات بڵێ ئەو مردووانەی لێرە نێژراون، ڕەنگە بۆ هەقی خەوتن لەو «شوێنە پیرۆزە» پارەیەکی زۆریان دابێ، بەڵام قسەکەی خواردەوە. قسەی تەوساوی و گاڵتەجاڕی ئەو پیاوە قۆشمە و ئازادیخوازە لەپڕ بوو بە تووڕەیی و ڕق. دەتگوت قسە لەگەڵ خۆی دەکا، درکاندی: «سەیرە، لەم گەوجاوایەدا ڕێگای چوونە ژووریێ لە چ کەڕە پەشمەیەک بپرسین؟ چبکەین خەریکە کات بە سەر دەچێ.»

کتوپڕ سەروسەکوتی پیاوێکی پیر و سەر ڕووتاوە، بە چاوی شیشلۆق و پڕ لە داوای لێبوردنەوە پەیدا بوو. عەبایەکی فشوفۆڵی هاوینیی لەبەردا بوو. کڵاوەکەی لە سەری داگرت و بە زمانێکی شیرین گوتی: من ناوم ماکسیمۆفە و خاوەن مڵکێکی ناوچەی (توولا)م. هەر لەڕێوە تێگەیشت گرفتی میوانەکان چییە.

ـ باوە زووسیما لە ژووری پشوودانە، چوارسەد هەنگاو لەولای کلێساوەیە و کەوتۆتە ئەودیوی دارستانەکە.

فیۆدۆر پاولۆویچ گوتی: «دەزانم لەودیوی دارستانەکەیە. بەڵام ڕێگاکەیم لەبیر نەماوە... لەمێژە بۆ ئەم لایە نەهاتووم.»

ـ لەملایەوە، لە پاڵ ئەم دەروازەیەوە و ڕاست بە پەنا دارستانەکەدا... دارستانەکە. بەدوامدا وەرن. پیشانتانی دەدەم.... دەبێ بچم... خۆشم هەر دەچووم بۆ ئەوێ. لەملایەوە، لێرەوە.

لە دەروازەکە چوونە دەرێ و بەلای دارستانەکەدا بایاندایەوە. ماکسیمۆف شەستساڵی تەمەن بوو. لە پێشیانەوە هەڵدەهات و ئاوڕی دەدایەوە و بە وردی تەماشای دەکردن و چاوە کونەسووژنەکانی زیت کردبۆوە.

میۆسۆف بە تووڕەیی گوتی: «ئێمە بۆ کارێکی تایبەتی هاتووین بۆ لای پیر. ئەو زاتە بەلای ناخێری شانازیی ئەو دیدارەی بە ئێمە داوە. زۆرت سپاس

دەکەین کە ڕێگاکەت پیشانداین، بەڵام بە باشی نازانین لەگەڵمان بێیتە نێو حوجرەکەوە.»

ماکسیمۆف بە پێکەنین و شادییەوە چەقەنەیەکی لێدا و گوتی:

ـ چووم، زۆر چووم؛ un chevalier parfait{چەکدارێکی بەجەرگ و ئازایە}.

میۆسۆف پرسیی: کێ چەکدارێکی بەجەرگ و ئازایە؟

ـ پیری کلێسە، پیری خاوەن شکۆ، پیری کلێسە دەڵێم! شانازی و شەرەفی پەرستگاکەمان، زووسمیا. بەڕاستی پیری چاکە!

بەڵام لەپڕ مریدێکی ڕەنگبزرکاو و بەژن و باڵا دەستە، بە کڵاوی ڕاهیبانەوە هاتە پێشێ و قسەی پێ بڕی. فیۆدۆر پاولۆویچ و میۆسۆف لە سەر جێی خۆیان ڕاوەستان.

ئەو ڕاهیبە، بە کڕنۆشێکی زۆر شایان و پڕ لە ڕێزەوە گوتی: «باوکە عابید هەموو ئێوە برایانی بانگهێشتن کردووە کە دوای دیدار لە ژووری پیر نانی نیوەڕۆ لەگەڵ ئەو مەیل بفەرموون،کە کاتژمێر یەکی نیوەڕۆ دەبێ.» لەگەڵ ئەوەی چاوی لە ماکسیمۆف بڕیبوو گوتی: «ئێوەش.»

فیۆدۆر پاولۆویچ کە ئەو بانگهێشتنەی زۆر بە دڵ بوو، گوڕاندی: «قسەی تێدا نییە ئەو کارە دەکەم. باوەڕ بفەرموو هەموومان قەولی شەرەفمان داوە بە ئەدەبێکی تەواوەوە هەڵسوکەوت بکەین... تۆچی پیووتێر ئەلکساندرۆویچ، تۆش دێی؟»

ـ ئەی‌چۆن نایەم. مەگین نازانن بۆ زانیاری لە سەر داب و نەریتی ئێرە هاتووم؟ تەنیا کۆسپی سەر ڕێگای منیش تۆی...

ـ خۆ دیمیتری فیۆدۆر ۆویچ هێشتا نەهاتووە!

پیووتێر ئەلکساندرۆویچ گوتی: «ئەگەر نەیەت دەیکوژێ! پێتوایە ئەم بەزم و ڕەزمەم پێخۆشە، ئەویش لەگەڵ تۆ؟ پاشان بە ڕاهیبەکەی گوت: «کەوایە بۆ نەهار دێین، لە لایەن ئێمەوە سپاس لە باوکە عابید بکە.»

ڕاهیب وەڵامی دایەوە: «نانا، ئێستا ئەرکی من ئەوەیە، ئێوە بەرم بۆ خزمەت پیری خاوەن شکۆ.»

ماکسیمۆف بە دڕدۆنگییەوە گوتی: «ئێستا کەوایە خۆم ڕاست دەچم بۆ لای باوکە عابید، ئەرێ بۆ لای باوکە عابید.»

ڕاهیب بە زمانێکی پڕ لە دوو دڵییەوە گوتی: «باوکە عابید ئێستا سەرقاڵە. بەڵام هەرچۆنێک پێتان خۆشە...»

لەکاتێکدا ماکسیمۆف بە هەڵاتن دەگەڕایەوە بۆ کلێسا، میۆسۆف بە دەنگێکی بەرز گوتی: «پیرە پیاوی بێئەدەب دڵێی قڕنووە!»

فیۆدۆر پاولۆویچ گوتی: «دەڵێی (فوونسوهەن)ە[1].»

- هەر ئەوە دەزانی!؟... کوێی لە فوون سوهەن دەچێ؟ تۆ فوون سوهەنت لە کوێ دیوە؟

- وێنەکەیم دیوە. چرچ و لۆچی دەموچاوی ناڵێم، یانی لە تاریف نایە. فوون سووهەنی دووهەمە. بە قەڵافەتیدا بۆم دەرکەوت.

- ئەرێ،بە دڵنیاییەوە دەڵێم لەو بارەوە زۆر شارەزای. بەڵام وریابە فیۆدۆر پاولۆویچ، هەر ئێستا گوتی ئێمە بەڵێنیمان داوە بە ئەدەبانە هەڵسوکەوت بکەین. لە بیرت نەچێ. داوات لێدەکەم ئاگات لە خۆت بێ.

بەڵام ئەگەر گەوجییەتی بکەی، نێوانەکەمان تێکدەچێ... دیوتە چ بنیادەمێکە - مەبەستی لە ڕاهیبەکە بوو - لەڕووم هەڵنایە لەگەڵ ئەو جۆرە مرۆڤانە بچم بۆ نێو کۆڕی پیاوماقووڵان.

بزەیەکی نەرم و مەکربازانە نیشتە سەر لێوی ڕەنگ بزرکاوی ڕاهیب. بەڵام وەڵامی نەدایەوە، دیار بوو لەبەر هەستی ویقار و قورساخی ئاوا بێدەنگە. میۆسۆف زیاتر لە پێشوو تێکچوو.

میۆسۆف لە دڵ خۆیدا گوتی: «ئاخ، سەریان لە قوڕ نێن! ڕواڵەتیان بە درێژایی مێژوو ڕازاوەتەوە، بەڵام لە ژێریدا دزێوی و ڕق و هیچی و پووچی گڤەی دێ. سەر قۆزی بن ئاڵۆزن.»

---

1- لە درێژەی چیرۆکەکەدا فوون سوهەن دەناسێنم.

فیۆدۆر پاولۆویچ گوڕاندی: «ئەمەش هۆدەی پشوودانی پیر، گەیشتینێ. دەرگاکانی داخراون.»

پاشان لە هەمبەر پیاوانی ڕەسم کراو و لە سەر هەردوو تای درگاکە خاچی کێشاو کڕنۆشی برد.

ـ کاتێک لە ڕۆمی، وەک ڕۆمییەکان هەڵسوکەوت بکە. لێرە لەم حوجرەیە بیست و پێنج کەس پیاوی خودای لێیە. چاو لە یەکتر دەکەن و کاهوو دەخۆن. تەنانەت ژنێکیش لاقی لەم دەرگایە ناچێتە ژووری. ئەم خاڵەش جێگای سەرنجە. لە ڕاستیدا واشە.

لەپڕ چاوێکی لە ڕاهیب کرد و گوتی: «بەڵام بەم گوێچکانەی خۆم بیستوومە کە پیر ڕێگای بە ژنان دەدا بچنە ژووری.»

ـ ژنانی چینی بێبەش هەر ئێستا لێرەن و لەبەر ئەو هەیوانە دانیشتوون و چاوەڕوانن بچنە خزمەتی. بەڵام بۆ ژنانی دەوڵەمەند دوو هۆدە لە نزیک هەیوانەکە درووستکراوە، لە دەرەوەی حەوشەکە ـ پەنجێرەکانی لە دوورەوە دیارە ـ ئەگەر پیر لەشساخ و دڵخۆش بێ، لە ڕەهۆڵێکی نهێنییەوە کە لە حوجرەکەوە بۆ ئەو هۆدانە لێدراوە، دەچی بۆ لایان. ئەوان دایمە لە دەرەوەی حەوشەکەن، خاتوونێکی خەڵکی خارکۆف، خاتوو خۆخلاکۆف، لەگەڵ کچە نەخۆشەکەی چاوەڕوانە و لە دەرێ ڕاوەستاوە. لەوە دەچێ پیر بەڵێنیی دابێ بچێ بۆ لای. دەڵێن لەم دواییانەدا هێندە کز بووە خۆی نیشان خەڵکی نادات.

ـ دەی، دەی، کەوایە کەلوکون هەیە لە ڕێگای ئەوانەوە لە حوجرەکە بێتە دەرێ و بچێ بۆ لای ژنان. باوکی پیرۆز، پێت وانەبێ مەبەستێکی خراپم هەیە. بەڵام خۆ دەزانی لە ئاتووس نەک هەر دیداری ژنان حەرامە، بەڵکو مریشک و مێوەقەل و مانگاش...

ـ فیۆدۆر پاولۆویچ! ئاگادار بە من دەگەڕێمەوە و بە تەنیایی بەجێت دەهێڵم. بێتو منیش بڕۆم دەرتدەکەن.

«پیووتێر ئەلکساندرۆویچ! من خۆم کارم بە سەر تۆوە نییە.» لەپڕ پێی نایە حەوشەکە و هەرای کرد: «دیوتە لە چ قەڵایەکی پڕ لە گوڵاڵەسوورەدا دەژی»[2].

ئەگەرچی گوڵاڵەسوورەی لێنەبوو، بڕێکی گوڵی جوان و کەم وێنەی پایزی لێبوو کە لەملاوئەولا ڕوا بوون، دیار بوو کە دەستێکی شارەزا ئاگادارییان لێدەکا؛ شوێنی ڕسکانی گوڵ دەوری کڵێسا و نێوان گۆڕەکان بوو، ماڵێکی دارینەش کە یەکنهۆم بوو و پیر لەوێدا دەژیا، بە گوڵ ڕازابۆوە.

فیۆدۆر پاولۆویچ هەروا کە بە پلیکانەکاندا دەچووە سەرێ گوتی: «ئەرێ لە سەردەمی پیری خوالێخۆشبوو باوە وارسوونۆفیشدا بەم شێوەیە بوو؟ ئەو زاتە زۆری گوێ بەو ڕازاوەییە نەدەدا. دەیانگوت هەڵدەستا و تەنانەت ژنانیشی وەبەر گۆچان دەدا.»

ـ ڕاهیب جوابی دایەوە: «کردەوەی وارسوونۆفی پیر، بەو پیرییە جاری وابوو سەیر دەبوو. بەڵام زۆربەی ئەو قسانە گەوجانەن. ئەو هیچکات لە کەسی نەدا، ئێستاش کاکینە، ئەگەر تۆزێ مۆڵەتم بدەن، دەتاننێرمە ژوورێ.»

میۆسۆف دەرفەتی بۆ هەڵکەوت دیسان لەبەر خۆیەوە بڵێ: «فیۆدۆر پاولۆویچ، بۆ دوایین جار پێت دەڵێم. لە سەر بەڵێنی خۆت سوور بە، حاڵی بووی؟ بەئەدەب بەو پێی خوار دانەنێی، دەنا خۆت دەزانی.»

فیۆدۆر پاولۆویچ بە تەشەرەوە گوتی: «نازانم بۆ ئەوەندە کەوتوویە دڵەڕاوکێ؟ دەڵێن ئەو چاو لە چاوی هەر کەسێک بکا، تێدەگا بۆچی هاتووە. بڕوا و مەبەستی ئەوان بۆ پیاوێکی وەک ئێوەی هێژای نوێخواز و پاریسی چ گرینگایەتییەکی هەیە! پێم سەیرە.»

بەڵام میۆسۆف فریا نەکەوت وەڵامی ئەو تەشەرە بداتەوە. داوایان لێکردن بچنە ژوورێ. ئەویش، تاڕادەیەک تووڕە و ئاڵەتی، خۆی کرد بە ژووریدا و لەبەر خۆیەوە گوتی:

ـ لەخۆم دەگەم، دەزانم کە دڵم هێشاوە و ڕقم هەستاوە، لەوانەیە شەڕوقڕە سازکەم و خۆم و ئەندێشەکانم چکۆلە بکەمەوە.

---

2– ئاماژەیەکی تەوساوییە بە کتێبی پیرۆز کە دنیای ناو ناوە دەربەندی فرمێسک.

# (٢)

## پیرە حەنەکچی

ئەوان ڕاست ئەو کاتە پێیان نایە ژووریٚ، کە پیری کلێسە لە هۆدەی خەوەکەی هاتبووە دەریٚ و دەیویست بچێتە ژووری میوانەکان. دوو کەس لە ڕاهیبانی حوجرەکەش کە چاوەڕوانی پیری کلێسە بوون هاتنە ژووریٚ. یەکیان باوە کتێبدار و ئەوی دیکەیان باوە پایسی بوو کە بە وتەی زۆر کەس بیرمەندێکی زانا بوو و لەگەڵ ئەوەشدا لاوێکی لاواز و ڕیوەڵە بوو. لاوێکی کەڵەگەتیش لەویٚ بوو، کە بیست و دووساڵێکی تەمەن بوو. لە تەواوی ماوەی مشتومڕەکەشدا لە قوژبنێک ڕەق ڕاوەستا بوو. زۆر باڵابەرز بوو، ڕوخسارێکی شاد و گەشاوە و چاوانی زیت و قاوەیی و وریا و ئاگادار بوون. جل و بەرگی ئاساییی لەبەردا بوو. تەلەبە بوو و لە داهاتوودا دەبووە پیاوی ئایینی. بە هۆیەکیش لە ژێر چاوەدێری و سایەی کلێسە و برادەراندا دەژیا. قەلافەتی نیشاندەری ڕێز و حورمەت بوو، بەڵام ڕێز و حورمەت بۆ خۆی. چونکە پلە و پایەی لە خواریٚ بوو، لەگەڵ میوانەکان هاوشان نەبوو، هەر بۆیە نە سڵاوی کرد و نە کڕنۆشی برد.

باوە زووسیما هاوڕیٚ لەگەڵ ئالیووشا و مریدێک هات. دوو ڕاهیب لەبەری هەستان، بە دەنگێکی بەرز سڵاویان لێکرد، کڕنۆشیان برد و قامکیان لە زەوی خشکاند. پاشان خاچیان کێشا و دەستیان ماچکرد. پیر دەستی بەسەریاندا هێنا و هەر بە شێوەی ئەوان قامکی لە زەوی خشاند و وەڵامی ڕێز و حورمەتەکەی دانەوە و داوای لە هەردووکیان کرد تەقدیسی بکەن. ئەم ڕیٚوڕەسمە فەرمییە بە شێوەیەکی جیددی بەڕێوە چوو، کە لەگەڵ ڕۆژانیتر جیاواز بوو. بەڵام میۆسۆف لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە بەقەستی وا دەکەن،

بۆ ئەوەی کاردانەوەی لە سەر میوانەکان هەبێ، میۆسۆف لە ڕیزی پێشەوە ڕاوەستا بوو. عەسری ڕۆژی پێشوو لە سەر ئەوە ساغ بووبۆوە کە بەوپەڕی ڕێز و ئەدەبەوە بڕواتە پێشی و تەبەڕوک لە پیر وەرگرێ. چونکە لێرە دابەکە وایە، تەنانەت ئەگەر دەستیشی ماچنەکردایە، دەبوو ئەو ڕێز گرتن و بەئەدەبەوە کڕنۆش بردنە ئەنجامبدات. بەڵام کاتێ ئەم هەموو نووشتانەوە و ماچکردن و کڕنۆشەی ڕاهیبەکانی دی، خێرا بیروڕای گۆڕدرا، بەپۆز و هەوایەکی زۆرەوە، کڕنۆشی برد و ڕۆیی بۆ لای کورسیلەک. فیۆدۆر پاولۆویچیش بە لاسایی کردنەوەیەکی مەیموونانە، هەر ئەو کارەی میۆسۆفی کرد. ئیوان فیۆدۆرۆویچ بە ویقاڕ و حورمەتێکی زۆرەوە کڕنۆشی برد بەڵام دەستی بە سینگییەوە نەگرت، گاڵگانۆفیش وا تووشی خەجڵان و عەبەسران بوو تەنانەت کڕنۆشیشی نەبرد. پیر ئەو دەستەی کە بۆ تەقدیس هەڵیهێنابوو، دایخستەوە و بە ڕێزێکی زۆرەوە داوای لە هەموویان کرد دانیشن. ئالیووشا سوور هەڵگەڕابوو. هەستی بە شەرمەزاری دەکرد. پێشبینییە تاڵەکانی خەریک بوو وەدی دەهاتن.

باوە زووسیما لە سەر کورسیلەیەکی چەپرەکی لەق و لۆر دانیشت و میوانەکانی لە سەر چوار کورسیلەی چەرمینی ڕەش و کۆنە لە پاڵ دیوارەکەدا بەرەوڕووی خۆی دانیشاند. ڕاهیبەکان دانیشتن یەکیان لای درگاکەوە و ئەوی دیکەیان لەبەر پەنجێرەکە. ئالیووشا و مرید و تەلەبەکەش بە سەر پێوە ڕاوەستان. حوجرەکە زۆر گەورە نەبوو و دارودیوارەکەی کۆن و تۆزاوی بوو. هیچی تێدا نەبوو جگە لە هێندێک کەرەسەی پێویست، ئەویش هەموویان فەقیرانە و هەرزانبایی. دوو گوڵدان لەبەر پەنجێرەکە بوون، چەن وێنەی پیرۆزیش لە سووچێکی حوجرەکە بوون بەرەوڕووی پەیکەرێکی گەورە و کۆن لەنتەرێک داییسا. لە نزیک ئەو دوو وێنە پیرۆزەی دیکە کە لە شوێنێکی ڕۆشن هەڵواسرابوون، لە نزیک ئەوانیش وێنەی چەن فریشتەی جوان و هێلکەی چینی و خاچێکی کاتۆلیکی عاج کە ماتر دۆلۆرۆسا[3] لە

---

3- ماتردۆلۆرۆسا Mater Dolorosa یانی «دایکی خەمبار» مەبەست لە مریەمە.

باوەشی گرتبوو، هێندێکیش کەندەکاریی بیانی کە بە دەستی هونەرمەندانی گەورەی سەدەی ڕابردووی ئیتالیا هەڵکۆڵدرا بوون. لەپاڵ ئەو کەندەکارییە بەنرخ و هونەریانەدا چەن نەقاشیی زبر و ناحەزی ڕووسی کە وێنەی پیاوانی خودا و شەهیدان و پێشەوایانی ئایینی و... لە سەر بوو و لە بازاڕی فێڵەباز و گزیکاراندا بە چەن پارەی قەڵب و چرووک دەفرۆشران. دیوارەکانی دیکەش وێنەی چەن ئوسقۆفی ڕووسیی ئێستا و ڕابردووی پێوە بوو. میۆسۆف چاوێکی خێرای بە هەموو ئەو شتە وشک و ڕەق و تەقانەدا گێڕا و چاوی لە سەر پیر گیرسایەوە. میۆسۆف خۆی بە پیاوێکی وریا و بەڕێز دەزانی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە پەنجا ساڵی تەمەن بوو، پیاوێکی دەوڵەمەند و خوێندەوار بوو، هەر بۆیە مافی خۆیەتی خۆگر و خۆبەزلزان بێ. لە سەرەتاوە کە زووسیمای دی نەکەوتە بەر دڵی. لە ڕاستیدا شتێک لە ڕوخساری پیری کلێسەدا بوو نەک هەر میۆسۆف، لەوانەیە هیچ کەس پێی خۆش نەبێ ببینێ. پیاوێکی کوڵەبنە و کووڕ بوو، لاواز و داڵگۆشت. شەست و پێنج ساڵی تەمەن بوو، کەچی ئاوا پێچووبوو. نەخۆشی وایلیێکردبوو، دە ساڵ پیرتر دیاریی دەدا. دەموچاوێکی وردیلە و چرچولۆچی هەبوو. بەتایبەت دەوری چاوە چکۆڵە و مژمۆر و کزەکانی کە وەک دوو خاڵی ڕووناک دەدرەوشانەوە. چەند چڵەمووی سپی لە دەوری لاجانگی تێک هاڵابوون. ڕیشە نووک تیژەکەی چکۆلە و تەنک بوو. لێویشی کە لە پەستا بزەی تێدەزا باریک و قەیتانی بوو. لووتی درێژ نەبوو. بەڵام تیژ وەک دەنووکی باڵندە وابوو. میۆسۆف لەدڵ خۆیدا گوتی: «لەژێر ئەو ڕواڵەتەدا، گیانێکی بەد زات و پڕ لە هەوا و چرووکی خۆی مەلاس داوە.» لە سەر یەک پیری نەکەوتە بەر دڵ.

کاتژمێرێکی چکۆلە و هەرزان بە دیوارەکەوە بەپەلە زەنگی کاتژمێر دوازدەی لێدا و دەست پێکردنی وتووێژەکەی ڕاگەیاند.

فیۆدۆر پاولۆویچ هەرای کرد: «وەختی خۆیەتی بێکەم و زیاد، بەڵام دیمیتری فیۆدۆرۆویچی کوڕم نەهاتووە، پیری بەڕێز و پیرۆز سەبارەت بەوە

داوای لێبووردنت لێدەکەم!» (ئالیووشا بە بیستنی ئەو «پیری بەڕێز و پیرۆز»ە مووچرکێکی پێداهات و هەموو ئەندامی کەوتە لەرزین.) من خۆم ڕێز بۆ کات و بەڵێن دادەنێم، سات‌بەسات لە بیرمە و وەخت ناسینیش لە شا و گەورەپیاوان دەوەشێتەوە...»

میۆسۆف لەپڕ خۆی پێڕانەگیرا و لەبن لێوەوە منجاندی: «دەی خۆ تۆ شا نیی.»

- بەڵێ ڕاستدەکەی. من شا نیم، باوەڕ بفەرموو پیووتێر ئەلکساندرۆویچ خۆشم ئاگام لەوە هەبوو، بەڵام جاری وایە پیاو بە هەڵە قسە دەکا.»

لەناکاو خەمبار و دڵسووتاوانە گوتی: «حەزرەتی پیر، پیرە حەنەکچییەکت لە هەمبەر خۆتدا دیتووە! من خۆم بەم ناوە دەناسێنم. لەهەنتەشی ئێوەدا وەک پیرە حەنەکچی وام، مخابن، لە دەمم دەرپەڕی! خووخدەیەکی لەمێژینەیە و ئەگەر جاروبارە گەوجییەتییەک دەنوێنم، مەبەستی خراپم نییە. بۆ خۆش کردنی کۆڕ و سەرگەرم کردنی خەڵکە. پیاو دەبێ مەجلیس خۆش بێ، وا نییە؟ حەوت ساڵ لەمەوبەر لە شارێکی چکۆلە بووم و لەوێ مامەڵەم دەکرد و لەگەڵ چەن بازرگان بوومە برادەر. چووین بۆلای سەرۆکی ئاسایش، چونکە پێویست بوو بۆ کارێک چاوم پێی بکەوێ و لەگەڵ ئێمە نان بخوا. کەڵەگەت و قەڵەو و موو بۆر و مڕومۆچ بوو، مرۆڤێکی زۆر ناجسن و دێزە و لەخۆ دەرچوو بوو. ڕاست ڕۆیشتم بۆلای و وەک پیاوێکی زانا و دنیا دیتوو گوتم: «ئاغای (ئیسپڕاڤنیک)[٤] چییە؟ وەرە ببە (ناپڕاڤنیک[٥])ی ئێمە.» گوتی: «مەبەستت لە ناپڕاڤنیک چییە؟» هەر خێرا بۆم دەرکەوت تیرەکەم لەبەرد دراوە. کابرا ڕووتاڵ و تووڕە ڕاوەستا بوو. گوتم: «بۆ ڕابواردن ویستم گاڵتەیەک بکەم، چونکە ئاغای ناپراڤنیک ڕێبەری ئورکێسترا بەناوبانگەکەمانە و شتێک کە بۆ هەماهەنگیی کارەکەمان پێویستە، کەسێکە لە

---

4- وشەیەکی ڕووسیە ispriavnik یانی سەرۆکی ئاسایش هەروەها مانای «بەرژەوەندخواز» دەدا.

5- Napravnik یانی «بەڕێوەبەر» یان «ڕێبەری ئورکێسترا» I _F ناپڕاڤینک (١٩١٦ ـ ١٨٣٩) لە ئۆپێڕای مارنیسکی لە پترزبورگ ڕێبەری ئورکێسترا بوو.

چەشنی ئەو.» خۆ تێگەیشتی کە شوبهاندنەکەم زۆر بەجێ بۆ باسکردی. گوتی: «ببوورە، ناوم ئیسپراڤنیکە و ئیزن نادەم هیچ ناوێک بە ناوەکەمەوە بلکێنن.» پاشان وەرگەڕایەوە و دوور کەوتەوە. وەدوای کەوتم و هەرام لێکرد: «ڕاست دەکەی، وایە، تۆ ئیسپراڤنیکی نەک ناپڕاڤنیک.» گوتی: «نانا، چونکە بە ناپڕاڤنیک بانگت کردم، تازە ناپڕاڤینکم.» خۆ قەبوولێشتە کە ئیتر مامەڵەکەمان شێوا! هەمیشەش هەروام، هەمیشە. بەردەوام بە هۆی ئەدەبی خۆمەوە زیان بە خۆم دەگەیەنم. چەند ساڵ لەمەوبەر، بە پیاوێکی دەسەلاتدارم کوت: «ژنەکەی تۆ ختیلکەی دێ.» هەڵبەت مەبەستم سووکایەتی نەبوو. بەڵام ئەو لە منی پرسی: «مەگین تۆ ختیلکەت داوە؟» لە دڵ خۆما گوتم واچاکە بە ئەدەبانە خۆم نیشانبدەم، هەربۆیە نەمتوانی خۆ لە کوتنی «ئەرێ» ببوێرم، ئەویش هەر لەڕێوە دەستی کرد بە ختیلکەدانم. ئەم باسە زۆر لەمەوبەر ڕوویدا، بۆیە لە گێڕانەوەی شەرمەزار نیم. هەمیشە هەر ئاوا زیان بەخۆم دەگەیەنم.»

میۆسۆف بە ڕقهەستاوی لە ژێر لێوەوە بۆڵاندی: «ئێستاش خەریکی ئەو کارە دەکەی.»

باوە زووسیما بە بێدەنگی چاوی لە هەردووکیان دەکرد.

ـ ئاوا؟ پیووتێر ئەلکساندرۆویچ باوەڕ بفەرموو خۆشم لەوە ئاگادار بووم. با ئەوەش بڵێم لەگەڵ جووڵانەوەی لێوم پێشبینی ئەوەم کردبوو. هەروەها ئەوەشم پێشبینی کرد کە تۆ یەکەم کەسی ئەوەم بە گوێ هەڵدێنی. حەزرەتی پیر، هەرکاتێک دەبینم گاڵتەکەم بێئاکام دەبێ، دەڵێی هەردوو ڕوومەتم بەرەو خوارێ دادەکێشن و سوور دەبنەوە. هەست بە شەرمەزاری دەکەم. لەو کاتەوە لاو بووم و لە ماڵی دەوڵەمەندەکان ناچار بووم بۆ وەدەستهێنانی بژیوی ڕۆژانە جەفەنگ و گاڵتەجاڕی وەڕێ بخەم، هەر ئاوا بووم ـ من حەنەکچییەکی کۆنەکارم، یانی، حەزرەتی پیر، لە کاتی لەدایک بوونەوە تا ئێسا هەروا بووم. هەر دەڵێی جۆرێک شێتییە و لەگەڵمدایە. بە دڵنیاییەوە دەڵێم، دێوێکە و لە ناخمدایە. بەڵام دێوێکی چکۆڵە. دێوی بەڕاستی شوێنێکی

دیکەی بۆ خۆی دیوەتەوە. بەڵام نەک ناخی تۆ، پیووتێر ئەلکساندرۆویچ، تۆ بە کاری ئەوە نایەی دێویش لە ناختدا جێی خۆی بکاتەوە. بەڵام من ئیمانم هەیە، ئیمانم بە خودا هەیە، هەرچەن لەم دواییانەدا تووشی شک و گومان بووم. بەڵام ئێستا دادەنیشم و گوێ لە وتەی بە نرخ و پڕ لە حیکمەتی حەزرەتی پیر دەگرم. باوە زووسیما! من وەک (دیدرۆ[6])ی فەیلەسووف وام، خۆ بیستووتە دیدرۆ لە سەردەمی (مەلیکە کاترین)دا دەچێ بۆ دیدەنیی مەترانی مەزن، کاتێ پێ دەنێتە ژووری، بەبێ پێشەکی دەڵێ «خودا نییە.» مەترانی مەزن لە وەڵامیدا دەڵێ: «گەمژە لە دڵەوە نەتگوتووە خودا نییە.» ئیتر دیدرۆ لەڕێوە بە سەر کەوشەکانی مەتراندا دەکەوێ و هاوار دەکا: «ئیمان دێنم، دەبمە مەسیحی.» هەرواشی کرد. پرێنس داشکۆف و پاتیۆمکین دەبنە دایک و باوکی و بە کوڕی خۆیانی قەبووڵدەکەن.»

میۆسۆف بە دەنگێکی تووڕە و لەرزۆکەوە گوڕاندی: «فیۆدۆر پاولۆویچ، ئەوە ئیتر لە تامت دەرکرد و بۆمان تامڵ ناکرێ! دەزانی ئەوەی دەیڵێی درۆیە، ئەو چیرۆکە گەوجانەیەشت ڕاست نییە. ئەوە بۆ وادەکەی؟ ئەم هەموو گەمژە بازاڕییە چییە وەڕێت خستووە؟»

فیۆدۆر پاولۆویچ بە بڕواوە نەڕاندی: «لە سەرانسەری تەمەنمدا دەمزانی ڕاست نییە. بەڵام براکانم، با هەقیقەتەکەتان پێ بڵێم. پیری مەزن، بمبوورە، چیرۆکی ئیمان هێنانی دیدرۆم هەر ئێستا لەخۆوە داتاشی. لە پێشدا بیریشم لێنەکردبۆوە. خۆم ئەوەم سازاند بۆ ئەوەی چێژێک بە قسەکانم بدەم. پیووتێر ئەلکساندرۆویچ، بۆیە گەمژە بازاڕی و گەوجییەتی دەنوێنم کە خۆم شیرین کەم. هەرچەن جاری وایە خۆشم نازانم بۆچی وا دەکەم. سەبارەت بە دیدرۆ بڵێم چی تەنانەت «گەمژە لە دڵەوە نەتگوتووە» کاتێ لاو بووم، بیست جارم لە کەسانی ناودار و گەورە پیاوی ئێرە بیستووە پیووتێر ئەلکساندرۆویچ، بیستوومە پوورت ئەو چیرۆکەی دەگێڕایەوە . هەموو خەڵک هەتا ئەمڕۆ لە

---

6- دیدرۆ (١٧١٣-١٧٨٤) نووسەر و فەیلەسووفی ماتریالیستی فەڕەنسی، ساڵی ١٧٧٣ بە ماوەی پێنچ مانگ هاتە ڕووسیا و لە کۆشکی کاترینی دووهەم، مەلیکەی ڕووسیا مایەوە.

سەر ئەو باوەڕەن کە دیدرۆی کافر هاتبوو لەگەڵ مەترانی مەزن سەبارەت بە خودا دەمەتەقێ بکا....»

میۆسۆف هێندەی زۆر بۆهات، تاقەتی لێبڕا و هەستا سەرپێ، قەڵس بوو و دەیزانی بۆتە مەسخەرەی دەستی فیۆدۆر پاولۆویچ و بەجارێ شووی لێهەڵکێشاوە.

ئەوەی لە حوجرەکەدا دەقەوما، بەڕاستی جێی باوەڕ نەبوو. چونکا لە چل ـ پەنجا ساڵی ڕابردوودا، لەسەردەمی پیری پێشووەوە، زیارەتکەران بەبێ هەستی ئەدەب و حورمەت پێیان نەنابووە حوجرەکەوە هەرکەس کە ڕێگای پێدەدرا بچێتە حوجرەکەوە هەستیدەکرد چاوی لە سەر هەڵناگیرێ و تەواوی هەڵسوکەوتی لە ژێر چاوەدێری دایە. لە ماوەی دانیشتنەکەدا زۆر کەس کە لە سەر چۆک دادەنیشت لە جێی خۆی جووڵەی نەدەکرد. لە نێو زیارەتکەراندا مرۆڤی خاوەن پلە و پایە و بیرمەندیش وەبەر چاو دەکەوتن. تەنانەت چەن کەسی ئازادیخواز و ڕووناکبیریش، کە لەبەر کونچکاوی یان هەر هۆیەکی دیکە هاتبوون. بەڵام هەموویان بەڕێز و حورمەتەوە هەڵسوکەوتیان دەکرد، چونکە لێرە حیسابی پارە لە گۆڕێدا نەبوو، بەڵکو ئەوین و خۆشەویستی لە لایەک و تۆبە و پاڕانەوە بۆ لاچوونی گیر و گرفتی ڕۆحی و کەندوکۆسپەکانی ژیان لە لایەکی دیکە. بۆیە قەشمەرجاڕیی فیۆدۆر پاولۆویچ، وەک شکاندنی حورمەتی ئەو شوێنە پیرۆزە دەهاتە ئەژمار. دانیشتوانی حوجرەکە، یان لانیکەم تاقمێک لە دانیشتوانی تووشی سەرسوڕمان کردبوو. ڕاهیب و مریدەکان هەروا لە جێی خۆیان چەقیبوون، بە گیان و دڵ چاوەڕێ بوون گوێیان لە فەرمایشتەکانی پیر بێ. بەڵام ئەوانیش وەک میۆسۆف هێندەی نەمابوو هەستنە سەرپێ. ئالیووشا ملی بەخوزدا گرتبوو و تۆزێکی مابوو دەست بکا بە گریان. ئەوەی لە هەموو شتێک ناخۆشتر بوو بەلای ئالیووشاوە ئەوە بوو، کە ئیوان فیۆدۆرۆویچی برای، کە تەواوی هیوای بەو بوو، دەیتوانی باوکی خاوکاتەوە و نەهێڵێ قسە بکا، سەری داخستبوو و جووڵەی نەدەکرد، وادیار بوو بە تامەزرۆییەوە

چاوەڕێ بوو بزانێ ئاکامی کارەکە بە کوێ دەگا، هەرچەند کە خۆی کاری بەو باس و کۆبۆنەوەیە نەبوو. ئالیووشا نەیدەوێرا چاو لە ڕاکیتین بکا. ڕاکیتین تەلەبەیەک بوو کە ئالیووشا لە نزیکەوە دەیناسی و لە بیر و لە فکری ئاگادار بوو. (چونکە لەو کلێسەیەدا ئالیووشا تەنیا کەسێک بوو کە ئاگاداری بیر و فکری ڕاکیتین بوو.)

میۆسۆف ڕووی لە باوە زووسیما کرد و گوتی: «بمبوورە حەزرەتی پیر، چونکە منیش لەم گەوجییەتییە پڕ لە شوورەیییەدا بەشدارم. من پێموابوو تەنانەت مرۆڤێکی وەک فیۆدۆر پاولۆویچیش لە کاتی دیدار لەگەڵ کەسایەتییەکی شکۆمەندی وەک ئێوەدا ئەرکی خۆی دەزانێ، بەڵام بە هەڵە چووم. نەمدەزانی وای لێدێ لەبەر هەڵە و گەوجییەتیی ئەو دەبێ داوای لێبوردن بکەم.»

پیووتێر ئەلکساندرۆویچ لەوە زیاتر قسەی بۆ نەهات و لە داخانا هەستا بڕواتە دەرێ.

«تکات لێدەکەم خۆت شلوێ مەکە.»پیری کلێسە هەستایە سەر لاقە لاوازەکانی و دەستی پیووتێر ئەلکساندرۆویچی گرت و لە جێگای خۆی داینیشاندەوە. «تکاتان لێدەکەم خۆتان شلوێ مەکەن. بە تایبەت داوا لە ئێوە دەکەم میوانی من بن.» لەگەڵ ئەوەی دەستی بە سینگییەوە گرتبوو گەڕاوە و لە سەر کورسیلە چکۆلەکەی دانیشتەوە.

فیۆدۆر پاولۆویچ لە ناکاو گوڕاندی: «ئەی پیری مەزن، خۆتان بفەرموون ئایا بەو نەقڵانە من دەبمە هۆی خاترگەرد گرتنی ئێوە؟» بە هەردوو دەستیشی کەمەی کورسیلکەی گرتبوو و دەتگوت لەگەڵ بیستنی وەڵامی «ئەرێ» ئامادەی هەستانە.

پیری کلێسە بە زمانێکی شیرین گوتی: «تکاتان لێدەکەم، تکاتان لێدەکەم خۆتان شلوێ مەکەن، دڵی خۆتان ناڕەحەت مەکەن، هیچ نەبووە، ئێرەماڵی خۆتانە. ئەوەندەش خۆتان بە شەرمەزار مەزانن، چونکە ئەوە زیاتر دەبێتە هۆی گیروگرفت.»

- ئێرە بەماڵی خۆم بزانم؟ سروشتییش هەڵسوکەوت بکەم؟ ئەوە لە من ناوەشێتەوە، بەڵام بە گیان و دڵ قەبووڵمە و زۆریشت سپاس دەکەم. دەزانیچی باوکی مەزن، چاکتر وایە داوای ئەوەم لێنەکەی بە شێوەیەکی سروشتی هەڵسوکەوت بکەم و ئاگام لە خۆم بێ، چونکە جێی مەترسییە... من خۆشم ناوێرم ئەو ئیزنە بە خۆم بدەم، بەقەد بەڕەی خۆم پێ ڕابکێشم. لەبەر خۆتان وریاییتان پێدەدەم. ڕاستت دەوێ، من هێشتا نیوەم لە ژێر تەمومژی بێبڕواییدایە، ئەگەرچی هێندێ کەس هەن بەوە دڵخۆشن لە لای تۆ بە خراپە باسم بکەن. میۆسۆف مەبەستم تۆی. بەڵام ئێوە ئەی زاتی پیرۆز، لێمگەڕێن بیدرکێنم. لە خۆشیی دیداری ئێوە خەریکە هەڵدەفڕم.

هەستا سەرپێ و لەگەڵ دەست هەڵێنان گوتی: «ڕەحمەت لەو دایکە پەروەردەی کردی لە هەناویدا و مەمکی نایە دەمت. ڕەحمەت لە شیرت. تۆ هەر ئێستا گوتت: «لەخۆتان شەرمەزار مەبن کە هۆی تەواوی کەندوکۆسپەکانە.» بژیی قسەکەت پڕ بە پێست بوو. لە ویستی من گەیشتی. لە ڕاستیدا کاتێ خەڵکی دەبینم، هەمیشە هەست دەکەم لە هەموو کەس سووک و چرووکترم و خەڵکیش وەک قەشمەری و حەنەکچی چاوم لێدەکەن. بۆیە دەڵێم: «چاکتر وایە قەشمەرهجاڕی ساز کەم. لەبیر و بڕوای ئێوە ناترسم، چونکە تەواوی ئێوە لە من خراپترن!» هەر بۆیە من حەنەکچیم. حەزرەتی پیر! لەبەر شەرمەزارییە، شەرمەزاری و هەستیاریی زۆر تووشی سەرچڵیم دەکا. ئەگەر بمزانیبایە هەموو وەک پیاوێکی زانا و دڵۆڤان چاوم لێدەکەن، خودا دەزانێ دەبوومە چ پیاو چاکێک!» لە ناکاو بە چۆکدا هات. «ئەی پیری مەزن! بۆ ئەوەی بگەم بە ژیانێکی پاک و هەرمان دەبێ چبکەم؟» تەنانەت ئێستاش زۆر دژوار بوو بڵێین گاڵتە دەکا. یان کەوتۆتە ژێر کاریگەریی شوێنەکەوە.

باوە زووسیما سەری هەڵێنا و چاوێکی لێکرد و بە زەردەخەنەوە گوتی:

- لە مێژە تێگەیشتووی دەبێ چبکەی، بە ڕادەی تەواو خاوەن ئاوەزی. تێگەیشتووی، ئیزن بە سەرخۆشی و قسەی هەلەقمەلەق و هەوەس مەدە. لە

هەموو شتێک گرینگتر ئاشقی ماڵی دنیا مەبە. دەرگای مەیخانەکانت داخە. ئەگەر ناتوانی دەرگای هەموویان داخەی، لانیکەم دوو سێ دانەیان. لە هەموو ئەوانەش گرینگتر ـ درۆ مەکە.

ـ سەبارەت بە دیدرۆ دەفەرموون درۆ نەکەم؟

ـ نا، سەبارەت بە دیدرۆ نا. لە هەموو گرینگتر درۆ لەگەڵ خۆت مەکە. کەسێ کە درۆ لەگەڵ خۆی دەکا و گوێ لە درۆی خۆی دەگرێ، گرێ کوێرە دەکەوێتە ژیانییەوە و حەقیقەتی ناخ و دەور و پشتی خۆی بۆ لە یەکتر جیا نابێتەوە. هەر بۆیە ناتوانێ ڕێز لە خۆی و لە خەڵکی بگرێ. بە نەبوونی ڕێز، خۆشەویستیش لە دڵیدا نامێنێ و بۆ سەرقاڵ کردنی خۆی و خۆدزینەوە لە خۆشەویستی پەنا دەبا بۆ هەوەس و تام و چێژی تاڵ و توون. لەبەر سووک و چرووکی تووشی گەڵحۆیی و گەوجییەتی دەبێ، هەمووشی بەهۆی درۆ کردنی بەردەوام لەگەڵ خۆی و خەڵکیدا پێک دێ. کەسێ کە درۆ لەگەڵ خۆی دەکا، زۆر ساناتر لە خەڵکی سووکایەتیی پێدەکرێ. دەزانی خۆ جاری وایە سووکایەتی پێکران هێندە خۆشە مرۆڤ کەیفی پێدەکا، مەگین نا؟ کەسێک لەوانەیە بزانێ کە هیچ کەس سووکایەتیی پێنەکردووە، بەڵام سووکایەتیی بۆخۆی داهێناوە. درۆی کردووە و شووی لێهەڵکێشاوە تاکو بە داهێنەری بزانن، بە وشەیەکەوە نووساوە و لەکا کێوێکی ساز کردووە. ـ خۆی ئەوە دەزانێ، لەگەڵ ئەوەشدا، یەکەم کەسە کە سووکایەتی پێکران قەبووڵدەکا و ئەوەندەش بە جاڕز بوون و ڕەشبینی شادە، هەست بە چێژێکی گەورە دەکا. دەکەوێتە سەر ڕێگای ڕاستەقینەی ڕق و تووڕەیی. بەڵام تکاتان لێدەکەم، کێشە و دەمقڕە وەلانێن، چونکە ئەوەش خولق‌وخوویەکی فیڵاوییە....

– ئەی پیری پیرۆز! بێنە دەستت با ماچیبکەم.

فیۆدۆر پاولۆویچ هەستا پێ و شەققەی ماچی لە دەستە وردیلەکەی پیر هەستاند. «حەز بە سووکایەتی پێکران خۆشە. ئەوەندەت جوان و بەڕێوجێ فەرموو، کە تا ئێستا نەمبیستبوو. بەڵێ لە هەموو ماوەی تەمەنمدا سووکایەتیم پێکراوە، لەبەر ئەوەی خۆم شاد و دڵخۆش بکەم. سووکایەتی

پێکران لە بواری هونەریدا، چونکە هێندێ جار سووکایەتی پێکران ئەوەندەی جوان و بەرچاوە، سەد هێندە خۆش و شیرینە. پیری مەزن! ئەوەت لەبیر چووبوو جوان و بەرچاوە! ئەوە بە زەینم دەسپێرم و قەتم لەبیر ناچێ! بەڵام لە ماوەی تەمەنمدا هەموو ڕۆژ و هەموو ساتێک درۆم کردووە، درۆی وام دەکرد بە حەواوە دەفڕی. لە ڕاستیدا من درۆم و باوکی درۆیان. چڵدرۆی وەک من هەر نییە و هەر ئەوەشم بەسە. ئەی فریشتە دڵۆڤانەکەم! ڕەنگە هێندێ جار باسی دیدرۆ بکەم، دیدرۆ هیچ زیانێکی بە نێو چاوانەوە نەبوو. ڕەنگە جاری وایە وشەیەک ئاوری لێهەڵاییسێ و خوێنی پێوەبێ. پیری مەزن، خەریک بوو لە بیرم دەچۆوە، هەرچەن دوو ساڵە پێوەبووم بێم بۆ ئێرە و پرسیارێکت لێبکەم و شتێکم بۆ ڕوون بێتەوە. تۆخوا بەو پیووتێر ئەلکساندرۆویچە بڵێ نەپەڕێتە نێو قسەکانم. پرسیارەکەم ئەمەیە: ئەی حەزرەتی پیر، ئایا ئەم ڕەوایەتە ڕاستە کە لە جێگایەکی «شەرحی حاڵی پیاوچاکان»دا هاتووە کە پیاوێکی خودا لەبەر ئیمانی شەهید دەبێ، کاتێ سەری دەبڕن هەڵدەستێتە سەرپێ. سەری خۆی هەڵدەگرێ و «بەڕێز و حورمەتەوە ماچیدەکا» بە دەستییەوە دەگرێ و ڕێگایەکی زۆر دوور دەبڕێ. باوکی هێژا، ئایا ئەوە ڕاستە یان نا؟

پیر گوتی: «نا، ڕاست نییە.»

کتێبداری کلێسە گوتی: «شتێکی وا لە هیچ لاپەڕەیەکی «شەرحی حاڵی پیاوچاکان»دا نەهاتووە. ئەوە سەبارەت بە کامە پیاوی خودا دەگێڕنەوە.»

ـ نازانم کام پیاوی خودا. نازانم و ناتوانم بیڵێم. فریوم خوارد، ئەو ڕەوایەتەیان بە درۆ پێ گوتووم. ئەوەم بیستووە و دەزانی لە کێم بیستووە؟ هەر لەم پیووتێر ئەلکساندرۆویچ میۆسۆفە، کە ئێستا لە داخی دیدرۆ ئاوا تووڕە و ئاڵەتی بووە. هەر ئەو بوو ئەو ڕەوایەتەی بۆ گێڕامەوە.

ـ قەتم بە تۆ نەگوتووە. من هەر قەتم قسە لەگەڵ تۆ نەکردووە.

ـ ڕاستە کە بە خۆمت نەگوتووە، بەڵام لە کۆڕێکدا گێڕاتەوە منیش لەوێ بووم. سێ ساڵ لەمەوبەر بوو. پێم گوتی کە چۆن بەو ڕەوایەتە قۆڕە ئیمانت

لەق کردووم. تۆ هیچت لەو بارەوە نەدەزانی. بەڵام ئەو کاتە بە ئیمانێکی لەق و لاوازەوە چوومەوە بۆ ماڵێ و لەو کاتەوە ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ ئیمانم لاواز و لاوازتر بوو. ئەرێ، پیوتێر ئەلکساندرۆویچ، تۆ بوویە هۆی ڕووخانی ئیمانم، نەک دیدرۆ.

فیۆدۆر پاولۆویچ دڵی پڕ بوو دەستیکرد بە گریان. بەڵام دانیشتوانی کۆڕەکە وەک ڕۆژ لێیان ڕوون بوو کە دیسان خەریکی ڕۆڵگێڕانە. لەگەڵ ئەوەشدا بە قسەکانی، میۆسۆفی تەزاند.

پیوتێر ئەلکساندرۆویچ میۆسۆف لە بن لێوەوە گوتی: «ئەوە قۆڕیاتە، هەمووی قۆڕیاتە. گریمان ئەو قسەیەشم کردبێ... بەڵام خۆ ئەو قسەیەم بۆ تۆ نەکردووە. منیش بۆیان گێڕامەوە. لە پاریس کابرایەکی فەڕەنسی بۆی گێڕامەوە. دەیگوت لە ڕووی کتێبی «شەرحی حاڵی پیاوچاکان»ەوە لەڕێوڕەسمەکانی ئێمەدا دەیخوێننەوە. پیاوێکی بیرمەند و زانا بوو. لە زانستی ماتماتێکی ڕووسیدا متالای تایبەتی بووبوو و ساڵانێکی زۆر لە ڕووسیا ژیابوو... خۆم شەرحی حاڵی پیاوچاکانم نەخوێندۆتەوە نەشم ویستووە بیخوێنمەوە... لە سەر سفرە باسی زۆر شت دەکرێ، ئەو کاتە خەریکی نان خواردن بووین.»

فیۆدۆر پاولۆویچ کە لاسایی میۆسۆفی دەکردەوە، گوتی: «بەڵێ تۆ ئەو کاتە خەریکی نان خواردن بووی، بۆیە من ئیمانی خۆم دۆڕاند!»

میۆسۆف دەیویست بگوڕێنێ: «بۆ ئیمانی تۆ مێشێکیشم میوان نییە،» بەڵام دانی بەخۆیدا گرت و بە ڕقەوە گوتی: «دەست لە هەر شتێ بدەی گڵاوی دەکەی.»

پیر لە ناکاو هەستا سەرپێ و لەگەڵ ئەوەی ڕووی لە هەموو میوانەکان بوو، گوتی: «کاکینە بمبوورن من دەبێ چەن دەقیقەیەک بەجێتان بێڵم. ئەو زیارەتکەرانەی بەر لە ئێوە هاتوون چاوەڕوانمن.» پاشان ڕووی لە فیۆدۆر پاولۆویچ کرد و بە بزەیەکەوە گوتی: «ئیتر لەمەولا درۆ مەکە.» لە حوجرەکە چووە دەرێ. ئالیووشا و مریدە تازەکە بەدوایدا دەرپەڕینە دەرێ. تاکو کاتی

چوونە خوارێ لە پلیکانەکان یارمەتیی بدەن. ئالیووشا هەناسەی سوار بووبوو، پێی خۆش بوو لەو شوێنە دوور کەوتۆتەوە. بەوەش زۆر شاد بوو باوە زووسیما توورە نەبوو و سووکایەتیی پێنەکراوە. پیر دەڕۆیی بەرەو هەیوانی حوجرەکە تاکو تۆبەی ئەو خەڵکە چاوەڕوانەی ئەوێ دادا. بەڵام فیۆدۆر پاولۆویچ بەدوایدا هاتە دەرێ و پێداگریی دەکرد کە نابێ پیر لە حوجرەکە بڕواتە دەرێ.

بە دڵپڕییەوە هاواری کرد: «ئەی مرۆڤی پیرۆز! ئیزنم بدە جارێکی دیکە دەستت ڕاموسم. لەگەڵ ئێوە دەمتوانی بە دڵی خۆم قسە بکەم و ڕێگای ڕاست بدۆزمەوە. پێتوایە هەمیشە ئاوا درۆ دەکەم و خۆم دەکەمە قەشمەری! باوەڕ بفەرموو لە تەواوی ئەم ماوەیەدا بەقەستی وام دەکرد بۆ ئەوەی ئێوە تاقیبکەمەوە. لە تەواوی ئەم ماوەیەدا دەمویست ئێوە تاقیبکەمەوە و بزانم دەتوانم لەگەڵ ئێوە ڕێکبکەوم یان بزانم لەپاڵ غرووری ئێوەدا شوێنێک بۆ خاکەڕاییی من هەیە؟ دەتوانم سوێند بخۆم کە پیاو دەتوانێ زۆر بەسانایی لەگەڵتان ڕێکبکەوێ! بەڵام ئێستا بێدەنگ دەبم، ئیتر زمانم ناگەڕێ. لە سەر کورسیلەکەم دادەنیشم و ورتەم لێوە نایە. با ئیتر پیووتێر ئەلکساندرۆویچ میۆسۆف قسە بکا. هەتاکو دە دەقیقە با بە ئیشتیای دڵی خۆی وەک پیاوماقووڵی ئەم کۆڕە ئەسپی خۆی تاو دا.»

# (٣)

## ژنانی ئیمانداری لادێیی

لە نزیک بەرهەیوانە دارینەکەی خوارێ، بەرەوڕووی دیواری دەرەوەی کلێسەکە نزیکەی بیست ژنی گوندنشین ڕاوەستابوون، پێیان گوتبوون پیر لە حوجرەکە دێتە دەرێ. دوو ژن یانی خاتوو خۆخلاکۆف و کچەکەی، خۆیان گەیاندبووە بەر هەیوانەکە و چاوەڕوانی پیری کلێسە بوون، بەڵام لە لایەکی بەرهەیوانەکە ماتڵ بوون کە تایبەتی ژنانی خاوەن شکۆ و سەرەژنان بوو.

خاتوو خۆخلاکۆف ژنێکی دەوڵەمەند بوو، هەروا جوان و جحێڵ و دڵڕفێن بوو و هەمیشەش جلوبەرگی جوان و ڕێک و پێکی لەبەر دەکرد. تۆزێ ڕەنگ پەریو بوو، بەڵام چاوی هەروا گەش و ڕەش و جوان بوون. سی و سێ ساڵی تەمەن بوو و پێنج ساڵ بوو بووبووە بێوەژن. کچەکەشی، کیژۆڵەیەکی چاردە ساڵانی مجرۆ بوو. بەستەزمانە شەش مانگ بوو نەیتوانیبوو بەڕێدا بڕوا. بە کورسیلەی تەگەردار بەملاوئەولادا دەیانگێڕا. دەموچاوێکی چکۆڵە و جوانی هەبوو. بە هۆی نەخۆشیەوە تا ڕادەیەک وردیلە بوو، بەڵام شاد و دڵخۆش دەهاتە بەرچاو. ترووسکەی بزۆزی لە چاوی ڕەش و گەورە و برژۆڵە درێژەکانیدا دیار بوو. دایکی لە بەهارێوە بڕیاری دابوو بیبا بۆ دەرەوەی وڵات. بەڵام سێ مانگەی هاوین کاروباری ملکەکەیان دەرفەتی پێ نەدابوون. حەوتوویەک بوو لەم شارەی ئێمە بوون، هەڵبەت بۆ کاری خۆیان هاتبوون، نەک بۆ زیارەت. بەڵام جارێک، سێ ڕۆژ لەمەوبەر چووبوونە زیارەتی باوە زووسیما. هەرچەند دەیانزانی پیر زۆر بە دەگمەن چاوی بە خەڵک دەکەوێ. کەچی دیسان هاتبوونەوە و ئیسەرەمیان دەکرد. «سەعادەتی زیارەتی ئەو پیرە مەزن و شیفادەرەیان بە نسیب بێ.»

خاتوو خۆخلاکۆف لە پەنا کورسیلەی تەگەرداری کچەکەی لە سەر کورسیلەیەک دانیشتبوو و دوو هەنگاو لەولای ئەوەوە ڕاهیبێکی پیر

ڕاوەستابوو. ڕاهیبی کلێساکەی ئێمە نەبوو، زیارەتکەرێک بوو لە یەکێک لە کلیسا گومناوەکانی باکوورەوە هاتبوو. ئەویش دەیویست لە سەر دەستی پیردا تۆبە بکا و تەبەڕوک ورەگریَ.

بەڵام باوە زووسیما، هەرکە پێی نایە بەرهەیوانەکە، ڕاست ڕۆیشت بۆ لای ژنە گوندنشینەکان، هەموویان لەبەر ئەو سیَ پلیکانەی بۆ هەیوانەکە سەردەکەوت کۆزیلکەیان بەستبوو. باوە زووسیما لە سەر پلیکانی سەروو ڕاوەستا، خاچەکەی ملی ئەمبارەوبار کرد و دەستیکرد بە تەقدیس کردنی ئەو ژنانەی لە دەوری ئاپۆرەیان دابوو. ژنێکی جندۆکە دەست لێوەشاندوو هاتە پێشی. ئەو ژنە هەرکە چاوی بە پیر کەوت، دەستیکرد بە قیژاندن و جینگڵدان، دەتگوت ژان گرتوویە. پیر خاچەکەی بە نێوچاوانیدا هێنا و دوعای بەسەردا خوێند و ژنە کتوپڕ چاک بۆوە و داسەکنا.

نازانم ئێستا چۆنە، بەڵام بە منداڵی زۆرم لەو ژنە جندۆکە دیتووانە لە گوند و کلیسەکان دەدی و گوێم لە دەنگیان بوو. ئەوانیان بۆ ڕێوڕەسمەکان دەهێنا، دەیانقیژاند یان وەک سەگ دەیاننووزاند و لە هەموو لایەکی کلێسەکەوە دەنگیان دەبیسترا. بەڵام کاتێک ڕیَوڕەسمی زیارەت بەڕێوە دەچوو، دەیانبردن بۆ ئەو زیارەتە، لە ناکاو شێتییەکەیان لە سەر دەپەڕی و ژنانی نەخۆش هەتا ماوەیەکی زۆر بە تەواوی چاک دەبوونەوە. ئەو شتەش زۆری شوێن لە سەر منداڵیی من دانابوو و لە دڵەوە خۆشم دەویست. بەڵام پاشان لە جیرانە لادێییەکان و مامۆستاکانی شارییم بیست «جندۆکە دەست لێوەشاندوو» جۆرێک دەغەڵی و خۆ نەخۆش خستن بوو بۆ خۆ لە کار دزینەوە. ئەگەر بە شێوەیەکی باش و بەردەوام وەدوای بکەوتنایە زوو چارەسەر دەکرا. بۆ سەلماندنی ئەم خاڵەش نەقڵ و حەقایەتی جۆراوجۆر دەگێڕنەوە. بەڵام پاشان بە سەر سوڕمانەوە لە پزیشکە پسپۆڕەکان فێر بووم کە ئەم ئازارە خۆ نەخۆش خستن نییە و بەڵکوو نەخۆشێکی زۆر قورسە و زیاتر تووشی ژنان دەبیَ. بەتایبەت لە نێو ئێمەدا لە ڕووسیا هەموو جێیەکی داگرتووە. بەڵام زۆرتر لە نێو ژنانی گوندنشین و چینی خوارووی کۆمەڵدا وەبەر چاو دەکەویَ.

پێیان گوتم نەخۆشیەکە بەهۆی کاری تاقەتپڕووکین و ژانی منداڵ بوونی ناسروشتی و بێ مامانییەوە سەرهەڵدەدا. یان بەهۆی دواکەوتوویی خێزان و چەرمەسەری و بێدەرەتانی و لێدانەوەیە، کە هێندێ لە ژنان بەرگەی ناگرن. چاکبوونەوەی سەیر و خێرای ژنی شێت ئەوەیە زوو لە کاتی خۆیدا بیبەن بۆ بەجێهێنانی فەرزی پیرۆز، کە پێیان گوتم هەموو فێڵ و تەڵەکەی پیاوە ئایینییەکانە و خۆی پێوە ڕادەنێن، دەنا شتێکی زۆر سروشتییە. لەو کاتەدا ژنە نەخۆشەکەش و ئەو کەسەش کە دەچووە ژێر پیلی و دەیبرد بۆ شوێنە پیرۆزەکە بڕوایەکی قورس و قایمیان بوو کە بە هاتنی ئەو شوێنە و کڕنۆش و بەجێهێنانی فەرزی پیرۆز «ئەوانگەل» کە خۆیان خزاندۆتە ناخییەوە، دێنە دەرێ و هەڵدێن. هەر لەبەر ئەوە بوو کاتێ ژنە کڕنۆشی دەبرد تەواوی گیانی وەلەرزین دەکەوت و ڕەنگی هەڵدەبزڕکا، دوای ماوەیەک چاوەڕوانی مۆجزەی شیفا دەردەکەوت، بە هۆی ئیمان و باوەڕەوە ئازارەکەی لەکۆڵ دەکەوت و هەڵدەستا سەرپێ و مۆجزەکە کاری خۆی دەکرد. هەر ئێستاش کاتێ پیری کلێسە خاچەکەی بە گیانی ئەو ژنە نەخۆشەدا هێنا، هەروای لێهات.

زۆربەی ژنانی نێو ئاپۆرەکە، بە دیتنی ئەو دیمەنە، کەوتنە ژێر کاریگەریی پیر، دڵیان پڕ بوو و فرمێسک بە چاویاندا هاتە خوارێ. هێندێکیان هەڕایان کردە بەر دەمی پیر و شاقەلی عەباکەیان ماچدەکرد، هێندێکیشیان دەلۆرانەوە. ئەویش هەموویانی تەقدیسکرد و لەگەڵ چەند کەسیان قسەیکرد. ژنە شێتەکەی دەناسی. لە گوندێکی چوار کیلومەتریی کلێسەکەوە دەهات و بەرلەوەش چەن جاری دیکە هێنابوویان.

«ئەم ژنەیان لە ڕێگایەکی دوورەوە هاتووە.» ئاماژەی بە ژنێکی جحێڵ کرد کە زۆر کز و لاواز بوو. دەموچاوی وا تاوەسووت بووبوو ڕەش داگەڕابوو. ئەو ژنە چۆکی دادابوو و چاوی لە پیری کلێسە بڕیبوو و شتێکی نزیک بە شێتی لە چاویدا دیار بوو.

«لەو دوور دوورانەوە، باوە، لەو دوور دوورانەوە! لە دووسەت کیلۆمەتریی ئێرەوە. لەو دوور دوورانەوە، باوە لەو دوور دوورانەوە!» ژنە

دەستیکرد بە گریان، دەتگوت وایلۆک دەچڕێ، سەری بەملاوئەولادا دەلەقاند و ڕوومەتی لە سەر لەپی دەستی دانابوو.

لەنێو گوندنشینەکاندا تووشی زۆر خەم و ئازاری قورس و لەمێژینە دەبین، کە خۆی وەدەر ناخات و بێدەنگە، لەناخدا قەتیس ماوە. بەڵام خەمی وایە هەڵدەچێ، هەرخێرا دەبێتە لافاوی فرمێسک و بە ڕێگای گریان و کوڕووزانەوەدا خۆی دەرباز دەکا. ئەویش بەتایبەت لە نێو ژناندا بەرچاوە. بەڵام ئەو خەمەش لە خەمی قەتیس ماوی ناخ سووکتر نییە. گریان و ڕۆڕۆ لە جێگایەک دڵ هێور دەکاتەوە کە دڵ بەجارێ گڕی خەمی تێبەر بووبێ. لە خەفەتی ئاوادا هیوای ئارام بوونەوە لە گۆڕێدا نییە، بتەوێ و نەتەوێ دەبێ لەگەڵی بسازێی. گریان و ڕۆڕۆی زۆریش لەوەوە سەرچاوە دەگرێ کە جارێکیتر برینەکەت بکولێتەوە.

باوە زووسیما زۆر سەیر چاوی لێکرد و گوتی: «لەچینی بازرگانانی؟»

ـ خەڵکی شارین، باوە، شار، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە شاری دەژین هەروەک لادێیی واین. حەزرەتی پیر، هاتووم بۆ زیارەتت! تاریفی تۆمان بیست، باوە، تاریفی تۆمان بیست. هاتووم بۆ زیارەتی ئێوە. چوومە سێ کلێسە، بەڵام پێیان گوتم: «بچۆ بۆ ناستازیا، برۆ بۆلای ئەوان.» یانی بێم بۆ لای ئێوە، لە دەورت گەڕێم. ئەوە هاتووم، دوێنێ کۆڕی پرسەمان بوو، ئەمرۆش ئەوە هاتووم بۆ خزمەت ئێوە.

ـ بۆ دەگریی؟

ـ باوەگیان بۆ کوڕەکەم دەگریم. سێ ساڵانە بوو، سێ ساڵانە. سێ ساڵ و سێ مانگ. باوە، بۆ کوڕەکەم دەگریم، بۆ کوڕەکەم. جەرگم سووتاوە، باوە! هەر ئەو منداڵەم بۆ مابۆوە. چوار منداڵمان بوو، من و نیکیتا، بەڵام ئێستا منداڵمان نییە، هەموویان مردن. سێ دانەکەی دیکەیانم ناشت ئەوەندەیان بۆ نەگریام، بەڵام ئێستا کە دوایین دانەیانم مردووە، لە دڵم دەرناچێ. ناتوانم لەبیری بەرمەوە. دەڵێی هەمیشە لەبەر چاوم ڕاوەستاوە. وەختە دڵم بتۆقێ. کاتێ چاو لە کراسە چکۆلەکەی و کەوشە چکۆلەکانی و جلوبەرگەکانی دەکەم

وەختە شێت بم. هەموو ئەو شتانەی لە پاشی بەجێماوە. هەموو شتە چکۆلەکانی دێنم و بە سەریاندا دەگریم. بە نیکیتای مێردمم گوت ئیزنم بدا بێم بۆ زیارەتت، مێردەکەم داشقەچییە. هەژار و دەستەنگ نییە، باوە، ئەسپ و داشقەی خۆمانە. هەمووی هی خۆمانە، بەڵام بەکاری چی دێ؟ ئێستا کە دوورم لە نیکیتا، دەزانم دەستیکردووە بە ئارەق خواردنەوە. ئێستا بیر لە ئەو ناکەمەوە. سێ مانگە ماڵەکەم بەجێهێشتووە و ڕۆیشتووم. لەبیر خۆشم بردۆتەوە. هەموو شتێکم لەبیر بردۆتەوە. نامەوێ وەبیرم بێننەوە. ئێستا ژیانی ئێمە چیی بە سەر دێ؟ کاری خۆمم لەگەڵ ئەودا یەکلایی کردۆتەوە، یەکلایی. لەگەڵ هەموویان یەکلاییم کردۆتەوە. مێشێکیشم میوان نییە.

پیر گوتی: «گوێ بگرە دایکەکەم. جارێکیان زەمانی زوو پیاوێکی خودا لە هیکل[7] دایکێکی دی کە وەک تۆ بۆ منداڵەکەی دەگریا، بۆ منداڵە تاقانەکەی کە خودا بردبوویەوە، دەگریا. پیاوی خودا پێیگوت: «مەگین نازانی ئەو منداڵانە لە بارەگای خودادا چەندە جەسوور و بێباکن؟ لە تەواوی ئاسماناندا کەس لەوان جەسوورتر نییە. دەڵێن: «خودایە، تۆ ژیانت بە ئێمە بەخشی و هێشتا بە جوانی نەماندیبوو لێت ساندینەوە.» بەو شێوە بێباکانەیە ئەوەندە دەپرسن و دەپرسنەوە کە خودا دەیانکاتە فریشتە و خاوەن شکۆ. کەوایە، دایکەکەم تۆش بەجێی ئەوەی گریان و ڕۆڕۆ بکەی، شادی بکە و دڵخۆش بە. چونکە ڕۆڵەکەت لەگەڵ فریشتەکان هاوپلە و پایەیە و لەلای خودایە.» ئەو پیاوەی خودا ئاوای بەو دایکە گوت. ئەو پیاوێکی چاک و پاک بوو درۆی نەدەکرد. کەوایە تۆش دایکەکەم، لێت ڕوون بێ منداڵەکەت لە بارەگای بەرزی خودایە، شاد و دڵخۆشە و لە دەرگای خودا بۆ تۆ دەپاڕێتەوە، کەوایە بەجێیی ئەوەی بۆی بگریی، برۆ شادی بکە.»

ژنەکە چەنەی لە سەر بەری دەستی دانابوو و چاوی لەبەر پێی خۆی دەکرد. گوێی لە پیر گرتبوو. هەناسەیەکی هەڵکێشا.

---

7- «هیکل» بە پێی کتێبی پیرۆز لە هەمبەر Thetemple (پەرستگا) داندراوە.

- نیکیتاش ویستی بەو قسانە وەک تۆ دڵخۆشیم بداتەوە، گوتی: «گەوجە گیان بۆ دەگریی؟ کوڕەکەمان لەگەڵ فریشتان لە بارەگای خودا گۆرانی دەڵێ.» ئەوەی بە من دەگوت بەڵام خۆی دەگریا. دەمدی ئەویش وەک من دەگری. گوتم: «نیکیتا، دەزانم. ئەگەر لەلای خودا نەبێ، کەوایە لەکوێیە؟ تەنیا ئەوەندەیە بە ڕواڵەت لەلامان نەماوە.» خۆزگە جارێکی دیکە بماندیبایە. خۆزگە لە سووچێک خۆ بشارمەوە و تەنیا دەقیقەیەک ببیینم. جارێکی دیکە لە نێو حەوشەکە یاری بکا و بە دەنگە ناسکەکەی هەرام لێبکا، «دایە، لە کوێی؟.» خۆزگە گوێم لە ترپەی پێی بوایە کە بەمسەر و ئەوسەری هۆدەکەدا هەڵدێ. تەنیا جارێکی دیکە، تەنیا جارێک. چونکە دێتەوە بیرم چۆن هەڵدەهات بۆلام و دەیقریشکاند و پێدەکەنی. کە گوێم لە ترپەی پێی دەبوو دەمناسییەوە! بەڵام ئەو ڕۆیشتووە، باوە، ئەو ڕۆیشتووە و ئیتر گوێم لە دەنگی نابێ.

بەرسینگە چکۆلەکەی لە باخەڵی دەرهێنا، پەراوێزەکانی گوڵدۆزی کرابوو، بۆنی پێوەکرد و دەستیکرد بە گریان. هۆن هۆن دەگریا و سەرتاپای دەلەرییەوە. دەستی بەبەر چاوییەوە گرت و لە کەلێنی قامکییەوە فرمێسک دەهاتە خوارێ. باوە زووسیما گوتی: «تۆش وەک ڕاحیل وای «کە بۆ منداڵەکانی دەگریا و دڵی ئارام نەدەبۆوە و سێبووریی نەدەهات. چونکە ئیتر نەما بوون.» ئەوەیە چارەنووسی ئێوە دایکان لە سەر زەوی. ئارام مەبەوە. شتێک کە تۆ پێویستتە، ئارام بوونەوە نییە. بگری، پڕ بەدڵ بگری. بەڵام هەر کاتێ کە گریای لەبیرت بێ کوڕەکەت یەکێ لە فریشتەکانی خودایە و لەو سەرەوە تەماشای خوارێ دەکا و دەتبینێ. بە دیتنی فرمێسکەکانت دەگەشێتەوە و پیشان خودای دەدا. ماوەیەکی زۆر ئەو فرمێسکە دایکانەیەی تۆ ویشک ناکاو ئەو خەمە لە دڵتدا دەمێنێ. بەڵام لە ئاکامدا دەبێتە شادی و ئارام بوونەوە و فرمێسکە تاڵەکانت، فرمێسکە خەماوییەکانت شیرین دەبێ و دڵت پاک دەکەنەوە و لە تاوانت ڕزگار دەکەن. من بۆ شادیی ڕۆحی منداڵەکەت دۆعا دەکەم و دەپاڕێمەوە. ناوی چی بوو؟

- باوەگیان، ئالکسی.

- چ ناوێکی خۆشە. هاوناوی ئالکسی، پیاوی خودا؟
- باوە! پیاوی خودا، پیاوی خودا، ئالکسی پیاوی خودا.
- چ پیاو چاکێک بوو! دایکەگیان، لە پاڕانەوەکانمدا خەمەکانی تۆم لەبیر ناچێ و بۆ لەش‌ساخیی مێردەکەشت دۆعا دەکەم. بەجێ‌هێشتنی مێردەکەت تاوانە. کوڕەکەت لە بەهەشتەوە دەبینێ کە باوکیت بەجێ‌هێشتووە و لەتاوا دەگری. بۆ بەختەوەری و شادییەکەی لێتێکدەدەی؟ ئەو زیندووە، چونکە ڕۆح تا هەتایە هەر زیندوو دەمێنێ. ئەگەرچی ماڵەکەی بەجێ‌هێشتووە، بەڵام لە نزیکی تۆیە و نایبینی. چۆن دەتوانێ بڕواتەوە بۆ ماڵێ، کاتێ تۆ دەڵێی ماڵەکە لێوڕێژە لە بێزاری و دڵتەنگی؟ ئەگەر دایک و باوکی پێکەوە نەبینێ و ماڵەکەش چۆڵ بێ بچێ بۆلای کێ؟ ئەو لەوانەیە بێتە خەونت، کەچی تۆ شینی بۆ دەگێڕی. بەڵام لە پاشان خەونی ئارام و خۆشت بۆ دەنێری. بڕۆوە بۆلای مێردەکەت، هەر ئەمڕۆ بڕۆوە.
- باوەگیان، بەقسەت دەکەم. بە سەر چاو دەڕۆمەوە. قسەکانتم زۆر بەدڵ بوو. نیکیتاگیان، نیکیتاکەم، خۆشەویستەکەم، چاوەڕێمی، ئەمڕۆ دێمەوە بۆلات.
دوای ئەوە زووسیما ڕووی لە ژنێکی زۆر پیر کرد کە جل و بەرگەکانی لە جل وبەرگی شارستانی دەچوو نەک جلوبەرگی زیارەتکەر. بە چاویدا دیاربوو بۆ شتێک هاتووە و شتێکی لە دڵدایە و دەیهەوێ بیدرکێنێ. گوتی ژنی ئەفسەرێکی وەزیفە بووە و ئێستا مردووە، هەر خەڵکی ئەمشارەیە. واسنکای کوڕی لە سەربازییە و ناردوویانە بۆ ئیرکۆتێسک لە سیبیریا. دوو جار لەوێوە نامەی بۆ نووسیوە. بەڵام ساڵێک دەبێ هەواڵی لێی نییە. سۆراخی گرتبوو، بەڵام شوێنەکەی بۆ پەیدا نەکرابوو.
- چەن ڕۆژ لەمەوبەر ئیستیفانیدا ئیلینیشنا - ژنە تاجرێکی دەوڵەمەند - گوتی: «پیراخورووفنا، بچۆ ناوی کوڕەکەت لە کلێسا بنووسە بۆ دەورە دۆعا و بۆ شادبوونی ڕۆحی دۆعا بکە، وێدەچێ مردبێ. ڕۆحی دەکەوێتە ئازارەوە و نامەت بۆ دەنووسێ» هەروەها ئیستیفانیدا ئیلینیشنا پێی گوتم: دۆعای ئێوە

یەکاویەکە و زۆرجاری تاقیکردۆتەوە. بەڵام دوو دڵم... ئەی چرای هۆمێدمان! ئەرێ ڕاستە یان درۆ؟ ئەو کارەی منت پێباشە یان نا؟

ـ بیریشی لێمەکەوە، ئەو پرسیارە شوورەییە. مەگین بۆ شادبوونی ڕۆحی مرۆڤی زیندوو دۆعا دەکرێ؟ ئەویش دایکی! تاوانێکی گەورەیە. وەک جادووبازی وایە. تەنیا لەبەر تێنەگەیشتنتە تاوانەکەت بەخشراوە. وا چاکترە بۆ سەلامەتی و لەشساخی ئەو لە درگای شاژنی ئاسمان، یار و یارمەتیدەری تیژ باڵمان، دۆعا بکەی بەڵکو لە تاوانت ببووری. پیراخورۆفنا، با شتێکی دیکەشت پێ بڵێم، کوڕەکەت بەم زووانە یان دێتەوە بۆ لات، یان نامەت بۆ دەنووسێ. بڕۆوە و لەوەبەدواوە خەم مەخۆ. کوڕەکەت زیندووە.

ـ باوکی خۆشەویست! سەرچاوەی هیوا و بژیومان، خودا سزای چاکەت بداتەوە چونکە دۆعا بۆ ئێمە و تاوانەکانمان دەکەی!

بەڵام پیری کلێسە لە نێو ئاپۆرەکەدا دوو چاوی دیبوو ئاوریان لێدەبۆوە. ژنە لادێییەکی پیر و ڕەقەڵە بە بێدەنگی چاوی تێبڕیبوو. بە چاوانی دەپاڕایەوە. بەڵام خۆی لەوە دەچوو نەوێرێ بێتە پێشێ.

ـ ڕۆڵەگیان، چییە؟

ژنە زۆر بە ئەسپایی گوتی: «باوەگیان، گیانم ڕزگار کە.» لەگەڵ ئەوەدا بە چۆکدا هات و لەبەر پێی پیردا سەری نایە زەوی. «تاوانم کردووە، باوە. لە تاوانەکەم پەشیمانم، حەجمانم نییە.»

پیر لە سەر پلیکانی خواروو دانیشت. ژنە هەروا بە گاگۆڵکێ چووە پێشترەوە. بە کوڕووزانەوە و لێوەلەرزەوە گوتی: «سێ ساڵە بوومەتە بێوەژن. لەگەڵ مێردەکەم ژیانێکی تاڵم هەبوو. پیرە پیاو بوو. بێبەزەییانە لێی دەدام. نەخۆش کەوت، بیرم کردەوە، ئەگەر چاک بێتەوە و دیسان هەستێتەوە، چبکەم، دیسان دەبێ بکەومە ژێر زەبر و زەنگی. پاشان ئەو فکرەم بەزەین گەیشت کە...»

پیر گوتی: «ڕاوەستە.!» پاشان گوێچکەی بردە پەنا لێوی ژنە و ئەویش بە سرتە درێژەی بە قسەکانی دا و ئیتر کەس جگە لە زووسیما لێی حاڵی نەدبوو. زوو قسەکانی تەواو کرد.

پیر پرسی: «سێ ساڵ لەمەوبەر؟»

ـ بەڵێ سێ ساڵ لەمەوبەر. لەو ماوەیەدا بیرم لێنەدەکردەوە. بەڵام ئێستا نەخۆش کەوتووم و ویژدانم ئازارم دەدا.

ـ لەڕێگای دوورەوە هاتووی؟

ـ لە سێسەد کیلۆمەترییەوە.

ـ دانت پیاناوە؟

ـ بەڵێ دانم پیاناوە. دووجار دانم پیاناوە.

ـ ڕێگایان پێداوی لە ڕێوڕەسمی تۆبەدا بەشداری بکەی؟ تۆبەیان داداوی؟

ـ بەڵێ. بەڵام لە مردن دەترسم. زۆر دەترسم.

ـ ترسی هیچت نەبێ و خەم مەخۆ. ئەگەر لە تۆبەکردن درێغی نەکەی، خودا لە هەموو شتێک دەبووری. هیچ تاوانێکیش لە دنیادا نییە، کە خودا لە سەر تۆبەکاری ڕاستەقینەی هەڵنەگرێ! مرۆڤ ناتوانێ تاوانێکی ئەوەندە گەورە بکا کە خۆشەویستیی بێسنووری خودا بگەیەنێتە کۆتایی. مەگین تاوانێک هەیە لە خۆشەویستی خودا فرەتر بێ؟ تەنیا لەبیری تۆبەدا بە. تۆبەی بەردەوام، بەڵام ترس بە یەکجاری بنێ ئەولاوە. ئیمانت بەوە ببێ خودا ئەوەندەی خۆش دەوێی کە ناتوانی بیریشی لێبکەیەوە، خودا بە تاوانیشەوە خۆشی دەوێی لە قەدیمەوە گوتوویانە بەهەشت بۆ تاوانبارێکی پەژیوان زیاتر لە دە مرۆڤی ئیماندار شادی و چێژی تێدایە. بڕۆ و مەترسە. ڕقت لە هیچ مرۆڤێک نەبێ. ئەگەر خراپەت دی، قەڵس مەبە. مێردە مردووەکەت هەرچەندە ئازاری دابێتی، لە دڵەوە بیبەخشە. لەگەڵی ئاشت ببەوە. ئەگەر ببیتە تۆبەکار، ڕەحمودڵت زۆر دەبێ. خەڵکت خۆش دەوێ. ئەگەر خەڵکیشت خۆش بوێ، لە خودا نزیکی. تاوانی هەموو شتێک دەدرێتەوە. هەموو شتێک بە خۆشەویستی پاک دەبێتەوە. ئەگەر من،منێک کە وەکو تۆ تاوانبارم. بەزەییم بە تۆدا دێ و دڵم پێت دەسووتێ، خۆشەویستیی

خودا زۆر لەوە زیاترە. خۆشەویستی خەزێنەیەکی ئەوەندە پڕ بایەخە دەتوانی تەواوی دنیای پێ ڕزگار کەی، ئەویش نەک تەنیا تاوانی خۆت، دەتوانی بەخشەری تاوانی خەڵکی دیکەش بی. بڕۆ و مەترسە. بڕو.

سێ جاردەستی بە سەریدا هێنا، سووڕەتێکی لە ملی خۆی داماڵی و کردییە ملی پیرێژنەکە. ژنە بەبێ ئەوەی هیچ بڵێ سەری نابووە زەوی. زووسیما هەستا سەرپێ، چاوێکی تاسەمەندانەی لە ژنێکی توندوتۆڵی لادێیی کرد کە منداڵێکی وردیلەی بە باوەشەوە بوو.

- لە (ویشەگووری)یەوە هاتووم باوەگیان.

- چوار کیلۆمەترت ڕێگا بڕیوە بەو منداڵەوە، چت دەوێ؟

- هاتووم تەماشات بکەم. پێشتریش هاتوومە خزمەتت - یان ڕەنگە لە بیرت نەمابێ؟ ئەگەر لەبیریشت چووبێتەوە، ناهەقت نییە. دەڵێن نەخۆش بووی. لەدڵ خۆما گوتم بچم و بە چاوی خۆم بیبینم. ئێستا لەبەر چاومی و نەخۆشیش نیت. بیست ساڵی دیکەش دەمێنی. خودا خێرت وەڕێ بێنێ. زۆر کەس هەن دۆعات بۆ دەکەن. مەگین دەکرێ نەخۆش کەوی؟

- سپاس کچم.

- ڕاستت دەوێ داواکارییەکم هەیە. ئەو شەست کوپکەم لێوەرگرە و بیدە بە کەسێکی لە من هەژار و بێدەرەتانتر. لە ڕێگا کاتی هاتن بۆ ئێرە گوتم واچاکە لە لایەن باوە زووسیماوە ئەو کارە بکەم. چونکە دەزانێ ئەو پارەیە بداتە دەست کێ.

- ڕۆڵە گیان، سپاس بۆ تۆ، سپاس. تۆ ژنێکی باشی. خۆشمدەوێی. دڵنیابە ئەو کارە دەکەم. ئەوەش کچی چکۆلەتە؟

- باوەگیان، کچی چکۆلەمە ناوی لیزاوتایە.

- خودا پاداشی خێر بە هەردووکتان بداتەوە. دایەگیان دڵت شاد کردم. خوداحافیز ڕۆڵە خۆشەویستەکانم. خوداحافیز.

زووسیما دۆعای بە سەر هەموویاندا خوێند و سەری کڕنۆشی بۆ دانەواندن.

# (٤)

## خاتوونی کەم ئیمان

ژنە دەوڵەمەندێکی زیارەتکەر، هاتە نێو ئاپۆرەکەوە و زووسیمای دی، بەدەم دۆعا کردنەوە دەستی بۆ خەڵکەکە ڕادەتەکاند و تەقدیسی دەکردن، ئەویش نەرم نەرم فرمێسکی هەڵدەوەراند و بە دەستەسڕێک فرمێسکی چاوی دەسڕی. ژنێکی بەهەست و ڕێزدار بوو. لەزۆر لایەنەوە خاوەنی چاکە و دڵفراوانی بوو. کاتێک پیری کلێسە چوو بۆلای، بە سەر و ڕوویەکی خۆش و وەک ئەوەی باڵ بگرێ بەرەوپیری چوو.

«نازانی بە دیتنی ئەو دیمەنە دڵهەژێنە، چەندەم ئازار کێشا. ئازارێکی زۆر...» لەتاوانا دەتگوت هەڵیدەچۆقێنن، نەیدەزانی بڵێ‌چی. «پیری مەزن دەزانم خەڵک چەندەیان خۆش دەوێی. منیش خەڵکم خۆش دەوێ. دەمەوێ بە گیان و دڵ خۆشم بوێن. بۆ دەکرێ ئەو خەڵکە پاکەی ڕووسیەم بەو هەموو گەورەیی و ساکارییەوە خۆش نەوێ؟!»

ـ کچەکەت چۆنە! دیسان دەتەوێ سەبارەت بە ئەو لەگەڵم بدوێی؟

ـ ئاخ، داوام لە خودا دەکرد، سێ ڕۆژ لەبەر پەنجێرەی حوجرەکەت چۆک دادەم و چاوەڕوان بم، هەتا ئیزنی هاتنە ژوورەوەم پێ بدەی. ئەی شیفادەری بەڕێز و مەزن هاتووین سپاست لێبکەین. تۆ بوویە هۆی ئەوەی لیز[٨] ـ ی کچم چاک بێتەوە. پێنجشەممەی ڕابردوو تەنیا بەدەست بەسەرداهێنان و دۆعا بە سەردا خوێندن بوویە هۆی ئەوەی دەرد و عەلەمی لێ‌ببڕێ. بە

---

8- لیز Lise زاراوەی فەڕەنسی Lisa یە.

هەڵەداوان هاتووین بۆ ئێرە تاکو دەستت ماچکەین و هەستی پڕ لە خۆشەویستی و پێزانینی خۆمان دەربڕین.

ـ چۆن دەڵێی چاک بۆتەوە؟ ئەی بۆ هەر لە سەر کورسیلەکەی دانیشتووە؟

ـ بەڵام چەقوچۆی شەوانەی نەماوە. یانی لە پێنجشەمەوە تا ئەمڕۆ کە دەکاتە دە ڕۆژ. خۆ هەر ئەوەش نییە. لاقوقولی تینی تێگەڕاوە. ئەمڕۆ بەیانی بەوپەڕی ساخی و سلامەتییەوە لە خەو هەستا. شەوێ زۆر چاک خەوت و خەبەری نەبۆوە. چاو لە کوڵمە سوور و چاوە گەشەکانی بکە! دایمە دەگریا، بەڵام ئێستا پیدەکەنێ، لێو بەبزە و دڵشادە. ئەمڕۆ بەیانی ئیسەرەمی کردبۆوە بە پێوە ڕاوەستێ، دوو دەقیقەی تەواو بێ ئەوەی دەست بە هیچ شتێکەوە بگرێ، بەپێوە ڕادەوەستا. بڕیاریداوە هەتا دوو حەوتووی دیکە چۆپی بکێشێ و سەما بکا. پزیشکی گەڕەکەکەمان، هیرتیزنستیۆب ـ م بانگکرد شانی هەڵتەکاند و گوتی: «سەرم سووڕرماوە، تێیناگەم.» تۆ ئەو چاکەیەت لەگەڵ کردووین دەکرێ نەیەین و سپاست لێنەکەین؟ لیز! سپاس لە حەزرەتی پیر بکە، دەی سپاسی لێبکە!

ڕوخساری جوان و وردیلەی لیز، گەشایەوە. ئەوەندەی توانیی لە سەر کورسیلەکە هەستا و چاوی لە پیر بڕی . لە هەمبەریدا هەردوو دەستی لێک هەڵپێکا، بەڵام نەیتوانی خۆی ڕاگرێ و دەستیکرد بە پێکەنین، ئاماژەی بە ئالیووشا کرد و بە شلوێ بوونێکی منداڵانەوە کە نەیتوانی، شادی خۆی بشارێتەوە، گوتی: «بەوە پێدەکەنم.»

ئەگەر کەسێک لەو کاتەدا چاوی لە ئالیووشا بوایە، کە هەنگاوێک لە دوای زووسیماوە ڕاوەستابوو، تێدەگەیشت کە چ ڕەنگێکی هێنا و برد. بزەیەکی هاتێ و چاوی لە بەرپێی خۆی بڕی.

دایکی لیز، دەستە بە دەستکێشەکەی بۆ لای ئالیووشا ڕاداشت و گوتی: «ئالکسی فیۆدۆرۆویچ! لیز پەیامێکی بۆ هێناوی.»

پیر ئاوڕی دایەوە و بە وردی چاوێکی لە ئالیووشا کرد. ئالیووشا چوو بۆلای لیز، بە بزەیەکی وشکەوە دەستی لەبەردەمی کچەدا ڕاگرت. لیز زەردەیەکی گرت . پسوولەیەکی دایە دەست ئالیووشا و گوتی: «ئەوە کاترینا ئیوانا پێیدام بۆت بێنم. بەتایبەت دەیەوێ هەرچی زووتر بچی بۆلای. لەبیرت نەچێ.»

ئالیووشا بە سەر سوڕمانەوە منجاندی: «داوای لە من کردووە بچم بۆلای؟ لە من؟ بۆچی؟!» لە ناکاو ڕەنگی تێکچوو.

دایکی لیز بەپەلە گوتی: «سەبارەت بە دیمیتری فیۆدۆرۆویچە و ئەوەی لەم بەینانەدا ڕووی داوە. کاترینا ئیوانا بڕیارێکی داوە، بەڵام پێویستە چاوی بە ئێوە بکەوێ.... هەڵبەت من ئاگادار نیم، کارەکەی چییە. بەڵام دەیەوێ زۆر زوو چاوی پێتان بکەوێ. هەرچۆنێک بێ دەبێ بچی، چونکە ئەرکێکی ئایینییە.»

ئالیووشا، هەر بەو شێواوییەوە، دەنگی هەڵێنا و گوتی: «تاقە جارێکم دیوە.»

ـ ئەک، چ مرۆڤێکی بەرز و بێوێنەیە. تەنیا هەر لەبەر ڕەنج و ئازارەکانی... تۆ بیهێنە بەر زەینی خۆت چ ڕەنج و ئازارێکی کێشاوە و ئێستا چی دەکێشێ! بیهێنە بەر زەینی خۆت چی چاوەڕوانییەتی، چارە ڕەشی و ئاپۆر!

ئالیووشا، دوای خوێندنەوەی خێرای یادداشتە کورت و پڕ نهێنییەکە کە هەمووی داخواز و پاڕانەوە بوو، کە بچێ، بەبێ هیچ قسە و باسێک گوتی: «زۆر چاکە، دێم.»

لیز بەحەز و شادییەکی کتوپڕەوە گوتی: «ئەک چ کارێکی جوان و بەرێوجێ! بە دایکم گوت پێموانییە بچی. گوتم لەبیری ڕزگار کردنی گیانی خۆت دای. تۆ چەندە دڵ گەورەی. هەمیشە بیرم لەوە کردۆتەوە کە تۆ مەزنی. چەندە شادم کە ئەوە بە تۆ دەڵێم.»

دایکی بە لەبزێکی ماناداره‌وه گوتی: «لیز!» هەرچەن دوای ئەوە پێکەنی، بەڵام لەپاشان درێژەی بە قسەکانی دا: «ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، ئێمەت لەبیر

چۆتەوە. ئێستاسەرێکمان لێ هەڵناهێنی. لەگەڵ ئەوەشدا لیز دوو جاری پێ گوتووم لەلای تۆ نەبێ لەلای هیچ کەسێکی دیکە دڵی داناسەکنێ.» ئالیووشا سەری هەڵێنا و دیسان سوور هەڵگەڕا و بزەی هاتێ، بەبێ ئەوەی بزانێ بۆ. بەڵام پیری کلێسە ئیتر چاوی لێنەکرد. لەگەڵ ڕاهیبێک دەستیکردەوە بە قسە کردن، کە لە پەنا کورسیلەکەی لیز چاوەڕوانی بوو و پێشتریش باسم کرد. دیاربوو ڕاهیبێکە لە چینی لادێ. بەرچاو تەنگ و گوێ نەبیس. بەڵام ديندارێکی ڕاستەقینە، بە شێوەی خۆی، دیندارێکی کەللەڕەق. ڕای‌گەیاند کە لە باکووری دوورەوە هاتووە. لە ئابدورسک، لە ناوچەی سێن‌سیلوستێر و ئەندامی کلێسەیەکی چکۆلە بوو کە تەنیا نۆ ڕاهیبی بوو. زووسیما تەقدیسی کرد و پێیگوت هەرکاتێ پێیخۆشە بێ بۆ حوجرە.

ڕاهیب کە زۆر بە هێوری و مانادارانە ئاماژەی بە لیز دەکرد، لە ناکاو پرسیی: «چۆن دەوێری کاری ئاوا بکەی؟» مەبەستی «چاک بوونەوەی» لیز بوو.

«هەڵبەت سەبارەت بەوە زۆر زووە قسە بکەین، ئەو ئارام بوونەوەش چارەی یەکجاری نییە و لەوانەیە هۆگەلی جۆراوجۆری هەبێ. بەڵام ئەگەر چاکیش بووبێتەوە. تەنیا لە خوداییەوەیە و دەستی هیچ هێزێکی دیکەی تێدا نییە.» لە درێژەی قسەکانیدا بە ڕاهیبی گوت: «باوە، وەرە بۆ دیدەنییم. زۆرمان دەرفەت نەماوە بۆ دیدار. نەخۆشم و دەزانم مەرگ نزیک بۆتەوە لێم.»

خاتوونی دەوڵەمەند هاواری کرد: «ئەیەڕۆ، نا، نا! خودا ئێوەمان لێ نەستێنێ. جارێ شوکور زۆر پیر نەبووی. نەخۆشیی چی؟ شوکور زۆریش لەش ساخ و شاد و بەدەماخی.»

ـ ئەمڕۆ لەڕادەبەدەر حاڵم باشە. بەڵام دەزانم ساتێکە. ئیتر چاک لە نەخۆشیی خۆم دەگەم. دڵخۆشم بەوەی لەبەر چاوی ئێوە شاد و لەش‌ساخم. هیچ وتەیەک بەقەد ئەوەی دڵخۆش نەکردووم. چونکە مرۆڤ بۆ شادی و بەختەوەری خولقاوە. هەر کەسێکیش کە لەو پەڕی شادی و بەختەوەریدایە،

هەقیەتی کە بەخۆی بڵێ: «من لە سەرزەوی داخوازیی خودا بەجێ دێنم.» عادڵان و پیاوانی خودا و شەهیدانی پیرۆز هەموو بەختەوەر بوون.

خاتوونی دەوڵەمەند دیسان هاواری کرد: «ئەک، لەو وتە بەنرخ و پڕ حیکمەتانە! چ وتەیەکی بەرز و پیرۆز و گەوهەربار بوون! بەو قسانەت دڵی مرۆڤ ئاوپڕژێن دەکەی. لەگەڵ ئەو هەموو بەختەوەرییە، بەختەوەری لەکوێیە؟ کێ دەتوانێ بڵێ بەختەوەرە؟ گەورەم! ئێستا کە بە هۆی خۆشەویستی و بەزەییەوە ودمت داوە جارێکی دیکە زیارەتت بکەم. ئەوەی جاری پێشوو نەمتوانی، یان نەموێرا بیدرکێنم. لێمگەڕێ ئەوەی ماوەیەکی زۆرە پێوەی جینگل دەدەم و ئازاری داوم، بیدرکێنم. بمبوورە! خەریکی ئازارکێشانم، حەجمانم لێهەڵگیراوە!» لە نێو تەوژمی هەستێکی پڕ تاویاودا لە هەمبەر پیردا دەستی لێک هەڵپێکا.

ـ بە دەست چ شتێکی تایبەتەوە ئازار دەکێشی؟

ـ بە دەست بێ ئیمانییەوە ئازار دەکێشم.

ـ ئەی بیروڕات سەبارەت بە خودا چییە؟

ـ ئەک، نا، نا! تەنانەت ناوێرم بیریشی لێبکەمەوە. بەڵام ئەو دنیا چ مەتەڵێکە! کەوا هیچکەس بۆی هەڵنایە. گوێ بگرە! تۆ شیفادەری، ئاگات لە قووڵایی ڕۆح و گیانی مرۆڤ هەیە. هەڵبەت چاوەڕوانیی ئەوەشم نییە بڕوا بە هەموو قسەکانم بکەی. بەڵام دڵنیات دەکەم و بە شەڕەفم سوێند دەخۆم کە قسەکانم هەمووی ڕاستە و گرێوگۆڵی تێدا نییە. بیرۆکەی ژیان لە گۆڕ زیاتر دڵەخورپە و ترس و مەترسیی بۆ دروستکردووم. نازانم دەستەوداوێنی کێ بم، قەتیش نەموێراوە ئەو کارە بکەم. ئێستاش زۆر ڕووهەڵماڵدراوانە لە تۆ دەپرسم. گەورەم! ئێستا بڕوات سەبارەت بە من چۆنە؟

ـ سەبارەت بە بڕوای من دەرهەق بەخۆت، پێویست ناکا خۆت ئازار بدەی. بڕوایەکی قایمم هەیە کە ئەو ڕەنج و ئازارەی تۆ سادقانەیە.

ـ دەک لەدەورت گەڕێم. زۆر زۆرت سپاس دەکەم! چاوم دەقووچێنم و لەخۆم دەپرسم، ئەگەر هەموو ئیماندارن، کەوایە سەرچاوەی ئیمان کامەیە؟

لەکاتێکا دەشڵێن سەرچاوەی ترس لە شتە ترسێنەرەکان، سروشتە و بەتۆز ڕاستیی تێدا نییە. بەخۆشم دەڵێم: ئەگەر هەتا کۆتاییی تەمەنم بە ئیمانەوە بژیم و کاتێ مەرگ هەڵدەکوتێتە سەرم، بەقەولی نووسەریک هیچ شتێک جگە لە «دڕکودالْ لە سەر گۆڕەکەم شین نابن.»[9] ئەو کاتە چبکەم؟ زۆر ناخۆشە! چۆن - چۆن دەتوانم ئیمانەکە وەرگرمەوە. بەڵام کاتێ منداڵ بووم، بیر و بڕوام مەکینە ئاسایی و بەبێ بیر کردنەوە بوو. چۆن، چۆن دەکرێ ئەوە بسەلمێنم؟ ئێستا هاتووم سفرەی دڵم لای تۆ کردۆتەوە و پرسیارەکەم لە تۆ دەپرسم. ئەگەر ئەم دەرفەتەم لەکیس بچێ، هیچ کەس ناتوانێ وەڵامم بداتەوە. چۆن ئەوە بسەلمێنم و چۆن خۆم ڕازی کەم؟ پەکوو، چەندە چارەڕەشم! ڕادەوەستم و لە دەوروبەری خۆم دەڕوانم، دەبینم هیچ کەس گوێی بەو شتانە نابزوێ و ئیتر هیچ کەس سەبارەت بەو مەبەستە ژانەسەر بۆخۆی دروستناکا ناکا. منیش تەنیا کەسێکم کە بۆم تاملْ ناکرێ. وەختە دیق بکەم، دیق.

ـ بێگومان وایە، زۆر تاڵە، بەڵام بۆ سەلماندن نابێ و نازانی چۆنی بسەلمێنی. ئەگەرچی پیاو دەتوانێ ئیمانی پێ بێنێ.

- چۆن؟

- بە ئەزموونی ئەوینی چالاک. هەوڵبدە جیرانەکەت چالاکانە و ماندوویی نەناسانە خۆشبوێ. بەو ڕادەیە کە لە ئەشقا دەچێتە پێشێ، لە هەقیقەتی خودا و هەرمانی ڕۆحت دڵنیاتر دەبی. ئەگەر خۆشویستنی جیرانەکەت بەجێیەک بگا کە خۆتت لەبیر بچێتەوە، ئەو کاتە بەبێ هیچ دڕدۆنگییەک ئیمان دێنێ و گومان لە دڵتدا نامێنێ. بە ئەزموونیش سەلمێندراوە و شکی تێدا نییە.

ـ لە ئەشقی چالاکدا؟ پرسیارێکی دیکەم هەیە - ئەویش چ پرسیارێک! مرۆڤم ئەوەندە خۆش دەوێ، لەوانەیە بڕوا نەکەی زۆرجار دێمە سەر ئەوەی دەست لە ماڵ و ژیان هەڵگرم و لیزاش بەجێ بڵێم و بڕۆم ببمە پەرستار. چاو دەقووچێنم و بیردەکەمەوە و خەیاڵ هەڵمدەگرێ، لەو کاتەدا بۆ زاڵبوون

---

9- وتەی بازارۆف لە کتێبی (باوکان و کوڕان)دا. بەرهەمی تورگنیف.

به سەر کەندوکۆسپەکاندا، هێز و ورەم لە ڕادەبەدەر دەبێ، هیچ برینێک، هیچ زام و ناسۆرێک، لەو کاتەدا جاڕزم ناکات. ئەو زام و برینانە دەشۆمەوە و بە دەستی خۆم دەیانپێچم. بۆ برینداران و لەشبەباران دەبمە پەرستار. تەنانەت زامەکانیان ماچدەکەم.

ـ ئەوە ئیتر زێدەڕەوییە. لە لایەنێکیشەوە چاکترە کە زەینت بەو بیر و خەیالانەوە خەریکە و خۆت سەرقاڵی خەیاڵی دیکە ناکەی. هێندێ جار لەوانەیە لە دنیای ڕاستەقینەدا کاری خێر بکەی و خۆشت ئاگات لێنەبێ.

خاتوونی دەوڵەمەند بەتین و تاوێکەوە هەتا ڕادەیەک بە شێواوی گوتی: «بەڵێ، بەڵام ژیانێکی ئاوا هەتا ماوەیەکی زۆر بڵێی بتوانم تاقەت بێنم؟ پرسیاری سەرەکیم ئەوەیە ـ ئازاراویترین پرسیاریشمە. چاوم دەنووقێنم و لە خۆم دەپرسم: «ئایا لەو ڕێگایەدا هەتا ماوەیەکی دوور و درێژ خۆ ڕادەگری؟ ئەگەر برینی نەخۆشێکت تیمار کرد و پاشان سپاسی لێنەکردی، بەڵکو بە ئیشتیای دڵی خۆی قسەی تاڵی بە گورچوودا دای و هیچ بایەخێکی بۆ خزمەتە خێرخوازانەکەت دانەنا و بە جنێو و فەرمان پێدانی بێ ئەدەبانە بوغزاندتی و لای سەرانی باڵای نەخۆشخانەکە شکایەتیشی لێ کردی (کاتێ مرۆڤ دەست دەداتە ئەرکێکی گەورە، زۆرجار ئەوانە ڕوو دەدەن) ئەو کاتە چی؟ ئایا دیسان خۆشەویستییەکەت وەک خۆی دەمێنێ یان نا؟» دەشزانی بە ترسەوە بەو ئاکامە دەگەم، ئەگەر شتێک ئەشقە چالاکەکەم دەرهەقەق بە مرۆڤایەتی بەبا بدا، ئەو شتە سپڵەییە. وەلحاسڵ دەردەکەوێ کە من خزمەت کردنەکەم بە کرێیە و چاوەڕوانی کرێی خێرام ـ یانی نان بەقەرز دان. سەربەسەر کردن بە ئەوین. ئەگەر واش نەبێ دیارە لە خۆشویستنی خەڵک بێزارم.»

لە جەنگەی سزادانی خۆیدا بوو، کاتێ قسەکەی تەواو بوو، بە چاوێکی پڕ لە پرسیارەوە لە زووسیمای ڕوانی.

پیر گوتی: «ڕاست هەر ئەو چیرۆکەیە کە جارێکیان پزیشکێک بۆی گێڕامەوە. پیاوێکی ڕۆحسووک و وریا بوو. هەر وەک ئێوە بەبێ گرێوگۆڵ

لەگەڵمدا دەدوا. بە تانە و تەشەرێکی تاڵەوە گوتی: «مرۆڤایەتیم خۆشدەوێ. بەڵام سەرم لەخۆم سوڕ ماوە. هەرچەندە مرۆڤایەتیم وەک مانا ئاساییەکەی خۆشدەوێ، مرۆڤم بە مانای تایبەت، یانی جیاواز، بە شێوەیەکی تاکە کەسی، کەمتر خۆشدەوێ، لە خەون و خەیاڵەکانمدا زۆر جار پلانی فیداکارانە دادەڕێژم بۆ خزمەت بە مرۆڤایەتی و ئەگەر لەپڕ کارێکی زەرووریشم بۆ بێتە پێشێ، دوور نییە لەگەڵ کۆسپ و تەگەرە بەرەوڕوو بم. لەگەڵ ئەوەشدا بە ئەزموون بۆم ڕوون بۆتەوە کە ناتوانم لەسەریەک دوو ڕۆژ لە ژوورێکدا لەگەڵ کەسێک ڕابوێرم. بێتو کەسێکم لێ نزیک بێ، بوونی ئەو، تەنیایی و هێمنایەتیم لێ دەشێوێنێ و ئازادیم لێ بەرتەسک دەکاتەوە. لە ماوەی بیست و چوار کاتژمێردا تەنانەت لە چاکترین مرۆڤ وەڕەز دەبم: کەسێک بە هۆی ئەوەوە درەنگ دەست لە نووسین دەکێشێتەوە. یەکێکی دیکە بەو هۆیەی هەڵامەتی گرتووە و لە پەستا چڵمەکەی دادەلووشێ. هەر لە یەکەم ساتەوە کەسێک دێ بۆ لام ڕقی لێ هەڵدەگرم. بەڵام زۆر جار هاتۆتە پێشێ، هەتا زیاتر لە خەڵک بە شێوەی تاکەکەسی بێزار بم، ئەشقم دەرهەق بە مرۆڤایەتی زیاتر بڵێسە دەستێنێ.

- دەی چارە چییە؟ لەو جۆرە کاتانەدا پیاو چبکا؟ دەبێ هیوابڕاو بێ؟

- نا، هەر ئەوەندە بەسە کە بیر و زەینت ئاڵۆز دەبێ و هەست بە نیگەرانی دەکەی. هەرچی لە دەستت دێ بیکە، چونکە چاکە هەتا زۆر بێ باشە و هەمووشی لە دەفتەری کردەوەتدا تۆمار دەکرێ. زۆریش قووڵ و تایبەتی توانیوتە خۆت بناسی، بۆیە کاری زۆر باش و شیاوت کردووە. ئەگەر سادقانە پێیان گوتووی لەبەر ئەوە بوو بەبێ پێچانەوە فتوا وەرگری. هەر بەو شێوەی کە ئێستا لە منت وەرگرت. هەڵبەت ئەو کاتە لە ڕێگای وەدەست هێنانی عەشقی ڕاستەقینەدا، بە هیچ کوێ ناگەی و لە ڕادەی خەون زیاتر تێناپەڕێ و بە شێوەیەکی سروشتی لە بیرکردنەوە و خەیاڵی ئەو دنیا دەست هەڵدەگرێ. بەڵام لە کۆتاییدا دەکەویتە سەر ڕێگایەکی پڕ لە هێمنایەتی.

ـ تۆ ئابڕووت پێوە نەهێشتم! کاتێ قسە دەکەی، تازە تێدەگەم کاتێ گوتم ناتوانم سپڵەیی و پێنەزانین تامڵ بکەم، لە ڕاستیدا بۆ پاک بوونەوەی خۆم بە دوای فتوای تۆوە بووم. تۆ خۆمت پێناساندم. تۆ لە ناخی ڕۆحی من گەیشتی و قوژبنە تاریکەکانی گیانمت دی و لە لایەن خۆمەوە خۆمت بۆ ڕوون کردمەوە.

ـ ڕاست دەکەی! کەوایە ئێستا دوای ئەو دان پیانانە بە بڕوای من هەمیشە دڵپاک و بێڕیا بووی . ئەگەر بەختەوەریش ڕووی تێنەکردووی، لە بیرت نەچێ ڕێگای ڕاستت گرتۆتە بەر و تێبکۆشە ئەو ڕێگایە بەر نەدەی. لە هەموو شتێکیش گرینگتر، خۆ لە درۆ ببوێرە، هەموو جۆرە درۆیەک، بە تایبەت درۆ کردن لەگەڵ خۆت. وریابە خۆت فریو نەدەی و هەموو کات و ساتێک لە سەر هەست بە. قەت بیر لە سەر کۆنە کردنی خۆت و خەڵکی مەکەوە و هەوڵبدە خۆت لێنەدەی. ئەوەی لە ناخت دایە و پێتوایە دزێوە، ئەگەر بیخەیتە ژێر چاوەدێری، ژەنگوژارەکەی پاک دەبێتەوە. خۆ لە ترسیش لادە. ئەگەرچی ترس ئاکامی هەموو چەشنە درۆیەکە. لە ڕێگای گەیشتن بە ئەوین و خۆشەویستی، قەت لە دڵدۆڕاوی مەترسە. لە کردەوە شەیتانییەکانیشت باکت نەبێ. بەداخەوەم کە ناتوانم شتێکی لەوە باشترت پێ بڵێم بۆ ئەوەی دڵت بحەسێتەوە، چونکە عەشق لە کردەوەدا لەگەڵ هەڵسەنگاندنی عەشق لە خەون و خەیاڵدا شتێکی ناحەز و دزێوە. عەشق لە خەون و خەیاڵدا تاسەباری کردەوەی خێرایە. بەبێ وچان لەبەر چاوی هەموو کەس، مرۆڤ ئامادەن گیان فیدا کەن بەو شەرتەی تاقیکارییەکەیان دژوار و درێژخایەن نەبێ و زوو تەواو بێ. خەڵکیش وەک ئەوەی شانۆیەک ببینن، چەپڵەیان بۆ لێدەن. بەڵام ئەشقی ڕاست و چالاک، هەوڵ و لەخۆبردوویی دەوێ و ڕەنگە بۆ تاقمێک زانستێکی تەواو بێ. بەڵام ئەوەشت پێ بڵێم، ئەو کاتەی دەبینی ئەو هەموو هەوڵەت داوە و ماندوویی نەناسانە وەدوای کەوتووی، بەجێی ئەوەی لە ئامانجەکەت نزیک ببییەوە، لێشی دوور کەوتوویەوە. لەو کاتەدا پێشبینی دەکەم کە پێیدەگەی و هەموو کاتێک، لە

ڕێگای عەشق و خۆشەویستیدا، دەستی خودا بۆ ڕێنوێنی کردن و ماندوو نەبوونت بە شێوەیەکی نهێنی لەگەڵتدا بووە و بە ڕوونی دەیبینی. بمبوورە کە لەوە زیاتر ناتوانم لەلای تۆ بمێنمەوە. ئەوانیش چاوەڕێمن، خوداحافیز.

خاتوونی دەوڵەمەند خەریک بوو دەگریا. لەپڕێکا داچڵەکی و هاواریکرد: «لیز، لیز! دەستێک بە سەری لیزدا بێنە، تەقدیسی کە!»

پیر بە گاڵتەوە گوتی: «بۆ خۆشەویستی نابێ. هەر خەریکی بزۆزی و هاروهاجییە، چاوم لێبوو. بۆ بە ئالکسی پێدەکەنیی؟»

لیز لە ڕاستیدا هەر لە سەرەتاوە دەیویست پێیڕابوێرێ. زوو بۆی دەرکەوت ئالیووشا کوڕێکی شەرمەونە و هەوڵدەدا تەماشای نەکا. بۆیە ئەوەی بۆ سەرگەرمی پێ باش بوو. بە وردی چاوەڕێ بوو سەرنجێکی وەگیر بێنێ. ئالیووشا کە خۆی لەبەر سەرنجی بەردەوامی لیزدا نەدەگرت، وزەیەکی بەهێز و لە ناکاو وای لێدەکرد چاوێکی لێبکا. ئەویش بە شێوەیەکی وریا و سەرکەوتووانە زەردەیەکی دەگرت. بەوەش ئالیووشا ئەوەندەی دیکە ڕەنگی تێکدەچوو. لە ئاکامدا بە تەواوی ڕووی وەرگێڕا و چوو لە پشت زووسیماوە ڕاوەستا. دوای چەن دەقیقە دیسان ئەو هێزە دەروونییە وایلێکرد ئاوڕێک بداتەوە و بزانێ هەر لە ژێر سەرنجی لیزدایە یان نا، دیتی لیز لە سەر کورسیلەکەی خۆی خوار کردۆتەوە و سەری بەملاوئەولادا دەگێڕێ و زۆر تامەزرۆیانە چاوەڕوانی ئاوڕێکی ئەوە. کاتێ سەرنجی ئالیووشای وەگیر هێنا، قاقایەکی وای کێشا کە پیر نەیتوانی خۆی ڕاگرێ: «کچێ بۆ وا گاڵتەی پێدەکەی، قۆشمە؟»

لیز لە ناکاو ڕەنگی تێکچوو و سوور هەڵگەڕا. چاوی بریقەیەکی لێوەهات و توورە بوو. بە شێوەیەکی سەرکۆنەکەرانە گەرم داهات و دەستی کرد بە قسە کردن:

- ئەی بۆ هەموو شتێکی لەبیر چۆتەوە؟ کاتێ چکۆلە بووم، دەیبردم بۆ ئەملاوئەولا. پێکەوە کایەمان دەکرد. دەهات فێری خوێندنەوەی دەکردم. دوو ساڵ لەمەوبەر کە ڕۆیشت گوتی قەتت لەبیر نابەمەوە و هەتا دنیا دنیایە

هاوڕێی یەکتر دەبین! ئێستاش خەریکە لێم دەترسێ. بۆ من دەمەوێ بیخۆم؟ بۆ نایە بۆلام؟ بۆ قسە ناکا؟ بۆ نایە بۆ ماڵمان؟ واش نییە بڵێین تۆ ئیزنی پێنادەی، چونکە بۆ هەموو شوێنێک دەچێ. من پێم عەیبە بانگهێشتی کەم. ئەگەر ئێمەی لەبیر نەچۆتەوە با بیرێکی لێبکاتەوە. نا، ئە ئێستا دەیەوێ گیانی خۆی ڕزگار کا! بۆ ئەو عەبا شۆڕەت پێ لەبەر کردووە؟ خۆ بەو عەبایەوە هەڵبێ لە لاقی دەهاڵێ و دەکەوێ.

لەپڕ خۆی پێڕانەگیرا دەستی بەبەر دەموچاوییەوە گرت و دای لە قاقای پێکەنین، پیر بە بزەیەکەوە گوێی بۆ ڕاگرت و بە دڵۆڤانییەوە دەستی بە سەریدا هێنا و تەقدیسی کرد. لیز دەستی زووسیمای پیری گرت و ماچیکرد، پاشان دەستی پیری بە چاوییەوە گوشی و دەستیکرد بە گریان:

ـ دڵت لێم نەهێشێ. من گەوج و هیچوپووچم... ڕەنگە ئالیووشا هەقی بێ نایەوێ بێ بۆ دیتنی کچێکی ئاوا هیچوپووچ و گەمژە.

زووسیما گوتی: «دڵنیابە دەینێرم.»

## (٥)

## هەروا دەبێ! هەروا دەبێ!

ماوەی بیست و پێنج دەقیقە بوو پیر لە حوجرەکەی هاتبووە دەرێ. کاتژمێر لە دوازدە و نیوی لادابوو. بەڵام دیمیتری فیۆدۆرۆویچ کە هەموو لەبەر ئەو لێرە کۆ ببوونەوە، هێشتا نەهاتبوو. بەڵام تارادەیەک لەبیریان چووبۆوە، کاتێک پیر هاتەوە نێو حوجرەکە بە ئاخافتنێکی بەسۆز میوانەکانی سەرقاڵ کرد. ئیوان فیۆدۆرۆویچ و دوو کەس لە ڕاهیبەکان لەو وتووێژەدا دەوری سەرەکییان بوو، میۆسۆفیش دەیویست بە شێوەیەک بەشداریی وتووێژەکە بکا و ڕواڵەتەن زۆر تامەزرۆ بوو. بەڵام لەولایەنەشەوە شانسی نەبوو. دیار بوو لە ڕیزی دواوەیە و هیچ کەس بایەخ بە قسەکانی نادا و ئەم بارودۆخە تازەیەش ئەوەندەی دیکە ئیمان هەردەی کردبوو. بەرلەوە لەگەڵ ئیوان فیۆدۆرۆویچ دەمەتەقێیەکی ڕۆشنبیرانەیان کردبوو. بایەخ پێنەدانێکی تایبەتیش لە لایەن ئیوانەوە، ئەوەندەی تر ئۆقرەی لێهەڵگرتبوو. لە دڵ خۆیدا گوتی: «لانیکەم تا ئێستا بەهۆی ئاگادار بوون لە پێشکەوتی فەرهەنگ لە ڕیزی پێشەوە بووم و ئێستا بەرەی نوێ ئێمە هەر بە هیچ نازانن.»

فیۆدۆر پاولۆویچ کە بەڵێنی دابوو ئارام دانیشێ و ورتەی لێوە نەیەت، ماوەیەکیش بێدەنگ بووبوو. بەڵام زەردە خەنەیەکی تەوساوی میۆسۆفی خستبووە ژێر چاوەدێری و ڕواڵەتەن کەیفی بە شکست و بەزینی دەکرد. ماوەیەک چاوەڕێ بوو، تاکو حیسابە کۆنەکانی پاک بکا و ئێستا نەیدەویست هەلی لە کیس بچێ. سەری لە میۆسۆف بردە پێشێ و بە سرتە دیسان سەری خستە سەری.

- کەوایە بۆ ئێستا، دوای «ماچکردنی پڕ لە ڕێز» نەڕۆیشتی؟ بۆ ڕازی بووی لە کۆڕێکی ئاوا ناجۆردا دانیشی؟ بۆ ئەوەبوو هەستت کرد

سووکایەتیت پێکراوە و بۆیە نارۆی دەتەوێ وریایی و زانایيت بە چاویاندا بدەیەوە و تۆڵەی خۆت بکەیەوە؟

ـ دیسان تۆ؟.... بەپێچەوانە هەر ئێستا دەڕۆم.

فیۆدۆر پاولۆویچ، لە سەروبەندی گەڕانەوەی زووسیمادا، زەبرێکی دیکەی لە میۆسۆف وەشاند: «بەسەری خۆت وایە! تۆ لە دوای هەموومان دەڕۆی.»

دەمەتەقێ بۆ چەن ساتێک ڕاوەستا، بەڵام پیر کاتێ لە جێگای پێشووی دانیشتەوە، جۆرێک چاوی لێکردن وەک ئەوەی بەڕێزەوە داوایان لێبکا درێژە بە قسەکانیان بدەن. ئالیووشا کە لە هەموو حاڵەتەکانی ڕوخساری پیر دەگەیشت، بۆی دەرکەوت لەڕادەبەدەر ماندوو بووە و بە دژواری خۆی بە پێوە ڕاگرتووە. لەم ئاخریانەدا کاتێ زۆر ماندوو دەبوو بێهۆش دەکەوت. ڕەنگی هەڵبزڕکابوو کە ئەوەش بەر لە بێهۆشبوون ئاساییە و لێوی سپی هەڵگەڕابوون. بەڵام وادیار بوو نایەوێ کۆبوونەوەکە تێکبدا: دەتگوت بۆ ڕاگرتنی ئەوان ئامانجێکی تایبەتی هەیە. چ ئامانجێک؟ ئالیووشا بە وردی خستبوویە ژێر چاوەدێری.

باوە یوسفی کتێبدار، ڕوویکردە زووسیما و ئاماژەی بە ئیوان فیۆدۆرۆویچ کرد و گوتی: «خەریکین سەبارەت بە وتارێکی زۆر باش لەگەڵ ئەو برایە مشتومڕ دەکەین. زۆری قسە و ڕوانگەی تازە تێدایە. بەڵام بە بڕوای من بەڵگەیەکی دوولایەنەیە. وتارەکەی لە وەڵامی کتێبێکدایە کە گەورە پیاوێکی ئایینی سەبارەت بە دادگای کلێسە و ناوچە و شێوەی حوکمەکەیەتی.»

پیر چاوێکی ورد و مووقلێشانەی لە ئیوان فیۆدۆرۆویچ کرد و گوتی: «سەرنج ڕاکێشە. بەڵام لە چ لایەنێکەوە؟»

ئیوان لە وەڵامی پیردا، بەڵام نەک بە شێوەیەکی لەخۆباییانە، کە ئالیووشا ڕۆحی لێی تۆقیبوو، بەڵکو بە خاکەڕایی و خێرخوازییەکی ئاشکراوە و ڕواڵەتەن بە بێ هیچ مەبەستێکی شاراوە گوتی:

ـ لێرەوە دەست پێدەکەم کە پێوەندیی ڕەگەزەکان، یانی پێوەندیی بنەمای سەرەکیی کلێسە و حکوومەت کە بە شێوەیەکی جیاواز لەبەر چاو گیراوە و هەڵبەت هەتا هەتایە هەر درێژەی دەبێ، بە پێی ئەم ڕاستییە مەحاڵە و هیچ کات نابێتە هۆی ئاکامێکی چەسپاو یان تەنانەت سروشتی. چونکە بناغەکەی لە سەر هەڵە و ناتەکووزی دامەزراوە. پێوەندیی کلێسە و حکوومەت لە بواری حوکم و دەوڵەتداریدا بە بڕوای من بە هیچ کلۆجێ ناگونجێ و هەڵەیەکی گەورەیە. دژوازە ئایینییەکانی من لە سەر ئەو باوەڕە بوون کە کلێسە پێگەیەکی باڵا و ڕاست و دیاریکراوی لە حوکوومەتدا هەیە. من بە پێچەوانە پێموایە کلێسە دەبێ دەستی لە تەواوی کاروباری حکوومەتدا ببێ، نەک تەنیا چەمکێکی بگرێ، ئەگەر ئەم خاڵەش لەم دەمودەستەدا، بە هێندێ هۆ، مەحاڵە، کەوایە دەبێ لە ڕاستیدا ببێتە ئامانجی ڕاستەقینە و سەرەکیی پێشکەوتنی داهاتووی کۆمەڵگای مەسیحی!

باوە پاسیی، ڕاهیبی بێدەنگ و بیرمەند، بە ئیرادەیەکی پتەوەوە گوتی: «ڕاست وایە و قسەی تێدا نییە.»

میۆسۆف لاقی لە سەر لاقی ئەمبارەوبار کرد و گوڕاندی: «ئەرێ ئولترامۆنتانیسم ـی خالیس!»[10]

باوە یوسفیش دەنگی هەڵێنا: «لێرە خۆ «موونتان[11]»مان نییە.» پاشان ڕووی کردە زووسیما و درێژەی بە قسەکانی دا: «قوربان بڕوانە ئەوە بەلایخۆی پیاوی ئایینییە، دیوتە چۆن وەڵامی بەر هەڵستکاری خۆی دەداتەوە و چۆن دەڕوانێتە بنەمای «سەرەکی و نبەوەشەیی» ئەو. «هیچ ڕێکخراو و کۆمەڵگایەک نابێ و ناتوانێ ئەو دەسەڵاتەی بۆخۆی پێڕەوا بێ کە مافی کۆمەڵایەتی و ڕامیاریی ئەندامانی خۆی دیاری بکا.» دووهەم ئەوەیە، «دەسەڵات لە بواری جینایی و کۆمەڵایەتیدا نابێ بدرێ بە کلێسە،

10- ئولترامۆنتانیسم ultramontanism بریتییە لە بزووتنەوەیەک کە دەسەڵاتی تەواو دەبەخشێ بە پاپا لە کاروباری دەوڵەت و کلێسەدا.

11- باوە یوسف کە لەو واژەیە ناگا «مۆنتان» بە mountain (کێو) حاڵی دەبێ، بۆیە دەڵێ: »لێرە موونتان (کێو)مان نییە.

چونکە چۆنیەتیی ئەو، چ وەک چوارچێوەی دامەزراوەیەکی خودایی و چ وەک چوارچێوەی ڕێکخراوەیەکی دەستکردی مرۆڤ بۆ ئامانجگەلی ئایینی نابێ و پێکەوە دژایەتییان هەیە» و «وەلحاسڵ کلێسە خودای ئەم جیهانە نییە.»

باوە پاسیی نەیتوانی لە هێنانەگۆڕێی ئەو قسە خۆ ببوێرێ : «ئەو جۆرە کایە کردنە بە وشە لە پلەوپایەی پیاوێکی ئایینی ناوەشێتەوە!» پاشان ڕووی کردە ئیوان فیۆدۆرۆویچ و گوتی: «ئەو کتێبەم خوێندەوە کە وەڵامت دابۆوە و ڕەخنەت لێگرتووە، لەو ڕستەیەش سەرم سوورما کە دەڵێ: «کلێسە یاسا دانەری خودا لە سەر ئەم جیهانە نییە.» ئەگەر کلێسە لە سەر ئەم جیهانە دەسەڵاتێکی خودایی نەبێ، کەوایە بە هیچ شێوەیەک بۆی نییە لە سەر زەوی بوونی هەبێ. لە ئینجیلدا ڕستەی «ئەم جیهانە نا» بەو مانایە نەهاتووە، کایە کردن بەو جۆرە وشانە بۆ پارێزگاری نابێ. ڕێبەری مەزنی ئێمە، عیسا مەسیح هات تاکو کلێسە لە سەر زەوی دروست بکا. هەڵبەت دەسەڵاتی ئاسمانی تایبەتی ئەم جیهانە نییە. بەڵکو درگای بەهەشتە، بەڵام لە ڕێگای کلێسەوە، کە لە سەر زەوی ڕۆنراوە و دامەزراوە، دەتوانین سەری پێداکەین. یاریکردنی ئاواش بە وشە سەبارەت بەوە کارێکی ناحەزە و بۆ لێبوردن نابێ. لە ڕاستیدا، کلێسە دەسەڵاتی خودایە و ئەو یاسایە بۆیە هەیە تاکو دەسەڵاتداری بکا. لە ئاکامیشدا بێگومان دەبێ ببێتە یاسایەکی ئاسمانی و بە سەر تەواوی زەویدا زاڵبێ و دنیا لە ژێر دەسەڵاتی ئەودا بێ. ئەوەش بەڵێنی خودایە بە ئێمە دراوە.»

باوە پاسیی لە ناکاو دەستی لە قسەکانی هەڵگرت، وەک ئەوەی دان بە خۆیدا بگرێ. ئیوان فیۆدۆرۆویچ بە وردی و ڕێزەوە گوێی لە قسەکان گرتبوو، پاشان هەر بەو ڕێز و حورمەتەوە ڕووی لە زووسیما کرد:

ـ کاکڵی وتارەکەم لەم ڕاستییەدا شاردوەتەوە کە ئایینی مەسیح، لە ماوەی سێ سەدەی یەکەمدا، جگە لە کلێسە لە هیچ شوێنێکی دیکەی ئەم زەوییە نەبوو و لە کلێسەش زیاتر هیچمان نەدی. لە ئیمپڕاتۆڕیی ڕۆمدا کاتێ ئایینی مەسیح دەسەڵاتی بە دەستەوە گرت و کافران ئیمانیان هێنا، ئەو

ئیمپڕاتۆرەش ناچار بوو لەگەڵ کلێسە ڕێک بکەوێ. بەڵام لە زۆر ناوەندی حکوومەتیدا کافر هەرمابوون. لە ڕاستیدا ئەو پێشهاتەش ناچاری بوو. بەڵام ڕۆمییەکان لە بنەمای حکوومەتەکەیاندا زۆربەی ژیارو فەرهەنگی بێدینییان زیندوو کردەوە، بۆ وێنە، لە ئامانج و بنەمای سەرەکیی حکوومەتدا. کاتێ کلێسەی مەسیحیان بردە گۆڕەپانی حکوومەتەوە، دەیانتوانی ڕێژەیەک لە بنەمای سەرکی ـ یانی ئەو بناغەی کە کلێسەی لە سەر دامەزرابوو ـ گەشە پێنەدەن و بە دوای ئامانجێکی دیکەشدا نەڕۆن، جگە لەو ئامانجەی کە خودا دایناوە و خۆی ناردوویەتە خوارێ. باوەڕ پێهێنان و ڕاکێشانی ئەو خەڵکەی دەستیان لە حکوومەتدا بوو، بەڵام باوەڕیان بە کلێسە نەبوو.

بەمشێوەیە (یانی، بە ڕوانین لە داهاتوو) وا نییە کە بۆ کلێسە وەک هەموو «ڕێکخراوەیەکی کۆمەڵایەتی» یان «ڕێکخراوەیەکی خێرۆمەندی» (هەروەک قەشەی نووسەری ئەو کتێبە دەڵێ) بە شوێن پلە و پایەیەکی دیاریکراوەوە بن لە حکوومەتدا. بەپێچەوانە، هەموو حکوومەتێکی دنیایی لە هەمبەر کلێسادا گۆڕانی بەسەردا دێ و دەبێتە بەشێک لە کلێسە و هەر ئامانجێک کە لەگەڵ قەستی کلێسە یەکنەگرێتەوە تووڕ هەڵدەدرێ. ئەوەش بە هیچ شێوەیەک پلە و پایە و پیرۆزیی کلێسە ناهێنێتە خوارێ و لە شانازی و مەزنایەتیی وەک حکوومەتێکی گەورە کەم ناکاتەوە، هەروەها لە گەورەییی دەسەڵاتدارەکانیشی کەم ناکاتەوە، بەڵکو لە ڕێگای پڕ لە پێچ و پەناو پڕ لە تاوان کە هەروا کوفر و بێدینیی پێوەیە دوور دەکەوێتەوە و دەچێتە سەر ڕێگای ڕاست و هەق کە بە ئامانجی هەرمان و تا هەتایی دەگا. هەر لەبەر ئەوەشە نووسەری کتێبی «لە بناغەکانی دەسەڵاتداری کلیسادا» بە شێوەیەکی ڕاست و ڕەوان نێوبژیوانیی دەکرد. کە لە دۆزینەوە و دانانی ئەو بنەمایانەدا، تەنیا بە چاوی سازگارییەکی کاتی و پابەندبوون لە سەردەمی تاوانبار و سەقەتی ئێمەدا تێیدەڕوانن. بەڵام نووسەر، کە دێتە سەر ئەوەی ئەو بنەمایانە پێشبینی بکا و باوە یوسف ئێستا ئاماژەی بە هێندێکیان کرد، بە شێوەی بنەماگەلێکی تاهەتایی و سەرەکیی دێنێتە ئەژمار. ڕاست بە

پێچەوانەی کلێسە و ئامانجی پیرۆز و هەرمانی هەنگاو هەڵدێنێتەوە. ناوەڕۆکی وتارەکەشم ئەوەیە.

باوە پاسیی، بە پێداگری کردن لە سەر هەر وشەیەک، درێژەی بە قسەکانی دا. «یانی بە شێوەیەکی کورت، بە پێی بیروڕایەک کە زۆر بە ڕوونی لە سەدەی نۆزدەدا بناغەی بۆ داڕێژراوە، کلێسە دەبێ ببێتە حکوومەت. گوایە ئەوەش پێشکەوتێک دەبێ لە خوارەوە بەرەو سەرێ و لە نێویدا دەتوێتەوە و ڕێگا بۆزانست و ڕۆحی سەردەم و ژیار دەکرێتەوە. ئەگەر کلیساش پێداگری بکا و ڕازی نەبێ لە حکوومەتدا بەشداری بکا، ئەویش بە شێوەیەکی سەربەخۆ لە هەموو جێگایەک و لە تەواوی وڵاتە تازە و فەڕەنگییەکان جێبکەوێ، بەڵام لە ڕووسیا بەو پێیەی ئاوات و هیوا و تێگەیشتنێکی زۆرمان لە کلێسە هەیە، نامانەوێ لە خوارەوە بەرەو سەرێ بڕوا و لە نێو حکوومەتدا جێی خۆی بکاتەوە، بەڵکو بە پێچەوانە دەمانەوێ حکوومەت ئەوەندە بەرز و مەزن بێ، کە لە ئاکامدا ببێتە کلێسە نەک شتێکی دیکە. بۆیە دەڵێم هەروا بووە و هەروا دەبێ!»

میۆسۆف دیسان لاقی خستەوە سەر لاق و بە بزەیەکەوە گوتی: «چاکە، دانی پێدادەنێم کە هەتا ڕادەیەک دڵنیاتان کردووم. کەوایە تا ئەو جێیەی من تێیدەگەم، کاتی دەرکەوتنی ئەو حەزرەتە، تێگەیشتن لە ئانانجێکی وا زۆر مەحاڵ بووە. چۆنتان پێخۆشە با وابێ. خەونێکی خۆش و بێ سەرەوبەرەیە سەبارەت بە لەنێوچوونی شەڕ و سیاسەت و بانک و هتد... لە ڕاستیدا، شتێک بە شێوەی سۆسیالیزم. بەڵام من پێموابوو وتارەکەتان جیددییە و بە یاسای کلێسە هەر لە ئێستاوە دەتوانن تاوانباران دادگایی بکەن و قامچی و زیندان و تەنانەت مەرگیان بۆ ببڕنەوە.»

ئیوان فیۆدۆرۆویچ، بێ ئەوەی لە ژێری دەرچێ بە ئارامی وەڵامی دایەوە: «بەڵام ئەگەر دادگایەک جگە لە دادگای کلێسە ببێ، تەنانەت ئێستاش لە لایەن کلێسەوە تاوانبارێک زیندان یان مەرگی بۆ نەدەبڕایەوە و تاوان و شێوەی

بەسەردا سەپاندنی ناچار گۆڕانی بەسەردا دەهات، هەڵبەت نەک بە شێوەیەکی کتوپڕ، بەڵکو بە زووترین کات.»

میۆسۆف چاوێکی ڕەخنەگرانەی لێکرد: «بەڕاستتە؟»

ئیوان فیۆدۆرۆویچ لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: «ئەگەر هەموو شتێک بووبوایەتە کڵێسە، هەموو یاخی و تاوانبارانیان بەرەڵڵا دەکرد و سەریان نەدەپەڕاندن، گەورەترین سزایان شار بەدەرکردن و دوور خستنەوە دەبوو. لە تۆ دەپرسم ئەو مرۆڤە شار بەدەرو تاراوانە چییان بە سەر دەهات؟ وەک ئێستا، مرۆڤی پەڕیوە و تاراو ناچار دەبوو نەک هەر لە خەڵک، تەنانەت لە ئایینی مەسیحیش دوور بکەوێتەوە. ئەو کاتە دەرهەق بە خەڵک و کڵێسە تاوانی دەکرد و دەستدرێژیی دەکردە سەریان. هەڵبەت ئەمڕۆش بارودۆخ هەروایە، بەڵام بە ڕوونی بەیان نەکراوە و تاوانبار زۆرجار لە ڕووی ویژدانەوە لە کارەکەی پاشگەز بۆتەوە و جاریواش بووە بە ئەقڵی خۆی هێندێ ڕێوشوێنی بۆ خۆی کێشاوە. بۆ وێنە دەڵێن: «ڕاستە دزیم کردووە، بەڵام خۆ دژایەتیم لەگەڵ کلێسا نەکردووە و دوژمنایەتی لەگەڵ مەسیحیش ناکەم.» ئەوە شتێکە کە تاوانباری ئەمڕۆ بەردەوام بە خۆی دەڵێ. بەڵام کاتێک کلێسا جێگای حکوومەت بگرێتەوە، ئەو کاتە ناتوانێ دژایەتی لەگەڵ کلیسای تەواوی دنیا بکا. «هەموو مرۆڤێ تووشی هەڵە و تاوان دەبێ. مرۆڤایەتی هەمووی کلێسەیەکی درۆینەیە و منی دز و پیاوکوژ کلێسەیەکی ڕاستەقینەی مەسیحم.» زۆر ئەستەمە ئەوە بەخۆی بڵێ، کە کۆمەڵگایەکی پڕ لە تاوان و دژایەتی بارودۆخێکی چەتوون و تایبەت پێکدێنێ. لە لایەکی دیکەوە، بیروڕای کلێسە سەبارەت بە تاوان بێنە بەرچاوی خۆت: پێت وانییە دەبێ بە پێی بارودۆخی ئەمڕۆ کە هێشتاش هەر لە سەر ئەو بنەما کۆنە ڕاوەستاوە، ئاڵوگۆڕی بەسەردا بێ؟ ئەو کەرەسەی پیشەسازییەی ئەمڕۆ بۆ بەرگری کردن لە کۆمەڵگا بەکاری دێنن؟ یانی ئەندامی نەخۆش لە جەستەی کۆمەڵگا جیا دەکەنەوە، وازی لێبێنن و بیرۆکەی لەنوێ خولقانەوەی مرۆڤ و

بەرژەوەندی و چارەسەری کۆمەڵگا و ڕزگار کردنی بە شێوەیەکی گونجاو و بەویژدانانە هەڵبژێرن؟»

میۆسۆف پەڕییە نێو قسەکانیەوە: «مەبەستت چییە؟ لێت تێناگەم. دیسان جۆرێک خەون و خەیاڵ. شتێکی دوور لە زەین، مەبەستت لە شاردنەوە و شێوەی شاربەدەر کردنەکە چییە؟ ئیوان فیۆدۆرۆویچ پێموایە تۆ دەتەوێ پێمان ڕابوێری.»

زووسیما کتوپڕ گوتی: «بەڵێ، بەڵام دەزانی لە ڕاستیدا ئێستا وایە.» هەموو سەریان بۆ لای پیر وەرسووڕاند. «ئەگەر لەبەر کلێسەی مەسیح نەبوایە هیچ شتێک، کەسی تاوانباری لە سەرەڕۆیی و بێ بەندوباری پاشگەز نەدەکردەوە و لێبووردن و ڕزگار کردنی ڕاستەقینەش پاشان لە ئارادا نەدەبوو. یانی هیچ شتێک جگە لە بەخشینی دەستکرد، کە هەر ئێستا باسی لێکرا، کە لە زۆر لایەنەوە دڵتەزێنە و بەخشینی ڕاستەقینە لە ئارادا نەدەبوو. تەنیا لێخۆشبوونێک کە چارەسەرە و تەنیا لێبوردنێک کە پاشگەزکەرەوەیە و دڵی تاوانبار شاد دەکا، ئەوەیە کە لە ڕووی ویژدانەوە تاوانی خۆی بناسێ و ئەو وزە شاراوەیەی ناخی خۆی وەدەرخا و وەکاری بخا.»

میۆسۆف بە کونچکاوی پرسیی: «پێمخۆشە گەورەیی بنوێنی و زیاترمان بۆ ڕوون بکەیەوە؟»

پیر گوتی: «باشە، سەردەمانی زووش تەواوی ئەو حوکمی شاربەدەرکردن و دوور خستنەوە بە کاری گرانەوە، لێدانی قامچیش کەسی نەهێنایەوە سەر ڕێگای ڕاست و تاوانباری بۆ کۆنترۆڵ نەکرا و نەیتوانی تاوانیش کەمبکاتەوە. بە پێچەوانەوە زیاتریشی کرد. خۆ ئەوە دەسەلمێنن؟ لە ئاکامدا هێمنایەتیی کۆمەڵگا ناپارێزرێ. چونکە هەرچەندە ئەندامی ملۆزم و مێملّ لە کۆمەڵگادا بە شێوەیەکی دەستکرد جیا کەیتەوە و هەڵیگری لەبەر چاو، خێرا تاوانبارێکی دیکە و زۆرجار دوو کەسی دیکە جێگاکەی پڕ دەکەنەوە. ئەگەر شتێک پارێزگاری لە کۆمەڵگا بکا، تەنانەت لە سەردەمی ئێمەشدا تاوانبار جارێکی دیکە لەدایکدەبێتەوە و دەست بە کار دەبێتەوە. تەنیا

یاسای مەسیح دەتوانێ لە ویژدانی ئەودا جێ بکاتەوە و تەنیا بە ناسینی تاوانەکانی لە پلە و پایەی کۆڕێکی کۆمەڵگای مەسیحیدا ـ یانی کلێسەیە کە تاوانەکانی دەرهەق بە کۆمەڵگا ـ یانی دەرهەق بە کلێسە ـ پێدەناسێنێ. ئەوەیە کە تاوانباری ئەمڕۆ تێدەگا کە دەرهەق بە کلێسە تاوانی کردووە، نەک دەرهەق بە حکوومەت. ئەگەر کۆمەڵگاش وەک کلێسە دەسەڵاتی بووبووایە، ئەو کاتە دەیزانی کێ لە دوورەپەرێزی و پەڕیوەیی بگێڕێتەوە و دیسان بەخۆی پەیوەند بداتەوە. ئێستا لە کلێسەدا لەبەر نەبوونی دەسەڵاتی ڕاستەقینە، جگە لە دەسەڵاتی بەسەردا سەپاندنی حوکمی ئەخلاقی، بە مەیلی خۆیان لە تاوانباران خۆش دەبن و هیچ سزایەکیان بەسەردا نادەن، تەنیا پێداگری لە سەر ئامۆژگارییەکی باوکانە دەکەن. جگە لەوەش، هەوڵدەدەن هەموو فەرز و دابەکانی مەسیحی فێری تاوانبار بکەن و ڕێگای پێدەدەن لە ڕێوڕەسمی ئاینیدا بەشداریبکا. لە خێر و خێرات بەشی دەدەن و وەک دیلێک هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکەن، نەک تاوانبار. خوداش دەزانێ تاوانبار چیی بە سەر دەهات ئەگەر لە کۆمەڵگای مەسیحی ـ یانی کلێسەش ـ دەریان بکردایە، جا ئەگەر یاسای کۆمەڵایەتی شاربەدەری بکردایە، دەبوو چی بکا؟ ئەگەر کلێسەش بە سزادان وەک ئاکامی ڕاستەوخۆی یاسای دنیایی لە تاوانی خۆش بوایە؟ ئیتر هیوابڕاوی لەوە ناخۆشتر هەر نەبوو. لانیکەم بۆ تاوانبارانی ڕووسی، چونکە تاوانبارانی ڕووسی هەروا خاوەن ئیمانن. ئەگەرچی دەشزانێ، لەوانەیە ڕووداوێکی سامناک بقەومێ، ڕەنگە دڵی ناهومێدی تاوانبار ئیمانی پێنەمێنێ جا ئەو کاتە چیی بە سەر دێ؟ بەڵام کلێسە وەک دایکێکی دڵسۆز و دڵۆڤان، خۆی لە بەخشینی لانادا، چونکە تاوانبار لە لایەن یاسای مەدەنییەوە بە سەختی سزا دراوە و دەبێ لانیکەم کەسێک ببێ بەزەییی پێیدا بێ. کلێسە لە سەروو هەموو شتێکەوە، خۆی ڕادەگرێ و حکمەکەشی تەنیا حوکمێکە کە داگری هەقیقەتە. بۆیەش لە ڕوانگەی زانستی و ئەخلاقییەوە ناتوانێ لەگەڵ هیچ حوکمێکی دیکە، تەنانەت بە شێوەی سازشتێکی کاتی، یەک بگرێتەوە. کەوایە لەو بارەوە ناتوانێ تێکەڵ

بە هیچ جۆرە پەیمانێک ببێ. دەڵێن تاوانباری بیانی تۆبە ناکەن. چونکە ئایینەکانی سەردەم وای هاندەدەن کە تاوانەکەی تاوان نییە، بەڵکو تەنیا دژ کردەوەیەکە لە هەمبەر دەسەڵاتێکی زاڵمانەدا. کۆمەڵگا بە وزەیەکەوە کە بە شێوەی دەستکرد بە سەریدا زاڵدەبێ، بە یەکجاری تەرەی دەکات و (لانیکەم لە فەرەنگ لەخۆیانەوە وا دەڵێن) ئەم شاربەدەر بوونەشیان لەگەڵ قین و بێزاری و لەبیر چوونەوە و ئەوپەڕی سەرسارد‌ی ، وەک چارەنووسی «غایی» برای خەتاکار، بەرەووڕوو دەبێ. بەو پێیە هەموو شتێک بەبێ دەستتێوەردانی دڵسۆزانەی کلێسە بەڕێوە دەچێ، چونکە لە زۆر لایەنەوە لەوێ کلێسە لە ئارادا نییە. بۆیە هەرچەند پیاوانی ئایینی و کۆشک و باڵەخانەی بەشکۆی کلێسە ماونەتەوە، هەوڵیشیان داوە ـ لە زۆر زووەوە کلێسە لە خوارەوە بەرەو سەرێ ڕاگوێزن و بە ناوی حکوومەت بەرزی کەنەوە و بە تەواوی ئاڵوگۆڕی بەسەردا بێنن. لانیکەم لەو وڵاتانەی کە ئایینێکی نوێتریان هەیە، وایە. بەڵام لە ڕۆم هەزار ساڵ لەمەوبەر لەجیاتی کلێسە، حکوومەتیان ڕاگەیاند، هەر بۆیە تاوانبار لە بوونە ئەندامی کلێسە ئاگادار نییە و هیوابڕاو دەبێ. ئەگەر بگەڕێتەوە کۆمەڵگا، زۆرجار لەگەڵ ڕق و بێزاری بەرەو ڕوو دەبێ و کۆمەڵگا تەرەی دەکا. خۆتان دەتوانن ڕای خۆتان دەربڕن کە داهاتوو چۆن دەبێ. لە زۆر لایەنەوە وا دەنوێنێ کە ئێمەش واین، بەڵام جیاوازی لەوەدایە کە جگە لە یاساوڕێسای دادگا، کلێسەشمان هەیە کە تاوانبار وەک کوڕی خۆشەویستی خۆی چاو لێدەکا و پێوەندیی لەگەڵ ناپسێنێ. بێجگە لەوەش حوکمی کلێسە هەروا بەردەوام دەبێ، ئەگەرچی تەنیا وەک بیرۆکەیەک وایە و ئیتر بەکردەوە بوونی نییە، بۆیە وەک خەونێکی شیرین بۆ داهاتوو زیندووە و بێگومان، تاوانبار لە ناخی خۆیدا لەو غەریزەیە دەگا و ئەوەی ئێستا لێرەش باسکرا هەمووی ڕاستە. یانی ئەگەر دەسەڵاتی کلێسەی بە خۆیەوە بگرتایە، حوکمی کلێسەش لە سەر تاوانبار شوێنی دادەنا و لەوانەبوو تاوان و سەرپێچیش ئەوەندە کەم بێتەوە جێگای باوەڕ نەبێ. شکیشی تێدا نییە کلێسە لەوەبەولاوە بە چاوێکی دیکە

تەماشای تاوان و تاوانباری دەکرد و بۆ هێنانەوەی شار بەدەرکراوەکان و لە بەند کردنی ئەوانەی شەڕ و گێرەشێوێنی دەکەن، تا ڕادەیەکی زۆر سەر دەکەوت و ژیانێکی تازەی بۆ شکستخواردووەکان دابین دەکرد.» باوە زووسیما بە پێکەنینەوە گوتی: «ڕاستە کۆمەڵگای مەسیحی ئێستا ئامادە نییە و تەنیا پشتی بە حەوت مرۆڤی عادڵ بەستووە، بەڵام بەو پێیەی کە کۆمەڵگا قەت مرۆڤی عادڵی لێنابڕێ، بەهیواین کۆمەڵگای تاڕادەیەک بێئیمان بەرەو خووخدە و باوەڕێکی کلێسەیی و جیهانی ڕادەین و دەسەڵاتەکەشی هەروا بەرز و خۆڕاگر بمێنێتەوە. هەروا دەبێ! هەروا دەبێ! چونکە زەمانی دنیا ئاخر بوون، ـ کە خودا وایداناوە ـ نابێ بە هیچ شێوەیەک دڵاودڵی لێبکەین، لەبەر ئەوەی ڕازی زەمان لە حیکمەتی خودا دایە و لە ڕوانگەی عەشقی ئەودایە. ئەوەش بە پێوانەی مرۆڤ زۆر دوور دەنوێنێ، بەڵام ئەوە لەبەر دەستی ویست و دەسەڵاتی خودا دایە و هەر کات و ساتێک لەوانەیە بقەومێ. هەروا دەبێ! هەروا دەبێ!»

باوە پاسیی زۆر بە دڵپاکی و ڕێزەوە دووپاتی کردەوە: «هەر وادەبێ! هەر وادەبێ!»

میۆسۆف هەڵیدایە و بە ڕقێکی شاراوەوە گوتی: «سەیرە، زۆر سەیرە!»

باوە یوسف بە لەسەرەخۆیی گوتی: «بە بڕوای تۆ چی سەیرە؟»

میۆسۆف لەپڕ گوڕاندی: «ئەوە ئیتر لەگەڵ عەقڵ یەک ناگرێتەوە، کە حکوومەت لە نێو بچێ و کلێسە بە دەسەڵات بگا. ئولترامۆنتانیسم هیچ، ئولترامۆنتانیسمی گەورەشە! لەوپەڕی خەون و خەیاڵی پاپ گریگۆری حەوتەمەوەیە!»

باوە پاسیی بە تووڕەیی گوتی: «زۆر بەپێچەوانە لێکی دەدەیەوە. چاو لێبکە، کلێسە ڕواڵەتی حکوومەت ناگۆڕێ. لە کلێسەی ڕۆم وا دەڵێن و ئەو خەون و خەیاڵەیان لە سەر دایە. ئەوە ئیتر سێهەمین وەسوەسەی شەیتانە[12]، بەپێچەوانە حکوومەت ڕواڵەتی کلێسە دەگۆڕێ، سەر دەکەوێت و

12- بڕوانە ئینجیلی «مەتی» بەشی چوارەم

سەرتاسەری جیهان دادەگرێ. ئەوەش ڕاست بە پێچەوانەی ئۆلترامونتانیسم و پیاوانی ئایینیی ڕۆم و لێکدانەوەی ئێوەیە و تەنیا چارەنووسێکی پڕ شکۆیە کە بۆ کلێسەی کاتۆلیک بڕدراوەتەوە و ئەو ئەستێرەیەش لە ڕۆژهەڵاتەوە هەڵدێ!»

میۆسۆف قیت و مانادار و بێدەنگ دانیشتبوو. قەڵافەتی قورساخییەکی تایبەتی پێوە دیار بوو. بزەیەکی پڕ لە پۆز و هەوا لە سەر لێوی بوو. ئالیووشا بە دڵەکوتێوە لێی دەڕوانی و لە تاوی ئەو قسانە لە ناخەوە هەڵدەچۆقا، لەپڕ چاوی بە ڕاکیتین کەوت لەلای دەرگاکەوە لە سەر جێی خۆی ڕاوەستابوو، گوێی شلکردبوو و بە وردی چاوی بە کوڕەکەدا دەگێڕا. بەڵام بە ڕەنگە هەڵبزڕکاوەکەیدا بۆی دەرکەوت، ئەویش دڵی کەوتۆتە قرت و فرت و دەشیزانی هۆی دڵەخورپەکەی چییە.

میۆسۆف بە لووتبەرزی و هەوایەکەوە گوتی: «براکانم، ئیزنم بدەن شتێکتان بۆ بگێڕمەوە. چەن ساڵ لەمەوبەر، ڕاست دوای کودەتای دیسامبر[١٣]، خوداوڕاستان لە پاریس چووم بۆ دیدەنیی کەسایەتییەکی دەستڕۆیشتووی دەوڵەت. لە ماڵی ئەوان مرۆڤێکی زۆر سەیرم دی. ئەو کابرایە بەڕاستی سیخوڕ نەبوو، بەڵکوو سەرکردەی دەستەیەک سیخوڕی سیاسی بوو ـ پلە و پایەیەکی باشی هەبوو و تاڕادەیەک دەسەڵاتدار بوو. کونچکاوی وای لێکردم دەرفەتی ئاخافتن لەکیس نەدەم و چونکە وەک میوان نەهاتبوو، بەڵکوو وەک فەرمانبەرێکی ژێردەست هەواڵێکی تایبەتی هێنابوو، بەو پێیەش کە بۆی دەرکەوت لە لایەن بەرپرسەکەیەوە ڕێزم لێگیراوە، وای نواند کە بێ پەردە قسە دەکا، هەڵبەت تاڕادەیەک. دەکرێ بڵێین پیاوێکی بەئەدەب بوو. ئەو جۆرەی کە فەڕەنسی دەزانن بەئەدەب بن، بەتایبەت دەرهەق بە غەریبان. بەڵام من بە جوانی لە قسەکانی دەگەیشتم. باسی شۆڕشگێڕانی سۆسیالیستی دەکرد، کە ئەو کاتە دادگاییان کردوون. زۆری لە سەر ناڕۆم و بە سەر

13- دووهەمی دیسامبر ١٨٥١ لوویی ناپیلیۆن دەوڵەتی فەڕەنسای ڕووخاند و خۆی ساڵی دوایی بوو بە ئیمپڕاتۆڕ.

پوختەی مشتومڕەکەدا تێدەپەڕم، ئەو کابرایە لە کاتی قسەکانیدا شتێکی سەیری لە دەم دەرچوو کە گێڕانەوەی ئەو وتەیە لەم کۆڕەدا بەجێیە، گوتی: «لەو سۆسیالیست و ئانارشیست و بێدینانە باکمان نییە، بۆ ساتێکیش چاویان لێ غافڵ ناکەین و لە کاروباریان ئاگادارین. بەڵام لە نێوان ئەواندا چەن کەسی سەیر هەن کە ئیمانیان بە خودا هەیە و مەسیحین، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا سۆسیالیستیشن. لەو جۆرە مرۆڤانە زۆر دەترسین. کەسانێکی مەترسیدارن. پیاو دەبێ زیاتر لە سۆسیالیستی مەسیحی بترسێ نەک سۆسیالیستی بێدین.» لەو کاتەدا زۆر سەرنجی ڕاکێشام و ئێستا لە ناکاو ئەو قسانەم وەبیر هاتەوە.»

باوە پایسی، بێئەوەی قەراغی لێبکێشێ گوتی: «وتەکانی ئەو لەگەڵ هی ئێمە هەڵدەسەنگێنێ و بە چاوی سۆسیالیستیش تەماشای ئێمە دەکەی؟» بەڵام بەرلەوەی پیووتێر ئەلکساندرۆویچ بیر لە وەڵام بکاتەوە، دەرگا کرایەوە و دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، کە هەتا ئەو کاتە چاوەڕوانی بوون، هاتە ژوورێ. لەڕاستیدا ئیتر بەهیوای هاتنی نەبوون، هاتنەکەی لەپڕێکدا بۆ ساتێک تووشی سەرسوڕمانی کردن.

## (٦)

## بۆ مرۆڤێکی ئاوا زیندووە؟

دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، لاوێکی بیست و هەشت ساڵانە بوو. قەڵافەتێکی دەستە و لەباری هەبوو کە زیاتر لە تەمەنی خۆی دیاریی دەدا. پیاوانەی دەنواند و توانا و هێزێکی زۆری پێوە دیار بوو. لەگەڵ ئەوەشدا، ناساخییەک بە ڕوخسارییەوە دیار بوو. دەموچاو باریک و ڕوومەتی تێکقوپاو و ڕەنگی زەردهەڵگەڕابوو. چاوی ڕەش و تا ڕادەیەک گەورە و زەق نیشاندەری ورەو خۆڕاگری بوو، بەڵام نیگای لێوڕێژ بوو لە گومان و نهێنی. تەنانەت لە شوێنێکا کە توورە دەبوو و بە ڕقەوە قسەیدەکرد، چاوی لەگەڵ حاڵوباڵیدا یەکی نەدەگرتەوە و شتێکی دیکە بە سەرنج و ڕوخسارییەوە دیار بوو. ئەو کەسانەی لەگەڵی دەکەوتنە قسە، هێندێ جار دەیانگوت: «ڕوون نییە بیر لە چی دەکاتەوە.» ئەو کەسانەی کە حاڵەتێکی پەرۆش و عەبووسیان لە چاویدا دەدی، سەریان لە پێکەنینە کتوپڕەکەی سووڕ دەما، چونکە هەر لەو کاتەدا کە چاوی خەمین و پەشێو دیار بوو، پێکەنینەکەی نیشاندەری بیر و خەیاڵی شادانە بوو. لەگەڵ ئەوەشدا جۆرێک شێواوی بە ئەدگارییەوە دیار بوو کە لەم کاتەدا تێگەیشتنەکەی ئاسان بوو. هەموو ئاگاداری ژیانی پڕ لە چەرمەسەرێ و تەنگژەی بوون، دەیانزانی لەگەڵ باوکی لە سەر پارە نێوانیان تێکچووە و تووشی کێشە هاتوون. هەر بۆیە لە نێو شاردا سەربردەی شەڕ و کێشەی باوک و کوڕ بووبووە بنێشتە خۆشەکە. لە ڕاستیدا دیمیتری خووخدەیەکی ئاڵەتیی بوو و مرۆڤێکی توورە و توند تەبیعەت بوو، «بە زەینێکی کز و ناتەکووزەوە» هەر ئەو جۆرەی کە کاشالنیکۆف سەرۆکی دادگاکەمان لە کۆڕێکدا وەسفیکرد.

باڵتەیەکی درێژ و قۆپچەداری لەبەردا بوو. دەستکێشی ڕەشی لە دەست کردبوو و کڵاوێکی تاسەیی بەدەستەوە بوو. لەبەر ئەوەی تازە لە ئەرتەش هاتبووە دەرێ سمێڵی وەک خۆی مابوو و ڕیشی تاشرابوو. تووکەسەرە خورماییەکەی کورت کردبۆوە و لە سەر لاجانگی بۆ پێشەوە دای هێنابوو. وەک پیاوێکی ئەرتەشی هەنگاوی قورس و قایمی هەڵدێنایەوە. لەبەر دادگاکەدا تۆزێک لە جێی خۆی ڕاوەستا، چاوێکی بە دانیشتوانی کۆڕەکەدا گێڕا و ڕاست ڕۆیی بۆ لای پیری کلێسە، چونکە دەیزانی ئەو خانەخوێیە. بە ڕێزەوە کڕنۆشێکی بۆ برد و داوای لێکرد تەقدیسی بکا. باوە زووسیما، لە سەر کورسیلەکەی هەستا و دەستی بە سەریدا هێنا. دیمیتری فیۆدۆرۆویچ بە حورمەتەوە دەستی پیری ماچکرد و بە ناقابلییەکی نزیک بە تووڕە بوونەوە گوتی:

ـ لەوەی کە چاوەڕوانم ڕاگرتن، بە گەورەیی خۆتان بمبوورن، بەڵام ئیسمیر دیاکۆف نۆکەری نێردراوی باوکم، لە وەڵامی پرسیاری مندا، دوو جار بە لەبزێکی خاترجەمانەوە گوتی کاتی دیدار سەعات یەکە. ئێستاش ئەوە دەبینم...

پیری کلێسە گوتی: «خۆت نارەحەت مەکە، قەیدێ ناکا. تۆزێ درەنگ هاتووی، گرینگ نییە....»

ـ سپاستان دەکەم و چاوڕەوانیی ئەو دڵۆڤانییەی ئێوەم هەر دەکرد.»

دیمیتری فیۆدۆرۆویچ دوای ئەو قسەیە جارێکیتر کڕنۆشی بۆ بردەوە. پاشان ڕوویکردە باوکی و بە ڕێز و حورمەتێکی زۆرەوە کڕنۆشێکی بۆ ئەویش برد. دیاربوو لە پێشدا ئەوەی لەبەر چاو گرتووە، چونکە بەوپەڕی نبەوەشەییەوە کڕنۆشێکی برد و دەرکەوت کە بە ئەرکی خۆی دەزانێ ڕێز و پێزانینی دەرهەق بە باوکی نیشانبدا و فیۆدۆر پاولۆویچ ئەگەرچی غافڵگیر بوو، خۆی شلوێ نەکرد. لە وەڵامی کڕنۆشی کوڕەکەیدا لە سەر کورسیلەکەی هەستا و وەک ئەو کڕنۆشێکی پڕ لە ڕێزی بۆ برد. لەپڕ ئەدگارێکی قورساخ و وشکی بەخۆیەوە گرت و ڕووی خۆی تاڵ و دزێو

کرد. دیمیتری سڵاوی لە یەکیەکی دانیشتووان کرد و بێئەوەی زمانی بگەڕێ، بە هەنگاوی قورس و قایم بەرەو پەنجێرەکە ڕۆیشت و لە سەر ئەو کورسیلە بەتاڵەی نزیک باوە پایسی دانیشت. خۆی بۆ پێشەوە نووشتاندەوە و ئامادەی بیستنی مشتومڕێک بوو کە بە سەریدا کەوتبوو.

نزیکەی دوو دەقیقە دەبوو دیمیتری فیۆدۆرۆویچ وەژوور کەوتبوو، کە دەمەتەقێ دەستی پێکردەوە. بەڵام ئەمجارە میۆسۆف، وەڵامی پرسیاری پێداگرانە و تاڕادەیەک تووڕەی باوە پایسیی بە شتێکی بێ بایخ زانی و بە ڕوو هەڵماڵدراوییەکی بەئەدەبانەوە گوتی: «ئیزن بدەن لە خێری ئەو باسە بگوزەرێم. پرسیارەکەشتان پرسیارێکی زۆر ناسکە. ئیوان فیۆدۆرۆویچ خەریکە پێمان پێدەکەنێ. ڕەنگە لەو بوارەدا قسەیەکی بۆ گوتن پێ بێ. لەو بپرسە.»

ئیوان فیۆدۆرۆویچ هەڵیدایە: «قسەیەکی تایبەتییم نییە، جگە لە عەرزێکی چکۆلە. ئازادیخوازانی فەڕەنگ بە گشتی و تەنانەت ئازادیخوازانی بێ ئەزموونی خۆشمان، ئاکامی کۆتاییی سۆسیالیسم زۆرجار لەگەڵ ئاکامی کۆتاییی مەسیحییەت تێکەڵدەکەن. هەڵبەت ئەو بەئاکام گەیشتنە نەزانانەیەش دیاردەیەکی بەرچاوە. بەڵام جگە لە ئازادیخوازان و بێ ئەزموونان، پۆلیسەکانیش -مەبەستم پۆلیسی فەڕەنگە - وادیارە لە زۆر لایەنەوە سۆسیالیسم و مەسیحییەت لێکناکەنەوە. پیووتێر ئەلکساندرۆویچ قسەکەی ئێوەش تاڕادەیەک ڕاستە.»

پیووتێر ئەلکساندرۆویچ میۆسۆف جارێکی دیکە گوتی: «تکاتان لێدەکەم با ئەو باسە بە یەکجاری وەلانێین. لەجیاتی ئەوە، برایان، باسێکی زۆر جێی سەرنج و تاڕادەیەک نموونە لەو ئیوان فیۆدۆرۆویچەتان بۆ دەگێڕمەوە. هەر پێنج ڕۆژ لەمەوبەر لێرە لە کۆڕێکدا، کە زۆربەی دانیشتوانی ژن بوون، زۆر بە جیدی گوتی لە تەواوی دنیادا شتێک نییە کە مرۆڤ وا لێبکا جیرانەکەی خۆی خۆش بوێ، لە سروشتیشدا یاسایەک نییە کە مرۆڤ بەرەو خۆشەویستیی مرۆڤایەتی پەلکێش بکا و ئەو خۆشەویستییە بکاتە ئەرکی

سەرشانی. ئەگەر تا ئێستا لە سەر زەوی ئەوینێک بووبێ، تایبەت بە یاسای سروشتی نەبووە، بەڵکو بەو هۆیەوە بووە کە مرۆڤەکان ئیمانیان بە زیندووبوونەوە بووە. ئیوان فیۆدۆرۆویچ گوتیشی تەواوی یاسای سروشت لە ئیمان بە زیندووبوونەوەدا کۆ بۆتەوە و ئەگەر بڕیار بێ ئیمان بە زیندوو بوونەوە لە مرۆڤدا نەمێنێ، نەک هەر ئەوین بەڵکو هەموو جۆرە وزەیەکی زیندووڕاگری ژیانی دنیا بەیەکجاری لە بێخ و ڕیشەوە وشکدەبێ. لەگەڵ ئەوەشدا ڕەوشتی دژە ئەخلاقی پەرە دەستێنێ و هەموو شتێک، تەنانەت خواردنی گۆشتی مرۆڤیش ئازاد دەبێ. تازە ئەوەش هەموو مەسەلەکە نییە. ئەو وتارەکەی بەوە کۆتایی پێهێنا کە بۆ هەر کەسەی ، وەک خۆمان، کە ئیمانی بە خودا، یان زیندووبوونەوە نییە، پێیوایە یاسای ئەخلاقیی سروشت دەبێ لەڕێوە بە دژی یاسا ئایینییەکەی پێشوو ئاڵوگۆڕی بەسەردا بێ و خۆ پەرستی، تەنانەت هەتا ڕادەی تاوان، نەک هەر ئازاد بەڵکوو تەنانەت وەک سازندەیەکی ناچار و زۆر زانایانە و بەشەڕەفانەی ئەو بارودۆخە بناسرێ؟ برایان! لەم دژایەتییەوە سەبارەت بە هەموو بیروڕا لێک دژەکانی ئیوان فیۆدۆرۆویچی دۆستمان ناوبژیوانی بکەن.»

دیمیتری فیۆدۆرۆویچ لەپڕ گوڕاندی: «بمبوورن، ئەگەر ڕاستم بیستبێ و لێی حاڵی بووبێتم، بۆ هەر بێدینێک، تاوان نەک ئازادە بەڵکو وەک سازەندەیەکی ناچار و زۆر زانایانەی بارودۆخی ئەو دەبێ بناسرێ! وایە یان نا؟»

باوە پایسی گوتی: «ڕاست وایە.»

- ئەوەمان لەبیر ناچێ.

دیمیتری فیۆدۆرۆویچ دوای گوتنی ئەو ڕستەیە، کتوپڕ وەک چۆن دەستی کرد بە قسەکردن ئاواش سکوت بوو. بۆیە هەموویان کونچکاوانە چاویان تێبڕی.

پیری کلێسە لە ناکاو لە ئیوان فیۆدۆرۆویچی پرسی: «یانی بڕوای ئێوە سەبارەت بە ئاکامی لەنێوچوونی ئیمان بە زیندووبوونەوە، لە ڕاستیدا وایە؟»

ـ بەڵێ. باسەکەی من هەر لە سەر ئەو تەوەریە بوو. ئەگەر زیندووبوونەوە نەبێ زانست و گەورەییش نابێ.

ـ ئەگەر باوەڕت بەو وتەیە هەبێ بەختەوەری. دەنا زۆر چارەڕەشی.

ئیوان فیۆدۆرۆویچ بە بزەیەکەوە پرسیی: «بۆ چارەڕەش؟»

ـ چونکە زۆر وێدەچێ ئیمانت نەبێ بە هەرمانی ڕۆح و هەروەها ئەوەی لە وتارەکەتدا سەبارەت بە دەسەڵاتی کلێسە نووسیوتە.

ئیوان فیۆدۆرۆویچ ڕەنگی هەڵبزڕکا و بە شێوەیەکی کوتوپڕ و سەیر دانی پیانا: «ڕەنگە هەق بە ئێوە بێ!... بەڵام بە تەواوی بەڕاستم بوو.»

ـ یانی گاڵتەت نەدەکرد. وایە؟ بەڵام پرسیار هەروا مێشکت دەکوڵێ و بێ وەڵام ماوەتەوە. بەڵام شەهید پێی خۆشە هێندێ جار بە هیوابڕاوی زەینی خۆی بە جێگایەکی دیکەوە خەریک بکا. دەڵێی هیوابڕاوییەکە خۆی بەرەو ئەو لایەی دەکێشێ. تۆش لەو هیوا بڕاییەتدا، زەینی خۆت بە وتار و باسوخواسەوە خەریک دەکەی. ئەگەرچی ئیمانت بە وتار و باسەکانی خۆت نییە و بە دڵێکی پڕ لە ژانەوە بۆیان دەگرژێیتەوە... وەڵامی ئەو پرسیارەت نەداوەتەوە و خەمی گەورەی تۆش ئەوەیە چونکە بۆ وەڵام داماوی.

ئیوان فیۆدۆرۆویچ کە بەو بزە ویشک و سڕەوە هەروا لە پیری دەڕوانی، بە سەرسوڕمانەوە پرسیی: ›ئەرێ دەتوانم وەڵامی بدەمەوە؟ ئەویش بە ویستی خۆم؟»

ـ ئەگەر نەتوانی بە ویستی خۆت وەڵامی بدەیەوە، هیچ کاتێ بە ناچاریش ناتوانی. خۆت دەزانی ئەوە تایبەتمەندیی دڵی تۆیە و هەموو ڕەنجان و دڵ ئێشانەکانیش بە هۆی ئەوەوەیە. بەڵام سپاس بۆ خودا کە دڵێکی گەورەی بە تۆ داوە، کە جێگای ئەو ئازارانەی تێدا دەبێتەوە و شوێنی بۆ بیرکردنەوە و گەڕان بە دوای شتی چاکتر و گەورەتردا هەیە، چونکە هەوارگەی ئێمە لە ئاسمانەکانە. خودا بکا دڵی تۆ لەم دنیایەدا بە وەڵامی خۆی بگا و خودا ڕێگات بۆ متفەڕک و پیرۆز بکا.

پیر دەستی هەڵێنا و ئەگەر ئیوان فیۆدۆرۆویچ هەڵنەستایەتە سەرپێ، دەیویست هەر لەوێوە خاچی بکێشێ و تەقدیسی بکات. بەڵام ئیوان فیۆدۆرۆویچ هەستا و چوو بۆلای پیر و دەستی ماچکرد و داوای لێکرد تەقدیسی بکا. پاشان بە بێدەنگی گەڕایەوە و لە سەر جێگاکەی خۆی دانیشتەوە. ڕوخساری جۆرێک خۆگرتن و سوور هەڵگەڕانی پیاوانەی پێوە دیار بوو. ئەو کردەوەیە و هەموو وتەکانی پێشووی کە لە ئیوان فیۆدۆرۆویچ نەدەوەشایەوە، دانیشتوانی کۆڕەکەی تووشی سەرسووڕمان کرد و بۆ ماوەیەک ورتەیان لێوە نەهات. ڕوخساری ئالیووشاش جۆرێک ترس و هەراسانیی پێوە دیاربوو. بەڵام میۆسۆف، لەپڕ شانی هەڵتەکاند و هەر ئەو کاتە فیۆدۆر پاولۆویچ هەستا سەر پێ و ئاماژەی بە ئیوانی کوڕی کرد و گوڕاندی:

ـ ئەی حەزرەتی پیری پیرۆز، ئەوە کوڕی منە، جگەرگۆشەی خۆشەویستمە! ئەوە «کارێل مۆر[١٤]»ی ئەرکناس و دڵپاکی منە. بەڵام ئەم کوڕەیان کە تازە هاتووە، یانی دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، کە تکاتان لێدەکەم سەبارەت بە ئەو حوکم دەرکەن، «فرانتێس مۆر»ی ئەرکنەناس و دڵڕەقە. منیش «فوون مۆر»ی فەرمانڕەوام! حوکم دەرکە و ڕزگارمان کە! جگە لەوەش چاوەڕوانی دوعا و پێشوێژییەکانی ئێوەین!

پیر بە دەنگێکی لەرزۆک و ماندوو وەڵامی دایەوە: «قەشمەرجاڕی وەلانێ جا قسە بکە، ئیتر دەست لە ناونێتکە هەڵدان لە ئەندامی بنەماڵەکەت هەڵگرە.» دیاربوو هەرچەندە شەکەتتر بێ، هێز وتوانای خۆ لە کەمی دەدا.

دیمیتری فیۆدۆرۆویچ بە قەڵسی دەنگی هەڵێنا: «کاتێ هاتم بۆ ئێرە، چاوەڕوانیی ئەو قەشمەرەجاڕییەم دەکرد!» ئەویش وەک باوکی هەستا سەر پێ و پیری کردە بەر دەنگی خۆی و درێژەی بە قسەکانی دا: «ئەی باوکی بەڕێز! ببوورە. من خوێندەوار نیم. ناشزانم بە شێوەیەکی شیاو لەگەڵتاندا

14- کاریل مۆر و فرانتێس مۆر دوو پاڵەوانی شانۆی «چەتەکان»ن نووسراوی شیللێر، کە یەکیان دڵپاک و ئەوی دیکەیان دڵڕەش، باوکیشیان فوون موور پیاوێکی زاڵم و بێبەزەیی و خوێنخۆر بوو.

بدویم، بەڵام کڵاوت چۆتە سەر و نەدەبوو بە هیچ شێوەیەک ڕێگای ئێمەومانان بدەی بۆ حوجرەکەت. ئابڕووتکان و شوورەییی لێدەکەوێتەوە. هەر ئەوەی باوکم دەیەوێ. ئەو دەیەوێ ئابڕووی بنەماڵەکەمان ببا. تەنیا خۆشی دەزانێ بۆ وا دەکا. ئەو لەخۆڕا هیچ کارێک ناکا. پێموایە دەزانم ئەمجارەش بۆ...»

فیۆدۆر پاولۆویچ قسەکەی پێ بڕی: «هەموویان سەرکۆنەم دەکەن، هەموویان! ئەو پیووتێر ئەلکساندرۆویچەش وەک ئەوان سەرکۆنەم دەکا.» لە ناکاو ڕوویکردە میۆسۆف و ئەگەرچی میۆسۆف پێی وانەبوو دەتوانێ قسەکەی پێ ببڕێ، گوتی: «پیووتێر ئەلکساندرۆویچ تۆش سەرکۆنەت کردووم، ئەرێ! هەموویان بەوەم تاوانبار دەکەن کە پارەی منداڵەکانم لە نێو کەوشەکانمدا شاردۆتەوە و گزەم لێکردوون . کڵاوم ناوەتە سەریان. بەڵام خۆ دادگا هەیە! دیمیتری فیۆدۆرۆویچ لەوێ لە ڕووی یادداشت و نامە و گرێبەستەکانتەوە موو بە موو بۆت حیساب دەکەن کە چەندت پارە بووە، چەندیت خەرجکردووە و چەندیت بۆ ماوەتەوە. بۆ پیووتێر ئەلکساندرۆویچ لە حوکم دەترسێ؟ چونکە دیمیتری فیۆدۆرۆویچ ناناسێ. چونکە هەموویان دژی منن. ئێستاش دیمیتری فیۆدۆرۆویچ بە من قەرزدارە، ئەویش خۆ کەم نییە، هەزاران ڕۆبڵە. دەوسیە و گرێبەستی نووسراوەم هەیە. کە ئاوری کڵاوچییەتی و فێڵ و تەڵەکەکانی شاری داگرتووە، ئەو شارەی کە جاران تەشریفی لەوێ بوو. چەنجار بە هەزار و دوو هەزار ڕۆبڵی بۆ کچێکی بە ئابڕوو خەرجکردووە. جەنابی دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، موو بە موو ئاگاداری هەموو شتێکتم. ئەوەش دەسەلمێنم.... باوکی پیرۆز، باوەڕ دەکەی دڵی ئابڕوودارترین خاتوونی جوان و نەجیمزادەی خستۆتە داوەوە، کچی سەرهەنگێکی ئازاو بە جەرگە، سەرهەنگێک کە پێشتر سەرۆکی دەستەکەیان بووە و کەسێکە کە شانازی و پلە و پایەی زۆری وەدەستهێناوە و «نیشانەی ئانا»ی بە سینگەوە بووە. بەڵێنی زەماوەندی بە کچە داو لە ئەرتەش هاتە دەرێ. ئەو کچە بەستەزمانە ئێستا بێکەس و بێدەر لێرەیە و دەزگیرانییەتی،

بەڵام بەر لەو کچە، چاوی بە دوای جادووبازێکەوە بووە، هەرچەندە ئەو ژنە موقوربازە مارەکراوی کەسێکیتر بووە، بەڵام بیرێکی ئازادیخوازانەی هەیە و وەک قەڵایەک وایە کە بە ئاسانی دەستی بەسەردا ناگیریٚ، چونکە خۆی بە ژنێکی پاکداوێن و بەناموس دەزانیٚ. ئەریٚ، حەزرەتی پیر! ئەو ژنێکی بە ئیمانە و ئێستا دیمیتری فیۆدۆرۆویچ دەیەویٚ درگای ئەو قەڵایە بە کلیلێکی زێڕین بکاتەوە. هەر لەبەر ئەوەشە ئەوەندە بە ڕووی مندا هەڵدەشاخیٚ و لەگەڵ ئەوەی هەزاران ڕۆبڵی لە ڕێی ئەو ژنەتیوە جادووبازەدا داناوە، دەیەویٚ پارە لە من وەرگریٚ. بۆ ئەو کارەی بەردەوام خەریکی قەڕز و قۆڵەیە. پێت وایە لە کێی قەرز دەکا؟ بیڵێم! میتیا؟!»

دیمیتری فیۆدۆرۆویچ گوڕاندی: «بێدەنگ بە! ڕاوەستە با من بڕۆم. ناوێری لە لای من ناوی کچێکی پاک و بە ئابڕوو لەکەدار بکەی! وتەی تۆ بۆ ئەو شوورەیی و نەنگە و من ئیزنی ئەوەت نادەمیٚ!»

کەوتبووە هەناسەبڕکیٚ.

فیۆدۆر پاولۆویچ فرمێسکێک لە چاوی داوەری و وەک شێت و هار نەڕاندی: «میتیا! میتیا! مەگین تەقدیسی حەزرەتی پیر لای تۆ بایەخی نییە؟ ئەگەر تووک و نزات لێبکەم، دەڵێیچی؟»

دیمیتری فیۆدۆرۆویچ بە تووڕەیییەوە گوتی: «ئەی ماستاوکەری بێشەرم!»

- ئەوە بە باوکی خۆی دەڵیٚ! بە باوکی خۆی! دەبیٚ چی بە خەڵک بڵیٚ؟ برایان تەنیا بیهێننە بەرچاوی خۆتان؛ پیاوێکی هەژار بەڵام بەئابڕوو لێرە دەژی کە ئەرکی بەڕێوەبردنی بنەماڵەیەکی گەورەی لە سەر شانە، ئەفسەرێک کە تووشی دەردەسەر هات و لە ئەرتەش دەریانکرد، بەڵام نەک لەبەر چاوی کۆمەڵ، نەک بە دادگای نیزامی و نەک بە ڕووشاندنی ئابڕووشی. کەچی سیٚ ڕۆژ لەمەوبەر، دیمیتری فیۆدۆرۆویچی ئێمە لە مەیخانەیەک ڕیشی گرت و بە ڕاکێش ڕاکێش هێنای بۆ سەر شەقام و لەبەر چاوی ئاپۆرەی خەڵک تێروپڕی کوتا، تەنیا لەبەر ئەوەی نوێنەری یەکێک لە مامەڵە چکۆلەکانی منە.

«هەمووی درۆیە! بە ڕواڵەت لە ڕاست دەچێ، بەڵام درۆیەکە بە پێی خۆی دەڕوا! دیمیتری فیۆدۆرۆویچ لەداخانا دەلەرزی. «باوە، من پاکانە بۆ کردەوەی خۆم ناکەم، بەڵێ لەبەر چاوی کۆمەڵ دانی پێدادەنێم. دەرهەق بەو ئەفسەرە دڕندانە جووڵامەوە و ئێستاش پەشیمانم، لەبەر ئەو ڕقە دڕندانەیەم بێزم لەخۆم هەڵدەستێ. بەڵام ئەو سەروانە، نوێنەرەکەی جەنابت، چوو بۆ لای ئەو خانمەی کە تۆ بە جادووبازی دەزانی و لە لایەن تۆوە پێشنیازی پێکرد ئەو سفتانەی من کە لە لای تۆیە وەر بگرێ، بۆ ئەوەی کاتێک داوای هەق و حیساب دەکەم، لە دادگا شکایەتم لێبکا و بەهۆی ئەو سفتانەوە بمخاتە بەندیخانە. ئێستاش سەرکۆنەم دەکەی کە ئەو خاتوونە دڵی ڕفاندووم، لە حاڵێکدا تۆ بووی کە هانتدا دڵم برفێنێ! خۆی بە چاو ئەوەی پێگوتم. چیرۆکەکەی بۆ گێڕامەوە و پێت پێدەکەنی! دەتویست بکەومە بەندیخانە چونکە بەخیلیت پێ دەبردم کە لەگەڵ ئەوم. چونکە ویستبووت بە ناچاری بۆ لای خۆتی بکێشی، ئاگاداری ئەوەشم، بۆیە پێت پێدەکەنی ـ گوێت لێیە ـ کاتێ باسەکەی بۆ دەگێڕامەوە قاقا پێت پێدەکەنی. ئەی باوکی پیرۆز! چاوت لەو پیاوەیە، ئەم باوکە کوڕە بێ بەندوبارەکەی سەرکۆنە دەکا! برایان، بمبوورن کە ڕقم هەستاو دەنگم هەڵێنا لە خزمەتتاندا. دەمزانی ئەو پیرە پیاوە فێڵبازە ئێوەی لە دەوری یەک کۆ کردۆتەوە بۆ ئەوەی ئابڕوومان بەرێ. هاتبووم دەست پێشخەری بکەم و بیبەخشم، بیبەخشم و داوای لێبووردنی لێبکەم! بەڵام ئێستا لەم ساتەدا نەک هەر بە من، سووکایەتیی بە خاتوونێکی بەئابڕووش کرد، خاتوونێک کە هێندە لەلام بەڕێزە کە ناوێرم لەخۆڕا ناویشی بێنم. بڕیارمداوە لێی لەقاو دەم، ئەگەرچی باوکیشمە!...»

لەوە زیاتر نەیتوانی درێژە بە قسەکانی بدا. چاوی بریقەی دەهات و هەناسەی سوار بووبوو. بەڵام تەواوی ئەو کەسانەی لە حوجرەکەدا بوون تووشی سەرسووڕمان بووبوون. جگە لە باوە زووسیما، هەموو هەستانە سەرپێ. ڕاهیبەکان گرژومۆن دیار بوون. بەڵام چاوەڕێی ڕێنوێنی بوون لە لایەن پیرەوە. پیریش ئارام دانیشتبوو و ڕەنگی هەڵبزڕکابوو، بەڵام لەبەر

دڵەوڕێزە نەک نەخۆشین. بزەیەکی لێوڕێژ لە پاڕانەوەی لە سەر لێو بوو. جارناجارێ دەستی هەڵدێنا، دەتگوت بۆ ئارام بوونەوەی ڕەشەبا وادەکا. هەڵبەت ئاماژەیەکی ئەو بەس بوو کە قرموقاڵەکە دامرکێ. بەڵام دەتگوت چاوەڕوانی شتێکە و بە وردی چاوی پێدا دەگێڕان. لەوە دەچوو بیهەوێ بە تەواوی لە شتێک بگا، تەواو بۆی ڕوون نەبوو. لە ئاکامدا میۆسۆف هەستی بە سووکایەتییەکی زۆر کرد و بە ڕقهەستاوی گوتی:

ـ لەبەر ئەو گێرەوکێشە پڕ شوورەییە هەموومان شیاوی سەرزەنشتین. بەڵام کاتێ دەهاتم، ئەوەم پێشبینی نەکردبوو، ئەگەرچی دەمزانی سەروکارم لەگەڵ کێیە. ئەم کێشەیە دەبێ خێرا کۆتایی پێبێ! قوربان، باوەڕ بفەرموون ئاگاداریم سەبارەت بەو شتانە نەبوو کە لێرە ئاشکرا کران. ناتوانم باوەڕ بکەم، بۆ یەکەم جارە شتیوا دەبینم.... باوکێک بەخیلی بە پێوەندیی کوڕەکەی لەگەڵ ژنێکی جلف و بەستۆکە دەبا و لەگەڵ ئەو دەعبایە دەستبەیەکی دەکا بۆ ئەوەی کوڕەکەی بخاتە زیندان! ئەوەیە کۆڕێک کە ناچار کراوم بەشداریی تێدا بکەم! کڵاوم چووە سەر. با ئەوەشتان پێ بڵێم، لە هەمووتان زیاتر فریوخوردە بووم.

فیۆدۆر پاولۆویچ، بە دەنگێکی گڕ و گۆڕاو لە ناکاو گۆڕاندی: «دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، ئەگەر کوڕم نەبوایەی، هەر ئێستا لەگەڵت بەکێشە دەهاتم... بانگم دەکردی بۆ دۆئێل، بە دەمانچە، لە مەودای سێ گەزییەوە!...» لەگەڵ لاق بەزەویداکوتان، کۆتاییی بە قسەکەی هێنا: «بە مەودای دەسماڵێک.»[15] لە ژیانی چل درۆیانی تەڵەکەبازدا کە هەموو تەمەنیان ڕۆڵیان گێڕاوە و لە سەد ئاویان داوە و قولاپەیان تەڕ نەبووە، هێندێ کات هەیە بە جۆرێک تێکەڵ ڕۆڵەکەی خۆیان دەبن و دەور دەگێڕن، کە بەڕاستی خۆیان دەکەونە ژێر کاریگەریی ڕۆڵەکەیانەوە و فرمێسک دەزێتە چاویان. ئەگەرچی هەر لەو کاتەدا، یان تاوێک دواتر، دەتوانن بە سرتە بە خۆیان بڵێن: «خۆشت دەزانی درۆ دەکەی، ئەی پیرە ڕێویی تاوانباری بێشەرم! هەر ئێستا خەریکی

15- لەگەڵ زایەڵەی «فێڵ و ئەوین» kabaleund Liebecc ، بەرهەمی شیللێر.

دەورگێڕانی، درۆدەکەی! لەگەڵ ئەو ڕقە پیرۆزەشدا هەروا فێڵ و درۆت لە ژێر سەردایە و هەرواش دەمێنی.»

دیمیتری فیۆدۆرۆویچ لە داخانا ڕەنگی تێکچوو. بە ڕقێکی ئەستوورەوە چاوی لە باوکی بڕی. پاشان بە دەنگێکی ئارام و لەسەرخۆ گوتی: «پێموابوو.... پێموابوو لەگەڵ فریشتەی دڵم، دەزگیرانەکەم، دێمەوە بۆ زێدی خۆم و لە سەردەمی پیریدا ڕێز لە باوکم دەگرم و دەبمە گۆچانی دەستی. مخابن، من چەندە خاوپێچڕاوم. باوکی چی، هەوەسبازێکی ناپاک و حەنەکچییەکی قێزەون!»

پیرەپیاوی بەدواز، کەوتبووە هەناسەبڕکێ . لەگەڵ قسەکردندا دەمی پڕژەی دەکرد، گوڕاندی: «دۆئێل! تۆش پیووتێر ئەلکساندرۆویچ میۆسۆف لێمگەڕێ با بە حەزرەتەکەت بڵێم لە تەواوی بنەماڵە و خزموکەستدا ژنێکی سەرەتر و بەشەڕەفتر ـ گوێت لێیە ـ بەشەڕەفتر لەو ژنەی کە وێرات بە «دەعبا» ناوی بەری، نەبووە و نییە! تۆش دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، دەزگیرانەکەی خۆت لەبەر ئەو «دەعبا»یە بەجێ هێشتووە، کە دەتزانی ئەو دەزگیرانەی پێشووت پێی‌ناکەوێ کەوشیشی بۆ دانێ. لەبەر ئەوەیە بە «دەعبا» ناوی دەبەن!»

باوە یوسف وەدەنگ هات: «شوورەیییە! بەڕاستی شوورەیی.»

گالگانۆف سوور هەڵگەڕا و لەگەڵ ئەوەی لە داخانا دەلەرزی، دەنگی هەڵێنا: «شوورەیی و داڕزان!» ئەو تا ئەو کاتە ورتەی لێوە نەهاتبوو.

دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، لە داخانا وەک شێت و هاری لێهاتبوو. شان و ملی وا بردبوو بە نێو یەکدا پشتی بەجارێ کووڕ بووبۆوە. بە دەنگێکی ڕقاوی لە بنەوە منجاندی: «کەسێکی ئاوا بۆ دەبێ زیندوو بێ؟ پێم بڵێن، ها!؟ تا کەنگێ دەبێ ئیزنی پێبدرێ زەوی چەپەڵ و ڕمووده بکا و بەردەوام بێ لە سەر ئەو کارە گڵاوانەی؟» چاوی بە هەموو دانیشتووانی کۆڕەکەدا گێڕا و ئاماژەی بە باوکی کرد. قسەکانی دانەدانە و بەجێ دەردەبڕی.

فیۆدۆر پاولۆویچ، هەڵات بۆ لای باوە یوسف و نەڕاندی: «ڕاهیبان گوێ بگرن، گوێ لەو باوککوژە بگرن! ئەوەش لە وەڵامی ئێوەدا کە قسە لە «شوورەیی» دەکەن. چی شوورەییە؟ ئەو «دەعبا»یە، ئەو «ژنە سەڵیتە»یە ڕەنگە هێژاتر بێ لە ئێوە، هێژاتر و پیرۆزتر لە ئێوەی قەشە و ڕاهیب کە بە دوای ڕزگارییەوەن! ڕەنگە لە تافی لاویدا مێشکی خاو بووبێ و بەهۆی بارودۆخی کۆمەڵگا و دەورووبەرەوە تووش بووبێ. بەڵام ژنێکی بەڕەحم و دڵۆڤان بووە لە ژیانیدا. حەزرەتی مەسیحیش خۆی ژنێکی بەخشی «چونکە دڵۆڤان و خەڵک خۆشەویست بوو.[16]» باوە یوسف خۆی پێڕانەگیرا و بە نەرمی گوتی: «لەبەر ئەو جۆرە خۆشەویستییە نەبوو مەسیح عەفووی کرد.»

- چۆن لەبەر ئەوە نەبوو، ئێوەی ڕاهیب لێرە بە خواردنی کەلەرم ڕۆحی خۆتان ڕزگار کەن و دڵی خۆتان خۆشکردووە و پێتان وایە عادڵن. ڕۆژی بەچکە ماسییەک دەخۆن و پێتان وایە بە خواردنی وردە ماسییەک دەتوانن کڵاو لە سەر خودا بنێن و سمێڵچەورانەی دەنێ بۆ ئەوەی لێتان خۆش بێ.

لە هەموو لایەکی حوجرەکەوە قاڵەمەقاڵم پەیدا بوو: «بەسی کەن ئیتر، لەوە زیاتر تامڵ ناکرێ، بەسە!»

بەڵام ئەو کێشەیە زۆر خێرا و چاوەڕوان نەکراو کۆتایی پێهات. باوە زووسیما لەپڕ هەستا سەرپێ. ئالیووشا کە لە تاوی پیر و ئەوانی دیکە دڵەخورپەی پێکەوتبوو، تاڕادەیەکیش گێژ بووبوو، بەپەلە باسکی پیری گرت. باوە زووسیما ڕوویکردە دیمیتری فیۆدۆرۆویچ و چوو بۆلای، کە گەیشتە پەنای، لەبەردەمی چۆکی دادا. ئالیووشا پێیوابوو لەبەر شەکەتی بەچۆکدا هاتووە، بەڵام وانەبوو. پیری کلێسە لەبەر پێی دیمیتری فیۆدۆرۆویچ نووشتایەوە و ناوچاوانی نایە عەرزی. ئالیووشا وا حەپەسا بوو، کاتێ پیر دەیویست هەستێتەوە، لەبیری نەبوو یارمەتیی بدا و دەست بداتە ژێر پیلی. زووسیما بزەیەکی نیشتە سەر لێوان و کڕنۆشێکی بۆ میوانەکان برد و گوتی: «خوداحافیز، تکاتان لێدەکەم بمبوورن!»

---

16- ئاماژەیە بە مەریەمی مەجدەلییە.

دیمیتری فیۆدۆرۆویچ چەند ساتێک عەبەسراو لە جێی خۆ نەبزووت. سوجدە بردن بۆ ئەو چ مانایەکی هەبوو؟ لەپڕ بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد: «ئاخ خودایە گیان!» دەستی بە دەموچاوییەوە گرت و لە حوجرەکە دەرپەڕییە دەرێ. هەموو میوانەکان بەدوایدا چوونە دەرێ و لەبەر پەشۆکاوی خوداحافیزییان لە پیر نەکرد و کڕنۆشیان بۆ نەبرد. تەنیا ڕاهیبەکان بۆ وەرگرتنی تەبەڕوک لەوێ مانەوە و هەموویان چوون بۆلای.

فیۆدۆر پاولۆویچ کە لەپڕ بێدەنگ بووبوو، هەوڵیدەدا سەری قسە بکاتەوە، بێ ئەوەی بوێرێ کەسێکی تایبەت بکاتە بەر دەنگی خۆی، گوتی: «خۆ خستنە بەرپێی ئەو چ مانایەکی هەبوو؟ ڕازێکی تێدابوو؟» هەموویان لەو کاتەدا لە حەوشەی حوجرەکە دەچوونە دەرێ.

میۆسۆف بە گرژی وەڵامی دایەوە: «ناتوانم لەجیاتی شێتخانە و شێتەکانی وەڵام بدەمەوە. بەڵام فیۆدۆر پاولۆویچ، ئیتر بۆ هەتاهەتا خۆم لە چنگ تۆ و قسەکانت ڕزگار دەکەم! ئەرێ ئەو قەشەیەی بڕیار وابوو بۆ نانی نیوەڕۆ بانگهێشتنمان کا، لە کوێیە؟»

ئەو قەشەیەی بانگهێشتی کردبوون، چاوەڕوانی ڕانەگرتن و لەگەڵ ئەوەی لە پلیکانی حوجرەکەی پیر هاتنە خوارێ ڕۆیی بەرەو پیریان، لەوە دەچوو لەو ماوەیەدا چاوەڕێیان بووبێ. میۆسۆف بە ڕقەوە بە قەشەکەی گوت:

- باوکی پیرۆز! تکات لێدەکەم دەرهەق بە من گەورەیییەک بنوێنن. ڕێزی بێپایانم بە حەزرەتی عابید ڕاگەیەنن و لەلایەن منەوە داوای لێبوردن لەو زاتە بکەن، پێشی بفەرموون زۆر بەداخەوەم بەهۆی بارودۆخی پێشبینی نەکراوەوە ناتوانم بێمە هەنتەشی مەبارەکیان و ئەو شانازییەم بە قسمەت بێ لەگەڵیان لە سەر سفرەیەک دانیشم، ئەگەرچی زۆریش تامەزرۆی دیداریانم...

فیۆدۆر پاولۆویچ پەڕییە نێو قسەکانی: «هەڵبەت ئەو بارودۆخە پێشبینی نەکراوەش منم. گوێت لێیە باوە. ئەو بەڕێزە نایهەوێ لەگەڵ من لە شوێنێک دانیشێ دەنا لەڕێوە دەهات. میۆسۆف! تۆ دەچی، تکات لێدەکەم بچۆ بۆ خزمەت باوکە عابید و نەهارەکەت مەیل بکە. ئەوە منم دەبێ نەچم نەک تۆ.

من دەڕۆمەوە بۆ ماڵێ، لە ماڵێ نان دەخۆم. پیووتێر ئەلکساندرۆویچ خزمە خۆشەویستەکەم! ئێرە شیاوی من نییە و هیچم بۆ ناخورێ.»

ـ من قەت خزمی تۆی خوێڕی و قێزەون نیم و قەتیش نابم.

ـ بۆیە وامگوت بۆ ئەوەی ڕقت هەستێنم. چونکە هەمیشە دوورەپەرێزی لەو خزمایەتییە دەکەی. ئەگەرچی سەد ئەوەندەی دیکەش حاشا لە خزمایەتییەکەمان بکەی، هەر خزمین. لەڕووی ڕۆژژمێری کلێسەوە دەیسەلمێنم. بەڵام تۆش ئیوان فیۆدۆرۆویچ ئەگەر پێتخۆشە بمێنەوە، پاشان ئەسپەکانت بۆ دەنێرم. میۆسۆف ئەدەب وادەخوازێ بچییە خزمەت حەزرەتی عابید و سەبارەت بەو کێشە و هەرایەی وەڕیمان خستووە، داوای لێبوردن بکەی...

ـ یانی بەڕاستی دەڕۆیەوە بۆ ماڵێ؟ درۆ ناکەی؟

ـ پیووتێر ئەلکساندرۆویچ، دوای ئەو ڕووداوە تاڵە چۆن لەڕووم هەڵدێ! بەڕێزان بمبوورن، بەدەست خۆم نەبوو. شێوا بووم! بەڕاستی شەرمەزاری ئێوەم. کاکینە! پیاوی وا هەیە دڵی ئەسکەندەری هەیە و ئیواش هەیە دڵی تلۆ قەندییەک، دڵی من ئەو سەگە گچکەیە. دڵی من دڵی گەماڵە وردیلەیە. شەرمەزارم! دوای ئەو ئابڕووتکانە چۆن لەڕووم هەڵدێ بۆ خواردنی نانی نیوەڕۆ بچم و شۆرباوی کلێسە هەڵقوڕێنم. شەرمەزارم، ناتوانم بێم، بمبوورن.

میۆسۆف هەروا بە دڕدۆنگی لەبەر خۆیەوە گوتی: «تاقە شەیتانی دنیایە، ئەگەر فریومان بدا چبکەین؟» بە چاوێکی پڕ لە گومان و بێ بڕواییەوە لە حەنەکچییەکەی دەڕوانی، فیۆدۆر پاولۆویچ وەرگەڕایەوە و هەرکە دیتی میۆسۆف چاوی تێبڕیوە، ماچێکی بۆ فڕێدا.

میۆسۆف کتوپڕ لە ئیوان فیۆدۆرۆویچی پرسی: «چاکە، تۆ دێی بۆ لای حەزرەتی عابید یان نا؟»

ـ بو نایەم؟ دوێنێ جەنابی عابید بە تایبەتی منی بانگهێشت کرد.

میۆسۆف بێئەوەی گوێی بەوە ببزوێ کە ڕاهیب گوێی لێیە هەر بەو ڕقە ئەستوورەوە گوتی: تاڕادەیەک خۆم ناچار دەبینم کە بچم بۆ ئەو نەهارە نەگبەتییە، لانیکەم لە سەر شانمانە بەهۆی ئەو کێشە و هەرایەوە داوای لێبووردن بکەین و بڵێین کاری ئێمە نەبوو. دەی دەڵێیچی؟

ئیوان فیۆدۆرۆویچ گوتی: «بەڵێ، دەبێ بڵێین کاری ئێمە نەبوو. ئەوەش هیچ، خۆ حەزرەتی ئۆسقوف لەوێ نابێ.»

- چاکە، هیوادارم لەوێ نەبێ! بەزیاد نەبێ ئەو نەهارەش!

لەگەڵ ئەوەشدا، هەموویان دەڕۆیشتن، ڕاهیب لە بێدەنگیدا گوێی شل کردبوو. بەڵام لە ڕێگا گوتی کە حەزرەتی عابید ماوەیەکی زۆرە چاوەڕوانییانە، زیاتر لە نیو کاتژمێر وەدرەنگ کەوتوون. وەڵامێکی نەبیست. میۆسۆف بە ڕقەوە چاوێکی لە ئیوان فیۆدۆرۆویچ کرد و لەبەرخۆیەوە گوتی: چاوی لێکە، خەریکە دەڕوا بۆ لەوەڕ، هەر دەڵێی نە بای دیوە نە بۆران، مێشێکیشی میوان نییە. پەکوو لە دەست ڕووهەڵماڵدراوی و ویژدانی کارامازۆف!»

# (٧)

# تەڵەبەی بەرزەفڕ

ئالیووشا یارمەتیی باوە زووسیمای دا بڕوا بۆ هۆدەکەی خۆی و لە سەر جێوبانەکەی ڕایکێشا. هۆدەیەکی چکۆلە بوو بە کەلوپەلی هەژارانەوە. چرپایەکی ئاسنین و باریک لە ژوورەکەدا بوو و لەتێکی لباد لەجیاتی دۆشەک لە سەر ڕاخرابوو. لە سووچێکی وەتاغەکەدا، لە خوار پەیکەرەکانە، ڕەحلێکی خاچنیشانی لێبوو ئینجیلێکی لە سەر داندرابوو. پیری کلێسە شلوشەکەت لە جێدا کەوت. چاوی بریقەی دەهات و پشووی سوار بووبوو. بە وردی وەک ئەوەی لەبیری شتێکدا بێ چاوی لە ئالیووشا کرد:

ـ بڕۆ، کوڕی خۆم، بڕۆ. من «پرۆفیر»م بەسە. زووکە، لەوێ کاریان پێت دەبێ. بڕۆ لە سەر سفرەکەی ئوسقوف میوانداری بکە.

ئالیووشا کەوتە پاڕانەوە: «ئیزنم بدە لێرە بمێنمەوە.»

لەوێ زیاتریان کار پێت دەبێ. ئەوێ زۆر قەرەباڵغە و دەتوانی یارمەتییان بدەی. ئەگەر ڕۆحگەلی شەڕەنگیزیش قوت بوونەوە، دۆعایەک پاتە بکەوە، کوڕم.» ـ پیری کلێسە پێیخۆش بوو ئاوا بانگی بکا. ـ «لەبیرت نەچێ لە داهاتوودا جێی تۆ ئێرە نییە. پیاوی لاو، ئەوەت لەبیر نەچێ. هەرکاتێ خودا ئیرادەی کرد و بردمیەوە، تۆش کلێسە بەجێ بێڵە و قەت ڕوو لێرە مەکە.»

ئالیووشا سەرسام بووبوو.

ـ چییە؟ ئێستا جێگای تۆ لێرەیە و سەبارەت بە خزمەتە گەورەکانت لە دنیادا، تەقدیست دەکەم. زیارەتی تۆ زیارەتێکی دوور و درێژ دەبێ. دەبێ ژنیش بێنی. دەبێ وابکەی. بەرلەوەی بگەڕێیتەوە، دەبێ خاچی هەموو شتێکت لەکۆڵ نابێ و خارابێتی لە نێو کڵی زەماندا. کاری زۆرت لە پێش دەبێ. بەڵام لە تۆ دڵنیام، هەر بۆیە دەتنێرم، تۆ مەسیحت لەگەڵدایە. قەتت لەبیر نەچێ و هەمیشە لەبیرت بێ، ئەویش قەت تۆ بەجێ ناهێڵێ. خەمێکی گەورەت دێتە ڕێ و لەو خەمەدا

بەختەوەر دەبی. دوایین وتەی منیش بۆ تۆ ئەوەیە: بەختەوەری لە خەمدا بدۆزەوە. کار بکە، بەردەوام کار بکە. لەمەبەولاوە وتەکانمت لەبیر نەچێتەوە، بۆیەش ئاوا ڕوون و کراوە لەگەڵت دەدوێم، چونکە نەک ڕۆژانێک بەڵکو چەن کاتژمێرێکم تەمەن ماوە.

ئالیووشا دیسان خەم دایگرت و ڕەنگی هەڵبزڕکا.

باوە زووسیما بە نەرمی بزەیەکی هاتێ و پرسیی: «چییە دیسان؟» پیاوی دنیایی بۆ مردوو دەگرین، بەڵام لێرە لە ژوور سەری باوکێک کە لە مردن نزیک بۆتەوە دەبێ شادی بکەین. بەجێم بێڵە، دەبێ دۆعا بکەم برۆ زووکە. لەلای براکانت بە، ئەویش نەک هەر لەلای یەکیان؛ بەڵکو لەلای هەردووکیان بە. پشتی یەک بەرمەدەن.

باوە زووسیما دەستی هەڵێنا و بەسەری ئالیووشایدا هێنا. ئالیووشا نەیتوانی نارەزایەتی دەربڕێ، ئەگەرچی زۆری پێخۆش بوو لەوێ بمێنێتەوە. زۆریش تامەزرۆ بوو ڕازی کڕنۆش بردنەکەی بۆ دیمیتری لێ بپرسێ، پرسیارەکە لە سەر نووکی زمانی بوو، بەڵام نەیدەوێرا دەری ببڕێ. دەیزانی ئەگەر پێویست بێ باوە زووسیما، بێ ئەوەی پرسیاری لێبکا، سەبارەت بەو کارەی دەدوێ. بەڵام دیاربوو نەیدەویست باسی ئەو شتە بکا. ئەو کارە بەجارێ شوێنی لە سەر ئالیووشا دانابوو. باوەڕێکی تەواویشی بە پڕ لە ڕاز بوونی کارەکە هەبوو. پڕ لە ڕاز و تەنانەت زۆر بە سامیش.

هەروا بەپەلە لە حەوشەی حوجرەکە دەهاتە دەرێ تاکو بۆ میوانداری و خزمەتکردن لە سەر سفرەکەی باوکە عابید، خۆی بگەیەنێتە کلێسە، لەپڕ ژانێکی لە سەر دڵی هەست پێکرد و لە ڕۆیشتن کەوت. دەتگوت دیسان قسەکانی باوە زووسیما لە گوێیدا دەزرینگێتەوە کە پێشوێژیی مەرگە ناوادەکەی خۆی دەکا. ئەو شتە کە ئەو ئاوا بە وردی و بە ڕوونی پێشوێژیی کردبوو، بێگومان وەڕاست دەگەڕا. ئالیووشا بە شێوەیەکی شاراوە و لە ناخەوە ئیمانی پێی بوو. بەڵام بەبێ ئەو چۆن دەیتوانی هەڵبکا؟ نەدیتنی پیر و نەبیستنی قسەکانی، ئاراوقارای لێ هەڵدەگرت. ڕوو لە کوێ بکا؟ پیر پێیگوتبوو لە کلێسە بڕواتە

دەرێ. خوداگیان! زۆر لەمێژ بوو ئالیووشا تووشی دڵەخورپەی ئاوا نەهاتبوو. بە تاڵووکە خۆی بەو دارستانەدا کرد کە کەوتبووە نێوان حوجرەکە و کلیساوە. فکر و خەیاڵ هێزیان لێبڕیبوو، چاوی بڕییە ئەو دار کاژە پیرانەی قەراغ ڕێگاکە. زۆری مابوو بگاتە کلێسە، نزیکەی پێنجسەد هەنگاوێکی مابوو. چاوەڕوانی ئەوە نەبوو چاوی بە کەس بکەوێ، بەڵام لە پێچی یەکەمی ڕێگاکەدا تووشی ڕاکیتین بوو. لەوە دەچوو چاوەڕوانی کەسێک بێ.

ئالیووشا لێی نزیک بۆوە و گوتی: «چاوەڕوانی منی؟»

ڕاکیتین زەردەیەکی گرت و گوتی: «بەتایبەتی چاوەڕوانی تۆم، دەمەوێ پرسیارێکت لێبکەم. دەزانم بە هەڵەداوان دەچی بۆ خزمەت باوکە عابید، وادیارە میوانداریيەکی شاهانەی بەدەستەوەیە. باوکە عابید لەو کاتەوە میوانداریی لە ئوسقوف و ژینڕاڵ کرد، میوانداری ئاوای وەڕێ نەخستبوو. خۆ لەبیرتە؟ من نایەم بەڵام تۆ بچۆ خزمەت بکە. ئالکسی شتێکم پێبڵێ. مانای ئەو کارە چییە؟ پرسیارەکەشم ئەوەیە.»

- کامە کار؟

- کڕنۆش بردن بۆ دیمیتریی برات، مەگین نێوچاوانی لە بەردەمیا نەنایە زەوی!

- باسی باوە زووسیما دەکەی؟

- بەڵێ باوە زووسیما.

- نێوچاوانی نایە سەر زەوی؟!

- ئاخ، بێئەدەبیم کرد! دەی بڵێمچی! پێم بڵێ مانای ئەو کارەی چیبوو.

- میشیا منیش نازانم.

- دەمزانی بە تۆش ناڵێ، ڕەنگە شتێکی سەیر و سەمەرەی تێدابێ، هەر وەک ئەو حەقایەتە ئاساییەکە، خۆڵاڵ کردنی پیرۆز، بەڵام لەم کارەیاندا ئامانجێک هەیە. تەواوی خەڵکی شارەکە باسیدەکەن و ڕووداوەکە دەم بە دەم بڵاو دەکەنەوە و هیچ کەس سەری لێ دەرناهێنێ. بە بڕوای من پیر بە ڕاستی

کەراماتی هەیە؛ بۆنی جینایەتی هەست پێکردبوو. ئەو بۆگەنەش لە بنەماڵەکەی ئێوەدایە.

- جینایەتی چی؟

دیاربوو ڕاکیتین قسەیەکی لە دڵدایە و تامەزرۆیە بیدرکێنێ.

- ئەو جینایەتە لە بنەماڵەی ئێوەدا دەقەومێ. لە نێوان براکانت و باوکە دەوڵەمەندەکەتدا. بۆیە زووسیما نێوچاوانی نایە زەوی، تاکو بۆ شتێک کە دەقەومێ، ئامادە بێ. ئەگەر دواتر شتێک بقەومێ، خەڵک دەڵێن: «ئاخ پیری پیرۆز پێشبینیی کرد و پێشوێژیی کرد!» ئەگەرچی سوجدە بردنێکی ئاوا، پێشوێژییەکی کەم بایەخە. بەڵام دەڵێن: «پەکوو، چ ڕازێک بوو، پیر دەیزانی.» خەڵکی ساویلکە و کەسانێکی شەیتانیش هەر کەسە بە ڕبەی خۆی دەیپێوێ! هەمیشە بە گەورە و پیرۆز ناوی دەبەن: «جینایەتەکەی پێشبینی کرد و تەنانەت تاوانبارەکەشی دەستنیشانکرد.» خەڵکی ڕەشۆکیش لەوە زیاتریان لێ ناوەشێتەوە، لە هەمبەر مەیخانەیەکدا بە چۆکدا دێن و کڕنۆش دەبەن و بەردیش بە پەرستگادا دەدەن. وەک ئەم پیرەی تۆ، لە هەمبەر مرۆڤێکی پاک و ڕاستدا دەستدەداتە گۆچان و لەبەر پێی قاتڵیشدا سەر لە زەوی دەسوێ.

- جینایەتی چی؟ کام قاتڵ؟ تۆ مەبەستت چییە؟

ئالیووشا لەجێی خۆ وشک بوو. ڕاکیتینیش ڕاوەستا.

- نازانی کامە قاتڵ؟ یانی خۆت لە گێلی دەدەی، یان نازانی؟ دڵنیام لە پێشدا بیرت لێکردۆتەوە. بەڕاستی سەیرە، گوێ بگرە ئالیووشا! تۆ درۆ لە زاتتدا نییە بەڵام بۆ دەربڕینی ڕاستییەکان ماوەیەک تووشی دوودڵی دەبی، تۆ بیرت لەو شتە کردۆتەوە؟ ڕاست و ڕوون پێم بڵێ، ئا یان نا؟

ئالیووشا زۆر لەسەرەخۆ وەڵامی دایەوە: «ئەرێ.» ڕاکیتین داچڵەکی و نەڕاندی:

- چی؟ بەڕاستیتە؟

ئاليووشا لەبن لێوییەوە منجاندی: «من... من بە وردی بیرم لێ نەکردۆتەوە، بەڵام قسەکانی تۆ هێندە سەیر بوو، جۆرێک باستکرد، پێموابوو بیرم لێکردۆتەوە.»

ـ دیوتە؟ (چەندە جوانیش درکاندت!) دیوتە؟ ئەمڕۆ کاتێ چاوت لە باوکت و میتینکای برات دەکرد، بیرت لە جینایەت کردەوە. کەوایە بەهەڵە نەچووم، ها؟

ئاليووشا دڕدۆنگانە گوتی: «سەبرکە، تۆزێ سەبرکە. چی تۆی وا لێکرد بیر لەو شتە بکەیەوە؟ بۆ سەرنجی ڕاکێشای؟ پرسیاری یەکەمم ئەمەیە.»

ـ دوو پرسیار؟ بێئەوەی پێوەندییان پێکەوە هەبێ، بەڵام سروشتی. ئەوانە لێک هەڵداوێرم. چ شتێک بووە هۆی ئەوەی سەرنجی من بۆ ئەو لایەنە ڕاکێشرێ؟ نەمدەزانی، ئەگەر لە خووخدەی دیمیتری فیۆدۆرۆویچی برات نەگەیشتمایە، بە یەکەم ڕوانین ناخیم دەخوێندەوە و بە هۆی تایبەتمەندیی کەسایەتییەوە تێیدەگەیشتم؟ ئەو مرۆڤانەی کە زۆر بە شەڕەفن و لەگەڵ ئەوەدا هەوەسبازیشن، سنوورێکیان هەیە کە بۆ پەڕینەوە نابێ. بەڵام بێتو لەو سنوورە تێپەڕن، باوکی خۆیان دەکوژن. ئێستا باوکت پیرە پیاوێکی هەمیشە مەست و گەندەڵە و هەموو شتێکی لەڕادە تێپەڕاندووە. ئەو جووتە هیچکامیان ناتوانن دان بە خۆدا بگرن و ئیختیاریشیان لە دەست خۆیاندا نەماوە. بێگومان خۆشیان بە کونێکەوە دەنێن.

ـ نا، میشیا، نا. ئەگەر هەر ئەوە بێ، خەمم نییە. چونکە دڵنیام کاریان بەو جێگایە ناگا.

ـ ئەی بۆ دەلەرزی؟ ڕاوەستە پێتبڵێم، ئەو ڕەنگە مرۆڤێکی بەشەڕف بێ، ـ مەبەستم میتینکایە ـ بەڵام (بەشەڕەفێکی گەمژەیە) هەوەسبازە. ئەوەشی بە باوکتەوە بە میرات پێگەیشتووە. دەزانی ئاليووشا من تۆم پێ سەیرە، چۆن توانیوتە ئاوا داوێنپاک خۆت ڕاگری. ئاخر تۆش کارامازۆفی! لە بنەماڵەی ئێوەدا هەوسبازی و داوێنتەڕی گەیشتۆتە ڕادەی شێتی. بەڵام ئێستا ئەو سێ داوێن پیسە، چەقۆیان لەبەر کەلەکەی خۆیان هەڵچەقاندووە و لە بۆسەی یەکتریدان.

زۆرجار لووتیشیان بە لووتی یەکدا دەتەقێ. دڵنیام ڕۆژێک تێکبەردەبن. لەوانەیە تۆش چوارەمین کەسیان بی.

ئالیووشا لە داخانا هەموو گیانی دەلەرزی، بە دەنگێکی بوغزگرتوو گوتی: «سەبارەت بەو ژنە لە هەڵە دای. دیمیتری ڕقی لێیەتی.»

- ڕقی لە گرووشنکایە؟ نا براگیان ڕقی چی. وەک دەڵێن دەزگیرانەکەشی لەبەر خاتری ئەو ژنە بەجێ هێشتووە، نا ڕقی لێی نییە. شتێک هەیە تۆ هێشتا سەری لێدەرناکەی. پیاوێک کە ئاشقی ژنێکی جوان دەبێ، لەشی ژنێک، یان تەنانەت بەشێک لە لەشی ژنێک (مرۆڤی هەوەسباز لەوە دەگا) لەوانەیە لەبەر خاتری ئەو منداڵەکانیشی بەجێ بێڵێ،دایک و باوکیشی بۆ بفرۆشێ، تەنانەت وڵاتەکەشی تووشی شەرمەزاری بکا. ئەگەر بەشەڕف بێ دزی دەکا، ئەگەر دڵۆڤان بێ پیاو دەکوژێ، ئەگەر ئیمانداریش بێ خەڵک فریودەدا، ئەوین ئاوایە. تۆ نازانی. پوشکین شاعیری پەلوپووزی ژنان، شیعری بۆ ڕان و بەلەکیان دەگوت. خەڵکی دیکەش پێیدا هەڵناڵێن. بەڵام ناتوانن تەماشای بکەن و نەلەرزن و مۆچڕکەی هەوەس بە لەشیاندا نەیەت. خۆ هەر لاقوقولیش نییە. ئەوە گریمان قینی لە گرووشنکاش بێ، ڕق و قین چاری ناکا. وای دانێین ڕقی لێیەتی، خۆ ناتوانێ لێی داببڕێ. هەوەس لەگەڵ ڕق جیاوازە.

ئالیووشا گوتی: «من لەوە ناگەم.»

ڕاکیتین ڕەشبینانە گوتی: «بەڕاستتە؟ دەنا من دڵنیام زۆر چاکی تێدەگەی. چونکە خێرا بە سەر زارتدا دێ. ناخافڵ لە دەمت دەرچوو. هەر ئەوەش بایەخی دان پیانانەکەت زیاتر دەکا. کەوایە مەبەستێکی ئاشنایە. بیرت لێکردۆتەوە. مەبەستم هەوەسبازییە!

بەڕاستی داوێنپاکی! ئالیووشا، دەزانم پیاوێکی بێدەنگی، لەسەرخۆی، پیاوی خودای، بەڵام شەیتان دەزانێ زەینت تا کوێ بڕ دەکا و چەندە دەزانی! تۆ پاکی، بەڵام بە ناخدا ڕۆچووی... لەمێژە لە ژێر چاوەدێریم دای. تۆ کارامازۆفی، کارامازۆفێکی شەشدانگ - بێگومان لەدایکبوون و پێوەندی و بنەماڵە هۆی ئەوەیە تۆ لە لایەن باوکتەوە هەوسباز و شواڵ چەپەڵی، لە لایەن دایکیشەوە

پیاوی خودای و شێتیشی. بۆ ئاوا دەلەرزی؟ کەوایە ڕاستە؟ دەزانی گرووشنکا بەردەوام داوام لێدەکا بتبەم بۆلای. دەڵێ: «عەباکەی لەبەر دادەماڵم.» تۆ ئاگادار نیی، هەتا دەمبینی داوام لێدەکا تۆ لەگەڵ خۆم بەرم بۆلای. نازانم بۆ ئەوەندە بەردڵی کەوتووی. دەزانی، ژنێکی بێوێنەیە؟»

ئالیووشا بە بزەیەکی سارد و سڕەوە گوتی: «لە زمان منەوە سپاسی لێبکە، ڕاکیتین قسەکەت تەواوکە. بیروڕای خۆمت پاشان پێدەڵێم.»

ـ تەواو کردنی ناوێ، وەک ڕۆژ لێم ڕوونە، ئەوانە هەموو قسەن براگیان. کاتێ تۆش لە ناخەوە هەوەسبازی، ئیوانی برات هەر باسی مەکە! خۆ ئەو برای دایک و بابتە. ئەویش کارامازۆفە. ئەوەی لە زاتیماڵباتی کارامازۆفدایە هەوسبازی و چاوحیزی و شێتییە! هەمووتان وان. ئیوانی براشت بۆ گاڵتە وتاری ئایینی دەنووسێ. تەنیا لەبەر خواستی گەوجانە و نەناسراوی خۆی ئەو کارە دەکا. مرۆڤێکی بێدینە و دان بەو چرووکییەی خۆشیدا دەنێ. ئیوانی برات ئاوایە. ئەگەر نەتناسیوە بیناسە. جگە لەوە، دەیهەوێ دەزگیرانەکەی میتیای برات لەخۆی مارە کا. پێموایە ئەو کارەش دەکا. میتینکاش ڕازی دەبێ و دەزگیرانەکەی خۆی دەداتێ، چونکە دەیهەوێ ڕزگاری بێ لە چنگی و هەڵێ بۆلای گرووشنکا. ئامادەشە وەک پیاوێکی دڵ فراوان و بێلایەن ئەو کارە بکا. حاڵی بووی؟ ئەوانە مەترسیدارترین مرۆڤی سەردەمن! کێ سەر لە کاری ئێوە دەردەکا؟ ئەو لە چرووکیی خۆی گەیشتووە و لەگەڵی هەڵدەکا! ڕاوەستە با پێتبڵێم باوکە پیرەکەشت ئێستا لە سەر ڕێگای میتینکا قوت بۆتەوە. ئەویش بۆ گرووشنکا شێت بووە، بە دیتنی ئەو دەمی ئاو دەکا. هەر لەبەر ئەویش بوو ئەمڕۆ لە حوجرە ئەو هەڵلاو بەزمەی سازکرد. چونکە میۆسۆف پێیگوت «دەعبای سەڵیتە». باوکت لە عەشقدا لە پشیلەی نێر خراپترە. سەرەتا ئەوی لە مەیخانەکانی و پاشان لە مامەڵە نهێنییەکانیدا دامەزراند. بەڵام ئێستا کتوپڕ لەبەر چاوی شیرین بووە و بەجارێ دڵی لەلا نەماوە. ـ بە پێشنیارەکانیشی کە هەڵبەت ئابڕوومەندانە نین، ناهێڵێ ساتێ هەدا بدا. باوک و کوڕی هێژاش لەو ڕێگایەدا ناچارن بەرەو ڕووی یەک ڕاوەستن! بەڵام گرووشنکا دڵی بە هیچیانەوە نییە.

هەروا کایەیان پێدەکا و دەستیان پێ گەرم دەکاتەوە. دەیهەوێ بزانێ کامیانی چاکتر بۆ دادەدۆشرێ. چونکە هەرچەندە دەتوانێ پارەیەکی زۆر لە باوکت داتاشێ، بەڵام باوکت قەت نایهێنێ. ڕەنگە لە ئاکامدا ڕژدییەکەی گوڵ بکا و دەست بە گیرفانییەوە بگرێ و هیچی لە دەست دەرنەیەت. لێرەدا دیمیتری بایەخدار دەبێ، ئەگەرچی دەوڵەمەند نییە. بەڵام ئامادەیە زەماوەندی لەگەڵ بکا. ئەرێ، ئامادەیە بیهێنێ! دەزگیرانەکەی خۆی پەری ڕوویەکی بێوێنەیە. کاترینا ئیوانا کچە سەرهەنگێکی دەوڵەمەندە، کەریەتی نییە واز لەو بێنێ و وەدوای گرووشنکا کەوێ و زەماوەندی لەگەڵ بکا، کە گراوی پیرە بازرگانێکی ناهیر بووە بە ناوی سامسانۆف، کە شارەداری تووڕە و نەخوێندەواری پێشووی شارەکەمان بووە. ئەو ڕووداوە لەوانەیە شەڕێکی خوێناویی بەدواوە بێ. ئەوەش شتێکە کە ئیوانی برات چاوەڕوانیەتی. وەک دەڵێن کوێرە چیت دەوێ، دەڵێ دوو چاوی ساغ. کاترینا ئیوانای شۆخ و شەنگ کە بۆی شێت بووە، لەگەڵ خۆیدا دەیبا و جیازیی شەش هەزار ڕۆبڵیی دەنێتە تەنگەی باخەڵی. بۆ مرۆڤی سەر سۆاڵکەریش ئەوە ئەوپەڕی ئاوات و ویستی دەروونییە. ئەوەش بزانە ئیوان بەو کارەی خەیانەت بە میتینکا ناکا، بەڵکو گەورەترین خزمەتیشی پێدەکا. چونکە ئاگادارم هەر لەم حەوتووەدا لەگەڵ چەند کەسی هەرزە لە مەیخانەیەک مەستی کردووە و پڕ بە مەیخانەکە دەنگی هەڵێناوە و گوتوویە: «من شیاوی کاتیای دەزگیرانم نیم و بۆ ئیوانی برام باشە.» کاترینا ئیواناش لە ئاکامدا دەزانم دەست بە ڕووی پیاوێکی سەرنجڕاکێشی وەک ئیوان فیۆدۆرۆویچەوە نانێ. ماوەتەوە لە نێوان ئەو دوانەدا کامیان هەڵبژێرێ. ئەو ئیوانە نازانم چۆن دڵی هەمووتانی کردۆتە خۆی؟ کە هەتا ئەو ڕادەیە خۆشتان دەوێ و کڕنۆشی بۆ دەبەن؟ بەڵام ئەو لەبنەوە پێتان پێدەکەنێ و بۆخۆشیی خۆی کەڵکتان لێوەردەگرێ.

ئالیووشا نێوچاوانی تێک ناو بە تووڕەیی پرسیی: «تۆ چوزانی؟ چۆن ئاوا بە ئەرخەیانی قسە دەکەی؟»

- بۆ دەپرسی و بە وەڵامدانەوەشم ترست لێدەنیشێ؟ دیارە دەزانی ئەوەی من دەیلێم، ڕاستە و پێچووپەنای تێدا نییە.

ـ تۆ ئیوانت خۆش ناوێ، چونکە ئیوان بۆ پارە ناکەوێتە هەلەکەسەما.

ـ بەڕاستتە؟ ئەی جوانیی کاترینا ئیوانا؟ خۆ هەر پارە نییە، ئەگەرچی شەش هەزار ڕۆبڵێش پارەیەکی کەم نییە.

ـ ئیوان زۆر لەوانە مەزنترە. ئەو بۆ هەزاران ڕۆبڵیش سەر بۆ کەس دانانەوێنێ. ئیوان بەدوای پارە و هێمنایەتی و تەوزەلییەوە نییە.، ڕەنگە بەدوای ڕەنج و زەحمەتەوە بێ.

ـ ئەوە ئیتر چ خەونێکی دڕندانەیە؟ پەککو لە دەست ئێوەی نەجیمزادە!

ـ ئاخ میشیا، ئەو ڕۆحێکی ئاڵۆزوپلۆزی هەیە. زەینی لە مەنگەنە دایە و ڕۆحی لە چنگی دڕدۆنگییەکی گەورە و چارەسەرنەبوو دایە. لەو کەسانەیە کە پارەی زۆریان ناوێ، تەنیا بەدوای وەڵامی پرسیارەکانیانەوەن.

ڕاکیتین، بە ناپاکییەکی ئاشکراوە گوڕاندی: «ئالیووشا، ئەوە ئیتر پڕوپاگەندە و خۆ پەرستییە. خەریکی هەر قسەکانی زووسیما کاوێژ دەکەیەوە. نازانی ئیوان چ پیلانێکی بۆ داڕشتوون!» ڕەنگی تێکچوو و کەوتە لێوەلەرە. «ئەوەی تۆ باسی دەکەی شتێکی قوڕ و گەوجانەیە و تەنانەت بایەخی ئەوەی نییە بیریشی لێبکەیتەوە. ئەگەر گوشار بۆ مێشکت بێنی تێیدەگەی. وتارەکەی زۆر بێهوودە و قوڕە. بیروڕا گەوجانەکەیشت هەر ئێستا گوێ لێبوو: ئەگەر بەقای ڕۆح نەبێ، هیچ فەزیلەتێک لە ئارادا نییە و هەموو شتێک و هەموو کارێک ئازادە. (لەگەڵ ئەوەشدا، لە بیرتە میتنکای برات هاواری کرد: «ئەوەم قەت لەبیر ناچێ») بیروڕایەکی سەرنجڕاکێش بوو بۆ هەڵە و هەرزەکان! ـ (خەریکم چەقەسرۆیی دەکەم، گەوجانەیە.) نەک بۆ هەڵە و هەرزەکان، بەڵکو بۆ خۆبەزلزانەکانیش. «ئەوانەی کەوتوونە گۆمی گومانی قووڵ و بێ چارەسەرەوە.» خەریکە خۆی دەنوێنێ و هەمووشی لێرەدا بەئاکام ناگا، کە «لەلایەکەوە چارەسەرێک جگە لە قەبوولکردنمان نییە.» و «لەلایەکی دیکەشەوە دەبێ دانی پێدا بنێین!» بیروڕاکەشی سەرتاپا ڕەزیلانەیە! مرۆڤایەتی ئەو توانابییەی هەیە کە بۆ پایەبەرزی، ئەویش بەبێ ئیمان بە زیندووبوونەوە ژیان بەرێتەسەر. ئەوەش لە عەشق بە ئازادی و بەرابەری و برایەتیدا وەدەستدەکەوێ.»

ڕاکیتین، وای ڕق هەستابوو بە دژواری دەیتوانی دان بە خۆیدا بگریێ. بەڵام کتوپڕ وەک ئەوەی شتێکی وەبیر هاتبێتەوە، دەمی بوو بە تاقی چرا.

بە بزیەکی ماستاوکەرانەتر لە پێشوو گوتی: «دەی بەسە، بۆ پێدەکەنی؟ پێتوایە گەمژەیەکی سووک و چرووکم؟.»

ـ نا هەر بەخەونیش نەمدیوە بە گەمژەیەکی سووک و چرووکت بزانم. تۆ بەهۆشی بەڵام... لەوە گەڕێین، پێکەنینەکەم لەبەر گەوجییەتی بوو. میشیا لەم بارەوە من لە تین‌وتاوی تۆ دەگەم. بەو تین‌وتاوەی تۆدا پێموابوو خۆشت دەرهەق بە کاترینا ئیوانا سەرساردی. براکەم، زۆر لەمێژە ئەو گومانەم لەدڵدایە، هەر لەبەر ئەوەشە، کە ئیوانی برامت خۆشناوێ و بەخیلیی پێ دەبەی؟

ـ هەروەها بۆ پارەی کاترینا ئیوانا بەجارێ چاوت چووە، ئەوەشی پێ‌زیاد کەم؟

ـ باسی پارە ناکەم، نامەوێ سووکایەتیت پێبکەم.

ـ باوەڕ دەکەم، چونکە وادەڵێی، بەڵام یا خودا تۆ و براکەت فەوت و فەنا بن. تۆ لەوە ناگەی کە پیاو لەوانەیە ڕقی لێی ببێ. جا هەر کارمان بە سەر کاترینا ئیواناوە نییە! ئاخر بۆ لەخۆڕا ئەوم خۆش بوێ؟ دەزانی قسەی سووکم پێ دەڵێ. بۆ دەبێ ئەو هەقەم نەبێ منیش قسەی سووکی پێ‌بڵێم؟

ـ قەتم نەبیستووە بە چاکە یان بە خراپە ناوت بێنێ. باسی تۆ هەر ناکا.

ـ بەڵام بیستوومە پێرێ لەماڵی کاترینا ئیوانای شیاوی خۆی جنێوی پێداوم. دیوتە چ هۆگرییەکی بەم بەندە زەبوونە هەیە؟ بەو پێیە ئێستا کێ بەخیلە، لەولاوە ڕاوەستێ. ئەو سەبارەت بە من ئاوابیروڕای خۆی دەربڕیوە. ئەگەر لە داهاتوودا نەچمە ڕیزی پیاوانی ئایینییەوە و نەبمە ڕاهیب، خاترجەم دەچم بۆ پترزبۆرک و لە گۆڤارێکی بەناوبانگدا جێی خۆم دەکەمەوە و هەتا دەساڵ دەنووسم و پاشان، دەبمە خاوەنی گۆڤار. هاوڕا لەگەڵ بیری ئازادیخوازان و بێ‌دینەکان دەری دەکەم. ڕەنگدانەوەی مەرامی سۆسیالیستی، لەگەڵ تۆزە ڕووناکییەک لە سۆسیالیسم. بەڵام لە هەموو کاتێکدا لە سەر هەست دەبم. یانی لەگەڵ هەردوو لایەنەکە ڕێکدەکەوم و گەوجەکان فریو دەدەم. بەحیسابی

براکەت، ڕەنگدانەوەی سۆسیالیسم نابێتە کۆسپ و تەگەرە لە سەر ڕێی داهات، پاشەکەوتی پارەش لە ژێر چاوەدێریی جوولەکەیەکدا نابێ. لە ئاکامیشد کارگەیەکی گەورە لە پترزبۆرگ ساز دەکەم و چاپخانەکانم بۆ ئەوێ ڕادەگوێزم و نهۆمەکانی سەر ڕێی بە کرێ دەدەم. ئەو تەنانەت جێگاکەشی دەستنیشان کردووە، لە نزیک پردە بەردینەی ئەولای نەواوە هەڵکەوتووە کە دەڵێن بڕیار وایە لە پترزبۆرگ سازی بکەن.

ئالیووشا نەیتوانی دان بەخۆیا بگرێ و بە پێکەنینەوە گوتی: «ئاخ میشیا، ئەوە ئیتر ڕەد بووونەوەی تێدا نییە.»

ـ تۆش ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، وادیارە ڕقت لە تانەوتەشەر نییە.»

ـ نا، نا، گاڵتە دەکەم. بمبوورە. شتێکی تەواو جیاوازم لە زەین دایە. بەڵام، داوای لێبووردن دەکەم، کێ ئەو قسانەی بۆ تۆ گێڕایەوە؟ کاتێ باسی تۆی کردووە، خۆ تۆ لە ماڵی کاترینا ئیوانا نەبووی؟

ـ من لەوێ نەبووم، بەڵام خۆ دیمیتری فیۆدۆرۆویچ لەوێ بوو. بەو گوێچکانەی خۆم گوێم لێبوو باسی دەکرد. ئەگەر پێت خۆشە بزانی، با دڵنیات کەم، خۆی پێی گوتم. گوێ قولاغ ڕاوەستابووم، ئەویش نەک بەقەستی، من لە وەتاغی خەوەکەی گرووشنکا بووم و نەمدەتوانی بێمە دەرێ، چونکە دیمیتری لە وەتاغەکەی دیکەیان بوو.

ـ ئەها، لەبیرم نەبوو، ئێوە خزمایەتیتان هەیە.

ڕاکیتین سوور هەڵگەڕا و گوڕاندی: خزمایەتی! من و خزمایەتی لەگەڵ گرووشنکا! شێت بووی، یان عەقڵت کار ناکا؟

ـ مەگین خزمایەتیتان نییە؟ دەنا من وامبیستووە.

ـ لەکێت بیستووە؟ ئێوە کارامازۆفەکان هەر خەریکی فڕوفیشاڵن و دەڵێن ئێمە لە بنەماڵەیەکی ڕەسەن و نەجیمزادەین، پێت وایە کەس نازانێ باوکت لە سەر سفرەی ئەم و ئەو ڕشقنجاڕی و گەمەی ساز دەکرد بۆ ئەوەی بەخێری خۆیان پاروویەک نانی بدەنێ. ڕەنگە من کوڕە قەشەیەک بم و لەبەر چاوی ئێوەی ڕەسەن و تایەفەدار سووک بم، بەڵام ئاوا بەکەیفی خۆت سووکایەتیم پێ مەکە.

ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، خودا نەکا من خزمی گرووشنکای بەستۆکە بم. تکات لێدەکەم ئاگات لەدەمی خۆت بێ!

ڕاکیتین بەجارێ ڕەنگی تێک چووبوو.

«بۆخاتری خودا بمبوورە، نەمزانی... جگە لەوەش... چۆن دەتوانی پێی بڵێی بەستۆکە؟ یانی ئەو... لەو جۆرە ژنانەیە؟ ئالیووشا سوور بووبۆوە. «دیسان پێت دەڵێمەوە، من بیستوومە دەڵێن خزمایەتیتان هەیە. زۆرجار دەچێ بۆ ماڵیان، خۆشت پێتگوتم گراوت نییە و حەزی لێناکەی. بەخەونیش نەمدەزانی ئەوەندەت ڕق لێیبێ! یانی مستەهەقی ئەوەیە؟»

- حەتمەن هۆیەکی هەر هەیە کە دەچم بۆلای. ئەوەش پێوەندییەکی بە تۆوە نییە. خزمایەتی، لەوانەیە براکەت یان باوکت بیکەنە خزمی تۆ، نەک خزمی من. ئەوە گەیشتینێ. واچاکە بڕۆی بۆ چێشتخانەکە. ڕاوەستە بزانم! چبووە؟ یانی وەدرەنگ کەوتووین؟ ئاوا زوو نابێ نەهاریان خواردبێ! بڵێی کارامازۆفەکان دیسان کێشەیان وەڕێ خستبێ؟ بێگومان وایە.ئەوەش باوکت و ئیوان فیۆدۆرۆویچی برات. لە وەتاغی باوکە عابید هاتنە دەرێ. چاو لێکە باوە ئیزیدۆر لە سەر پلیکانەکانەوە بە دەنگی بەرز شتێکیان پێدەڵێ. باوکیشت دەستی ڕادەوەشێنێ و دەگوڕێنێ. پێموایە جنێو دەدا. بەزمە! چاوکە میۆسۆف بە فایتوونەکەی خەریکە دوور دەکەوێتەوە. وادیارە ڕۆیشت. ئەوەش ماکسیمۆفی پیر چاو چۆن هەڵدێ! حەتمەن شەڕ و کێشەیان لێپەیدا بووە. نەهار لە گۆڕێدا نییە. بڵێی لە باوە عابیدیان نەدابێ! یان ڕەنگە لێدانیان خواردبێ! ئەگەر وابێ هەقی خۆیانە!

قسەکانی ڕاکیتین و سەرسووڕمانەکەی بێهۆ نەبوو. کێشەیەکی پڕ لە شوورەیی و بێوێنەیان وەڕێ خستبوو. هەر کتوپڕیش لەخۆڕا قسەیان لێک هەڵبەزیبۆوە.

# (٨)

# کێشەی پڕ شوورەیی

میۆسۆف وەک مرۆڤێکی خاوەن کەسایەتی و ژیار، کاتێ لەگەڵ ئیوان فیۆدۆرویچ گەیشتنە لای باوکە عابید حاڵی تێکچوو: لەبەر ڕق هەستانەکەی هەستی بە شەرمەزاری دەکرد. هەستیکرد لە دەست فیۆدۆر پاولۆویچی دڵنزم و سووک و چرووک، نەدەبوو ئەوەندە جاڕز بوایە، کە لە حوجرەکەی باوە زووسیما ئیمان هەردە بێ و تا ئەو ڕادەیەی خۆی لە بیر بچێتەوە. لە سەر پلیکانەکان لە دڵی خۆیدا گوتی: «نەدەبوو ئاوا هەڵچم، ڕاهیب و قەشەکان شیاوی سەرکۆنە و سووکایەتی پێکران نەبوون. ئەگەر ئێرە مرۆڤی بەشەڕەفی لێبێ و (هەتا ئەوجێیەی ئاگادارم باوکە عابید پیاوێکی نەجیمزادەیە و لە بنەماڵەیەکی ڕەسەنە) بۆ لەگەڵ ئەوان بە سەروڕووخۆشی و ڕێزەوە هەڵسوکەوت نەکەم؟ دمبەدمەیان لەگەڵ ناکەم، هەموو شتێک قەبووڵدەکەم و بە چەکی ئەدەب دەیانبەزێنم. و... و... نیشانیان دەدەم کە من هیچ پێوەندییەکم بە ئەو (ئیزۆپ[١٧])ە حەنەکچییە، ئەو (پیرۆت[١٨])ە بێ شەرمەوە نییە و بە هەڵکەوت کەوتوومەتە نێو ئەو کێشەیەوە، ڕاست وەک خۆیان.»

بڕیاریدا لە دەست ماسیگران و داربڕان سکاڵا نەباتە بەر کلێسە و چاوپۆشییان لێبکا، ئەو کارەشی لەبەر ئەوە دەکرد، چونکە ماسیگرتن و داربڕین، لەچاو ڕابردوو بێبایەخ بووبوو. بە جوانیش نەیدەزانی ئەو لێڕەوار و چۆمەی کێشەی لەسەرە لە کوێوەیە.

---

17- ئیزۆپ: (بە یۆنانی ئیزۆپۆس)ە فابل نووسی یۆنانی لە سەدەی بەر لە زانین.

18- پیرۆ: Pierrot حەنەکچیی شانۆ سوننەتییەکان بووە.

ئەو ویستە دەروونییەشی، کاتێک چووە وەتاغەکەی باوکە عابید لە ناخەوە بڕیاری لەسەردا کە وازی لێبێنێ. وەتاغی نان خواردنەکەی باوکە عابد بۆ ئەوە نەدەبوو ناوی وەتاغی نان خواردنی لێبنێی، چونکە تەنیا دوو وەتاغی هەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا گەورەتر و خۆشتر بوو لە حوجرەکەی باوە زووسیما. کەلووپەلەکانی نێو ئەو وەتاغەش جێی سەرنج نەبوون. کورسیلەکانی دارینە بوون و بە داری سنەوبەر دروستکرابوون و ڕووکێشێکی چەرمینیان پێوەبوو، بە مۆدەی لەبرەوکەوتووی ساڵی ١٨٢٠. تەنانەت تەختی ژوورەکەشی ڕەنگ نەکرابوو. بەڵام هەموو شتەکانی لەبەر خاوێنی بریقەیان لێ هەڵدەستا. چەن چەپکە گوڵ لەبەر پەنجێرەکان بوو. هەڵبەت لەو کاتەدا سەرنج ڕاکێشترین شت لە هۆدەکەدا ئەو سفرە ڕازاوە و ڕەنگینە بوو. قاپ و قاچاخەکان بریقەیان دەهات. سێ جۆر نانی برژاو، دوو بتڵ شەڕاب، دوو شووشە هەنگوینی سروشتیی کلێسە، تۆنگەڵەیەکی گەورەی پڕ لە (کوواس) ئەو دوو جۆرەی دواییان لە کلێسە بەرهەم دێنا و لە ناوچەکەدا ناوبانگی هەبوو. (ودکا)ی لێنەبوو. ڕاکیتین دواتر باسی کرد کە سفرەکە پێنج چەشنە خۆراکی لە سەر بووە: سووپی ماسی، ماسیی برژاو، شفتەی ماسی، دۆڵدرمە و کومپووت و ژێلەی میوە، ڕاکیتین چاک لەوانە گەیشتبوو، چونکە پێی بۆ چێشتخانەکە کرابۆوە و هەرتاوناتاوێ خۆی پێدا دەکرد و خۆی پێڕاگیر نەدەکرا. بە هەموو لایەکدا دەگەڕاو سەبارەت بە هەموو شتێک ئاگاداریی وەدەست دێنا. چاوبرسی و بەخیل و بێ سرەوت بوو. نەیدەتوانی تاوێک هەدا بدا. لە تواناییەکانی خۆی ئاگادار بوو و لە خۆپەرستیدا کەس دەسکی لە دوو نەدەکرد. دەیزانی کە ڕۆڵێکی گرینگ دەگێڕێ. بەڵام ئالیووشا، کە ئەوی بە هاوڕێی خۆی دەزانی، دەتگوت دڵی دەرزی ئاژەن دەکەن، کە دەیدی هاوڕێکەی هەرزە و بێ ئابڕووە و خۆی بە تەواوی لە گێلی داوە و بەپێچەوانە، پێی وابوو چونکە پارەی بەجێ ماوی سەر مێزەکە نادزێ، مرۆڤێکی ڕەسەن و بەشەڕەفە.

ڕاکیتین، کەسێک نەبوو کە بۆ نەهار بانگهێشتن کرابێ. بۆ ئەو نەهارە، لە دانیشتوانی کلێسە تەنیا باوە یوسف و باوە پایسی و ڕاهیبێکی دیکە بانگهێشت کرابوون. کاتێ میۆسۆف و گاڵگانۆف و ئیوان فیۆدۆرویچ گەیشتنێ، ئەوان چاوەڕێ بوون. میوانەکەی دیکە، ماکسیمۆف لە پەنایەک ڕاوەستابوو. ئەویش چاوەڕوان بوو. باوکە عابید هاتە نێو وەتاغەکەوە بۆ ئەوەی میوانەکان بەخێرهاتن بکا. پیرە پیاوێکی کەڵەگەت و تیشکەڵە بوو، بەڵام هەروا بەتوانا، مووی سەر و ڕیشی هەروا ڕەش بوو، جیێ جیێ ماشوبرنجی بووبوو. دەموچاوێکی درێژۆکە و جیددی و زاهیدانەی هەبوو. بە بێدەنگی دەستی بە سینگییەوە نا و کڕنۆشی بۆمیوانەکان برد. بەڵام ئەمجار ئەوان چوونە پێشی بۆ ئەوەی تەقدیسیان بکا. میۆسۆف تەنانەت ویستی دەستی ماچ بکا. بەڵام باوکە عابید گورج دەستی کێشا دواوە. بەڵام ئیوان فیۆدۆرویچ و گاڵگانۆف بە شێوەیەکی زۆر خاکەڕایانە و کامڵ تەشریفاتەکەیان بە ئەنجام گەیاند و بە شێوەیەکی لادێیانە دەستیان ماچکرد. میۆسۆف بە پێکەنینەوە و بە زمانێکی قورساخانە و پڕ لە ڕێزەوە ئاوای گوت: «قوربان، بەوپەڕی خاکەڕاییەوە داوای لێبووردن دەکەین. بمانبوورن ئەگەر بە تەنیا هاتووین. فیۆدۆر پاولۆویچ ناچار بوو بڕوا و لە شانازی میوانداریی ئێوە بێبەش بێ، ڕۆیشتنەکەشی بێ هۆ نەبوو. لە حوجرەکەی حەزرەتی باوە زووسیما لەگەڵ کوڕەکەی قسەیان لێکهەڵبەزییەوە و تووشی کێشە هاتن. خۆی پێ ڕانەگیرا و دەمی هەڵمالێ. هێندێ دژمان و قسەی سووکی بەزاردا هات کە نەیدەزانی چۆن پاستاوی بۆ بێنێتەوە... و لە ڕاستیدا لەڕووشی هەڵنەدەهات و مەحاڵ بوو بتوانێ داوای لێبووردن بکا. هەروەها» ـ چاوێکی لە ڕاهیبەکان کرد ـ «گەورەم، بێشک لەوە ئاگاداری. هەر بۆیە سوور سوور دەیزانی دەبێ سەرکۆنە بکرێ و لەناخەوە هەستی بە داخ و کەسەر و شەرم دەکرد و تکای لە من و ئیوان فیۆدۆرۆویچی کوڕی کرد، بێینە خزمەتتان پەژیوانی و داوای لێبوردنی بە ئێوە ڕاگەیێنین. هەروەها هیوادارو

تاسەمەندە لە داهاتوودا ئەو هەڵەیەی قەرەبوو بکاتەوە. داوای تەقدیسی لە ئێوە دەکرد و بەو هیوایە ئەو ڕووداوە فەرامۆش بفەرموون.»

میۆسۆف، لەگەڵ دەربڕینی دوایین وشەی مژولیایشەکەی دڵی کرایەوە و هەموو دیاردەکانی ڕق و شلویٚ بوونی پێشووی وەلانا. دیسان بەوپەڕی پاکی و یەکدڵییەوە بووەوە بە پیاوێکی مرۆڤدۆست.

باوە عابید بە قورساخی گوێی بۆ ڕاگرت، تۆزێ سەری لەقاند و وەڵامی دایەوە: «لەوەی کە پاشملە باسی دەکەم زۆر بەداخەوەم. ڕەنگە بە هاتنی سەر سفرەکەمان فێری ئەوە بوایە ئێمەی بکەوێتە بەر دڵ و ئێمەش ئەومان خۆش بوێ. برایان فەرموون دانیشن، تکاتان لێدەکەم.»لە هەمبەر پەیکەری پیرۆزدا ڕاوەستا و بە دەنگی بەرز دەستیکرد بە دۆعا کردن. هەموو بە ڕێزەوە سەریان دانەواند و ماکسیمۆف بەوپەڕی تاسەوە دەستی بە سینگییەوە نا.

هەر لەو کاتەدا فیۆدۆر پاولۆویچ دوایین فێڵ و تەڵەکەی خۆی وەکار خست. ئەوەشمان لەبیر نەچێ بەڕاستی دەیویست بڕواتەوە بۆ ماڵێ، چونکە پێیوابوو مەحاڵە بتوانێ لە سەر سفرەی باوکە عابید دانیشێ. هەر دەتگوت هیچ نەقەوماوە. وانەبوو بڵێی شەرم لەخۆی دەکا و پەشیمانە لە کارەکەی، ڕەنگە تەواو بەپێچەوانەش. بەڵام هەروا هەستیدەکرد خواردنی ئەو نەهارە کارێکی دروست نییە. لەگەڵ ئەوانەشدا فایتوونە زەوار دەرچووەکەیان هێشتا بۆ نەهێنابۆوە بەر پلیکانەکانی هوتێل و هێشتا خۆشی سوار نەبووبوو، لەپڕ لەجێی خۆی ڕاوەستا. وەبیر ئەو قسانەی خۆی کەوتەوە کە لە حوجرەکەی پیری کلێسە کردبووی: «هەمیشە لە نێو خەڵکدا خۆم بە کەم دەزانم و پێموایە وەک حەنەکچییەک دێمە بەرچاویان، بۆیە دەڵێم با تۆزێ قەشمەرەجاڕی وەڕێ خەم. چونکە هەموو ئێوە لە من خوێڕیتر و گەوجترن.» پێیخۆشبوو تۆڵەی ئەو سووک و چرووک بوونەی خۆی لە هەمووان بستێنێتەوە. لە ناکاو وەبیری هاتەوە جارێکیان لێیان پرسیبوو، «بۆ ئەوەندەت ڕق لە فلانکەسە؟» لە کۆتایی قەشمەرجاڕییەکەشیدا وەڵامی

دابۆوە: «ئەها. هیچ ئازارێکی بە من نەگەیاندووە. بەڵام فیلێکی پیسم لێکرد و لەو کاتەوە هەر ڕقم لێی بووە.»

ئێستا بە هاتنەوەبیری ئەو، زەردەیەکی گرت. زەردەیەکی کەمڕەنگ و فیلاوی و تاوێک بە دوو دڵی مات بوو. چاوی بریقەی هات و لێوی لەرزی. بڕیاریدا: «چاکە ئێستا کە دەستم پێکردووە، وا چاکە بڕۆمە پێشێ.» هەستی زاڵبووی لەو کاتەدا، دەتوانین بەو وشانە بەیان بکەین: «دەی خۆ ئێستا ناتوانم خۆم چاک بکەم. کەوایە با شەرمەزاریان بکەم. نیشانیان دەدەم کە بۆم گرینگ نییە چۆن بیر دەکەنەوە ـ هەر ئەوەو بڕایەوە!»

بە فایتوونەوانەکەی گوت چاوەڕوانی بێ و خۆی بەپەلە بەرەو کلێسە گەڕایەوە و ڕاست ڕۆیی بۆ وەتاغەکەی باوکە عابید. خۆشی نەیدەزانی چدەکا، بەڵام دەیزانی خۆی پێڕاناگیرێ و لەوانەیە بە پەلەپیتکەیەک وا خۆ دزێو و تاڵ بکا، لەبەر چاوی عالەم ڕەش بێ، بەڵام تەنیا خۆدزێو و تاڵ کردن، نەک ئەوەی خۆی تووشی تاوانێک بکا و لەباری یاساییەوە سزا بدرێ. لەو پەڕی ڕق هەستانیشدا دەیتوانی دان بەخۆیدا بگرێ و لە ڕاستیدا زۆر جار سەبارەت بەو کارە ئافەرینی بە خۆی گوتبوو. هەر لەو کاتەدا کە دوعاکە تەواو بووبوو و هەموو ڕۆیشتبوونە سەر سفرە، لەبەر دەرگای وەتاغی نان خواردنەکەدا خۆی قوت کردەوە، هەروا کە لەبەر دەرگاکەدا ڕاوەستابوو، چاوێکی بە خەڵکەکەدا گێڕا و دای لە قاقای پێکەنینێکی شەیتانانە کە وەتاغەکە دەنگی دایەوە. پاشان بە چاوێکی زەقەوە سەرنجی تیژی لە چاوی هەموویان چەقاند و گوڕاندی: «پێتان وابوو ڕۆیشتووم، بەڵام دیسان گەڕاومەتەوە.»

ماوەیەک هەموو متەقیان لە خۆیان بڕی و چاویان لێ نەتروکاند. هەموو پێیان وابوو ڕووداوێکی تاڵ و ناجۆر و پڕ لە شوورەیی دەقەومێ. میۆسۆف لە ناکاو ئاڵەتی بوو، لەداخانا چەقۆت لێدایە خوێنی لێ نەدەهات. ئاوری ڕقەکەی پێشووی کە دامرکابۆوە، لە ناکاو بڵێسەی سەند و نەڕاندی: «نا، نا! ئێتر ئەوەم بۆ تامڵ ناکرێ! بە هیچ شێوەیەک ناتوانم! ئێرە ئێتر بۆ مانەوە

نابێ.» خوێن بەری چاوی گرت و ئەوی جنێوی دەیزانی ئاوقای فیۆدۆر پاولۆویچی کرد و دەوری بۆ تێکردەوە. وای قین هەستابوو، شوێن و ئەدەب و عەیبە و هەموو شتێکی لەبیر چووبۆوە. کڵاوەکەی بەدەستەوە گرت و ویسیتی بڕوا.

فیۆدۆر پاولۆویچ گوڕاندی: «چی ناتوانیێ؟ هەر بەڕاستی ناتوانیێ؟ قوربان ئیزن دەفەرموون بێمە ژووریێ یان نا؟ میوان ڕادەگرن؟»

باوکە عابید وەڵامی دایەوە: «پێتان لە سەر چاومە.» و گوتیشی: «برایان، بمبوورن، تکاتان لێدەکەم دژایەتی و ناخۆشی وەلانێن. وەک بنەماڵەیەکی ڕێکوپێک و پڕ لە خۆشەویستی، شوکری خودا بکەن و لە سەر ئەو سفرە هەژارانەیەی ئێمە دانیشن.»

میۆسۆف وەک شێت و هار نەڕاندی: «نا، نا،مەحاڵە!

ـ دەی ئەگەر بۆ پیووتێر ئەلکساندرۆویچ مەحاڵ بیێ، بۆ منیش مەحاڵە و لێرە نابم. هەر بۆیە هاتووم. ئێستا دەبمە مڵۆزمی پیووتێر ئەلکساندرۆویچ، ئەو بڕوا منیش دەڕۆم، لێرەبیێ منیش لێرەم. گوێت لێبوو میۆسۆف! باوکە عابید، بەو فەرمایشتەی سەبارەت بە بنەماڵەی ڕێکوپێک فەرمووتان، بەجاریێ پیووتێر ئەلکساندرۆویچت هەڵتەزاند. چونکە ددانی پێدا نانیێ کە خزمی ئێمەیە. وایە، یان نا، فۆن سووهەن؟ ئەوەش فۆن سووهەن، چۆنی فۆن سووهەن؟

ماکسیمۆف عەبەسراوانە منجاندی: «مەبەستت منم؟»

فیۆدۆر پاولۆویچ گوڕاندی: «بەڵیێ مەبەستم تۆی. ئەی کیێ؟ باوکە عابید خۆ ناکریێ فۆن سووهەن بیێ.»

ـ ئاخر خۆ منیش فۆن سووهەن نیم، من ماکسیمۆفم.

ـ نا تۆ فۆن سووهەنی. قوربان دەزانن فۆن سووهەن کیێبوو؟ سەربهوردی کوژرانەکەی بە سەردەمی هەموانەوە بوو. لە قەحبەخانەیەک کوشتیان. پێموایە زۆر لەو شوێنانە بەو ناوەوە کراوە و خوێندووتانەتەوە. کاتیێ کوژرا هەموو پارەکەیان لیێ دزی و چونکە بە ساڵا چووبوو، بەڕێزەوە

خستیانە نێو سندووقێکەوە و دەرگاکەیان بزمارکوت کرد. بە شەمەندەفەری باری لە پترزبۆرگەوە ناردیان بۆ مۆسکۆ. کاتێ دەرگای سندووقەکەیان بە بزمار دادەکوتا. سەڵیتەکان گۆرانییان دەگوت و پیانۆیان لێدەدا. بۆیە دەڵێم ئەم کابرایە هەر ئەو فۆن سووهەنەیە،زیندوو بۆتەوە و لە گۆڕ هاتۆتەوە دەرێ. مەگین وا نییە فۆن سووهەن؟

لە نێو ڕاهیبەکانەوە دەنگێک هات: «چ ڕووداوێک خەریکە دەقەومێ؟ ئەوە چییە ئیتر؟»

میۆسۆف بە گاڵگانۆفی گوت: «هەستە با بڕۆین.»

فیۆدۆر پاولۆویچ نەڕاندی: «نا، ببوورن.» هەنگاوێک هاتە ژووری، «ڕاوەستن با قسەی خۆم بکەم. لە حوجرە منتان سەرکۆنە کرد لەبەر کردەوەی ناحەز و قسەی بێئەدەبانە. ئەویش هەر لەبەر ئەوەی باسی خواردنی وردە ماسیم کرد. میۆسۆفی خزمم پێیخۆشە قسەکانی زیاتر بەئەدەبانە بێ نەک سادقانە، ئەویش تەنیا لەبەر بەدەماری و خۆ گرتن. بەڵام من بەپێچەوانەی ئەو پێم خۆشە قسەکانم سادقانە بن نەک بەئەدەبانە. من بێزم لە هەموو شتێکی نەجیم و بەئەدەب هەڵدەستێ. مەگین وا نییە. فۆن سووهەن؟ باوکە عابید ئیزنم بدەن، ئەگەرچی من حەنەکچیم و حەنەکچییەتیم پێخۆشە، بەڵام لە زاتی خۆما بەشەڕەفم دەمهەوێ دەروونی خۆم بنوێنم و هیچ شتێک نەشارمەوە، من زاتم بەشەڕەفانەیە. بەڵام دەروونی پیووتێر ئەلکساندرۆویچ میۆسۆف تەنیا پۆز و هەوا و غرووریکی ئاڵۆزی تێدایە. بۆیە هاتووم بۆ ئێرە دەمەوێ چاوێک بگێڕم و ناخی خۆم وەدەر خەم و ئەوی تێیدایە بیدرکێنم. ئالکسی کوڕم لێرەیە و تۆبەکارە. من باوکی ئەوم، گرینگییەکی زۆر دەدەم بە سەربەرزی و بەختەوەریی. بە ئەرکی سەر شانی خۆشمی دەزانم گرینگیی پێبدەم. لەگەڵ ئەوەی ڕشقنجاڕی و بەزمم وەڕێ خستبوو، بە دزییەوە گوێم هەڵدەخست و دەمڕوانی، ئێستاش دەمهەوێ دوایین بەشی شانۆکەم بنوێنم. خۆ دەزانن بارودۆخی ژیانی ئێمە چۆنە؟ کاتێ شتێک لە بەرزاییەوە دەکەوێتە خوارێ. هەروا دەمێنێ. کاتێک شتێک یەک

جار داکەوتبێ، دەبێ هەتا هەتایە لەو جێگایەدا بمێنێ. بەڵام وا نیم، من دەمهەوێ دیسان هەستمەوە. باوکی پیرۆز، زۆرتان لێتووڕەم. دان بە تاواندانان فەرزێکی گەورەیە و لە هەمبەریدا ئامادەم بە ڕێزەوە کڕنۆش بەرم، بەڵام لەوێ لە حوجرەدا هەموو چۆک دادەن و بە دەنگی بەرز دەپاڕێنەوە و دان بە تاوانەکانیانا دەنێن. باوە ئەرێ پاڕانەوە بە دەنگی بەرز کارێکی دروستە؟ باوکانی پیرۆز فتوایان داوە کە پاڕانەوە دەبێ لە خەڵوەتدا بکرێ: چونکە پاڕانەوە و ددان پیانان شتێکی نهێنییە و لە قەدیم و نەدیمەوە هەروا بووە. بەڵام چۆن دەتوانم لە هەمبەر عالەمدا بە کوڕەکەم بڵێم چیمکردووە و چیم نەکردووە.. دەی، تێگەیشتن بۆ هێندێ جار باش نییە پیاو هەموو شتێک بڵێ چونکە لە ڕاستیدا ڕیسوایی و ئابڕووچوونی بەدواوەیە! باوکانی پیرۆز، پیاو لەگەڵ ئێوە بێ لەوانەیە هەتا ڕادەی «قامچیبازان[19]» بڕواتە پێشی لە زووترین کاتدا، نامە بۆشۆڕای کلێسە دەنووسم و ئالکسیی کوڕم لەگەڵ خۆما دەبەمەوە بۆ ماڵێ.»

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کە فیۆدۆر پاولۆویچ دەیزانی لە کوێوە قامک بە چاویاندا بکا. سەردەمێک دەنگۆیەکی ناحەز بڵاو بووبۆوە کە تەنانەت بە گوێی ئوسقوفی مەزنیش گەیشتەوە. (نەک هەر سەبارەت بە کلێسەکەی ئێمە، کلێسەکانی دیکەش ئەوانەی وا دامەزراوەی پیری پیرۆزیان تێدابوو) ئەویش ئەوە بوو ڕێزی لەڕادەبەدەر لە پیرانی کلێسە دەگیرا و ئەو ڕێزە بە جێگایەک گەیشتبوو کە گەورەیی باوکە عابیدی هەتا ڕادەی زەواڵ بردبوو. پیرانیش ڕێوڕەسمی پاڕانەوە و دان پیانانیان بە چاوی سووک تەماشا دەکرد و... ئەو تۆمەتانەش وردە وردە لە نێو چوون. بەڵام بڵێسەی گەوجییەتی کە بەرۆکی فیۆدۆر پاولۆویچی گرتبوو، لەگەڵ شەپۆلی ڕق و ناخی دەخەزداری تێک هاڵان و هەتا سنووری ئابڕوو چوون لوولیان داو وایان لێکرد ئەو تۆمەتە کۆنە بژیێنێتەوە. فیۆدۆر پاولۆویچ یەک وشەشی لەو بارەوە نەدەزانی. تەنانەت نەیدەتوانی بەئەدەبانەش بەیانی بکا، چونکە لە حوجرەی پیر کەس

---

19- تیرەیەکی مەزهەبین قامچی لێدان بەشێک لە ئایینەکەیانە.

چۆکی دانەدابوو و بە دەنگی بەرزیش فەڕزی دان پیانان و پاڕانەوەیان بەجێ نەهێنابوو. بۆیە شتێکی وای هەر نەدیبوو. تەنیا بە ئاڵۆزی باسی تۆمەتە کۆن و لە مێژینەکانی دەکرد، بەڵام کاتێ کە ئەو قسە قۆڕ و هەقمەقانەی پەڕاند، هەستیکرد ئەوەی دەیڵێ دەلەسە و قۆڕیاتە و لە ناکاو هاتە سەر ئەوەی بەخۆی و گوێگرەکانی بسەلمێنێ، کە قسەی قۆڕ و هەللەق مەللەقی نەکردووە و درۆ ناکا. ئەگەرچی دەشیزانی هەتا زیاتری لە سەر بڕوا زیاتر ناچار دەبێ درۆودەلەسە پێکەوەنێ. ئیختیاری لە دەست خۆیدا نەمابوو و کوێرانە و بەپڕتاو دەچووە پێشێ.

پیووتێر ئەلکساندرۆویچ هاواریکرد: «لەو شوورەییە!»

باوکە عابید گوتی: «داوای لێبووردن دەکەم! دەڵێن: سەبارەت بە من زۆریان دژایەتی نواندووە و بەخراپە باسیانکردووم. لەگەڵ بیستنی ئەو قسانەش بەخۆم گوتووە: «ئەوە تەمبێیانەیەکە لەلایەن خوداوە و بۆ شیفای ڕۆحی لەخۆباییم بەڕێکراوە.» کەوایە ئەی میوانانی خۆشەویست، زۆر خاکەڕایانە سپاستان دەکەم!» پاشان کڕنۆشێکی بو فیۆدۆر پاولۆویچ برد. فیۆدۆر پاولۆویچ زۆر بێئەدەبانە گوڕاندی: «حەیەحەیەحەی ـ خۆپیرۆز نواندن و قسە وباسی چەن پاتە! قسەو باسی کۆن و هەڵسووکەوتی کۆن. درۆ و دەلەسەی کۆن و سوجدە و کڕنۆشی تەشریفاتی. لەوانە ئاگادارین. «ڕامووسینی لێوان و چەقۆ لە دڵ ڕاکردن!» هەر بەو جۆرەی لە (چەتەکاندا) هاتووە. باوکانی هێژا، درۆودەلەسەم ناوێ، من هەقیقەتم دەوێ. بەڵام هەقیقەت لە خواردنی وردە ماسیدا نادۆزرێتەوە، ئەوەش بە دەنگێکی بەرز ڕادەگەیەنم! ئەی ڕاهیبان، ئێوە بۆ ڕۆژوو دەگرن؟ بۆ دەتانەوێ پاداشتەکەی وەرگرنەوە و چاوتان لە ئاسمان بڕیوە؟ باشە بۆ پاداشێکی وا منیش وەک ئێوە ڕۆژوو دەگرم! ڕاهیبی پیرۆز مەگین ناتانەوێ لە دنیادا زانا و مەزن بن و قازانجتان بۆ کۆمەڵگا هەبێ، بێ ئەوەی لە سەر گیرفانی خەڵکی خۆتان لە کلێسەدا زیندانی بکەن و بێ ئەوەی چاوەڕوانی پاداشەکەی بن کە لە ئاسمانەوە بۆتان داڕژێ. بەڵام ئەگەر ئەو کارە نەکەن ئەرکەکەتان تۆزێ

دژوارتر دەبێ. باوە عابید منیش دەتوانم ماقووڵانە قسە بکەم، ئێرە چیی لێیە؟» ڕۆیی بۆ سەر سفرەکە. «شەرابێ شیرین و کۆنەی برایانی ئێلی سیۆف. تف، تف. ئەوە شتێکە لەگەڵ وردە ماسی جیاوازیی هەیە. چاو لەو بتڵانە بکەن کە باوکان هێناویانەتە دەرێ، ها! ها! ها! کێ ئەو هەمووەی بۆ دابین کردوون؟ کابرایەکی لادێیی، کرێکارێکی هەژاری چارەڕەش کە پاروو لە دەمی ماڵ و منداڵەکەی دەگێڕێتەوە و دەیهێنێ دەیکاتە کۆشی ئێوەوە! ئێوەش باوکانی پیرۆز، دەزانن چۆن خوێنی خەڵک بمژن!»

باوە یوسف گوتی: «ئەوە ئیتر زۆر شوورەییە، پەککوو!»

باوە پایسی هەروا قڕوقەپی کردبوو. میۆسۆف دەرپەڕی بۆ دەرێ و گاڵگانۆفیش بە دوایدا.

ـ باوە ئیتر منیش بەدوای پیووتێر ئەلکساندرۆویچدا دەڕۆم! هەتا من بم، تازە پێم بە ئێرەدا نایەتەوە. ئەگەر چۆک دابدەی و لێشم بپاڕێیتەوە نایەم. هەزار ڕۆبڵم بۆ ناردوون. کەوایە ئێستا پارەکەتان زۆرتر بووە. خەریکم تۆڵەی تافی لاویم دەکەمەوە. لەبەر ئەو هەموو سووکایەتییەی پێمکراوە و تاڵم کردووە. ئەو کلێسەیە لە ژیانی مندا ڕۆڵێکی گەورەی گێڕاوە! زۆری گریاندووم و تاڵاوی خەمی بە گەروودا کردووم. ئێوە، ژنەکەم، ئەو ژنە شێتەتان ئەوەندەی دیکە لێ هارووژاندم. بە گازەنگ و کتێب لەعنەتتان بۆ دەناردم و سەبارەت بە من قسە و قسەڵۆکتان بڵاو دەکردەوە. باوکان! ئیتر بەسە! ئێستا سەردەمی لیبرالیسمە، سەردەمی پاپۆڕی هەڵمی و هێڵاسنە. هەزار ڕۆبڵ هیچ، تۆ بڵێ سەد ڕۆبڵ، تەنانەت سەد کۆپکیشت لە لایەن منەوە پێنادرێ!

با ئەوەمان لەبیر نەچێ، ئەو کلێسەیەی ئێمە هیچ ڕۆڵێکی لە ژیانی ئەودا نەبووە و قەتیش لەبەر ئەو دڵۆپێک فرمێسکی لە چاو هەڵنەوەراندووە. کەچی ئاڵۆزی و ڕق وای هەڵەشە کردبوو، وا کەوتبووە دڵە لەرزە خۆشی تا ڕادەیەک باوەڕی دەکرد. بەڵام بۆ ساتێک هەستیکرد واچاکە کۆی کاتەوە.

باوکە عابید بۆ ئەو درۆ شەرماوییەی سەری داخست و دیسان بە پێداگرییەوە هاتە قسە:

ـ لە کتێبی پیروزدا هاتووە: «ئیفتیڕا و تۆمەتی خەڵکی بە ڕووخۆشی و تاقەتەوە تامڵ بکە و دڵی خۆت تووشی خەم و نارەحەتی مەکە. لەو کەسەش کە تۆی بوغزاندووە و قسەی بۆ هەڵبەستووی دڵشلوێ مەبە و ڕقی لێهەڵمەگرە.» ئێمەش وادەکەین.

«حەیەحەیەحەی! تۆ بیرێک لە خۆت و قسە هەڵلەق مەڵلەقەکانت بکەوە. باوکانی بەڕێز، بیرێک لە خۆتان بکەنەوە. من دەڕۆم. بەڵام ئالکسیی کوڕیشم لەگەڵ خۆم دەبەم و ناهێڵم پێی بە ئێرەدا بێتەوە. چونکە وەک باوک ئیختیاری کوڕەکەی خۆمم هەیە. ئیوان فیۆدۆرویچ، ئەرک ناسترین کوڕم، ئیزن بدە فەرمان بدەم بە دوای مندا بێی. فۆن سووهەن، تۆ بۆ دەتەوێ لێرە بمێنیتەوە؟ وەرە بۆ دیدەنیی من، لە نێو شار دەتوانین زۆر خۆشی ڕابوێرین. تەنیا کیلۆمەترێکە ڕێگاکەی. لەجیاتی ڕۆنی گیایی، گۆشت بەرازی برژاوت دەدەمێ. گەرمەشانیت بۆ دەکوڵێنم و خۆراکەکەمان بە (براندی)یەوە دەخۆین..... هۆی، فۆن سووهەن، دەرفەت لەکیس مەدە» بە گوڕە گوڕ و دەست بە سینگەوە گرتن دەرپەڕییە دەرێ.

هەر لەو کاتەدا بوو ڕاکیتین چاوی پێی کەوت و نیشان ئالیووشای دا. فیۆدۆر پاولۆویچ کە چاوی بە ئالیووشا کەوت، لە دوورەوە هەرای کرد: «ئالکسی هەر ئەمڕۆ وەرەوە بۆ ماڵێ، بارگەوبنەت وەپێچە و بیهێنەوە، هیچ نیشانەیەک لە خۆت بەجێ نەهێڵی.»

ئالیووشا لەجێی خۆی ویشک بوو و بەواق وڕماوی و سەرسامی چاوی لە باوکی بڕی. فیۆدۆر پاولۆویچ خێرا سواری فایتوونەکە بوو. ئیوان فیۆدۆرۆویچیش بێ ئەوەی بۆ خوداحافیزی ئاوڕ لە ئالیووشا بداتەوە، سوار بوو. بەڵام لەو کاتەدا کێشەیەکی سەرسوورهێنەر و ڕشقنجاڕییەکی نابەجێ، دوایین بەشی شانۆکەی وەڕاست گێڕا. ماکسیمۆف کتوپڕ گەیشتە پەنا فایتوونەکە. لە ترسی ئەوەی نەکا درەنگ بگاتێ، بە هاسکە هاسک هەڵدەهات.

ڕاکیتین و ئالیووشا دیتیان کە هەڵدەهات. ئەوەندە بە هەشتاو هەڵدەهات، لەبەر پەلەپەل پێی لە سەر ئەو ڕکێفە دانا کە لاقی چەپی ئیوان فیۆدۆرویچی هێشتا لە سەر بوو، چنگی لە لێواری فایتوونەکە گیر کردبوو و هەوڵی دەدا سواربێ. لە پەستا هاواری دەکرد: «دێم لەگەڵتان، دێم!» وای دەنواند شادە و بە ڕوویەکی خۆشەوە دەگرژییەوە «منیش بەرن.»

فیۆدۆر پاولۆویچ بە دڵخۆشییەوە هاواریکرد: «فەرمووو! نەمگوت فۆن سووهەنی. ڕاست فۆن سووهەن خۆیەتی لە گۆڕەکەی هاتۆتەوە دەرێ. چۆن بوو خۆت دەرباز کرد؟ چ فۆن سووهەن بازییەکت وەڕێ خست؟ چۆن توانیت واز لەو لەوەڕە بێنی؟ دەبێ پیاوێکی ڕووهەڵماڵدراو بی! من کە خۆم هەم، بەڵام بۆ تۆ پێم سەیرە! وەرە سەرێ دەی، وەرە سەرێ! وانیا لێیگەڕێ با بێتە سەرێ. ناخۆش ناگوزەرێ. دەتوانێ لەوبەر پێیەدا دانیشێ. فۆن سووهەن، لەوبەر پێیەدا ڕادەکێشی؟ دەنا بچۆ باغەڵدەستی فایتوونەوانەکە.»

بەڵام ئیوان فیۆدۆرویچ کە لە سەر جێگاکەی خۆی دانیشتبوو، بەبێ ئەوەی هیچ بڵێ مشتێکی لە سینگی ماکسیمۆف داو خستییە خوارێ. تۆزێکی مابوو لە سەر عەرزەکە ڕەهێڵ بێ.

ئیوان فیۆدۆرویچ بە توورەیی گوڕاندی بە سەر فایتوونەوانەکەدا: «لێخوڕە دەی یاڵڵا!»

فیۆدۆر پاولۆویچ بەتوورەیی گوتی: «بۆ وادەکەی، چیت لە ژێر سەردایە؟ ئەوە کارە؟»

فایتون وەڕێکەوتبوو. ئیوان فیۆدۆرویچ وەڵامی نەدایەوە.

فیۆدۆر پاولۆویچ دیسان گوتی: «تۆش مرۆڤێکی سەیری.»

دوای دوو سێ دەقیقە مات بوون، خێسەیەکی لە کوڕەکەی کرد و گوتی: «ئەوە تۆبووی بەرنامەی چوونە کلێسەت چنی، خۆت ئیسەرەمت کرد و ئێستاش ڕقت هەستاوە؟»

ئیوان فیۆدۆرویچ بە گرژ و مۆنی وەدەنگ هات: «زۆرت فەرمایشتی هیچەکە و پووچەکە بەرەڵلا کرد، ئێستا تۆزێ پشوو بدە، ئیتر لەسەری مەڕۆ.»

فیۆدۆر پاولۆویچ دیسان دوو دەقیقە مات بوو. پاشان بە زمانێکی ئامۆژگاریکەرانە گوتی: «ئێستا دلۆپێک (براندی) چارەسازە.» بەڵام ئیوان فیۆدۆرویچ وەلامی نەدایەوە.

ـ بگەینەوە ماڵێ تۆش قومێ بخۆوە.

ئیوان فیۆدۆرویچ متەقی نەکرد.

فیۆدۆر پاولۆویچ دیسان دوو دەقیقە مت بوو.

ـ بەڵام من ئالیووشا لەو کلێسەیە دێنمە دەرێ. جا ئەو کارە بۆ تۆ، جەنابی ئەجەل (کاریل فۆنمۆر) هەرچەندە ناخۆشیش بێ، چش.

ئیوان فیۆدۆرویچ لەبەر بێزاری و وەڕەزی شانی هەڵتەکاند و ڕووی لێوەرگێڕا و چاوی لە ڕێگاکەی بڕی. ئیتر هەتا ماڵێ لە ئەلفەوە نەهاتە بێ.

# (١)

## لە دیوی خزمەتکاران

ماڵی کارامازۆف لە ناوەندی شار دوور بوو، بەڵام زۆریش لاپەڕ نەبوو. خانووبەرەیەکی قەدیمی و یەکنهۆم و بەرژەوەند خۆش بوو، ماڵێکی جوان و ڕازاوە، دیوارەکانی دەرەوەی خۆڵەمێشین و هەورەبانەکەی سوور بوو. ڕواڵەتێکی خاوێن و سەرنجڕاکێشی هەبوو. ماڵێکی جێدار و بەرفراوان، دارو دیوارەکەی دیار بوو ساڵانێکی زۆر دەوام دێنێ. هەموو چەشنە وەتاغ و خەڵوەتی و پلیکان و سەکۆیەکی تێدابوو. مشکیش تریلیلانیان تێدا دەکرد، بەڵام فیۆدۆر پاولۆویچ باسی نەدەکردن. دەیگوت «ئیوان کاتێک پیاو بە تەنیا دەبێ، چاکە زۆر هەست بە تەنیایی ناکا.»

عادەتی بوو شەوانە خزمەتکارەکانی دەناردە وەتاغی خۆیان و دەرگای لە سەر خۆی دادەخست. وەتاغی خزمەتکاران، بینایەکی گەورە و قایم بوو لە حەوشەکەدا. ئەگەرچی ماڵەکەی چێشتخانەی بوو، بەڵام فیۆدۆر پاولۆویچ فەرمانی دەدا نان و چێشت لە ژورری خزمەتکاران ساز بکەن. بۆن و هاڵاوی کاتی چێشت لێنانی پێخۆش نەبوو، زستان و هاوین دەبوو قاپ و قاچاخ و نان و چێشت لە حەوشەوە بێننە ماڵێ. خانووبەرەکە بۆ بنەماڵەیەکی گەورە ساز کرابوو، ئەندامانی خاوخێزان بە خزمەتکارکانیشەوە ئەگەر پێنج بەرابەری ئێستاش بوایەن جێگایان دەبۆوە و هەرکەس وەتاغی خۆی وەبەر دەکەوت. بەڵام لە کاتی ئەو چیرۆکەی ئێمەدا تەنیا فیۆدۆر پاولۆویچ و ئیوان فیۆدۆرویچی کوڕی لەو ماڵەدا دەژیان. وەتاغی خزمەتکارانیش سێ کەسی لێبوو. گریگۆریی پیر و ژنەکەی، لەگەڵ پیاوێکی جحێڵ بە ناوی ئیسمیر دیاکۆف، پێویستە تۆزێکیش سەبارەت بەو سێ کەسە بدوێین. کەم تا کورتێ

باسی گریگۆری واسیلیەویچ کرا. ئەو پیاوێکی پێداگر و لەکار سووربوو. ئەگەر کاتێک، بەهەر هۆیەک ( کە زۆرجار چاوەڕوان نەکراو بوو) بەو باوەڕە بگەیشتایە کە ئەو شوێنەی مەبەستییەتی یان ئەو کارەی دەیهەوێ بیکا، دروستە و بەجێیە؛ کوێرانە و خیشەسەرانە هەڵی دەکوتایە سەری و پاشگەز بوونەوەی نەبوو. سادق و بێ فڕوفێڵ بوو، بێ دەغەڵە کاری دەکرد. ژنەکەی مارتا ئیگناتیفنا بە شێوەیەکی شاراوە و نهێنی هەموو تەمەنی خۆی لە هەمبەر ویستی مێردەکەیدا ملکەچ و گوێ بە فەرمانی بوو. لەگەڵ ئەوەشدا، دوای ئازادبوونی کۆیلە و ڕەعیەتان[1] ئەو ژنە هەژارەی وەزاڵە هێنابوو. بۆیە ئەو ژنە هەردوو پێی لە کەوشێک کردبوو کە لەلای فیۆدۆر پاولۆویچ بڕۆن و بەو بڕە پارەیەی هەیانە دووکانێکی چکۆلە لە مۆسکۆ بکەنەوە. بەڵام گریگۆری هەر ئەو کاتە بڕیاری هەوەڵ و ئاخری دا کە «ژنەتیوە قسەی قۆڕ دەکا، ژن بێوەفان» ئەربابی پیریان هەرچۆنێک بێ، نابێ بەجێیبێڵین. چونکە «ئێستا ئەرکی سەرشانیانە.»

لە مارتا ئیگناتیفنای پرسی «دەزانی ئەرک یانی چی؟»

مارتا ئیگناتیفنا وەڵامی دایەوە: «گریگۆری واسیلیەویچ دەزانم ئەرک یانی چی، بەڵام بۆ ئەرکی ئێمەیە لێرە بمێنینەوە. قەت لەوە ناگەم.»

ـ کەوایە هەر چاکترە تێینەگەی. هەر ئەوەی کە گوتم. تۆش دان بە جەرگتدا بگرە و هیچ مەڵێ.

هەرواش بوو. نەڕۆیشتن. فیۆدۆر پاولۆویچیش بەڵێنیدا هەقدەستی کەمیان بداتێ و بەردەوام پێشی دەدان. گریگۆریش دەیزانی کارتێکەرییەکی تەواوی لە سەر ئەربابەکەی هەیە. فیۆدۆر پاولۆویچ قەشمەرییەکی فێڵەباز بوو، گریگۆریش بەباشی لەوە ئاگادار بوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، خۆی گوتەنی «لە هێندێ بواری ژیاندا» ئیرادەیەکی بەهێزی هەبوو، کەچی ئەوە سەیربوو لە هەمبەر بڕێ کاری دیکەدا دەستەوستان و کار لە دەست نەهاتوو بوو. ئاگاداری خاڵە لاوازەکانی خۆی بوو و لێی دەترسا. لە هێندێ لایەنەوە

---

1- کۆیلە و ڕەعیەتان (سێرفەکان Serf) کە لە نۆزدەی فیوریەی ١٨٦١دا ئازاد کران

پێویسته پیاو زۆر وریا بێ که ژیان بەبێ کەسێکی باوەڕپێکراو دژواره و گریگۆری باوەڕپێکراوترین مرۆڤ بوو. فیۆدۆر پاولۆویچ گەلێجاران له ژیانیدا. ئەگەر نێوبژیوانیی گریگۆری نەبوایە، به حیسابی خوریشۆریان دەکرد. هەموو جارێکیش خزمەتکاری پیر زۆر چاک سەرکۆنەی دەکرد. بەڵام تەنیا لەبەر لێدان نەبوو که فیۆدۆر پاولۆویچ دەترسا. له هێندێ کاتی ناسک و ئاڵۆزدا فیۆدۆر پاولۆویچ به دڵ و گیان ئاواتی بوو کەسێکی وەفادار و دڵسۆزی لەلابێ. سەبارەت بەو ئاواتەشی که برێجار به ڕوانینێک به سەریدا زاڵ دەبوو، نەیدەتوانی بدوێ. ئەو شێوه حاڵوباڵەش تاڕادەیەک سامناک بوو. فیۆدۆر پاولۆویچ که له داوێن پیسیدا وەک گیانلەبەرێکی ملۆزم و ئافەتهێن و زاڵمی لێهاتبوو، هێندێ جار له تەنیایی و تاریکیدا ترسێکی خەیاڵی و دڵەخورپەیەکی ئەخلاقی بەسەریدا زاڵدەبوو، چاوی ڕەشکەوپێشکەی دەکرد و ئەو ترسه لەبەرچاوی دەبووه دێوەزمه. دەیگوت: «لەو کاتانەدا وەختە گیانم دەرچێ.» لەو وەختانەدا پێیخۆش بوو کەسێکی لەلابێ، یان لێی نزیک بێ. ئەگەر له وەتاغەکەی خۆشی نەبێ، لانیکەم له هۆدەی خزمەتکارەکان بێ و هەستیپێبکا. پیاوێکی بەهێز، وەفادار، ئیماندار و لەخۆی نەچوو، که تەواوی بێبەندوبارییەکانی دیوه و له هەموو ڕاز و نهێنییەکانی ئاگاداره، بەڵام ئامادەیه لەبەر بەوەفایی چاوپۆشی بکا له هەموو ئەوانه و دژایەتیی لەگەڵ نەکا. له هەمووشی گرینگتر ترسی نەخاته دڵەوه و هیچ هەڕەشەیەکی لێنەکا، جا هی ئەم دنیا بێ یان هی ئەو دنیا، له کاتی پێویستیشدا پشتیوانیی لێبکا ـ له هەمبەر کێدا؟ له هەمبەر کەسێکی نەناسراو بەڵام بەسام و مەترسیداردا. ئەوەی که پێویستی بوو ئەوه بوو که هەست بکا، پیاوێکی «دیکە» لەو ماڵەدایه. دۆستێکی لەمێژینه و تاقیکراوەیه که لەوانەیه له کاتی نەخۆشیدا بانگیبکا تاکو چاو له ئەدگاری ببڕێ و چەن قسەی ناحەز به گورچوویدا دا. ئەگەر خزمەتکاری پیریش تووڕه نەبوایە، هەستی به هێمنایەتی دەکرد. ئەگەر تووڕەش بوایه بەجارێ خەم دایدەگرت. تەنانەت پێشدەهات ئەویش (زۆر بە کەمی) که فیۆدۆر پاولۆویچ شەوانه دەچوو بۆ وەتاغی خزمەتکاران و

گریگۆری لە خەو هەڵدەستاند و چەن ساتێک دەیبرد بۆلای خۆی. کاتێ پیرە پیاو دەهات، فیۆدۆر پاولۆویچ دەستیدەکرد بە قسەکردن سەبارەت بە بێنرخترین کاروبار و زۆر زووش مەرەخەسی دەکرد. جاریوابوو تەنانەت بە گاڵتە دەیهێنا و بەرلەوەی بڕوا، فیۆدۆر پاولۆویچ بە جنێوێکەوە دەچووە نێو پێخەفەکەیەوە و بەویژدانێکی ئاسوودەوە تەخت دەخەوت. بە هاتنی ئالیووشا، هەستێکی وا لە فیۆدۆر پاولۆویچدا سەری هەڵدەدا. ئالیووشا بەهۆی ئەوەی «هەموو شتێکی دەدی و لەگەڵ ئەو دەژیا. قەتیش بو سەرکۆنە لە ئەلفەوە نەدەهاتە بێ.» هەروەها «لەدڵیدا جێی خۆی کردبۆوە.» جگە لەوانە، ئالیووشا شتێکی لەگەڵ خۆی هێنابوو کە باوکی تا ئەو کاتە لێی ئاگادار نەبوو؛ ون بوونی هەموو ڕق لێ بوونەوە و خۆشەویستییەکی نەگۆڕ، ڕێز و حورمەتێکی تەواو سروشتی دەرهەق بە پیرە پیاوێک کە شیاوی نەبوو. بۆ پیرێکی خەرەفاو کە هەموو پێوەندەکانی بنەماڵەی لەبەریەک هەڵوەشاندبوو، ئەو کردەوەیەش بەجارێ تووشی سەرسامیی کردبوو. بۆ ئەو کە هەتا ئەو کاتە جگە لە شەڕ بیری لە هیچ شتێکی دیکە نەکردبۆوە، ئەزموونێکی تازە و سەرسووڕهێنەر بوو. ئالیووشا بەجێی هێشتبوو، هەستیشی بەوە کردبوو شتێک فێر بووە کە تا ئەو کاتە نەیویستبوو فێری بێ.

باسمکرد کە گریگۆری زۆری ڕق لە ئادلایدا ئیوانا، ژنی یەکەمی فیۆدۆر پاولۆویچ دایکی دیمیتری فیۆدۆرۆویچ بوو، بەڵام بەپێچەوانە زۆری لایەنگری لە سۆفیا ئیوانا دەکرد، ئەرباب‌ەکەی یان هەرکەسێکی دیکە قسەی بەو ژنە شێت و هەژارە بگوتایە گریگۆری لەسەری وەجواب دەهات. هاودڵی لەگەڵ ئەو ژنە چارەڕەشەی بە کارێکی خێر دەزانی و تەنانەت بیست ساڵ دواتریش هیچ کەس نەیدەوێرا باسی ئەو ژنە بکا و چکۆلەترین ئاماژەیان پێبکرایە و گریگۆری بەدڵی نەبوایە، لەڕێوە بەگژیاندا دەهات. گریگۆری بە ڕواڵەت سارد وسڕ و نەدوێن بوو، بەڵام لەخۆڕا و بێ بیرکردنەوە قسەی نەدەکرد. لە یەکەم دیداردا مەحاڵ بوو کەسێک بۆی دەرکەوێ ژنە بەتاقەت و

گوێڕایەڵەکەی خۆش دەوێ یان نا، بەڵام بەڕاستی خۆشی دەویست و ژنەکەشی ئەوەی دەزانی.

مارتا ئیگناتیفنا ژنێکی تێگەیشتوو بوو، لە ڕاستیدا زۆریش لە مێردەکەی وریا و چاوکراوەتر بوو، یان لانیکەم لە کاروباری ڕۆژانەدا لە مێردەکەی بە مشوورتر بوو. لەگەڵ ئەوەشدا، لە کاتی زەماوەندەکەیانەوە بەبێ هیچ گلە و گازندەیەک سەر لە پێناوی مێردەکەی بوو و ڕێزێکی زۆری بۆ دادەنا. ئەوەشمان لەبیر نەچێ، ئەوان لە ماوەی ژیانی هاوبەشییاندا زۆر کەم لەگەڵ یەکتر دووا بوون، مەگین باسی شتێکی زۆر پێویستی ڕۆژانەیان کردبێ. گریگۆری ڕوو گرژ و تووڕە، بەتەنیا مشووری هەموو کار و ئەرکەکانی بنەماڵەی دەخوارد، بەجۆرێک کە مارتا ئیگناتیفنا لەمێژ بوو بۆی دەرکەتبوو کە پێویستی بە هیچ ڕێنوێنییەک نییە. دەیزانی مێردەکەی ڕێز بۆ ئەو خۆتێهەڵنەقوتاندنەی دادەنێ و ئەوەشی بە فام و تێگەیشتوویی دەزانی. گریگۆری تاقە جارێکی لێدابوو، ئەویش زۆر کەم. ساڵێکیان دوای زەماوەندەکەی فیۆدۆر پاولۆوچ و ئادلایدا ئیوانا، ژنان و کچانی لادێیی، ـ کە ئەو سەردەمە کۆیلە و ڕەعیەت بوون ـ داوایان لێکردن گۆرانی بڵێن و سەما بکەن. خەریکی دەستپێکردنی کاری «مێرگ و چیمەنی سەوز» بوون کە مارتای جوان و جحێڵ هەڵاتە پێشێ و دەستیکرد بە «سەمای ڕووسی». بەڵام نەک بە داب و نەریتی ناوچەیی، بەڵکوو بە شێوەی سەردەمی قەرەواشییەکەی لە بنەماڵەی دەوڵەمەندی میۆسۆف. لە شانۆیەکی تایبەتیدا کە هونەرمەندان لەلای مامۆستایەکی سەمای مۆسکۆیی لەوێ فێری سەما دەکران. گریگۆری چاوی بە سەما کردنی ژنەکەی کەوت. پاشان لە ماڵێ هێندێ سەرو قژی کێشا و بەسەریدا هات. بەڵام هەر ئەو کاتە کێشە تەواو بوو: لێدان ئیتر دووپات نەبۆوە و مارتائیگناتیفناش سەماکردنی وەلانا. خودا منداڵی پێنەدابوون، تەنیا منداڵێکیان بوو ئەویش مرد. گریگۆری زۆر منداڵ خۆشەویست بوو، بەڵام دڵی پێوەنەبوو منداڵیان ببێ. ئەوەی نەدەشاردەوە و بە دەربڕینی ئەو هەستەش خۆی بە شەرمەزار نەدەزانی. دوای هەڵاتن و

تۆرانی ئادلایدا ئیوانا، دیمیتری فیۆدۆرۆویچی سێ ساڵانەی هێنا لای خۆی. سەری بۆ شانە دەکرد و بە دەستی خۆی لە تەشتدا دەی‌شۆرد، بەو شێوەیە ساڵێکی ئاگاداری لێکرد. دواتر ئاگادارییی لە ئیوان فیۆدۆرۆویچ و ئالیووشاش کرد، کە ژنەکەی ژینڕاڵی خودالێخۆشبوو بە شەپلاغە پاداشەکەی دابۆوە. لە دواییدا دێینەوە سەر ئەو باسە. تەنیا بەختەوەرییەک کە منداڵەکەی بە دیاری بۆی هێنابوو، چاوەڕوانیی لەدایک بوونی بوو. کاتێ لەدایک بوو. خەم و مەترسی سواری شانی بوو. منداڵەکەی شەشۆ بوو. واتە شەش قامکی بوو. گریگۆری لەژێرباری ئەو کەسەرەدا وا چەمییەوە هەتا ڕۆژی وسڵپێدان قڕوقەپی کردبوو و تەنیا لە نێو باخەکەدا بوو، قسەشی لەگەڵ کەس نەدەکرد. بەهار بوو بۆیە هەتا سێ ڕۆژ لە باخەکە نەهاتە دەرێ و خەریکی تەکمیش کردنی دارەکان بوو. ڕۆژی سێهەم بۆ وسڵ پێدانی کوڕەکەی دیاری کرابوو. هەر لەو کاتەدا گریگۆری بەو ئاکامە گەیشت کە بڕواتەوە بۆ ماڵەکەی، چونکە لەوێ بانگهێشت کراوان و پیاوانی ئایینی کۆبووبوونەوە و فیۆدۆر پاولۆویچیش وەک باوکی خوازراو لەوێ بوو. گریگۆری لەو کۆڕەدا ڕایگەیاند کە ئەو منداڵە «نابێ بە هیچ شێوەیەک وسڵ بدرێ و بانگی بە گوێدا بدەن.» ئەوەشی زۆر ئارام و لەسەرخۆ ڕاگەیاند و زۆر بە زەحمەت درکاندی و پیرانە چاوی لە قەشە بڕی و لەوە زیاتری لە سەر نەڕۆیشت.

قەشە بە سەرسوڕمانەوە و بە ڕوویەکی خۆشەوە پرسیی: «بۆچی؟»

گریگۆری لە ژێر لێوەوە گوتی: «چونکە شەشۆیە.»

- شەشۆ؟ شەشۆی چی؟

گریگۆری تۆزێ مات بوو. پاشان هێدی و لەسەرەخۆ گوتی: «شێوانی سروشت.» دیاربوو دەیەوێ لەوە زیاتریش لەسەری بڕوا. هەموو دەستیان کرد بە پێکەنین. هەڵبەت منداڵە بەستەزمانەکەیان وسڵدا و گریگۆری لە پەنا تەشتە ئاوی وسڵەکەیدا بە دڵ دەستیکرد بە دوعا و پاڕانەوە، بەلام باوەڕی سەبارەت بە منداڵە نەگۆڕابوو. لەگەڵ ئەوەشدا بە هیچ شێوەیەک کاری بە سەر منداڵەکەوە نەبوو. تا ئەو کاتەی منداڵە نەخۆشەکەیان زیندوو بوو،

تەماشای نەدەکرد و لەڕاستیدا هەوڵی دەدا هەمیەتی نەداتێ، زۆربەی کات لە دەرەوەی ماڵەکەیان دەمایەوە. بەڵام دوای دوو حەوتوو منداڵەکە بۆقژەی گرت و مرد. خۆی منداڵەکەی لە تابووتێکی چکۆلە ناو بە خەمێکی قووڵەوە چاوی تێبڕی. کاتێ خۆڵیان بە سەر گۆڕە بچووکەکەیدا دەکرد، چۆکی دادا و سەری نایە زەوی. ساڵانێکی زۆر دوای مردنی منداڵەکەیان نە خۆی باسی دەکرد و نە مارتای خێزانیشی لەلای ئەو دەیوێرا باسی بکا. ئەگەر لە جێگایەک گریگۆریشی لێنەبوایە، ڕەنگ بوو تۆزێ دەردەدڵەکەی لای کەسێک بدرکاندایە و باری دڵی خۆی سووک کردایە. مارتا بۆی دەرکەوت لە دوای بەخاک سپاردنی کوڕەکەیان، گریگۆری هەموو کاتی خۆی بۆ مەزهەب تەرخان کردووە و دەستی کردووە بە خوێندنەوەی «بەسەرهاتی پیاوانی ئایینی». چونکە زۆربەی کات لەتەنیایی و بێدەنگیدا دادەنیشت و چاویلکە خڕ و گەورەکەی لە چاو دەکرد کە دەورەکەی زێوین بوو، بە دەنگی بەرز دەستی دەکرد بە خوێندنەوەی ئەو کتێبە، جگە لە ماوەی پارێز. هۆگرییەکی زۆری بە کتێبی ئەیووب هەبوو. چەند بەرگی لە کتێبی وتە و وتارەکانی «باوە ئیسحاقی لەخوا ترسی سووریی[2].» وەدەست خستبوو کە ساڵانێکی زۆر بەردەوام دەیخوێندنەوە. زۆری سەر لێدەرنەدەکرد، بەڵام لەوە دەچوو هەر بەو هۆیەوە بێ ئاوا خۆشی دەویست. لەم دواییانەدا هاموشۆی ڕێ و ڕەسمی «قەمچی بازەکانی» دەکرد، کە لەو مەڵبەندە نیشتەجێ بوون. دیاربوو کەوتۆتە ژێر کاریگەریی ئەوان. بەڵام باوەڕهێنان بە ئیمانێکی تازەی پێ خراپ نەبوو. خووگرتن بە موتاڵای دەقە ئایینییەکان، ئەدگارێکی گرژ و عەبووسی پێدابوو. دەتگوت هەر لە ڕۆژی «بەرێ»وە ئەو عیرفانەیان لە وجوودیدا تواندۆتەوە و لەگەڵی گەورە بووە. لەدایک بوونی ئەو منداڵە شەشۆیە و مردنەکەی، دەتگوت بەپێی پلانێکی تایبەت، لەگەڵ ڕووداوێکی سەرسووڕهێنەری دیکە یەک کەوتن، چونکە دواتر دەیگوت، «خۆشەویستی»یەکی لە ڕۆحمدا بەجێ هێشتووە، کە ئاوێتەی هەست و

---

2- یەکێ لە زاهیدانی سەدەی حەوتەمی زایین. دۆستۆیۆڤسکی بەرگێک لەو کتێبەی بووە.

نەستم بووە. شەوی ناشتنی کوڕەکەی مارتا بە دەنگی ناڵەی منداڵێک لە خەو ڕاچەنی، ترس دایگرت و مێردەکەی لە خەو هەستاند. ئەویش گوێی ڕاگرت و گوتی لەوە دەچێ کەسێک بێ و ئاوا دەناڵێنێ، «لەوانەیە ژنێک بێ» هەستا خۆی پۆشتە کردەوە. شەوێکی گەرمی مانگی مەی بوو. کە لە پلیکانەکان چووەخوارێ، بەجوانی گوێی لەدەنگەکە بوو. لە نێو باخەکەوە دەهات. بەڵام دەروازەکەی شەوانە قوفڵ دەکرا و ڕێگایەکی دیکە نەبوو بۆ چوونە نێو باخەکە. چونکە دەورواندەوری بە نەردەی بەرز و قایم پەرژین کرابوو. گەڕاوە ماڵێ و لەنتەرێکی هەڵکرد، دەستی دایە کلیلی دەروازەکە و بێ ئەوەی گوێ بداتە ترسی ژنەکەی کە دەیگوت دەنگی گریانی منداڵە و ئەوە کوڕەکەی خۆیانە دەگری و بانگیان دەکا، بە بێدەنگی چووە نێو باخەکەوە. لەوێ بۆی دەرکەوت دەنگەکە لەوحەمامەوە دێ کە لە نزیک دەروازەی باخەکە هەڵکەوتبوو. دەنگی ناڵە و نووزەی ژنێکیش بوو. کە دەرگای حەمامەکەی کردەوە، چاوی بە دیمەنێک کەوت کە لە جێی خۆی وشک بوو. کچێکی ئەقڵسووک، کە لە کووچە و کۆڵان دەخولاوە و هەموو ئەویان بەو ناوە دەناسییەوە، «لیزاوتا ئیسمیر دیاشانا» (لیزاوتای بۆگەنیو) هاتبووە نێو حەمامەکەوە و منداڵی بووبوو. لەپەنا منداڵەکەی کەوتبوو و دەیناڵاند. کچە هیچی نەگوت، چونکە لە ماوەی تەمەنیدا قسەی نەکردبوو. بەڵام بەسەرهاتی ئەو بەشێکی جیای پێوویستە.

## (٢)

## ليزاوتاى بۆگەنيو

شتێک بوو کە بە تايبەت سەرنجى گريگۆريى ڕاکێشاو، دڕدۆنگييەکى زۆر ناخۆش و وروو‌ژێنەرى لە ناخيدا بەدى هێنا. ليزاوتا کچێکى خڕيلەى کورتە بالاّ بوو. «ورديلەيەکى بستە بالاّ.» چونکە زۆر لە پيرێژنانى ئيماندار، لەدواى مردنەکەى، دڵسۆزانە دەيانگوت، بيست ساڵى تەمەن بوو. دەموچاوە پان و ساغ و مەيلەو سوورەکەى، تەواو حەپۆلانە بوو. ڕوانينى چاوە زيتەڵەکانى، لەگەڵ قەلاّفەت و ئەدگارە ئازاراوييەکەى تەزووى بە دڵى مرۆڤدا دێنا. زستان و هاوين بە تۆيى کراسێکى جاو و بە پێخاوسى دەسووڕاوە. قژە ڕەش و زبر و لوولەکەى وەک بەرگنى بەرخ تێک هالاّبوو و دەتگوت کلاّوە لە سەريدا. سەر و قژى هەميشە قوڕاوى بوو، پووش و پەلاّش و کاوکۆتى پێوە دەنووسا. چونکە لەهەر کوێ بوايە لەجێگاى پيس و خاوێن وەردەکەوت و تخێڵ دەبوو. باوکى ئارەق خۆرێکى بێ ماڵ و حاڵ و نەخۆش بوو. ئيلياى هەژار و دەستکورت دارونەدارى لە دەست بووبۆوە. سالاّنێکى زۆر وەک کرێکار لەلاى تاقمێک مامەڵەچيى دەوڵەمەند ژيانى تێپەڕ کردبوو. ليزاوتا چەند ساڵ بوو دايکى مردبوو. ئيلياى باوکيشى نەخۆشى و دەستتەنگى واى لێ کردبوو، ڕق لە زگ و دەغەزەدارانە هەڵسوکەوتى دەکرد. هەرکاتێ ليزاوتاش دەچوو بۆلاى، دڕنداتە دەيکوتا، بەلاّم زۆر بەدگمەن دەچوو بۆلاى باوکى. چونکە تەواوى خەڵکى شار ئامادە بوون ئاگادارىى لێبکەن، چونکە ئەقڵى سووک بوو، هەر لەبەر ئەوەش بووبووە خۆشەويستى خەڵک. خاوەنکارەکانى ئيليا و خەڵکى شارەکە و ئيليا خۆشى و بە تايبەت مامەڵەچييەکان هەوڵيان دەدا جلوبەرگى باشترى لەبەر کەن، زستانانەش

کەوڵە مەڕێکیان لەبەر دەکرد و پۆستاڵیان لە پێ دەکرد، بەڵام زۆری خۆ هەڵدەسووڕاند و نەیدەهێشت جلوبەرگی لەبەر بکەن. پاشان کە هیچی پێنەدەکرا و بەزۆر لەبەریان دەکرد، ملی ڕێی دەگرت و دەڕۆیشت، خێرا لە دالانی کلێسەی گەورە، ئەوەی لەبەریدا بوو دایدەماڵی و بەجێی دەهێشتن. ڕووپۆشەکەی پێشووی لەبەر دەکردەوە و بە پێخاوسی دەکەوتە کۆلان و شەقامان. خوداوڕاستان کاتێ حاکمی تازەی پارێزگا، کە بۆ سەردانی شارەکەی ئێمە هاتبوو، چاوی بە لیزاوتا کەوت و هەستە ناسکەکەی ڕووشا، ئەگەرچی پێیان گوتبوو کە لیزاوتا عەقڵی سووکە، کەچی گوتبووی گەڕانی کچێکی بیست ساڵانە، ئاوا بە نیوەڕووتی جوان نییە و دژی ئادابی کۆمەڵایەتییە و نابێ دووپات بێتەوە. بەڵام حاکم ڕۆیشت و لیزاوتا هەر لەو بارودۆخەدا ما. ئاخری باوکی مرد و لە پێشوو زیاتر کەوتە بەر سیلەی ڕەحمی کەسانی ئایینی، چونکە سێوی بوو، هەموو خۆشیان دەویست. تەنانەت کوڕانیش ئازاریان نەدەدا، ئەگەرچی کوڕانی شارەکەمان، بەتایبەت خوێندکارەکانیان، داروودەستەیەکی بزۆز و شەیتانن، لیزاوتا خۆی بە هەموو ماڵێکدا دەکرد و کەس وەدەری نەدەنا. هەموو بەزەییان پێیدا دەهات و شتێکیان دەدایە. ئەگەر پارەیان دەدایە، وەری دەگرت و دەیخستە سندووقی خێر و خێراتی کلێسە و زیندانەوە. ئەگەر لە بازاڕ نانێک یا کولێرەیەکیان پێبدایە، لەڕێوە تووشی هەر منداڵێک بوایە دەیدایە. جاریوابوو دەوڵەمەندترین ژنی شارەکەی ڕادەگرت و نان یان کولێرەکەی پێدەدا، ژنەش زۆر بە تامەزرۆیی لێی وەردەگرت. خۆی جگە لە ئاو و نانی جۆ دەمی لە هیچ شتێکی دیکە نەدەدا. ئەگەر بچوایەتە دووکانێکی گرانبایییەوە، کە لەوێدا پارە و کەلوپەلی بەنرخ لێرە و لەوێ کەوتبوو، کەس چاویشی لێ نەدەکرد، چونکە دەیانزانی ئەگەر هەزاران ڕۆبڵیش بکەوێ و بزانێ ئاگاشیان لێنییە، خودا نەکا دەستی بۆ بەرێ و چاویشی لێبکا. نەدەچووە نێو کلێسەوە، یان لە دالانەکەی کلێسە دەخەوت، یان بە سەر پەرژینێکدا (لەجیاتی نەردە و شیشبەند تا ئێستاش ئەم شارەی ئێمە پڕە لە پەرژین) دەچووە باخچەیەکەوە.

لانیکەم حەوتووی جارێک سەری لە ماڵی خاوەنکارەکانی پێشووی باوکی هەڵدێنا. زستانانەش هەموو شەوێ دەچووە ماڵی ئەوان و لە سووچی دالانێک یان گەورێکدا دەخەوت. کەس نەیدەزانی بەو حاڵەوە چۆن تاقەت دێنێ، بەڵام خووی پێگرتبوو، ئەگەرچی وردیلە بوو بەڵام ئەندامێکی پتەو و ساغی هەبوو. هێندێ لە خەڵکی شار لە سەر ئەو باوەڕە بوون کە ئەوکارانە لەبەر غورووڕ و سەرنج ڕاکێشانی خەڵک دەکا، بەڵام ئەوە وانەبوو. قسەکردنی نەدەزانی و تەنیا جاروبارێ پتەپتێکی دەست پێدەکرد، بەڵام کەس نەیدەزانی دەڵێچی. دەی ئەو چووزانێ غروور چییە؟

به هەڵکەوت شەوێکی گەرم و مانگەشەوی مانگی سیپتامبر (چەن ساڵ لەمەوبەر) دەستەیەکی پێنج شەش کەسی لات و مەست، درەنگانێ لە گازینۆ دەگەڕانەوە، بە «ڕێگەی پشتەوە»دا کە دەچووە نێو باخەکانی پشت ماڵانەوە، بە سەر پەرژینەکاندا وەسەر کەوتن و ملی ڕێیان گرت کە ڕێگاکە دەگەیشتە پردێک بە سەر بەنداوێکی دوور و درێژ و بۆگەنەوە کە نێومان نابوو چۆم. لە نێو دڕوودڵ و گەزەنە و گیا و گژی بن پەرژینەکاندا، لیزاوتایان دی خەوی لێکەوتبوو. بە حیلکە حیلک تەماشایان دەکرد و دەستیانکرد بە گاڵتە و جەفەنگی ناحەز و دزێو. یەکێ لەو لاوانە بە زەینیدا هات و بە هۆی هەوەسەوە ویستی بزانێ وەک ژن دەکرێ چاو لەو دەعبایە بکەن و... هەموویان بە قێزوبێزەوە گوتیان مەحاڵە شتی وا، بەکەڵک نایە. بەڵام فیۆدۆر پاولۆویچ، کە لەگەڵیاندا بوو، هاتە پێشێ و گوتی وانییە و دەنا زۆر کەیفیشی لەلایە و... ئەوە ڕاستە لەو کاتەدا قەشمەرەجاڕیی وەڕێ خستبوو. پێی خۆشبوو خۆی نیشانبدا و کوڕەکە سەرگەرم بکا. و بەڕواڵەت دەیویست وا نیشانبدا کە هاوشانی ئەوانە، بەڵام لە ڕاستیدا لە چاو ئەوان تەنیا نۆکەرێکی خوێڕی و بێئابڕوو بوو. ڕاست ئەو ڕۆژەش بوو کە هەواڵی مەرگی ژنەکەی یەکەمی لە پترزبۆرگەوە پێگەیشتبوو. پەڕۆیەکی ڕەشی لە کڵاوەکەی دابوو و بێشەرمانە خەریکی خواردنەوە بوو، ئاکاریشی هێندە قێزەون و ناحەز بوو، کە تەنانەت خوێڕیترین کەسی شارەکەمان بێزی لەوکارانە هەڵدەستا. هەڵبەت

لاوەکان بەو مەستییەش سەریان لەو قسەیەی فیۆدۆر پاولۆویچ سوڕما و دایان لە قاقای پێکەنین. تەنانەت یەکێ لەو لاوانە گوتی من ئەو کارەی لەگەڵ دەکەم. زۆربەیان ئەو کارەیان ڕەت کردەوە، ئەگەرچی هەروا حیلکەیان دەهات و دەتریقانەوە. پاشان هەموو ملی ڕێیان گرت و ڕۆیشتن. دواتر، فیۆدۆر پاولۆویچ سوێندی خواردبوو کە ئەویش لەگەڵیان ڕۆیشتووە، ڕەنگە واش بووبێ، بەڵام کەس بۆی ڕوون نییە و تا هەنووکەش مەعلووم نەبووە. بەڵام پێنج شەش مانگ دواتر، خەڵکی شارەکە بە ڕقێکی قورس و دڵتەنگییەوە باسی زگپڕبوونی لیزاوتایان دەکرد و هەوڵیان دەدا بزانن چ مرۆڤێکی بێویژدان دەستریژیی پێکردووە. ئەو کاتە لە ناکاو دەنگۆیەکی سەیر شاری تەنیەوە، ئەویش ئەوەبوو کە، ئەو مرۆڤە خوێڕی و بێویژدانە فیۆدۆر پاولۆویچە. کێ ئەو دەمگویەی بڵاو کردەوە؟ لەو دارودەستە ئارەقخۆرە پێنج کەسیان لەو شارە ڕۆیشتبوون. تەنیا یەکیان مابوو کە ئەویش پیاوێکی ڕیشسپیی بەمشوور و خاوەن تەگبیر و ڕای دوڵەت بوو، باوکی گەورە کچان بوو، مەحاڵیش بوو بڵاوکردنەوەی ئەو دەنگۆیە کاری ئەوبێ. بەڵام فیۆدۆر پاولۆویچ ئامانجی دەنگۆکە بوو و هەموو ئەویان بە تاوانبار دەزانی. هەڵبەت ئەو زۆریشی گوێ نەدایە: ئەو زەحمەتەی بەخۆی نەدەدا گوێ لە تاقمێک مامەڵەچی و بازاڕی بگرێ و جوابیان بداتەوە. ئەو کاتە زۆر لەخۆبایی بوو. تەنیا لە نێو کۆڕی دەوڵەمەندان و نەجیمزاداندا دادەنیشت و بە قەشمەرجاڕی سەرگەرمی دەکردن و دەماری نەدێنا قسە لەگەڵ کەس بکا.

هەرلەو کاتەدا، گریگۆری بە تەواوی توانایەوە لایەنگریی لە ئەربابەکەی کرد. لە سەر ئەو شەڕ و دەمقڕەی زۆری کرد و توانیی تاقمێکی زۆر بێنێتە سەر ئەو باوەڕەی فیۆدۆر پاولۆویچ بێ تاوانە و بوختانی بۆ هەڵدەبەستن. بۆیە زۆر بە ئیمان و متمانەوە گوتی: «ئەو دێڵە سەڵیتەیە خۆی تاوانبارە.» تۆمەتبار کابرایەکی تاوانباری مەترسیدار بوو، ناوی کارپ بوو، لە زیندان هەڵاتبوو، چونکە لە شارەکەی ئێمە خۆی شاردبۆوە، ناوی بۆ زۆربەی خەڵک ئاشنا بوو. ئەو گومانەش دەکرا، چونکە وەبیریان هاتەوە، ئەو کاتە، لە پاییزدا

کارپ لەو ناوچەیە سێ کەسی ڕووت کردبوو. بەڵام ئەوەش و دەنگۆکانیش نەبووە هۆی ئەوەی خەڵکی لیزاوتایان لەبەرچاو بکەوێ و دڵیان بۆی نەسووتێ. لە جاران زیاتریان ئاگاداری لێدەکرد. بێوەژنێکی دەوڵەمەند بەناوی کێندراتیف، کە مێردەکەی تاجر بووبوو، لە کۆتاییی مانگی ئاوریلدا بردی بۆ ماڵی خۆیان و دەیویست هەتا دوای منداڵ بوونەکە نەهێڵێ بڕواتە دەرێ. چاوی لە سەر هەڵنەدەگرت. بەڵام بە سەر ئەو هەموو ئاگادارییەشدا ڕۆژی ئاخری دووگیانییەکەی هەڵات و ڕووی کردە باخەکەی فیۆدۆر پاولۆویچ. مەعلوومیش نەبوو بەو زگە پڕەوە چۆن بەو تەیمانە بەرزەدا هەڵگەڕاوە. هێندێ کەس لە سەر ئەو باوەڕەبوون کە لەوانەیە کەسێک یارمەتیی دابێ: تاقمێکی دیکە ئاماژەیان بە شتێکی سەیرتر دەکرد. دەیانگوت ڕووداوێکی سروشتییە ـ یانی لیزاوتا هێندە بەو پەرژینەدا هەڵڕووچکابوو، بۆی بووبووە عادەت، بەڵام بەوحاڵەوە ڕەنگە پێداهەڵگەڕانەکەی دژوار بووبێ و کاتی کەوتنە خوارێ ئاسیوی بەخۆی گەیاندبێ.

گریگۆری بە پڕتاو هەڵات بۆلای مارتای ژنی و ناردی بۆ لای لیزاوتا، خۆشی بە هەڵاتن چوو بەدوای مامانێکدا کە ماڵەکەی لەو گەڕەکە بوو، بەپەلە هێنای لەگەڵ خۆی. منداڵەکەیان ڕزگار کرد، بەڵام لیزاوتا نەگەیشتە بەیانی مرد. گریگۆری منداڵەکەی هەڵگرت و بردییەوە بۆ ماڵی خۆیان. داوای لە ژنەکەی کرد دانیشێ و منداڵەکەی خستە باوەشییەوە، گوتی: «منداڵێکە لەلایەن خوداوە هەتیو هی هەموو کەسە و زیاتر لە خەڵکی هی ئێمەیە. کوڕە چکۆلەکەمان کە داخی بەجەرگماندا نا، ئەم منداڵە لە کوڕێکی شەیتان و ئافرەتێکی بەستەزمان و بێتاوان بووە، ئەوبۆی ناردووین. شیری پێبدە و ئیتر مەگری.»

هەربۆیە مارتا منداڵەکەی پەروەردە کرد و ناویان نا پاول. خەڵکیش ناوی فیۆدۆرۆویچیان (کوڕی فیۆدۆر) بەسەردا بڕی. فیۆدۆر پاولۆویچ دژایەتیی لەگەڵ ئەو ناوە نەکرد و پێی ناخۆش نەبوو و بە سەرگەرمیشی دەزانی، ئەگەرچی حاشای لێدەکرد و دەیویست خۆی لە بەرپرسایەتیی ببوێرێ و

پێداگریی لە سەر دەکرد. خەڵکی شارەکەش بەهۆی ئەوەی منداڵێکی بێکەسی بە کوڕی خۆی قەبووڵکردبوو، زوریان پێخۆشبوو. دواتر فیۆدۆر پاولۆویچ ناوێکی تازەی بۆ دۆزییەوە و بەناوی خوازراو لە ناوکەی دایکی، ناوی نا ئیسمیر دیاکۆف.

ئاوابوو کە ئەم ئیسمیر دیاکۆفە بوو بە دووهەمین خزمەتکاری فیۆدۆر پاولۆویچ و ئەو کاتەی کە چیرۆکەکەی ئێمە دەستیپێکرد، لەگەڵ گریگۆری و مارتا لە ژووری خزمەتکاراندا دەژیا. کاروباری چێشتخانەی بەڕێوە دەبرد. پێویستە زیاتر لەمەڕ ئەم ئیسمیر دیاکۆفەوە بدوێم، بەڵام نامەوێ سەرنجی خوێنەرانی خۆم بەو خزمەتکارانەوە خەریک بکەم، داوای لێبوردنیان لێدەکەم و دەگەڕێمەوە سەر چیرۆکەکەم و هیوادارم لە درێژەی چیرۆکەکەدا زیاتر باسی ئیسمیر دیاکۆف بکەم.

## (٣)

# دانپیانانی دڵێکی سووتاو ـ بە هۆنراوە

ئالیووشا دوای بیستنی ئەو فەرمانەی کە باوکی بە گورەگور لە نێو فایتوونەکەوە پێیدا، ماوەیەک حەپەسا. بەڵام لەگەڵ ئەوەی خەمیش دایگرتبوو. بێدەنگ دانەنیشت. لەوجۆرە خووخدانەی نەبوو. ڕاست ڕۆیی بۆ چێشتخانەکە تاکو بزانێ باوکی چ چەپکە گوڵێکی بە ئاودا داوە. ئەو کاتە وەڕێکەوت، بەو هیوایەی ڕێگاچارەیەک بدۆزێتەوە بۆ ئەو دڕدۆنگییەی کە ئازاری دەدا. چونکە گوڕە و هەراکەی باوکی کە فەرمانی پێدا خێرا «لێفەونوێن و کەلوپەلەکانی» کۆکاتەوە و بێتەوە بۆ ماڵێ، نەیتۆقاندبوو، زۆرچاک تێگەیشتبوو کە ئەو گوڕە و هەرا و فەرمان پێدانە شانۆیەکە بۆ ئەوەی قسەکانی خۆی بچەسپێنێ. هەر بەو شێوەیە یەکێ لە بازرگانانی شارەکەمان لەگەڵ تاقمێک لە دۆستانی ساڵڕۆژی ناونانی خۆی کردبوو بە جێژن، لەبەر ئەوەی ودکایان زۆر نەدایە قەڵس بوو، تەواوی پەرداخ و پیاڵەکانی پێکدادا و شکاندی، جل و بەرگی خۆی و ژنەکەشی شڕ و پەتۆر کرد و لە ئاکامدا شووشەی پەنجێرەکانیشی شکاند، هەمووشی لەبەر ئەوە بوو قسەی خۆی بچەسپێنێ. هەڵبەت ڕۆژی دوایی، یان ڕەنگە هەر ئەم ئێوارەیە پەشیمان ببێتەوە و ئیزنی بدا بچێتەوە بۆ کلێسە. لەگەڵ ئەوەشدا سوڕ دەیزانی باوکی ئازار بە عالەم بگەیەنێ، بە ئەمی ناگەیەنێ. ئالیووشا لێی ڕوون بوو کە هێچ کەس لە دنیادا نابێتە هۆی ئازاری و لەگەڵ ئەوەدا دەشیزانی هیچ کەس ناتوانێ ئازاری پێبگەیێنێ. بۆیە لەوحاڵەشدا شک و گومانی نەبوو و بە پشتبەستن بەو باوەڕە، بە ئەرخەیانی ڕێی خۆی گرتەبەر و پاشگەز نەبۆوە.

بەڵام هەر لەو کاتەدا دڵەوڕێزەیەکی جیاواز تووشی پەرۆشی و شێوانی کرد و چونکە نەیدەتوانی خۆی قانع بکا، زیاتر بووە هۆی خەم و دڵەخورپەی. ئەو ترسەشی لە ژنێک بوو، کاترینا ئیوانا، کە ئاوا پێداگرانە، لەو یادداشتەدا کە مادام خۆخلاکۆف پێی دابوو، داوای لێکردبوو سەبارەت بە مەبەستێکی تایبەت بچێ بۆلای و چاوی پێیبکەوێ. ئەو داخوازییە و پێویست بوونی چوونەکەی، بەجارێ دڵی ئالیووشای خستبووە قرتوفرت، ئەو هەستەش پێشنیوەڕۆی ئەو ڕۆژە، بەهۆی ئەو کێشە و ڕووداوانەوە کە لە حوجرەی حەزرەتی پیر و وەتاغی باوکە عابید قەومابوو، بەجارێ ئاراوقارای لێهەڵگرتبوو، لەناخەوە هەڵیدەچۆقاند. لەبەر ئەوە ئۆقرەی لێنەبڕابوو کە نەیدەزانی مەبەستی کاترینا چییە و دەیهەوێ بڵێچی و دەبێ چ وەڵامێکی بداتەوە. لەبەر ژن بوونەکەشی لێی نەدەترسا. ئەگەرچی سەبارەت بە ژنان زۆری زانیاری نەبوو، تەمەنی هەر لە منداڵییەوە تا کاتی چوونە کڵێسە بە گشتی لەگەڵ ژنان ڕابواردبوو. لەو ژنە، لە کاترینا ئیوانا دەترسا. لە یەکەم جارەوە کە دیتبووی لێی ترسابوو. تەنیا دوو سێجار دیتبووی و ئەوەندەی قسە لەگەڵ نەکردبوو و ئەوی بە کچێکی شۆخ و شەنگ و لەخۆبایی و بەبیانوو دەزانی. جوانییەکەی نەبوو کە تووشی دڵەخورپە و شێواویی کردبوو، شتێکی دیکە بوو. هەر ئەوەی نەیدەزانی هۆی ترسەکەی چییە، ئەوەندەی دیکە ترسی خستبووە دڵییەوە. کچە نیەتی خراپی نەبوو، ئالیووشا ئەوەشی دەزانی. ئەو دەیویست دیمیتری ڕزگار بکا، چونکە دەرهەق بە ئەو زۆر دەست و دڵباز و بەبەزەیی بوو. ئەگەرچی دیمیتری خواری لەگەڵ جووڵا بۆوە. لەگەڵ ئەوەشدا، ئالیووشا ئاگای لە هەموو ئەو هەستە بەرز و دڵفراوانییەی کاترینا بوو و بە چاوی ڕێزەوە تەماشای دەکرد، بەڵام کاتێ گەیشتنە نزیک ماڵەکەیان تەزوویەک بە لەشیدا هات و چۆکی وە لەرزین کەوت.

بیری کردەوە ئیوان فیۆدۆرویچ کە یەکێ لە دۆستە زۆر نزیکەکانی ئەوبوو، لەوێ نایبینێ، چونکە ئیوان ئێستا سوڕ دەیزانی لەلای باوکییەتی.

لێشی ڕوون بوو کە دیمیتریش لەوێ نابینێ. سەبارەت بەوەش دڵی خەبەری پێدابوو. بۆیەش ئاخافتنەکەی تەنیا لەگەڵ ئەوبوو. ئاواتیشی ئەوە بوو بەر لە وتوویژەکەی بە باڵی چارەنووس بەرەولای براکەی بفڕێ و بێئەوەی نامەکەی نیشانبدا، سەبارەت بە کاترینا قسەی لەگەڵدا بکا. بەڵام شوێنی ژیانی دیمیتری زۆر دوور بوو، دڵنیا بوو لە ماڵێش نییە. ماوەیەک لەجێی خۆی چەقی و پاشان بڕیاریدا، زۆر خێرا و بەپێی عادەت خاچی خۆی کێشا و بە پێکەنینەوە، گەڕایەوە و بە ئەرخەیانی بەرەو ماڵی ئەو خاتوونە بەسامە وەڕێکەوت.

ماڵەکەیانی دەزانی. ئەگەر لە شەقامی سەرەکییەوە و پاشان لەولای بازاڕەوە بڕۆیشتبایە، ڕێگاکەی دوور دەکەوتەوە. ئەگەرچی شارەکەی ئێمە چکۆلەیە و ماڵەکان دوور لە یەکتر دروستکراون. هەرلەو کاتەشدا باوکی چاوەڕوانی بوو، لەوانەیە فەرمانەکەشی لەبیر نەچووبێتەوە. لەوانەبوو لە ڕێگای ئەقڵ کلابێ بۆیە دەبوو خێرا بچێ و بە هەڵەداوان بگەڕێتەوە. هەربۆیە بڕیاریدا لە ڕێگای پشتەوە نێوبڕ لێدا، چونکە بست بە بستی ئەو شوێنەی دەناسی. بۆ ئەوەش دەبوو بە شیشبەند و پەرژینەکاندا هەڵگەڕێ و لە حەوشەی پشتەوە تێپەڕێ، ئەو جێگایەی کە هەموو شارەزای بوون و سڵاو و چاکوخۆشییان لەگەڵ دەکرد. لەو ڕێگەیەوە دەیتوانی لەماوەیەکی زۆر کەمدا بگاتە شەقامی سەرەکی.

چارەی نەبوو جگە لەوەی لە باخێکەوە تێپەڕێ کە جیرانی باخەکەی باوکیەتی و هی ماڵێکی چکۆڵە و داڕووخاوە بە چوار پەنجێرەوە. خاوەنی ئەو ماڵەش هەروەک ئالیووشا ئاگادار بوو، پیرێژنێکی کەلەلا بوو لەگەڵ کچەکەی دەژیا. کچەکەش پێشتر لە پترزبۆرگ لە ماڵی ژێنڕاڵەکاندا پەرستاری دەکرد. ماوەی ساڵێک دەبوو هاتبۆوە بۆ ماڵێ و ئاگاداریی لە دایکە گردەنشینەکەی دەکرد. دایمە جلوبەرگی ڕازاوەی لەبەردا بوو. ئەگەرچی خۆی و دایکی لە گێژاوی ئەو هەژاری و لێقەوماوییە کەوتبوون و هەموو ڕۆژێ ناچار بوون بۆپاروویەک نان و تۆزێ شلە پەنا بۆ چێشتخانەکەی فیۆدۆر پاولۆویچ بەرن.

مارتاش بێئەوەی دەست بە ڕوویانەوە نێ خێرا پێیدەدان، لەگەڵ ئەوەشدا هەرکاتێ ئەو خاتوونە جحێڵە دەچوو بۆ نان و شلە هیچکام لە جلەکانی نەفرۆشتبوو. یەکێ لەو جلانەی هاودامێنێکی درێژ بوو. ڕاستییەکەشی ئەوە بوو کە ئالیووشا بە ڕێکەوت لە ڕاکیتینی بیستبوو، کە بەردەوام ئاگای لە هەموو کاروبارێکی شارەکەبوو. بەبیستنی ئەوە لەبیری چووبۆوە، بەڵام ئێستا کە گەیشتە نێو باخەکە ئەو کراسە ئاودامێنە چیندارەی وەبیر هاتبۆوە. هەروا سەری داخستبوو و دەڕۆیشت، لە ناکاو سەری هەڵێنا و چاوی بە دیمیتریی برایکەوت، کە بە سەر پەرژینەکەدا ملی دەکێشا و شتێکی نابووە ژێر لاقی و بۆ پێشەوە نووشتابۆوە. بە دەست و بە سەر ئاماژەی دەکرد، بانگیدەکرد و بە ڕواڵەت دیاربوو لە ترسی ئەوەی مەبادا دەنگی ببیستن، ورتەی لێوە نەدەهات. ئالیووشا بە هەڵپە ڕۆیی بۆلای پەرژینەکە. دیمیتری فیۆدۆرۆویچ بە سرتەیەکی شاد و بە تاڵووکە گوتی: «باش بوو سەرت هەڵێنا. ئەوەندەی نەمابوو هاوار بکەم. زووکە خێرا لێرەوە سەرکەوە! چەندە کارێکی بەجێت کرد هاتی! هەر ئێستا لەبیری تۆدا بووم!»

ئالیووشاش دڵی شادبوو، بەڵام نەیدەزانی چۆن بە سەر پەرژینەکەدا سەرکەوێ و بچێتە ئەودیو، بەڵام میتیا بە دەستە بەهێزەکەی بن پیلی گرت و یارمەتییدا باز بداتە ئەودیو. ئالیووشا شاقەلی عەباکەی هەڵکرد و چالاکانە و گورج و پێخاوس بە سەر پەرژینەکەدا بازیدا ئەودیو.

میتیا لەبەرخۆیەوە بەڕوو خۆشی منجاندی: «ئافەرین ئێستا وەڕێکەوە با بڕۆین.»

ئالیووشا بە نەرمی گوتی: «بۆ کوێ؟» پاشان چاوێکی لە دەورووپشتی خۆی کرد. خۆی لە نێو باخێکی چۆڵ و بەرەڵڵادا دییەوە، کە لە خۆیان زیاتر کەسی تێدا نەبوو. باخێکی چکۆڵە بوو،ماڵەکەش نزیکەی پەنجا شەقاوێک دوور لە باخەکە هەڵکەوتبوو.

- ئێرە خۆ کەسی لێنییە، بۆ بە سرتە قسە دەکەی؟

دیمیتری به هێز و قەوەتی خۆی گوڕاندی: «بۆچی به سرته قسه دەکەم؟ بەزیاد نەبێ چ سەردەمێکە! دیوته سروشت چ فێڵ و تەڵەکەیەکی لە ژێر سەردایە. به دزییەوە لێرەم و ئاگاداری له نهێنییەک دەکەم. پاشان بۆت باس دەکەم. بەڵام بە تێگەیشتن لەوەی کە ڕاز و نهێنییە، وەک مرۆڤێکی گەمژە دەستمکرد بە سرتە و ویرەویر، ئەویش لە کاتێکدا کە پێویست نەبوو. واچاکە بڕۆین بۆ ئەوێ. تا ئەو کاتە بێدەنگ بە. دەمەوێ ماچت بکەم.

سپاس لە بۆ خودای جیهان.

خولقێنەری بوون و ژیان[3]...

هەر ئێستا، بەرلەوەی تۆ بێی، لێرە دانیشتبووم و ئەوەم دووپات دەکردەوە.»

باخەکە نزیکەی سێ هێکتار دەبوو، لەچواردەورەکەی و پەنا نەردە و پەرژینەکان داریان چەقاندبوو. داری سێو و پەڵک و لیمۆ و غان. نێوەڕاستی باخەکە سەوزەڵانی و ڕاستە مێرگ بوو، هاوینان هەزاران باخە گیایان لێ دەدوورییەوە و دەیان بردەوە. هەموو هاوینێک باخەکەیان بە چەند ڕۆبڵ بە ئیجار دەدا. بە چوار دەوری شیشبەندەکاندا بنچکی تووترک و شیلان و ترێ سەریان لێک دابوو. لەم دواییانەدا باخچەیەکیان لە نزیک خانووبەرەکەش چەقاندبوو.

دیمیتری فیۆدۆرۆویچ براکەی بردە سووچێکی چۆڵ و هۆڵی باخەکە و لەوێ پۆلێک داری چڕوپڕی لیمۆ و بنجەڕەزی ویشک بوو و پۆلێک گوڵە شیلان و لەیلانک و یاسی لێبوو. ماڵێکی دارینەیان لێ دروستکردبوو، کە لەبەر کۆنی دار و دیوارەکانی ڕەش داگەڕابوو. دیواری ماڵەکە هەمووی درز و کەلێن بوو، بەڵام هێشتا بۆ کاتی باران و گەرما دەکرا کەڵکی لێوەرگری. خودا دەزانێ ئەو خانووبەرەیە لە کەنگێوە دروستکرابوو. دەیانگوت پەنجا ساڵ لەمەوبەر سەرهەنگێکی خانەنشین کراو بە ناوی «ئەلکساندر کارلۆدۆویچ فۆن ئیشمیت» ساز کراوە، کە ئەو کاتە خاوەنی باخەکە بووە.

---

3- لەوە دەچێ دیمیتری هۆنراوەی خۆی بێ.

میچ و تەختی بنەکەی خەریک بوو دەپووا و تەختەکانی لەق بووبوو، دار و دیواری بۆنی شێی لێدەهات و بەرەو خاپووربوون دەچوو. لە نێو ماڵەکەدا کورسیەکی سەوز داندرابوو کە هێشتا بۆ ئەوە دەبوو لەسەری دانیشی. ئالیووشا خێرا تێگەیشتبوو کە براکەی سەرخۆشە. چونکە کاتێ چوونە نێو ماڵەکەوە بتربیەک براندی و پەرداخێکی شەڕابخۆری لە سەر مێزەکە بوو.

میتیا پێکەنی و گوتی: «ئەوە براندییە. بە ڕوانینتدا دیارە لە دڵی خۆتدا دەڵێی: «دیسان بادەنۆشیی کردووە.»

باوەڕ مەکە بە شەیتان و شۆڤاران.

هەرگیز بڕوا بە تاقمی چڵدرۆ و گەلحۆیان مەکە،

وەلانێ دڕدۆنگی و گومان![4]

بادە نانۆشم، هەر ئەو جۆرەی کە هاوڕێکەت، ڕاکیتینی نارەسەن دەڵێ «زێدەڕەوی» دەکەم. ئاخری ڕۆژێک ئەو هەتیوە دەبێتە ڕاوێژکاری دەوڵەت، چونکە هێندە سوێر قسەیە و چەنە درێژی دەکا. دانیشە. دەمهەوێ بتگرمە باوەش و ئەوەندەت ڕێک بگوشم هەتا جیقت دەردێنم. چونکە لە تەواوی دنیادا ـ لەڕاستیدا ـ لەڕا ـس ـتی ـدا ـ (بڕوادەکەی؟) جگە لە تۆ هیچ کەسی دیکەم خۆش ناوێ!»

ئەم وشانەی دواییی بەگەشە و نەشەوە دەربڕی.

ـ یانی جگە لە تۆ و «گراو»ێک کە ئەشقی ئەو بۆتە هۆی فەوتانم. بەڵام ئاشق بوون بە مانای خۆشویستن نییە. لەوانەیە ئاشقی ژنێک بی و هەر لەو کاتەشدا ڕقت لێی بێ. ئەوەت لەبیر نەچێ! دەتوانم هەروا بە سەرخۆشی باسی بکەم. لەو پەنا مێزە دانیشە، منیش لە پاڵت دادەنیشم و چاوت لێدەکەم و درێژە بە قسەکانم دەدەم چونکە ئێستا کاتی هاتووە. بەڵام کاتێ بیری لێدەکەمەوە، واچاکە بەهێواشی قسە بکەم، چونکە لێرە ـ لێرە ـ ناکرێ بڵێین چ گوێچکە گەلێک گوێمان لێدەگرن. باسی هەموو شتێکت بۆ دەکەم، وەک دەڵێن:

---

4- بەشێکە لە شێعری (ئەو کاتەی شەوی گەندەڵی) کە شێعری ‹نکراسۆف›ە و سەبارەت بە سەڵیتەیەکی عەفوو کراوە.

«چیرۆک دریژەی هەیە.» بۆیە تامەزرۆت بووم؟ بۆیە ئەو چەن ڕۆژە و هەر ئێستاش، تامەزرۆی دیدارت بووم؟ لەو کاتەوە کە لێرە دامکوتاوە، پێنج ڕۆژ تێدەپەڕێ.)چونکە هەر تۆی دەتوانم سفرەی دڵمت بۆ بکەمەوە. چونکە پێویستم بە تۆیە، چونکە سبەینێ لە هەور و هەڵا دەرباز دەبم، چونکە سبەینێ ژیان بە ئاکام دەگا و دەستیش پێدەکا. جاری وا بووە خەونببینی و لە هەڵدێریکەوە بکەوییە نێو کەندڕێکەوە؟ ڕاست بەو شێوەیە خەریکە دەکەوم بە عەرزدا، بەڵام نەک لە خەوندا. ترسیشم ڕێنەنیشتووە، تۆش مەترسە. لانیکەم تۆقیوم بەڵام چێژی لێ وەردەگرم. چێژیش نا، شاگەشکەبوون. بەزیاد نەبێ. ئەوی هەیە! ڕۆحی بەهێز، ڕۆحی لاواز ـ ڕۆحی ژنانە ـ هەرچی هەیە! وەرە با ڕێز لە سروشت بگرین: ئەو خۆرەتاوەت دیتووە، ئەو ئاسمانە ساماڵە، گەڵاکان هەموو سەوز و گەش، هێشتا هاوینە، کاتژمێر سێی دوانیوەڕۆیە و کاتی پشوو دان و حەسانەوەیە. دەتویست بچی بۆکوێ؟

ـ دەچووم بۆ ماڵی باوکم! بەڵام دەمویست لە پێشدا سەرێک لە ماڵی کاترینا ئیوانا هەڵێنم.

ـ ماڵی ئەو و ماڵی باوکم! پەکوو، چ ڕێکەوتێک! بۆ چاوەڕوانت بووم؟ بۆ ئەوەی لە لایەن خۆمەوە بتنێرم بۆ لای باوکیشم و کاترینا ئیواناش، چونکە تۆ تەنیا دەرووی ڕووناکیمی و لە ناخی دڵ و گیانەوە تینووی دیدارت بووم. دەمهەوێ بتنێرم بۆ ئەوەی کارەکەم لەگەڵ ئەو و باوکم یەکلایی بکەمەوە، پێمخۆش بوو فریشتەیەک بنێرم. دەکرا هەموو کەس بنێرم، بەڵام دەبوو فریشتەیەکی پاک بێ، ئێستاش ئەوا تۆ خۆت دەچی بۆ دەیدەنیی باوکم.

ئالیووشا بە شڵەژاوی گوتی: «یانی هەر بەڕاستی دەتویست من بنێری؟»

ـ سەبرکە! خۆت ئەوەت دەزانی! ئێستاش دەبینم خۆت لەوە گەیشتووی. بەڵام بێدەنگ بە، تاوێک بێدەنگ بە. خۆت نارەحەت مەکە و مەشگوڕێنە.

دیمیتری فیۆدۆرۆویچ هەستا سەرپێ، تۆزێک بیری کردەوە و قامکی بە نێوچاوانییەوە نا.

ـ خۆی داوای لێکردووی، نامە و شتی بۆ ناردووی، وا دەچیٚ بۆلای؟ خۆ بۆ شتێکی دیکە نەدەچووی؟

«یادداشتەکەی ئەو ئەوەتا.» ئالیووشا دەریهێنا لە گیرفانی ـ میتیا بە ڕوانینێکی خێرا خوێندییەوە.

ـ کاتیٚ بەڕێگای پشتەوەدا دەڕۆیشتی! ئاخ خودایە گیان زۆرت سپاس دەکەم کە ئەوت بە ڕێگای پشتەوەدا نارد بۆلام! ئەوە وەک ئەو ماسییە زێڕینە وایە کە لە ئەوسانەی پەریاندا دەچیٚ بۆلای ماسیگرێکی پیری گەمژە.[5]

گویٚ بگرە ئالیووشا، گویٚ بگرە براکەم! ئێستا دەمهەویٚ هەموو شتێکت پیٚبڵێم، چونکە دەبیٚ بە کەسێکی بڵێم. گوتوومە فریشتەی ئاسمان. بەڵام دەمهەویٚ بڵێم فریشتەی سەرزەوی. تۆ فریشتەی سەرزەوینی. گوێت لێمە، دەسەڵاتت هەیە و دەتوانی بەخشندەش بی. گویٚ بگرە! ئەگەر دوو کەس لە سەر زەوی لێکدابڕێن و بە نەناسراوی باڵ بگرن. یان یەکیان لانیکەم بەر لە باڵ گرتن یان لە نێو چوون، بچیٚ بۆلای کەسێکی دیکە و بڵیٚ: «ئەو کارەم بۆ بکە.» ـ داخوازییەک کەتا ئێستا بۆ جێبەجیٚ کردنی چاوەڕوانیی لە هیچ کەس نەبووە و تەنیا لە سەرەمەرگدا دەتوانیٚ چاوەڕوانیی هەبیٚ ـ بڵێی ئەو کەسە، ئەگەر هەڤاڵ یان برابیٚ، خۆی لیٚببوێریٚ؟

ئالیووشا گوتی: «بەسەرچاو، من خۆمی لێنابوێرم، زووکە پێمبڵیٚ، بزانم چییە؟»

ـ دەتهەویٚ زوو پێت بڵێم! ئەها!... ئالیووشا پەلە مەکە، پەلەپەل بکەی دڵی خۆت نارەحەت دەکەی. ئێستا پێویست ناکا بە تاڵووکە بی. ئێستا دنیا لە سەر گرێژەنەیەکی دیکە دەخولێتەوە. ئاخ ئالیووشا، حەیفیٚ تۆ لە ئەشق و شاگەشکە بوون ناگەی. منیش شتی وا دەڵێم! قەت ئەوە قسەیە؟ مەگین

---

5- لە شیعری «پوشکین»دا (ئەوسانەی ماسی و ماسیگر) ماسییەکە بەڵێن بە ماسیگرەکە دەدا ئەگەر ئازادی بکا، هەر ئاواتێکی ببیٚ بۆی دێنێتە دی. بەڵام ژنی ماسیگرەکە وەک دوایین ئاوات، گەوجانە داوا دەکا ببێتە دەسەڵاتداری زەریاکان ـ ماسییەکەش دەبێتە خزمەتکاری بەڵام تەواوی ئەو ماڵ و داراییەی ماسیگرەکە وەدەستی هێنابوو، بزر دەبیٚ.

دەکرێ تێی‌نەگەی. عەجەب کەرێکم، ئەوە دەڵێم چی؟ «ئەی مرۆڤ نەجیم و ڕەسەن بە!» ئەوە شیعری کێیە؟

ئالیووشا ویستی چاوەڕوان بمێنێتەوە. هەستیکرد، ڕەنگە لە ڕاستیدا کارەکەی هەر ئەوە بێ و لەم شوێنە بێ. میتیا هەنیشکی‌دا سەر مێزەکە و سەری نا سەر لەپی دەستی و چەند ساتێک کەوتە بیرکردنەوە. هەردووکیان بێدەنگ بوون.

میتیا گوتی: «ئالیووشا، هەرکەسێکی دیکە لەجێی تۆبێ پێم پێدەکەنێ. پێمخۆشە دەستبکەم بە ـ دان پیانان ـ بە «پاڕانەوەیەکی شادانەی»شیلێر. ئاڵمانیایی نازانم، هەر ئەوەندە دەزانم بە ئاڵمانیایی دەبێتە An die Freude. پێت وانەبێ چونکە مەستم، ئاگام لەخۆم نییە و قسە دەپەڕێنم. هەر مەستیش نیم. براندی شتی چاکە، بەڵام بۆ مەستبوون دوو بوتڵی ئاوام دەوێ:

*سیلەنووس[6] بە گۆنای سوورەوە*

*بە سواری کەرێکی کە وا هەڵدەستێ و دەکەوێتەوە.*

بەڵام چونکە پەرداخێکیشم لێ‌نەخواردۆتەوە و سیلەنووسیش نیم. سیلە نووس نیم، بەڵام سیلەن[7] هەم. چونکە بڕیاری هەوەڵ و ئاخرم داوە. بۆ ئەو (جیناس).ە بمبوورە. ئەمڕۆ دەبێ زۆر لە جیناس زیاترم لێ‌ببووری. خۆت شلوێ مەکە. زۆر درێژدادڕی ناکەم. خەریکم ماقووڵانە دەدوێم و هەر ئێستا دەچمە سەر باسەکە. ئەوەندەت چاوەڕوان ڕا ناگرم. ڕاوەستە بزانم چۆن دەستپێبکەم باشە!

سەری هەڵێنا، تۆزێ بیریکردەوە و بەگەشە و نەشەوە دەستیپێکرد:

*سڵۆک و ترساو لە نێو ئەشکەوتا*

*خۆی شاردبۆوە بە ڕووت و قووتی*

*چۆڵگەڕی تەنیاش وێڵ و ئاراگێڵ*

*بەجێی هێشتووە دەشتی پڕ داهات*

---

6- سیلەنووس: Silenus لە ئەساتیری یۆنان، هاوڕێی باکووس (دیۆنیزووس)، خودای شەڕاب.

7- سیلەن: Silen وشەیەکی ڕووسییە، یانی بەهێز.

*بە تیر و ڕمبی ترسێنەرەوە*
*ڕاوچی دەگەڕێ بە دارستانا*
*قوڕ بە سەری ئەو چارەڕەشانەی*
*کەوا پەڕیوەی ڕۆخی دڵڕەشی ڕق و بێدادین!*
*لەسەر ترۆپکی بەرزی چیاوە*
*دایکێک دێتەخوار «سی‌یرسی[8]» ناوە*
*لەو چۆڵگەیەدا دەگەڕێ لە دووی*
*پراسپرینی کچی بزربووی*
*بەڵام داڵدەیەک نابینێتەوە*
*هەرچەند بە تەنیا دەسووڕێتەوە*
*هیچ کەسیش نەبوو بێ بەرەوپیری*
*پەرستگایەکیش نییە بنوێنێ*
*ئاسەوارێکی خوداپەرستی*
*لە دەشت و مەزرا و ڕەزو باخەوە*
*میوەیەک نەهات جێژنمانی پێ برازێتەوە،*
*گوشتی قوربانیی خوێناوی نەبێ*
*لەسەر ئاورگان دەبوونە چزیلک،*
*لەهەر کوێیەکیش خودای پەژارە*
*چاوی خەمبار و کزی دەگێڕا،*
*لە نێو بوودری سووکایەتیدا*
*مرۆڤی دەدی، مرۆڤ سی‌یرسی.*
میتیا دای لە پڕمەی گریان و دەستی ئالیووشای گرت.
ـ براگیان! خۆشەویستەکەم! شەرمەزاری، سووک و چرووکی، هەتا ئەمڕۆ شەرمەزاری! مرۆڤ لەم دنیایەدا کوێرەوەری و چارەڕەشیی زۆر دەبینێ.

---

8- سی‌یرسی ناوی ڕۆمیی دیمیتر، خودای کشت و کاڵە. دیمیتریش یانی «پێوەندیدار بە دیمیترەوە.»

تووشی چەرمەسەری و ئازاری تاقەتپڕووکێن دەبێ و ناچارە تاملّی بکات. پێتوانەبێ من پێشخزمەتێکی ساویلکە و گەلحۆم و بە هۆی ڕوتبەی ئەفسەرییەوە خۆم لێگۆڕاوە و بادیهەوا بووم، وەکا دەخۆمەوە و خەریکی عەیش و نۆشم، بەڵکو تەنیا بیر لە شتێک دەکەمەوە. بیر لە پیاوێکی شەرمەزار دەکەمەوە. ئەگەر درۆم نەکردبێ. شوکور بۆ خودا کە ئێستا درۆ ناکەم و خۆم نانوێنم. بیر لەو مرۆڤە دەکەمەوە، چونکە ئەو مرۆڤە خۆمم.

*بۆ ئەوەی گیانی لە چڵکی کۆنی ژیان پاک کاتەوە*

*بە تیشک و هێژایی بگا*

*دەبێ پەژیوان بێتەوە و*

*باوەش بکا بە دایکیدا ـ*

*خاکی پاک و لەمێژینەی*

بەڵام عەیبەکەی لێردایە، دەبێ چۆن هەتا هەتایە خۆم بە دایکی زەوییەوە پێوەند بدەم. ماچیناکەم، پێسیری ئاوەڵا ناکەم و مەمکی هەڵنادڕم. دەبێ ببمە لادێیی یان شوانێک؟ دەڕۆمە پێشی و نازانم بەرەو ڕووناکی و شادی دەچم یان بەرەو شەڕ و تاریکی. کۆسپ و گرفتەکە لێرەدایە، چونکە هەموو شتێکی ئەم جیهانە مەتەڵە! جارلەگەڵ جار پتر بە زەلکاوی سووکایەتی و شەرمەزاریدا ڕۆدەچم (کە زۆرجارم بەسەرهاتووە) هەمیشەش ئەو شیعرە سەبارەت بە سیرسی و مرۆڤ دەخوێنمەوە. ئایا بەرەو ڕێگای ڕاستی کێشاوم؟ قەت قەت! چونکە کارامازۆفم. چونکە هەرکاتێ دەکەومە نێو کەندڕێکەوە، بەسەرەوە تێدەکەوم و شادم لەوەی ئاوا بە شێوەیەکی سووک و چرووکانە سەرەوشۆڕ دەبم و بە جوانیشم دێتە بەرچاو. لە ناخی ئەو سەرشۆڕی و چارەڕەشییەشدا سروودی پاڕانەوە و مەتح دەچڕم. لێمگەڕێ با بە تاوانبارم بزانن. لێمگەڕێ با سووک و چرووک و خوێڕی بم، بەڵام لێمگەڕێ با پەراوێزی ئەو چارشێوە ماچبکەم کە خوداکەمی پێ کفن کراوە. خودایە! هەرچەند کە من ڕێبواری ڕێبازی شەیتانم، کوڕی تۆم و خۆشم دەوێی. هەست بەو شادییەش دەکەم کە بەبێ ئەو دنیا ناتوانێ بەردەوام بێ.

*شادیی هەتا هەتایی*
*تینوتاو بە گیاندارانی ئەم جیهانە دەبەخشێ*
*بە کڵپەی پڕ لە ڕازی خۆی*
*لێوەڕێژ دەکا پەرداخی ژیان لە تیشک*
*چەکەرە بە گیا و گژ دەدا و*
*نێزەی دەستیان بەرەو چاوی خۆر دەڕاسێ و*
*تەنانەت تیشک بەو جێیە دەگەیێنێ کە ئەستێرەناسەکانیش*
*مەحاڵە دەستیان بیگاتێ.*
*دۆزەخ و تاریکستانیش*
*لەگەڵ پانتای بێسنووری ئاسمانەکان*
*هەمووی تیشکباران دەکا*
*لە سینگی پڕ بەرەکەتی سروشتەوە*
*هەموو ئەو بوونەوەرانەی کە هەناسە هەڵدەکێشن*
*حەز و شادی دەخۆنەوە،*
*تەواوی خوڵقاوەکان و تەواوی نەتەوەکانی*
*لەنێو بە ئاگاییدا بۆلای خۆی ڕادەکێشێ.*
*دیاریی ئەویش بۆ مرۆڤ، دۆست و یارانی فریاڕەسە،*
*تاجە گوڵینەیە و شەڕاب*
*بۆ فریشتە نوورانییەکان*
*بۆ دەعبا و گیانلەبەرانیش*
*چێژ و هەوەسیان بۆ دێنێ.*

شیعر بەسە! گریانم دێ، لێمگەڕێ با تێر بگریم. ڕەنگە گەوجییەتی بێت و خەڵک وە پێکەنین بخا. بەڵام تۆ پێناکەنی. چاویشت بریقەیان دێ. شیعر بەسە. ئێستا دەمەوێ باسی ئەو دەعبایانەت بۆ بکەم کە خودا «هەوەسی» پێداون.

*بۆ گیانلەبەر و دەعبایان*

براکەم، من ئەو دەعبایەم، ئەو هەوەسەش بە تایبەت شیاوی من بوو. ئێمە کارامازۆفەکان هەموومان دەعبایەکی واین، تۆ ئەگەر فریشتەش بی، ئەو دەعبایەت هەر لە ناخ دایە و لە نێو خوێنەکەتدا تۆفان وەڕێ دەخا. تۆفانەکان، وەک هەوەسی تۆفان وان. ـ لە تۆفانیش خراپتر! جوانییەکی بەسام! بۆیە سامناکە چونکە بێ بنە و قەتیش ناکرێ بگەیە بنەکەی. چونکە خودا شتێکی وەک مەتەڵمان دەخاتە بەردەم. لێرە سنوورەکان بەیەک دەگەن و هەموو دژ و دژوازەکانیش پێکەوە پاڵ ڕێکدەدەن. براگیان! من مرۆڤێکی خاوەن ژیار نیم. بەڵام لەو بارەوە زۆرم بیر کردۆتەوە. هێندەی ڕاز و نهێنی تێدایە پیاو سەری سوڕ دەمێنێ! مرۆڤ هێندەی نەزیلە و مەتەڵ لە سەر شانە چەماوەتەوە. ئەوانە دەبێ ئەو جۆرەی پێمان خۆشە بیکەینەوە و هەوڵبدەین لە نێو ئاوەکەدا تەڕ نەبین. جوانی! ئەو بیرۆکەیەم بۆ تامڵ ناکرێ. مرۆڤێک کە زەین و دڵێکی والای هەبێ و بە ئامانجی (مادۆنا[9]) دەست پێبکا و لە ئاکامدا بە ئامانجی (سۆدۆم[10]) بگا. لەوەش تازەتر ئەوەیە، مروڤێکی ئامانجی سۆدۆم لە دڵیدا بێ و چاوپۆشی لە ئامانجی مادۆنا بکات، بەڵکو دڵی بەو ئامانجە بسووتێ، خێرا و خالیسانەش بسووتێ، ڕاست وەک سەردەمی لاوی و بێ تاوانیی.

بەڵێ، هەموو ئاوێنەیەک مرۆڤێکی بەربڵاوە، زۆر بەرین. من هەتا بتوانم توندتری لە ئامێز دەگرم. تەنیا شەیتانیش لەوە دەگا! ئەوەی بۆ ئاوەز شوورەییە، بۆ دڵ جوانە و نەک شتێکی دیکە. ئایا لە سۆدۆمدا جوانی هەیە؟ بڕوا بکە بۆ تاقمێکی زۆر لە خەڵک جوانی لە سۆدۆمدا هەیە و دەست دەکەوێ. تۆ ئاگاداری ئەو بووی؟ ئەو جوانییەش زۆر پڕ نهێنی و ڕازە و سامناکیشە. خودا و شەیتان لەوێ بەشەڕ دێن و شەڕگەکەشیان دڵی مرۆڤە.

---

9- Madonna وشەیەکی ئیتالیاییە، یانی، «خاتوونەکەم» کە مەبەستی حەزرەتی مەریەمە.

10- Sodom شارێکی تووک لێکراوی فەلەستین کە خەڵکەکەی بۆ فسق و فجوڕ بەناوبانگ بوون.

بەڵام مرۆڤ هەمیشە باس لە ئازاری خۆی دەکا، گوێ بگرە، ئێستا با بچینە سەر ڕاستییەکان.

## (٤)

## دانی پیانانی دڵێکی سووتاو ـ بە چیرۆک

ئەو کاتە ژیانێکی دڕندانەم تێپەڕ دەکرد. باوکم هەر ئێستا گوتی کە چەن هەزار ڕۆبڵت بۆ فریودانی کچان خەرجکردووە. ئەوە ئیتر خۆی سازاندوویەتی، چونکە شتی وا هەر نەبووە. ئەگەر بووبێتیش، تەنیا پێویستیم بە پارە نەبووە، خۆ کچ هەر بە پارە هەڵنافریوێ. پارە بۆ من کەرەسەیەکە و بەس، سۆز و کوڵی دڵیشم چوارچێوەکەیەتی. ئەو کچەی سازی دەکەم، ئەمڕۆ خاتوونی منە و سبەینێ ژنێکی سەڵیتەی گەڕۆک دێتە جێگاکەی. هەردووکیانم سەرگەرم دەکرد. وەک گەڵا تاڵوو پارەم هەڵدەڕشت بۆ مۆسیقا و کەیف و نەهەنگ و قەرەجان. هێندێ جار دەمدا بە ژنانی ماقووڵیش، چونکە دەبێ ڕوون بێ لێت کە چنۆک و تەماکارانە وەریدەگرن و لەبەر ئەو پارەیە دڵخۆش و ڕازی دەبن . سپاسیشت لێ دەکەن. ژنان زۆریان هۆگری بە من هەیە: نەک هەموویان. بەڵکو هەڵدەکەوت، بە هەڵکەوت. بەڵام هەمیشە کۆڵانی چۆڵ و پێچەڵاوپووچم پێخۆش بووە. وەک ئەو کۆڵانانەی پشت ڕێگای سەرەکی کە هاتوچۆی کەمی بەسەرەوەیە. لەو شوێنانەشە پیاو بە ویستی دڵی دەگا و لە نێو قوڕ و زێلاقەی ئەو شوێنانەدا پیاو مرواریی بە نرخ دەدۆزێتەوە. براگیان، بە زمانی خوازە قسە دەکەم. ئەو شارەی منی لێبووم، کۆڵانی ئاوا تەنگ و چۆڵ و لاپەڕی نەبوو، ڕواڵەتەن بەرچاو نەبوون، بەڵام ئەگەر بتویستایە هەموو کۆڵانێک و گەڕەکێک ژوانگەی لێدەستدەکەوت. ئەگەر وەک من بوویتایە، دەتزانی ئەوە یانی چی. ئاشقی فیسق و فجووڕ بووم، هەرچی کاری ناڕەوایە لە من دەوەشایەوە. شوورەیی و ئابڕوو لای من

پارەیەکی چرووکی نەدەهێنا. وا کەوتبوومە زەلکاوی داوێن پیسی و خراپەکارییەوە هەتا بینەقاقام ڕۆچوو بووم. ئەی من دەعبا نیم، چیم؟ دەعبای لەوە مزێڕ و بەزەڕتر هەیە؟ لە ڕاستیدا کارامازۆفێکی هەژدە عەیارم! جارێک دەستەیەک بووین ڕۆیشتین بۆ گەڕان، حەوت فایتوونمان پێبوو. هەوا تاریک بوو، زستان بوو، من کچێکم لە پەناوە بوو، دەستمکرد بە گوشینی قامکە شووش و باریکەکانی و ناچارمکرد ماچمبکات. کچی کابرایەکی مووچەخۆر بوو. کچێکی شۆخ و شەنگ و دڵنەرم و ڕۆحسووک. خۆی بۆ شلکردم. لە تاریکیدا ئیجازەی زۆر شتی پێدام. بەستەزمانە پێیوابوو ڕۆژی دوایی دەچمە خوازبێنیی (وەک کەسێکی باشیش هاتبوومە بەرچاوی و هاوڕێکانیش پێیان وابوو دەزگیرانمە) بەڵام پێنج مانگی ڕەبەق قسەم لەگەڵ نەکرد. لە کۆڕی بەزم و سەمادا چاوم پێی دەکەوت (ئێمە هەمیشە کۆڕی بەزم و سەمامان هەبوو) لە سووچێکەوە چاوی تێدەبڕیم. چاویم دەدی کە بڵێسەی لێهەڵدەستێ. ئەو گڕە نەرمەی چاوی، ئەو دەعبای هەوەسەی لە ناخمدا دنە دەدا کە من سەر لە پێناوی بووم. چەن مانگ دواتر شوویکرد بە فەرمانبەرێک و لەو شارە ڕۆیشت. هەروا ڕقهەستاو و ڕەنگە هەروا دڵیشی لە داوی مندا بووبێ. ئێستا ژیانێکی خۆش و باشی هەیە. ئەوەش بزانە، لەلای هیچ کەسێ باسمنەکردووە و بە شاتوشووت خۆم پێوە ڕانەناوە. ئەگەرچی کەلاوڕێژم لە هەوەس و خوێڕییەتی و تەواوی داوێن پیسانم خۆش دەوێ، بەڵام بێ ئابڕوو نیم. بۆ ڕەنگت هەڵبزڕکاوە؟ چاوت پڕ بووە لە ئاو! باشە ئیتر واز لەو قسە پیس و گەندەڵانە دێنم. ئەوەی باسم کرد هەر هیچ نەبوو. ئەو دەعبا گڵاوە لە ناخمدا وا بەهێز بووبوو، ئاراوقارای لێهەڵگرتبووم. کوا دەمتوانی دەستی لێهەڵگرم. براگیان، دەفتەرێکی بیرەوەریم هەیە تەواوی ئەوانەم تێدا نووسیوە. خودا چاکیان بۆبکا ئەو خاتوونانە. هەمیشە هەوڵم دەدا بەبێ شەڕ و دەمەقاڵێ تێکیدەم، بەڵام کوا من دەسکم لە دوو دەکردن، نامەوێ خۆ بە هیچ کامیانەوە ڕانێم. با لە سەری نەڕۆم. نەوەکا پێتوابێ بۆ ئێرەم هێناوی ئەو قسە قۆڕ و سووکانەت بۆ بگێڕمەوە. نا، دەمهەوێ شتێکی

زۆر سەیرت بۆ باس بکەم؛ سەریشت سوڕ نەمێنێ بۆ ئەو قسەیە کە پێتی دەڵێم چونکە بەجێی ئەوەی شەرمەزار بم، خۆشحاڵم.

ئالیووشا لەپڕدا گوتی: «بۆیە ئەوە دەڵێی چونکە من ڕەنگم تێکچووە. پێتوایە لەبەر ئەوەی کردووتە و باسی دەکەی ڕەنگم هەڵبزڕکاوە؟ نا بۆیە ڕەنگم پەڕیوە لە داخی ئەوەیە منیش وەک تۆ وام.»

ـ تۆ؟ دەست هەڵگرە. ئەوانە لە تۆ ناوەشێنەوە!

ئالیووشا بە تووڕەیی گوتی: «نا، زۆریش بەدوور نییە.» (وادیارە ئەو بیرۆکەیە بیرۆکەیەکی تازە نەبوو) «پلیکان یەکێکە. من لە پلیکانی خوارووداڕم و تۆ لە پلیکانی سێزدەهەمدای. من وای دەبینم. جیاوازیشی نییە. هەر یەکن. ئەو کەسەی لە سەر پلیکانی یەکەمە ناچار دەبێ بەرەو پلیکانی سەروو بڕواو.»

ـ کەوایە پیاو نابێ بە هیچ شێوەیەک پێ لە سەر پلیکان دانێ.

ـ هەرکەس لە دەستی بێ، چاکتر وایە کاری وا نەکا.

ـ تۆ لە دەستت دێ؟

ـ باوەڕ ناکەم.

ـ ئالیووشا گیان، بێدەنگ بە بێدەنگ. خەریکی وا کار دەکەیتە سەرم، دەمەوێ دەستت ماچبکەم. ئەو گرووشنکا بڵحە دایمە چاوی بە دوای پیاوانەوەیە. جارێکیان پێی گوتم ئەگەر نەمرم ئالیووشا وەک بابۆڵە دەپێچمەوە. چاکە، چاکە، لەسەری نەڕۆم چاکترە! وەرە با لەم ڕێبازە گەندەڵ و مێش تێداوەوە، گەشتێک بە تراژیدیای مندا بکەین، کە ئەویش مێش تێیداوە، یانی بە هەموو جۆرە گەندەڵی و زیندوولەیەک ڕمووده بووە. ئەگەرچی پیرە پیاوی خەرەفاو سەبارەت بەوەی کە کچانم فریو داوە، درۆی دەکرد، لە ڕاستیدا شتێک لەو شێوەیە لە خەیاڵی منیشدا بوو، ئەگەرچی تەنیا جارێک بوو پاشان ئیتر بەلایدا نەچوومەوە. بەڵام ئەو دەیهەوێ بەشتێک سەرکۆنەم بکا کە ڕاشنەبردووە، ئەو تەنانەت لەو ڕووداوەش ئاگادار نییە. چونکە لەوبارەوە تا ئێستا لەگەڵ هیچ کەس نەدواوم. تۆ یەکەم کەسی، هەڵبەت جگە

لە ئیوان ـ ئیوان ئاگاداری هەموو شتێکە، زۆر لە پێش تۆ ئاگادار بووە. بەڵام خۆ ئیوان وەک کەرەکێوی وایە.

ـ ئیوان کەرەکێوییە؟

ـ بەڵێ، ئەی نییە!

ئالیووشا بە وردی گوێی گرتبوو.

ـ لە هەنگی پیادەنیزامدا ملازم بووم، بەڵام هەروا لە ژێر چاوەدێری و فێرکاریدا بووم، وەک کەسێکی تاوانبار. لەگەڵ ئەوەشدا لەو شارە زۆر بە گەرمی وەریان دەگرتم و ڕێزیان بۆ دادەنام. بە چەپ و بە ڕاست پارەم خەرج دەکرد. پێیان وابوو زۆر دەوڵەمەندم، خۆشم پێموابوو وایە. بەڵام لە ڕێگاگەلێکی دیکەوە دڵخۆشم دەکردن. ئەگەرچی لەبەر ئاکار و کردەوەم سەریان ڕادەوەشاند. بەڵام خۆشیان دەویستم. فەرماندەکەمان سەرهەنگێکی پیر بوو، لێم بەڕقدا کەوت و هەمیشە دەیگوڕاند بەسەرمدا. بەڵام من دۆست و ئاشنای کەڵەکەڵەم بوو، جگە لەوەش، تەواوی خەڵکی شار لایەنگری من بوون، بۆیە نەیدەتوانی ئازارێکی زۆرم پێبگەیەنێ. خەتای خۆشم بوو، بە شێوەیەکی شیاو ڕێزم بۆ دادەنا. لەخۆبایی بووم. ئەو کابرا خیشەسەرە کە لە ڕاستیدا مرۆڤێکی دڵۆڤان و بەڕەحم و میوانەوێن بوو، دوو ژنی هەبوو، هیچیان نەمابوون. ژنی یەکەمی، لە بنەماڵەیەکی هەژار بوو، کچێکی لەپاش بەجێما وەک خۆی بێئازار بوو. ئەو کاتەی لەوێ بووم گەورە کچێکی بیست و چوار ساڵانە بوو، لەگەڵ باوکی و میمکی دەژیا. ئەو خوشکەی دایکی ژنێکی ساویلکە و نەخوێندەوار بوو، کچەش خۆی هەروا سادە و ساویلکە بوو، بەڵام بە نەشە و گەشە بوو. پێمخۆشە باسی چاکەی ئەو خەڵکە بکەم. ژنێکم پێشک نەدەهات وەک ئاگاتا خاوەن کەسایەتی و دڵڕفێن بێ. بیهێنە بەرچاوی خۆت، ناوی ئاگاتا بوو! وەک ژنانی ڕووسی بەژن و باڵای نالەبار نەبوو: باڵا بەرز و چوار شانە و توند و تۆڵ و چاو جوان بوو. ئەگەرچی سەر و ڕووی تۆزێ لە تووڕە دەچوو. شووی نەکردبوو. دوو خوازبێنیشی بۆ هاتبوو. بەڵام جوابی کردبوون. بەڵام وەک هەمیشە بەکەیف و نەشە بوو.

پێکەوە زۆر گەرموگوڕ بووین، نەک بەو «شێوە»یە، دۆستایەتییەکەمان پاک و بێکرێژ بوو. زۆربەی دۆستایەتییەکەشم لەگەڵ ژنان وابووە. زۆربەی ژنان ئەو جۆرە ئازادییەیان پێخۆشە و کچ بوونی ئەویش ئەوەندەی دیکە بوارەکەی خۆش کردبوو. ئیتر وام لێهاتبوو قەت وەک کچێک چاوم لێنەدەکرد. ئەو و میمکی زۆر خاکەڕایانە و بە دڵخوازی خۆیان، لە ماڵی باوکی دەژیان و قەت لەگەڵ خەڵکدا دانوویان نەدەکولا. جێی سەرنجی هەموان بوون، قازانجیان بە خەڵک دەگەیاند. بەرگدروویەکی زیرەک و دەست ڕەنگین بوو. سەلیقەی چاکی هەبوو. بەخۆڕایی کاری دەکرد، پارەی لە هیچ کەس وەرنەدەگرت. کاری دەکرد، ئەگەر کرێی کارەکەشیان پێدەدا وەری نەدەگرت. هەڵبەت سەرهەنگ لەگەڵ ئەوان جیاواز بوو، پیاوێکی ناو بەدەرەوە بوو. درگای ماڵەکەی بە ڕووی هەموو کەسدا کراوە بوو. پۆل پۆل خەڵکی بانگهێشت دەکرد و شێوی پێدەدان و کۆڕی سەمای وەڕێ دەخست. هەر لەو کاتەدا من گەیشتمێ و لەو هەنگەدا ناونووسی کرام. تەواوی خەڵکی شارەکە باسی گەڕانەوەی کچی دووهەمی سەرهەنگیان دەکرد. پەری ڕوویەک کە تازە یەکێک لە قوتابخانە بە ناوبانگەکانی پێتەختی بەجێ هێشتبوو. ئەو کچەش ناوی کاترینا ئیوانا بوو، لە ژنی دووهەمی بوو، کە لە بنەماڵەی ژینراڵێکی ناو بەدەرەوە و ڕەسەن بوو. هەروەک لە ژێدەر گەلێکی جێی باوەڕم بیستووە، ئەم ژنەش هیچ پارەیەکی بۆ سەرهەنگ نەهێنا و جیازییەکی ئەوتۆی پێنەبوو. ئەو تەنیا چەن قەوموقیلەیەکی پایە بەرزی هەبوو، هیوایەکی زۆریشی بە داهاتووی خۆی بوو و لەوەش زیاتر هیچی شک نەدەبرد لە دارەی دنیا. ئەوانیش هیچ داهاتێکیان بۆ ئەو بەنێوچاوانەوە نەبوو.

لەگەڵ ئەوەشدا، کاتێ شەنگە کچ لە قوتابخانەی شەوانەڕۆژی هاتەوە، هەڵبەت بۆ سەردان، نەک بەقەستی مانەوە، شارەکە یەکپارچە شڵەژا بوو. بەناوبانگترین سەرە ژنی شارەکە کە دوو ژنە ژینراڵی خاوەن کەسایەتی و ژنە سەرهەنگێک بوون و پۆلێک کەنیز و قەرەواش و هاوڕێیان لەگەڵدا بوو،

خێرا دەوریان داو بە شانازیی ئەو و هاتنەوەکەی میوانداریيان وەڕێ خست. کۆڕی هەڵپەڕکێ و سەمایان ساز دەکرد و بە کۆڕ دەچوونە گەشت و گەڕان، ئەوەش بە قازانجی خزمەتکارانی بێهێز و شەکەت تەواو دەبوو و شانۆیان بەڕێوە دەبرد و پارەکەیان دەدا بەو هەژار و لێقەوماوانە. من سەرنجێکی ئەوتۆم نەدەدایە و هەروەک پێشوو وەحشییانە وەبەرم دابوو. یەکێ لە شاکارەکانم ئەو کاتە بووبووە بنێشتە خۆشەکەی هەموو کۆڕ و کۆبوونەوەیەک. ڕۆژێک لە ماڵی فەرماندەری تۆپخانە تێگەیشتم دادەخانم سەیر تێمدەڕوانێ، بەڵام نەچووم بۆلای، وەک ئەوەی لە ئاشنایەتییەکەی وەڕەز بم. ماوەیەک دوای ئەوە لە کۆڕێکی عەسرانەدا چووم بۆلای و قسەم لەگەڵ کرد. چاوی لێنەکردم و بە ڕقەوە لێوی خۆی دەکرۆشت. لە دڵی خۆما گوتم: «جارێ ڕاوەستە، بزانە چۆنت تۆڵە لێدەکەمەوە.» ئەو سەردەمە لە زۆربەی کاتەکاندا وەک مرۆڤێکی خیشەسەر و نابار هەڵس وکەوتم دەکرد و خۆشم ئەوەم دەزانی. ئەوەی خراپتری دەکرد ئەوە بوو، هەستمدەکرد کاترینا کچە قووتابییەکی چاو و گوێئاخنراو نییە، بەڵکو کچێکە زانا و چاوکراوە و لەخۆبایی، لە هەمووشی گرینگتر خوێندەوار و بەئاوەز بوو. منیش لەو شتانە بێبەش بووم. پێتوایە دەمویست بچمە خوازبێنیی؟ نا، تەنیا دەمویست تۆڵەی لێبکەمەوە. چونکە من ببوومە بنێشتە خۆشەکەی سەر زاری خەڵک و ئەویش بە هیچی نەدەزانیم و بە پیاویشی دانەدەنام.

ئەو عەینە، کاتی خۆمم بە کەیف و نەهەنگ ڕادەبوارد، تا ئەوەی جەنابی سەرهەنگ دوو سێ ڕۆژی کردمە زیندان. هەر لەو کاتەدا باوکم شەش هەزار ڕۆبڵی بۆ ناردم، تاکو سەنەدێکی بۆ بنێرم و چاوپۆشی لە هەموو داواکارییەکانم بکەم و حیساب و کیتابمان لەبەیندا نەمێنێ و ئیتر چاوەڕوانیی هیچم لێی نەبێ. ئەو کاتە لە شتێک هەر نەگەیشتم. تا ئەوەی هاتم بۆ ئێرە. ئالیووشا! هەتا چەند ڕۆژ لەمەوبەر، ڕەنگە هەر ئێستاش، نەمتوانیوە سەر لە کاروباری ماڵ و دارایی باوکم دەرهێنم. بەڵام کارت بە سەر ئەوەوە نەبێ، لە کاتی خۆیدا باسی دەکەین.

هەر ئەو کاتە پارەکەم بە دەست گەیشت، نامەیەکم لە لایەن دۆستێکەوە بۆ هات. باسی ڕووداوێکی کردبوو کە زۆری سەرنج ڕاکێشام. تێگەیشتم کە فەرماندەرانی ئەرتەش لە جەنابی سەرهەنگ دوو ڕازی نین. وا دەردەکەوت کە بەرەو بێسەرەو بەرەیی دەڕوا. لە ڕاستیدا نەیارەکانی خەریک بوون چێشتێکیان بۆ لێدەنا، بستێکی ڕۆن لە سەر بێ. ئەو کاتە فەرماندەری لق خۆی گەیاندێ و بەزم و هەرایەکی سازکرد دەتگوت ڕۆژی حەشرە. زۆری نەخایاند فەرمانی خانەنشین کرانی دەرچوو. پێت نالێم، کە چی ڕوویدا. سووڕ دەشمزانی دوژمنی بوو. لەپڕدا خەڵک دەرهەق بە ئەو و بنەماڵەکەی ساردبوونەوە و هیچ سەرنجێکیان پێنەدەدان. دۆستەکانی هەموو پشتیان تێکرد. ئەو کاتە من یەکەم هەنگاوم هەڵێنایەوە. چووم بۆلای ئاگاتا ئیوانا کە دۆستایەتییەکەم لەگەڵ ئەو تێک نەدابوو، گوتم: «دەزانی باوکت چوارهەزار و پێنجسەد ڕۆبڵی لە حیسابی ماڵ و دارایی دەوڵەت کەمی هێناوە؟»

ـ مەبەستت چییە؟ کوانێ بەڵگەت؟ ماوەیەک لەمەوبەر بوو کە ژینڕاڵ لێرەبوو و هەموو شتێک بەکەیفی ئەو هەڵدەسووڕا.

ـ ئەو کاتەبوو، بەڵام ئێستا نییە.

کچە زۆر ترسابوو.

گوتی: «مەمترسێنە! کێ بە تۆی گوت؟»

گوتم: «خەمت نەبێ، بە هیچ کەس نالێم و سەبارەت بەو شتە لەبزم لە لەبزی کەس ناگەڕێ. بەڵام دەمویست لەوبارەوە شتێکی دیکەت وەبیر بێنمەوە. کاتێ داوای چوارهەزار و پێنجسەد ڕۆبڵەکەیان لە باوکت کردەوە و نەتوانێ بیدا، دادگایی دەکەن و دەرەجەکانی لێدەستێننەوە و ناچاری دەکەن بە پیری بڕوا بۆ سەربازی، تەنیا ڕێگایەک دەمێنێ، ئەویش ئەوەیە تۆ کاترینای خوشکت بنێری بۆلام. لەم بەینانەدا پارەیەکم بە دەست گەیشتووە. ئەگەر پێتخۆش بێ چوارهەزار ڕۆبڵی پێدەدەم و وەک نهێنییەکی پیرۆز ڕایدەگرم و مەگین گڵ لیمببیستێ.»

گوتی: «ئەی بەرەڵڵای هیچ و پووچ! ناکەسی ناپاک! چۆن دەوێری قسەی وا دەکەی؟!»

زۆر بە ڕقهەستاوی ڕۆیشت. جارێکی دیکە گوڕاندم و گوتم ئەو ڕازە پیرۆزە ڕادەگرم و کەس لێمنابیستێ. هەر لێرەدا با ئەوەش بڵێم، ئەو دوو بوونەوەرە، یانی ئاگاتا و پووری لە هەوەڵ تا ئاخری ئەو مامەڵەیەدا وەک فریشتە هەڵسووکەوتیان کرد. کاتیا ئەو کچە بەهەوا و لەخۆ باییەیان لە ڕۆح و گیانیان خۆشتر دەویست، ئەویان لە خۆیان باڵادەستتر دەزانی و دەستەونەزەر لە خزمەتیدا ڕادەوەستان. بەڵام ئاگاتا باسی ئەو قسەیەی خۆی و منی بۆ دەکا. زۆر دواتر جا ئەوەم بۆ دەرکەوت. قسەکانمانی نەشاردەوە و هەڵبەت ئەوەش شتێک بوو کە من حەزم پێدەکرد. لەپڕ سەرگوردێکی تازە هات و فەماندەریی گوردانەکەی وەئەستۆ گرت. سەرهەنگ دووی باوکی کاترینا لەڕێوە نەخۆش کەوت و هەتا دوو ڕۆژ نەیتوانی لە ژوورەکەی بێتە دەرێ، پارەی دەوڵەتیشی نەدایەوە. دوکتۆر کرافشنکۆ گوتی سەرهەنگ بەڕاستی زۆر نەخۆشە. بەڵام من دەمزانی و لەمێژ بوو لەوە گەیشتبووم، کە لە چوار ساڵی ڕابردوودا هیچ پارەیەکی دەوڵەتی لەبەر دەستتدا نەبووە، جگە لەوکاتەی کە فەرماندەر بۆ بەسەر کردنەوە هاتبوو. پارەی بە کەسێکی جێی متمانە دەدا، بازرگانێکی شارەکەمان کە ناوی تریفۆنۆف بوو، بێوە پیاوێک بوو ڕیش درێژ و چاویلکەی دەسک زێڕینی لەچاو دەکرد. ئەو کابرایە دەچووە بازاڕی مەکارە[11] و بەو پارەیەی قەرزی کردبوو مامەڵەی زۆر گەورە و پڕ سوودی دەکرد و تەواوی پارەکەی بۆ سەرهەنگ دەبردەوە. بەوجۆرە دیارییەکی لە بازاڕی مەکارە دەست دەکەوت و هەروەها بەهرەی ئەو پارە و دراوانەشی دەنایە تەنگەی باخەڵی. بەڵام ئەمجارە (سەبارەت بەوە بە هەڵکەوت لە کوڕێکی میراتگری تریفۆنۆفم بیست کە لاوێکی بڵقنە بوو و

---

11- مەکارە: وشەیەکی ڕووسیە، بازاڕی مەکارە: ساڵی چەند ڕۆژ لە وڵاتێک دەکرێتەوە و هەموو وڵاتەکان، بۆ فرۆشتن کەلوپەل دێننە ئەو بازاڕە.

یەکێک بوو لە ناڕەسەنترین و خراپکارترین مرۆڤی دنیا.) هەروەک گوتم ئەمجارەیان تریفۆنۆف هیچی لە بازاڕ نەهێنایەوە. سەرهەنگ بەهەڵەداوان چوو بۆ لای. «هیچ پارەیەکم لە تۆ وەرنەگرتووە و باوەڕ ناکەم قەتیشی وەرگرم.» ئەوە بوو وەڵامەکەی. هەربۆیە سەرهەنگ دووی ئێمە لە تاوانا نەخۆش کەوت و لە جێوباندا تخێڵ بوو. خاولییەکی بەنێوچاوانەوە بوو، دوو کچەکەی و ژنخوشکی سەهۆڵیان بە سەر خاولییەکەدا دەگێڕا. لە ناکاو پێشخزمەتێک وەژوور کەوت، دەفتەرێکی بە بن هەنگڵەوە بوو. پسوولەیەکی دەرهێنا کە فەرمانی لە سەر درابوو: «بەڕێز، تکایە هەتا ماوەی دوو کاتژمێر پارەی سەندووقەکە بێنەوە.» سەرهەنگ پسوولەکەی ئیمزا کرد. (من دواتر چاوم بە ئیمزاکەی کەوت.) خێرا هەستا سەرپێ و واینواند کە دەیهەوێ جلە سەربازییەکانی لەبەر بکا. پاشان بە لەز خۆی کرد بە وەتاغەکەی خۆیدا. تاپڕە دوو لوولەکەی داگرت و دوو گوللەی تێهاویشت. لوولەکەی نا بە سینگییەوە و بە قامکی لاقی بە دوای ماشەی تفەنگەکەدا گەڕا. بەڵام ئاگاتا، قسەکانی منی وەبیر دێتەوە و دەکەوێتە دڵەڕاوکێ. بە دزییەوە سەر دەکێشێتە ژووری خەوەکەی باوکی، زۆر بەجێش فریا دەکەوێ. خۆی دەکا بە ژوورێدا و لە پشتەوە خۆی بەسەردا دەدا. توند باوەشی پێدادەکا و تفەنگەکە دەردەچێ و لە بنمیچەکە دەدرێ. بەڵام زیان بە هیچ کەس ناگا. کاترینا و پووریشی بەرەو وەتاغەکە هەڵدێن. تفەنگەکەی لە چنگ دەردێنن و هەردوو دەستی دەبەستن. دواتر باسی ڕووداوەکەیان بە وردی بۆ گێڕامەوە. لە ماڵێ دانیشتبووم، خەریک بوو هەوا تاریک دەبوو، دەمویست لەماڵ وەدەرکەوم، جلوبەرگم لەبەر کردبوو، سەرم داهێنابوو. عەترم لە دەسەسڕەکەم دابوو و کڵاوەکەمم بە دەستەوە گرتبوو. لەپڕ درگاکە کرایەوە و کاترینا ئیوانا هاتە ژوورێ و بەرانبەرم ڕاوەستا.

شێوەی پێشهاتەکان جاری وایە سەیرە. هیچکەس لە شەقام چاوی پێی نەکەوتبوو، بۆیە کەس لە نێو شاریدا هەواڵی لێینەبوو. لەگەڵ دوو پیرێژنی لاکەوتە لە ماڵێکدا دەژیاین. کە ئاگادارییان لێ دەکردم و کاروباری ناوماڵیان

بەڕێوە دەبرد. پەکوو لەو ژنانە، دەتگوت فریشتەن. هەر کارێکم بووبوایە بە دڵ و گیان ئامادە بوون. پاشان لە سەر داوای من سەبارەت بەو کەین‌وبەینە زمانیان نەگەڕا و لە ئەلفەوە نەهاتنە بێ. هەڵبەت خێرا تێگەیشتم و باروودۆخەکەم هەڵسەنگاند. هاتە ژووریێ و ڕاست چاوی تێبڕیم. بەو چاوە ڕەش و گەشانەوە. نیگایەکی جیددی و تەنانەت شەڕاشۆ. بەڵام بە لێو و زاریدا تێگەیشتم متمانەی پێم نییە.

هاتە قسە و گوتی: «خوشکم پێی گوتم چوار هەزار ڕۆبڵم پێدەدەی ئەگەر بۆ وەرگرتنی خۆم بێم بۆلات. من ئەوە هاتووم... پارەکەم پێبدە!»

ئیتر نەیدەتوانی درێژە بە قسەکانی بدا. کەوتبووە هەناسەبڕکێ و ترس دایگرتبوو. دەنگی دەرنەدەهات. لێوی دەلەرزی. گوێت لێیە یان خەوتووی؟

ئالیووشا بە شڵەژاوی گوتی: «میتیا، دەزانم ئەوی هەقیقەتە دەیڵێی و لێی لانادەی.»

ـ ئەگەر تەواوی هەقیقەتەکە مووبەموو نەڵێم، لەخۆم نابوورم. یەکەم بیرۆکەم ـ بیرۆکەیەکی کارامازۆفییانە بوو. براگیان جارێک کاکڵەمێشانێک پێوەی دام و چەقوچۆیەکم گرت هەتا دوو حەوتوو لە جێدا کەوتم. لەوکاتەشدا وام هەستدەکرد، کاکڵەمێشانێک خەریکە بە دڵمەوە دەدا. دەعبایەکی مزێڕ، تێدەگەی؟ چاوێکم لە سەرتاپای کچە کرد. دیتووتە؟ خودای جوانییە. بەڵام لەو کاتەدا بە شێوەیەکی دیکە جوان بوو. لەو کاتەدا جوان بوو چونکە بالادەست بوو، منیش خوێڕی و بەڕەڵڵا. ئەو سەرچاوەی دەستودڵبازی و لەخۆبردوویی بوو. سەبارەت بە باوکی و من دەعبایەک بووم! بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە دەعبایەکی هیچوپووچ بووم، ئەو بە تەواوی بە ڕۆح و جەستەوە لەبەر دەستمدا بوو. کەوتبووە داوم. بە ئاشکرا پێت‌دەڵێم ئەو بیرۆکەیە، ئەو بیرۆکە ژەهراوییە، وای دڵم داگرت کە ئاراوقارای لێهەڵگرتم. دەتگوت ئیتر خۆڕاگری لەهەمبەریدا کەڵکی نییە.

ڕاست وەک دەعبا، وەک کاکڵەمێشانێکی ژەهراوی جووڵامەوە. دڵڕەق و بێبەزەییانە. وەهەناسەبڕکێ کەوتبووم. تێدەگەی! دەبوو ڕۆژی دوایی

بچووبایەمە خوازبێنی. بۆ ئەوەی ئەو ڕووداوە ئابڕوومەندانە کۆتاییی پێ‌بێ و هیچکەس ئاگادار نەبێ. چونکە، ئەگەرچی مرۆڤێکی شواڵ چەپەڵ و هەوەسبازم، بەڵام خاوەن شەرەفم. هەر لەوکاتەشدا دەتگوت دەنگێک لە بن گوێما سرتەیەتی: «بەڵام کاتێ سبەینێ چووی بۆ خوازبێنی، ئەو کچە هەردەماری ناهێنێ چاویشت لێبکا. فەرمان بە فایتوونەوانەکەی دەدا و بە شەپ وەدەرت نێ. دەڵێ: «لە تەواوی شاردا بیکە بەقاو. من هیچ باکێکم لە تۆ نییە.» چاوێکم لە خانمۆڵێ کرد، دەنگم فریوی نەدابووم. هەروا دەبێ. سبەینێ بە مرۆڤیشم حیساب ناکا، شکی تێدا نییە. هەر ئێستا لە سیمایدا دەمدی کە وەدەرم دەنێ. ڕقم هەستا. پێم‌خۆش بوو چەپەڵترین فێڵ و تەڵەکەی بۆ وەکار خەم: بە چزەبزەیەکەوە چاوی لێبکەم و خێرا هەر لەو شوێنەی کە بەرانبەرم ڕاوەستابوو، بە لەبزێک کە تەنیا کابرایەکی بەقاڵ پێی دەدوێ، لەجێی خۆی وشکی بکەم.

«چوار هەزار! مەبەستت چییە؟ گاڵتەم دەکرد. بە هیوای شین‌خۆر کردنی. ئەگەر پێتخۆش بێ دووسەد ڕۆبڵی لە سەر چاوم دادەنێم. بەڵام چوار هەزار ڕۆبڵ بۆ ئەوە نابێ هەروا بەفشە بە ئاویدا بدەی. لەخۆڕا زەحمەتت بەرخۆت داوە.»

هەڵبەت دەستم لە هیچ گیر نەدەبوو. لەوانەبوو بسڵەمێتەوە. بەڵام تۆڵەیەکی دێو ئاسایی دەبوو. بایی زەحمەتەکەشی دەبوو. بە وەکار خستنی ئەو تەڵەکەیە هەتا ئاخری تەمەنم گوێزم بە کلک دەشکاند. باوەڕ دەکەی، تا ئێستا دەرهەق بە هیچ ژنێک ئاوا نەبووم. بە هیچ ژنێک، کە هەتا ئەو ڕادیە بە ڕقەوە تێی‌بڕوانم. بەڵام سێ‌چرکە، یان ڕەنگە پێنج چرکە بە ڕقێکی ئەستوورەوە چاوم تێبڕی ـ هەر ئەو قینەی کە لەگەڵ ئەشق لەگەڵ شێتانەترین ئەشق، موویەکی مەودا هەیە!

چووم بۆلای پەنجێرەکە، ناوچاوانم بە شووشە سارد و سڕەکەوە نا و لەبیرمە سەهۆڵی شووشەکە وەک پشکۆ ناوچاوانی سووتاندم. مەترسە، زۆرم خانمۆڵەخان ماتڵ نەکرد گەڕامەوە چووم بۆلای مێزەکە، خوانچەکەم

کێشایە دواوە و چەکێکم بە گوژمەی پێنچ هەزار ڕۆبڵ دەرهێنا. (خستبوومە بەینی لاپەڕەی فەرهەنگی فەڕەنسییەوە.) بە بێدەنگی نیشانیم دا و دووقەدم کرد و دامە دەستی. دەرگای ڕێڕەوەکەم کردەوە و لەگەڵ ئەوەی بۆ دواوە کشامەوە دەستم بە سینگمەوە گرت، کڕنۆشێکی پڕ لە ڕێز و حورمەتم بۆ برد، بڕوام پێبکە! سەرتاپای گیانی دەلەرزی، ماوەیەک چاوی تێبڕیم. ڕەنگی سپی هەڵگەڕابوو ـ وەک هومایی ـ لەپڕ و نەرم و هێدی لەبەر پێمدا چووە سوجدە، لەو شێوە ڕێزگرتنانەی تایبەتی قوتابخانەی شەوانەڕۆژی نەبوو، بەڵکو بە شێوەی ڕووسی، ناوچاوانی بە چەقی وەتاغەکەوە نابوو. هەستا پێ و بە هەڵاتن دەرپەڕی بۆ دەرێ. خەریکی لەقەد بەستنی شمشێرەکەم بووم. هەڵمکێشا و زۆری نەمابوو خۆم بکووژم. لەبەرچی، نازانم، هەڵبەت ئەگەر خۆم بکوشتبایە، زور کارێکی گەوجانە دەبوو. پێموا لەبەر خۆشحاڵی بوو. تێدەگەی پیاو جاری وایە لەبەر شادی و خۆشحاڵیی زۆر خۆی دەکوژێ؟ بەڵام شمشیرەکەم لەخۆم ڕانەکرد. ماچمکرد و نامەوە کالانەکەی، ئەوەش پێویست نەبوو، بەتۆی بڵێم. پێموایە بۆ درکاندنی کێشە و ئاژاوەی دەروونم لای تۆ دمەوێ گەورەی کەمەوە بۆ ئەوەی خۆم مەزن و بەڕێز نیشاندەم. بەڵام لەوە گەڕێین، خوا غەزەب لە هەموو ئەو کەسانە بگرێ کە دەیانەوێ شەیتانانە سەر بە ناخ و دڵی ئەم و ئەودا بکەن! چاکە، سەبارەت بەو ڕووداوە لەگەڵ کاترینا ئیوانا هەر ئەوەندە بەسە. ئێستا تەنیا تۆ و ئیوانی برام لەو ڕووداوە ئاگادارن و هیچ کەسی دیکە نازانێ.

دیمیتری فیۆدۆرۆویچ هەستا سەرپێ، بە شڵەژاوی دەستیکرد بە گەڕان بە نێو ژوورەکەدا. دەسرەکەی لە گیرفانی دەرهێنا و نێوچاوانی سڕی، دیسان دانیشتەوە، نەک لەجێی خۆی، بەڵکو لە پشت سەری ئالیووشاوە. ئالیووشا ناچار بوو بە تەواوی وەرسووڕێ و ڕووی تێکا.

## (٥)

## دان پیانانی دڵێکی سووتاو ـ «ئامادەی ڕۆیشتن»

ئالیووشا گوتی: «ئێستا لە نیوەی هەوەڵ گەیشتووم.»

ـ لە نیوەی هەوەڵ گەیشتووی. ئەوە نیوەی ئەو شانۆیە بوو کە لەوێ بەڕێوە چوو. نیوەی دووهەم تراژیدیایە و خەریکە لێرە بەڕێوە دەچێ.

ئالیووشا گوتی: «بەڵام من نیوەی هەوەڵ نەمتوانی هیچی لێ هەڵکرێنم.»

ـ پێتوایە من خۆشم توانیومە سەری لێدەرکەم؟

ـ دیمیتری، سەبرکە. پرسیارێکی گرینگ. پێم بڵێ بزانم، ئێوە دەزگیران بوون، ئێستاش پێکەوە ماون؟

ـ خێرا نەبووینە دەزگیران، سێ مانگ دوای پارە پێدانەکە. ڕۆژی دوایی لە دڵی خۆما گوتم پەڕاوی ئەو ڕووداوە پێچرایەوە، کۆتاییی پێهات و ئاکامێکی ئەوتۆی نییە. خوازبێنی کردنیش پێموابوو کارێکی سووک و ڕەزیلانەیە. نزیکەی شەش حەوتوو کە لەو شارە مایەوە. چاوم پێی نەکەوت هیچ هەواڵێکم لێینەبوو. تەنیا جارێک نەبێ، ڕۆژی دوای دیدارەکە سەروسەکوتی کڵفەتەکەی پەیدا بوو، کە نامەیەکی بۆ هێنابووم. پاکەتەکەم هەڵپچڕی، باقیی پارەکەی تێدابوو. تەنیا پێویستیان بە چوار هەزار و پێنجسەد ڕۆبڵ بوو. بەڵام کاتی نەغد کردنەوەی چەکەکە، دووسەد ڕۆبڵێکی لێ گل درابۆوە. نزیکەی دووسەد و شەست ڕۆبڵی بۆ ناردبوومەوە، بەجوانی لەبیرم نییە و هیچ یادداشتێکیش لە نێو نامەکەدا نەبوو. تەنانەت یەک وشەش. سەروبنی پاکەتەکەم پشکنی ـ هیچ ـ هیچ شتێکم نەدۆزییەوە! باقیی پارەکەم لەڕێی

کەیف و ڕابواردنێکدا خەرج کرد، کە سەرگوردی تازە ناچار بوو سەرکۆنەم بکا.

جەناب سەرهەنگیش، لەگەڵ ئەوەی هەموویانی تووشی سەرسامی کردبوو، پارەکەی گوردانی هێنایەوە. چونکە هیچ کەس باوەڕی نەدەکرد هەروا پارەکە بێنێتەوە بێ ئەوەی فلسێکی لێ‌کەم بووبێتەوە، چەند ڕۆژ دوای دانەوەی قەرزەکە نەخۆش کەوت و ئیتر نەیتوانی لە جێوبان بێتە دەرێ. دوای سێ حەوتوو کەلەلایی، شەپلەی مێشک لێیدا و ڕۆژی دواییەکەی مرد. بە ڕێوڕەسمی نیزامی بە خاکیان سپارد. چونکە تەمەنی بۆ کاتی خانەنشین بوون، مابووی! دە ڕۆژ دوای بە خاک سپاردنەکەی، کاترینا ئیوانا لەگەڵ پووری و خوشکی چوون بۆ مۆسکۆ. چونکە کاتی ڕۆیشتنەکەیان (نەمدیبوون و بەڕێم نەکردبوون) یادداشتێکی کورتیان بۆ ناردبووم، کوتە کاغەزێکی شینی ناسک بوو، تەنیا دێڕێکی لە سەر نووسرابوو: «نامەت بۆ دەنووسم، چاوەڕێ بە. ک.» هەر ئەوە.

پاشماوەکەی بە کورتی باسدەکەم. لە مۆسکۆ چارەنووسیان زۆر بە خێرایی و چاوەڕوان نەکراو، وەک چیرۆکی هەزار و یەک شەو ئاڵوگۆڕی بەسەدا هات. ئەویش خزمێکی بێوەژنیان بوو کە زۆر دەوڵەمەند بوو، دوو کچی برازای بوو کە دەبوونە میراتگری، لەپڕ هەردووکیان بە نەخۆشیی هاوڵەمردن. ئەو خاتوونە پیرە چونکە لە ژێر باری خەم و کەسەردا بڕستی لێ‌بڕابوو، کاتیای کردە کچی خۆی، وەک تەنیا هیوای ژیان، دەستەوداوێنی کاتیا بوو، وەسیەتنامەکەشی بەقازانجی ئەو گۆڕی. بەڵام ئەو بەکاری داهاتوو دەهات. بۆ ئێستاشی هەشتا هەزار ڕۆبڵی بە ناوی جیازی پێدا، کە بە دڵی خۆی خەرجی بکا. ژنێکی تووڕە و تۆسن بوو. دواتر لە مۆسکۆ بە خزمەتی گەیشتم.

لەناکاو ڕۆژێکیان چوار هەزار و پێنجسەدڕۆبڵم بە ڕێگای پۆستەدا بە دەست گەیشت. لەبەر سەرسووڕمان زمانم شکا. سێ ڕۆژ دواتر نامەی بۆ ناردم. هاودەمی هەموو کاتەکانمە، ئەو نامەیە هەتا کاتی مردن هەر هاودەمم

دەبێ. پێتخۆشە نیشانتی بدەم؟ دەبێ بیخوێنیتەوە. پێشنیاری کردووە کە شووم پێدەکا، دەیهەوێ خۆیم بەسەردا ببڕێ، دەڵێ: «خولیای ئەشقی تۆم و خۆشم دەوێی، تەنانەت ئەگەر تۆ خۆشیشت نەوێم، گوێم لێنییە. ببە مێردم، مەترسە. نابمە گۆشتی گەردەمل، قەرەواشیت دەکەم. دەبمە خۆڵی بەرپێت. دەمهەوێ هەتا کاتی مردن خۆشەویستم بی و دەمهەوێ تۆ لە چنگ خۆت ڕزگار بکەم.» ئالیووشا، نامەوێ بە قسەی قۆڕ و بێتام و لەبزی ناحەزی خۆم، کە ساتێک ڕزگاریم نایە لە دەستی، نووسراوەکەی ئەو دووپات بکەمەوە. ئەو نامە تەنانەت هێشتاش وەک خەنجەر لە دڵم ڕادەچێ. پێتوایە گرینگیی پێنادەم ـ هێشتاش گرینگی پێنادەم؟ هەرلەڕێوە وەڵامی نامەکەیم بۆ نووسییەوە. چونکە چوونە مۆسکۆ بۆ من مەحاڵ بوو. بە چاوی فرمێسکاوییەوە نامەم بۆ نووسی. هەتا کۆتاییی تەمەنم لەبەر شتێک هەست بە شەرمەزاری دەکەم. لە جوابی نامەکەیدا ئاماژەم کردبوو کە دەوڵەمەندی و جیازیت هەیە و من سواڵکەرێکی لەخۆباییم! ناوی پارەم هێنا! دەبوو ئەوەم بە بێدەنگی بەڕێوە ببردایە، بەڵام لە پتەم دەرچوو. ئەو کاتە خێرا نامەیەکم بۆ ئیوان نارد و لە شەش لاپەڕەدا مووبەموو هەموو شتێکم بۆ نووسی و ناردم بە دوای کاتریનادا. بۆ ئاوا تەماشام دەکەی؟ بۆ وا چاوت تێبڕیوم؟ بەڵێ ئیوان ئاشقی بوو. ئێستاش هەر دڵی پێوەیەتی. ئەوە دەزانم. بە بڕوای خەڵک کارێکی زۆر دزێو و گەوجانەم کرد؛ بەڵام ڕەنگە ئەو تەنیا کارە گەوجانەیەم، ئێستا مایەی ڕزگاریی هەمووان بێ. ئاخ، نەتدیوە چۆن لەگەڵ ئیوان کۆکە و ڕێز و حورمەتی بۆ دادەنێ؟ کاتێ ئێمە بەیەکەوە هەڵدەسەنگێنێ. پێتوایە بتوانێ کەسێکی وەک منی خۆشبوێ، بەتایبەت دوای ئەو کێشە و چەلەحانێیەی کە لێرە ڕووی دا؟

ـ بەڵام من پێموایە کاترینا پیاوێکی خۆشدەوێ کە وەک تۆ وابێ، نەک پیاوێکی وەک ئیوان.

«ئەو تەنیا گەورەیی خۆی خۆش دەوێ و خۆپەرستە. منی هەر خۆش ناوێ.» ئەم وشانە، بێئیختیار و تاڕادەیەک لە ڕووی بەدزاتییەوە لە زمانی

دیمیتری دەرپەڕی. پێکەنی، بەڵام دوای ساتێک چاوی بریقەی هات، سوور هەڵگەڕا و بە توندی مشتێکی کێشا بە مێزەکەدا.

بە ڕقێکی ئەستوورەوە دەرهەق بەخۆی، گوڕاندی: «ئالیووشا، سوێند دەخۆم. ڕەنگە بڕوام پێنەکەی، بەڵام بە زات و گەورەییی خودا، ئەگەرچی هەر ئێستا پێکەنینم بە هەستە بەرز و پیرۆزکەی هات، بەڵام هەزاران جار گیانم گەندەڵ و پیسترە لە گیانی ئەو، هەروەها ئەو هەست و سۆزە مەزنەی ئەو وەک هەست و سۆزی فریشتەیەکی ئاسمانی وایە. تراژیدیاش لێرەدایە ـ دڵنیام. چی دەبێ پیاو تۆزێکیش خۆی هەڵکێشێ؟ مەگین من خۆشم وا نیم؟ لەگەڵ ئەوەشدا من درۆ ناکەم، سادقم، بەڵام تێدەگەم ئیوان ئێستا چۆن تووک و نزا لە سروشت دەکا ـ بە ئاوەزیشی دەبینێ کە کێ بە سەر کێیدا هەیە و چی بە باشتر دەزانێ. ئەو دێوەزمەی، کە هەرچەندە دەزگیرانیشی هەیە و هەموو چاویان لێیەتی ناتوانێ بەرگری لە بێبەند و بارییەکانی بکا ـ ئەویش لەبەر چاوی دەزگیرانەکەی دیارە پیاوێکی وەک منیشی پێباشترە و دەست بە ڕووی ئەوەوە دەنێ. ئەویش بۆچی؟ بۆ ئەوەی کچێک دەیهەوێ بە هۆی هەقناسی و پێزانینەوە ژیان و چارەنووسی خۆی فیدا بکا. شتێکی قۆڕە! هەتا ئێستا لەوبارەوە یەک وشەشم بۆ ئیوان باسنەکردووە. هەڵبەت ئیوانیش لەوبارەوە هیچ ئاماژەیەکی بە من نەکردووە. بەڵام چارەنووس کاری خۆی دەکا و هەق بە هەقدار دەگا و مرۆڤی هەقخوراویش بۆ هەمیشە لە کۆڵانی پڕ لە پێچەڵاوپووچی خۆیدا ون دەبێ ـ کۆڵانی گەرما و کۆڵانی خۆشەویستی. پیس و خاوێن، ناحەز و جوان. هەر ئەو جێگایەی کە هەست بە حەسانەوە دەکا و هەر ئەو جێگایەی بە دڵی خۆی و بەتامەزرۆییەوە لە چڵک و پیساییدا نوقم دەبێ. گەوجانە قسەم کردووە. قسەم پێنەماوە. ئەوانەم هەروا کوێزەرکوت و ئەڵلاقۆیتاسی گوتووە. بەڵام هەروا دەبێ کە کوتوومە. من لە کۆڵانی تەنگەبەر و پێچەڵاوپووچی خۆمدا ئەوق دەبم و ئەو لەگەڵ ئیوان زەماوەند دەکا.

ئالیووشا بە کەشتەنگی و دڵەخورپەوە پەڕییە نێو قسەکانی: «سەبرکە دیمیتری. شتێک هەیە هێشتا ڕوونت نەکردۆتەوە: تۆ دەزگیرانت هەیە یان نا؟ چۆن دەتوانی دەزگیرانییەکەت تێکبدەی، ئەگەر دەزگیرانەکەت پێیخۆش نەبێ، یەکلایەنە دەبێ؟»

ـ ئەرێ، بە شێوەیەکی فەرمی و شەرعی دەزگیرانین. کاتێ چووم بۆ مۆسکۆ ڕێوڕەسمی دیاریکردنمان بەڕێوە برد. زۆریش بەشکۆ بوو. ژنەکەی ژینرال تەقدیسی کردین و ـ بڕوا دەکەی؟ـ پیرۆزباییی لە کاتیا کرد. «هەڵبژاردنەکەت زۆر چاک و ژیرانەیە، ناخی وجوودی دەبینم.» باوەڕیش دەکەی، ئیوانی وەبەر دڵ نەکەوت و بە ناقایلی وەڵامی سڵاوەکەی دایەوە؟ لە مۆسکۆ زۆرم قسە لەگەڵ کاتیا کرد. باسی خۆمم بۆ کرد و زۆر سادقانە و بەشەرەفانە. زۆر چاک گوێی بۆ شل کردبووم.

*دڵەخورپەیەکی شیرین لە نێوانماندا بوو*

*وشەی شیرین و ناسک لە لێومان هەڵدەفڕی*

وشەی غرووراویش لە گۆڕێدا بوو. بەڵێنییەکی گەورەی لێدەرکێشام بۆ ئەوەی بمکاتە گوێ لە مشتی خۆی. بەڵێنییەکم پێدا و لێرە...

ـ چی؟

ـ دەی، بانگم کردی و بۆ ئێرەم هێنای ئەمڕۆ ـ لەبیرت نەچێ ـ تاکو بتنێرم ـ هەر ئەمڕۆکە ـ بۆلای کاترینا ئیوانا و...

ـ بۆ؟

ـ بۆ ئەوەی پێی بڵێی ئیتر قەت ناچم بۆ سەردانی. بڵێ «ئەو ڕێزی زۆری بۆت هەیە.»

ـ ئاخر شتیوا چۆن دەبێ؟

ـ بەو هۆیەش تۆ دەنێرم بەجێی خۆم، چونکە خۆم مەحاڵە بتوانم، خۆم چۆنی پێ بڵێم؟

ـ دەتەوێ بچی بۆ کوێ؟

ـ بۆ ئەو کۆڵانەی پشتەوە.

ئالیووشا بە لەبزێکی خەماوی گوتی: «کەوایە دەچی بۆلای گرووشنکا!» پاشان دەستی هەڵگلۆفی «یانی ڕاکیتین ڕاستی دەکرد؟ پێموابوو تۆ تەنیا چووبوویە سەردانی و هیچی تر.»

- مەگین پیاوی دەزگیراندار دەتوانێ بۆ ئەو جۆرە دیدارانە بچی؟ مەگین شتی وا هەردەبێ، ئەویش بەو دەزگیرانەوە و لەبەر چاوی تەواوی دنیا؟ بەزیاد نەبێ، بەلای ناخێرم ئابڕووم هەیە! لەگەڵ ئەوەی هامووشۆی گرووشنکام دەستپێکرد، دەزگیرانەتی و شەرەفم با بردی. ئەوە تێدەگەم. بۆ وا تەماشام دەکەی؟ چاو لێکە، سەرەتا بەو قەستە چووم بڕێکی بکوتم. بیستبووم و ئێستاش بۆم دەرکەوتووە، کە ئەو کابرا سەروانەی کارداری باوکم، یەکێ لە قەباڵەکانی قەرزەکەمی داوە بە گرووشنکا، تاکو بۆ ساندنەوەی شکایەتم لێبکا و تالاوم بە گەروودا بکا. دەیانویست بمترسێنن. بۆیە بە قەستی لێدانی چووم. بەر لەوە لە دوورەوە دەمناسی. لە یەکەم دیداردا نایەتە بەرچاو. سەبارەت بەو بازرگانە پیرەش کە ئێستا نەخۆش و کەلەلا کەوتووە، ئاگادار بووم؛ بەڵام ئەو بڕە پارەیەکی بۆ گرووشنکا لەپاش بەجێ دەما. هەروا ئاگاداریش بووم کە خرینگەی پارە ببیستێ ملی خۆی بۆ دەشکێنێ و کۆی دەکاتەوە و بە قەرز دەیدا بەموبەو و سوودێکی زۆریان لێدەستێنێ، کەڵەکوکوڵەکەکەشی لە ڕادە بەدەرە. بە قەستی لێدانی چووم و لەوێ مامەوە، ڕەشەبا هەڵیکرد و وەک چاوقووڵکە لە عەرزی دام. ئێستاش هەروا چاوقووڵکەمە و دەزانم هەموو شتێک تەواو بووە، منی تاعوون گرتووش هیچم بۆ نەماوەتەوە. لە نێو بازنەی زەماندا دەخولێمەوە و دەرباز بوونم مەحاڵە. ئەگەرچی چارەنووس کردوومی بە سواڵکەر، بەڵام ئەو کاتە سێ هەزار ڕۆبڵم لە گیرفاندا بوو. لەگەڵ گرووشنکا بە سواری چووین بۆ «ماکرۆیە» پازدە کیلۆمەتر لێرەوە دوورە. قەرجەکان هاتن و شامپانییان هێنا، هەموو لادێییەکانی ئەوێ و هەموو ژنان و کچانم ناچار کردشامپانی بخۆنەوە. سێ هەزار ڕۆبڵەکەم دا بە بادا. لە ماوەی سێ ڕۆژدا دەست بەتاڵ مامەوە، بەڵام بوومە پاڵەوان. پێتوایە پاڵەوان بە ئامانجی خۆی گەیشتبوو؟

لەلایەن ئەوەوە هیچ دیاردەیەک لەوە نەبوو. ئەو گرووشنکا بەستۆکەیە لەشێکی نەرموونۆڵی هەیە، سەر تا پاشی وایە. لاقی خرپنە و تەنانەت قامکە تیتۆلەی لاقیشی هەروا جوان و نەرم و سەرنجڕاکێشە. دیتم و ماچمکرد، هەر ئەوە بوو سوێندت بۆ دەخۆم! گوتی: «ئەگەر پێت خۆش بێ شووت پێدەکەم. خۆ دەزانی سواڵکەری و هیچت نییە. بەڵام بەڵێنم پێبدەی لێمنادەی و دەهێڵی بە کەیفی خۆم ڕایدەم، شووت پێدەکەم.» پێکەنی و هێشتاش هەر پێدەکەنێ.

دیمیتری فیۆدۆرۆویچ زۆر بە ڕقهەستاوی ڕاستەوە بوو، لەوە دەچوو مەست بێ، لەپڕ چاوی بوو بە گۆمی خوێن.

ـ هەر بە ڕاستیش دەتەوێ زەماوەندی لەگەڵ بکەی؟

«ئەگەر پێیخۆش بێ هەر لەڕێوە. ئەگەرپێیشی خۆش نەبێ، هەروا دەمێنمەوە و دەبمە نۆکەر و درگاوانی.» نەڕاندی: «ئالیووشا!» لە هەمبەریدا بە بێدەنگی ڕاوەستا، شانی گرت و دەستیکرد بە ڕاتڵەکاندنی. «ڕۆڵەگیان، بڕوا بکە ئەوانە هەمووی وڕێنەیە، وڕێنەیەکی بێمانا. چونکە لێرە تراژیدیا لە گۆڕێدایە. با ئەوەشت پێبڵێم. ڕەنگە مرۆڤێکی خوێڕی بم، هەوەسباز و داوێن پیس بم، بەڵام دیمیتری فیۆدۆرۆویچ ناتوانێ تاقە ساتێک دز و گیرفانبڕ بێ، کەوایە با پێتبڵێم دز و گیرفانبڕم. هەر ئەو ڕۆژە سەر لەبەیانی، ڕاست بەر لەوەی بچم بۆ لێدانی گرووشنکا، کاترینا ئیوانا ناردی بە دوامدا، زۆریش بە نهێنی (نازانم لەبەر چیش بوو، پێموایە هۆیەکی تایبەتی هەبوو.) داوای لێکردم بچم بۆ ناوەندی پارێزگا و سێهەزار ڕۆبڵ بە ڕێگەی پۆستەدا بۆ ئاگاتا ئیوانا بنێرم بۆ موسکۆ. جۆرێکیش کە هیچ کەسێ لەم شارە ئاگادار نەبێ. کە چووم بۆ سەردانی گرووشنکا، ئەو سێ هەزار ڕۆبڵەم لە گیرفاندا بوو، هەر ئەو پارەیەی لە ماکرۆیە خەرجمان کرد. دواتر وامنواند کە چووم بۆ پارێزگا، بەڵام ڕەسیدی پۆستەکەم نیشاننەدا. گوتم پارەکەم ناردووە و ڕەسیدەکەیت بۆ دێنم. هێشتاش کە هێشتایە بۆم نەبردووە و لەبیر خۆمم بردۆتەوە. ئێستا پێتوایە ئەمڕۆکە چووی بۆلای چیی پێ بڵێی باشە؟ «ئەو دەست بە سینگەوە دەگرێ و کڕنۆشت بۆ دێنێ،» پاشان لێت دەپرسێ، «ئەو پارەیە بوو

بەچی؟» دەکرێ پێی بڵێی «ئەو هەوەسبازێکی خوێڕی و هیچوپووچە و گڕی هەوەسی دانامرکێ. پارەکەشتی نەنارد، بردی لە ئاوی کرد. چونکە وەک بوونەوەرێکی پەست و خوێڕی خۆی پێ ڕانەگیرا.» بەڵام دەکرێ بشڵێی: «هەرچییەک بێ دز نییە. ئەو سێ هەزار ڕۆبڵەش، دەنێرێتەوە. خۆت بۆ ئاگاتا ئیوانای بەڕێ بکە. بەڵام بە منی گوتپێت بڵێم: ڕێزت لێدەگرێ و کڕنۆشت بۆ دەبا.» بەڵام ئەو لێت دەپرسێ: «ئەی پارەکە کوا؟»

ـ میتیا دەزانم خەمباری! بەڵام ئەوەندەش خەمبار و ناشاد نیی کە دنیات لە خۆت کردۆتە چەرمە چۆلەکە. بۆ لەخۆڕا داخ و دیق دەکەیە دڵی خۆتەوە؟

ـ چی، تۆ پێت وایە خۆم بە داروبەردا دەدەم چونکە ئەو سێ هەزار ڕۆبڵەم بۆ نادرێتەوە؟ ڕاست وایە. خۆم بە ئاوریشدا دەدەم. ئێستا لە دەستم نایە. بەڵام خۆ دنیا هەر ئاوا نابێ، نەمرم دەیدەمەوە. بەڵام ئێستا دەمەوێ بچم بۆلای گرووشنکا. گوێشم لێنییە، هەرچی دەبێ با ببێ.

ـ ئەی دەتەوێ چیبکەی؟

ـ دەبمە مێردی، ئەگەر پێی خۆش بێ دەبمە مێردی. کاتێکیش ئاشقەکانی دێن بۆ لای دەچمە ژوورێکی دیکە. کەوشەکانیان بۆ جووت دەکەم و دەیانسڕم. چاییان بۆ لێدەنێم. خزمەتیان دەکەم.

ئالیووشا بە دڵنیاییەوە گوتی: «کاترینا لەوە دەگا. دەزانێ ئەو گرفتارییە چەن گەورەیە و دەتبەخشێ. ئەو ڕۆحێکی گەورەی هەیە و دەزانێ چەندە کوڕێکی ناشاد و لێقەوماوی. ئەو خۆی ئەوە باش دەزانێ.»

میتیا بە چزەبزەیەکەوە گوتی: «خۆ لە هەموو شتێکم نابوورێ. براگیان شتێک هەیە کە هیچ ژنێک ناتوانێ لێی ببوورێ. دەزانی باشترین ڕێگەچارە چییە؟»

ـ چییە؟

ـ پێدانەوەی ئەو سێ هەزار ڕۆبڵە.

- جا لەکوێی بێنین؟ ئەها وەبیرم هاتەوە. من دوو هەزار ڕۆبڵم هەیە، ئیوانیش هەزار ڕۆبڵت دەداتێ. ئەوە دەبێتە سێ هەزار ڕۆبڵەکە، بیبە پێی بدەوە.

- ئەی ئێوە. ئەو سێ هەزار ڕۆبڵەی ئێوە چۆن و کەی بدەمەوە؟ جگە لەوەش تۆ تەمەنێکی وات نییە. بەڵام دەبێ ئەمڕۆکە - حەتمەن، حەتمەن - سڵاو و ڕێزی منی پێبگەیەنی، جا بە پارەکەوە یان بێپارە. چونکە ئیتر تاقەتم نەماوە. بارودۆخەکە ناجۆرە و بە بنبەست گەیشتووە. سبەینێ درەنگە. دەمەوێ بتنێرم بۆلای باوکم.

- بولای باوکم؟

- بەڵێ، لەپێشدا بچۆ بۆلای باوکم. داوای سێ هەزار ڕۆبڵی لێبکە.

- میتیا، ئاخر کوا ئەو پارەیە لە چنگ ئەو دەردێ؟ نایدا.

- وای دانێ کە دەیدا! دەزانم کە نایدا. ئالکسی دەزانی هیوابڕاوی چییە؟

- بەڵێ، ئەیچۆن نازانم!

- گوێ بگرە. بە شێوەیەکی یاسایی هیچم پێ قەرزدار نییە. هەتا ڕۆبڵی ئاخرم لێوەرگرتووە. ئەوە دەزانم. بەڵام خۆ ئەخلاقەن شتێکم پێ قەرزدارە، وانییە؟ خۆ دەزانێ بە بیست و هەشت هەزار ڕۆبڵی دایکم بوو دەستی بە کار کرد و سەد هەزاری پێ دەرهێنا. با پیاوەتی بکا و تاقە سێ هەزار ڕۆبڵی بدا بە من. بەو کارە گیانم لە دۆزەخ ڕزگار دەکا. دەبێتە کفارەی زۆربەی تاوانەکانی. ئەگەر ئەو سێ هەزار ڕۆبڵەم بداتێ - قەولی شەڕەف بە تۆ دەدەم - کۆتایی بە هەموو شتێک بێنم و ئیتر لێی نەبمە یەسکی نێو برین، وا دەڕۆم و ئیتر بە سەرو سۆراخم نەزانێ. بۆ دوایین جار ئەو دەرفەتەی پێدەدەم کە باوک بێ. پێی بڵێ خودا خۆی ئەو هەل و دەرفەتەی بۆ ڕەخساندووە.

- میتیا، پێموانییە باوکم بە هیچ شێوەیەک ئەو پارەیەی لێ هەڵوەرێ.

- دەزانم. زۆر چاک دەزانم. ئێستا، چەند ڕۆژ لەمەوبەر، ڕەنگە هەر دوێنێ یەکەم جار «بە شێوەیەکی جیددی» بۆم دەرکەوت کە گرووشنکا لە ڕاستیدا گاڵتە ناکا و دەیهەوێ شووم پێ بکا. باوکم باش لە خووخدەی گرووشنکا

دەگا، چاکیش ئەو پشیلە منجرە دەناسێ. کەوایە تۆ پێت وایە ئەو پارەیەم پێدەدا تاکو زەماوەندەکە سەر بگرێ، ئەویش لە کاتێکدا کە خۆی شێت و شەیدا بووە بۆی؟ دیسان خۆ هەر ئەوەش نییە. دەتوانم زۆر لەوە زیاترت بۆ باسبکەم. دەزانم هەر پێنج ڕۆژ لەمەوبەر سێ هەزار ڕۆبڵی لە بانک وەرگرتووە. کردوویەتە گەڵای هەزار ڕۆبڵی، خستوویەتە پاکەتێکی گەورەوە و پێنج دانە لاکومۆری لێداوە و بە تەنزیلی سوور بەستوویەتی. دیتووتە چۆنم ئاگا لێیە! لە سەر پاکەتەکە نووسیویە: «بۆ فریشتەکەم، گروشنگا، هەرکاتێ کە بێ بۆلام.» بە قەڵەمی جندۆکان لە بێدەنگی و خەڵوەتدا نووسیویەتی و کەس لە شوێنی شاردنەوەکەی ئاگادار نییە. جگە لە خزمەتکارەکەی ئیسمیر دیاکۆف کە بەقەد خۆی باوەڕی پێی هەیە. ئێستا ئەوە سێ چوار ڕۆژە چاوەڕوانی گرووشنکایە. بە هیوایە لەبەر پارە بچێ بۆ لای. هەواڵی لێ ناردووە، ئەویش وەڵامی بۆ ناردۆتەوە کە ڕەنگە بچێ. ئەگەر بشچێ بۆ لای ئەو پیرە، دەتوانم پاشان زەماوەندی لەگەڵ بکەم؟ ئێستا تێگەیشتی بۆ لێرە خۆم شاردۆتەوە و کێشکی چی دەدێرم.

ـ بۆ ئەو؟

ـ بەڵێ، بۆ ئەو. تۆماس لە ماڵی کڵفەتەکانی ئێرە وەتاغێکی هەیە. تۆماس لە ناوچەی خۆمانەوە هاتووە و لە گوردانەکەی ئێمەدا سەربازە. کار بۆ ئەوان دەکا. شەوانە کێشکچییە و بە ڕۆژیشدا خەریکی ڕاوی باڵندانە و لەو ڕێگایەوە بژیوی خۆی دابین دەکا.

ـ کەوایە تەنیا ئیسمیر دیاکۆف لەوە ئاگادارە!

ـ بەڵێ تەنیا ئەو، ئەگەر گرووشنکا بچێ بۆلای باوکم، زوو ئاگادارم دەکا.

ـ کەوایە هەر ئەویش سەبارەت بە پارەکە ئاگاداری کردی؟

ـ بەڵێ، زۆر بە نهێنی. تەنانەت ئیوانیش لە پارە و شتی ئاگادار نییە. باوکم دەیەوێ بە سەفەرێکی دوو سێ ڕۆژە ئیوان بنێرێ بۆ «چرماشنیا». کڕیارێکی بۆ دارستانەکە پەیدا کردووە و بڕیار وایە بە هەشت هەزار ڕۆبڵ لێی بکرێ. بۆیە بەردەوام داوا لە ئیوان دەکا بۆ ئەو سەفەرە ڕێ داگرێ. ئەو

کارەش دوو سێ ڕۆژی وەخت دەوێ. فیۆدۆر پاولۆویچیش هەر ئەوەی دەوێ. بو ئەوەی لە کۆڵیان کەوێ و گرووشنکا بتوانێ بێ بۆلای.

- کەوایە ئەمڕو چاوەڕوانی گرووشنکایە؟

میتیا لەپڕ هاواریکرد: «نا، گرووشنکا ئەمڕۆ نایە. نیشانەگەلێک هەیە. بە دڵنیاییەوە دەڵێم نایە. ئیسمیر دیاکۆفیش هەر لە سەر ئەو بڕوایەیە. باوکم ئێستا خەریکی بادە نۆشینە. لەگەڵ ئیوانی برام لە سەر سفرەیەک دانیشتوون، بچۆ بۆ لایان و داوای ئەو سێ هەزار ڕۆبڵەی لێبکە.» ئالیووشا لە جێگای خۆی ڕاستەوە بوو. چاوێکی لە ئەدگاری شێتانەی براکەی کرد و گوڕاندی: «تۆ دەڵێی چی؟» بۆ ساتێک وای بە زەین گەیشت کە دیمیتری فیۆدۆرۆویچ شێت بووە.

دیمیتری فیۆدۆرۆویچ بە وردی چاوێکی بە سەرتاپای براکەیدا گێڕا و گوتی: «چییە؟ من شێت نەبووم مەترسە. تۆ دەنێرم بۆلای باوکم و ئەوەی دەشیلێم لێی ئاگادارم. ئیمانم بە مۆجزەش هەیە.»

- مۆجزە؟

ـ بە مۆجزەی خودایی. خودا ئاگای لە دلم هەیە. دڵە شکاوەکەم و هیوابڕاوییەکەم دەبینێ. یەقینم هەیە کە نایەڵێ ڕووداوی تاڵ و ناخۆش بقەومێ. ئالیووشا ئیمانم بە مۆجزە هەیە. بڕۆ!

- دەچم. پێم بڵێ بزانم، هەر لێرە چاوەڕوانم دەبی؟

- ئەرێ، دەزانم ماوەیەک دەخایێنێ، ناتوانی بە بێ پێشەکی بڕۆیە پێشێ. ئەو ئێستا سەرخۆشە. سێ سەعات لەسەرت ماتڵ دەبم، چوار، پێنج، شەش، حەوت سەعات. بەڵام لەبیرت نەچێ ئەمڕۆ دەبێ بچی بۆلای کاترینا ئیواناش. ئەگەر نیوەشەویش بێ، بە پارەوە، یان بەبێ پارە، پێی بڵێی «ڕێزی بۆت هەیە و کڕنۆشت بۆ دەبا.» لە تۆم دەوێ ئەو شێعرەی حەتمەن بۆ بخوێنیتەوە:»

*«بە گیان و بە دڵ ڕێزت لێ دەگرێ*
*کڕنۆش دەبا بۆت هەتاکو دەمرێ»*

ـ میتیا! ئەگەرگرووشنکا ئەمڕۆکە هات چی ـ ئەمڕۆ، سبەینێ، یان دووسبەی؟

ـ گرووشنکا؟ دەیبینم. بە هەڵاتن دەچم پێشی پێ دەگرم.

ـ ئەی ئەگەر...؟

ـ ئەگەر، ئەگەرێکی تێدابێ کوشتنە. حەیاتی لێدەبڕم، بۆم تامڵ ناکرێ.

ـ کێ دەکووژی؟

ـ باوکم. خۆ گرووشنکا ناکووژم.

ـ براکەم، ئەوە دەڵێی چی؟

ـ ئاخ، نازانم... نازانم ڕەنگە نەشی کووژم، ڕەنگە بشی کووژم. مخابن ئەو لەو کاتەدا بەو ئەدگار و قەڵافەتەوە لەبەر چاوم دزێو و قێزەون دەبێ، لە بەرملە گڵاوەکەی و لووت و چاوە بێشەرمەکەی و چزەبزە حیزانەکەی بێزم هەڵدەستێ. ڕشانەوەم دێ. هەر لەوە دەترسم. هەر بۆیە لە تاقەتم بەدەرە و بۆم تامڵ ناکرێ.

ـ میتیا، من ئەوە دەچم، هیوادارم خودای مەزن خێرم بە دەستەوە بێنێ و ڕووداوی تاڵ نەقەومێ.

ـ منیش چاوەڕوان دادەنیشم، بەڵکوو ئەو مۆجزەیە ببینم. ئەگەر ئەو مۆجزەیەش وەڕاست نەگەڕا...

ئالیووشا لەگەڵ کۆڵێک فکر و خەیاڵ بەرەو ماڵی باوکی وەڕێ کەوت.

## (٦)

## ئیسمیر دیاکۆف

ئالیووشا کە گەیشتە ماڵی باوکی سفرەکە کۆ نەکرابۆوە. وەتاغی نان خواردنیان لە ماڵێدا هەبوو، بەڵام سفرەکەیان لە وەتاغی نشیمەن ڕاخستبوو. باوکی هێشتا لە سەر سفرەکە بوو. وەتاغەکە گەورە و ڕازاوە بوو. بە دابی کۆن داروديوارەکانیان نەخشاند بوو. کەلوپەلەکان سپی و قەدیمی بوون و سەرپۆشی سوور و هەورێشمینیان پێدا دابوون. لە نێوان پەنجێرەکاندا ئاوێنە هەڵواسرابوون، چوارچێوەکەیان سپی و زێڕکفت و بە شێوازی قەدیم کەندەکاری کرابوون. دیوارەکانی کاغەز دیواریی لێدرابوو و لە زۆر جێگاوە دڕابوو. دوو وێنەی گەورە بە دیوارەکەدا هەڵواسرابوو - یەکیان وێنەی شازادەیەک بوو کە سی ساڵ لەمەوبەر پارێزگاری ناوچەکە بوو، ئەوی دیکەشیان وێنەی ئۆسقوفێک بوو، کە ئەویش چەند ساڵ لەمەوبەر مردبوو. لە سووچی ڕووبەڕووی دەرگاکە چەن پەیکەرەی لێبوو کە شەوانە چرایەکیان لەبەردا هەڵدەکردن.... ئەویش لەبەر ڕووناکایی ماڵەکە بوو، نەک لەبەر باری ئایینییەکەی. فیۆدۆر پاولۆویچ درەنگ دەخەوت، سەعات سێ یان چواری نیوەشەو، شەوانەش بە نێو وەتاغەکەدا دەگەڕا، یان لە سەر کورسیلەیەکی لانکەیی دادەنیشت و بیری دەکردەوە. ئەوەشی بۆ بووبووە عادەت. هەمیشە بە تەنیا دەخەوت و خزمەتکارەکانی دەناردە وەتاغی خۆیان. بەڵام ئیسمیر دیاکۆف دەماوە و لە پێشخانەکە لە سەر قەرەوێڵەیەک ڕادەکشا.

کاتێ کە ئالیووشا چووە ژووری، شێویان خواردبوو، بەڵام قاوە و شەوچەلەیان تازە هێنابوو. فیۆدۆر پاولۆویچ پێیخۆش بوو دوای شام

شیرینیات بە براندییەوە بخوا. ئیوان فیۆدۆرویچیش لە سەر سفرەکە بوو و قاوەکەی قومەقومە دەخواردەوە. خزمەتکارەکان، یانی گریگۆری و ئیسمیر دیاکۆف لە سووچێک ڕاوەستابوون. لەوە دەچوو خانەخۆی و خزمەتکارەکان لە سەر نەشە بن. فیۆدۆر پاولۆویچ قاقای دەکێشا. ئالیووشا بەرلەوەی بگاتە ژووری گوێی لە قاقایەک بوو کە زۆر چاکی دەناسی و دەیزانی باوکی سەرەتای نەشەیەتی و هێشتا زۆری ماوە بە تەواوی سەرخۆش بێ. فیۆدۆر پاولۆویچ، کە بە دیتنی ئالیووشا زۆر خۆشحاڵ بوو، گوڕاندی: «ئەوەتا! ئەوەتا! هاتە ڕیزی خۆمانەوە. دانیشە. قاوە خۆراکی پارێزگارانە، زۆر گەرم و خۆشە. خولکی براندیت ناکەم. چونکە بەڕۆژووی. بەڵام قومێکت دەوێ، نا؟ وا چاکە پێکێکمان لەگەڵ بخۆیەوە، شەڕابێکی کۆنە و چاکمان هەیە. ئیسمیر دیاکۆف برۆ سەر گەنجەکە لە سەر ڕەفحەکەی دووهەمی دەستە ڕاستە. ئەوەش کلیلەکەی. لەبیرت نەچێ کامە دەڵێم!»

ئالیووشا نەیخواردەوە و داوای لێبوردنی کرد.

ـ قەیناکا. تۆ ناخۆی، مەخۆ؛ خۆمان دەیخۆینەوە. بەڵام سەبرکە شێوت خواردووە؟ ئالیووشا کە لە ڕاستیدا پەنچکێ نان و پیاڵەیەک شلەی لە چێشتخانەکەی باوە عابید خواردبوو، وەڵامی دایەوە: «بەڵێ، بەڵام پەرداخێک قاوە دەخۆمەوە.»

ـ ئافەرەم کوڕم! پەرداخێک قاوە دەخواتەوە. بەڵام دەبێ گەرمی بکەنەوە؟ نا، وادیارە هەر دەکوڵێ. قاوە زۆر خۆشە. بەتایبەت دەستاوی ئیسمیر دیاکۆف. ئیسمیر دیاکۆفی من بۆ لێنانی قاوە و ماسی، هەروەها شفتەی ماسی، زۆر شارەزایە. دەبێ ڕۆژێک بێی شفتە ماسییەکمان لەگەڵ بخۆی. بەر لە هاتن ئاگادارم بکە... بەڵام ڕاوەستە، مەگین ئەمڕۆ بەیانی پێم‌نەکوتی سەرین و دۆشەک و کەلوپەلەکانت هەڵگرە و وەرەوە بۆ ماڵێ؟ دۆشەکەکەت هێناوە؟ هە، هە، هە!

ئالیووشا بە زەردە خەنەیەکەوە گوتی: «نا، نەمهێناوەتەوە.»

ـ ئاخ، ئاخر ترسای، ئەمڕۆ بەیانی ترسای، نا؟ ئاخەر لە دەورت گەڕێم بۆ ورووژاندنی تۆ چیی‌دیکەم لە دەست دەهات. ئیوان، دەزانی کاتێ چاو لە چاوی پیاو دەبڕێ و بزەی دێتێ، ناتوانم چاوی لە سەر هەڵگرم؟ وەپێکەنینم دەخا. هۆگرییەکی زۆرم پێی هەیە. ئالیووشا ڕاوەستە با تەقدیست بکەم، تەقدیسی باوکێک.

ئالیووشا هەستا سەرپێ. بەڵام فیۆدۆر پاولۆوویچ لە خواستەکەی خۆی پاشگەز بۆوە. گوتی: «نا، نا. جارێ تەنیا خاچت دەکێشم. ئارام دانیشە: سەرگەرمییان هەیە بۆت. ئەویش بە شێوەی خۆت. وەپێکەنینت دەخا. کەری بەلعەم[12] لێرە وەقسە هات و لەگەڵمان دووا ـ وەرە ببینە چۆنیش قسە دەکا!»

دەرکەوت کە کەری بەلعەم مەبەستی ئیسمیر دیاکۆفی نۆکەری بوو. ئەو هێشتا لاوێک بوو، تەمەنی نزیکەی بیست و چوار ساڵ دەبوو. زۆر کەم‌بلێ و دوورە پەرێز بوو. وا نەبوو کە مرۆڤێکی حەیابەخۆ بێ. بە پێچەوانە، مرۆڤێکی لەخۆڕازی بوو. لەوەش دەچوو ڕقی لە هەموو کەس بێ. بەڵام پێویستە لێرەدا پەلە نەکەین و هێندێکی باس بکەین. گریگۆری و مارتا عاملاندیان. بەڵام گریگۆری گوتەنی «بەبێ هیچ چاوەڕوانییەک بارمان هێناوە. کوڕێکی دوورە پەرێز و خانەکی و دوور لە خەڵک و کۆمەڵ و تەریک بار هات، لەوە دەچوو باوەڕی بە هیچ شتێکی دنیا نەبێ. بە منداڵی پشیلەی دەگرت لە داری دەدا و پاشان بە ڕێوڕەسمێکی شیاو بە خاکی دەسپارد. پەڕۆیەکی وەک عەبا بە شانیدا دەدا، خۆی وەک قەشە لێ‌دەکرد و لە سەر گۆڕی پشیلەکە دوعای دەخوێند. هەموو ئەو کارانەشی لە خەڵوەتدا بە دزییەوە ئەنجامدەدا. گریگۆری جارێکیان لە سەر ئەو کارەی گرتی و چەخسێکی چاکی کوتا. ئەویش لە سووچێکدا خۆی مەڵاس کرد و هەتا حەوتوویەک نەهاتە دەرێ. گریگۆری بە مارتای گوت: «ئەو ڕموزنە من و تۆ بە هیچ نازانێ. نەک هەر من و تۆ هیچ کەس.» ئەمسا ڕاستەوخۆ بە کوڕەی

12- کتێبی پیرۆز، سیفری ژومارەکان، بەشی بیست و دووهەم. کەری بەلعەم وەزمان دێ، مەگین فریشتەی خودا لە خاوەنەکەی ببوورێ.

گوت: «تۆ بنیادەمی؟نا، تۆ بنیادەم نیی. تۆ لە چڵکاوی حەمام دەرپەڕیوی. ئەرێ لە چڵکاوی حەمام.» دواتر مەعلووم بوو کە ئیسمیر دیاکۆف ئەو قسانەی قەت لە دڵ دەرنەچووە و دڵی لە گریگۆری هێشاوە. گریگۆری خوێندنەوە و نووسینی فێر کرد و کاتێ تەمەنی گەیشتە دوازدەساڵان دەستیکرد بە فێرکردنی کتێبی پیرۆز، بەڵام ئەم فێرکردنەی بە هیچ کوێ نەگەیشت و لە وانەی دووهەم یان سێهەمدا، کوڕە لەپڕ دەستی کرد بە پێکەنین.

گریگۆری کە لە ژێر چاویلکەکەیەوە بە چاوی هەڕەشە تەماشای دەکرد، پرسیی: «بەچی پێدەکەنی؟»

- بەهیچ، مێژووی پیرۆز دەڵێ، خودا ڕووناکیی ڕۆژی یەکەم خولقاند و خۆر و مانگ و ئەستێرانی ڕۆژی چوارەم. ئەی ڕۆژی یەکەم ڕووناکی لە کوێوە هات؟

گریگۆری تووشی سەرسووڕمان بوو. کوڕە بە مامۆستاکەی پێکەنی، وەک ئەوەی بەزەیی پێیدابێ. گریگۆری خۆی پێ ڕانەگیرا. گوڕاندی: «پێت دەڵێم لە کوێوە!» شەپلاخەیەکی خێواندە لاڕوومەتی، کوڕە بێ ئەوەی ورتەی لێوە بێ شەپلاخەیەکی نۆشی گیان کرد، بەڵام دیسان چەند ڕۆژ خۆی خزاندە قوژبنێک و مات بوو. دوای حەوتوویەک یەکەم هێرشی ئەو نەخۆشییە ڕووی تێکرد. یانی فێ. کە هەتا ئاخری تەمەنی هەر لەگەڵیدا بوو. چەن وەخت جارێک سەرودڵی لێدەهات. فیۆدۆر پاولۆویچ کاتێ لەوە ئاگادار بوو، بە چاوێکی دیکە تەماشای کوڕەی دەکرد. تا ئەو کاتە هیچ سەرنجێکی نەدابوویە، ئەگەرچی قەتیش سەرکۆنەی نەدەکرد و هەرکاتێ چاوی پێی دەکەوت کوپکێکی پێدەدا. هێندێ جار کە کەیفی سازدەبوو، بڕێکی شیرینی بۆ دەنارد. بەڵام کاتێک لە نەخۆشییەکەی ئاگادار بوو، هۆگرییەکی تەواوی دەرهەق بە ئەو لە خۆی نیشاندا و هەستی بە بەرپرسیارەتی دەکرد. بۆیە ناردی بە دوای پزیشکدا و ویستی ماریجەی بکا، بەڵام نەخۆشییەکەی ماریجەی نەهات، پزیشک لە چارەی نەخۆشییەکەی دۆشدامان. بە شێوەیەکی

مامناوەندی مانگێ جارێک فێی لێدەهات. بەڵام لە کاتی جۆراوجۆردا. سەرودڵ لێهاتنەکەی هەمیشە وەک یەک نەبوو، جارێ وابوو سووک بوو، جارێ وابوو زۆر بەسەختی لێی دەهات. فیۆدۆر پاولۆویچ تەمبێ کردنی جەستەییی لە گریگۆری قەدەغە کرد و ماوەیەک بردی بۆلای خۆی. هەروەها نەیهێشت گریگۆری دەرسی پێبڵێ. رۆژێکیان کە کوڕە تەمەنی گەیشتبووە پازدە ساڵان، فیۆدۆر پاولۆویچ دیتی لەلای کتێبخانەکەی ڕاوەستاوە و لە پشت جامخانەکەوە ناوی کتێبەکان دەخوێنێتەوە. فیۆدۆر پاولۆویچ هێندێکی کتێب هەبوو ـ زیاتر لە سەد بەرگ ـ بەڵام هیچکەس نەیدیبوو کتێب بخوێنێتەوە. هەر لەڕێوە کلیلی کتێبخانەکەی دایە و گوتی: «ها، بیگرە، بەکەیفی خۆت بیخوێنەوە. لە ئێستاوە تۆ کتێبداری خۆمی. خەریکی خوێندنەوە بی زۆر لەوە چاکترە لە حەوشەدا خەریکی پیاسە و ڕاوێچکە کردن بی. ها، ئەوە بیخوێنەوە» فیۆدۆر پاولۆویچ کتێبی (شەوانە لە مەزرای نزیک دیکانکا[١٣])ی دایە دەستی.

خوێندییەوە، بەڵام پێی خۆش نەبوو. بۆ جارێکیش بزەی نەهاتێ و بە گرژ و مۆنی کتێبەکەی تەواو کرد.

فیۆدۆر پاولۆویچ پرسیی: «چییە؟ پێکەنینی نییە؟»

ئیسمیر دیاکۆف هیچی نەگوت.

ـ گەمژە، جوابم بدەوە!

کوڕە بە چزەبزەیەکەوە، منجاندی: «هەمووی درۆ و دەلەسەیە.»

ـ کەوایە برۆ بۆ دۆزەخ، تۆ مرۆڤێکی پەست و خوێڕیی. سەبرکە، ها، ئەوە «مێژووی گشتی» ئیسماراگدۆفە بیخوێنەوە. هەمووی ڕاستە.

بەڵام ئیسمیر دیاکۆف دە لاپەڕەی لە کتێبەکەی ئیسماراگدۆف نەخوێندەوە تاقەتی لێی بەسەرچوو. هەر بۆیە دیسان کتێبخانەکە داخرایەوە.

زۆری نەخایاند، مارتا و گریگۆری بە فیۆدۆر پاولۆویچیان ڕاگەیاند: ئیسمیر دیاکۆف وردە وردە خەریکە بە قێز و بێز دەبێ و خووخدەیەکی

---

13- یەکەمین کۆمەڵە چیرۆکی نیکۆلای گۆگول، کومێدیا نووسی بلیمەتی ڕووسی (١٨٠٩ ـ ١٨٥٢)

سەیر و سەمەرەی لێ پەیدا بووە. کە چێشتەکەی لەبەر دەم دادەنێین، دەستدەداتە کەوچکەکە و چاو لە چێشتەکە دەبڕێ، سەرەتا چێشتەکە دەباتە پێشێ و کەوچکەکە پڕ دەکا و دەیداتە بەر ڕۆشنایی.

گریگۆری لێی دەپرسێ: «چییە، قالۆنچەیە؟»

مارتا دەڵێ: «ڕەنگە مێشی تێدا بێ.»

ئیسمیر دیاکۆفی لاو جواب ناداتەوە، بەڵام هەر چێشتێکی بۆ دادەنێی، ئەو کارە دەکا. جنچکە گۆشتێک بە چنگاڵەکەی دەگرێ و دەیداتە بەر ڕۆشنایی، زۆر بە وردی چاوی لێدەکا و دوای دڵنیا بوون بڕیار دەدا بیخاتە دەمیەوە.

گریگۆری چاوێکی لێدەکا و دەمنجێنێ: «پەکو، لەو ئەداو ئەتوارە ئاغاواتییانەیە!»

فیۆدۆر پاولۆویچ کە ئەوەی بیست خێرا بڕیاریدا بیکاتە ئاشپەزی خۆی و بۆ فێربوون ناردی بۆ مۆسکۆ. ئیسمیر دیاکۆف چەن ساڵ لەوێ مایەوە و بە سەر و پۆتراک و قەڵافەتێکی گۆڕاوەوە هاتەوە. لەچاو تەمەنی زۆر پیری نیشاندەدا. ڕوخساری زەرد و پڕ لە چرچ و لۆچ بووبوو، کۆستەش بوو. گۆڕانکاری بە سەر خووخدە و ئاکاریدا نەهاتبوو. وەک پێشوو پارێزی لە خەڵک دەکرد، پێی خۆش نەبوو لەگەڵ هیچ کەس قسە بکا. لە مۆسکۆش هەر ئاوا بێدەنگ بوو. دڵی بە مۆسکۆ نەکرابۆوە و پێی خۆش نەبوو. زۆر کەم بۆ دیتنی شاران و ئەملاوئەولا دەچوو، بەڵام بێدەنگ و دڵتەنگ هاتە دەرێ. لە لایەکی ترەوە، تەرپۆش و پاک و خاوێن، بە جلوبەرگی تازەوە لە مۆسکۆ هاتەوە. ڕۆژی دوو جار زۆر بە وازی وازییەوە جلەکانی دەتەکاند و شەی دەکێشان. زۆری پێخۆش بوو پۆتینە چەرمینەکانی بە بۆیاغی ئینگلیزی بریقەدار بکا و وەک ئاوێنە بدرەوشێتەوە. ئەو بووبە ئاشپەزێکی کەم وێنە. فیۆدۆر پاولۆویچ هەقدەستێکی بۆ بڕییەوە، کە هەتا دوایین کوپکی دەدا بە جل و بەرگ و خەمیر و عەتر و ئەو جۆرە شتانە. بەڵام لەوە دەچوو بەقەد پیاوان ڕقی لە ژنانیش بێ؛ قەت لێیان نزیک نەدەبۆوە. فیۆدۆر پاولۆویچ بە چاوێکی دیکە تەماشای دەکرد. فێ لێهاتنەکەی زیاتر بووبوو. ئەو ڕۆژانەی کە

نەخۆش دەکەوت مارتا چێشتی لێدەنا بەڵام فیۆدۆر پاولۆویچ ئیشتیای نەیدەبرد.

فیۆدۆر پاولۆویچ، بە لاچاوێک تەماشای ئیسمیر دیاکۆفی ئاشپەزی کرد و پرسیی: «بۆ نەخۆشییەکەت قورستر بووە؟ پێت خۆشە ژن بێنی؟ دەتەوێ ژنێکت بۆ پەیدا بکەم؟»

ئیسمیر دیاکۆف لە داخانا ڕەنگی هەڵبزرکا و جوابی نەدایەوە. فیۆدۆر پاولۆویچ ئیتر لەسەری نەڕۆیشت و وازی لەو شتە هێنا. گرینگ ئەوە بوو باوەڕێکی تەواوی بە ڕاست و دروستیی ئاشپەزەکەی بوو. خوداوڕاستان ڕۆژێک کە فیۆدۆر پاولۆویچ مەست بوو، سێ گەڵای سەد ڕۆبڵی کە تازە بە دەستی گەیشتبوو، فڕێیدا نێو خۆڵ و خاکی حەوشەکەوە. ڕۆژی دوایی تێگەیشت کە پارەکەی لێ ونبووە. بەپەلە پڕووزێ و هەڵەپڕووکێ خەریکی پشکنینی گیرفانی بوو، کەچی تەماشای کرد سێ گەڵاکە لە سەر مێزەکە بوون. لە کوێوە هاتبوون؟ ئیسمیر دیاکۆف ڕۆژی پێشوو دۆزیبوونییەوە و هێنابووی لە سەر مێزەکە دابنابوو.

فیۆدۆر پاولۆویچ گوتی: «کوڕەکەم، کەسم وەک تۆ نەدیوە،» پاشان دە ڕۆبڵی پێدا. ئەوەشمان لەبیر نەچێ، نەک هەر بڕوای بە ڕاست و درووستییەکەی بوو، بەڵکو لەبەر هۆیەک خۆشیشی دەویست. ئەگەرچی ئەو هەروا بە گرژی و ڕووتاڵی چاوی لە فیۆدۆر پاولۆویچ دەکرد و هەروا بێدەنگ بوو. بە دەگمەن قسەیەکی دەکرد. ئەگەر لەو کاتەدا ئەو پرسیارە بە زەینی کەسێک بگەیشتایە کە ئەو پیاوە لاوە هۆگریی بە چییە و چیی لە دڵدایە، مەحاڵ بوو تێی بگەن. لەگەڵ ئەوەشدا هێندێ جار لە ماڵێ لە جێی خۆی ڕادەوەستا. یان تەنانەت لە حەوشە یان لە سەر شەقام، دە دەقیقەیەک لە فکر و خەیاڵدا نوقم دەبوو و بە بێدەنگی لەجێی خۆی نەدەجووڵا. قەڵافەتی لەگەڵ ڕوخساری، هەرکەسێ لێکی بدایەتەوە، بۆی دەردەکەوت کە هیچ بیرۆکە و خەیاڵێکی تێدا نییە، بەڵکو جۆرێک کاس و وڕیی تێدایە. تابلۆیەکی

سەرنج ڕاکێشە لە کرامسکۆ[14]ی وێنەگر بە ناوی «کاسووڕ» لێڕەوارێکە لە زستاندا و لە ڕێگای لێڕەوارەکەدا و لەوپەڕی تەنیاییدا، لادێییەکی سەرگەردان بە کەپەنکی دڕاو و کەوشی دارینەوە، جۆرێک ڕاوەستاوە دەڵێی لە ئەندێشەدا نوقم بووە. بەڵام ئەو بیرناکاتەوە، بەڵکو «وڕوکاس» بووە. ئەگەر دەستیان لێدایە وا دادەچڵەکا و تەماشای دەکرد دەتگوت لە خەوێکی قووڵ ڕاچەنیوە و تووشی حەپەسان بووە. ڕاستە خێرا وەخۆ دەهاتەوە. بەڵام ئەگەر لێیان بپرسیایە بیرت لەچی دەکردەوە، هیچی وەبیر نەدەهاتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو کارتێکەرییەی کاتی کاسووڕ بوون سەرتاپای دادەگرت و وێدەچوو لە دەروونی خۆیدا بە نهێنی مابێتەوە، ئەو کارتێکەرییانەی بەلاوە شیرین بێ و ئەوانە بێگومان و بە شێوەیەکی هەست پێنەکراو و تەنانەت بێ ئیختیار لە ناخی خۆیدا کۆ کاتەوە. چۆن و بۆ، ئەو خۆشی نازانێ. لەوانەیە کتوپڕ دوای ساڵانێکی زۆر کۆ کردنەوەی ئەو کارتێکەرییانە، دەست لە هەموو شتێک هەڵگرێ و بۆ دەرباز بوونی گیانی بچێ بۆ زیارەتی ئوورشەلیم. یان لەوانەیە لە ناکاو شوێنی لە دایکبوونی خۆی ئاور تێبەردا، یان لەوانەیە هەردووکیان بکا. لە نێو لادێییەکاندا زۆرن ئەو کەسانەی ئاوا کاس ووڕن. کەوایە ئیسمیر دیاکۆفیش یەکێک لەوانە بوو، لەوانەیە خۆشی نەزانێ بۆ ئەو کارتێکەرییانەی بە چنۆکی و ڕەزیلی لە ناخیدا کۆ دەکردەوە؟

14- ئای ـ ئین کرامسکۆ، وێنەگر و تەڕاحی ڕووسی (١٨٨٧ـ ١٨٣٧)

(٧)

# چەلەحانێ

بەڵام کەری بەلعەم کتوپڕ وەقسە هات. باسەکەش شتێکی سەیر و سەمەرە بوو. گریگۆری ئەو ڕۆژە سەرلە بەیانی چووبووە بازاڕ، چیرۆکی سەربازێکی ڕووسیی لە زمان لۆکیانۆفی بەقاڵ بیستبوو، گوایە ڕۆژنامەکانی ئەو ڕۆژە نووسیبوویان سەربازێک لە ناوچەیەکی دوورە دەستی ئاسیا کەوتۆتە زیندانەوە و پێی دەڵێن دەبێ حاشا لە دینی مەسیح بکەی و موسڵمان بی، دەنا مەرگێکی خێرا و پڕ ئازار و ئەشکەنجەت لەپێشە. بەڵام سەربازەکە حاشا لە دینەکەی خۆی ناکا، ئەشکەنجەی دەکەن. بە زیندوویی پێستی لەشی دادەماڵن و ئەو لەگەڵ مەتح و دۆعا کردن و بەهەق زانینی دینی مەسیح گیانی دەردەچێ. گریگۆری لە سەر سفرەکە ئەو باسەی گێڕاوە. فیۆدۆر پاولۆویچ پێیخۆش بوو دوای شام و شەوچەلە قسە بکات و پێبکەنێ. تەنانەت ئەگەر لەگەڵ گریگۆریش بوایە. ئەمڕۆ هەر لە دوانیوەڕۆوە کەیفی ساز بوو. لەگەڵ ئەوەی قوم قوم براندی دەخواردەوە گوێی لە باسەکە گرتبوو. گوتی: «دەبێ ئەو سەربازە بکرێتە قەدیس و پێستەکەی بەرن بۆ کلێسەیەک. ئەو کارەش دەبێتە هۆی ئەوەی پۆل پۆل خەڵک تێ‌ڕژێن و پارە بێنن.

گریگۆری کە دیتی فیۆدۆر پاولۆویچ بەو چیرۆکە تێکنەچووە و هەروا لە سەر بەزم و پێکەنینی خۆیەتی، گرژ بوو زەردەیەکی گرت. ئیسمیر دیاکۆف زۆربەی کات دوای شام ڕادەوەستا و چاوەڕێی فەرمان دەبوو، لەو ڕۆژەوە ئیوان هاتبۆوە، بۆ شارەکەمان ئەوە کاری بوو.

فیۆدۆر پاولۆویچ ئاگای لە بزەکەی ئیسمیر دیاکۆف بوو و دەیزانی بە گریگۆری پێکەنیوە، پرسیی: «ئەوە بەچی پێدەکەنی؟»

ئیسمیر دیاکۆف بە دەنگێکی بەرز و چاوەڕوان نەکراو جوابی داوە: «قوربان بڕوای من ئەوەیە ئەگەر ئەو سەربازە کارەکەی پیرۆزە و جێگای ڕێزبوو، بە بڕوای من قوربان، تاوان نەدەبوو ئەگەر لەو تەنگەژیەدا حاشا لە ناوی مەسیح و مەسیحی بوونی خۆی بکا. چونکە دەیتوانی گیانی خۆی ڕزگار بکا و بە چاکەکاری لە پاشماوەی تەمەنیدا کەفارەتی ئەو ترسەنۆکییەی بداتەوە.»

فیۆدۆر پاولۆویچ گوتی: «چۆن تاوان نەبوو؟ قسەی قۆڕ دەکەی، هەر لەبەر ئەو قسەیەت ڕاست دەتبەنە دۆزەخ و وەک پەز دەتبرژێنن.»

هەر لەو جێگایەدابوو کە بە ئالیووشای گوت دانیشێ و بە هاتنەکەی کەیفی ساز بوو و گوتی: «خەریکین لە سەر ئەو باسە مشتومڕ دەکەین کە تۆ پێت‌خۆشە.»

ئیسمیر دیاکۆف بە لەبزێکی قورس و قایم گوتی: «پەزی چی قوربان شتی وا هەر نییە، ئەوێ کوا جێگای سوتاندن و برژاندنە؟ هەر نابێ واش بێ، ئەگەر وایە قوربان لەگەڵ عەداڵەت یەک ناگرێتەوە.»

فیۆدۆر پاولۆویچ دەستێکی کێشا بە ڕانی ئالیووشادا و هەر بە نەشەوە گوڕاندی: «مەبەستت لە "عەداڵەت و..." چییە؟»

گریگۆری پەڕییە نێو قسەکانی: «ئەوە گەوج و نەفامە، خۆ تێناگا!» پاشان بە ڕقەوە چاوێکی لە ئیسمیر دیاکۆف کرد.

ئیسمیر دیاکۆف، زۆر لەسەرەخۆ، جوابی دایەوە: «گریگۆری واسیلیەویچ، زۆر پێی زیادی دامەکێشە و کارت بە سەر گەوج و نەفامیی منەوە نەبێ، چاکتر وایە سەرنج بدەیە ئەو شتە، کاتێک دوژمنانی نەژادی مەسیح بمخەنە بەندیخانە و داوام لێبکەن دەست لە دینەکەی خۆم (دینی مەسیح) هەڵگرم، بە تەواوی هەقم هەیە ئەقڵی خۆم وەکارخەم، تاوانیش نییە.»

فیۆدۆر پاولۆویچ نەڕاندی: «ئەوەت پێشتر گوت. لەخۆڕا قسەی زیادی مەکە، بیسەلمێنە.»

گریگۆری بە لەبزێکی قیناوی و لێوەکورۆژێ گوتی: «بەچکە ئاشپەز!»

- بەڵام بەچکە ئاشپەز بوون، دیسان پێی زیادی دامەکێشە، بەبێ ئەوەی سووکایەتی بە من بکەی، سەرنج بدە گریگۆری واسیلیەویچ! چونکە بێتوو من بەو ئەشکەنجەگەرانە بڵێم،«نا، من مەسیحی نیم و لە دینی خۆم وەردەگەڕێم.» ئەو کاتە خێرا بە هۆی عەدڵی باڵای خودا، بە لە دین وەرگەڕاوم دێننە ئەژمار و وەدەر دەنرێم. چونکە بە کافرم دەزانن. بەجۆرێ کە هەر لەوکاتەدا، نەک ئەو کاتەی بە دەنگێکی بەرز دەیڵێم، بەڵکو کاتێک کە لە بیری گوتنەکەشیدا بم، بەر لەوەی یەک لە چواری چرکەش تێپەڕیبێ، لە کلێسە وەدەر دەنرێم. گریگۆری واسیلیەویچ وایە یان نا؟

بە ئاشکرایی گریگۆریی کردە بەر دەنگی خۆی، بەڵام لە ڕاستیدا وەڵامی پرسیارەکانی فیۆدۆر پاولۆویچی دەدایەوە و لەوە بە جوانی ئاگادار بوو، هەر بەقەستی وای نواند کە گریگۆری ئەو پرسیارانەی کردووە.

فیۆدۆر پاولۆویچ لە ناکاو گوڕاندی: «ئیوان، داخۆت دانەوێنە و گوێچکەت بێنە پێشێ شتێکت پێبڵێم. ئەو هەموو ئەوانەی لەبەر تۆ هێناوەتە گۆڕێ. دەیەوێ ئافەرینی پێبڵێی و سپاسی لێبکەی. ئافەرینی پێبڵێ دەی!»

ئیوان فیۆدۆرۆویچ زۆر بە جیددی گوێی بۆ سرتەی باوکی ڕاگرتبوو.

فیۆدۆر پاولۆویچ دیسان گوڕاندی: «سەبرکە ئیسمیر دیاکۆف، تاوێ بێدەنگ بە. ئیوان دا دیسان گوێچکەت بێنە پێشێ.»

ئیوان فیۆدۆرۆویچ بە ئەدگارێکی تەواو نبەوەشەییەوە سەری بردە پێشێ.

- بەقەد ئالیووشام خۆش دەوێی، پێتوانەبێ خۆشم ناوێی. تۆزێکت براندی بۆ تێکەم؟

ئیوان فیۆدۆرۆویچ گوتی: «بەڵێ» چاوێکی لە باوکی کرد و لە دڵی خۆیدا گوتی: «بەڵام تۆ تا ڕادەیەک سەرخۆشی.» زۆر بە وردی چاوی لە ئیسمیر دیاکۆف بڕیبوو.

گریگۆری هەڵیدایە: «دیارە تۆ لە دین وەرگەڕاوی. گڵاوی هیچوپووچ. چۆن دەوێری دوای ئەوە دەلیل و بەڵگە دێنییەوە، ئەگەر....»

فیۆدۆر پاولۆویچ قسەکەی پێ بڕی؛ «گریگۆری، سەرزەنشتی مەکە، سەرزەنشتی مەکە.»

- گریگۆری واسیلیەویچ، باشترە تۆزێ سەبر بکەی، تەنانەت ئەگەردەتوانی ماوەیەکی زۆر کورت گوێ بگرە. چونکە هێشتا قسەم تەواو نەبووە. چونکە، قوربان هەر ئەو ساتەی لە دین وەردەگەڕێم، هەر لەو ساتەشدا، قوربان، بە تەواوی وەک کافرم لێدێ و ناوی مەسیحیم لە سەر لادەچێ و لەو دینە دەشۆرێمەوە، وانییە قوربان؟

فیۆدۆر پاولۆویچ کە زۆرتر بە تامەزرۆییەوە، قوم قوم لە پێکەکەی دەنۆشی، گوتی: «کوڕی چاک زووکە قسەکەت تەواو بکە.»

- ئەگەر ئیتر مەسیحی نەبم، ئەو کاتە دوژمنان لێیان دەپرسیم مەسیحیم یان نیم. درۆم نەکردووە، چونکە بە هۆی فکرەکەوە، بەرلەوەی وشەیەک بە دوژمنەکانم بڵێم، خودا خۆی منی لە مەسیحی بوون ڕزگار کردووە. ئەگەر لەدین دەرچووبێتم، چۆن و بە کام عەداڵەت، لەبەر حاشا کردن لە مەسیح، لەو دنیا بە تاوانبار دەناسرێم، کاتێک بە هۆی فکرەوە. بەرلەوەی حاشا لە دینی مەسیح بکەم، لە دینی مەسیح وەرگەڕاوم؟ ئەگەر ئیتر مەسیحی نەبم، ئەو کاتە ئیتر دەتوانم دەست لە دینی مەسیح هەڵگرم، چونکە ئەو کاتە حاشا لەچی بکەم. گریگۆری واسیلیەویچ، کێ تاتارێکی کافری، تەنانەت لە بەهەشت بە تاوانبار زانیوە، چونکە کاتی لەدایکبوون مەسیحی نەبووە؟ کێ بەو هۆیە سزای دەدا؟ خۆ مانگا دووجار کەوڵ ناکرێ! چونکە کاتێ ئەو تاتارە دەمرێ، وای دانێین خودای مەزن ئەو بە بەرپرسیش بزانێ، پێوایە کەمترین سزای بۆ لەبەر چاو دەگرێ. (چونکە دەبێ سزا بدرێ) چونکە ئەگەر ئەو کافرێکی گڵاوە و لە دایکێکی کافر بووە، تاوانێکی نییە و نابێ سەرکۆنە بکرێ. دڵنیام خودای گەورە ناتوانێ دەستی تاتارێک بگرێ و بڵێ ئەوە مەسیحییە؟ ئەگەر

وابێ مانای ئەوەیە خودا ڕاست ناکا. مەگین دەکرێ خودای ئاسمان و زەوی، تەنانەت یەک وشەی درۆی بەزاردا بێ؟

گریگۆری سەیر حەپەسابوو، چاوی لە ئیسمیر دیاکۆف بڕیبوو و هەردووک چاوی وەک کەشکە فەریکە دەرپەڕاندبوو. ئەگەرچی بە تەواوی قسەکانی ئەوی بۆ نەدەچووەوە سەریەک، بەڵام شتێکی لە قسە هەللەق مەللەقەکانی هەڵکڕاند و لەجێی خۆی ڕاوەستا. وا کاس بووبوو دەتگوت سەری بە دیواردا کێشاوە. فیۆدۆر پاولۆویچ پەرداخە براندییەکەی هەڵقوڕاند و دای لە قاقای پێکەنین.

ـ ئالیووشا! ئالیووشا! لە جوابی ئەو قسانەدا چیت بۆ گوتن پێیە؟ ئەی سەفسەتەچی! ئیوان ، حەتمەن ئەو لە جێگایەک لەگەڵ یەسووعییان بووە. ئاخ، ئەی یەسووعیی چەپەڵ، کێ ئەوەی فێر کردووی؟ بەڵام تۆ سەفسەتەچییی دەغەڵ، قسەی قۆڕ کاوێژ دەکەی، قسەی قۆڕ، قسەی قۆڕ. گریگۆری تۆ خەمت نەبێ و مەگری، هەر ئێستا پەڕوپۆی پێوە ناهێڵین. ئەی کەرە. بیلێ بزانم لە هەمبەر ئەشکەنجەگەرانتدا ڕەنگە هەق بەتۆ بێ. بەڵام لە دڵی خۆتدا حاشات لە ئیمانت کردووە. خۆت دەڵێی هەر ئەو کاتە لە دین وەرگەڕاوی. ئەگەر لە دینیش وەرگەڕێی دۆزەخییەکان چەپڵەت بۆ لێنادەن. یەسووعییە جوانکیلەکەم، لەو بارەوە دەڵێی چی؟

ـ گومانی تێدا نییە قوربان، کە لە دڵەوە حاشام لە ئیمانم کردووە، بەڵام قوربان، تاوانێکی تایبەتم ئەنجام نەداوە. ئەگەر تاوانیش بێ، تاوانێکی ئاساییە و شتێکی وا نییە قوربان.

ـ چۆن شتێکی وا نییە و تاوانێکی ئاساییە کاکی هێژا؟

گریگۆری وستێکی لێکرد: «ئەی مەلعوونی نەگبەت، درۆ دەکەی!»

ئیسمیر دیاکۆف، لەسەرخۆ و چاو قایم، دەیزانی سەرکەوتوو بووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دڵفراوانانە بە سەر تووڕەیی خۆیدا زاڵبوو. لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: «چاو لێکە گریگۆری واسیلیەویچ. لە کتێبی پیرۆزدا هاتووە: ئەگەر ئیمانت ببێ، تەنانەت بەقەد دەنکە هەرزنێکیش، فەرمان بە چیا بدەی

بڕوا بۆلای دەریا، بەبێ هیچ بیانوو هێنانەوەیەک وەڕێ دەکەوێ. دەی باشە، گریگۆری واسیلیەویچ، ئەگەر من بێ ئیمانم و تۆش ئەوەندە ئیمانداری و لەپەستا جنێوبارانم دەکەی، یاڵلا فەرمان بەو کێوە بدە نەک بۆلای زەریا، چونکە دوورە، با بێ بۆلای ئەم چۆمەڵە بۆگەنەی نێو باخەکە. گەورەم! ئەو کاتە تێدەگەی لە جێگای خۆی چورتە ناکا. ئێستا جەنابی هێژا هەرچەندە بە سەر ئەو کێوەدا بگوڕێنی، لەجێی خۆی ناجمێ و دەردەکەوێ کە تۆ جەنابی گریگۆری واسیلیەویچ ئیمانێکی دروست و حیسابیت نییە و تەنیا دەزانی جنێو بدەی و بگوڕێنی. هەمووشمان ئەوە دەزانین، نەک هەرتۆ، بەڵکو هیچ کەس لە دنیادا، لە بالاترین کەسەوە بگرە هەتا خوارووترین کەس لەم زەمانەدا ناتوانێ چیا بەرەو دەریا ڕادا ـ جگە لە کەسێک، یان ڕەنگە بەلانی زۆرەوە دوو کەس، کە وێدەچی ئەوانیش لە شوێنێکی شاراوەی بیابانی میسر مژوولاهی ڕزگار کردنی ڕۆحی خۆیان بن، بۆیە ناتوانی ئەوانیش وەدۆزی ئەگەر واش بێ و ئەگەر ئەو هەموو خەڵکەی دیکە ئیمانیان نەبێ، بڵێی خودا ئەو عالەمە سزا بدا و غەزەبیان لێبگرێ؟ یانی تەواوی خەڵکی سەرگۆی زەوی ـ جگە لە دوو کەسی چلەگر و گۆشەنشین لە بیابان، ناکەونە بەر ڕەحمەتی بێپایان؟ کەوایە هیوادار دەبم هەرچەند جارێک وە شک کەوتبێتم، بە هەڵوەراندنی فرمێسکی پەشیمانی دەبەخشرێم.»

فیۆدۆر پاولۆویچ سەرخۆش و بە نەشە گوڕاندی: «سەبرکە! کەوایە تۆ پێت وایە دوو کەسن، کە دەتوانن شاخ و کێو لە جێی خۆیان بگوێزنەوە؟ ئیوان یادداشتی کە، بینووسە. بە بێ کەم و زیاد ئیمانی ڕووسییەکی ڕەسەنە!»

ئیوان فیۆدۆرۆویچ بە بزەیەکی پڕ لە ڕەزایەتەوە گوتی: «لەوەی کە تایبەتمەندیی ئیمانی خەڵک وایە، هەق بە تۆیە.»

ـ تۆ قەبووڵتە؟ ئەگەر تۆ قەبووڵت بێ، کەوایە دەبێ وابێ. ڕاستە، مەگین وانییە ئالیووشا؟ بەبێ هیچ کەم و زیادێک خاوەن ئیمانێکی ڕووسیی ڕەسەنە، مەگین نا؟

ئالیووشا قورس و قایم گوتی: «نا، ئیسمیر دیاکۆف ڕێزەیەکی ئیمانی ڕووسی نییە.»

ـ کارم بە ئیمانی نییە. مەبەستم ئەو دوو کەسەی بیابانە. تەنیا ئەوە. دڵنیام ئەوان ڕووسین، وایە یان نا؟

ئالیووشا بەبزیەکەوە گوتی: «بەڵێ ڕووسییەکی خالیس و هەژدە عەیار.»

ـ ئەی کەرە، قسەکانت لیرەیەکی ئاڵتوون دەژی و هەر ئەمڕۆ پێتی دەدەم. بەڵام لەمەڕ قسەکانی دیکەتەوە، هەمووی گەوجە گەوج بوو، گەوجە گەوج. هەقمەق گیان، ڕاوەستە با پێت بڵێم کە هەموومان لێرە ئیمانێکی لاوازمان هەیە. تەنیا لەبەر ئەوەی بێفکرین، دەرفەتمان نییە و کاری زۆرمان بەتووشەوە بووە. هەروەها خودای مەزن دەرفەتێکی زۆر کەمی پێداوین. تەنیا بیست و چوار سەعات لە ڕۆژدا. جۆرێکە تەنانەت پیاو تێر خەویش نابێ. چ بگا بەوەی تۆبە لە تاوانەکانی بکا. تۆش ئەوا لە هەمبەر ئەشکەنجەگەرانتدا حاشات لە ئیمانت کردووە، ئەویش ئەو کاتەی هیچ فکر و زکرێکت نەبوو جگە لەوەی ئیمانی خۆت بنوێنی! براکەم، بۆیە بەبڕوای من لە تاوان دەچی.

ـ ڕەنگە لە تاوان بچی. بەڵام گریگۆری واسیلیەویچ، بڕوانە ئەگەر لە تاوانیش بچی، باری تاوانەکە سووک دەکا. ئەگەر لەو کاتەدا ئیمانم بە خودی هەقیقەتەکە بوایە و ئیمانداریم بە ئەرکی خۆم زانیبایە، ئەو کاتە ئەگەر لەبەر ئیمانم تووشی شکەنجەش نەبوایەم، دەچوومە سەر دینی کافر، ئەو کاتە لە ڕاستیدا کردەوەیەکی پڕ تاوانم دەبوو. هەڵبەت ئەو کاتە تووشی ئەشکەنجە نەدەبووم، چونکە لەو کاتەدا فەرمانم بە کێوێک دەدا: «وەرە ئەو شکەنجەگەرەم بۆ پان و فلێچ کەوە.» کێوەکەش دەهات و شکەنجەگەرەکەی وەک قالۆنچە دەفلیقاندەوە و منیش لەگەڵ مەتح کردنی خودا و دۆعا کردن لەوێ دوور دەکەوتمەوە، هەروەک نە بای هاتبێ و نە بۆران. بەڵام وای دانێ لەو کاتەدا ئەو کارەم لە دەست بهاتبایە و فەرمانم بە کێوەکە بدایە: «ئەم ئەشکەنجەگەرەم بۆ پان و فلێچ کەوە.» ئەویش نەیکردایە دەیفەرموو لەو

کاتەدا و لەو شوێنە پڕ مەترسی و تۆقێنەرەدا چۆن دەمتوانی شک نەکەم؟ جگە لەوەش، دەمزانی دەستم بە ئاسمانان ڕاناگا. (چونکە لەوێ کێو بەقسەی نەکردبووم و لە جێی خۆی نەجووڵابوو، دانیشتوانی ئاسمانیش ئیمانەکەمیان بە هیچ نەدەزانی و لەو دنیاش پاداشێکم بۆ لەبەرچاو نەگیرابوو.) کەوایە بۆ بهێڵم پێستی لەشم دامالن، ئەویش بەبێ هیچ ئامانجێک؟ چونکە ئەوان کاتێک نیوەی پێستەکەشیان دابماڵیبایەم، تەنانەت ئەو کاتەش کێوەکە گوێی بە هاوار و سکاڵام نەدەبزووت و لە جێگای خۆی نەدەجمی. لەو کاتانەشدا پیاو نەک هەر وهشک دەکەوێ، بەڵکو لە ترسانا بەجارێ ئاوەزیشی دەدۆڕێنێ و ناتوانێ تەنانەت بیریشی لێ بکاتەوە. کەوایە بۆ دەبێ من بە تایبەت ببمە ئامانجی لۆمە و سەرکۆنە، ئەگەر لەوێ چاوم بە جەزا و پاداشێک ناکەوێ، لانیکەم با گیانی خۆم ڕزگار کەم. بۆیەشە بە تەمای ویستی خودای گەورەم و ئەو هیوایەم هەیە کە بکەومە بەر ڕەحم و دلۆڤانییەکەی، قوربان.

## (٨)

# کۆڕی خواردنەوەی براندی

چەلەحانێ تەواو بوو. بەڵام ئەوە سەیر بوو، فیۆدۆر پاولۆویچ، کە ئەو هەمووە سەرخۆش بووبوو، لەپڕ نێوچاوانی تێکنا. بە مڕومۆچی قومێکی لە پەرداخە براندییەکە دا، پاشان شووشەکەی نا بەسەریەوە و گڵاسێکی لە ڕادەی ئاسایی زیاتر خواردەوە. گوڕاندی بە سەر خزمەتکارەکاندا: «ئێوە هەمووتان یەسووعین، یاڵڵا لێرە وەدەر کەون! ئیسمیر دیاکۆف تۆش بڕۆ. ئەو لیرە ئاڵتوونەی ئەمڕۆ قەولم پێدای، سبەینێ بۆت دەنێرم. ئێستا بڕۆ لێرە! گریگۆری مەگری. بڕۆ لای مارتا. جێگات بۆ ڕادەخا و ئەهوەنت دەکاتەوە.» هەر بەو قسانەی، خزمەتکارەکان هەموو ڕۆیشتن. بە شێواوی گوتی: «بێشەرەفانە ناهێڵن دوای شام پیاو وچانێک بدا و بە ئاسوودەیی دانیشێ.» پاشان ڕووی کردە ئیوان فیۆدۆرۆویچ و گوتی: «ئیسمیر دیاکۆف هەمیشە دوای شێو دێ بۆ ئێرەو هۆگرییەکی زۆری بە تۆ هەیە. چیت کردووە وا خولیای تۆ بووە؟»

ـ هیچم نەکردووە. پێیخۆشە من بە چاوێکی ڕێزدارانەوە تەماشای بکەم. مرۆڤێکی سووک و خوێڕییە. لەگەڵ ئەوەشدا ڕاست لەکات و وادەی دیاری کراودا دەگاتێ و هەمیشە یەکەم کەسە.

ـ یەکەم کەسە؟

ـ مرۆڤی دیکە و لەئەو چاکتریش هەیە. بەڵام کەسێکی وەک ئەویش هەیە و لە پێش هەموویاندا قوت دەبێتەوە و چاکەکانیان دواتر دێن.

ـ لە کات و وادەی دیاری کراودا دەگاتێ؟

ـ وەک مووت لێ هەڵپڕوزاندبێ. تا ئێستا لادێییەکان نەیانویستووە گوێ بەو ئاشپەز و پێشخزمەتانە بدەن.

ـ ئاخ، براکەم، بەڵام کەری بەلعەمی چونکە هەر بیر دەکاتەوە و بیر دەکاتەوە، شەیتانیش تێی ناگا.

ئیوان بە بزەیەکەوە گوتی: «ئەو دەیەوێ هەموو فکرەکانی بخاتە سەریەک.»

ـ خۆ دەزانم من یان کەسێکی دیکەی بۆ تامڵ ناکرێ، تەنانەت تۆش، ئەگەرچی پێت وایە بە چاوی ڕێزەوە تەماشات دەکا. بەڵام لەگەڵ ئالیووشا وا نییە، زۆری ڕق لە ئالیووشایە. بەڵام دزی ناکا، شەیتانی و شۆڤاریش ناکا. ئاگای لە زمانی خۆیەتی وزەنگەکەمان نازڕێنێ. لە ماسی لێنانیش زۆر شارەزایە. بەڵام، بەلەعنەت بێ، کوا شیاوی ئەوەیە ئەوەندەی باسبکەین؟

ـ جا دیارە شیاوی باسکردن نییە.

ـ بەڵام سەبارەت بەو فکرانەشی کە لەوانەیە وەکاری بخا، گوندنشینی ڕووسی بە تێکڕایی پێویستیان بە قامچی لێدانە. ئەوەش بڕوای هەمیشەی منە. لادێییەکانی ئێمە گەمژە و نەفامن و بۆ ئەوە نابن بەزەییت پێیاندا بێ، جێی خۆشیەتی کە هێشتا جاروبار دارکاری دەکرێن. ڕووسیا لە داری غاندا دەوڵەمەندە. ئەگەر ئەو لێڕەوارانە لە نێو ببرێن، ڕووسیاش کاول دەبێ. من لایەنگری مرۆڤی زانا و بەهۆشم. دەستمان لە لێدانی لادێییەکان هەڵگرتووە، زۆر وریا بووینەتەوە، بەڵام ئەوان خۆیان قامچی لە خۆیان دەدەن، کە ئەوەش شتی چاکە. «چونکە هەر بەو پێوانەیەی خۆیان بۆ تۆشی دەپێون[15]» یان دەڵێن چی؟ بە هەرحاڵ، دەیپێون. بەڵام هەموو شتێکی ڕووسیا بەراز ئاساییە. ڕۆڵەگیان، خۆزگە دەتزانی چەندە لە ڕووسیا بێزارم... یانی نەک لە ڕووسیا، بەڵکو لەو هەموو توند و تیژییە! بەڵام لەوانەیە مەبەستم هەر

---

15- ئینجیلی لووقا، بەشی شەشەم

ڕووسیا نەبێ. Tout celac estdela cochonnerie[16].... دەزانی چیم پێخۆشە؟ جوانی و نەرم ونیانی، وردەکاری و ناسکی.
- پەرداخێکی دیکەشت خواردەوە، بەستە.
- تۆزێ سەبرکە، پەرداخێکی دیکەش دەخۆمەوە و پاشان پەرداخێکی دیکە و ئەوسا دەستی لێهەڵدەگرم. نا، سەبرکە، پەڕییە نێو قسەکانم. لە ماکرۆیە لەگەڵ پیاوێکی پیر قسەمدەکرد، پێی گوتم: «هیچ شتێکمان لەوە پێخۆشتر نییە کچان مەحکووم بە قامچی لێدان بکەین، هەمیشەش لێدانی قامچییەکە دەخەینە ئەستۆی کوڕان. کوڕێکی لاو کە ئەمڕۆ قامچیی لە کچێک داوە، سبەینێ دەچێتە خوازبێنیی. هەر بۆیە ئەو کارە بە قازانجی کچانیشە و هەست بە هێژایی دەکەن.» ئەمەش دەورەیەک لە ئاسەواری مارکی دووسادە[17]! بەڵام هەرچۆنێک بێ کارێکی زیرەکانەیە. پێتخۆشە بڕۆینە پێشێ و چاوێکی لێبکەین؟ ئالیووشکا بۆ خەریکی سوور دەبییەوە؟ ڕۆڵەگیان، ئەوەندە شەرمێون مەبە! بەداخەوە بۆ فراوێن نەمامەوە دەنا بەسەرهاتی کچانی ماکرۆیەم بۆ ڕاهیبەکان دەگێڕایەوە. ئالیووشا گیان قەڵس مەبە لەوەی ئەمڕۆ بەیانی سووکایەتیم بە باوە عابید کرد. ئیمان هەردە بووم، ئەوەندەم ڕق هەستابوو. ئەگەر خودایەک ببێ، جێی خۆیەتی سزا بدرێم و سەرزەنشتم کەن و دەبێ تاوانەکەشی بدەمەوە. بەڵام ئەگەر خودایەک نەبێ، باوکانی ئێوە شیاوی چین؟ تەنیا سەربڕینان بەس نییە، دەبێ لەوە خراپتریان بە سەر بێنن، چونکە بەر بە پێشکەوتن دەگرن. ئیوان باوەڕ دەکەی ئەو کارە دڵم پاراو دەکا؟ نا، بە چاوتدا دیارە باوەڕ ناکەی. تۆ باوەڕ بەو شتانە دەکەی کە خەڵک سەبارەت بە من دەیڵێن؟ دەڵێن حەنەکچیم، قەشمەریم. ئالیووشا تۆچی، باوەڕ دەکەی من حەنەکچییەکم و هیچی تر؟
- نا باوەڕ ناکەم.

---

16- «هەمووی بەراز سفەتییە.»

17- مارکی دووساد Desade نووسەر و بیریاری فەڕەنسی (١٧٤٠-١٨١٤) کە گوایە زۆر زاڵم بووە، وشەی «سادیسم» - ئازاردانی دیتران - لە ناوی مەبارەکی ئەو وەرگیراوە.

ـ باوەڕت پێدەکەم و دەزانم بەڕاستتە. چونکە پیاوێکی ڕاستی و قسەکانیشت سادقانەیە. بەڵام ئیوان وانییە. ئیوان لەخۆباییە... لەگەڵ ئەوەشدا کاری ڕاهیبان یەکلایی دەکەمەوە. هەموو ئەو قۆڕیاتە عیرفانییەی ڕووسیای داگرتووە بەجارێک کۆدەکەمەوە و زەوتی دەکەم. هەتا تەواوی ئەو گەوجانە ئاقڵ دەکەم. ئەو کاتە بزانە چ زێڕ و زیوێک دەڕژێتە زەرابخانەوە! ئیوان پرسیی: «دەی بۆچی زەوتی دەکەی؟»

ـ بۆ ئەوەی هەقیقەت دنیا داگریٚ، لەبەر ئەوە.

ـ چاکە ئەگەر هەقیقەت دەبێ دنیا داگریٚ، دەزانی تۆ یەکەم کەس دەبی کە ماڵەکەی تالان دەکریٚ و پاشان... زەوتی دەکەن.

فیۆدۆر پاولۆویچ، بە سووکی دەستی کێشا بە تەوێڵی خۆیدا و گوتی: «بەها! بەڕاستتە، ها. ئەگەر وایە من کەرم. کەوایە ئالیووشا، ئەگەر ئاوا بێ با کلێسەکەی تۆ هەر لەجێی خۆی بێ. ئێمەش خەڵکانی وریا لە سووچێک دادەنیشین و براندی دەخۆینەوە و کەیف دەکەین. ئیوان دەزانی، ڕەنگە لە لایەن خودای بانیسەرەوە ئاوا بڕدرابێتەوە. ئیوان بیڵێ بزانم، ئەرێ خودا هەیە یان نییە؟ سەبرکە، ڕاست بڕۆ، بێپێچ و پەنا، ڕاستبە ڕاست. بۆ پێدەکەنی؟

ـ بەوە پێدەکەنم هەر ئێستا سەبارەت بە بیروباوەڕی ئیسمیر دیاکۆف، کە دوو پیاو هەن دەتوانن شاخ و کێوان بە فەرمانپێدانێک لەجێی خۆی بگوێزنەوە، قسەیەکی زیرەکانەت کرد.

ـ دەی ئێستا دەفەرمووی شێوەی ئەو دەدەم؟

ـ زۆریش.

ـ دەی ئەوە نیشاندەری ئەوەیە ڕووسیم و تایبەتمەندیی ڕووسیم هەیە. تۆش ئەگەرچی ماشەڵڵا فەیلەسووفێکی، لەوانەیە هەر بەو شێوە غافڵگیر بی. لەوە گەڕێین، پێم بڵێن بزانم خودا هەیە یان نییە؟ بەڵام جیددیبە جیددی، داوات لێدەکەم لانیکەم ئێستا جیددی بی.

ـ نا، خودا نییە.

ـ ئالیووشکا، خودا هەیە؟

- بەڵێ هەیە.
- ئیوان ئەی زیندووبوونەوە هەیە، تەنیا هێندێک، هەر ڕێزەیەک؟
- زیندووبوونەوەش نییە.
- هەرنییە، نییە؟
- هەر نییە، نییە.
- کەوایە مردن و بەیەکجاری تەواوبوون و بڕانەوە. ڕەنگە شتێکی دیکەش هەبێ. وێناچێ ئەم هاتن و چوونەش هەروا گۆترە بێ.
- مردن و بڕانەوە.
- ئالیووشکا، تۆ دەڵێی چی، زیندوو بوونەوە هەیە؟
- بەڵێ هەیە.
- خوداش و زیندووبوونەوەش؟ ڕۆحیش شتێکی هەتا هەتاییە؟
- بەڵێ خوداش و زیندووبوونەوەش. هەرمانی ڕۆحیش بە دەست خودایە.
- ئەها! زۆر وێدەچی هەق بە ئیوان بێ. خودایە گیان! تۆ بیری لێبکەوە مرۆڤ لەبەر هیچ و خەون و خەیاڵێکی تایبەت چ ئیمان و وزەیەکی سەرف کردووە. ئەویش چەند هەزار ساڵ. بەڵام کێیە تا ئەو ڕادەیە مرۆڤی بە شێت زانیوە؟ ئیوان! بۆ دوایینجار، ڕاست و ڕەوان پێمبڵێ خودا هەیە یان نییە؟
- بۆ دوایین جار دەیڵێمەوە، نییە.
- ئیوان، کێ ئاوا کڵاوی لە سەر مرۆڤ ناوە و پێشی پێدەکەنێ؟
- ئیوان فیۆدۆرۆویچ، بە بزەیەکەوە گوتی: «ڕەنگە شەیتان!»
- شەیتانی چی؟ مەگین ئەویش هەیە؟
- نا، شەیتانیش هەر نییە.
- جێی داخە. بەزیاد نەبێ چ ژیانێکە. ئەگەر ئەو مرۆڤەم دەست بکەوێ کە بۆ یەکەم جار خودای داهێنا، دەزانم چیی لێدەکەم! تەنیا لە سێدارەدانیشی بەس نییە. دەبێ دەردی بدرێتێ.
- ئەگەر خودایان دانەهێنایە، ژیاریش نەدەبوو.
- ژیار نەدەبوو؟ بەبێ بوونی خودا ژیار نەدەبوو؟ بەڕاستتە؟

ـ بەڵێ، نە ژیار دەبوو، نە براندی. کەوایە دەبێ ئەو براندییە لەبەر دەستت لابەم.
ـ سەبرکە، سەبرکە، ڕۆڵەگیان، پەرداخێکی دیکە، من هەستی ئالیووشام ڕووشاندووە. ئالکسی، دڵت لێم هێشاوە؟ ئالیووشا کووچەلانەکەم، بەرخەکەم!
ـ نا، نە ڕقم هەستاوە و نە دڵم لێت دێشێ. چونکە لەبیر و باوەڕت ئاگادارم، دڵت چاکترە لە مێشکت.
ـ دڵم چاکترە لە مێشکم، هەر بەڕاست؟ خودایەگیان! ئەویش تۆ پێم دەڵێی. ئیوان، تۆ ئالیووشکات خۆش دەوێ؟
ـ بەڵێ.
ـ دەبێ خۆشت بوێ. ( فیۆدۆر پاولۆویچ ئیتر تەواو سەرخۆش بووبوو.) گوێ بگرە، ئالیووشا، ئەمڕۆ بەیانی سووکایەتیم بە پیرەکەت کرد. بەڵام هێندەم ڕق هەستابوو ئاگام لەخۆم نەبوو. پێموایە ئەو پیرەی تۆ زۆر دڵێکی گەورەی هەیە و شلوێ نابێ، ئیوان وایە یان نا؟
ـ ڕەنگە واش‌بێ.
ـ با وایە. «LLya du piron la dedans[١٨]»، ئەو یەسووعییە، مەبەستم یەسووعیی ڕووسییە. مرۆڤێکی بەشەڕەفە، بەڵام چونکە دەیەوێ بە ناچاری خۆی پیرۆز نیشانبدا، ڕقێکی شاراوە لە ناخیدا قوڵپدەدا.
ـ بەڵام بە تەواوی ئیمانی بەخودا هەیە.
ـ وانییە... نەتزانیوە؟ خۆی بە هەمووکەسی گوتووە. یانی بە هەموو کەسیش نا، بەڵکو بە هەموو ئەو خەڵکە وریا و چاوکراوانەی دەچن بۆلای. هەروا ماوەیەک لەمەوبەر بە سولتێزی حاکمی گوتبوو: «ئیمان، بەڵام نا خۆشم نازانم ئیمانم بەچییە.»
ـ بەڕاستتە؟

18- «زۆر شێوەی پیرۆن دەدا» پیرۆن شاعیر و شانۆ نووسی تەنزوێژی فەڕەنسی (١٧٧٣ـ ١٦٨٩)

- بەڵێ، بەڵام ڕێزی لێدەگرم. بڕێکیش شێوەی «مفیستافیلیس[19]» دەدا. یان «قارەمانی سەردەمی ئێمە[20]»... ئاربنین، یان ناوی چییە؟ خۆ دیتووتە چەندە هەوەسبازە. ئەوەندە تۆڵازە پیاو کاتێ کچەکەی یان ژنەکەی بۆ دان پیانان دەچن بۆلای تووشی خانەگومانی دەبێ. خۆ دەزانی کاتێ دەستدەکا بە گێڕانەوەی چیرۆک... پێرارەکە ئێمەی بۆ چایی خواردنەوە بانگهێشت کرد، چایی و شەڕاب. (ژنان شەڕابی بۆ دەنێرن) دەستیکرد بە گێڕانەوەی سەربردە و نەقڵی ڕابردوو، ئەوەندە پێکەنیم لەوانەبوو ناوسکم بپچڕێ...

بەتایبەت کاتێک نەقڵی ماریجە کردنی ژنێکی نقوستانی بۆ گێڕاینەوە. «ئەگەر لاقوقولم ساخ بوایەن سەمایەکم بۆ دەکردی کەیف بکەی. تەواوی تەمەنم بە سەما و هەڵپەڕکێ ڕابواردووە.» دەیگوت: «فێڵ و تەڵەکەی زۆری کردووە.» شەست هەزار ڕۆبڵی لە دۆمیدۆفی بازرگان خوارد.

- چیی لێی دزی؟

- چونکە جێی متمانەی بوو، پارەکەی هێناو پێیدا، پاشان پێی گوت: «دۆستی خۆشەویست، ئەم پارەیە با وەک ئەمانەت لەلای تۆبێ. پۆلیس بڕیارواییە سبەینێ ماڵەکەم بپشکنێ.» ئەویش پارەکەی لێوەرگرت و گوتی: «تۆ وابزانە ئەو پارەیەت داوە بە کڵێسە.» پێمگوت: تۆ خوێڕی و هەرزەی.» گوتی: «نا، من خوێڕی و هەرزە نیم. دەستو دڵبازم.»

بەڵام ئەو کەسە ئەو نەبوو، کەسێکی دیکە بوو. لەگەڵ کەسێکی دیکە لێم شێوا بوو... بێئەوەی سەرنجی بدەمێ. گڵاسێکی دیکەم بۆ تێکە و ئیتر بەسە. ئیوان ئەو بترییە لابە، کۆی کەوە. خەریک بوو درۆم دەکرد. ئیوان، بۆ قسەکەت پێنەبڕیم و نەتگوت خەریکم درۆ دەکەم؟

- دەمزانی دەست هەڵدەگری.

---

19- MephistoPheles، نوێنەری لوسیفێر (ئیبلیس) لە شانۆی فاوستی گۆتەدا.

20- ناوی ڕۆمانی بەناوبانگی «لیرماتۆف»ە و قارەمانی ئەو ڕۆمانەش «پچوورین»ە «ئاربنین» لە یەکێ لە شانۆکانی لیرمانتۆفدا ـ بالماسکە ـ دەوری مرۆڤێکی هەرزە و خوێڕی دەگێڕێ.

- ئەمە درۆیە. لەبەر قین، لەبەر بوغز لەزگی ئەو کارەت لەگەڵ من کرد. تۆ قینت لیمە. هاتووی بۆلام و لە ماڵەکەی خۆمدا قەڵسەم لیٚدەگیڕی.

- باشە ئەوە دەڕۆم. زۆرت براندی خواردۆتەوە و زێدەڕەویت کردووە.

- بۆخاتری خودا، تکام لێکردووی یەک - دوو ڕۆژێ بچی بۆ چێرماشنیا، کەچی ناچی.

- ئەگەر ئەوەندە بە پێویستی دەزانی و پڕکێشی لە سەر دەکەی سبەینێ دەچم.

- ناچی دەتەوێ من بخەیتە ژێر چاوەدێری. ئەی سەگی قێزەون، تۆ هەر ئەوەت دەوێ، بۆیە ناچی.

پیرە پیاو لە سەر قسەکەی خۆی سوور بوو. تەواو سەرخۆش بووبوو. ئەگەرچی بە مەستیش قەتی قسەی سووک و جنێو بەدەمدا نەدەهات، وای لیٚ هاتبوو سەری لە شەڕوکێشە دەخورا و دەیویست خۆی بنوێنێ.

- بۆ چاوم لێناکەی؟ بۆچی ئاوا تێمدەڕوانی؟ چاوانت پێمدەڵێن: «ئەی مەستی دزێو!» چاوت پڕن لە گومان. پڕن لە ڕق. بە پلانێکەوە هاتووی بۆ ئێرە. ئالیووشا تێم دەڕوانێ و چاوی دەبریقێتەوە. ئالیووشا ڕقی لێمنییە. ئالکسی، تۆ نابێ ئیوانت خۆشبوێ.

ئالیووشا بە لەبزێکی قایم و فەرمان پێدەرانەوە گوتی: «تۆ نابێ لەگەڵ کاکم ئەوەندە بەدخولقی بکەی، ئەوەندەی لەگەڵ تێوەمەچۆ.»

- ئاخ، باشە باش. ئاخ، چەندەم سەر دێشێ. ئیوان، ئەو بوتڵە براندییە هەڵگرە، ئەوە سێهەم جارە پێت دەڵێم.

فیۆدۆر پاولۆویچ کەوتە بیر کردنەوە، لە ناکاو بزەیەکی هاتێ، زۆر نەرم و هێدی گرژییەوە: «ئیوان، ڕق لە پیرە پیاوێکی نەخۆش و لاواز هەڵمەگرە. دەزانم خۆشت ناوێم، بەڵام قەڵس مەبە. هیچیوام نییە تاکو لەبەر ئەو خۆشت بوێم. بچۆ بۆ چێرماشنیا. خۆم دێم بۆ ئەوێ بۆلات و دیارییەکت بۆ دێنم. لەوێ کچێکیشت نیشاندەدەم. کە زۆر لەمێژە هەڵمناوە و چاوەدێریم لێکردووە.

هەروا بە پێخاوسی بەملاو ئەولادا هەڵدێ. لە کچانی پاپەتی مەترسە. ڕقت لێیان نەبێ. گەوهەرن!»

چوار قامکی دەستی بە دەمییەوە نا و شەقەی ماچی لێهەستاند.

فیۆدۆر پاولۆویچ زوو مەستییەکەی ڕەوی و کاتێ گەیشتە مەبەستی دڵخوازی خۆی، دەتگوت تەواو وریا بۆتەوە: «بە بڕوای من.. بە بڕوای من... هاوار لەدەست ئێوە هەتیوانە! ڕۆڵەکانم، کوودەڵە خرپنەکانم. بە بڕوای من... لە ماوەی ژیانمدا هیچ ژنێکم پێ ناشیرین نەبووە. ئەوەش خووخدەی منە، دەتوانن تێمبگەن؟ چبکەم بۆ ئەوەی تێمبگەن؟ دەمارتان شیری تێدایە، نەک خوێن. هێشتا سەرتان لە هێلکە نەجووقاوە، دەمتان بۆنی شیری خاوی لێدێ. من بڕوام وایە کە پیاو دەتوانێ لە هەر ژنێکدا شتێکی باش و سەرنجڕاکیش، بدۆزێتەوە کە لە ژنێکی دیکەدا نییە. تەنیا دەبێ بزانی چۆنی پەیدا بکەی، خاڵی گرینگ ئەوەیە. لێزانیشی دەوێ. بە بڕوای من ژنی ناشیرین نییە. هەر ئەوەی کە ژن بێ نیوەی خواستەکە دێتە دی... بەڵام چبکەم تاکو لەوە تێبگەن. تەنانەت veilles filles [پیرە کچان]یش شتێکیان تێدایە کە لە دڵی خۆیاندا دەڵێن ئەو پیاوانە چەندە گەوج و ناهیر بوون هەمیەتیان پێنەداون و هێشتوویانە پیر بن. کچانی پاپەتی و هەژار و ئەوانەی زۆر ڕووبازاری نین دەبێ خافڵگیریان کەی. ئەوەتان دەزانی؟ دەبێ وایان تووشی سەرسوڕمان بکەی و شەیدا و حەشەری بن. هەست بە شەرمەزایی بکەن کە پیاوێکی ئاوا گەورە ئاشقیان بووە. ئەوەش زۆر چاکە. هەتا دنیا بووە ئەرباب و نۆکەریش هەر بووە، بۆیە هەمیشەش کڵفەت و ئەرباب بەجۆرێ کەینوبەینیان بووە، ئەوەش بزانن، کە باشترین شتە بۆ بەختەوەری و چێژ وەرگرتن لە ژیان. سەبرکە... گوێ بگرە، ئالیووشکا، هەمیشە دایکتم تووشی سەرسامی دەکرد، بەڵام بەشێوەیەکی دیکە. قەت ئەوەندەم سەرنج نەدەدایە، بەڵام کاتێ بۆم دەردەکەوت هەلیەتی، بەقوربان و سەدەقەی دەبووم و بخ گاگۆڵکێ بۆلای دەخوشیم و لاقیم ماچدەکرد. هەمیشە ـ ئەو ساتەم لەبیرە و قەتم لەبیر ناچێتەوە و وادەزانم دوێنێ بوو ـ وە پێکەنینم دەخست، وردە قاقایەکی سەیر بە نەختاڵێ تووڕەییەوە، ئەو جۆرە پێکەنینەش

تایبەتی خۆی بوو. دەمزانی هێرشەکانی وادەستپێدەکا، ڕۆژی دوایی زۆر شێتانە دەیقیژاند و ئەو وردە قاقایانە دیاردەی شادی و ڕەزایەت نەبوون. بەڵام نیشاندەری جۆرێک عەشق و خدەی سروشتی بوون. گرینگ ئەوەیە بزانی چۆن کەسێک هەڵفریوێنی. جارێکیان «بلیافسکی» ـ لاوێکی دەوڵەمەند و جوانچاک ـ دەهات بۆ ئێرە و خۆی تێهەڵدەقوتاند ـ لەبەر چاوی دایکت یەک زللەی خێواندە لاڕوومەتم. ئەویش ـ وەک مەڕی پێغەمبەر وابوو ـ لە داخی ئەو شەپڵاغەیە و هیچ نەگوتنی من، وەک شێت و هاری لێهات و دەستیکرد بە لێدانم. حوکمی لێکردم: «شەپڵاغەت خواردووە، لێیان داوی. چۆن ئەو هەتیوە زللەی لە تۆ دا. ئەوە دەتەوێ منی پێبفرۆشی... چۆن دەوێرێ لەبەرچاوی من لە تۆ بدا! ئیتر تخوونم نەکەوی. نامەوێ چاوم بە چاوت بکەوێ، بڕۆ، ئیتر نامەوێ قەت قەتت ببینم، قەت قەت. هەستە بڕۆ تۆڵەی خۆتی لێبکەوە، بانگی بکە بۆ دوئێل!.... هەر ئەو کاتە بردم بۆ کلێسە بەڵکو بێتەوە سەر ئەقڵ. قەشەکان زۆریان دوعا بەسەردا خوێند و ئارامیان کردەوە. بەڵام ئالیووشا، بەو خودایەی لە ژووری سەرە بەقەد سەرە دەرزییەکم سووکایەتی بەو کچە هەژار و شێتوولکەیە نەکرد! تەنیا جارێک، ئەویش پێموا یەکەم ساڵ بوو، ئەوکات زۆری هۆگری بە عیبادەت بوو. بەتایبەت جێژنی بۆ مریەمی پیرۆز دەگرت و لە وەتاغەکەی وەدەر دەنام. لە دڵی خۆمدا گوتم: «با ئەو عیرفانەی لە مێشک دەرهاوێژم!» گوتم: «چاو لێکە، ئەوەش پەیکەرە پیرۆزەکەت، خۆ دیتووتە. ئەوەتا. دەیهێنمە خوارێ. پێتوایە پەرجۆ دەکا. بەڵام چاو لێکە، تفی لێدەکەم و هیچ بەڵایەکیشم بە سەر نایە!» کە ئەوەی دی، خودایە گیان! پێموابوو دەمکوژێ. بەڵام تەنیا جینگڵێکی لەخۆی دا و دەستی خۆی هەڵگلۆفی. پاشان بەهەر دوو دەستی دەموچاوی گرت، سەرتاپای لەشی وەلەرزین کەوت و درا بە عەرزدا... گرمۆڵە بوو. ئالیووشا، ئالیووشا. ئەوە چییە، بۆ ڕەنگت گۆڕاوە؟

پیرە پیاو لەترسانا لەجێی خۆی داچڵەکی. لەو کاتەوە دەستیکردبوو بە باسکردنی دایکی، ئالیووشا ڕەنگ و ڕووی گۆڕابوو، سوور سوور بووبۆوە. چاوی فرمێسکی تێزابوو، لێوی دەلەرزی. پیرە مەست، بێئەوەی گوێی بداتێ

هەروا درێژەی بە چەنەدرێژی و هەڵەوەڕی دەدا، تا ئەو ساتەی ئالیووشا حاڵی لێهات. ڕاست ئەو جۆرەی کەباسی دایکی کرابوو. لە ناکاو ئەو حاڵەی بەسەردا هات و لەجێی خۆی دەرپەڕی. ڕاست بەو شێوەی کە دایکی دەرپەڕیبوو و جینگڵی لەخۆی دابوو دەستی خۆی هەڵگلۆفی و هەردوو دەستی بە دەموچاوییەوە گرت، دەستیکرد بە گریان و لەگەڵ بەرسینچکە و گریان هەموو گیانی دەلەرییەوە. ئەو شێوە حاڵ لێهاتنەی ئەوەندە لەدایکی دەچوو، بەجارێ شوێنی لە سەر فیۆدۆر پاولۆویچ دانا.

ئیوان، ئیوان، زووکە ئاو بێنە ئاو! ڕاست وەک ئەوی لێهاتووە، ئەویش ئەو کاتە ڕاست ئاوای لێ‌هات، مەبەستم دایکییەتی. ئاو بکە دەمتەوە و لە سەر و چاوی بپرژێنە. منیش هەر ئەو کارەم کرد بۆ دایکی.» لەبن لێوییەوە بە ئیوانی گوت: «لەتاوی دایکی حاڵی تێکچووە، لەبەر خاتری دایکی»

ئیوان ڕق و قین وەک خوێن بەرچاوی گرت و بە تووڕەیی گوڕاندی: دایکی ئەو دایکی منیش بوو، وانییە؟» پیرە پیاو لە ترسی ڕق و تووڕەیی و چاوی ئیوان کە ئاوریان لێ‌دەبۆوە، کشا دواوە. بەڵام شتێکی زۆر سەیر قەومابوو، لە ساتێکیش زیاتری نەخایاندبوو، دەتگوت لە داڵغەی پیرە پیاودا هەرنەماوە کە دایکی ئالیووشا،، دایکی ئیوانیشە.

کتوپڕ لە بن لێوەوە منجاندی: «دایکی تۆ؟ مەبەستت چییە؟ باسی کام دایک دەکەی؟ دایکی تۆش بوو؟.... فکرم لە کوێیە! دیارە دایکی تۆش بوو! ئەوە فکرم لە کوێیە! قەت تا ئەو ڕادەیە داڵغەم نەشێواوە. بمبوورە، ئیوان، فکرم ڕۆیشتبوو.... ها، ها، ها!» لە قسە کەوت. لێوی بە بزەیەکی مەستانە و نیوە شێواوانە گرژییەوە.

هەر لەو ساتەدا قرموقاڵ و هاوارێکی ترسناک لە سەرسەراوە هەستا. گوڕە و هەرایەکی تووڕە، دەرگاکە بە توندی کرایەوە و دیمیتری فیۆدۆرۆویچ خۆی کرد بە ژووریدا. پیرە پیاو لەترسانا هەڵات بۆلای ئیوان. دەستی بە شانی ئیوانەوە گرت و قیژاندی: «دەمکوژێ! دەمکوژێ! مەهێڵە دەستی پێم‌بگا! مەهێڵە!»

# (٩)

## هەوەسبازان

گریگۆری و ئیسمیر دیاکۆف بەدوای دیمیتری فیۆدۆرۆویچدا بە هەڵەداوان خۆیان کرد بە وەتاغەکەدا. لە سەرسەرا کێشمەکێشمیان لەگەڵ کردبوو، بە پێی ئەو فەرمانە کە چەن ڕۆژ لەمەوبەر فیۆدۆر پاولۆویچ پێی دابوون، ئیزنیان نەدابوو بێتە ژووریّ. دیمیتری کاتێ چاوی بەوە کەوت تۆزێ ڕاوەستا و چاوێکی بە دەوروبەری خۆیدا گێڕا. گریگۆری دەورێکی سفرەکەی لێدا و بەرەو دەرگایەکی دووتایی هەڵات کە لەوبەری وەتاغەوە هەڵکەوتبوو، بە سەر ژووره ناوینییەکاندا دەکرایەوە. لەبەر دەرگا پێوەدراوەکەدا هەر دەستی لێکبڵاو کردو خۆی ئامادە کرد، تاکو هەتا دوایین دڵۆپی خوێنی بەرگری لە درگاکە بکا و نەهێڵێ بڕواتە ژووریّ. دیمیتری کە ئەوەی دی، ئەوەندەی دیکە ڕقی هەستا. نەڕاندی و هەڕایکردە گریگۆری.

کەوایە لێرەیە! لێرە خۆی شاردۆتەوە! لاچۆ لەبەر ئەو درگایە خوێڕی! ڕێ لە من دەگری؟

هەوڵیدا گریگۆری بخاتە ئەولاوە و خۆ بکا بە ژووریدا، بەڵام خزمەتکاری پیر پاڵێکی پێوەنا و ڕایدا بۆ دواوە. دیمیتری چەقۆت لێدایە خوێنی نەدەهات، وەک شێت و هار هۆمەنی بۆ پیرەپیاو برد و مشتێکی لە سەر سینگی پیرە پیاو ڕاکێشا. گریگۆری وەک باخەگیا لە سەر زەوی گولۆڵە بوو. دیمیتری بە سەر لەشی تخێڵبووی پیرە پیاودا بازیدا و خۆی کرد بە ژووریدا. ئیسمیر دیاکۆف لەوبەری هۆدەکەوە شانی داتەپاندبوو و لە نزیک فیۆدۆر پاولۆویچ وەک مێژۆکە دەلەرزی و ڕەنگی هەڵبزڕکابوو.

دیمیتری فیۆدۆرۆویچ گوڕاندی: «ئەو لێرەیە هەر ئێستا دیم بەرەو ئەو ماڵە بایداوە، بەڵام پێینەگەیشتمەوە. کوانێ؟ لەکوێیە؟ ئەو نەڕڕەیەی «ئەو لێرەیە» سەیر شوێنی لە سەر فیۆدۆر پاولۆویچ دانا. ئەوی ترسی لە دڵیدا بوو ڕۆڕژا.

هاواری کرد: «بیگرن! بیگرن! بەشوێن دیمیتریدا وەک تێسکەی تفەنگ دەرچوو و خۆی کرد بە وەتاغەکەی دیکەدا. گریگۆری هەستابۆوە و هێشتا کاس بوو. ئیوان و ئالیووشاش بەپەلە بەدوای باوکیاندا ڕۆیشتن. لە وەتاغی سێهەمدا خرمەی شکانی شتێک هات. گوڵدانێکی شووشەیی گەورە بوو - زۆریش گرانبایی نەبوو - لە سەر پێچکەیەکی مەڕمەڕی، دیمیتری بە پەنایدا ڕۆیشتبوو، کەوتبوو بەعەرزدا.

پیرە پیاو هاواریکرد: بیگرن! کوڕە بگەنێ!»

ئیوان فیۆدۆرۆویچ و ئالیووشا پیلی باوکیان گرت و گێڕایانەوە. ئیوان بە تووڕەیی گوڕاندی بە سەر باوکیدا: «بۆ وەدوای کەوتووی؟ بتگرێ لەڕێوە دەتکووژێ.»

- وانچکا، ئالیۆشچکا! لێم ڕوونە لێرەیە. گرووشنکا لێرەیە. خۆی گوتی دیویەتی بەرەو ئێرە هەڵاتووە.

وە هەناسەبڕکێ کەوتبوو. لەو کاتەدا چاوەڕوانی گرووشنکا نەبوو، ئەو هەواڵە کتوپڕەش کە لێرەیە، بەجارێ وەدڵەخورپەی خست. سەرتاپای دەلەرزی. وەک شێتی لێهاتبوو.

ئیوان نەڕاندی: «بەڵام خۆت دەزانی نەهاتووە.»

- بەڵام ڕەنگە لە دەرگایەکی دیکەوە هاتبێتە ژوورێ.

- ئەو دەرگایەی دیکە داخراوە و کلیلەکەی بەخۆتە.

دیمیتری دیسان هاتەوە بۆ وەتاغی نشیمەن. دیتبووی درگاکەی دیکە قوفڵ کراوە، کلیلەکەشی لە گیرفانی فیۆدۆر پاولۆویچدا بوو. پەنجێرەی هەموو وەتاغەکانیش پێوەدرابوون. بۆیە گرووشنکا لە هیچ ڕێگایەکەوە وێنەدەچوو هاتبێتە ژوورێ و خۆی شاردبێتەوە.

فیۆدۆر پاولۆویچ هەرکە چاوی بە دیمیتری کەوتەوە قیژاندی: «بیگرن! لە وەتاغی خەوەکەی من دزیکردووە.» خۆی لە چنگی ئیوان ڕاپسکاند و شاڵاوی برد بۆ دیمیتری. بەڵام دیمیتری بە هەردوو دەستی چنگی لە تووکە سەری ئەملاوئەولای سەری فیۆدۆر پاولۆویچ گیرکرد و دای بە زەوییدا. دوو سێ

پێلاقەی کێشا بە سەر و سەکوتیدا. پیرە پیاو بە دەنگێکی گریاناوی هاواری لێ هەستا. ئیوان فیۆدۆرۆویچ ئەگەرچی قەوەی بە قەوەی دیمیتری نەدەشکا، بەڵام لە دواوە توند باوەشی پێداکرد و کێشایە دواوە. ئالیووشای بێتین و هێزیش چووە یاریدەی و لە پێشەوە براکەی گرت.

ئیوان نەڕاندی: «شێت و وێت! کوشتت!»

دیمیتری بە هانکە هانک هاواری کرد: «هەقی خۆیەتی! ئەگەر نەشمکوشتبێ، جارێکی دیکە دێمەوە و دیکوژم. ناتوانی ئاگاداریشی لێبکەی!»

ئالیووشا بە تووڕەیی گوڕاندی بە سەریدا: «دیمیتری، زوو لێرە بڕۆ دەرێ!»

ـ ئالکسی! تۆ پێمبڵێ، تەنیا باوەڕ بە تۆ دەکەم. ئەو ئێستا لێرە بوو یان نا؟ خۆم دیتم بەپەنا پەرژینەکاندا بەرەو ئەملایە خوشی. هەرام لێکرد، هەڵات.

ـ سوێندت بۆ دەخۆم نەهاتووە بۆ ئێرە، هیچ کەسیش چاوەڕوانی نەبووە.

ـ بەڵام دیتم... ئەی ئەوە دەبێ... ئێستا دەیدۆزمەوە لەکوێیە.... خودا حافیز ئالکسی! ئێستا سەبارەت بە پارە لەگەڵ ئەو خوێڕییە مەدوێ. خێرا بچۆ بۆلای کاترینا ئیوانا و «کرنۆشی بۆ بەرە!» پێشی بڵێ ڕێز و سڵاوم هەیە بۆی، ڕێز و سڵاو. خۆت هەموو شتێکی بۆ بگێڕەوە!

ئیوان و گریگۆری خێرا فیۆدۆر پاولۆویچیان هەستاندەوە و لە سەر کورڕسیلەیەک دایاننیشاند. چڕو چاوی شەلاڵی خوێن بوو... بەڵام هۆشی بوو و بەوپەڕی ڕەزیلی و ڕقەوە گوێی لە گوڕە و هەرای دیمیتری گرتبوو. ئەو هەروا بیری لە گرووشنکا دەکردەوە و پێیوابوو لە جێیەکی ماڵەکەدا خۆی شاردۆتەوە. دیمیتری لەگەڵ ڕۆیشتنە دەرێ، چاوێکی پڕ لە قینی لێکرد.

گوڕاندی: «ئەگەر بتکوژم و خوێنت برێژم پەشیمان نابمەوە! دەست هەڵگرە، پیرە پیاو، دەست هەڵگرە. دەست لەو ئارەزووەت هەڵگرە، چونکە منیش ئارەزووم هەیە. تووک و نزات لێدەکەم و حاشا لە باوکێتیت دەکەم.»

ئەمسا لە وەتاغەکە چووە دەرێ.

پیرە پیاو بە نووزە نووزێکەوە گوتی: «ئەو لێرەیە. حەتمەن لێرەیە.

ئیسمیر دیاكۆف، ئیسمیر دیاكۆف!» بە قامكیشی ئاماژەی دەكرد.

ئیوان بە ڕقھەستاوی نەڕاندی: «نا، ئەو لێرە نییە، پیری لەون لێگۆڕاو! ئێ، ئێ، ئێ، خۆ خەریكە لە ھۆش خۆ دەچێ! ئاو، خاولی، زووكە ئیسمیر دیاكۆف!»

ئیسمیر دیاكۆف ھەڵات بۆ ئاو. جلەكانیان لەبەر داكەند و بردیانە سەر چرپای خەوەكە و ڕایانكێشا. خاولییەكی تەڕیان لەسەری پێچا. ھێندەی براندی خواردبۆوە فل بووبوو، دڵەخورپە و كوتان خواردنیش ئەوەندەی دیكە شلیكردبوو، بۆیە ھەركە سەری كردە سەر باڵنجەكە چاوی قوچاند و خەوی لێكەوت. ئیوان فیۆدۆرپاولۆویچ و ئالیووشا گەڕانەوە بۆ وەتاغی نشیمەن. ئیسمیر دیاكۆف لەتوكوتی گوڵدانە شكاوەكەی خڕ كردەوە. گریگۆریش لە پەنا خوانەكە ڕاوەستابوو، مات و خەمناك چاوی لە چەقی ژوورەكە بڕیبوو.

ئالیووشا پێیگوت: «پێموا وا چاكە تۆش پەڕۆیەكی تەڕ لە سەرت ھاڵێنی و بچییە سەر پێخەفەكەت. ئێمە ئاگامان لێیەتی. دیمیتری زەبرێكی سەختی لەسەرت دا.»

گریگۆری بە لەبزێكی خەمبارانەوە گوتی: «سووكایەتیی پێكردم!»

ئیوان فیۆدۆر پاولۆویچ بە لەبزێكی ناچارییەوە گوتی: «تۆ بەجێی خۆی، سووكایەتیی بە باوكیشی كرد.»

گریگۆری دووپاتی كردەوە: «لەدایك و باوكی زیاترم خزمەت پێكردووە، لە نێو تەشتدا شتوومە و خاوێنم كردۆتەوە، سووكایەتیی بە من كرد.»

ئیوان فیۆدۆرۆویچ بە سرتە بە ئالیووشای گوت: «غەزەبە دەڵەی بەرازە، نەمكێشایەتە دواوە دەیكوشت. وادیارە زۆر سانا دەكرێ ئەو ئۆزۆپە لە كۆڵ خۆمان كەینەوە، وانییە؟»

ئالیووشا گوڕاندی: «خودا نەكا، شتیوا مەڵێ!»

ئیوان بە بزەیەكی تاڵەوە، دیسان سرتاندی: «بۆ خوا نەكا؟ حەزیایەك حەزیاكی دیكە ھەڵدەلووشێ و ھەردووكیشیان ھەقی خۆیانە بەو دەردە بچن.»

ئالیووشا موچڕكێكی پێداھات.

ـ هەڵبەت ناهێڵم بیکوژێ، هەروەک ئێستا نەمهێشت. ئالیووشا تۆ لێرە دانیشە، من سەرم دێشێ، دەچم تۆزێ لە حەوشە پیاسە دەکەم.

ئالیووشا چوو بۆ ژووری خەوەکەی باوکی و نزیک سەعاتێک لەژوور سەری دانیشت. پیرە پیاو بە هێوری چاوی هەڵێنا و ماوەیەک لە ئالیووشا ڕاما، دیاربوو خەریکە فکر دەکاتەوە و ڕووداوەکەی وەبیر دێتەوە. کتوپڕ ڕەنگی تێکچوو. بە خەمباری و دڵەدوایی گوتی: «ئالیووشا، ئیوان لەکوێیە؟

ـ لە حەوشەیە، سەری دێشێ، خەریکە کێشک دەدێرێ.

ـ دا ئەو ئاوێنەیەم بدەیە، ها ها لەو سەرەیە. دابۆم بێنە.

ئالیووشا ئاوێنەیەکی گردی چکۆڵەی لە سەر دۆڵابەکە هەڵگرت و بۆی هێنا. پیرە پیاو چاوێکی لەخۆی کرد، لووتی ماسیبوو، لای چەپی نێوچاوانیشی قرینجا بوو، برینەکەی سووری دەکردەوە.

ـ ئیوان دەڵێ چی؟ ئالیووشا گیان. هەر تۆ بەکارم دێی کوڕم، لە ئیوانیش دەترسم. لە ئیوان زیاتر دەترسم تا ئەوەی دیکە. تەنیا لە تۆ ناترسم...

ـ لە ئیوانیش مەترسە. کەمێ تووڕە و تۆسنە. بەڵام لەسەری کردییەوە.

ـ ئالیووشا، ئەی ئەو هەتیوەی دیکە؟ هەڵدێ بۆلای گرووشنکا. فریشتە نازەنینەکەم، ڕاستم پێبڵێ ئالیووشا، گرووشنکا ئێستا لێرە بوو یان نا؟

ـ هیچ کەس نەیدیوە. بەهەڵە چووە دیمیتری. نەهاتووە بۆ ئێرە.

ـ دەزانی دیمیتری دەیهەوێ مارەی کا؟

ـ شووی پێناکا.

ـ شووی پێناکا، دەزانم شووی پێناکا. بەهیچ لەونێک شووی پێناکا!

فیۆدۆر پاولۆویچ لە خۆشیانا وەختەبوو باڵ بگرێ، دیاربوو هیچ قسەیەک بەقەد ئەوە ئۆخژنی پێ نابەخشێ. بە شادییەوە دەستی ئالیووشای گرت و لە سەر دڵی خۆی دانا و فرمێسک لە چاویدا قەتیس ما.

گوتی: ئەو پەیکەرەی دایکی پیرۆز کە هەر ئێستا بۆم باسکردی، هەڵی بگرە و بیبە بۆخۆت. ئیزنت دەدەم بچیتەوە بۆ کلێسەش... ئەمڕۆ بەیانی گاڵتەم

لەگەڵ کردی، بەدڵیەوە نەگری. سەرم دێشێ ئالیووشا. تۆزێ دڵم خۆشکە. وەک پیاوان ئەو کارەم بۆ بکە و ڕاستم پێبڵێ.

ئالیووشا خەمبارانە گوتی: «هێشتا هەر دەتەوێ بزانی گرووشنکا لێرە بووە یان نا؟»

ـ نا، نا، نا. باوەڕ بە قسەی تۆ دەکەم. ئێستا پێتدەڵێم چبکەی: خۆت بڕۆ بۆلای گرووشنکا، یان بە شێوەیەک بیبینە. خێرا بچۆ و لێی بپرسە، خۆت بزانە دڵی بە کاممانەوەیە. من یان ئەو؟ دەی؟ دەتوانی ئەو کارە بۆ باوکی خۆت بکەی؟

ئالیووشا بە حەپەساوی لەبەر خۆیەوە منجاندی: «ئەگەر دیتم، لێی دەپرسم.»

پیرە پیاو پەڕییە نێو قسەکانی ئالیووشا: «نا، بە تۆ نالێ. زۆر حیلەبازە، هەر بتبینێ باوەشت پێدادەکا و دەستدەکا بە ماچکردنت و پێتدەڵێ، لە تۆ زیاتر کەسی خۆش ناوێ. سەڵیتەیەکی زۆر فێڵزان و بێحەیایە، خونکە نابێ بچی بۆلای، نابێ.»

ـ نا، باوە چوونی من جوان نییە، هەر نەچم چاکترە.

ـ دەیویست بۆکوێت بنێرێ؟ کاتێ دەرپەڕی و هەڵات، پێی دەگوت «بچۆ».

ـ بۆلای کاترینا.

ـ بۆ پارە، بچی داوای پارەی لێبکەی؟

ـ نا، بۆ پارە نا.

ـ ئەو تاقە کوپکێکیشی نییە. ئەمشەو سەرحیسابێکی پارەکانم دەبم، دیسان بیری لێدەکەمەوە، تۆش دەتوانی بڕۆی. ڕەنگە گرووشنکاش ببینی... بەڵام بەیانی حەتمەن وەرەوە بۆلام. دەمەوێ شتێکت پێبڵێم. دێیتەوە؟

ـ بەڵێ.

ـ کاتێ دێی، واخۆت نیشانبدە کە هاتووی بۆ سەردان و هەواڵپرسیم. بە هیچ کەس مەڵێ من پێم گوتووی بێی. لە لای ئیوان دەنگێ نەکەی.

ـ بەڵێ باشە.

- خوداحافیز فریشتەکەم. هەر ئێستا لەسەرت کردمەوە و لایەنگریت لێکردم، قەتم لەبیر ناچێ. سبەینێ قسەت لەگەڵ دەکەم - بەڵام دەبێ بیری لێبکەمەوە.

- لەوە گەڕێین حاڵت چۆنە؟

- سبەینێ گورج و گۆڵ و بەدەماخ هەڵدەستم و دێمە دەرێ.

ئالیووشا، لە حەوشەکە تێپەڕی و دیتی ئیوانی برای لەلای دەرگای حەوشە لە سەر سەکۆکە دانیشتووە. خەریکی نووسینی شتێک بوو لە دەفتەری یادداشتەکەیدا. ئالیووشا پێی گوت کە باوکی لە خەو هەستاوە و وەهوش هاتۆتەوە، ئیزنی پێداوم بۆ خەوتن بچمەوە بۆ کلێسە.

ئیوان لەگەڵ ئەوەی هەستایە سەرپێ، بەڕێزەوە، پرسیی: «ئالیووشا، خۆشحاڵ دەبم ئەگەر سبەینێ چاوم پێت بکەوێ.» ڕێز و حورمەتی ئیوان بووە هۆی سەرسووڕمانی ئالیووشا.

ئالیووشا وەڵامی دایەوە: «سبەینێ دەچم بۆ ماڵی خۆخلاکۆف، یان ڕەنگە بچم بۆ ماڵی کاترینا ئیوانا، هەڵبەت ئەگەر ئێستا نەیبینمەوە.»

ئیوان، بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی: «بەڵام ئێستا هەرچۆنێکە دەتەوێ بچی بۆلای کاترینا؟ بۆ گەیاندنی ئەو پەیامەی دیمیتری، "ڕێز و کڕنۆش" ها؟» ئالیووشا مات بوو.

- پێموایە لە گوڕە گوڕی ئێستای و بەشێک لەوەی کە لە پێشدا ڕابردووە بە جوانی گەیشتووم. دیمیتری داوای لێکردووی بچی بۆلای کاترینا و پێی بڵێی، کە بەوپەڕی ڕێز و حورمەتەوە لێت جیا دەبێتەوە و واز لەو عەشقە دێنێ؟

ئالیووشا گوتی: «کاکە، ئەم کێشەیەی نێوان باوکم و دیمیتری بڵێی چۆن تەواو بێ؟»

- هیچ شتێک ڕوون نییە. ڕەنگە هیچیش نەقەومێ، گرپەیەکی خێرا داگیرسێ و بکووژێتەوە. ئەو ژنەش دەعبایەکی مزیرە. نابێ بێڵین باوکم لە ماڵێ بچێتە دەرێ و دیمیتریش سەر بەو ماڵەدا بکا.

- کاکە، با شتێکی دیکەت لێبپرسم. کەسێک هەقی هەیە چاو لە خەڵک بکات و بڕیار بدا کامیان مافی ژیانی هەیە؟

ـ بۆ ئەو پرسیارە دێنییە گۆڕێ؟ ئەو شتانە لە دڵی مرۆڤدا لە سەر بنەمایەکی زۆر سروشتیتر بڕیاری بۆ دەدرێ. بەڵام سەبارەت بە هەق کێ مافی ئاوات خواستنی نییە؟

ـ بۆ مەرگی کەسێکی دیکەش نا؟

ـ تەنانەت ئەگەر بۆ مەرگی کەسێکی دیکەش بێ؟ چونکە هەموو مرۆڤەکان بە فڵان شێوە دەژین و ڕەنگە جگە لەوەش چارەیەکیان نەبێ، بۆ مرۆڤ درۆ لەگەڵ خۆی دەکا؟ خەریکی ڕاست ئاماژە بەو شتە دەکەی وا ئێستا باسمکرد. کە «دوو حەزیا یەکتری هەڵدەلووشن؟» کەوایە با لێت بپرسم، نەکا منیش وەک دیمیتری چاو لێکەی و پێت وابێ توانایی ڕشتنی خوێنی ئوزۆپم هەیە و دەتوانم بیکووژم؟

ـ ئیوان ئەوە دەڵێی چی؟ من قەت شتی وام بە زەینیش نەگەیشتووە. پێم وانییە دیمیتریش ئەوەی پێبکرێ.

ئیوان پێکەنی و گوتی: «لەبەر ئەوەش بێ سپاست دەکەم. دڵنیابە هەتا بمێنم بەرگریی لێدەکەم. بەڵام لە ئارەزووەکانمدا سەبارەت بەو مەرگە بەهەقی خۆمی دەزانم. خوداحافیز.» بە پێکەنینیشەوە گوتی: «›مەحکوومم مەکە و بە چاوی مرۆڤێکی تاوانبار و دڵڕەش تەماشام مەکە.»

بە گەرمی دەستی یەکتریان گوشی، کارێک کە تاکو ئێستا قەتیان نەکردبوو. ئالیووشا هەستیکرد براکەی دەست پێشخەریی کردووە و دەشیزانی بۆ ئەو کارە ئامانجێکی دیاریکراوی هەیە.

## (١٠)

## هەردوو پێکەوە

ئالیووشا، تا ڕادەیەک ورەی بەردابوو، شێواوتر لەو کاتەی پێی‌نایە ماڵی باوکی، لەوێ چووە دەرێ.

زەینیشی ئاڵۆز و شڵەژا بوو، هەستیشی دەکرد، ئەو زەینە ئاڵۆزەی بۆ ناخرێتەوە سەریەک و ناتوانێ بە سەرجەمی ئەزموونەکانی بیرۆکەیەکی گشتی سازکا. بۆیە لەو ئەزموون و بیرەوەرییە ژاناوی و پڕ لە دژوازییەی ئەو ڕۆژە دەترسا. هەستێکی بوو هاوتەریب لەگەڵ هیوابڕاوی، هەستێک کە تاکو ئەو کاتە، بەلایەوە نامۆ بوو. ئەم پرسیارە پڕ لە گرێکوێرە و مەرگاوییە وەک کێو بە سەر شتەکانی دیکەوە قورسایی دەکرد و باڵای کردبوو: کێشەی نێوان باوکی و دیمیتریی برای لەگەڵ ئەو ژنە سەڵیتە و سامناکە چۆن کۆتاییی پێدەهات؟ ئێستا خۆی شایەدی ڕووداوەکە بوو، ئامادە بوو لە شوێنەکە و هەموو شتێکی بە چاوی خۆی دیتبوو. لەو نێوەشدا تەنیا دیمیتریی برای ناشاد دەبوو، ئەویش ناشادییەکی دژوار و پڕ لە ئازار: گیروگرفتێکی لەڕێدا بوو. هەروەها دەرکەوت دەستی تاقمێکی دیکەش لەکاردایە. زۆر زیاتر لەوەی ئالیووشا بیری لێدەکردەوە. شتێکی زۆر نهێنی و پڕ لە ڕازیشی تێدا بوو. ئیوانی برای هەنگاوی یەکەمی بۆلای ئەو هەڵێنا بۆوە، شتێک کە ئالیووشا زۆر لەمێژ بوو ئاواتی بۆ دەخواست. لەگەڵ ئەوەشدا، ئێستا لەبەر هۆیەک ترسی خستبووە دڵییەوە. بەڵام ئەو ژنانە؟ زۆر سەیرە پێشتر بەو پەڕی سەرسامییەوە دەیویست بەرەو ماڵی کاترینا ئیوانا وەڕێ کەوێ؛ بەڵام ئێستا ئەو هەستەی نەمابوو، ترسی شکابوو. بەپەلە

بەرەو ئەوێ ملی ڕێی گرتبوو، دەتگوت چاوەڕوانی ئەوەیە ڕێنوێنی لەو وەرگرێ. بەڵام گەیاندنی ئەو پەیامە دیار بوو زۆر لە پێشوو دژوارترە. سێ هەزار ڕۆبڵەکەش بە تەواوی بوو بوو بە هیچ و دیمیتری کە خۆی بە ئابڕووچوو دەزانی، بەجارێ هیوابڕاو بووبوو، لەوانەبوو خۆی بە کونێکەوە بنێ. لەگەڵ ئەوەشدا، پێیگوتبوو باسی کێشەکەی ئەو و باوکی کاترینا ئیوانا بگێڕێتەوە.

سەعات حەوت بوو، کاتێ کە ئالیووشا گەیشتە ماڵە بەرین و خۆشەکەی کاترینا ئیوانا، کە لە سەر شەقامی سەرەکی هەڵکەوتبوو، هەوا تەواو تاریک داهات. ئالیووشا دەیزانی کە کاترینا لەگەڵ دوو پووری لەو ماڵەدا دەژی. یەکیان ژنێکی نەخوێندەوار بوو، پووری ئاگاتا ئیوانای زڕخوشکی بوو، کە لە ماڵی باوکی کاتێ لە قوتابخانەی شەوانەڕۆژی دەهاتەوە، ئاگاداریی لێدەکرد. پوورەکەی دیکەش، ئێستا نەبوونی و هەژاری ڕووی تێکردووە، دەنا کاتی خۆی یەکێ لە سەرە ژنانی بەناوبانگی مۆسکۆ بوو. ئەو دوو ژنە وەک باسیان دەکرد لە هەموو بارێکەوە کاترینا ئیوانایان بە مەحرەمی خۆیان دەزانی. ئەویش ئەوانی تەنیا بۆ خزمەت و قەرەواشی ڕاگرتبوو. کاترینا ئیوانا خۆی هیچ کەسی بە مەحرەمی خۆی نەدەزانی، جگە لە خوابژیو، ژنی ژینڕاڵی کۆچ کردوو، کە نەخۆشیی لە مۆسکۆ گیرساندبوویەوە و کاترینا ئیوانا وەک ئەرکی سەر شانی خۆی حەوتووی دوو جار بە وردی هەموو کاروبارەکانی خۆی بۆ دەنووسی.

کاتێک ئالیووشا گەیشتە بەر هەیوانەکە و داوای لەو پێشخزمەتە کرد کە درگاکەی لێکردبۆوە، بچێ و هەواڵی هاتنی ئەوی پێبدا، دیار بوو کە لە هاتنەکەشی ئاگادارن. لەوانەیە لە پەنجێرەکەوە چاویان لێبووبێ. لانیکەم ئالیووشا گوێی لە دەنگێک بوو، ترپەی بەپەلەی هەنگاو و خشەخشی تەشک و داوێنی بیستن. دوو سێ ژن لە وەتاغەکە دەرپەڕیبوون.

ئالیووشا سەری لەوە سووڕمابوو کە هاتنەکەی ئەوەندەی تووشی شڵەژاویی کردوون. هەر بۆیە خێرا بەرەو وەتاغی میوانداری ڕێنوێنییان کرد.

وەتاغێکی گەورە بوو، پڕ لە کەلوپەلی ڕازاوە، لەگەڵ نەریت و شێوازی ناوچەکە یەکی نەدەگرتەوە. قەنەفە و چوارپایە و کورسیلەی لانکەیی و مێزی گەورە و بچووکی تێدا بوو. دیوارەکان ڕەسم و وێنەی پێوە هەڵواسرابوو، گوڵدان و چرا لە سەر مێزەکان و چەن چەپکە گوڵ و تەنانەت ئاکواریۆم، لەبەر پەنجێرەکان داندرابوون. ژوورەکە زۆر ڕووناک نەبوو. ئالیووشا چاوی بە باڵتەیەکی هەوریشمین کەوت کە لە سەر قەنەفەک داندرابوو، دیاربوو کەسێک لەوێ بووە. لە سەر مێزەکەی پەنای قەنەفەکە دوو پەرداخ قاوەی نیوە خوراوە و کەیک داندرابوون. دەفرێکی بلوورینیش پڕ بوو لە کشمیشی مالاگا و دەفرێکی دیکەش پڕ بوو لە شیرینی. ئالیووشا بۆی دەرکەوت کە ناوەخت هاتووە و میوانییەکەی لێ تێکداون، بۆیە گرژ بوو. بەڵام هەر لەو کاتەدا پەردەکە لادرا و کاترینا ئیوانا بە پەلە و هەڵەداوان هاتە ژووریَ و بە بزیەکی شیرین و پڕ لە شادییەوە، هەردوو دەستی بۆلای ئالیووشا درێژ کرد. هەر لەوکاتەدا، پێشخزمەتێک دوو مۆمی داگیرساوی هێنا و لە سەر مێزەکە داینا.

ـ خودایە زۆر شوکور! ئاخری تۆش هاتی! لە بەیانییەوە هەتا ئێستا دەستەودوعا بووم بۆ هاتنت! دانیشە.

جوانیی کاترینا ئیوانا سیَ حەوتوو لەمەوبەر ئالیووشای تاساندبوو. یا هەر ئەو کاتەی دیمیتریی برای، بۆ یەکەمجار، لە سەر داوای تایبەتیی کاترینا ئیوانا لەگەڵ خۆی هێنابووی بۆ ئەوەی بە یەکتریان بناسێنیَ. بەڵام ئەو کاتە لەگەڵ یەکتر نەدوابوون. کاترینا ئیوانا چونکە پێی وابوو ئالیووشا شەرمێونە، بۆ ئەوەی تووشی شەرمەزاری نەبیَ، لەگەڵ دیمیتری فیۆدۆرۆویچ کەوتبووە قسە. ئالیووشا بێدەنگ بوو. زۆر شتی بۆ ڕوون بووبۆوە. لووت بەرزی و حوکم کردن و خۆبەزل زانینی کچە ماتی کردبوو. لەوبارەشەوە گومانی تێدا نەبوو، کە ئالیووشا هەستی دەکرد زێدەڕەویی تێدا نییە. چاوانی ڕەش و گەش و گەورەی کاتریناى زۆر پێجوان بوو، بەتایبەت بەو ڕوخسارە ڕەنگ پەڕیوەیەوە، تەنانەت تۆزیَ مەیلە و زەردە و درێژۆکە. بەڵام لەو چاوانەیدا و

لەو لێوە خونچە ئاسایی و بێوێنەیەیدا شتێکی تێدابوو کە لەوانەیە هەر ئەوە دڵی براکەی ڕفاندبێ. زۆر دانەنیشتن، دوای دیدارەکە، دیمیتری لەبەری دەپاڕایەوە بیروڕای خۆی سەبارەت بە دەزگیرانەکەی دەربڕێ. ئەویش بیروڕای خۆی بە شێوەیەکی ئاشکرا درکاند.

ـ لەگەڵ ئەودا بەختەوەر دەبی، بەڵام ڕەنگە بەختەوەرییەکی ئاوێتە لەگەڵ هێمنایەتی نەبێ.

ـ براگیان هەروایە. ئەو جۆرە مرۆڤانە هەمیشە دەمێنن. خۆ نادەنە دەست چارەنووس. کەوایە بە بڕوای تۆ هەتا هەتا خۆشم ناوێ و لەوانەیە لەبەر چاوم بکەوێ؟

ـ نا، ڕەنگە هەتا هەتایە هەر خۆشت بوێ. بەڵام، لەوانەیە بۆ هەمیشە لەگەڵیدا بەختەور نەبی.

ئالیووشا لە شەرما سوور هەڵگەڕابوو، لەو کاتەدا بیروڕای خۆی لەو بارەوە دەربڕیبوو، لەوەی کە ملی بە خواستی براکەی داوە و ئەو بیروڕا گەوجانەیەی دەربڕیوە، ڕقی لە خۆی هەستا بوو. چونکە دوای بیروڕاکەی هەر خێرا بۆی دەرکەوتبوو گەوجانەیە. هەروەها هەستی بە شەرمەزاری دەکرد کە بیروڕایەکی ئاوا پڕ لە متمانەی سەبارەت بە ژنێک دەربڕیوە. بۆیە ئێستا لەگەڵ یەکەم ڕوانین بۆ کاترینا ئیوانا، بە سەرسوڕمانەوە هەستیکرد لەوانەیە بیروڕاکەی بە تەواوی هەڵە بێ. ئەمجارە ڕووخساری کاترینا لەبەر دلۆڤانی و خولّک خۆشی و سەداقەت و خوینگەرمی trووسکەی دەهات. «ئەو هەوا و دەمارەی» کە پێشتر سەرنجی ئالیووشای ڕاکێشابوو، ئێستا بووبووە وزەیەکی ئاشکرا و سەخی و ئیمانێکی بەقەوەت دەرهەق بەخۆی. ئالیووشا هەر لە یەکەم ڕوانیندا، کە لەگەڵی کەوتە قسە، بۆی دەرکەوت کە تراژیدیای بارودۆخی ئەو لە پێوەندی لەگەڵ پیاوێکدا کە بە گیان و دڵ خۆشی دەوێ، بە ڕوونی دیارە و هەموو شتێک دەزانێ. لەگەڵ ئەوەشدا، بەو مەبەستە وا گەشابۆوە و ئیمانی بە داهاتوو بوو کە هەر باسی ناکرێ. ئالیووشا هەر لەڕێوە بۆی دەرکەوت بەهەڵە چووە. بۆیە خێرا بەزی و

گیرۆدە بوو. لەگەڵ ئەوەشدا، کاتێ کاترینا کەوتە قسە، هەستیکرد، دڵی بە پڕتاو لێدەدا و دڵەخورپە و بێئۆقرەیی وایلێکردووە خەریکە حاڵی لێدێ.

ـ زۆر تامەزرۆی دیدارت بووم، چونکە دەتوانم ئەوی هەقیقەت هەیە لەتۆوە فێربم ـ تەنانەت لە تۆ نەک کەسێکی دیکە.

ئالیووشا، کاس و وڕ، منجاندی: «من ـ ئەو ناردمی.»

کاترینا ئیوانا زەردەیەکی گرت و گوڕاندی: «ئەها! پێشبینیم کردبوو. ئێستا هەموو شتێک دەزانم ـ هەموو شتێک. ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، تۆزێ سەبرکە، پێت دەڵێم بۆچی ئەوەندە تامەزرۆی دیدارت بووم. چاو لێکە، ڕەنگە لە تۆ زیاتر بزانم و پێویستیش ناکا هەموو شتێک بە من بڵێی. پێت دەڵێم کە چیم لە تۆ گەرەکە. دەمەوێ دوایین بیروڕای تۆ سەبارەت بە دیمیتری فیۆدۆرۆویچ بزانم. لەتۆم دەوێ ڕاست و ڕەوان و تەنانەت بە ڕقیشەوە (هەرچۆنێکت پێخۆش بوو،) بە من بڵێ بڕوای تۆ سەبارەت بە ئەو و بارودۆخی ژیانی، دوای دیدارەکەی ئەمڕۆکەت لەگەڵی، چییە. ڕەنگە ئەمە چاکتر بێ لەوەی کە ڕووبەڕوو قسەی لەگەڵدا بکەم. چونکە نایەوێ بێ بۆلام. حاڵی بووی چیم لە تۆ دەوێ؟ ئێستا زۆر بە سادەیی پێم بڵێ، پەیامەکەی دیمیتریم وشە بە وشە پێ بڵێ. (دەمزانی تۆ دەنێرێ.)»

پێیگوتم، بە ڕێزەوە کڕنۆشت بۆ بەرم و ـ پێتبڵێم کە ئیتر نایەت بۆلات ـ بەڵام ڕێز و خۆشەویستی هەیە بۆت و کڕنۆشت بۆ دەبا.

ـ کڕنۆش؟ هەر ئەوەی گوت وتەی خۆیەتی؟

ـ بەڵێ.

ـ ڕەنگە بە ڕێکەوت هەڵەیەک لەو وشەیەدا هەبێ، یان وشەکەی بە دروستی دەرنەبڕیبێ؟

ـ نا؛ ئەو زۆر بە وردی و بە ڕوونی گوتی ئەم وشەیە بۆ تۆ دووپات کەمەوە. دوو سێ جار داوای لێکردم لە بیرم نەچێتەوە.

کاترینا ئیوانا سوور هەڵگەڕا.

- ئالکسی فیۆدۆر پاولۆویچ، ئێستا یارمەتیم بدە. ئێستا بەڕاستی پێویستیم بە یارمەتیت هەیە. بیروڕای خۆمت پێدەڵێم و داوات لێدەکەم پێمبڵێی، درووستە یان نا. گوێ بگرە! ئەگەر هەروا بە دەمیدا بهاتبایە کڕنۆش بۆ من دەبا، لە سەر ئەوە پێداگریی نەدەکرد کە ئەو وشەیە دووپات بکەیەوە، بۆیە دوایی بە هەموو شتێک دەهات! بەڵام ئەگەر بەتایبەت لە سەر ئەو وشەیە پێداگریی کردبێ و ئەگەر بە تایبەت پێیگوتبێتی، دووپاتی «کڕنۆش» بۆ منت لەبیر نەچێ، ڕەنگە شاگەشکە و دەستەپاچە بووبێ. بڕیاری خۆی داوە و تێیدا تووشی ترس بووە. بە هەنگاوی پتەوەوە لە من دوور نەکەوتۆتەوە، تەنیا سەرەنگرێ بووە. پێداگری لە سەر ئەو وشەیەش ڕەنگە تەنیا شاتوشووت بووبێ و بەس.

ئالیووشا بەگەرمی گوڕاندی: «ئەرێ، ئەرێ! پێموایە ڕاست ئەوەیە، چاکی بۆ چووی.»

- ئەگەر واش بێ، بە تەواوی لەدەست دەرنەچووە. تەنیا گرفتاریی ئەو هیوابڕاوییە، بەڵام هەنووکە دەتوانم نەجاتی بدەم. سەبرکە! سەبارەت بە پارە هیچی بە تۆ نەگوت - سەبارەت بە سێ‌هەزار ڕۆبڵ؟

ئالیووشا وەڵامی دایەوە: «با، هەر ئەو شتەیە ئاوا ئاراوقارای لێ‌هەڵگرتووم. گوتی بەجارێ ئابڕووی چووە و ئێستا ئیتر هیچ شتێک بۆ ئەو هەمیەتی نییە.» ئەوەشی بەگەرمی کوت. لە دڵیدا ترووسکەی هیوایەکی هەست پێدەکرد و لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە لەوانەیە دەروویەکی ڕزگاری بۆ براکەی لە گۆڕێدا بێ. گوتیشی: «بۆ تۆ ئاگاداری پارە هەی؟» لە پڕیش بێدەنگ بوو.

- زۆر لەمێژە لەوە ئاگادارم. بۆ ئاگاداربوون برووسکەم لێدا بۆ مۆسکۆ. زۆر لەمەوبەریش بیستم کە پارەکە نەگەیشتووە. پارەکەی نەناردبوو، بەڵام هیچم نەگوت. حەوتووی پێشوو هەواڵم پێگەیشت کە پێویستی بە پارە هەیە. تاقە ئاواتی منیش لەو کارەدا ئەوە بوو، دیمیتری بزانێ بگەڕێتەوە بۆلای کێ و دۆستی ڕاستەقینەشی کێیە. بەڵام، ئەو تێناگا دۆستی ڕاستەقینەی هەر منم.

بەداخەوە نامناسیّ و تەنیا وەک ژنێک چاوم لێدەکا. ئەم حەوتووە عەجمانم لیّهەڵگیرابوو، بیرم لەوە دەکردەوە کاتیّ تووشی دەبم چبکەم کە لەبەر ئەو سیّ هەزار ڕۆبڵە بەخۆدا نەشکێتەوە و هەست بە شەرمەزاری نەکا. لەخۆی شەرمەزارە، با ببیّ؛ لە ئاگاداربوونی کەسانی دیکە شەرمەزارە، باببیّ، بەڵام لە ئاگاداربوونی من نا. دەتوانیّ بەبیّ شەرمکردن و خەجاڵەتیکێشان هەموو شتێک بە خودا بڵیّ. بۆچی ئەو تێناگا من ئامادەم لەبەر خاتری ئەو زۆر شت تامڵ بکەم؟ بۆچی، بۆچی نامناسیّ؟ چۆن دڵی دیّ دوای ئەو هەموو پێکەوەبوونە دەستم لیّهەڵگریّ؟ من دەمەویّ بۆ هەمیشە نەجاتی بدەم. قەیناکا با لە بیریشی بچێتەوە من دەزگیرانیم. ئەوە سەیرە دەترسیّ بەبۆنەی منەوە ئابڕووی چووبیّ. ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، ئەی بۆ کاتیّ لای تۆ ڕاستی ئەو شتانەی گوت، نەترسا؟ ئەی بۆ دەبیّ من مافی ئەوەم نەبیّ؟

دوایین قسەکانی بە گریانەوە دەربڕی، فرمێسک بە چاویدا هاتە خواریّ.

ئالیووشاش بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی: «با پێتبڵێم تاوێک لەمەوبەر چ کێشەیەک لە نێوان ئەو و باوکمدا ساز بوو.» هەموو ڕووداوەکەی بە وردی بۆ گێڕایەوە و تەنانەت ئەوەش کە دیمیتری ئەوی بۆ پارە ناردووە، بەزۆر خۆی کردووە بە ژووریدا، باوکی داوە بە زەویدا و پاشان ئیسەرەمی کردووە کە دەستی بۆ بە سینگەوە بگریّ و بە کڕنۆشەوە بڕواتە دەریّ. هەروەها گوتیشی: «چوو بۆلای ئەو ژنە.»

«تۆ پێتوایە ناتوانم لەگەڵ ئەو ژنە پێکبێم؟ ئەویش پێی وایە ناتوانم؟» کاترینا لە ناکاو قاقایەکی تووڕەی کێشا و درێژەی بە قسەکانی دا: «بەڵام ناتوانیّ لەگەڵ ئەو ژنە زەماوەند بکا. یانی ئەو هەوەسە تاهەتایە لە کارامازۆفێکدا دەمێنیّ؟ هەوەسە، نەک ئەوین. لەگەڵ ئەو ژنە زەماوەند ناکا، چونکە ئەو ژنە شووی پێناکا.» کاترینا ئیوانا دیسان قاقایەکی سەیری کێشا.

ئالیووشا سەری بەردایەوە و بە لەبزێکی خەمبارانەوە گوتی: «ڕەنگە زەماوەندی لەگەڵ بکا.»

کاترینا ئیوانا بەتین و گوڕێکی کتوپڕەوە گوتی: «ئەو قسەیەی منت لەبیر بێ زەماوەندی لەگەڵ ناکا. ئەو ژنە فریشتەیە. ئەوە دەزانی؟ تێدەگەی؟ ژنێکی بێوێنەیە. دەزانم زۆر حیلەبازە، بەڵام دەزانم زۆریش دڵۆڤان و خۆڕاگر و بەشەرەفە. ئالکسی فیۆدۆرۆویچ بۆ ئاوام تەماشا دەکەی؟ ڕەنگە سەرت لە قسەکانم سوڕ مابێ، یان باوەڕ ناکەی؟» سەری بۆلای هۆدەکەی دیکە سووڕاند و بە دەنگێکی بەرز گوتی: «ئاگرافنا ئەلکساندرفنا، فریشتەکەم! وەرە ئەمدیو، دۆستێک هاتووە. ئالیووشایە. ئاگاداری هەموو شتێکمانە. وەرە ئەمدیو وەرە.»

دەنگێکی نەرم و ژنانە، دەشکرێ بڵێین شیرین، گوتی: «لەپشت پەردەکە چاوەڕوانی فەرمایشتی ئێوە بووم.»

پەردەکە لادرا و گرووشنکا، شاد و لێو بە بزە هات بۆلای مێزەکە. ئالیووشا واقی وڕما. چاوی تێبڕی و نەیدەتوانی چاوی لە سەر هەڵگرێ. ئەمەش ئەو، ئەو ژنە بەسامە، ئەو «دەعبا»یە، هەر ئەو جۆرەی نیوسەعات لەمەوبەر ئیوانی برای گوتبووی و ئەو ناوەی پێوە لکاندبوو. گرووشنکا لە هەمبەریدا ڕاوەستابوو، ئالیووشا پێیوابوو لە هەموو ژنێک سادەتر و ئاساییترە. ژنێکی خدەپاک و دڵۆڤان و شۆخ و شەنگ، بەڵام وەک ژنانی دیکە جوان و «ئاسایی»! ئەو کاڵ و کرچی و جوانییەی تایبەتی ژنانی ڕووسییە، ئەوی سەد هێندە شۆخ و دڵڕفێنتر کردبوو، بۆیە پیاوان بۆی شێت و شەیدا بووبوون. ژنێکی باڵابەرز بوو، بەڵام تۆزێ لە کاترینا کورتەباڵاتر، چونکە کاترینا ئیوانا لەڕادەبەدەر کەڵەگەت بوو. توندوتۆڵ، هێدی و لەسەرەخۆ، بێدەنگ و کەم دوو، دەنگیشی وەک هەڵسوکەوتەکەی نەرم و نیان بوو. ڕەوت و ڕۆینی وەک کاترینا ئیوانا توند و بەلەز و جەسوورانە نەبوو، بەڵکو زۆر نەرم و هێواش، وەک ئەوەی پێ لە سەر پەلکی گوڵ دانێ. لەگەڵ ئەوەی جل و بەرگە هەورێشمین و ڕەشەکەی بە نەرمی خشەشی لێدەهات و گەردنە سپی و سۆڵ و شان و ملە ڕێکوپێکەکەی، بە شاڵێکی کشمیریی گرانبایی داپۆشیبوو، بە ئارامی لە سەر کورسیلەیەک دانیشت.

بیست و دوو ساڵی تەمەن بوو، ڕوخساریشی ڕاست وایﻨیشاندەدا. سپی و سۆڵ و کوڵمئاڵ، دەموچاو پان و شەویلکەی خوارووی گۆشتن و پڕ و بەرجەستە، دەتگوت ماسیوە. خەرمانی بسکە خورمایییەکەی و برۆی کەوانی و چاوی شین، بە برژۆڵی دریژ و هەڵگەڕاوەوە، لە نێو ئاپۆرەی خەڵکدا سەرنجی دڵمردووترین پیاوی ڕادەکێشا و لە جێی خۆی وشکی دەکرد. هەرکەسێ دەیدی تا ماوەیەک لەبیری نەدەچۆوە. لە ڕوخساریدا ئەوەی زیاتر لە هەموو شتێک سەرنجی ئالیووشای ڕادەکێشا، گەشاوییە منداڵانەکەی بوو. حاڵەتێکی منداڵانەی لەچاودا بوو، گەشە و نەشەی منداڵانە. بە ڕوویەکی کراوە و پشکووتووەوە هات بۆلای مێزەکە، دەتگوت بە کونچکاوییەکی منداڵانە و بێسەبر و پڕ باوەڕەوە چاوەڕوانی شتێکە. ترووسکەی چاوەگەشەکانی شادیی لەگیان دەگێڕا ـ ئالیووشا هەستی بەوە کردبوو. شتێکی دیکەشی تێدابوو کە ئالیووشا سەری لێ دەرنەدەهێنا. یان نەیدەتوانی تاریفی بکا، بەڵام بێئیختیار شوێنی لە سەر هەست و ڕۆحی دانابوو. ئەو شتەش نەرموونۆڵی و شلوملی و هەڵسوکەوتی ئارامی بوو. وەک پشیلەی نەرم و خرپن. لەگەڵ ئەوەشدا لەشێکی بەهێز و گۆشتنی بوو. شان و ملە نەرم و ناسکەکەی لە ژێر شاڵەکەوە دیاربوو. سینگ و بەرۆکی کچانە و لەش ولاری ڕێکوپێکی دەتگوت وێنووسە، لەویش قیتوقۆز و لەبارتر، ئەوەش پیاو بە ئاشکرا تێیدەگەیشت. جوانیناسانی ڕووسی بەمتمانەوە دەیانتوانی پێشبینی بکەن کە ئەم جوانییە تەڕو پاراوە، کە هێشتا گەشاوەیی پێوە دیارە، لە تەمەنی سی ساڵاندا تێکدەچێ و دەشلوێ؛ دەموچاوی هەڵدەزلەپێ و چرچولۆچ دەکەوێتە تەوێڵ و دەوروبەری چاویان، گرژومۆن دەبێ و سوور هەڵدەگەڕێ ـ لەڕاستیدا ئەو جوانییەکی کاتی بوو، جوانییەکی زوو تێپەڕ کە لە زۆربەی ژنانی ڕووسیدا وەبەرچاو دەکەوێ. هەڵبەت ئالیووشا بیری بۆ ئەوە نەچوو. بەڵام بەجارێ شڵەژابوو، دەتگوت جادوو کراوە، هەستێکی ناخۆش دڵی دەگوشی، دەشکرێ بڵێین، بە داخ و کەسەرەوە لەخۆی پرسی، بۆ وا دەنگی دەلەرزێ و زمانی تەتەڵە دەکا. دیاربوو ئەو جۆرە ئاخافتنەی لەگەڵ

ئەو هەستە ئاوێتە بووە و کێشان و درێژکردنەوەی هیجاکانی خۆشتر کردووە. ئەو خووخدە خراپە، بەهۆی کەمزەوقییەوە بوو، کە فەرهەنگی دواکەوتوو و ڕەنگە هەڵە لە ئەدەب و ئاداب و نەریتی باش جیا دەکاتەوە. ئەوەش بەجێیخۆی، ئەم کرژ و خاوی و شێوە ئاخافتنە بۆ کەسێکی وەک ئالیووشا، لەگەڵ خدەی منداڵانە و ساکار و شادی و گەشاوییی ڕوخساری و تاسەی ئارام و منداڵانە لە چاویدا، بە شێوەیەکی دوور لە باوەڕ ئاڵۆز و ناتەکووز دیاربوو! کاترینا ئیوانا لە ڕێوە گرووشنکای لە سەر کورسیلەیەکی ڕووبەڕووی ئالیووشا دانیشاند و چەنجار بە تامەزرۆییەوە لێوە پڕ بزەکانی ڕامووسی. وای دەنواند کە بەجارێ ئاشق و شەیدای بووە.

کاترینا ئیوانا وەک کەسێکی جەزمبوو گوتی: «ئالکسی فیۆدۆرۆیچ، یەکەم جارە کە یەکتر دەبینین، دەمویست بیناسم، چاوم پێی بکەوێ. دەمویست بچم بۆلای، بەڵام هەرچی سەرم هێناوبرد، نەمزانی چۆنی پێبڵێم و بانگی بکەم بۆلای خۆم. دەمزانی هەموو شتێک پێکەوە حەلوفەسڵ دەکەین ـ هەموو شتێک! دڵم خەبەری دابوو ـ داوایان لێکردم کە پێشقەدەم نەبم، بەڵام پێشبینیم دەکرد، کە ئەوە ڕێگایەکە بۆ دەربازبوون لەو تەنگوچەڵەمە و بە هەڵەش نەچووبووم. گرووشنکا هەموو شتێکی بۆ باسکردووم، پێیگوتووم قەستی چ کارێکی هەیە. ئەمڕۆ وەک فریشتەی خێروبێر بەرەو ئێرە باڵی گرتوو هێمنایەتی و شادیی هێنا بۆمان.»

گرووشنکا بە دەنگێکی نیان و ئەو زەردەخەنە دڵڕفێنەیەوە گوتی: «خاتوونی نازەنین و بەڕێز، خۆ ڕقت لێهەڵنەگرتووم، لێم تووڕەی؟»

ـ هەی عەیار ـ هەی جادووباز، چۆن دەوێری ئاوا قسە لەگەڵ من بکەی؟ منو ڕق هەڵگرتن، ئەویش لە تۆ! ڕاوەستە، دەبێ جارێکی دیکە لێوی خواروت ماچبکەم. ئەو لێوە گۆشتن و جوانەت، هەر دەڵێی خودا بۆ مژین و ماچکردنی خولقاندووە. ئالکسی فیۆدۆرۆویچ چاوی لێکە چەندە جوانە پێدەکەنێ! دیتنی ئەو فریشتەیە شیفای دڵ و ڕۆحە.

ئالیووشا سوور هەڵگەڕا، مۆچڕکێکی سڕ بەنێو شانیدا هات.

ـ خاتوونی بەڕێز و هێژا، زێدەڕەوی دەکەی سەبارەت بە من، ڕەنگە من قەت شایانی ئەو هەموو خۆشەویستی و دڵۆڤانییە نەبم.
کاترینا ئیوانا دیسان بە گوڕ و تینێکەوە گوڕاندی: «شایانی نەبی! جا ئەوە قسەیە، دەڵێ شایانی نییە! دیوتە، ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، ئێمە خەیاڵپڵاو دەکەین، سەرەڕۆین، بەڵام لە نێو دڵە چکۆلەکەماندا لە هەموو بەدەمارێک بەدەمارتر و غوللوورترین. ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، با ئەوەشت پێبڵێم، ئێمە بەشەڕەفین. ئێمە دەست و دڵبازین. بەڵام ناوچاوەکەمان نەیهێناوە. ئێمە بۆ مرۆڤێکی هەرزە و نەشاز و بیرەبیرە ئەو هەمووە لەخۆ بووراین. پیاوێک لە نێواندا بوو ـ پیاوێک، ئەویش ئەفسەرێک بوو کە خۆشم دەویست، لەبەر خاتری ئەو پشتم لە هەموو شتێک کرد. زۆر لەمەوبەر بوو، پێنج ساڵ لەمەوبەر، ئەویش وازی لێهێناین و لەبیری بردینەوە و ژنی هێنا. ئێستا بۆتە بێوەپیاو، نووسیویەتی دێت بۆ ئێرە، دەشزانێ جگە لەو کەسمان خۆش نەویستووە و لە هەموو ماوەی تەمەندا یەکە خۆشەویستمان بووە! ئەو دێت و گرووشنکا هەمیسان بەختەوەر دەبێتەوە. پێنج ساڵە لەگەڵ خەم و ئازار دەژی و جینگڵی داوە. بەڵام کێ دەتوانێ لۆمەی بکا، کێ دەتوانێ خۆی پێوەڕانێ؟ تەنیا ئەو بازرگانە پیرە کە لەلایە، ئەویش زیاتر وەک باوک چاوی لێ دەکرێ، وەک برا و سەرپەرشتی ئێمە وایە. ئەو لەو کاتەدا ئێمەی لەوپەڕی ناهومێدی و لێقەوماویدا دی و زانیی ئەو پیاوەی دڵمان پێوەی بووە، دەستی لە گۆزەدا هێشتوونەتەوە و بۆی دەرچووە. گرووشنکا دەیویست خۆی بخنکێنێ، بەڵام بازرگانی پیر نەجاتی دا ـ ئەرێ ئەو نەجاتی دا!»
گرووشنکا دیسان بە دەنگێکی نیانەوە گوتی: «خاتوونی هێژا و بەڕێز، تۆ زۆر دڵۆڤانانە لایەنگری لە من دەکەی. زۆر بەتاڵووکەی و لەخۆڕا هەڵدەچی.»
ـ لایەنگری لە تۆ دەکەم! من شیاوی لایەنگری لە تۆم؟ چون دەتوانم ئەو ورەیە بەرخۆم بنێم و لایەنگری لە تۆ بکەم؟ گرووشنکای ئازیز، فریشتە

نازشێواوەکەم، دەستت بدەرە دەستم. ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، تۆ چاو لەو دەستە خرپن و ناسک و جوانانە بکە! بڕوانە! هەر ئەو دەستانە بەختەوەریی بۆ من هێناوە و هەڵیستاندوومەتەوە. دەمهەوێ پشت و لەپی ماچبکەم، ئالکسی فیۆدۆرۆویچ!

پاشان سێجار لە سەر یەک دەستە ناسک و خرپنەکەی گرووشنکای ڕامووسی و لەوانەبوو شاگەشکە بێ. گرووشنکا بە نەرمە بزەیەک و تووڕە بوونێکی نەرم و نیانەوە دەستی کێشایەوە دواوە، چاوی لە «خاتوونی شۆخ و نازدار» بڕی و دیاربوو ماچکردنی دەستی بە لاوە خۆش بووە.

ئالیووشا لە دڵی خۆیدا گوتی: «ڕەنگە حاڵ لێهاتنێکی لەڕادەبەدەر لە گۆڕێدا بێ.» سوور هەڵگەڕا، هەستی بە شڵەژانێکی سەیر دەکرد.

ـ خاتوونی ئازیز و هێژا، لەبەر چاوی ئالکسی فیۆدۆرۆویچ بەو دەست ماچکردنە بە خۆمدا مەشکێنەوە.

کاترینا ئیوانا، تا ڕادەیەک تووشی سەرسووڕمان بوو، گوتی: «پێتوایە قەستی ئەوەم بوو توشی بەخۆدا شکانەوە و شەرمەزاریت بکەم؟ ئاخ چاوەکەم، تۆ لە نیازی دڵم ئاگادار نییت!»

ـ بەڵێ خاتوونی هێژا و بەڕێز، تۆش ڕەنگە بە تەواوی لە مەبەستم نەگەیشتبێتی. لەوانەیە ئەو جۆرەی کە دەمبینی، وا نەبم. من بەدزاتم! ڕاست بەپێی ڕەوەشتی خۆشم هەڵسوکەوت دەکەم. ئەو ڕۆژە تەنیا بۆ ڕابواردن دیمیتری فیۆدۆرۆویچی بێچارەم هەڵفریواند.

ـ بەڵام ئێستا ڕزگاری دەکەی، بەڵێنت بە من داوە. هەموو شتێکی بۆ شی دەکەیتەوە. ئاگاداری دەکەیتەوە کە لەمێژە دڵت بە پیاوێکەوەیە و ئێستا هاتۆتە خوازبێنیت.

ـ ئاخ، نا! بۆ ئەو کارە هیچ بەڵێنێکم بە تۆ نەداوە. خۆت ئەوەت دامەزراند. من هیچ بەڵێنێکم بە تۆ نەداوە.

کاترینا ئیوانا تۆزێ ڕەنگی هەڵبزڕکا و لەسەرەخۆ گوتی: «کەوایە بە جوانی لە مەبەستت نەگەیشتم. پێموابوو بەڵێنیت پێداوم.»

گرووشنکا، هەروا بە سادەیی و بزەیەکی نەرمونیانەوە، پەڕییە نێو قسەکانی: «ئەیەڕۆ، نا، خاتوونی بەڕێز، من هیچ بەڵێنێکم نەداوە. خاتوو فریشتەی هێژا، خۆ دەزانی لە چاو تۆ چەندە سەرەڕۆم. ئەگەر بمهەوێ کارێک بکەم دەیکەم. لەوانەیە هەر ئێستا بەڵێنێکم بە تۆ دابێ. بەڵام ئێستا خەریکم بیر دەکەمەوە. لەوانەیە دیسان دڵ بە میتیا بدەمەوە. جارێک زۆرم بەردڵ کەوت ـ ماوەی سەعاتێک زۆرم بەدڵ بوو. لەوانەیە هەر ئەمڕۆ بچم بۆلای و پێی بڵێم لە ئەمڕۆبەدواوە لەگەڵت دەمێنم و دیوتە چۆن گۆڕاوم.»

کاترینا ئیوانا بە شێواوی گوتی: «هەر ئێستا شتێک ـ شتێکی دیکەت گوت.»

ـ چی، هەر ئێستا! بەڵام خۆت دەزانی من بوونەوەرێکی بە بەزەیی و گەمژەم. بیری لێبکەوە لەبەر خاتری من چەندەی ئازار چێشتووە! ئەگەر بچم بۆ ماڵەکەی و دڵم پێی بسووتێ، چبکەم؟

ـ قەتم ئەو چاوەڕوانییە لە تۆ نەبوو کە...

«ئاخ. خاتوونی هێژا، تۆ لەچاو من چەندە چاک و دڵفراوانی! خۆ ئێستا لە خووخدەم گەیشتی، ڕەنگە بۆ بوونەوەرێکی کەلحۆی وەک من بایەخ دانەنێی.» پاشان زۆر لەسەرەخۆ گوتی: «خاتوونی پەریشێوە، دەستە ناسک و نازدارەکەت بدە دەستم،» زۆر بەڕێز و گەرموگوڕییەوە، دەستی کاترینا ئیوانای گرت.

ـ خاتوونی بەڕێز و ئازیز، دەستت دەگرم و هەر ئەو جۆرەی تۆ دەستی منت ماچکرد، منیش ئاوا دەستی تۆ ماچدەکەم. تۆ سێ جار دەستی منت ماچکرد، بەڵام من دەبێ سێ هەزار جار دەستی تۆ ماچبکەم، بۆ ئەوەی وەک یەک بێینەوە. لەوەگەڕێین. ئەو کاتە ئەوەی خودا بیهەوێ هەر ئەو دەبێ. ڕەنگە ببمە قەرەواشی ئێوە، تەواوی کاروبارەکانتان وەک کڵفەتێک جێبەجێ بکەم. لێگەڕێ هەرچی خودا دەیهەوێ با هەر ئەو بێ، بەبێ قەراروبڕیە. چ دەستێکی جوان و خشپیلانە، چ دەستێی جوان و خشپیلانەت هەیە! خاتوونی بەڕێز و هێژا، ئەی جوانی بێوێنە!

دەستی کاترینا ئیوانای برد بۆلای لێوی، بەو قەستەی کە لە ماچکردندا، لەگەڵ ئەو «بەرانبەر» بێتەوە. کاترینا ئیوانا دەستی کێشا دواوە. بە ترس و هیواوە گوێی لە دوایین وشەکان گرت، ئەگەرچی گرووشنکا بەڵێنیی خۆی بۆ کار و فەرمانی ئەو وەک کڵفەتێک بە شێوەیەکی سەیر دەربڕی. بە وردی چاوی لە چاوی بڕی، لە چاوانیدا هێشتا ئەو حاڵەتی پاکی بڕوایە، ئەو بزە شیرینەی بە ئاشکرا دیاربوو. کاترینا ئیوانا، بەتین و تاوێکی پڕهیواوە بەخۆی گوت: «ڕەنگە زۆر ساویلکە بێ.» هەر لەو کاتەدا، گرووشنکا تامەزرۆی ئەو «دەستە جوان و خشپیلانە»ی کاترینا بوو. بەقەستی بردی بۆلای لێوی. بەڵام چەن ساتێک لەپەنا لێوی ڕایگرت، لەوە دەچوو سەبارەت بە شتێک دوودڵ بێ.

بە دەنگێکی نەرمتر و شیرینتر لە پێشوو گوتی: «دەزانی چی، خاتوونی پەری شێوە، پێموایە دەستت ماچنەکەم باشترە!» بە شادی دای لە قاقای پێکەنین.

کاترینا ئیوانا واقی وڕما و دوای تاوێ گوتی: «هەر چۆنێ مەیلت لێیە. کەس لە تۆ ناگا!»

«بۆ ئەوەی لە بیرت بمێنێ کە تۆ دەستت ماچکردم، بەڵام من دەستی تۆم ماچنەکرد.» زەردەیەکی گرت و بە وردی چاوی لە کاترینا ئیوانا بڕی.

کاترینا ئیوانا، وەک ئەوەی کتوپڕ لە شتێک ئاگادار بووبێ، گوڕاندی: «ئەی بێحەیا!» ئاڵەتی بوو و هەستایە سەرپێ. گرووشنکاش هەستا، بەڵام زۆر بە ئارامی.

ـ بۆ ئەوەی بە میتیا بڵێم تۆ دەستمت ماچکرد، بەڵام من دەستی تۆم ماچنەکرد. پاشان جا وەرە و بیبینە چۆن قاقا دەکێشێ!

ـ ئەی سەڵیتەی بێشەرم، بڕۆ لەبەرچاوم ون بە!

ـ حەیات بێ، خاتوونی بەڕێز! حەیات بێ! خاتوونی بەڕێز و ئازیز ئەو قسەیە لە کەسێکی وەک تۆ ناوەشێتەوە.

کاترینا ئیوانا قیژاندی: «بڕۆ شەپێ لە خۆت هەڵدە، بڵحی لەش فرۆش!»

ڕەنگی سوور هەڵگەڕابوو و لێوی دەلەرزی.

ـ ڕاست دەکەی! تۆ خۆت سەردەمێ بۆ پارە ئێواران ڕەگەڵ پیاوان دەکەوتی. جوانیی خۆت بۆ فرۆشتن هێناوە، چاک دەزانم.

کاترینا ئیوانا دیسان قیژاندی و ئەگەر ئالیووشا بەهێز و قەوەتی خۆی نەیگرتایە، هۆمەنی بۆ گرووشنکا دەبرد.

ـ نە هەنگاوێک دەچیتە پێشێ و نە قسەیەک دەکەی! هیچ مەڵێ!، جوابی مەدەوە. لێرە دەڕوا ـ خێرا لێرە دەڕوا.

لەوکاتەدا هەردوو پوورەکەی کاترینا ئیوانا گوێیان لە قیژەکەی بووبوو، بە هەڵەداوان خۆیان بە ژوورێدا کرد و کڵفەتێکیشیان لەگەڵدا بوو. هەموویان هەڵاتن بۆلای.

گرووشنکا عەباکەی لە سەر قەنەفەکە هەڵگرت و گوتی: «ئەوە دەڕۆم. ئالیووشا گیان هەتا ماڵێ لەگەڵم وەرە.!»

ئالیووشا دەستی هەڵپێکا و وەک پاڕانەوە گوڕاندی: «بڕو ـ بڕۆ، زووکە بڕۆ!»

ـ ئالیووشنکا وردیلەی ئازیز، هەتا ماڵێ لەگەڵم وەرە. لەڕێگا قسەیەکی خۆشت بۆ دەگێڕمەوە. ئالیووشنکا من لەبەر خاتری تۆ و قازانجی تۆ دەست لەم کێشەیە هەڵدەگرم و دەڕۆم. خۆشەویستەکەم، هەتا ماڵێ لەگەڵم وەرە، زەرەد ناکەی، زۆریش خۆشحاڵ دەبی.

ئالیووشا، دەستی هەڵپێکا و ڕووی وەرگێڕا. گرووشنکا وەک کەو دەیقاسپاند، بە هەڵەداوان ڕۆیشتە دەرێ.

کاترینا ئیوانا وای ڕق هەستابوو، ئازای ئەندامی دەلەرزی و دای لە پرمەی گریان.

پووره گەورەکەی گوتی: «بە گوێمدا دای، هەولمدا بەر بە ئەو کارەت بگرم. خێرا ڕقت هەڵدەستێ و هەڵدەچی. ئەو کارانە لە تۆ ناوەشێنەوە. تۆ ئەو بوونەوەرانە ناناسی، دەڵێن لەوانەی دیکەش خراپترە. تۆ زۆر سەرەڕۆی.»

کاترینا ئیوانا نەڕاندی: «ئەوە دێڵە بەورە! ئالکسی فیۆدۆرۆویچ بۆ نەتهێشت لێیدەم؟ لێمدەدا، زۆر پیسم لێدەدا!»

لە هەنتەشی ئالیووشادا نەیدەتوانی دان بەخۆیا بگری؛ ڕەنگە لەڕاستیشدا، هیچ هەمیەتێکی پێنەدا.

ـ دەبێ لەبەر چاوی ئاپۆرەی خەڵک بە قامچی لێیدرێ و ئەتک کرێ!

ئالیووشا بەرەو درگاکە پاشەوپاش کشایەوە.

کاترینا ئیوانا هەردوو دەستی قووچاند و گوڕاندی: «بەڵام، خودایە! یانی ئەو! ئەو هەتا ئەوڕادەیە ناکەس و بێئابڕووە! باسی ئەو ڕۆژە نەخس و نەگبەتەی بۆ گێڕاوەتەوە! «خاتوونی بەڕێز و هێژا، تۆ جوانیی خۆت بۆ فرۆش هێناوە.» لەوە ئاگادارە! ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، براکەت زۆرهیچوپووچە.

ئالیووشا ویستی شتێک بڵێ، بەڵام نەیزانی بڵێ چی. دڵی ڕێک گوشرابوو و ژانی دەکرد.

ـ ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، لێرە بڕۆ، بۆ من شوورەییە، سامناکە! سبەینێ، تکات لێدەکەم سبەینێ وەرەوە. لۆمەم مەکە، بمبوورە. ئێستا سەرم لێشێواوە و نازانم چبکەم!

ئالیووشا، سەری لەگێژەوە دەهات، گەیشتە سەر شەقام. لەوانەبوو لە تاوی کاترینا و هەڵسوکەوتەکەی دەستبکا بە گریان. لە ناکاو کڵفەتی ماڵێ خۆی گەیاندێ.

ـ خاتوون ئەم نامەیەی مادام خۆخلاکۆفی لەبیر نەبوو بتداتێ. وەختی شێوخواردن بوو هێنایان.

ئالیووشا بێئیختیار پاکەتێکی چکۆڵەی پەمەییی وەرگرت و نایە گیرفانی.

(١١)

## ئابڕوویەکی دیکەش چوو

لە شارەوە هەتا کلێسە نیو کیلۆمەتر ڕێ بوو. ئالیووشا بە قەراغ ڕێگاکەدا، کە ئەو کاتە چۆڵوهۆڵ بوو، بەپەلە هەنگاوی دەنا. زۆری نەمابوو شەو بەسەردا بێ. هەوا وا تاریک داهاتبوو نەتدەتوانی سێ هەنگاو پێشی خۆت ببینی. لە نیوەی ڕێگا دووڕێیانێکی لێبوو. لە ژێر تاقە دارە بیی پەنا دووڕێیانەکە تاپۆیەک وەدەر کەوت. هەرکە ئالیووشا گەیشتە دووڕێیانەکە، ئەو تارماییە لەبن دارەکە هاتە دەرێ، وەک شێت و هار هەڕای کردە ئالیووشا و نەڕاندی:

ـ یان پارە یان گیانت!

ئالیووشا، بە سەرسوڕماوی و هەراسانی، گوڕاندی: «میتیا ئەوە تۆی؟»

ـ هە، هە، هە! چاوەڕوانی ئەوەت نەدەکرد؟ بیرمکردەوە لەکوێ چاوەڕوانت بم. لەلای ماڵەکەی ئەو؟ ماڵەکەی ئەو سێ ڕێگای هەیە و لەوانەیە نەتبینم. پاشان بیرمکردەوە لێرە لەسەرت ڕاوەستم، چونکە ناچار بووی لێرەوە بگەڕێیتەوە و کلێسەش جگە لەوە ڕێگایەکی دیکەی نییە. ئێستا ڕاستم پێبڵێ و وەک قالۆنچە جیقوفیقم دەرهێنە. چیم لێدەکەی بیکە، بەڵام پێمبڵێ چی بووە؟

«هیچ نەبووە، براکەم، زاورم چوو. ئاخ دیمیتری! خوێنی باوکم، هەر ئێستا.»

ئالیووشا دای لە پڕمەی گریان. ماوەیەکی زۆر بوو کوڵی هەستابوو . ئێستا وادیارە بوغزەکەی تەقیبوو. «ئەوندەی نەمابوو بیکوژی ـ تووک و

نزات لێکرد ـ ئێستاش ـ فەرموو ـ ئێستاش خەریکی گاڵتە دەکەی ـ یان پارە، یان گیانت!»

دەی چیبووە؟ یانی کارێکی باشم نەکردووە ـ ها؟ یانی نەدەبوو ئەو کارە بکەم و لە من نەدەوەشایەوە؟

ـ نا. من تەنیا....

ـ سەبر کە. چاو لە شەو بکە. دیوتە چ شەوێکی خەمناکە. هەور و هەڵایە، دیوتە چ بایەک هەڵیکردووە. لێرە لە ژێر ئەو دارە خۆم مەڵاسکرد و چاوەڕوانت مامەوە. خوداش لەوسەرە ئاگای لێیە، لە دڵی خۆما گوتم: «تاکەی درێژە بەو ژیانە پڕ لە نەگبەت و چەرمەسەرییە بدەم؟ ئیتر خۆ هیچ هیوایەکم نەماوە. دارە بییەک و دەسرەیەک و کراسێکم لە ئیختیاردایە، لە دەقیقەیەکدا دەتوانم بیکەم بە پەت و هەروەها قایشی پانتۆڵەکەشم هەیە. بۆ لەخۆڕا سەرباری زەوی بم و بە بوونی خوێڕییانەی خۆم سووکایەتیی پێبکەم. هەر لەو بیرەدا بووم گوێم لە ترپەی پێت بوو ـ خودایە، دەتگوت لەپڕ ژێر پێم خاڵی بوو بە عەرزیدا ڕۆچووم. کەسێک خەریکە دێ بۆ ئێرە کە خۆشم دەوێ. ئەوەتا، ئەو کەسەش، براچکۆڵە خۆشەویستەکەمە، کە لە دنیادا لە هەموو کەسم خۆشتر دەوێ. تەنیا کەسێکە کە لە دنیادا خۆشم دەوێ. لەو کاتەشدا خۆشەویستیم بۆ تۆ ئەوەندە لە زیادییدا، لە دڵی خۆمدا گوتم: «لەڕێوە دەست دەکەمە ملی.» بەڵام کتوپڕ بیرێکی گەوجانە بە مێشکمدا هات، کە گاڵتەیەکت لەگەڵدا بکەم و بتترسێنم. وەک کەسێکی گەمژە و نەزان قوولاندم: «یان پارە....» لەو گەوجییەم ببوورە ـ تەنیا وڕاوەیەک بوو، شتێکی ناشایستیشم لە دڵدا نەبوو... خودا غەزەبیان لێگرێ، باسەکەم بۆ وەگێڕە. گوتی چی؟ تێمهەڵدە. جیقم دەرهێنە، چاوپۆشیم لێمەکە! خۆ تووڕە نەبوو، ها؟

ـ نا، شتێکی وانەبوو، شتێکی وانەبوو، میتیا. لەوێ ـ هەردووکیانم پێکەوە دی.

ـ هەردووکیان؟ کێ؟

ـ گرووشنکا لە ماڵی کاترینا ئیوانا بوو.

دیمیتری فیۆدۆرۆویچ گێژوویژ بوو، هاواری کرد: «مەحاڵە، گاڵتە دەکەی! گرووشنکا و ئەو پێکەوە؟» ئالیووشا تەواوی بەسەرهاتەکەی مووبەموو بۆ گێڕایەوە. گێڕانەوەی ڕووداوەکە دە دەقیقەیەکی خایاند. ناتوانین بڵێین هەمووی ڕەوان و بێ گرێوگۆڵ گێڕایەوە. بەڵام وای دەنواند کە ڕوونی دەکاتەوە و وتە و کردەوەیەکی شایانی هەمیەت لە قەڵەم ناخا و بووچوونەکانی خۆی زیاتر بە وشەیەک بەڕوونی باسدەکرد. دیمیتریی برای متەقی نەدەکرد و گوێی بۆ شلکردبوو و بە چاوێکی پڕ لە ترسەوە تێیڕامابوو. بەڵام ئالیووشا دەیزانی کە لە هەموو شتێک دەگا و بەجوانی حاڵی بووە. بەڵام هەروا کە چیرۆکەکە دەچووە پێشێ ڕوخساری ئەویش نەک خەمناک بەڵکو سامناکیش دەبوو. نێوچاوانی تێکدەنا، و ددانەوە چیرە دەکەوت و چاوی وەک کەشکە فەریکە دەردەپەڕاند. تا ئەوەی کتوپڕ ئەدگارە ڕقتێزاو و وەحشییەکەی گۆڕا، لێوە قووچاوەکانی کرایەوە و دەستی کرد بە پێکەنینێکی توند و قاقای دەکێشا و هەموو گیانی لەگەڵی دەلەرزییەوە و هەتا ماوەیەک قسەی بۆ نەهات.

لەپەستا دەیگوت: «کەوایە دەستی ماچنەکرد! ماچینەکرد؛ هەڵات!» هێندە شاد بوو شێتانە قسەی دەپەڕاند. ئەو شادییەشی دەکرا وەک کردەوەیەکی ڕووهەڵماڵدراوانە ناو بەرین. هەڵبەت ئەگەر ئاوا بێئیختیار نەبووایە.

«گوتت ئەوی دیکەیان بەوی گوت دێڵەبەور! دێڵەبەوریش هەیە! کە دەبێ لەبەرچاوی ئاپۆرەی خەڵک قامچیی لێدەن. براگیان، قەیناکا با ئەو سزا بدرێ، بەڵام سەرەتا دەبێ من باشتر بم. ئاگاداری خووخدەی ئەو مەلەکەی سەربزێوی و ڕووهەڵماڵاوییەش هەم. ڕاست و ڕەوان خۆیەتی! لە کاتی ئەو دەست ماچکردنەدا، ئەو ژنە دۆزەخییەت بەجوانی دیوە! شاژنی تەواوی ژنانی دۆزەخی کە لەم دنیایەدا بیری لێبکەیتەوە! لە شێوەی تایبەت بەخۆیدا بێ وێنەیە! هەڵاتەوە بۆ ماڵێ، ها؟ منیش دەڕۆم ـ ئاخ ـ منیش هەڵدێم بۆلای ئەو! ئالیووشا، لۆمەم مەکە، دەزانم لە داردانیش بۆ ئەو کەمە.»

ئالیووشا بە لەبزێکی خەمبارانەوە گوتی: «ئەی کاترینا ئیوانا؟»

ـ ئەویش دەبینم! تەنانەت قووڵایی گیانی دەبینم، کارێک کە تا ئێستا نەمکردووە! دۆزینەوەی چوارقورنەی دنیا، یانی، پێنج قورنە، دەمێنێتەوە. ئەویش چ کارێک؟ ڕاست وەک کاری کاتنکا وایە، هەر ئەو خاتوونە نازەنینەی دامەزراوەی دەوڵەتی کە لە ژێر کارتێکەرییەکی کەریمانەدا بۆ ڕزگار کردنی باوکی، لەو ئەفسەرە تووڕە و تۆسنە نەترسا و خۆی لەبەر سووکایەتییە گیانپڕووکێنەکەیدا ڕاگرت! بەڵام چ شەڕێک، غەڕەبوون و نەترسان، شەڕ لەگەڵ چارەنووس، شەڕێکی لەڕادە بەدەر پڕ مەترسی!

گوتت ئەو پلکەی دەیویست دەستی بگرێ و نەهێڵێ تووشی شەڕ بێ؟ ئەو پوورە خاتوونەشی خۆی بە خەڵوارێک شەکرەوە ناخورێ و تامڵ کردنی دژوارە. خوشکی ئەو بێوەژنەیە کە مێردەکەی ژینراڵێکی مۆسکۆیی بوو، لەویش ڕەسەنترە. بەڵام کاتی دزینی پارەی دەوڵەت مەچەکیان گرت. هەموو شتێکی لە دەست بۆوە، ملک و ماڵ و هتد... ژنە لەخۆباییەکەشی ناچاربوو لەو فاکوفیکە بکەوێ و لەو کاتەوە ئیتر سەری هەڵنەهێناوە. دەی ویستی پێش بە کاتیا بگرێ و ئەویش جوابی نەدایەوە! پێیوایە بە سەر هەموو شتێکدا زاڵە و هەموو کەس کەوی و دەستەمۆی ئەوە. پێیوابووە ئەگەر بیهەوێ دەتوانێ گرووشنکا فریودا، خۆشی بڕوای بەوە کردووە. خەریکی دەورگێڕانە و ئەوەش خەتای کێیە؟ پێتوایە سەرەتا بەقەست و بە ویستێکەوە دەستی گرووشنکای ماچکردبێ؟ نا، ئەو لەڕاستیدا، جادووکراوی دەستی گرووشنکایە، یانی گرووشنکا نا، خەون و خەیاڵی خۆی، لە دەست خۆی فریوی خواردووە، چونکە خەون و خەیاڵی خۆی فریودەری خۆی بوو! ئالیووشاگیان، لەدەست ئەوان، ئەو ژنانە، چۆن دەرباز بووی؟ عەباکەت هەڵگرت و هەڵاتی؟ هە، هە، هە!

ـ براگیان، دیارە تێگەیشتووی کە بە گێڕانەوەی ڕووداوی ئەو ڕۆژە چۆنت سووکایەتی بە کاترینا ئیوانا کردووە. گرووشنکاش بەرەوڕوو پێیگوت کە بەدزییەوە ڕەگەڵ پیاوان کەوتووە کە جوانیی خۆی بفرۆشێ! یانی سووکایەتی لەوە خراپتر دەبێ؟

ئەوەی کە ئالیووشای لە هەموو شتێک زیاتر شڵەژاندبوو، ئەوە بوو کە براکەی بە ئابڕووتکانی کاترینا ئیوانا گەشەی دەکرد و خۆشحاڵ بوو. ئەگەرچی لەوانەیە واش نەبێ.

«پێهە!» دیمیتری فیۆدۆرۆویچ گرژ بوو و کێشای بە نێوچاوانی خۆیدا. تازە تێگەیشتبوو، ئالیووشا باسی ئەو سووکایەتی و گوڕاندنەی کاترینا ئیوانا دەکا کە گوتبووی: «براکەت هیچوپووچە.»

ـ ئەرێ، سەبارەت بەو «ڕۆژە نەخسە» کاتیا گوتەنی، ڕەنگە باسم بۆ گرووشنکا کردبێ. ئەرێ بۆم گێڕایەوە، لەبیرمە! هەر ئەو کاتە بوو کە چووبووین بۆ (ماکرۆیە) مەست بووم، قەرەجەکان گۆرانییان دەگوت... بەڵام من هۆن هۆن دەگریام. چۆکم دادابوو و لە هەمبەر وێنەکەی کاتیادا زووڕەزووڕ دەگریام، گرووشنکا تێگەیشت. بە هەموو شتێکی زانی. لەبیرمە دەستیکرد بە گریان... خودا بیانکوژێ! بەڵام ئێستا مقەدەر وایە کە ئەوە ببێ... ئەو کاتە گریا، بەڵام ئێستا «دڕکی لە دڵ چەقیوە!» ژنان هەروان هیدی.

دیمیتری فیۆدۆرۆویچ سەری داخست و کەوتە بیرکردنەوە. لە ناکاو بە دەنگێکی خەماوی گوتی: «ئەرێ، من هیچوپووچم، شەشدانگ هیچوپووچ! گرینگ نییە گریام یان نەگریام، من هیچوپووچم! پێی بڵێ کە بەگیان و بە دڵ ئەو ناوەم قەبووڵە. هەڵبەت ئەگەر مایەی ئۆخژن و ئۆقرە بێ. چاکە ئیتر بەسە. خوداحافیز، قسەکردن بێ فایدەیە! بۆ سەرگەرمیش نابێ، تۆ بە ڕێی خۆتا بڕۆ منیش بە ڕێی خۆمدا. ئیتر نامەوێ چاویشم پێت بکەوێتەوە، مەگین وەک دوایین پەنا و داڵدە. خوداحافیز، ئالکسی!» دەستی ئالیووشای بەگەرمی گوشی و هەروا ملی بە خوزدا گرتبوو، بێ ئەوەی سەری هەڵێنێ، لەجێی خۆی بزووت، بە پڕتاو بەرەو شار وەڕێ کەوت. ئالیووشا لە دواوە چاوی تێبڕی، بڕوای نەدەکرد کە ئاوا لە ناکاو بڕوا.

دیمیتری فیۆدۆرۆویچ لەپڕ ئاوڕی دایەوە و هاواری کرد: «سەبرکە، ئالیووشا، ڕاستی شتێکی دیکەش دەڵێم، بەڵام تەنیا لەلای تۆ دەیدرکێنم! چاوم‌لێکە، چاک بڕوانە، چاو لێرە بکە، ئێرە شوورەییەکی تاڵی بۆ من

پێوەیە.» (دیمیتری فیۆدۆرۆویچ بە گوتنی «ئێرە» شێتانە بە مشت لە سنگی خۆی ڕادەکێشا، دەتگوت شوورەییە کە ڕاست لە سینگیدا خۆی شاردۆتەوە. لە جێگایەکدا، لە گیرفانیدا، ڕەنگە بە ملیشیدا هەڵیواسیبێ.) ئێستا تۆ وەک مرۆڤێکی هیچوپووچ، هیچوپووچێکی سوێندخواردوو من دەناسی، بەڵام ڕاوەستە پێتبڵێم کە بەر لە ئێستاش و دواتریش کاری وام نەکردووە، کە لە پەستی و خوێڕییەتیدا لەگەڵ ئەو نەنگ و شوورەییە پێکی بگری و ئێستا هەر لەم کاتەدا لە دڵمدایە، ئێرە، ئێرە ئەگەر گەشە بکا، هەرچەند لە ڕاگرتنی ئەودا بەتەواوی ئازادم، دەتوانم بەری پێبگرم، یان هەتا کۆتایی ڕایدەم، جوان ئەوە تێبگە. با ئەوەشت پێبڵێم، ئەوە هەتا کۆتایی دەبەم. پێشی پێناگرم. هەر ئێستا هەموو شتێکم پێگوتی، بەڵام ئەوەم پێ‌نەگوتی. چونکە تەنانەت ناتوانم بەتەواوی پڕکێشیشی تێدا بکەم. هێشتا دەتوانم پێشی پێبگرم؛ ئەگەر وابکەم. دەتوانم نیوەی تەواوی ئابڕووی لەکیس‌چووم بکڕمەوە. بەڵام واناکەم. پیلانی خوێڕییانەی خۆم دەبەمە پێشێ. تۆش دەتوانی شایەدی بدەی کە لەپێشدا ئەوەم بۆ باس کردووی. تاریکی و لەبەریەک چوون! پێویست بە گوتن ناکا. بە وەختی خۆی تێیدەگەی. کۆڵانی تەنگەبەری گەمار و ژنی دۆزەخی. خوداحافیز. دوعام بۆ مەکە. چونکە شیاوی نیم. پێویستیش نییە، قەت پێوست ناکا... نیازیشم پێی‌نییە! دەڕۆم!»

لەناکاو وەرسووڕاو ئەمجارە لای نەکردەوە. ئالیوشاش بەرەو کلێسە کەوتە ڕێ. «چی؟ یانی ئیتر قەت نایبینم! ئەوە دەڵێ چی؟ لێم ڕوونە کە سبەینێ دەیبینم. ئەوەشی لێ دەردەکێشم. مەبەستی چییە؟»

***

دەورێکی کلێسەکەی لێداو لە دارستانەکە تێپەڕی و گەیشتە حوجرەکە... دەرگایان لێکردەوە. ئەگەرچی لەوکاتەی شەودا ئیزنی چوونەژوورێیان بە کەس نەدەدا. لەو دەمەدا کە پێی نایە حوجرەکەی باوە زووسیماوە، دڵی دەلەرزی. «بۆ، بۆ چووبووە پێشێ؟ بۆ ئەوی ناردبۆوە بۆ دنیا؟ ئێرە هێمنایەتیی لێبوو. ئێرە پاکیی لێبوو. بەڵام ئەوێ پڕ لە ئاڵۆزی و خەم و

کۆڤان بوو. پیاو سەری لێدەشێوا و خێرا گومڕا دەبوو و سەرەندەری نەدەکرد...»

پۆرفیری تازە مرید و باوە پایسی لە حوجرەکە بوون، ئەوان هەموو سەری سەعاتێک دەهاتن و لە حاڵوباڵی باوە زووسیمایان دەپرسی. ئالیووشا تێگەیشت کە حاڵی باوە زووسیما خراپە و ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ خراپتریش دەبێ. تەنانەت ئەو ڕۆژە نەیتوانیبوو بە شێوەیەکی ئاساییش لەگەڵ برادەران بدوێ. وا باو بوو هەموو شەوێ دوای بەڕێوەچوونی ڕێ و ڕەسمی عیشای ڕەببانی هەموو ڕاهیبەکان دەڕژانە حوجرەکەی باوە زووسیما و تێکڕا بە دەنگێکی بەرز دەستیان دەکرد بە پاڕانەوە و تۆبە کردن. دانیان بە هەموو کردەوەکانیاندا دەنا، هەر لە دەمەقاڵێ و کێشەی ڕۆژانەوە بگرە هەتا بیرۆکە و وەسواسی پڕ لە تاوان و خەیاڵی خراپ، هیچیان نەدەهێشتەوە. تاقمێکیان چۆکیان دادەدا و دەپاڕانەوە. پیری کلێسە دەیبەخشین و ئاشتی دەکردنەوە. ئامۆژگاریی دەکردن و تۆبەی دادەدان و تەقدیسی دەکردن و پاشان مەرەخەسی دەکردن بڕۆن. هەر ئەو ڕێوڕەسمی تۆبەدادان و دانپیانانە ئاساییە بوو کە دژانی پیری کلێسەی پێ وەڕەز بووبوو و ناڕەزایەتییان دەردەبڕی. دەیانگوت ئەو کارە دەبێتە هۆی سووک بوون و ناحەزبوونی فەرزەکە و تا ڕادەیەک کفریشە، ئەگەرچی ئەو کارە شتێکی جیاواز بوو. ئەوان تەنانەت بە سەرانی کلێسەیان ڕادەگەیاند کە ئەو شێوە دانپیانان و تۆبەکردنە ئاکامێکی باشی نییە و بەڵکو لەڕاستیدا تاڕادەیەکی زۆر ئاکامێکی پڕتاوان و دڕدۆنگی و ڕەشبینیشی بەدواوەیە. زۆربەی برایان پێیان خۆش نەبوو لەو کۆڕەدا بەشداریبکەن و بەبێ مەیلی دەچوون و تاڕادەیەک ناچار بوون. چونکە هەموو دەچوون و لەوە دەترسان وەک کەسێکی لووتبەرز و بەفیزو بیرچەوت و بەدزات چاویان لێبکەن. خەڵکی دەیانگوت تاقمێک لە ڕاهیبان لەپێشدا لە سەر ئەوە ڕێک کەوتوون و دەشیانگوت: «من دانیپیادەنێم کە ئەمڕۆ ڕقم لێت هەستا و تۆش ئەوە بسەلمێنە.» تەنیا لەبەر ئەوەی شتێکیان بۆ گوتن بەدەستەوە بێ. ئالیووشا

دەیزانی کە هێندێجار ئەو مەسەلە دێتە گۆڕێ. هەروەها دەیزانی لە نێو ڕاهیباندا کەسانێک هەن کە زۆریان ڕق لەو کارەیە کە ئەو نامانەی لەلایەن خزم و کەسانەوە دەگا، دەیانبەن بۆلای پیر و بەر لە خۆیان نامەکان هەڵدەپچڕن و دەیانخوێننەوە.

هەڵبەت ئەوەش لەبەر ئەوە بوو هەموو شتێک ئازادانە بەڕێوە بچێ و بە نییەتی خێرەوە لە ڕێگای تەسلیم بوونی خۆویستانە و ڕێنوێنیی بەسوودەوە بێ. بەڵام لەڕاستیدا ئەو کارە ڕاستی و سەداقەتی تێدا نەبوو و پڕیش بوو لە ناڕاستی و چەوتی. لەگەڵ ئەوەشدا ڕاهیبانی پیرتر و بەئەزموونتر بە بیر و باوەڕی خۆیانەوە نووسابوون و بەڵگەیان دەهێنایەوە کە: «بۆ ئەوانەی کە سادقانە و بە دڵێکی پاکەوە وەدوای ڕزگاری کەوتوون و هاتوونەتە نێو ئەم چوار دیوارییەوە. ئەو جۆرە فەرمانبەری و لەخۆبردووییەش بەڕوونی دیارە سوودێکی مەزنی دەبێ؛ لەلایەکی تریشەوە، ئەو کەسانەی کە ئەو کارە بە شتێکی خراپ و ناحەز و مایەی نیگەرانی دەزانن، ڕاهیبی ڕاستەقینە نین و بە هەڵە هاتوونەتە نێو کلێسەوە. جێگای باش و لەبار بۆ ئەوان ئاسمانانە. تەنانەت لە پەرستگاشدا پیاو ناتوانێ لە دەست تاوان و شەیتان لە ئەماندا بێ. هەر بۆیە نەبوونی سەداقەت بڕێجار نابێ ئەوەندەشی حیساب لە سەر بکرێ.»

باوە پایسی، هەروا خەریکی تەقدیس کردنی ئالیووشا بوو، بە ورتەورت پێیگوت: «حەزرەتی پیر کز و لاوازتر بووە، هەمیشە خەواڵووە و خەوەنووچکە دەیباتەوە. لە خەو هەستانیشی زۆر دژوارە. ناشکرێ لە خەوی هەستێنین. نزیکەی پێنج دەقیقە خەبەری بۆوە، بە ئاماژەی دەستی حازریانی تەقدیس کرد و داوای لێکردن شەوانە دۆعای بۆ بکەن. دەیهەوێ سبەینێ بەیانیش فەڕزی دانپیانان و تۆبەکردن بەجێ بێنێ. ئالکسی، ناوی تۆشی هێنا. پرسیی ڕۆیشتووی یان نا، عەرزیان کرد ڕۆیشتووی بۆ شار، گوتی: «بۆ ئەو کارە تەقدیسی دەکەم. جێگای ئەو ئەوێیە، نەک ئێرە، بۆ ماوەیەک.» قسەکانی ئەو سەبارەت بە تۆ هەر ئەوە بوو. زۆر بە سۆز و تامەزرۆییەوە ناوی تۆی

هێنا؛ تێدەگەی چۆنی ڕێز بۆ دانای؟ بەڵام چۆنە بڕیاریداوە ماوەیەک لە دنیای ئازاددا بژیت؟ حەتمەن چارەنووسی تۆی پێشبینی کردووە! ئالکسی، تێدەگەی ئەگەر بگەڕێیتەوە دنیا، بۆ ئەوەیە ئەو ئەرکەی پێت سپێردراوە لەلایەن پیرەوە ئەنجامی بدەی، نەک بۆ ڕابواردن و خۆشی و چێژی دنیایی.»

باوە پایسی ڕۆیشتە دەرێ. ئالیووشا سوورڕ دەیزانی باوە زووسیما خەریکە دەمرێ، لەوانەیە تەنیا دووسێ ڕۆژی دیکە بمێنێ. ئالیووشا بڕیاریدا، وادە و بەڵێنەکانی باوکی و بنەماڵەی خۆخلاکۆف و کاترینا ئیوانا، پشت گوێ بخا و ڕۆژی دوایی لە کلێسە نەڕواتە دەرێ و تاکۆتایی لە ژوورسەری پیر بمێنێ. دڵی لە گڕی عەشقدا دەسووتا، خۆشی سەرکۆنە و لۆمە دەکرد کە چۆن توانیویەتی بۆ ماوەیەک پیرەکەی خۆی لەبیر بەرێتەوە، یانی ئەوی لە سەر جێوبانی مەرگ بە کەلەلایی بەجێ هێشتبوو، ئەو کەسەی کە لە هەموو کەسێ زیاتر لە دنیادا ڕێزی بۆ دادەنا. چوو بۆ وەتاغی خەوەکەی باوە زووسیما، لە هەمبەر پیردا چۆکی دادا و ـ ڕاکشابوو چرتەی نەدەکرد، بە دڵەکوتە و پشووسواری و ڕوخسارێکی ئارامەوە ـ کڕنۆشی بۆ برد.

ئالیووشا گەڕایەوە هۆدەکەی دیکە، ئەو شوێنەی کە پیری کلێسە بەیانیی ئەو ڕۆژە زیارەتکەرانی لێکۆکردبۆوە و قسەی بۆ کردبوون. پۆستاڵەکەی داکەند و لە سەر کەتێکی ڕەق و باریک ڕاکشا. کە ماوەیەک بوو لەجیاتی چرپای نوستن کەڵکی لێوەردەگرت. تەنیا باڵنجێکی لەگەڵ خۆی هێنابوو. ئەو دۆشەکەی کە بەیانیی ئەو ڕۆژە باوکی بە گوڕە گوڕ باسی کردبوو، ماوەیەکی زۆر بوو لەبیری چووبۆوە لە سەریشی بخەوێ. عەباکەی داکەند و ماوەیەکی زۆر دەستیکرد بە دوعا و پاڕانەوە. لە پاڕانەوەکەیدا داوای لە خودا نەکرد کەند و کۆسپی لە سەر ڕێ لاببا و لە بەڵای شەیتانی بپارێزێ، بەڵکو تینووی هەستێکی شادانە بوو کە دوای شوکر و ستایش و پاڕانەوە، کە هەمیشە تاعەتی شەوانەی لەوە پێکدەهات و بەردەوام خۆی لە ڕۆح و گیانی دەهاڵاند. هەروا کە خەریکی پاڕانەوە بوو، لە ناکاو دەستی لە کاغەزێکی پەمەیی کەوت لە گیرفانی کراسەکەیدا کە پێشخزمەتەکەی کاترینا ئیوانا پێی

دابـوو. دڵـی کـەوتـە قـرتوفـرت بـەڵام هـەرچـۆنێ بـوو فـەڕزی تاعـەت و پاڕانـەوەکـەی بـەجـێ هێنا. پاشـان دوای تـۆزێ دڕدۆنگـی، پاکـەتـی نامـەکـەی هەڵپچڕی، نامەکە بۆ ئەو نووسرابوو. بە ئیمزای لیز، کچـی مـادامخۆخلاکۆف، کە بەیانی ئەو ڕۆژە لەبەر چاوی پیری کلێسە پێیپێکەنیبوو.

نووسـیبووی: «ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، ئـەو نامـەیـەم بۆ نووسـیوی بـەبێ ئەوەی هیچ کەس بزانێ، تەنانەت دایکیشم. دەشزانم کارێکی باش نییە، بـەڵام بەبێ دەربڕینی ئەو هـەستەی لە ناخمدایە و هـەڵدەچـێ، نـاتوانم بژیم. هـەتـا ماوەیەکیش نابێ جگە لە من و تۆ هیچکـەس لـەو مـەسـەلـە ئاگـادار بێ. بـەڵام ئـەو شـتەی کـە زۆر حـەز دەکـەم بـەتـۆی بڵـێم، چۆنـت پێبڵـێم؟ دەڵـێن کاغـەز خەجاڵەتی ناکێشێ، بەڵام دڵنیابە ئەو قسـەیـە ڕاسـت نییە و ئـەم کاغـەزە هـەر ئێستا وەک خۆم لە شـەرمانا سوور هەڵگەڕاوە. ئالیووشاگیان، خۆشـم دەوێـی لە منداڵییەوە، لەو کاتەوە کە لە مۆسکۆ بووین، تۆش وەک ئەو کاتـە نـەمـاوی و زۆر گـۆڕاوی. بۆیـە خـۆشـم ویستووی و هـەتـا ئـاخری تـەمـەنیشم خۆشـم دەوێی. دڵم تۆی هەڵبژاردووە تاکو ژیانمان پێکەوە گرێبدرێ و هـەتـا کۆتـاییی تـەمـەن پێکـەوە بـژیین. هـەڵبـەت بـەو مـەرجـەی واز لـە کلێسە بێنـی. بـەڵام تەمەنمان نایگەیێنێ و هێشتا منداڵین. هـەتـا دەگـەینـە تـەمـەنی یاسـایی سـەبر دەکـەین. هـەتـا ئـەو کاتـە دڵنیام هێز و وزەمـان دێتـە بـەر، بـەڕێدا دەڕۆیـن و سەما دەکەین. هیچ دڕدۆنگی و دوودڵییەکیشی ناوێ.

دەزانـیچـی بیـرم لـە هـەمـوو شـتێک کردۆتـەوە. بـەڵام شـتێک هـەیـە کـە نەمتوانیوە تەنانەت بیریشی لێبکەمەوە: بە خوێندنەوەی ئەم نامەیە سـەبارەت بە من چۆن بیر دەکەیتەوە؟ من هەمیشە پێدەکـەنم و بزۆزی دەکـەم. ئـەمڕۆ بەیانی قەڵسم کردی، بەڵام دڵنیابە بەر لە بە دەستەوەگرتنی قەڵەم، لە هەمبـەر پـەیکـەرەی دایکـی پیـرۆزدا پاڕامـەوە، ئێستا خـەریکـی دوعـا و پاڕانـەوەم و خەریکە دەستدەکەم بە گریان.

ڕازی من لە دەستی تۆدایە. سبەینێ ئەگەر بێی بۆلام، نازانم چۆن چاو لـە چاوت بکەم. ئاخ ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، ئـەگـەر وەک مرۆڤێکی گێل و گـەمژە

نەتوانم ددان بەخۆدا بگرم و کاتێ چاوم پێتدەکەوێ دەستبکەم بە پێکەنین ـ ئەو کارەی کە ئەمڕۆ کردم ـ چبکەم؟ پێتوایە کچێکی خراپم و سەردەخەمە سەرت. بۆیە بڕوا بە نامەکەشم ناکەی. کەوایە خۆشەویستەکەم تکات لێدەکەم سبەینێ کاتێ دێی بۆ ئێرە، ئەگەر دڵت پێم دەسووتێ ڕاست چاو لە چاوم برە، چونکە ئەگەر چاوم بە چاوت بکەوێ، لێم ڕوونە وەپێکەنین دەکەوم. بەتایبەت ئەگەر ئەو عەبا شۆڕەت لەبەردابێ. کاتێ بیر لەوە دەکەمەوە ئازای ئەندامم سڕ دەبێ. کەوایە کاتێک دێی، ماوەیەک چاوم لێمەکە، یان چاو لە پەنجێرەکە بکە یان لە دایکم...

ئەم نامەیە، نامەیەکی ئەویندارانەیە کە بۆم نووسیوی. پەککو منی چارەڕەش چم کردووە؟ ئالیووشا ڕقت لێمهەڵنەستێ، ئەگەر کارێکی ناحەزیشم کردووە و هەستم ڕووشاندووی، بمبوورە. ئێستا ڕازی ئابڕووی من، کە ڕەنگە بۆ هەمیشە چووبێ، لەدەستی تۆدایە.

دڵنیام ئەمڕۆ دەگریم. بەهیوای دیدار، دیداری سامناک و پڕ لە دڵەخورپەمان.»

ـ لیز ـ

«کۆتاییی نووسین. ـ ئالیووشا؟ تۆ دەبێ حەتمەن بێی بۆ لام! ـ لیز.»

ئالیووشا نامەکەی بە سەرسووڕمانەوە خوێندەوە، لە سەرەتاوە هەتا کۆتایی دیسان خوێندییەوە، تاوێ چووە فکرەوە و دای لە قاقای پێکەنین. داچڵەکی. ئەو پێکەنینە تاوان بوو. بەڵام دوای تاوێک دیسان بە نەرمی و ئارامی دەستیکردەوە بە پێکەنین. نامەکەی بە ئەسپایی نایەوە نێو پاکەتەکە، دوعایەکی خوێند و ڕاکشا. ترس و دڵەخورپەکەی لەڕێوە نیشتەوە. «خودایە، بە سەر هەموو عالەمدا ڕەحمەت ببارێنە، هەموو گیانە ناشاد و ئاڵۆزەکان بدە ژێر باڵی خۆت و بەرەو ڕێگای ڕاست هیدایەتیان بکە. هەموو ڕێگاکان لە دەستی تۆدایە. بە گەورەیی خۆت ڕزگاریان بکە. تۆ سەرچاوەی دڵۆڤانی و خۆشەویستیی. شادی بۆ هەموو عالەم دەنێری!» ئالیووشا ئەوەی زۆر بە ئارامی گوتو خاچی خۆی کێشا و لە خەوێکی قووڵ ڕۆچوو.

# (١)

## باوە فراپۆنت

بەیانی زوو ئالیووشایان لە خەو هەستاند. باوە زووسیماش خەبەری بۆوە، ئەگەرچی دەیویست لە پێخەفەکەی بێتە دەرێ و لە سەر کورسیلەکە دانیشێ، هەستی بە بێهێزییەکی زۆر کرد. زەینی ڕووناک بوو؛ ڕوخساری شەکەت و ماندووی دەنواند، بەڵام نوورانی و تا ڕادەیەک کراوە بوو و دەتگوت بزەی تێزاوە. شادی و دڵۆڤانی و گەشاوەییی پێوە دیاربوو. بە ئالیووشای گوت: «لەوانەیە نەگەمە سبەینێ.» ئەمجار ویستی بەبێ ماتڵ بوون فەرزی تۆبە و دانپیانان و پاڕانەوە بەجێ بێنێ. بیسەری هەمیشەیی دانپیانانەکانیشی باوە پایسی بوو. ڕێوڕەسمی چەور کردنی کەشیش بەڕۆنی پیرۆز دوای ئەو دوو فەرزە بەجێ دەهات. ڕاهیبان کۆ بوونەوە و حوجرەکە، وردە وردە پڕ بوو لە مرید و ڕاهیبی گۆشەنشین. ئیتر ڕۆژ بووبوۆە. خەڵک پۆل پۆل لە کلێسەوە بەرەو حوجرەکە دەهاتن. دوای تەواوبوونی ڕێوڕەسمەکە، پیری کلێسە ویستی هەموویان ماچبکا و ماڵئاوایی و گەردنئازادییان لێبکا. چونکە حوجرەکە زۆر بچووک بوو، ملاقاتچییانی پێشوو چوونە دواوە بۆ ئەوەی تازەهاتووەکان جێیان ببێتەوە. ئالیووشا لەپەنا پیردا، کە هەروا لە سەر کورسیلەکەی دانیشتبوو، ڕاوەستا. پیر بەپێی توانا قسەیکرد. هەرچەندە دەنگی زۆر کز بوو، بە گاڵتەوە گوتی: «ساڵانێکی زۆرە ئێوە فێر دەکەم، بە دەنگی بەرز هێندەم قسە کردووە، کە ئاخافتنم بۆ بۆتە عادەت، بەجۆرێ کە دەم لێکنانم هەتا ڕادەیەک پێدژوارترە لە مژولیایش. تەنانەت ئێستا، بەو بێهێزی و بێتاقەتییەوە هەروام باوکان و برایانی ئازیز.»

ئالیووشا دوای وتەکانی پیر هێندێ شتی وەبیر هاتەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەی پیر زۆر بە ئاشکرا قسەیدەکرد و دەنگی تا ڕادەیەک پتەو و جیددی بوو، وتارەکەی پچڕپچڕ دیاربوو. باسی زۆر شتی کرد، تامەزرۆ بوو بەر لە مەرگ ئەوی نەوێژراو ماوە بیوێژێ، ئەویش نەک بۆ فێرکاری، بەڵکو لەوە دەچوو تینووی ئەوە بێ هەموو شادی و حەزەکانی لەگەڵ مرۆڤ و تەواوی مەخلووقات بەشکات و جارێکی دیکە لە تەمەنیدا دەرگای دڵی ئاوەڵا بکا.

تا ئەوجێیەی کە دواتر ئالیووشا لەبیری مابوو، باوە زووسیما گوتی: «باوکان، یەکتریان خۆش بووێ، خواپەرستانتان خۆش بوێ و ڕێزیان بۆ دانێن، چونکە ئێمەش هەر بەوەی هاتووینە نێو ئەم چوار دیوارییەوە و خۆمان بەند کردووە، پێتان وانەبێ لە خەڵکانی دەرێ پاکترین، بەڵکو بەپێچەوانە، کە هاتووینە ئێرە، هەرکامەمان دانمان پێداناوە کە لە خەڵکی و لە تەواوی خەڵکانی سەر زەوی خراپترین... ڕاهیبیش هەرچەندە زیاتر لەم حوجرەیەدا بژی، دەبێ باشتر لەوە بگا. ئەگەر وانەبێ بۆ هاتنە ئێرە هیچ بەڵگەیەکیان بە دەستەوە نییە. کاتێ کە تێدەگا جگە لە خراپتربوون لە خەڵک، لە هەمبەر مرۆڤایەتیدا بەرپرسیشە ـ لەبەر خاتری هەموو کەس و هەموو شتێک و تاوانی خەڵک بە خاس و عامەوە ـ ئەو کاتەیە کە بە ئامانجی گۆشەنشینی و تەرکە دنیایی دەگەین. چونکە، خۆشەویستەکانم، دەبێ بزانن هەرکام لە ئێمە بێگومان لەبەر خاتری هەموو کەسێک و هەموو شتێک لە سەر زەوی بەرپرسین. نەک هەر لەبەر تاوانی گشتیی عالەمی وجوود، بەڵکو هەرکەسێک لەبەر تێکڕای خەڵک و یەکبەیەکی مرۆڤەکان. ئەوماریفەتەش بۆ خودای ڕاهیب و هەموو کەسێکی دیکە تاجی ژیانە. چونکە ڕاهیبان لە ئاو و گڵێکی دیکە نین و وەک خەڵکی وان. تەنیا بەهۆی ئەو ماریفەتەشەوەیە کە دڵمان بە خۆشەویستیی بێپایان و گشتی دەگەشێتەوە. ئەو کاتەیە کە هەرکام لە ئێوە دەتوانێ بە خۆشەویستی تەواوی دنیا داگیر بکا و هەموو تاوانەکانی دنیا بە فرمێسکی بشواتەوە.... هەمووتان بەردەوام ئاگاتان لە دڵی خۆتان بێ و تاوانەکانتان وەبیر خۆتان بێننەوە. هەتا تۆبە لەگۆڕێدایە، ترستان لە تاوان

نەبێ. تەنانەت ئەو کاتەی تووشی تاوان دەبن. هیچ چەشنە مەرجێک لەگەڵ خودا دامەنێن. دیسان دەیڵێمەوە، بادیهەوا مەبن. لە هەمبەر چکۆلە و گەورەدا لەخۆ دەرمەچن. ئەو کەسانەی سووکایەتیتان پێدەکەن، بوختانتان بۆ هەڵدەبەستن، جنێوتان پێدەدەن، یان تەرەتان دەکەن لەخۆیان، ئێوە ڕقیان لیَ‌هەڵمەگرن. قینتان لە کافر و بێدینان و شەڕخوازان و ماڵپەرستان نەبێ ـ مەبەستیشم تەنیا چاکەکانی ئەو کۆمەڵگایە نییە ـ چونکە لە نێوانیانا، بەتایبەت لەم سەردەمەی ئێمەدا، مرۆڤی چاک زۆرە. تەنانەت ڕقتان لە هەرە خراپەکانیشیان نەبێ. لە دۆعا و پاڕانەوەکانتاندا لەبیریان مەبەنەوە و بەو شێوەیە دۆعایان بۆ بکەن: خودایە! هەموو ئەو کەسانەی کە بێکەسن و کەس نییە بۆیان بپاڕێتەوە، بە کەرەمی خۆت ببەخشە. هەموو ئەو کەسانەش کە تاریکەسەلاتن و تاعەتت بەجێ ناهێنن نەجات بدە. هەروەها بڵێن: خودایە! لەبەر غروور ئەو کارە ناکەین، چونکە لە هەموو کەس چرووکترین... خەڵکتان خۆشبوێ. مەهێڵن بێگانان بە کەیفی خۆیان دەمبێنتان کەن و ڕاتان بدەن. چونکە کەوتنە ساڵەوە و کەلەلابوون و بادیهەوا بوونی قێزەون و لەوەش خراپتر بەخیلی و چاوچنۆکی هێزتان لێدەبڕێ و بێگانان ساناتر دەتوانن سواری ملتان بن و ڕاتان بدەن. بەردەوام کتێبی پیرۆز (ئینجیل) بۆ خەڵکی بخوێننەوە و ڕاڤەی بکەن.... چاوبرسی و تەماحکار مەبن.... دڵ بە زێڕوزیو مەبەستن، ڕسق و ڕۆزی عەمبار مەکەن بۆ گرانی... هیواتان بە خودا بێ. ئاڵای ئیمان و ئاشتی دەست بدەنێ و ڕای‌شەکێنن.»

بەڵام پیر پچڕپچڕتر لەوەی کە دواتر ئالیووشا باسی دەکرد، دووابوو. زۆر زوو هەناسەی سوار دەبوو و قسەی بۆ نەدەهات. بۆ ئەوەی هێزی بێتەوەبەر تۆزێک ڕادەوەستا و وەک ئەوەی حاڵی لیَ‌هاتبێ، درێژەی بە مژولیایشەکەی دەدا. هەموو بە هەستەوە گوێیان بۆ ڕاگرتبوو. ئەگەرچی زۆریان سەریان لە قسەکانی سوڕ مابوو و تێی‌نەدەگەیشتن... دوا ڕۆژ هەموویان ئەو وشانەیان وەبیر دێتەوە.

خوداوڕاستان بۆ ساتێک ئالیووشا لە حوجرەکە چووە دەرێ، لە نێو ڕاهیبانی دەوروبەری حوجرەکەدا، هەستی بە دڵەخورپە و چاوەڕوانی کرد. ئەو حاڵەتە چاوەڕوانییەش لە ئەدگاری تاقمێکیاندا وەک دڵەوڕێزە و مەترسی خۆی دەنواند و لە تاقمێکیشیاندا وەک ئۆخژن و ئۆقرە. هەموو چاوەڕوانی ئەوە بوون، بەر لە مەرگی پیر شتێک بقەومێ. چاوەڕوانییەکەشیان لەلایەکەوە، هەتا ڕادەیەک حەپۆلانەبوو. بەڵام تەنانەت چلەکێشترین ڕاهیبانیش کەوتبوونە ژێر کارتێکەریی ئەو هەستەوە. ڕوخساری باوە پایسی لە هەموویان جیددیتر دیار بوو. ڕاهیبێک بە نهێنی ئالیووشای بانگکرد، تاکو چاوی بە ڕاکیتین بکەوێ. ڕاکیتین تازە لە شارەوە هاتبۆوە و نامەیەکی لەلایەن مادام خۆخلاکۆفەوە هێنابوو بۆ ئالیووشا. مادام خۆخلاکۆف لە نامەکەیدا باسی ڕووداوێکی سەیر و زۆر داخوازیکارانەی بۆ ئالیووشا نووسیبوو. گوایە لە نێو ئەو ژنانەدا کە دوێنێ هاتبوون بۆ زیارەتی باوە زووسیما، پیرێژنێکی شارستانی، ژنی گورووبانێکی کۆچی دواییکردوو بە ناوی پروخۆرنا، هەبووە. لە حەزرەتی پیر دەپرسێ ئایا دەتوانێ بۆ شادیی ڕۆحی واسنکای کوڕی کە چووە بۆ ئیرکۆتێسک و ماوەی ساڵێک دەبێ نامەیەکیشی نەناردووە، بپاڕێتەوە؟ باوە زووسیماش لە وەڵامیدا بە ڕووگرژی دەڵێ: «کاری وا مەکە، دوعا کردن بۆ زیندوو بەو قەستە وەک ئەوە وایە مردبێت، ئەوەش جۆرێک جادووبازییە. پاشان بەهۆی نەزانییەکەیەوە دەیبەخشێ. بەجۆرێک کە دەتگوت کتێبی داهاتوو دەخوێنێتەوە.» (ڕاست وەک بۆچوونی مادام خۆخلاکۆف) ئەو وشە دڵخۆشکەرانەیە دەدرکێنێ کە: «واسیای کوڕی بە دڵنیاییەوە زیندووە و بەم زووانە یان خۆی دەگەڕێتەوە یان نامە دەنێرێ. ژنەش واچاکە بڕواتەوە بۆ ماڵێ و چاوەڕوان بێ...» مادام خۆخلاکۆف بە سەرسوڕمانەوە نووسیبووی: «باوەڕ دەکەن کە پێشوێژییەکەی وەڕاست گەڕاوە و ئەوەش هەموو مەبەستەکە نییە.» پیرێژن دەگاتە ماڵێ و ناگاتێ، نامەیەکی دەدەنە دەست کە لە سیبرییەوە هاتبوو. ئەوەش تەواوی مەبەستەکە نییە. واسیا لە نامەکەیدا بە

دایکی ڕاگەیاندبوو کە لەگەڵ خاوەن پلەوپایەیەک خەریکە دەگەڕێتەوە بۆ ڕووسیا و سێ حەوتوو دوای گەیشتنی نامەکە هیواداره «بگەڕێتەوە ئامێزی دایکی.»

مادام خۆخلاکۆف بە گوڕ و تینەوە داوای لە ئالیووشا کردبوو، ئەو پەرجۆ و پێشوێژییە بە باوکە عابید و ڕاهیبانی دیکە ڕاگەیێنێ. لە کۆتاییدا نووسیبووی: «هەموو کەس، هەموو کەس دەبێ لەوە ئاگادار کرێن!» نامەکە زۆر بەپەلە نووسرابوو. دڵەخورپەی نووسەرەکەشی بە هەموو دێڕەکانییەوە دیاربوو. بەڵام ئالیووشا بە پێویستی نەزانی بە ڕاهیبان بڵێ، چونکە هەموویان لەوە ئاگادار بوون. ڕاکیتین هەر لەو ڕاهیبەی نامەکەی هێنابوو، داوای کردبوو بەوپەڕی ڕێزەوە عەرزی باوە پایسی بکا، کە ڕاکیتین دەیهەوێ سەبارەت بە مەبەستێک لەگەڵیان بدوێ. مەبەستێکی هێندەش گرینگە کە ناتوانێ بۆ ساتێک وەدرەنگی بخات. هەروەها بەهۆی جەسارەتەوە، خاکەڕایانە داوای لێبووردنی دەکرد.» ئەو ڕاهیبەش بەرلە گەیاندنی نامەکە بۆ ئالیووشا، هەواڵەکەی بە باوە پایسی ڕاگەیاندبوو، ئالیووشا دوای خوێندنەوەی نامەکە بە باشی زانی بۆ سەلماندنی ئەو مەبەستە نامەکە بدا بە باوکە پایسی. تەنانەت بەو کابرا چلەکێش و پارێزگارەش ئەگەرچی کاتی خوێندنەوەی هەواڵی «پەرجۆکە» ناوچاوانی تێکنابوو. نەیتوانی بە تەواوی دان بەخۆیدا بگرێ. چاوی زیتەی هات و بزەیەکی جیددی و قورساغ نیشتە سەر لێوانی. هەڵیدایە و گوتی: «شایەدی ڕووداوگەلی زۆر گەورەتریش دەبین!»

ئەو ڕاهیبانەی کە لەو دەوروپشتە بوون دووپاتیان دەکردەوە: «شایەدی ڕووداوگەلی زۆر گەورەتریش دەبین!»

بەڵام باوە پایسی، هەروا کە نێوچاوانی تێکنابوو، داوای لە هەموویان کرد ئەو مەبەستە هەتا ماوەیەک پووشبەسەر بکەن. «هەتا زیاتر ڕوون دەبێتەوە و قەبووڵدەکرێ. ئەگەرچی لە نێو خەڵکانی ئەم دنیایەدا کەسانێکی زۆر ساویلکە و خۆشباوەڕ هەن. لەڕاستیشدا ئەو مەسەلەیە لەوانەیە بە

شێوەیەکی سروشتی و ئاسایی ڕووی دابێ و بەهەڵکەوت بووبێ.» ئەم وتەیەی کۆتاییی زۆر بە پارێزەوە درکاند. گوایە بۆ ڕازیکردنی ویژدانی، ئەگەرچی بڕوای بە حاشاکردنی خۆی نەبوو. ڕاستەقینەیەک کە گوێگرەکانی بە ئاشکرا تێیگەیشتن.

هەڵبەت لە ماوەی سەعاتێکدا «مۆجزەکە» بە گوێی تەواوی کەسانی نێو کلێسەکە و ئەوانەی بۆ زیارەت هاتبوون، گەیشت. هیچکەس لەو ڕاهیبەی ڕۆژی پێشوو لە سێنسیلۆستێر و لە کلێسەی چکۆلەی ئابدووڕسک لە باکووری دوورەوە هاتبوو، نەکەوتبووە ژێر کاریگەری. هەر ئەو بوو کە ڕۆژی پێشوو لە پەنا مادام خۆخلاکۆف ڕاوەستا بوو و بە ئاماژە کردن بە شیفای کچی ئەو ژنە، لە باوە زووسیمای پرسیبوو: «چۆن دەوێری خۆ لە قەرەی کارێکی ئاوا بدەی؟»

بەڵام ئێستا ماقمابوو و نەیدەزانی باوڕ بە قسەی کێ بکا. شەوی ڕابردوو چوو بۆلای باوکە فراپۆنت، کە حوجرەکەی لە پشت پلوورەی هەنگوینەکانەوە هەڵکەوتبوو، ئەو دیدارەش زۆری شوێن لە سەر داناو بووە هۆی سەرسام بوونی. ئەو باوکە فراپۆنتە هەر ئەو ڕاهیبە پیر و بەناوبانگەی لە نوێژ و تاعەتدا بێهاوتا بوو، کە بەر لە ئێستاش باسی ئەو هاتە گۆڕێ، ڕەخنەی لە باوە زووسیما و دامەزراوەی پیران دەگرت و ئەوەی بە شتێکی زیانبار و گەوجانە دەزانی. ئەو ڕەقیبێکی تەواو بەرهەڵستکاریان بوو. ئەگەرچی بە هۆی پلە و پایەکەیەوە بە دگمەن لەگەڵ ئەم و ئەو دەدوا. ئەوەی بووبووە هۆی دژایەتی کردنی و ئاوا لە سەر ئەو باوەڕەی خۆی سوور بوو، تاقمێک لە ڕاهیبەکان لەگەڵی هاودەنگ بوون و زۆربەی زیارەتکەران بەچاوی پیاوچاک و قەدیس لێیان دەڕوانی، ئەگەرچی گومانیان لەوەدا نەبوو کە شێتە. بەڵام هەر ئەو شێتییەی بوو سەرنجی هەمووانی ڕادەکێشا.

باوە فراپۆنت بۆ تاقە جارێکیش نەچووبووە دیدەنیی پیری کلێسە. ئەگەرچی هەر لەو چلەخانەیە دەژیا. قەتیان وادار نەدەکرد یاساوڕێساکان پێشێل نەکا. ئەوەش لەبەر ئەوە بوو تەواوی هەڵسوکەوتەکانی شێتانەبوو.

تەمەنی حەفتا و پێنج ساڵ یان زیاتریش دەبوو، لە سووچێکی حەوشەکە لە حوجرەیەکی دارینەی کۆندا دەژیا، کە لەمێژ بوو بۆ زاهیدێکی گەورەی دیکە درووستکرابوو، بۆ باوە ئیوانایان ساز کردبوو کە سەد و پێنج ساڵی عومر کرد و چیرۆکی زۆر سەیر و سەمەرە لە کەرامات و پێشوێژییەکانی دەگێڕنەوە.

باوە فراپۆنت توانیبووی لە حەوت ساڵ لەمەوبەرەوە بخرێتە ئەو حوجرەیەوە و لەوێدا گۆشەنشین بێ. دیوێکی هەژارانە بوو، ئەگەرچی زیاتر لە نوێژگە دەچوو، چونکە پڕ بوو لە ڕەسم و پەیکەرەی قەدیس و پیاوچاکان و مۆم و چرا لە هەمبەریاندا داگیرسابوو ـ ئەم مۆم و چرایانەی کە خەڵکی بە شێوەی نەزری دەیانهێنا بۆ کلێسە. باوە فراپۆنتیان کردبووە بەرپرسی ڕۆشن ڕاگرتنی ئەو چرایانە. دەیانگوت (ڕاستیشیان دەکرد) بە سێ ڕۆژ تەنیا سەد و پەنجا گرەمی نان دەخوارد. هەنگەوان کە لە نزیک پلوورەکان دەژیا، بە سێ ڕۆژ جارێک نانی بۆ دەبرد. باوە فراپۆنت تەنانەت لەگەڵ ئەو کابرا هەنگەوانەش کە لە ڕاستیدا خزمەتی پێدەکرد، بە دگمەن دەدوا. سێسەد گرەم نانی فەتیری پیرۆز کە ڕۆژانی یەکشەممە دوای ڕێوڕەسمی حەوتە باوە عابید بۆی دەنارد، جیرەی حەوتوویەکی بوو. ئاوی گۆزەکەی هەموو ڕۆژێ دەگۆڕی. بۆ ڕێوڕەسمەکان نەدەهات. ئەو زیارەتکەرانەی دەچوونە دەیدەنیی، زۆر جار دەیاندیت، ڕۆژ هەتا ئێوارە بێ ئەوەی چاو لە دەوروبەری خۆی بکا، چۆکی داداوە و خەریکی نوێژ و تاعەتە. ئەگەر ئەوانیش بووبوایەنە بەردەنگی و قسەی بۆ بکردایەن، وتارەکەی کورت و توند و غەریب بوو، هەمیشەش تووڕە و ئاڵەتی. زۆر بە دەگمەنیش هەڵدەکەوت لەگەڵ زیارەتکەران بدوێ. بەڵام زۆرجار قسەیەکی سەیری دەکرد کە وەک نەزیلە وابوو. بە هیچ داوا و پاڕانەوەیەکیش باسەکانی خۆی بۆ بیسەران شی نەدەکردەوە. قەشە نەبوو، تەنیا ڕاهیبێکی سادە بوو. بڕوایەکی سەیر لە نێو خەڵکدا باوبوو. زیاتریش لە نێو خەڵکانی گەلحۆ و ساویلکەدا: دەیانگوت باوە فراپۆنت لەگەڵ ڕۆحە ئاسمانییەکان لە پێوەندی دایە و تەنیا لەگەڵ ئەوان

دەدویٚ، بۆیە لەگەڵ مرۆڤ قسە ناکا. ڕاهیبی ئابدۆرسکی، دوای ئەوەی هەنگەوان، کە ئەویش ڕاهیبێکی زۆر بێدەنگ و مڕۆمۆچ بوو، ڕێنوێنیی کرد بۆ لای پلوورەی مێشەکان، لە سووچێک کە حوجرەکەی باوە فراپۆنت هەڵکەوتبوو، هەنگەوان وەک وریایی پێدان پێیگوتبوو: «چونکە لەوانەیە غەوارەیەک قسەت لەگەڵ بکا، لەوانەشە قسەت لەگەڵ هەر نەکەن.» ڕاهیب هەروەک دواتر دەیگێڕایەوە، بەوپەڕی نگەرانی و دڵگوشرانەوە لە حوجرەکە نزیکبۆوە. ئێوارەیەکی دەرنگ وەخت بوو. باوە فراپۆنت لە سەر کورسیلەیەکی پێچکە کورتی لەق لە پەنا دەرگاکەوە دانیشتبوو. نارەوەنێکی ساقەتە ئەستوور و پڕ لق و پۆپ و پیر بە نەرمی لە ژوور سەری خشوهۆڕی بوو. شەوێکی فێنک و خۆش بوو. ڕاهیب لە هەمبەر پیاوی خودادا چۆکی دادا و داوای تەقدیسی کرد.

باوە فراپۆنت گوتی: «ئەی ڕاهیب! دەتەویٚ لەبەر پێتدا سەر بنێمە عەرزی و سووجدەت بۆبەرم؟ هەستە، دەی هەستە.»

ڕاهیب هەستا سەرپیٚ.

ـ ئێستاکە تەقدیست دەویٚ، فەرموو. وەرە لە پەنام دانیشە. لە کوێوە هاتووی؟

ئەوەی بووە هۆی سەرسووڕمانی ڕاهیبی چارەڕەش، ئەوەبوو کە باوە فراپۆنت ئەگەرچی زۆری ڕۆژوو دەگرت و بەساڵاچووش بوو، بەڵام پیرەپیاوێکی تێکسمڕاو و پتەو بوو. کەڵەگەت بوو، قیت و ڕەپ بەڕێدا دەڕۆیشت. دەموچاوێکی وردیلە و گەش و ساغی هەبوو. گومانی تێدا نەبوو کە هێشتا خاوەن تین و گوڕە. توندوتۆڵ و بەهێز بوو. لە چاو تەمەنی هێشتا بە تەواوی سەروڕیشی ماشوبرنجی نەبووبوو، خاوەنی سەر و ڕیشێکی پڕ و تۆپ بوو کە سەردەمی خۆی ڕەش بوون. چاوی گەورە و شین و گەش بوون، بەڵام بڕێک زەق. بە زاراوەیەکی ڕەسەن قسەی دەکرد. عەبایەکی شۆڕ و مەیلە و سووری لەبەردا بوو کە قوماشەکەی لەماڵێکی زبر و ئەستوور بوو، گوریسێکی ئەستووریشی لە نێو قەدی دەبەست. سنگی و بەرۆکی ئاواڵە

بوو، لە ژێر عەباکەیدا کراسە کەتانەکەی بەجارێ چڵکەسوو بووبوو، چونکە چەندین مانگ بوو نەیگۆڕیبوو. دەیانگوت لە ژێر عەباکەیەوە نزیکەی سێ پۆند ئاسنەواڵە بە خۆیەوە دەبەستێ. گۆرەویی لە پێ نەدەکرد و کەوشەکانی کۆنە و دڕا بوون.

ڕاهیب چاوە چکۆڵە و زیتەکانی کە هەتا ڕادەیەک ترسی تێدا دیار بوو، لە زاهید بڕیبوو، خاکەڕایانە وەڵامی دایەوە: «لە کلێسەی بچووکی ئابدۆرسک، لە سێنسیلۆستێر.»

ـ لە سێنسیلۆستێری ئێوە بووم. دانیشتووی ئەوێ بووم. ئێستا سێن سیلۆستێر چۆنە؟

ڕاهیب تۆزێ مات بوو.

ـ ئێوە کۆمەڵێک مرۆڤی بێ شعوورن! ماوەی ڕۆژووگرتن چۆن بەڕێوە دەبەن؟

«ڕۆژووی ئێمە لە سەر بنەمای یاسا و نەریتی پێشینانە. لە ماوەی ئەو چەند ڕۆژە پارێزەدا، دووشەممە و چوارشەممە و هەینی چێشت ناخۆین. سێشەممە نانی وشکی و میوەی کوڵاو و هەنگوین و تووڕک و کەلەرمی سوێرکراو و جۆی کوڵاو دەخۆین. شەممانە کەلەرمی سپی و هەرشتە و لەپە و بڕوێش، کە هەموویان بە ڕۆنی شادانە ساز دەکەین. لە ماوەی حەوتوودا ماسیی وشک و بڕوێش بە سوپی کەلەرمەوە دەخۆین. لە دووشەممەوە هەتا عەسری شەممە، شەش ڕۆژی تەواو لە حەوتوودا پیرۆزە و هیچ شتێک ناکوڵێنین و تەنیا نان و ئاو دەخۆین. ئەویش بە پارێزەوە ئەگەر بۆمان بلوێ هەموو ڕۆژێ چێشت ناخۆین. یانی هەر ئەو جۆرەی کە بۆ حەوتووی یەکەمی ماوەی پارێز لەبەرچاو گیراوە. خاچەڕۆژ[1] دەم لە هیچ شتێک نادەین. بەم شێوەیە ڕۆژی شەممە دەبێ هەتا سەعات سێی دوانیوەڕۆ بەڕۆژوو بین، پاشانیش تۆزقاڵێک نان و ئاو دەخۆین و پێکێک شەڕابی بەسەردا دەکەین. ڕۆژی سێشەممەی پیرۆز شەڕاب دەنۆشین و شتێک لێدەنێین، ئەویش بەبێ

---

1- بەجێی Good Friday دامناوە (وەرگێڕ)

ڕۆن، یان جاری وایە هەر هیچ لێنانێین.» ڕاهیب کە زیاتر دڵنیا بووبوو، درێژەی پێدا: «بەڵام ئەی باوکی پیرۆز! لەچاو ئێوەی هێژا و مەزن ئەوە هەر هیچ نییە. چونکە لە ماوەی ساڵدا، تەنانەت لە جەژنی پیرۆزدا، ئێوە لە نان و ئاو زیاتر دەم لە هیچ شتێک نادەن و ئەوەی ئێمە لە دوو ڕۆژدا دەیخۆین ئێوە بەشی حەوتوویەکتان دەکا. بەڕاستی کارێکی جوان و بێوێنەیە، ڕۆژوو گرتنی ئێوە.»

باوە فراپۆنت لە ناکاو پرسیی: «قارچک چی؟»

ڕاهیب بە هەڵەشەیی گوتی: «قارچک؟»

ـ بەڵێ. دەتوانم چاوپۆشی لە نانەکەیان بکەم و هیچ نیازێکم پێیان نەبێ. خۆ بکەم بەنێو لێرەواردا و بە قارچک و تووشیرین بەڕێبچم، بەڵام لێرە ناتوانن واز لە نان بێنن، هەر بۆیە دایمە دیلی شەیتانن و لەغاوی کردوون. لەم ڕۆژانەدا ناپاکەکان حاشا لەو جۆرە ڕۆژووگرتنە دەکەن. کارەکەشیان ناپاک و شەیتانییە.

ڕاهیب هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: «ڕاست دەفەرموون.»

باوە فراپۆنت پرسیی: «لەنێو ئەواندا شەیتانت دیوە؟»

ڕاهیب بە ترس و لەرزەوە گوتی: «لەنێو ئەواندا؟ لە نێو ئەوان خۆ...؟ پارەکە ڕۆژی «یەکشەممەی سیانە» چووم بۆلای باوکە عابید و لەو کاتەوە ئیتر نەچووم. شەیتانێکم دی لە سەر سینگی کەسێک دانیشتبوو و لە ژێر عەباکەیدا خۆی مەلاس دابوو، تەنیا شاخی بەدەرەوە بوو؛ پیاوێکی دیکەش شەیتانێک سەری لە گیرفانییەوە قوت کردبۆوە و چاوی زیتەی دەهات، لە من دەترسا؛ شەیتانێکی دیکە لە زگی ناپاکی کەسێکی دیکەدا خۆی حەشار دابوو، شەیتانێکی دیکەش خۆی بە ملی پیاوێکدا هەڵواسیبوو و بێئەوەی بیبینێ بەملاوئەولادا لەگەڵ خۆی دەیگێڕا.

ڕاهیب پرسیی: «ئێوە ـ دەتوانن ئەڕواحیش ببینن؟»

ـ بەڵێ دەتوانم بیبینم، دەتوانم هەتا قووڵاییی گیانیان ببینم. کاتێک لە ژووری باوکە عابید هاتمە دەرێ، شەیتانێکم دی لە پشت دەرگاکە خۆی لە

من مات دابوو، گەورەش نەبوو، دوو مەتر یان زیاتر درێژ بوو، بە کلکێکی درێژ و ئەستوور و خۆڵەمێشییەوە، سەری کلکی لە کەلێنی درگاکەدا بوو، بە تەڕدەستی درگاکەم پێوەدا و کلکی گیری کرد. دەستیکرد بە قیژەقیژ و هەڵبەزدابەز، منیش سیٚجارم خاچ کێشا. هەر لەڕێوە وەک جاڵجاڵووکەیەکی ژێر پیٚ کەویٚ جیقی دەرهات و تۆپی. حەتمەن لەویٚ لەچەقی دەرگاکەدا ڕزیوە و بۆگەن بووە، بەڵام نایبینن، بۆنەکەشی هەست پێناکەن. ساڵێک لەمەوبەر بوو لەویٚ بووم. وەک غەریبەیەک، ئەوە لایتۆ دەدرکێنم.

ڕاهیب کە جارلەگەڵجار زیاتر غیرەتی دەبزووت،گوتی: «قسەکانت زۆرترسناکن! بەڵام ئەی باوکی پیرۆز و هێژا، ئایا ـ ئەو جۆرەی کە حەدیسی ئێوە لە چوارقورنەی دنیا دەنگی داوەتەوە ـ ڕاستە کە ئێوە لەگەڵ (ڕوح‌القدس) لە پێوەندی دان؟»

ـ جاروبارێک نازڵ دەبیٚ.

ـ چۆن نازڵ دەبیٚ؟ بە چ شێوەیەک؟

ـ وەک باڵندەیەک.

ـ (ڕوح‌القدس) وەک کۆترێک؟

ـ (ڕوح‌القدس)مان هەیە و ڕۆحی پیرۆزیشمان هەیە. ڕۆحی پیرۆز وەک باڵندەی دیکەش دەتوانیٚ خۆی بنوێنیٚ ـ هێندیٚجار وەک چۆلەکە، هێندیٚجار سێروو و بریٚجاریش وەک سیچڕە.

ـ ئەی چۆن لەگەڵ سیچڕەی ئاسایی لێکی دەکەنەوە؟

ـ قسە دەکا.

ـ چۆن قسە دەکا؟ بە چ زمانێک؟

ـ بە زمانی مرۆڤ.

ـ دەڵیٚ چی؟

ـ ڕاستت دەویٚ ئەمڕۆ پێیگوتم، گەوجێک دیٚ بۆ دیدارت و پرسیاری زۆر نابەجێت لێدەکا، ڕاهیب دەتەویٚ سەر لە ڕاز و نهێنییەکان دەرهێنیٚ؟

ڕاهیب سەری لەقاند و گوتی: «ئەی باوکی زۆر پیرۆز و هێژا، قسەکانت زۆر بەسامە.» بەڵام لە چاوە گچکە و ترس لێنیشتووەکانیدا دڕدۆنگی و گومان دەبیندرا.

باوە فراپۆنت تۆزێ ڕاوەستا و پرسیی: «ئەم دارەت دیوە؟»

- بەڵێ قوربان.

- بە بڕوای تۆ نارەوەنە، بەڵام من پێموایە شکڵێکی دیکەیە.

ڕاهیب دوای تاوێک بێدەنگی، لەپاش چاوەڕوانییە بێهوودەکەی، پرسیی: «چ شکڵێک؟»

- شەوانە دێتە پێشێ. ئەو دوو لقەی دەبینی؟ کە شەو دادێ دەبێ بە مەسیح و باوەشم بۆ دەکاتەوە و دەمکێشێ بۆلای خۆی، بەجوانی دەیبینم و ئازای ئەندامم دەلەرزێ. سامناکە، زۆر سامناکە!

- ئەگەر مەسیح خۆی بێ، ئیتر بۆ سامناکە؟

- ئاخر لەباوەشم دەکا و لەگەڵ خۆی دەمبا.

- بە زیندوویی؟

- لە ڕۆح و جەلالی ئەلیاسدا، مەگین نەتبیستووە؟ ئەو لەباوەشم دەکا و لەگەڵ خۆی دەمبا.

ئەگەرچی ڕاهیب بە دالغەیەکی ئاڵۆز و شێواوەوە گەڕایەوە بۆ ئەو حوجرەیەی کە لەگەڵ برایەکی دیکەی ڕاهیب تێیدا دەژیان، لە دڵی خۆیدا ڕێزێکی زۆر زیاتر لە باوە زووسیمای بۆ باوە فراپۆنت هەبوو. لایەنگری سەرسەختی ڕۆژوو گرتن بوو، سەیریشی نەبوو ئەگەر کەسێکی ڕۆژووەوانی وەک باوە فراپۆنت ئاوڕ لە غەریبان بداتەوە. وشەکانی بەڕاستی سەیر بوون، بەڵام تەنیا خودا دەزانێ ئەو وشانە چ نهێنییەکیان تێدابوو، ئەوەنییە جاری وایە وتە و کردەوەی زۆر سەیر و سەمەرە بە کەسێکەوە دەبینین، کە ئاوەزی خۆیان لەبەر خاتری خودا فیدا کردووە! تاسەبار و ئامادەی ئەوەبوو باوەڕ بە وەبەر دەرگا کەوتنی کلکی شەیتان بکا، ئەویش نەک بە مانا مەجازییەکەی. جگە لەوەش بەر لە زیارەت کردنی کڵێسە، لەگەڵ

دامەزراوەی «پیران» کە هێندێ دەمگۆی لەمەڕیانەوە بیستبوو، بە شتێکی خراپ و زیانباری دەزانی و سەرسەختانە دژایەتیی لەگەڵ دەکرد. زۆر بە سەر هاتنیا بۆ کلێسە تێنەپەڕیبوو، سرتوخورت لە نێو هێندێ لە برایانی ڕواڵەتبیندا ساز بوو، کە ئەو دامەرزاوەیان بەدڵ نییە، ئەوە بەگوێی ئەویش گەیشتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو پیاوێکی زیتەڵە و خۆ تێهەڵقوتێن بوو. دەیویست سەر لە هەموو شتێک دەرهێنێ. هەر بەو هۆیەوە مۆجزە تازەکەی باوە زووسیما بەجارێ تووشی سەرسووڕمانی کردبوو. ئالیووشا دواتر وەبیری هاتەوە کە میوانە ئابدوروسکییەکەیان زۆر کونچکاوە و لە پەستا لە نێو گرووپ و تاقمی ڕاهیباندا دەهات و دەچوو لە نێویاندا کە لە دەرەوە و ژوورەوەی حوجرەکەی باوە زووسیمادا کۆڕیان دەبەست، گوێی ڕادەگرت و پرسیاری دەکرد. بەڵام ئەو کاتە ئالیووشا زۆری گوێ نەدەدایە و زۆر دواتر ئەوانەی وەبیر هاتەوە. ڕاستت دەوێ دەرفەتیشی نەبوو لەوشتانە ورد بێتەوە. چونکە کاتێک باوە زووسیما، کە دیسان هەستی بە شەکەتی و بێهێزی دەکرد، چووبووە سەر چرپای خەوەکەی و خەریک بوو خەوی لێدەکەوت، ناردی بەشوێن ئالیووشادا. ئالیووشا بە هەڵەداوان گەڕایەوە. لە حوجرەکەدا تەنیا باوە پایسی و باوە یوسف و پۆرفیری تازە مرید مابوونەوە. پیر کە چاوە ماندووەکانی هەڵدەهێنا و بە وردی لە ئالیووشای دەڕوانی، پرسیی:

کوڕم، تۆ خزم و کەسەکانت چاوەڕوانت نین؟

ئالیووشا مات بوو و هیچی نەگوت.

- مەگین دوێنێ بەڵێنت پێنەدان کە چاوت پێیان بکەوێ؟ مەگین نیازیان پێتنییە؟

- با، وادەم داوە بە - باوکم - بە براکانم - بە کەسانێکی دیکەش.

- کەوایە پێویستە بچی، خەم مەخۆ. دڵنیابە هەتا تۆ لەژوور سەرم نەبی و دوایین وتەم لێنەبیستی، نامرم. کوڕم ئەو کەلامە بە تۆ دەڵێم، دوایین خەڵاتی

منە بۆ تۆ. بۆ تۆ کوڕی خۆشەویستم. چونکە تۆش منت خۆش دەویّ. بەڵام ئێستا لە سەر بەڵێنەکەت سوور بەو بڕۆ.

ئالیووشا بەبیّ ئەوەی خۆی بگنخێنیّ و ماتڵ بیّ وەڕێکەوت. ئەگەرچی ڕۆیشتنەکەی زۆر دژوار بوو، بەڵام ئەو وادەیەی کە ئەو دوایین وتەی پیر لەم دنیایەدا دەبیستیّ و دوایین خەڵاتی ئەوە بۆی، لە خۆشیانا دەتگوت حاڵی لیّهاتووە و هەر ئێستانا ئێستا شاگەشکە دەبیّ. بەپەلە وەڕێکەوت تاکو کاروبارەکانی نێو شار جێبەجیّ بکات و زوو بگەڕێتەوە. باوە پایسیش چەن وشەی پڕ ئامۆژگاریی پێگوت، کە ئالیووشای ڕاچڵەکاند و بەجاریّ سەرسامی کرد. یانی کاتێک لە حوجرەکە هاتنە دەریّ، ئەو قسانەی کرد.

باوە پایسی بەبیّ پێشەکی و هێنان و بردن گوتی: «کوڕی چاک! تێبگە و وریا بە، کە زانستی ئەم دنیایە، بەتایبەت لەم سەدەیەدا بۆتە هێزێکی مەزن، پاکی و پیرۆزییە نهێنییەکانی کتێبە ئاسمانییەکەمان، کە بەرە لەدوای بەرە پێمان گەیشتووە، هەمووی ڕاڤەکردووە. دوای ئەو ڕاڤە و شیکارییە زاڵمانەیە، بیرمەندان و زانیارانی ئەم دنیایە نەیانهێشتووە لە سەر زەوی ئاسەوارێک لە نەریتی پیرۆزی پێشینیان بمێنێتەوە. بەڵام، ئەوان پاژیان ڕاڤەکردووە و چاوپۆشییان لە گشت کردووە و لەڕاستیدا دیارە ئەوان زۆر کوێردڵن. لەگەڵ ئەوەشدا، گشت هەروا لەبەر چاویان زەق بۆتەوە و ڕاوەستاوە و درگاکانی دۆزەخی بەڕوودا ناکرێتەوە[2]. مەگین نۆزدە سەدە دەوامی نەهێناوە؟ مەگین هەروا لە نێو گیانی تاکە کەس و لە نێو ئاپۆرەی خەڵکدا هێزێکی زیندوو و کارا نییە؟ تەنانەت لەگیانی بیّدینەکانیشدا، کە باوەڕیان بە هیچ شتێک نییە، بەتوانا و زیندووە! چونکە تەنانەت ئەوانەش کە وازیان لە دینی مەسیح هێناوە و هێرشی دەکەنە سەر، لە ناخی دڵدا هەروا پێڕەوی لە ئایینی مەسیح دەکەن. چونکە تا ئێستا بە وردبینی یان تاسەی پڕ لە تینی دڵیان نەیانتوانیوە سەبارەت بە مرۆڤ و مەزنایەتیی، شتێکی باڵاتر و تەواوتر لە مەسیح بەدەستەوە بدەن. ئەگەر دەستیان بە شتێکیش ڕاگەیشتبیّ، ئاکامەکەی هەڵە و

---

2- ئینجیلی مەتا، بەشی شازدەهەم.

نابەجێ بووە. کوڕی چاک! ئەوەت قەت لەبیر نەچێ، پیرەکەت لە سەرەمەرگدا دەیهەوێ بتنێرێ بۆ دنیا. ڕەنگە ئەو ڕۆژە گەورەت لەبیر نەچێ و وتەکەم لە دالغەی خۆتدا ڕاگری. وتەیەک کە بۆ ڕێنوێنی تۆ لە ناخی دڵەوە هەڵدەقوڵێ، چونکە تۆ لاوی و وەسوەسەی دنیاییش زۆرن و لەوانەیە پێت تامڵ نەکرێ. چاکە ئێستا برۆکوڕە خۆشەویستەکەم.»

بەو وشانە، باوە پایسی تەقدیسی کرد. ئالیووشا کاتی چوونەدەرێ لە کلێسە و بیرکردنەوە لە وتەکانی باوە پایسی، بۆی دەرکەوت کە ئەو ڕاهیبە چلەکێشە کە بەر لەوە زۆر بە گرژی و ساردوسڕی هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکرد، لە ناکاو تێگەیشت لەگەڵ دۆستێکی تازە و چاوەڕوان نەکراو و مامۆستایەکی دڵسۆز و بەڕێز ئاشنا بووە. بەجۆرێک کە دەتگوت باوە پایسی میراتێکە و باوە زووسیما لە کاتی گیانکەنشتا بۆی بەجێ هێشتووە. ئالیووشا لە دڵی خۆیدا گوتی: «ڕەنگە هەر ئەو شتە بێ کە لە نێوانیاندا دەمەتەقێی لە سەر کراوە.» ئەو ئەندێشە فەلسەفییانەی کە ئێستا بیستووی، ئەویش ئاوا چاوەڕوان نەکراو، نیشاندەری سۆز و تینی دڵی باوە پایسی بوو. باوە پایسی دەیویست خێرا زەینی ئەو کوڕە لاوە بۆ ئانگژا بوونەوە لەگەڵ وەسوەسەی دنیایی ئامادە بکا وگەورەترین بەرگری لە گیانی لاوێک بکا کە بە ئەمانەت پێی سپێردراوە.

## (٢)

# لەماڵی باوکی

ئالیووشا بەر لە هەموو شتێک چوو بۆلای باوکی. لە ڕێگا وەبیری هاتەوە کە ڕۆژی پێشوو باوکی لە سەر ئەوە پێداگریی کردبوو کە جۆرێک بچێ نەهێڵێ ئیوان بزانێ. ئالیووشا لە ناکاو لەخۆی پرسی: «بۆ ئاوا؟ ئەگەر باوکم قسەیەکی تایبەتیشی لەگەڵ مندا هەبێ، بۆ بەدزییەوە بچم؟» ئاخری بەو ئاکامە گەیشت کە: «لەوانەیە دوێنێ لەبەر شێواوی و هەیەجان ویستبێتی باسی شتێک بکا.» وەلحاسڵ کاتێک مارتائیگناتیفنا دەرگای باخەکەی بۆ کردەوە (دیاربوو گریگۆری نەخۆشە و بە جێوبان کەوتووە) لە وەڵامی پرسیارەکەیدا گوتی ئیوان فیۆدۆرۆویچ دوو سەعات لەمەوبەر چۆتە دەرێ، زۆر خۆشحاڵ بوو.

- ئەی باوکم؟

مارتا بە لەبزێکی ساردوسڕ وەڵامی دایەوە: «لە سەرێیە. خەریکە قاوە دەخواتەوە.»

ئالیووشا چووە ژوورێ. پیرە پیاو دەمپایی لەپێ، بە عەبایەکی چکۆلە و کۆنەوە لە سەر مێزی نانخۆری بە تاقی تەنیا دانیشبوو. خەریکی حیساب و کیتاب بوو خۆی بەوکارەوە سەرقاڵ کردبوو. لە ماڵێ بە تاقیتەنیا بوو. چونکە ئیسمیر دیاکۆف بۆ کڕینی کەلوپەل چووبووە دەرێ. ئەگەرچی بەیانی زوو هەستابوو و هەوڵی دەدا خۆی کامڕەوا بنوێنێ، بەڵام شەکەت و بێهێز دیاربوو. نێوچاوانی لکەی خوێنی پێوە وشک هەڵاتبوو و بە دەسرەیەکی سوور پێچابووی. لووتیشی ماسیبوو و جێجێ لکە خوێن پێوەی قەتماغەی

بەستبوو، بەگشتی دەموچاوێکی ناحەز و قێزەونی هەبوو. پیرە پیاو لەو حاڵەتە ئاگادار بوو. هەرکە ئالیووشا چووە ژووری بە چاوێکی تووڕە و ڕقاوییەوە تێی ڕوانی.

بە لەبزێکی تۆسنەوە گوڕاندی: «قاوەکە ساردبۆتەوە. خوڵکت ناکەم. بۆ نیوەڕۆ پێمگوتوون شفتەی ماسی سازکەن، داوا لە کەسیش ناکەم لەگەڵم بخوا. بۆ هاتووی؟»

ئالیووشا گوتی: «هاتووم بزانم حاڵت چۆنە.»

ـ ئەرێ. دوێنێ خۆم پێمگوتی بێی. بەڵام بێفایدەیە. ڕازی بە زەحمەت نەبووم. بەڵام دەمزانی ڕاناوەستی و خێرا دێی.

ئەوەی بە هەستێکی تێکەڵ بە ڕقەوە دەربڕی، هەستا سەرپێ و بە نیگەرانی لەبەر ئاوێنەکە چاوی لە لووتی خۆی کرد (ڕەنگە ئەو ڕۆژە چل جار زیاتر چوبێتە بەر ئەو ئاوێنەیە.) هەروەها دەسماڵەکەی نێوچاوانی کردەوە و جوانتر بەستییەوە.

بە لەبزێکی ئامۆژگارییانەوە گوتی: «سوور چاکترە. دەستماڵی سپی پیاو وەبیر نەخۆشخانە دەخاتەوە. چاکە، وەعز و حاڵی کلێسە چۆنە؟ پیرەکەت چۆنە؟»

ئالیووشا وەڵامی دایەوە: «حاڵی زۆر خراپە؛ لەوانەیە ئەمڕۆکە بمرێ.» بەڵام فیۆدۆر پاولۆویچ گوێی نەدایە و خێرا پرسیارەکەی خۆی لەبیر بردەوە. گوتیشی: «ئیوان چۆتە دەرێ. دەیهەوێ ئەوپەڕی هەوڵی خۆی بدا کە دەزگیرانەکەی میتیا هەڵفریوێنێ بۆخۆی.» پاشان بەدزاتانە درێژەی بە قسەکانی دا: «بۆیە لێرە ماوەتەوە.» لچێکی هەڵقوورتاند و چاوی لە ئالیووشا کرد.

ئالیووشا پرسیی: «دڵنیام خۆی ئەوەی بەتۆ نەگوتووە!»

با، با. زۆر لەمەوبەر خۆی گوتی: باوەڕ ناکەی، سێ حەوتوو لەمەوبەر پێی گوتم؟ تۆ پێت وانییە ئەویش بۆ کوشتنی من هاتبوو؟ ها؟ حەتمەن بۆ ئەو هاتنە مەبەستێکی بووە.

ئالیووشا بە شڵەژاوی گوتی: «مەبەستت چییە؟ بۆ قسەی وادەکەی؟ ڕاستە داوای پارە ناکا، بەڵام ئەگەر داواش بکا کۆپکێکی پێ نادەم.»

هەر لەو کاتەدا کە بەنێو وەتاغەکەدا پیاسەی دەکرد، دەستی خستە گیرفانی عەبا چڵکنەکەیەوە، کە قوماشەکەی لە کەتانی زەرد بوو و درێژەی بە قسەکانی دا: «ئالکسی فیۆدۆرۆویچی خۆشەویستم! ڕەنگە بزانی کە دەمهەوێ زۆر عومر بکەم، بۆیە پێویستیم بە پارەیە و تەنانەت فلسێکیش بۆ من بایەخی خۆی هەیە، هەرچەندەش تەمەنم درێژتر بێ پێویستیم بە پارە زیاتر دەبێ. ئێستاش لە تەمەنی پەنجا و پێنجساڵیدا لە پیاوەتی نەکەوتووم. دەمهەوێ هەتا بیست ساڵی دیکەش لە پیاوەتی نەکەوم. بەڵام پیرتر دەبم، قەڵافەتیشم ناحەز و دزێو دەبێ و سەڵیتەکان ئەمجارە بە مەیلی خۆیان نایەن بۆلام. بۆیە پێویستیم بە پارە دەبێ. بۆیە هەرچی زیاتر پاشەکەوتی بکەم، بۆخۆمی پاشەکەوت دەکەم و پێویستیم پێیەتی ئالکسی فیۆدۆرۆویچی خۆشەویست. ڕەنگە وا چاکتر بێ تۆش بزانی. با پێت بڵێم دەخوازم هەتا کۆتاییی تەمەنم درێژە بە تاوان بدەم. چونکە تاوان شیرینە، هەموو کەس پێیان خراپە، بەڵام هەموو مرۆڤی دنیا لەگەڵیدا دەژین، بەڵام ئەوان بە نهێنی دەیکەن و من بە ئاشکرا. هەر بۆیە تاوانباران لەبەر ساویلکەییم تێمڕادەخوڕن. ئالکسی! با ئەوەشت پێبڵێم، بەهەشتی تۆ لەگەڵ زەوق و هەستی من سازگار نییە، ئەم بەهەشتەی تۆ ئەگەر بوونیشی هەبێ، شوێنێکی بەجێ نییە بۆ مرۆڤێکی ڕێزدار. پێموایە خەوم لێدەکەوێ و ئیتر خەبەرم نابێتەوە. مەرگ یانی ئەوەو تەواو. ئەگەر پێتخۆش بێ، دەتوانی بۆ شادیی ڕۆحم دوعا بکەی. ئەگەر پێشتخۆش نەبوو دۆعا مەکە بە توون! فەلسەفەی من ئەمەیە، ئیوان دوێنێ قسەیەکی باشی کرد، ئەگەرچی هەموومان سەرخۆش بووین. ئیوان مرۆڤێکی سەختیکێش و خۆنوێنە. بەڵام زانیارییەکی ئەوتۆی نییە... بارهێنانیشی هەروا. بێدەنگ دادەنیشێ و بێئەوەی متەق بکا بە پیاو پێدەکەنێ، هەر ئەوەش لە تەنگانە دەربازی دەکا.»

ئالیووشا بە بێدەنگی گوێی بۆ ڕاگرتبوو.

- بۆ قسە لەگەڵ من ناکا؟ ئەگەر بشیکا، بە پۆزێکەوە خۆ هەڵدەماسێنێ. کوڕم، ئیوان زۆر هیچوپووچە.» ئەگەر بمهەوێ، لە ماوەی دەقیقەیەکدا لەگەڵ گرووشنکا زەماوەند دەکەم. ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، ئەگەر پارەت هەبێ کافییە داوای شتێک بکەی زوو وەدەستت دەکەوێ. ئیوان هەر لەئەوە دەترسێ. چاوێکی کردۆتە چوار چاو و دەیهەوێ بەر بە ژنهێنانی من بگرێ. بۆیە میتیا هان دەدا لەگەڵ گرووشنکا زەماوەند بکا. دەیهەوێ بەو کارە لە گرووشنکام دوور خاتەوە. (پێیوایە ئەگەر پارەکەم خەرجنەکەم، دەیدەم بە ئەو!) جگە لەوەش ئەگەر میتیا لەگەڵ گرووشنکا زەماوەند بکا. ئیوان دەزگیرانە دەوڵەمەندەکەی ئەو وەگیر دێنێ و دڵیشی هەر بەوە خۆشە! کوڕم، ئیوان زۆر هیچوپووچە!

ئالیووشا گوتی: «چەندە تووڕەی تۆش. هەر لەبەر دوێنێیە؛ واچاکە تۆزێ ڕاکشێی.

پیرە پیاو وەک ئەوەی تازە بە زەینی گەیشتبێ، لە ناکاو گوتی: «فەرمووو! بەڵام قەیناکا تۆ هەرچییەک بڵێی لێت تووڕە نابم. ئەگەر ئیوان بیکوتبایە، لێی قەڵس دەبووم. تەنیا لەلای تۆ دڵم دەحەسێتەوە و هەست بە هێمنایەتی دەکەم، دەنا سەرتاپام ڕق و قین دایگرتووە و قیزەونیشم.»

ئالیووشا بە بزەیەکەوە گوتی: «ڕقاوی و قیزەون نییت، بەڵکو لەڕێ دەرچووی، هەڵەشەی، هەڵەشە.»

- گوێ بگرە، ئەمڕۆ بەیانی دەمویست ئەو میتیا نارەسەنە بە گرتن بدەم، نازانم بڕیارەکەشم دەبێ بەچێ. هەڵبەت لەم سەردەمەدا بە چاوێکی دەمار گرژانەوە چاو لە دایک و باوکان دەکەن، بەڵام تەنانەت ئێستاش یاسا ئیزن نادا تووکەسەری باوکە پیرەکەت بگری و بەملاوئەولادا ڕایکێشی، لە ماڵەکەی خۆیدا وەبەر مست و پێلاقەی دەی و هەڕەشەی کوشتنیشی لێبکەی - ئەویش لەبەر چاوی چەن شایەد. ئەگەر ئیشتیام لێبوایە، دەمتوانی لەبەر ئەو کارەی دوێنێی تاڵاوی بە گەرودا کەم و بیخەمە بەندیخانەوە.

- کەوایە ناتەوێ شکایەتی لێبکەی؟

- ئیوان پەشیمانی کردمەوە. ئیوان سەگی کوێیە، شتێکی دیکە لەگۆڕێدایە.
پاشان ئالیووشا سەری داخست، فیۆدۆر پاولۆویچ بە نیوە سرتەیەکی نهێنی لە درێژەی قسەکانیدا گوتی:
- ئەگەر ئەو هیچوپووچە بەگرتن بدەم و بکەوێتە بەندیخانەوە، گرووشنکا دەیبینێتەوە و بێماتڵ بوون دەچێ بۆ ملاقاتی. بەڵام ئەگەر بزانێ منی پیرە پیاوی بێهێزی خوری‌شۆر کردووە و بە قەستی کوشت لێی‌دوام. لەوانەیە واز لە ئەو بێنێ و بێ بۆلای من... چونکە شێوەکەی وایە و هەموو شتێک بە پێچەوانەیە. لە ناخی گەیشتووم! قومێک براندی هەڵنادەی؟ چۆڕێ قاوەی ساردەوەبوو بکە نێو پەرداخەکەوە با براندیت بۆ بکەم بە سەریدا، کوڕم قاوە و براندی تێکەڵ بکەی زۆر خۆشە.
ئالیووشا گوتی: «سپاس. ئەگەر ویستم، ئەو کولێرەیە هەڵدەگرم،» دەستی برد و کولێرە فەڕەنسییەکەی هەڵگرت و نایە گیرفانی عەباکەیەوە. پاشان چاوی لە باوکی بڕی و بە نیگەرانییەوە گوتی: «تۆش واچاکە براندی نەخۆیەوە.»
«ڕاست دەکەی هەق بەتۆیە. بەجێی ئەوەی ئەعسابم ئارام کاتەوە، زیاتری دەشڵەژێنێ. تەنیا پەرداخێکی چکۆڵەی دیکە، لە دۆلابەکە دەردێنم.» قوفڵی دۆلابەکەی کردەوە و پەرداخێکی پڕ کرد، پاشان دایخستەوە و کلیلەکەی نایەوە گیرفانی. « ئێتر بەسە، خۆ پەرداخێک نامکوژێ.»
ئالیووشا بە زەردەخەنەوە گوتی: «دیوتە ئێستا ئەخلاقت باشتر بووە.»
- ئم! تەنانەت بەبێ براندیش خۆشم دەوێی، بەڵام لەگەڵ ئەو هیچوپووچانە منیش هیچوپووچ دەبم. وانکا ناچێ بۆ چێرماشنیا - بۆ ناچێ؟ دەیهەوێ سیخوڕی بکا و بزانێ کاتێ گرووشنکا دێ چەندەی پارە دەدەمێ. هەموویان هیچوپووچن! بەڵام سەر لە کاری ئیوان دەرناکەم. هەر نایناسم، هەرچی دەکەم تێی‌ناگەم، لەباری ڕۆحیشەوە لە ئێمە ناچێ. پێی وایە میراتی بۆ بەجێ دەهێڵم! تۆش واچاکە بزانی، وەسییەتنامە لەپاش خۆم بەجێ ناهێڵم. میتیاش وەک قالۆنچە پان و فلێچ دەکەمەوە. قالۆنچە بەرسوورەکەش وایە شەوانە بە

دەمپایی دەیانکوژم. کاتێ پێیان لێدەنێم، کرچەیان دێ لە ژێر پێمدا. میتیای خۆشەویستی تۆش بەو دەردە دەبەم. دەڵێم میتیای خۆشەویستی تۆ، چونکە دەزانم خۆشت دەوێ. ئەرێ، تۆ خۆشت دەوێ و مەیلی خۆتە خۆشت دەوێ. هیچ ترسێکم لەوە نییە. بەڵام ئیوان هیچکەسی خۆشناوێ. ئیوان لە ئێمە نییە. ئالیووشاگیان! ئەو جۆرە مرۆڤانە لە ڕەچەڵەکی ئێمە نین. وەک تەپوتۆز وان، بایەک هەڵیبکا، تەفروتوونا دەبن.... کاتێک پێمگوتی وەرە بۆ ئێرە، بیرۆکەیەکی گەوجانەم لە مێشکدا بوو. دەمویست هەموو سڕوتڕی میتکا لە تۆ دەرکێشم. بۆوێنە ئەگەر هەزار یان دووهەزار ڕۆبڵی پێبدەم، بڵێی ئەو خوێڕییەی لەبرسا مردووە قەبووڵی بکا و بۆ ماوەی پێنج یان باشتر بڵێم، سی و پێنج ساڵ ملی خۆی بشکێنێ و گۆڕی گومبکا و دەست لە کۆڵ گرووشنکا بکاتەوە؟

ئالیووشا لە بنەوە منجاندی: «لێی ـ لێی دەپرسم. ئەگەر سێ هەزاری پێبدەی، ڕەنگە...»

«وڕێنە دەکەی! پێویست ناکا لێی بپرسی! ڕام گۆڕاوە. لەخۆڕا وڕێنەیەکم کرد.» ئەمجار پیرەپیاو، دەستی هەڵتەکاند و نەڕاندی: «هیچی نادەمێ، تەنانەت کووپکێکیش، خۆم پێویستیم بە پارەیە. بەبێ ئەوەش وەک کەرەجنە جیقی دەردێنم. هیچی پێ مەڵێ، دەنا دڵی خۆی خۆش دەکا. تۆش لێرە کارت نییە، پێویست ناکا لێرە بمێنیتەوە، بڕۆ. ئەو دەزگیرانەی، کاترینا ئیوانا، کە هەتا ئێستا لێی شاردوومەتەوە، شووی پێدەکا یان نا؟ پێموایە دوێنێ چووبووی بۆ دیدەنیی!»

ـ بە هیچ شێوەیەک دەستی لێهەڵناگرێ.

ـ دیوتە ئەو چەتیوە بەناز و نووزانە چۆن ئاشقی ئەو هەتیوە بەرەڵڵا و سووک و چرووکە بوون. ئەوە بزانە ئەو خاتوونە ڕەنگ بزرکاوانە جیاوازییان زۆرە لەگەڵ... ئاخ، ئەگەر وەک ئەو لاوە دەبووم و ئەو قەڵافەت و بەژن و باڵایەی ئەو کاتەم دەبوو، (لە تەمەنی بیست و هەشت ساڵاندا زۆر لەو قیتوقۆز و جوانچاکتر بووم) پاڵەوانێکی سەرکەوتوو دەبووم، ڕاست

وەک ئەو. مرۆڤێکی خوێڕییە! بەڵام بە هیچ شێوەیەک نابێتە خاوەنی گرووشنکا، نا کوڕم، نابێ! دەیتۆپێنم. جیقی دەردێنم!

بەم وشانەی کۆتایی، تەواو ڕقەکەی گەڕابۆوە و چەقۆت لێدایە خوێنی نەدەهات.

بە توڕەییەوە درێژەی پێدا: «دەتوانی بڕۆی. ئەمڕۆ لێرە هیچ کارێک نییە بیکەی.»

ئالیووشا بۆ خوداحافیزی لێیچووە پێشێ و شانی ماچکرد.

پیرە پیاو تۆزێ بە سەرسووڕمانەوە پرسیی: «ئەوە بۆچی بوو؟ دیسان یەکتر دەبینن، یان پێتوایە یەکتر نابینینەوە؟»

- دیارە یەکتر دەبینینەوە، مەبەستێکم نەبوو.

پیرەپیاو چاوێکی لێکرد و گوتی: «منیش هیچ مەبەستێکم نەبوو.» پاشان لەپشت سەریەوە گوڕاندی: «گوێبگرە گوێ، دیسان وەرەوە پێیاندەڵێم شفتەی ماسیت بۆ ساز کەن، شفتەی چاک، نەک وەک ئەوەی ئەمڕۆ. حەتمەن وەرەوە! سبەینێ وەرە، گوێت لێیە، سبەینێ!»

نیوە پەرداخێکی دیکەی براندی تێکرد، سینگی سافکرد و لەبن لێوەوە منجاندی: «ئیتر ناخۆمەوە!» و دیسان دەرگای دۆڵابەکەی داخستەوە و کلیلەکەی نایەوە گیرفانی. پاشان ڕۆیی بۆ وەتاغی خەوەکەی. شەکەت و ماندوو لە سەر چرپاکە خۆی ڕاکێشا و خێرا خەوی لێکەوت.

# (٣)

# دیدار لەگەڵ کوڕانی قوتابی

ئالیووشا، کە لە ماڵی باوکی هاتە دەرێ و بەرەو ماڵی مادام خۆخلاکۆف بایدایەوە، لە دڵی خۆیدا گوتی: «خودایە زۆر شوکور سەبارەت بە گرووشنکا هیچی لێنەپرسیم، دەنا نەمدەتوانی درۆ بکەم و دەبوو باسی دیداری دوێنێی خۆم لەگەڵ گرووشنکای مووبەموو بۆ بگێڕمەوە.»

ئالیووشا بەداخ و کەسەرەوە هەستیدەکرد هەردوو ڕەقیبەکە لە دوێنێوە ڕق ئەستوورتر بوون و دڵیان بەجارێ لە یەکتر ڕەش بووە. «باوکم قین و ڕق دایگرتووە و پیلانێکی داڕشتووە، دیمیتریش لەوانەیە لە دوێنێوە دڵڕەقتریش بووبێ، حەتمەن ئەویش ڕق و تووڕەیی ناخی داگرتووە، بێگومان ئەویش پیلانێکی داڕشتووە، پەککو لەو بەڵایە، هەرچۆنێکە دەبێ ئەمڕۆ پەیدای بکەم.»

بەڵام بیرکردنەوەی ئالیووشا زۆری نەخایاند. لە ڕێگا ڕووداوێک قەوما. ئەگەرچی ڕواڵەتەن ساکار بوو، بەڵام شوێنێکی قورسی لە سەر دانا. دوای ئەوەی لە گۆڕە پانەکە تێپەڕی . بەرەو کۆڵانێک بایدایەوە، کە دەچووە سەر شەقامی میخایلۆفسکی و کەندەڵانێکی چکۆلە لە شەقامی سەرەکیی جیا دەکردەوە. (هەموو شەقامی شارەکەی ئێمەیان بە قووڵکە و کەندەڵان لێکهەڵبڕیوە) لەلای پردێک چاوی بە پۆلێک کوڕی قوتابی کەوت. کە هەموویان تەمەنیان دە دوازدە ساڵان بوو. لە قوتابخانەوە بەرەو ماڵێ دەڕۆیشتنەوە. هێندێکیان جانتایان لەکۆڵ نابوو، هێندێکیان بە جانتای قایشی قەیتاندارەوە، بڕێکیان کۆڵەباڵتەیان لەبەردا بوو. تاقمێکیشیان چاکەتی چکۆلە.

تەنانەت هێندێکیان چەکمەی مل درێژیان لە پێدا بوو و حاندی قولاپەی لاقیان چرچولۆچ بوو، لەو جزمانەی کوڕانی نازپەروەردە لە پێی دەکەن و دڵیان پێوەیەتی. هەموویان بە تامەزرۆییەوە باسی شتێکیان دەکرد، دیار بوو پێکەوە تەگبیر و ڕا دەکەن. ئالیوۆشا هەر لەو ڕۆژەوە کە لە مۆسکۆ نیشتەجێ بوو، نەیتوانیبوو کاتی تێپەڕین بەلای قوتابیاندا سەرنجیان نەداتێ، بەتایبەت منداڵانی سێ‌چوار ساڵانەی زۆر خۆش دەویست. قوتابیانی دەدوازدە ساڵانەشی خۆش دەویست. هەر بۆیە لەبەر دڵتەنگی و شێواییەکەی ئەمڕۆی دەیویست خێرا بچێ بۆ لای ئەو منداڵانە و سەری قسەیان لەگەڵ بکاتەوە. چاوی لە ڕوخساری سوورهەڵگەڕاو و قوشقییان بڕی و خێرا بۆی دەرکەوت هەموویان بەردیان بە دەستەوەیە. لەولای کەندەڵانەکەوە، نزیکەی سی مەتر دوورتر، کوڕێکی قوتابیی دیکە لە پەنا محەجەرەیەک ڕاوەستابوو، ئەویش جانتایەکی قایشی لە شاندا بوو. دە ساڵانە دەبوو. لاواز و ڕەنگ بزڕکاو، چاوی ڕەش و گەش. شەش منداڵی دیکەش کە دیاربوو هاوپۆلی ئەون و پێکەوە لە قوتابخانە هاتوونە دەرێ، بەڵام لەگەڵ ئەوان بەکێشە هاتووە و دیارە ڕقی لێیان هەستاوە. سرک و قوشقی ڕاوەستابوو. چاوی لە منداڵەکان بڕیبوو. ئالیوۆشا لێیان چووە پێشێ، کوڕێکیان تووکە سەری بۆر و لوول بوو. باڵتەیەکی ڕەشی لەبەردا بوو، ئالیوۆشا پێیگوت:

ـ کاتێ هاوتەمەنی ئێوە بووم و جانتای قایشدارم هەبوو، لە شانی چەپەم دەکرد بۆ ئەوەی دەستە ڕاستم ئازاد بێ، بەڵام تۆ جانتاکەت لەشانی ڕاستەت کردووە. ئاوا نابێ، ناجۆرە.

ئالیوۆشا لەگەڵ فڕتوفێڵی ئەو جۆرە قسانە ئاشنا نەبوو. بەڵام مرۆڤی گەورە ئەگەر بیهەوێ لەگەڵ منداڵ یان تاقمێک منداڵ بکەوێتە قسە ئیتر ناچارە و دەبێ بە شێوەیەکی جیددی سەری قسە بکاتەوە تاکو وەک ئەوان بێتەوە. ئالیوۆشا ئەوەی لە ڕووی غەریزەوە دەزانی.

کوڕێکی یازدە ساڵانەی جوانکیلە و شادیک، خێرا وەڵامی دایەوە: «ئاخە چەپلەرە.» منداڵەکانی دیکەش هەموو چاویان لە ئالیوۆشا بڕی.

کوڕێکی دیکەیان گوتی: «کاتێ بەردیش دەهاوێ بە دەستی چەپەی دەیهاوێ.»

هەر لەو کاتەدا بەردێک ویژەی هات و بەرەو کوڕەکە هات. ئەگەرچی دەقیق و بەهێز لەوبەری کەندەڵانەکەوە بە دەستی کوڕەی کزەڵۆک هاوێژرابوو، لاچاوی کوڕەی چەپلەری تۆزێک فرینجاند.

هەموویان گوڕاندیان: «ئیسمۆرۆف، زووکە تۆڵەی خۆت بکەوە.» بەڵام ئیسمۆرۆف، کوڕەی چەپلەر، پێویست بە گوتن ناکا، هەر لە ڕێوە بۆ تۆڵەی خۆی، بەردێکی هاویشت بەڵام لە عەرزەکە درا. ئەو کوڕەی لەوبەری کەندەڵانەکە ڕاوەستابوو، کە لە سی مەترییەوە دیاربوو گیرفانی پڕە لە بەرد. بەردێکی دیکەی هاویشت. ئەمجارە ڕاست لە ئالیووشای هەڵکرد و لە شانی درا.

منداڵەکان بە قاقاکێشان هاواریان کرد: «لە تۆی هەڵکرد، بەقەست ئەو کارەی کرد. تۆ کارامازۆفی. کارامازۆف! دەتناسێ زوو کەن بەردبارانی کەن!»

شەش بەردیان لە کوڕە هەڵکرد، بەردێکیان ڕاست لە تەپڵی سەری درا و کەوت بە عەرزیدا. بەڵام خێرا هەستایەوە و زۆر تەڕدەستانە وەڵامی دانەوە. هەردوولا دەستیانکرد بە بەردەفڕکێ. زۆربەی منداڵەکان گیرفانیان پڕ بوو لە بەرد.

ئالیووشا نەڕاندی: «ئەوە چدەکەن؟ ڕۆڵەگیان، پێتان عەیب نییە؟ شەش کەس لەگەڵ یەک کەس بەشەڕ دێن! ئاخەر دەیکوژن.»

هەڵاتە پێشێ و بۆ ئەوەی کوڕەی کزۆڵە ڕزگار کا، بارانی بەردی بەگیانی کڕی. بۆ ساتێک دوو سێ کەسیان دەستیان لە بەردەفڕکێ ڕاگرت.

کوڕێکی کراس سوور بە دەنگێکی توورە و منداڵانەوە هاواری کرد: «سەرەتا ئەو دەستی پێکرد! هیچوپووچە. چەن ڕۆژ لەمەوبەر لە نێو پۆلەکەدا چەقۆیەکی لە کراسووتکین دا. خوێنی لێهات. کراسووتکین شکایەتی لێناکا، بەڵام پێویستە تەممێ کرێ.»

ـ ئاخر بۆ؟ حەتمەن سەردەنێنە سەری و ئازاری دەدەن.

منداڵەکان تێکڕا گوڕاندیان: «چاو لێکە، دیسان بەردێکی تێهەڵکردی. دەتناسی. ئێستا ئیتر تۆ بە دژی خۆی دەزانی. یاڵڵا دەی با هەموومان سێرەی لێبگرین، ئیسمۆرۆف تۆڵەی خۆت بکەوە!» دیسان بارانی بەرد، ئەویش زۆر توند و تیژتر لە پێشوو دەستیپێکردەوە. بەردێک لە سەر سنگی کوڕەی ئەوبەری کەندەڵانەکە درا؛ قیژەی لێ‌هەستا و دەستیکرد بە گریان و بە هەڵاتن لە سەر گردەکەوە بەرەو شەقامی میخایلۆفسکی داگەڕا. هەموو پێکەوە گوڕاندیان: «بەزی ترسەنۆک، قوڵەی ڕیخەڵۆک!»

کوڕێک کە کۆتی لەبەردا بوو و چاوی بریقەی دەهات، گوتی: «کارامازۆف نازانی چ بوونەوەرێکە. کوشتنیش بۆ ئەو کەمە.» وێدەچوو ئەو کوڕە لە هەموویان گەورەتر بێ.

ئالیووشا پرسیی: «مەگین چدەکا؟ قسەبەرە؟»

کوڕەکان هەموویان بە شێوەیەکی گاڵتەئامێز، چاویان لە یەکتر کرد.

هەر ئەو کوڕەی پێشوو گوتی: «ڕێگاکەت بەرەو میخایلۆفسکییە؟ خۆتی پێبگەیێنە.... چاو لێکە، دیسان ڕاوەستاوە، خەریکە چاومان لێدەکا.»

کوڕەکانی دیکە تێکڕا هاواریان کرد: «خەریکە چاومان لێدەکا.»

ـ لێی بپرسە بزانە لەگەڵ بەستەیەک گسکی حەمام چۆنە. گوێت لێیە، لێی بپرسە دەی!

دەنگی قاقای پێکەنینیان بەرز بۆوە. ئالیووشا چاوێکی لێکردن. ئەوانیش چاویان لە ئەو کرد.

ئیسمۆرۆف بە دەنگێکی تووڕە و هەڕەشەئامێزەوە هاواریکرد: «لێی نزیک مەبەوە، بریندارت دەکا.»

ـ سەبارەت بە بەستەی گسک هیچی لێناپرسم، چونکە پێموایە بە ئەو پرسیارە سەردەنێنە سەری. بەڵام قسەی لێ دادەکێشم، بزانم بۆ لێی‌بێزارن.

کوڕەکان هەموو بە پێکەنینەوە گوتیان: «کەوایە زوو ئەو کارەمان بۆ بکە.»

ئالیووشا لە پردەکە پەڕییەوە و بە گردەکەدا وەسەر کەوت و ڕاست ڕۆیشت بۆلای کوڕە.

کوڕەکان تێکڕا هاواریان کرد: «ئاگات لەخۆت بێ، لە تۆ ناترسێ. زمانت بگەڕێ، چەقۆیەکت لێدەدا، هەر بەوجۆرەی لە کراسووتکینی دا.»

کوڕە چاوەڕوان ڕاوەستابوو و لە جێی خۆی نەدەبزووت. ئالیووشا بەرەو لای ئەو دەڕۆیشت، کە نزیک بۆوە بۆی دەرکەوت کوڕە نۆ ساڵی تەمەنە.

لەگەڵ ئەوەی لاوازە و هەڵینەداوە، نەخۆشیشە. بە دەموچاوێکی زەردەڵ و ڕەقەڵەوە چاوە ڕەش و ڕقاوییەکەی تێبڕیبوو. ڕووپۆشێکی کۆنە و ڕەنگ بواردووی لەبەردا بوو کە زۆر بە بەری تەنگ بوو. قۆڵە ڕووتەکانی هەتا پشت هەنیشکی بەدەرەوە بوو. پینەیەکی گەورە بە سەر چۆکی ڕاستەی پانتۆڵەکەیەوە بوو. نووکی چەکمەی لاقی ڕاستەی کون بووبوو کە بە وردی بە جەوهەر ڕەشیان کردبوو. هەردوو گیرفانی چاکەتەکەی پڕ بوون لە بەرد و لەبەر قورسی داچۆڕابوون.

ئالیووشا دوو هەنگاوی مابوو بگاتە لای ڕاوەستا. هاوڕێ لەگەڵ چاکوخۆشی چاوی تێبڕی. کوڕەکە لەڕێوە لە چاوانی ئالیووشا گەیشتبوو کە لێینادا، خاو بۆوە و ئاوای گوت بە ئالیووشا!

- شەش کەس لەگەڵ یەک کەس، ئەگەر تەنیا بێن، هیچیان دەرەقەتم نایەن!

ئالیووشا گوتی: «دەیانگوت من دەناسی و بە قەستی بەردم تێ هەڵدەکەی.»

کوڕە بە تووڕەییەوە گوڕاندی: «لەکۆڵم بەوە.» بەڵام لە جێی خۆی نەبزووت. دەتگوت چاوەڕوانی شتێکە و دیسان بریقەیەکی پڕ لە ڕق و قین لە چاویدا دیاربوو.

ئالیووشا گوتی: «زۆر چاکە، من دەڕۆم. بەڵام ئەوە بزانە هەر ناتناسم. سەریش نانێمە سەرت. پێیان گوتم، گاڵتەت پێدەکەن، بەڵام من نامەوێ سەربنێمە سەرت و گاڵتەت پێبکەم. خوداحافیز!»

کوڕە هەروا تووڕە و تۆسنانە بە دوای ئالیووشادا وەڕێکەوت و گوڕاندی: «ڕاهیبی پاتۆڵ هەوریێشم!» هەستیشی دەکرد کە ئالیووشا هێرشی بۆ دەبا، بۆیە خۆی ڕاست و چەپ کرد و ئامادەی بەرگریکردن لە خۆی بوو؛ بەڵام ئالیووشا ڕووی وەرگێڕا و چاوی لێکرد، پاشان ملی ڕێی گرت. سێ هەنگاوی نەنابوو، کوڕە گەورەترین بەردی لە گیرفانی دەرهێنا و زۆر بە توندی لە پشتی ئالیووشای ڕاکێشا.

ئالیووشا دیسان ئاوڕی دایەوە و گوتی: «دەی کەوایە لە پشتەوە زەبر دەوەشێنی! قسەی ئەوان ڕاستە دەڵێن بە دزییەوە شاڵاو دەبەی.» ئەمجارە، کوڕە زۆر بە تووڕەیی بەردێکی لە دەموچاوی ئالیووشا هەڵکرد؛ بەڵام ئالیووشا فریا کەوت دەستی بکاتە قەڵغان و بەردەکە لە باسکی درا! گوڕاندی: شەرم ناکەی؟ ئاخر خۆ من کارم پێت نییە. ویستم یارمەتیشت بدەم!»

کوڕە هێدی و شەڕانی ڕاوەستا، دڵنیا بوو کە هەر ئێستا شاڵاوی بۆ دەبا. هەر بۆیە کاتێک تێگەیشت ئالیووشا کاری پێی‌نییە، وەک بوونەوەرێکی بچووکی وەحشی ڕقی هەستا و وەک شێت و هار هێرشی برد بۆ ئالیووشا و بەرلەوەی لەجێی خۆی چرتە بکا، کوڕەی ڕق لە زگ دەستی چەپەی ئالیووشای بە هەردوو دەستیگرت و بە قامکی زەڕنەقووتەیدا نووسا. ئالیووشا لەبەر ژانی دەستی نەڕاندی و بە هەموو هێز و قەوەتی خۆی دەستی ڕاپسکاند و قامکی لە گیرگەی ددانی کوڕە دەرهێنا. کوڕە دەستی بەردا و هەڵاتە ئەو لاوە. ددانی هەتا سەر یەسقانی پەنا نینۆخی چووبووە خوارێ و خوێنی لێ دەرپەڕاندبوو. ئالیووشا دەسرەیەکی لە گیرفانی دەرهێنا و توند بەستی. دەقیقەیەکی تەواو خەریکی پێچانی قامکی بوو. کوڕەش لەو ماوەیەدا ڕاوەستابوو و چاوی لێدەکرد. پاشان ئالیووشا سەری هەڵێنا و نیگا دڵۆڤانەکەی تێبڕی و گوتی:

«باشە بۆ وات کرد؟ دیوتە چ گازێکت لێگرتم؟ ئیتر بەس نییە؟ پێمبڵێ من چیم کردووە؟»

کوڕە عەبەسرابوو و چاوی نەدەترووکاند.

ئالیووشا هەر بەو لەسەرەخۆیییەوە درێژەی بە قسەکانی دا: «ئەگەرچی ناتناسم و ئەوە یەکەم جارە چاوم پێت دەکەوێ، ڕەنگە ئازارێکم پێ گەیاندبێتی دەنا لەخۆڕا ئاوقای من نابی. کەوایە پێمبڵێ چیمکردووە؟ چ هەڵەیەکم کردووە پێمبڵێ؟»

کوڕە لەجیاتی وەڵام، زووڕە زووڕ دەستی کرد بە گریان و تێی‌تەقاند. ئالیووشا هێور هێور بە دوایدا بەرەو شەقامی میخاییلفسکی سەری پێوەنا و هەتا ماوەیەکی زۆر دوور بە دوور کوڕەی دەدی بە پڕتاو هەڵدێ و ئاوڕ ناداتەوە، بێگومان هەروا دەشگریا. بڕیاریدا هەر کاتێ دەرفەتی بۆ هەڵکەوێ، بیدۆزێتەوە و گرێ پووچکەی ئەو نهێنییە بکاتەوە. بەڵام لەو کاتەدا دەرفەتی ئەوەی نەبوو.

## (٤)

## له ماڵی مادام خۆخلاکۆف

ئالیوشـا زوو خـۆی گـەیانـدە مـاڵی مـادام خۆخلاکـۆف، ماڵـەکـەیـان خانووبەرەیەکی بەردین و دوو نهۆم، یەکێکیش لە جوانترین خانووبەرەکانی ئەم شارەی ئێمە بوو. ئەگەرچی مادام خۆخلاکۆف زۆربەی کاتی ژیانی لە پارێزگایەکی دیکە تێپەڕ دەکرد، کە لەوێ ملّکێکی هەبوو، یا لە مۆسکۆ دەبوو کـە لـەوێـش خانووبـەرەیـەکـی تایبـەتـی هـەبـوو. لـە شـارەکـەی ئێمـەش خانووبەرەیەکی بوو کە لە باب و باپیرانەوە بە میرات پێی گەیشتبوو. ئەو ملّکەی لە شارەکەی ئێمە بوو لە دوو ملّکەکەی دیکەی گەورەتر بوو، لەگەڵ ئەوەشدا، ماوەیەکی زۆر کەم لە شارەکەی ئێمە مابۆوە. لەبەر هـەیوانـەکـەوە ئالیوشای دیت و بە هەڵەوداوان هات بەرەوپیری.

«نامەکەم سەبارەت بە مۆجزەی تازە بە دەستت گەیشت؟» زۆر توند و تووڕە قسەی دەکرد.

ـ بەڵێ.

ـ پیشان هەموانت دا؟ پیر کوڕەکەی بە دایکی گەیاند!

ئالیووشا گوتی: «ئەمڕۆ دەمرێ.»

ـ بیستوومە، دەزانم. ئاخ چەندم پێخۆشە لەو بارەوە لەگەڵت بدوێم. تەنیا لەگەڵ تۆ نەک کەسی دیکە، تەنیا لەگەڵ تۆ! چەندەش بەداخەوەم ناتوانم چاوم بە ئەو بکەوێ! تەواوی خەڵکی شارەکە شڵەژاون، هەموو چاوەڕێن. زانیوتە کاترینا ئیواناش لێرەیە؟

ئالیووشا گوڕاندی: «ناوچاوانەکەم هێناوییەتی. کەوایە هەر لێرە چاوم پێی دەکەوێ. دوێنێ پێی گوتم ئەمڕۆ حەتمەن بچم بۆ دیدەنیی.»

ـ دەزانم، لە هەموو شتێک ئاگادارم، ڕووداوەکەی دوێنێشم مووبەموو بیستووە ـ هەروەها کردەوەی شێتوشوورانەی ـ ئەو دەعبایەش. C'est tragique[3]، ئەگەر بەجێی ئەو بوایەم، نازانم چمدەکرد. دەی بیروڕات سەبارەت بە دیمیتریی برات چییە؟ ـ خودایە گیان! ئالکسی فیۆدورۆویچ! خەریکە لەبیرم دەچێ، بیهێنە بەرچاوی خۆت؛ براکەت لەگەڵ ئەوە، ئەو برادەرەت ناڵێم، براکەی دیکەت ئیوان فیۆدۆرۆویچ دەڵێم، پێکەوە قسەیان کردووە. پێکەوە بۆ مشتومڕی جیددی دانیشتوون. خۆزگە بتهێنایەتە بەرچاوی خۆت ئێستا لە نێوانیاندا چی دەگوزەرێ ـ واوەیلایە واوەیلا، من پێموایە زۆر جەرگبڕە، وەک چیرۆکێکی تراژیک و پڕ کارەسات دەچێ. ڕوون نییە بۆ خەریکن ژیانی خۆیان لە نێو دەبەن. هەردووکیشیان لەوە تێدەگەن و چێژی لێوەردەگرن.چاوەڕێت بووم، بەڕاستی تاسەم دەکردی ئیتر لە توانامدا نەماوە و ئەوەش لە هەموو شتێک خراپترە. هەر ئێستا هەموویت بۆ دەگێڕمەوە، بەڵام ئێستا دەبێ باسی شتێکی دیکەت بۆ بکەم، گرینگترین شت چییە. پێم بڵێبزانم لیزا بۆ تووڕە بووە؟ هەرکە بیستی لێرەی قەڵس بوو!

دەنگی لیزا لە کەلێنی درگاکەی تەنیشتییانەوە هات: «دایە، تۆی ئێستا ڕقت هەستاوە، نەک من.» دەنگی گڕ بوو، وەک ئەوەی بیهەوێ پێبکەنێ، بەڵام ئەوپەڕی هەوڵی خۆی دا بۆ ئەوەی دان بە خۆیدا بگرێ. لەڕێوە کەلێنی درگاکە سەرنجی ڕاکێشا، لیزاش بێگومان لە کەلێنەکەوە چاوی لێدەکرد، بەڵام ئیتر ئەوەی نەدەدی.

ـ سەیریش نییە لیزا، سەیر نییە... بیرە بیرە بوونی تۆش منی لە دین دەرکردووە. بەڵام ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، لیزا حاڵی باش نییە، شەوی ڕابردوو زۆر نەخۆش بووە، بەدەم چەقوچو و تاویاوەوە ناڵاندوویە! زۆر بە زەحمەت توانیم چاوەڕوانی بەیان و هاتنی هێرتزنستیۆب بم. دەڵێ سەری لێدەرناکەم و دەبێ جارێ سەبر بکەین. هێرتزنستیۆب هەمیشە دێت و دەڵێ سەرم

---

3- تراژیدیایە.

لێیدەرناچێ. کاتێ گەیشتیتە ئێرە لیزا قیژاندی و تووڕە بوو، ئیسەرەمی کرد کە بیبەمەوە بۆ هۆدەکەی خۆی.

ـ دایە! نەمدەزانی ئەو هاتووە. لەبەر ئەو نەبوو ویستم بۆ ئەم وەتاغەم بێنییەوە.

ـ قسەی تێدا نییە لیزا، یۆلیا بە هەڵاتن هات و پێی گوتی ئالکسی فیۆدۆرۆویچ خەریکە دێ بۆ ئێرە. خەریک بوو بۆ تۆی کێشک دەدێرا.

ـ دایکە گیان، قسەیەکی ژیرانەت نەکرد. بەڵام ئەگەر دەتهەوێ قەرەبووی بکەیتەوە و قسەیەکی ئاقڵانە بکەی، وا چاکە بە میوانە بەڕێزەکەمان ئالکسی فیۆدۆرۆویچ بڵێی دوای ئەو ڕووداوەی دوێنێ و بوونە مەڵحەکەی خەڵکی، کارێکی ژیرانەی نەکردووە هاتووە بۆلامان.

ـ لێزا! خەریکی پێی زیادی دادەکێشی. ناچارم دەکەی تووڕە بم. بۆتە مەڵحەکەی کێ؟ من زۆرم پێخۆشە هاتووە، پێویستم پێیەتی، بەبێ ئەو ناتوانم هەڵکەم. ئالکسی فیۆدۆرۆویچ بگە فریام زۆر خەمبارم!

ـ دایەگیان، بۆ ئاوا دەکەی، چبووە؟

ـ ئاخ لیزا! ئەو حاڵەتە کشمیشییەی تۆ و نەخۆشی و بێئۆقرەییت، ئەو شەوە تاڵووتوونە و لە هەمووی خراپتر حەزرەتی ئەجەلی ئەمجەدی ئەفخەم هێرتزنستیۆب! هەموو شتێک، لەڕاستیدا هەموو شتێک... تەنانەت ئەو مۆجزەیەش! ئاخ ئەو مۆجزەیە تووشی دڵەخورپە و شڵەژانیان کردم، وردیان کردم، ئەی ئالکسی فیۆدۆرۆویچی خۆشەویست! ئەو تراژیدیایەش لە وەتاغی میوانداری، با پێتبڵێم لە تاقەتی من بەدەرە. بۆم تامڵ ناکرێ. ڕەنگە کۆمێدی بێ نەک تراژێدیش. پێمبڵێ بزانم، باوە زووسیما بڵێی هەتا سبەینێ بمێنێ، ها؟ ئاخ خودایەگیان! من بۆ وام لێهاتووە؟ هەموو ساتێک چاوم دەقوچێنم و دەبینم هەمووی وڕێنەیە، وڕێنە.

ئالیووشا لە ناکاو پەڕییە نێو قسەکانی: «زۆری منەت هەیە ئەگەر کونەپەڕۆیەکی خاوێنم بدەنێ قامکمی پێببەستم. کوڵەوار بووە و زۆر دێشێ.»

ئالیووشا قامکە گەستراوەکەی کردەوە، دەسرەکە لە خوێنا شەڵاڵ بوو بوو. مادام خۆخلاکۆف قیژاندی و چاوی خۆی گرت.

ـ خودایەگیان چ برینێک، ئەوە بۆ وایلێهاتووە؟

بەڵام لیزا هەرکە لە کەلێنی درگاکەوە قامکی ئالیووشای دی، درگاکەی لە سەر چەقی پشت کردەوە و هاواری کرد: «وەرە، وەرە بۆ ئێرە. ئیتر ورێنە و قسەی بێسەرەوبەر، بەسە! خودایە گیان، بۆ تا ئێستا لەوێ ڕاوەستاوی و هیچ ناڵێی؟ دایە، لەوانەیە بەهۆی خوێن لەبەررۆیشتنی بمرێ! چۆن وات لێهات؟ ئاو، ئاو! لەپێشدا دەبێ خاوێن بیشۆی. بیخە نێو ئاوی ساردەوە با ژانەکەی بشکێ. هەر ئاوا ڕایگرە، هەر ئاوا ڕایگرە... دایە! زووکە، بڕێ ئاو و تەشتۆکەیەک بێنە. خێراکە.» زۆر بە تووڕەیی قسەکانی تەواو کرد. بە دیتنی برینەکەی قامکی زراوی چووبوو.

مادام خۆخلاکۆف هاواری کرد: «وا چاکە بنێرین بە دوای «هێرتزنێسیتۆب»دا!

ـ دایە! ئاخری دیقم پێدەکەی. هێرتزنێسیتۆبی خۆشەویستت دێت و دەڵێ سەرم لێی دەرناچێ! ئاو، ئاو! بۆخاتری خودا خۆت بچۆ و بە یۆلیا بڵێ پەلە بکا. ئەو تەوەزەلی دەستەوستانەش هەمیشە خۆی دەگنخێنێ! دایە خێراکە، خێرا، دەنا دەمرم، دڵم دەتۆقێ.

ئالیووشا، ترسا کێشە و هەرا سازبێ لە نێوان دایک و کچدا، هاواری کرد: «هیچ نییە، خۆ شتێکی وا نییە. خۆتان ناڕەحەت مەکەن.»

یۆلیا بەلەز بە ئاو و تاسەوە هاتە ژووری و ئالیووشا قامکی لە ئاوەکە نا.

ـ دایە! بۆخاتری خودا تۆزێ تەنزیل و تراوکەی کزانەوەی تایبەتی برینم بۆ بێنە. چیی پێدەڵێن، هێندێکمان هەیە، هێندێکمان هەیە، هەمانە، دایە دەزانی بتریەکە لە کۆییە؛ لە ژووری خەوەکەت لە نێو دۆڵابی دەستە ڕاست دایە، بترییەکی گەورە و بەستەتە نزیلەکە لەوێدایە.

ـ لیزا! هەر ئێستا هەموو شتەکانت بۆ دێنم، تۆ هەر مەقیژێنە و دڵی خۆت ناڕەحەت مەکە. دیوتە ئالکسی فیۆدۆرۆویچ ئازایانە تاملی دەکا. ئالکسی فیۆدۆرۆویچ قامکت بۆ ئاوا کوڵەوار بووە؟

مادام خۆخلاکۆف بە هەشتاو ڕۆیشت. لیزاش چاوەڕێ بوو. بەبێ ماتڵ بوون لە ئالیووشای پرسی:

ـ بەر لە هەموو شتێک ئەم وەڵامەم بدەرەوە، قامکت بەچ ئاوای لێهات؟ ئەوکات سەبارەت بە شتێکی دیکە قسە دەکەین. باشە؟

ئالیووشا هەستی بەوە کردبوو کە ئەو چەن ساتەی چوونە دەرەوەی مادام خۆخلاکۆف بۆ لیزا چەندە بەنرخە، باسی دیدارە پڕ نهێنییەکەی لەگەڵ منداڵانی قوتابیی بە چەن وشە بەیانکرد. لیزا بە بیستنی ئەو ڕووداوە دای بە ڕانی خۆیدا و وەک ئەوەی مافی بەرگری کردن لە کارەکانی ئەوی ببێ، بە تووڕەیی گوڕاندی:

ـ عەیب ناکەی، بەو جلوبەرگەوە لەگەڵ منداڵانی قوتابی دەکەوی! ئەگەرئەو کارانە بکەی لە منداڵیش منداڵتری! بەڵام سەبارەت بەو کوڕە دڕ و وەحشییە دەبێ هەرچۆنێکە پەیدای بکەیت و ئاگادارم بکەیتەوە، چونکە لەوە دەچێ ڕازێک لە گۆڕێدا بێ. ئێستا با بچینە سەر مەبەستی دووهەم. بەڵام سەرەتا پرسیارێک: ئالکسی فیۆدۆرۆویچ! پێت وایە ژان و ئازار دەبێتە هۆی ئەوەی سەبارەت بە شتێکی زۆر بێهەمیەت بتوانی بدوێی، ئەویش بە شێوەیەکی ماقووڵانە؟

ـ دیارە دەبێ، چونکە ئێستاش هەست بە ژانێکی زۆر دەکەم.

ـ هی ئەوەیە قامکت لەو ئاوەدایە. دەبێ زوو ئاوەکە بگۆڕین، چونکە هەر ئێستا گەرم دەبێ. یۆلیا، خێرا لە هەمارەکە کوتێ سەهۆڵ و تەشتێکی دیکە بێنە! ئێستا کە ئەویش ڕۆیشت، دەتوانم قسە بکەم. ئالکسی فیۆدۆرۆویچی ئازیز، ئەو نامەیەی دوێنێ بۆم ناردی بمدەوە ـ زووکە ئێستا دایکم دێتەوە و نامەوێ...

ـ نامەکەم پێ نییە.

ـ درۆ مەکە، پێتە. دەمزانی وا دەڵێی. لە گیرفانت دایە. شەوێ هەتا بەیانی لەبەر ئەو گاڵتەیە گڕی پەشیمانی هەڵی چۆقاندووم، زووکە پێم بدەوە.

ـ لە ماڵێ بەجێم هێشتووە.

ـ بەڵام لە پاش ئەو گاڵتەیە ناتوانی بە چاوی کچۆڵەیەک، بە چاوی کچێکی چکۆڵە لێم‌بڕوانی! سەبارەت بەو گەوجییەتییەشم داوای لێبووردنت لێدەکەم. بەڵام دەبێ نامەکەم بۆ بهێنیتەوە. ئەگەر بەڕاستی پێت نییە ـ دەبێ هەرچۆنێکە ئەمڕۆ بۆم بهێنیتەوە.

ـ ئەمڕۆ لەوانەیە نەتوانم، چونکە دەبێ بڕۆمەوە بۆ کلێسە و هەتا دوو ڕۆژی دیکە ـ ڕەنگە سێ‌چوار ڕۆژی‌تریش ـ نەتوانم بێم بۆلات ـ چونکە باوە زووسیما....

ـ چوار ڕۆژ. قسەی قوڕ! ئەرێ زۆرم پێ‌پێکەنییت؟

ـ نا هەر پێنەکەنیم.

ـ بۆ پێنەکەنییت؟

ـ چونکە باوەڕم بە قسەکانت کرد.

ـ دەتەوێ سووکایەتیم پێبکەی؟

ـ نا، بە هیچ شێوەیەک. لەگەڵ ئەوەی خوێندمەوە لە دڵی خۆمدا گوتم: سەردەگرێ، چونکە لە دوای مردنی باوە زووسیما، دەبێ واز لە کلێسە بێنم و بێمە دەرێ. ئەو کاتە دەستدەکەمەوە بە خوێندن و تەواوی دەکەم، هەتا ئەو کاتە تۆش دەگەیتە تەمەنی یاسایی و زەماوەند دەکەین. زۆرم خۆش دەوێی. هەمیشەش هەروا خۆشەویستم دەبی. ئەگەرچی دەرفەتی ئەوەم نەبوو سەبارەت بە ئەو مەسەلەیە بیر بکەمەوە. بەڵام پێموایە ژنی لە تۆ چاکترم دەستناکەوێ، باوە زووسیماش پێیگوتم دەبێ ژن بێنم.

لیزا سوور هەڵگەڕا و بە پێکەنینەوە گوتی: «ئاخر من نەقوستانم و بە کورسیلەی تەگەردار بۆ ئەملاو ئەولام دەبەن.»

ـ خۆم دەتگێڕم و خزمەتت دەکەم، بەڵام هەتا ئەو کاتە دڵنیام چاک دەبیتەوە.

لیزا بە تووڕەییەوە گوتی: «تۆ شێت بووی بە کەوچکێک ئاو کەوتوویە مەلە و بۆ گاڵتەیەک ئەو هەموو وڕێنە و قسە قۆڕەت تێکهەڵکێشاوە؟ ئەوە دایکیشم هاتەوە. هاتنەکەشی بەجێیە. دایە بۆ ئەوەندەت پێچوو، ئەوە یۆلیاش بەسەهۆڵەوە هاتەوە.»

ـ لیزا، ئەوەندە مەگوڕێنە، چونکە ئەو گوڕاندنەت لە هەموو شتێک زیاتر تووشی... ئاخر چبکەم تۆ تەنزیلەکەت لە جێیەکی دیکە داناوە. وڵاتم هەمووی سەنگوسووژن دا ـ پێموایە بە قەستی ئەو کارەت کردووە و شاردووتەوە.

ـ من چووزانم بە قامکی برینداروەوە دێ، دەنا ڕەنگە بە قەستی ئەو کارەم بکردایە. دایەگیان، تۆش قسەت خۆش کردووە و لە سەر بەزمی خۆتی.

ـ کارت بە قسە و بەزمی من نەبێ. بەڵام بۆ ئازار و ژانی ئالکسی فیۆدۆرۆویچ لە ڕادەبەدەر دڵسۆزی دەکەی. ئاخ ئالکسی فیۆدۆرۆویچی خۆشەویست ئەوەی دەمکوژێ شتێکی تایبەت نییە. هێرتێزنێستیۆبیش نییە، بەڵکوو هەموو شتێک پێکەوە دەستیان داوەتە دەستی یەک و گیرۆدەیان کردووم، بۆیە تاقەتم لێبڕاوە.

لیزا بە پێکەنینەوە گوتی: «دایە گیان بەسیکە، سەبارەت بە هێرتزنێستیۆب مەدوێ. دایە زووکە ئەو تەنزیل و تراوکەیە بێنە. ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، ئەو تراوکەیە ئاوی گۆلاردە. ئەوە ناوەکەیم وەبیر هاتەوە. بەڵام زۆر دەرمانی چاکە و یەکاویەکە. دایە بڕوا دەکەی لە ڕێگای ئێرە لەگەڵ منداڵەورکە شەڕی کردووە و یەکێ لە منداڵەکان گازی لە قامکی گرتووە، یانی خۆشی منداڵە! دوای ئەو ڕووداوە ئێتر شیاوی ئەوە نییە شووی پێبکەم. چونکە دایەگیان تۆ بیهێنە بەرچاوی خۆت، دەیهەوێ ژن بێنێ. لەبیری ژیانی هاوبەشیدایە، ئەوەش نەک هەر پێکەنینی، ئابڕوو چوونیشە! وا نییە؟»

لیزا لەبەرخۆیەوە ڕق هەستاوانە پێدەکەنی و لە بنەوە چاوی لە ئالیووشا دەکرد.

ـ مەسەلەکە چ پێوەندییەکی بە زەماوەندەوە هەیە؟ چی بۆتە هۆی ئەوەی باسی شتی وا بکەی کچم؟ ئەوە هەر بۆ قسەش نابێ ـ ڕەنگە کوڕە هار بووبێ.

ـ دایە ئەوە تۆ دەڵێی چی؟ یانی کوڕی هاریش لەم زەمانەدا هەیە؟!

ـ ئەی بۆ نییە، ڕۆڵە، پێتوایە لەخۆڕا قسەم پەڕاندووە؟ لەوانەیە ئەو کوڕە سەگی هار گرتبێتی و هار بووبێ. بۆیە هەر کەسێ لێی نزیک بێتەوە ئاوقای دەبێ و دەیگەزێ. ئالکسی فیۆدۆرۆویچ زۆر چاک برینەکەت پێچاوە، من نەمدەتوانی ئاوات بۆ بپێچم. ژانی نەشکاوە؟

ـ ئێستا زۆر نایەشێ.

لیزا پرسیی: «لە ئاو ناترسی؟»

ـ لیزا، واز بێنە ئیتر، سەبارەت بە هاربوونی ئەو کوڕە قسەیەکی کاڵ و نەکوڵیوم بە دەمدا هات، تۆش نایبڕییەوە. ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، کاترینا ئیوانابیستوویەتی لێرەی، لەوانەیە هەر ئێستا بگاتە سەرمان، وەختە گیانی دەرچێ بۆ دیتنت!

ـ تۆخودا دایە لێیگەڕێ، خۆت بچۆ بۆلایان. ئەو کوا دەتوانێ بڕوا، خۆ لەبەر ژانی پەنجەی عەجمانی نییە.

ئالیووشا گوتی: «نا وانییە، گوێم لە ژان نییە دەتوانم بڕۆم.»

ـ چی! دەتەوێ بڕۆی؟ یانی بە ڕاستتە؟

ـ ئەی چی، با جارێ بچم بۆ دیدەنیی ئەوان، سەرم سووک بێ دێمەوە بۆ ئێرە و هەرچەندەت پێخۆش بوو قسە دەکەین. بەڵام پێویستە زۆر زوو چاوم بە کاترینا ئیوانا بکەوێ، چونکە زۆر تامەزرۆی ئەوەم بگەڕێمەوە بۆ کلێسە.

ـ دایە، زووکە لێرەی ببە دەرێ. ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، لەمەولا بۆ دیتنی من زەحمەت بەرخۆت مەدە و ڕاست بگەڕێوە بۆ کلێسەکەت. خەوم دێ، دوێنێشەو تا بەیانی خەو نەچۆتە چاوم.

مادام خۆخلاکۆف گوڕاندی: «ئەیەڕۆ لیزا، ئیشەڵڵا بەڕاستت نییە، ڕەنگە خەوت بێ، بچۆ بخەوە.»

ئالیووشا لەسەرەخۆ گوتی: «نازانم چیمکردووە... ئەگەر پێت خۆش بێ، سێ خولەک یان پێنج خولەکی دیکەش لێرە دەبم.»

ـ تۆ بڵێ تەنانەت پێنج چرکەش! دایە زووکە بیبە دەرێ، ئەوە ڕمووزنە، ڕمووزن.

ـ لیزا، تۆ شێت بووی. ئالکسی فیۆدۆرۆویچ وەرە با بڕۆین، ئەمڕۆ حاڵەتەکەی کشمیشییە. دەترسم ڕقم لێی هەستێ و بە گژیدا بچم. ئاخ لە دەست کچی شێتووکە، پیاو تووشی چ چەرمەسەرییەک دەکات! دوای دیتنی ئێوە ڕەنگە بتوانێ بخەوێ. زۆر زوو خەواڵووت کرد، زۆر کارێکی باشت کرد هاتی بۆ ئێرە.

ـ ئەیەڕۆ دایە، قسەکانت چەندە لەبەردڵانە. دایەگیان دەبێ لەبەر ئەو قسە شیرینە ماچت بکەم.

مادام خۆخلاکۆف گوتی: «لیزا گیان، منیش ماچتدەکەم.» پاشان بە حاڵەتێکی ڕازاوی و زۆر لەخۆڕازی، بە سرتەیەکی توند گوتی: «گوێبگرە، ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، نامەوێ پێشنیازی هیچت پێبکەم و نامەوێ بۆت لە بنی کوولەکەکە بدەم، خۆت پاشان تێدەگەی چ دەبێ. پیاو کاس‌ووڕ دەبێ. پێکەنینیترین شێوەی مەڵحەکەیە، کاترینا ئیوانا، ئیوان فیۆدۆرۆویچی براتی خۆش دەوێ. زۆریش هەوڵدەدا وا بنوێنێ کە دیمیتری فیۆدۆرۆویچی خۆش دەوێ. پیاو کاس‌ووڕ دەبێ! لەگەڵ تۆ دێم، ئەگەر دەرم نەکەن هەتا کۆتایی دانیشتنەکەتان لەوێ دەبم.»

# (٥)

## سۆزی دڵ لە ژووری میوانداری

بەڵام لە ژووری میوانداری، مشتومڕ و چەلەحانێ کۆتاییی پێهاتبوو. کاترینا ئیوانا ئەگەرچی ڕواڵەتێکی جیددیی پێوە دیار بوو، بەجارێ تووشی سەرسامی بووبوو. هەر لەو کاتەدا کە ئالیووشا ومادام خۆخلاکۆف وەژوور کەوتن، ئیوان فیۆدۆرۆویچ هەستایە سەرپێ بڕوات. ڕەنگی پەڕیبوو. ئالیووشا بە نیگەرانییەوە تێیڕوانی. لەو کاتەدا دەبوو شک و گومان وەلانێ چونکە ئەو مەتەڵە ئازاراوییەی هەڵێنابوو کە لەمێژ بوو عەجمانی لێهەڵگرتبوو. لە ماوەی مانگی ڕابردوودا چەن جاریان بە گوێ هەڵهێنابوو کە ئیوانی برای دڵی بە کاترینـاوەیـە و دەیهـەوێ لـە چنگـی میتیـای دەرهێنـێ. هـەتـا ئـەم دواییيانـەش لەگەڵ ئەوەی ئالیووشای لەڕادەبەدەر ئازاردەدا، بەڵام هەرچی سـەری دێنا و دەبرد نەیدەتوانی بڕوا بکا. هـەردوو براکـەی خۆشـدەویسـت و ئـەو کـەڵـەوە کێشییەی نێوانیان تووشی دڵەخورپەی کردبوو. لـەو سـەروبـەنـدەدا، دیمیتری فیۆدۆرۆویچ ڕۆژی پێشوو گوتبووی زۆرم پێخۆشە ئیوانی برام بۆتە ڕەقیبم. ئـەوەش زۆرم یارمـەتـی دەدا. یارمـەتییـەکـەشـی چـیبـوو؟ تـاکوو لـەگـەڵ گرووشنکا زەماوەند بکا. بـەڵام ئەوە بۆ ئالیووشـا زۆر تـاڵ و نـاخۆش بـوو، جگە لەوەش، ئالیووشا هەتا دوێنێشەو بە نهێنی لەو بڕوایەدا بوو کە کاترینا ئیوانا ڕۆح و گیانی لەلای دیمیترییە. هەروەها پێیوابوو کە کاترینا ئیوانا لەوە کەم جیکەڵدانەترە بتوانێ ئاشقی کوڕێکی وەک ئیوان بێ، لـە ڕاسـتیدا ئاشقی دیمیترییە و ئەگەرچی خۆشەویستییەکی سەیر و سەمەرە بوو، بەڵام بە گیان

و بە دڵ خۆشی دەویست و ئەوی بە هەموو ئاکار و خووخدەکانییەوە خۆش دەویست.

بەڵام لە دوای ئەو دیدارەی دوێنێ لەگەڵ گرووشنکا، بیر و خەیاڵێکی دیکە لەسەری‌دا بوو. وشەی «جەرگبڕ» کە چەن سات لەمەوبەر بە زاری مادام خۆخلاکۆفدا هاتبوو، هەتا ڕادەیەک تووشی ڕاچڵەکانی کردبوو. چونکە ئەو شەوە لە کەڕەی بەیانیدا بە دەم خەوەوە هاواری کردبوو: «جەرگبڕ، جەرگبڕ، « کە وێدەچوو لە خەونەکانیشیدا ڕەنگی دابێتەوە. ئەو شەوە هەتا بەیانی ڕووداوی ڕۆژی پێشووی ماڵی کاترینا ئیوانا هاتبووە خەونی و ئێستاش درکاندنی ڕاستەوخۆ و پێداگرانەی مادام خۆخلاکۆف، کە کاترینا ئیوانا ئەویندای ئیوانە، ئەویش وەکو خۆنواندن و ترۆتۆپ، لە ڕووی دڵسۆزییەوە خۆی گێل دەکات و سەبارەت بە ئەرکی هەقناسی وا دەنوێنێ کە دیمیتریی خۆشدەوێ، بەهۆی ئەوەوە لە ناخەوە خۆی دەخواتەوە، ئەو قسانە شوێنی لە سەر ئالیووشا دانا و لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەرێ، ڕەنگە هەموو هەقیقەتەکە لەو وشانەدا شاردرابێتەوە.» بەڵام لەو کاتەدا ئیوان چ حاڵێکی دەبوو؟ ئالیووشا لەڕووی غەریزەوە هەستی بەوە دەکرد کە مرۆڤێکی وەک کاترینا ئیوانا خووخدەیەکی دەسەڵاتخوازانەی هەیە و تەنیا دەتوانێ کەسێکی وەک دیمیتری بێنێتە ژێر ڕکێفی خۆی، نەک کەسێکی وەک ئیوان. چونکە دوور نەبوو دیمیتری «بۆ بەختەوەربوون» ئاخری تەسلیمی دەسەڵاتخوازیی ئەوبێ، (ئالیووشاش لە دڵەوە ئەوەی پێخۆش بوو) بەڵام ئیوان وانەبوو، ئەو قەت خۆی بە دەستەوە نەدەدا، ئەو خۆبەدەستەوە دانەش بۆ ئەو مایەی بەختەوەری نەبوو. بیروڕای ئالیووشا سەبارەت بە ئێوان هەر ئەوە بوو. ئێستاکە پێی‌نایە ژووری میوانداری، هەموو ئەو گومان و ئەندێشانە لە پانتای زەینی دەرپەڕین. گومان و خەیاڵێکی دیکە خۆی بەسەردا سەپاند: «ئەگەر لەگەڵ هیچکامیان ـ نە ئیوان و نە دیمیتری ـ زەماوەند نەکا چی؟»

ئەوەشمان لەبیر نەچێ ئالیووشا خۆی سەرکۆنە دەکرد و شەرمەزار بوو لەوەی کە لە ماوەی مانگی ڕابردوودا ئاوای بیر کردبۆوە. دوای ئەو گومان و

دڕدۆنگییانه به لۆمەوه له دڵی خۆیدا گوتی: «له ئەوین و ژنان تێناگەم و چۆن دەتوانم سەبارەت بەو پەرسڤانه بڕیار بدەم؟» لەگەڵ ئەوەشدا نەیدەتوانی گوێی پێنەدات و بیری لێنەکاتەوه. هەر بە شێوەی غەریزی هەستیکردبوو کە ئەو ڕقەبەرایەتییەی نێوان براکانی گرنگییەکی بەرچاوه و پێوەندیی بە زۆر شتیانەوه هەیه.

ئیوانی برای ڕۆژی پێشوو، بە ڕقەوە باسی باوکی و دیمیتریی کردبوو، گوتبووی: «هەژدیهایەک، هەژدیهایەکی دیکه هەڵدەلووشێ.» لەبەر ئەوه بوو ئیوان، دیمیتریی برای وەک هەژدیها دەهاتە بەرچاو، ڕەنگە زۆر لەمەوبەریش هەروای دیبێ. ڕەنگە لە کاتی ئاشنا بوون لەگەڵ کاترینا ئیواناوه ئەوەی بە خەیاڵدا هاتبێ؟ ئەو قسەیەش، هەڵبەت، دوێنێ لە دەمی ئیوان دەرپەڕیبوو، هەر ئەوەش بووبووه هۆی ئەوەی گرێنگایەتیی زیاتری پێبدا. ئەگەر ئەو هەستەشی بووبووایە ئیتر ئاراوقارای لێهەڵدەگیرا و هێمنایەتیش لە ماڵەکەدا نەدەما و لەوانەیە قین و دوژمنایەتی لە بنەماڵەکەیاندا ڕیشەی داکوتێ. لەو نێوانەدا ئالیووشا دەبوو لایەنگری لە کاملایان بکا؟ هەروەها دەبوو بۆ هەرکامیان داوای چی لە خودا بکا؟ هەر دووکیانی خۆش دەویست، بەڵام! لەو نێوانه ئاڵۆز و پڕکێشەیەدا چ ئاواتێکی لەخودا بۆ دەخواستن؟ لەوانەبوو لەو تەنگژه و تاریکییەدا سەری لێبشێوێ و ئالیووشا نەیدەتوانی بێباوەڕی تامڵ بکا، چونکە مرۆڤێکی دڵۆڤان و بەڕەحم بوو. نەیدەتوانی خۆی لە خۆشەویستی ببوێرێ. ئەگەر کەسێکی خۆش بویستبایە، بەبێ ماتڵ بوون و خاوەخاو کردن دەچوو بۆ یارمەتیدانی. بۆ بەڕێوەبردنی ئەو کارەش دەبوو بزانێ چ ئامانجێکی هەیه و دەبوو بۆی ڕوون بووایەتەوه هەق بە کامیانه و کامیان لە پێشتره، کەوایه دوای ئەو دڵنیابوونه بۆ ئەو سروشتی بوو کە یارمەتیی هەر دووکیان بدا. بەڵام بەجێی ئامانجێکی دیاریکراو لە هەموو لایەکەوه هەستی بە شێواوی و بێباوەڕی دەکرد. هەروا کە ساتێ لەمەوبەر گوتبووی، «جەرگبڕ بوو» خۆ ئەو «دڵسۆزییەش» وا نەبوو کە بتوانێ

سەرەندەری لێبکا. لەو شێواوی و ئاڵۆزییە پڕ لە سەرسامییەدا هیچ وشەیەکی بۆ نەدەچۆوە سەریەک.

کاترینا ئیوانا، لەگەڵ ئەوەی چاوی بە ئالیووشا کەوت، زۆر بە تاڵووکە و ڕووخۆشییەوە ڕووی لە ئیوان فیۆدۆرۆویچ کرد کە هەستابوو بڕوا، گوتی: «دەقیقەیەک، دەقیقەیەکی دیکە ڕاوەستە، جاریێ مەڕۆ! دەمهەویێ بیروڕای ئەو پیاوەم بۆ دەرکەویێ، کە زۆرم بڕوا پێیەتی.» پاشان ڕووی لە مادام خۆخلاکۆف کرد و گوتی: «تۆش مەڕۆ.» ئالیووشای لەپاڵ خۆی دانیشاند، مادام خۆخلاکۆفیش لە پەنا ئیوان فیۆدۆرۆویچ بەرەوڕووی دانیشت.

کاترینا ئیوانا، لە کاتێکدا فرمێسک لە چاویدا قەتیس مابوو و دەنگی دەلەرزی، بە گوڕ و تینێکەوە گوتی: «خۆشەویستەکانم، لەم دنیایەدا لە ئێوە زیاتر کەسم نییە، « هەر لەو کاتەدا ئالیووشا لە دڵەوە بەزەییی پێیدا هات. «ئالکسی فیۆدۆرۆویچ! تۆ دوێنیێ شایەدی ئەو دیمەنە پڕ شوورەییە بووی و دیتت چۆن تێکچووم. ئیوان فیۆدۆرۆویچ تۆ نەتدی، ئەو دیتی. نازانم دوێنیێ سەبارەت بە من چۆنی بیر کردەوە، بەڵام شتێک دەزانم، ئەویش ئەوەیە ئەگەر ئەو دیمەنە ئەمڕۆ دووپات بووبوایەتەوە، دیسان ئەو هەست و سۆزەی دوێنێم دەردەبڕی - ئەو هەست و سۆزە، ئەو وشانە، ئەو هەڵسووکەوتە. ئالکسی فیۆدۆرۆویچ کردەوەکەمت لەبیرە؟ لە بیرتە پێشت بە یەکیان گرت؟...» (لەگەڵ دەربڕینی ئەو وشەیە سوور هەڵگەڕا و چاوی پڕ بوو لە ئاو). «دەبیێ پێت بڵێم ناتوانم بە سەریدا زاڵ بم. گوێ بگرە ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، نازانم هەنووکە «ئەوم خۆشدەویێ یان نا. بەزەییم پێیدا هات، ئەوەش نیشانەی سارد و سڕیی خۆشەویستییە. ئەگەر خۆشمویستبایە، ئەگەر هێشتا خۆشمویستبایە، ڕەنگبوو ئێستا بۆی بەداخەوە نەبم، بەڵکو ڕقیشی لیێهەڵگرم.

دەنگی دەلەرزی و فرمێسک لە چاویدا قەتیس مابوو. ئالیووشا لە ناخەوە جینگڵی دەدا و دەلەرزی. لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەو کچە ڕاستوێژ و یەکڕەنگە و ئیتر دڵی بۆ دیمیتری لیێنادا و خۆشی ناویێ.»

مادام خۆخلاکۆف بە دەنگێکی بەرز گوڕاندی: «ڕاست وایە، ڕاست وایە.»
ـ کاترینا ئاسپینای خۆشەویست، سەبرکە، بڕیاری سەرەکی و کۆتاییم، کە لە ماوەی شەوی ڕابردوودا داوە، بۆتانی باسدەکەم، هەستدەکەم بڕیارەکەم بڕیارێکی دژوار بێ، بەڵام دەزانم هیچ شتێک ناتوانێ پاشگەزم بکاتەوە ـ هیچ شتێک. هەتا کۆتاییی تەمەنیشم هەروا دەبم. تەگبیرکاری خۆشەویست و دڵۆڤان و هەمیشە وەفادار و جوامێرم، کە جگە لە ئەو لەم دنیایەدا دۆستێکی دیکەم نییە، یانی ئیوان فیۆدۆرۆویچ، بڕیارەکەمی بەدڵە و ئافەرینم پێدەڵێ، ئەویش بەو ڕوانینە قووڵ و دڵە گەشبینەیەوە. لەوە ئاگادارە.
ئیوان فیۆدۆرۆویچ، بە دەنگێکی نزم بەڵام قورس و پیاوانە گوتی: «ئەرێ بەدڵمە.»
«بەڵام پێمخۆشە ئالیووشاش (ئاخ! ببوورە ئالکسی فیۆدۆرۆویچ کە بە ئالیووشا ناوم هێنای)، حەز دەکەم ئالکسی فیۆدۆرۆویچ لەلای ئەو دوو هاوڕێیەم پێمبڵێ بڕیارەکەم بەجێیە یان نا. بە شێوەی غەریزی هەستدەکەم کە تۆ ئالیووشا، برای بەڕێزم (چونکە تۆ برایەکی زۆر خۆشەویستی بۆ من)، « ئەوەشی کاتێک دەربڕی کە دەستی ساردوسڕی ئالیووشای بە دەستە گەرموگوڕەکەی گرتبوو و دەتگوت ئێستا نا ئێستا لە خۆشیانا شاگەشکە دەبێ. «پێشبینیی دەکەم کە بڕیاری تۆ و پەسند کردنی تۆ، هاوکات لەگەڵ تەواوی ئازارەکانم، هێمنایەتیم بۆ پێکدێنێ. چونکە دوای قسەکانی تۆ ئۆقرە دەگرم و سەر لە پێناوت دەنێم ئەوەش بەگیان و دڵ هەستپێدەکەم.»
ئالیووشا سوور هەڵگەڕا و گوتی: نازانم چیت لە من دەوێ، هەر ئەوەندە دەزانم خۆشم دەوێی و لەم کاتەدا زیاتر لە بەختەوەریی خۆم ئاواتەخوازی بەختەوەریی تۆم!... بەڵام سەبارەت بەو کارانە هیچی لێنازانم.» شتێک ناچاری کرد ئەو وتەیە زۆر بە تاڵووکەوە دەرببڕێ.
«لە وەها کارێکدا، ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، لە وەها کارێکدا، ئەوەی گرینگە شەرەف و ئەرکە و شتێکی بەرزتریش ـ نازانم چی ـ بەڵام ڕەنگە لەو ئەرکەش بەرزتر و پیرۆزتر بێ. لەم هەستە قوڵپدەرەی ناخیشم کە بە

شێوەیەکی خۆڕاگرانە ناچارم دەکا، ئاگادارم، بەڵام دەکرێ بە دوو وشە سەروبەری پێکبێنی.» لە سەرخۆ گوتی: «بڕیارم داوە ئەگەر تەنانەت لەگەڵ ئەو ـ دەعبایەش کە قەتقەت لێی نابوورم، زەماوەند بکا، تەنانەت ئەو کاتەش پشتی بەر نادەم و هەر خۆشم دەوێ.» بە هەڵچوونێکی گەشکەئاسا و ئازاراوییەوە گوڕاندی: «لەمە بەدواوە قەت، قەتقەت پشتی بەر نادەم، نەک ئەوەی بەردەوام بە دوایەوە بم و وەک ملۆزم ڕێی پێبگرم و ئازارییبدەم. ئاخ، نا! دەچم بۆ شارێکی دیکە، ـ ئەو شوێنەی دڵی لێخۆشە ـ بەڵام هەتا کۆتایی تەمەنم ئاگاداریی لێدەکەم ـ هەتا کۆتایی تەمەنم بەردەوام ئاگاداریی لێدەکەم. هەر کاتێکیش لەگەڵ ئەو ژنە هەستی بە بەختەوەری نەکرد، کە ئەوە دوو بەختەکییە، قەیناکا با بگەڕێتەوە بۆلای خۆم، ئەو کاتە منی خۆش دەوێ و دەزانێ هەر من بەکاری دێم، وەک خوشکی خۆی... یان هتد ـ ئەویش بۆ هەتا هەتا ـ بەڵام لانیکەم فێر دەبێ کە ئەو خوشکەی بەڕاستی خوشکییەتی، خوشکێک کە خۆشی دەوێ و ژیانی خۆی لە پێناوی ئەودا فیدا کردووە، بۆ هەمیشە خۆشی دەوێ. ئەو کاتەیە منیش بە ئامانجەکەم دەگەم.» بە شێوەیەکی شێتانە دەنگی هەڵێنا: «لەسەر ئەوە پێداگری دەکەم کە من بناسێ و بە مەحرەمی نهێنییەکانی خۆیم بزانێ. بۆی دەبمە خودایەک کە سووجدەم بۆ بەرێ. ئەمەش لانیکەم بەهۆی خەیانەتەکەیەوە و بەهۆی ئازارێکەوە کە پێی داوم، خۆی بە منەتبارم دەزانێ و لێیگەڕێ با بزانێ هەتا ئاخری تەمەنم بۆ ئەو و بەڵێنییەک کە پێمداوە، وەفادار دەمێنم. چونکە خۆی بێوەفا بووە و خەیانەتی پێکردووم. من شتێک نا ـ نابم جگە لە ئامرازێک و هۆیەک بۆ بەختەوەریی ئەو یان چۆن بڵێم؟ ـ کەرەسەیەک، مەکینەیەک بۆ گەیشتن بە بەختەوەری، ئەویش هەتا کۆتایی تەمەنم، هەتا کۆتایی تەمەنم، ئەویش وێدەچێ لە ماوەی تەمەنیدا لەوە ئاگادار بێ! بڕیارم ئەمەیە. لێشم ڕوونە ئیوان فیۆدۆرۆویچ هەمووی بەلاوە پەسندە.»

هەناسەی سوار بووبوو. ڕەنگە ویستبێتی ئەندێشەی خۆی بە قورساخی و هونەر و سروشتی بوونێکی زیاترەوە دەربڕێ. بەڵام قسەکەی زۆر تووڕە

و خێرا بوو، لێوڕێژ بوو لە هەست و سۆزی لاوێتی، ئەوەشی ئاشکرا کرد کە هەروا لە ناخەوە ئازار دەکێشێ و شەرم و شوورەییی دوێنێی لەبیر ناچێتەوە و زۆر لەخۆباییانە تامەزرۆی ڕەزامەندییە. خۆی ئەوەی باش دەزانی. لەپڕ ڕەنگی ڕەش داگەڕا و گرژ بوو: ئالیووشا هەر لەڕێوە تێگەیشت و ڕمی هاودڵی لە جەرگی چەقی. ئیوانی برای کاتێک کارەکەی خراپتر کرد کە بە چەکمەوە پەڕییە نێو قسەکان و گوتی:

ـ من تەنیا بیروڕای خۆم دەربڕیوە. ئەگەر ئەو قسانە کەسێکی دیکە بیکردایە، بەهەڵچوون و وەسواسیان دەزانی، بەڵام چونکە تۆ گوتووتە جیاوازە. هەر ژنێکی دیکە ئەو قسەیەی بکردایە تاوان بوو، بەڵام تۆ ڕاست دەکەی. نازانم بڵێم چی، بەڵام دەزانم تۆ بەڕاستی سادقی و کەوایە ڕاست دەکەی.

«بەڵام ئەوە تەنیا پێوەندیی بەم کاتەوە هەیە و ئەم کاتەش ڕەمزی چییە؟ هیچ شتێک نییە جگە لە سووکایەتیی دوێنێ.» مادام خۆخلاکۆف نەیدەویست خۆیان تێهەڵقوتێنێ، بەڵام نەیتوانی واز لەو پێشنیارە بە ئینسافانەیەش بێنێ و هیچ نەڵێ.

ئیوان دیاربوو لەوە دڵی شلوێ بووە کە قسەکەیان پێبڕیوە، بەڵام بە تامەزرۆییەکی تایبەتەوە گوتی: «دڵنیام وایە. ئەم کاتەش بۆ هەرکەسێک پێوەندیی بە بۆچوونی دوێنێیەوە هەیە و تەنیا چرکەیەکیش دەخاێنێ. بەڵام بەهۆی خووخدەی تایبەتی کاترینا ئیواناوە، ئەو چرکەیە هەتا کۆتایی تەمەنی بەردەوام دەبوو. ئەوەی بۆ کەسانی دیکە تەنیا بەڵێنییەکە و بەس، بۆ ئەو ئەرکێکی هەتاهەتایی و دژوار و ڕەنگە پڕ پەژارە بێ، بەڵام بەبێ ئەشکەنجە و ئازار. ئەویش بە هەستکردن بە ئەم ئەرکە وەدی هاتووە و زیندوو دەمێنێ و هەست بە بوونی خۆی دەکا. کاترینا ئیوانا، ژیانت لەمەبەدواوە پڕ لە بیرکردنەوەی ژاناوی سەبارەت بە ڕەحم و دلۆڤانی و قارەمانی و ئازارەکانت دەبێ، بەڵام لە کۆتاییدا، باری ئەو ئازارە لە سەر شانت سووکدەبێ و لە خەیاڵ و بیری شیریندا ئەو تەرحە جەسوورانە و پڕلەخۆبایی بوونە وەڕاست

دەگەڕێ و خۆ دەنوێنێ. ئەرێ، هەر بەڕاستی پڕ لە غرووورە و هەر چۆنێک بێ جەسوورانەیە، بەڵام بۆ تۆ سەرکەوتنە. هێندێ جاریش بە تێگەیشتن لەو ئاکامە سەرچاوەی شادمانی کامڵ دەبێ و دەبێتە هۆی ئەوەی لەبەر دەرگانەی تەسلیم بووندا ملکەچ ڕاوەستی.»

ئەم وتەیە بەبێ هیچ دڕدۆنگییەک و لە ڕووی چەشنێک ڕەشبینییەوە بە دەمیدا هات و دیاربوو بە ئانقەست ئەو قسەیەی کردووە؛ یان لەوانەیە هەر نەیویستبێ بیشارێتەوە و بە ئانقەست قسەدەکا.

مادام خۆخلاکۆف دیسان گوڕاندی: «زۆر چاک بە هەڵە چووی گیانە!»

کاترینا ئیوانا بە دەنگێکی بەرز گوتی: «ئالکسی فیۆدۆرۆویچ تۆ شتێک بڵێ. بە دڵ و گیان حەز دەکەم بزانم تۆ دەڵێی چی!» لەگەڵ ئەوەدا دای لە پڕمەی گریان. ئالیووشا لە سەر کورسیلەکە هەستا.

کاترینا ئیوانا بە گریانەوە درێژەی بە قسەکانی دا: «هیچ نییە، گرینگ نییە! ڕقم هەستاوە، دوێشەو خەو نەچۆتە چاوم. بەڵام لەلای دوو هاوڕێی وەکو تۆ و کاکت هێشتا هەست بە هێز و توانا دەکەم، چونکە دەزانم ئێوە هیچ کامێکتان وازم لێناهێنن و دەزانم دڵتان نایە.»

ئیوان فیۆدۆرۆویچ هەڵیدایە: «بۆ بەدبەختی ناچارم بگەڕێمەوە بۆ مۆسکۆ ـ ڕەنگە سبەینێ ـ بۆ ماوەیەکی زۆریش بەجێت دەهێڵم. نیوچاوەکەم وای هێناوە هیچ چارەیەکی دیکەم نییە و دەبێ بڕۆم.»

«سبەینێ دەچی بۆ مۆسکۆ؟!» کاترینا ئیوانا ڕەنگێکی هێناوبرد. بە دەنگێکی تووڕە و گریاناوی گوڕاندی: «بەڵام ـ بەڵام، خودایەگیان، زۆر زۆریشم پێخۆشە.» کتوپڕ وا گەشایەوە دەتگوت هەر نەشگریاوە. ئەو گۆڕانە لە ناکاوەشی ئالیووشای تووشی سەرسووڕمان کرد. لەجیاتی کچێکی بێچارە و سووکایەتی پێکراو کە لە ناخی دڵەوە دەگریا، ژنێکی دی بە تەواوی بە سەر نەفسی خۆیدا زاڵبوو و تەنانەت زۆریش دڵشاد، دەتگوت لەو کاتەدا ڕووداوێکی زۆر خۆش قەوماوە.

بە بزەیەکی شیرین و دڵڕفێنەوە لە ناکاو وتەکەی خۆی ڕاستکردەوە: «ئاخ، بۆ من نابێتە هۆی بەختەوەری لەکیسدانی تۆ، دیارە خۆ دۆستێکی وەک تۆ نابێ وا بیر بکاتەوە. بە پێچەوانە زۆریش خەمبارم کە تۆی خۆشەویست لێم دوور دەکەوییەوە.» بێئیختیار ڕۆیی بۆلای ئیوان فیۆدۆرۆویچ و هەردوو دەستی گرت و گوشیی. «بەڵام ئەوە بۆ من دەبێتە هۆی شادی و بەختەوەری کە تۆ لە مۆسکۆ دەتوانی پووریّ گیانم و ئاگاتای خوشکم ببینی و باسی ئەم بارودۆخە پڕ لە خەم و دڵەخورپەیەمیان بۆ بگێڕیتەوە. دەتوانی زۆر بێپەردە و بە دڵی خۆت لەگەڵ ئاگاتا بدوێی، بەڵام کارت بە سەر پوورمەوە نەبێ. خۆ دەزانی چۆنیش ئەو کارە بکەی. ناتوانی بیهێنییە بەرچاوت کە دوێنێ و ئەمڕۆ بەیانی چ ئازارێکم چێشتووە و لە ناخەوە کوڵیوم، لە دڵی خۆمدا دەمگوت چۆن ئەو نامە ترسناکەی بۆ بنووسم ـ چونکە پیاو ناتوانێ ئەو شتانە لە نامەدا بێنێ... ئێستا نووسینی نامەکەم بۆ ئاسان دەبێتەوە، چونکە دەیانبینی و هەموو شتێکیان بۆ باسدەکەی. ئاخ چەندە دڵشادم! هەر لەبەر ئەو مەبەستەش دڵشادم، بڕۆام پێبکە. هەڵبەت، هیچکەس ناتوانێ جێی تۆم بۆ پڕکاتەوە...» لە ناکاو وتەکەی ئاوا کۆتایی پێهێنا: «هەر ئێستا دەچم نامەکە دەنووسم، « هەنگاوی هەڵێنایەوە بۆ ئەوەی لە ژوورەکە بڕواتە دەرێ.

مادام خۆخلاکۆف گوڕاندی: «ئەی ئالیووشا؟ ئالکسی فیۆدۆرۆویچ و بیروڕاکەی، کە ئەو هەمووە تامەزرۆی بیستنی بووی؟» دەنگی جۆرێک تەشەر و تووڕەییی پێوە دیاربوو.

کاترینا ئیوانا لەپڕ لەجێی خۆی ڕاوەستا و هاواری کرد: «لەبیرم چووبۆوە.» بە لەبزێکی تاڵ و پڕ توانجەوە درێژەی پێدا: «کاترینا ئاسپینا، بۆ لەم ساتە وەختەدا ئەوەندە قەڵس و جاڕزی؟ ئەوەی گوتم دووپاتی دەکەمەوە. دەبێ بیروڕای ببیستم. جگە لەوە دەبێ بڕیارەکەشیم بۆ ڕوون بێتەوە! هەرچی بڵێ، هەر ئەوە دەبێ. ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، دیوتە چەندە تامەزرۆی بیستنی وتەکانتم... بەڵام چ بووە؟»

ئالیووشا لە ناکاو بە شڵەژاوی گوڕاندی: «بڕوام نەدەکرد. سەرم لێی دەرناچێ!»

- چی؟ چی؟

- ئەو دەیەوێ بچێ بۆ مۆسکۆ، تۆش لە خۆشیانا وەک کەو دەقاسپێنی. ئەویش بە ئانقەست! وادەنوێنی کە خۆشحاڵییەکەت لەبەر ئەوە نییە و بەداخەوەی کە - دۆستێکت لە کیس دەچێ. بەڵام ئەوەش گەمە بوو - خەریک بووی دەوورت دەگێڕا - وەک ئەوەی لە سەر شانۆ بی.

کاترینا ئیوانا، بە سەرسووڕمانەوە، سوور بووبۆوە و ناوچاوانی تێکنابوو، بە تووڕەیی پرسیی: «لەسەر شانۆ؟ چی؟ مەبەستت چییە؟»

ئالیووشا بە پشووسواری گوتی: «ئەگەرچی خاترجەمی دەکەی کە بۆ لەکیسدانی ئەو بەداخەوەی، لە سەر ئەوەش پێداگری دەکەی کە بەرەوڕوو پێیبڵێی ڕۆیشتنی ئەو دەبێتە هۆی بەختەوەریت.» لەپاڵ مێزەکەدا ڕاوەستا بوو و دانەنیشت.

- باسی چی‌دەکەی؟ تێ‌ناگەم.

ئالیووشا هەر بەو دەنگە لەرزۆک و پس‌پسەوە درێژەی پێدا: «خۆشم تێی‌ناگەم... کتوپڕ بەزەینمدا هات...دەزانم ئەوە بەجوانی دەرنابڕم، بەڵام هەرچۆنێک بێ هەر دەیڵێم. ئەوەی بە زەینمدا دێ ئەوەیە کە تۆ دیمیتریی برامت خۆش ناوێ... هەر لە سەرەتاوە خۆشت نەویستووە..... دیمیتریش ڕەنگە قەتی تۆ خۆش نەویستبێ.... هەر ئەوەندەشت ڕێز بۆ دادەنێ... لەڕاستیدا نازانم چۆن ئیزن بەخۆم دەدەم کە ئەو قسەیە بکەم، بەڵام دەبێ کەسێک ئەو ڕاستییە ئاشکرا بکات... چونکە لێرە هیچکەس نییە دان بە ڕاستییەکاندا بنێ.»

کاترینا ئیوانا کە بە ئاشکرا تووڕەیی و شڵەژان بە دنگییەوە دیاربوو، گوڕاندی: «کام ڕاستی؟»

ئالیووشا بەپەلە و لەبزێکی هیوابڕاوانەوە، وەک ئەوەی بیهەوێ لە سەربانێکەوە خۆی فڕێدات، درێژەی پێدا: «پێتدەڵێم. خێرا دیمیتری بانگ بکە

بابیَ ـ خۆم دەیهێنم ـ پێیبڵێ بیَ بۆ ئێرە و دەستی تۆ و ئیوانی برام بگریَ، دەستتان بداتە دەستی یەکتر. چونکە تۆ دەتهەویَ ئیوان ئازار بدەی، لەبەر ئەوەی لەڕووی ڕەحم و بەزەییەوە دیمیتریت خۆشدەویَ ـ بە عەشقێکی درۆیینەوە ـ هەر لەبەر ئەوەی بەخۆتت سەلماندووە.»

ئالیووشا ورتەی لێبڕا و بێدەنگ بوو.

کاترینا ئیوانا هەڵیدایە: «تۆ.... تۆ.... تۆ ئیماندارێکی ئەقڵسووکی و لە هیچ ناگەی!»

ڕەنگی وەک هومایی سپی هەڵگەڕابوو و لەداخانا لێوی دەلەرزی. ئیوان فیۆدۆرۆویچ لە ناکاو قاقای کێشا و هەستا سەرپیَ، کڵاوەکەی بە دەستەوە گرتبوو.

جۆرێک ڕەنگی تێکچوو کە ئالیووشا لە عومراتی خۆی وای نەدیتبوو ـ حاڵەتێک کە سەداقەت و گەنجییەتی و هەستێکی بەهێز و ئاشکرای پێوە دیاربوو ـ گوتی: «ئالیووشای خۆشەویست، تۆ بەهەڵە چووی. کاترینا ئیوانا تۆزقاڵێکیشی خۆشەویستی من لە دڵدا نەبووە! لەوەش گەیشتووە کە خۆشم دەویَ ـ ئەگەرچی سەبارەت بە خۆشەویستییەکەی قەت لەلای خۆی زمانم نەگەڕاوە ـ ئەوەشی دەزانی بەڵام قەت خۆشەویستی خۆی دەرهەق بە من دەرنەبڕی. خۆ منیش قەتم ئەشقێتی لەگەڵ نەکردووە و دۆستی نەبووم، بۆ چرکەیەکیش ئاشقی نەبووم؛ چونکە هێندە لووتبەرز و لەخۆباییە پێویستی بە خۆشەویستی و ئەوین نییە. منی وەک کەرەسەی تۆڵە کردنەوە، لەلای خۆی ڕاگرتووە. تۆڵەی تەواوی ئەو سووکایەتییانەی لەسەرەتاوە بەردەوام دیمیتری پێیکردووە، دەیهەویَ بە هۆی خۆمەوە لە خۆمی بکاتەوە. چونکە بە ئاشکرا دیارە تەنانەت هەر لە یەکەم کاتی ئاشنایەتیمانەوە دڵێکی ناپاکی هەبووە و دایم لەبیری سووکایەتی کردندا بووە ـ ئەریَ ئەو دڵێکی ئاوای هەیە! لەگەڵ من جگە لە ئەشقی ئەو باسی هیچ شتێکی دیکەی نەکردووە. من ئەوە دەڕۆم؛ بەڵام کاترینا ئیوانا لێم ڕوونە تۆ تەنیا ئەوت خۆش دەویَ. هەرچەندەش زیاترت سووکایەتی پێبکا، تۆ زیاترت خۆشدەویَ. ـ «سۆزی

دڵ»ی تۆش ئەوەیە. ئەوت ئەو جۆرەی کە هەیە بەلاوە شیرینە و دیارە ئەو ئاکارەشت پێ‌جوانە، بۆیە خۆشتدەوێ چونکە سووکایەتیت پێدەکا. ئەگەر ملکەچ و گوێڕایەڵت بووایە، دڵنیام خێرا لێی‌جیا دەبوویەوە و خۆشەویستیی ئەوت لە دڵدا لە ڕیشەوە هەڵدەکەند. بەڵام پێویستیت پێیەتی. دەتهەوێ بەهۆی ئەوەوە لە سەر وەفای خۆت پێداگری بکەی و ئەویش بەهۆی بێ‌وەفاییەکەیەوە بدەیە بەر لۆمە و لەتەر. هەمووشی خەتای لەخۆبایی بوونتە. ئەشقی تۆ پڕاوپڕە لە سووک و چرووکی و هەمووشی لە غروورەوە سەرچاوە دەگرێ.... من زۆر لاوم و لەڕادەبەدەر خۆشەویستیی خۆم دەرهەق بە تۆ دەربڕیوە. دەزانم نابێ باسی ئەوە بکەم، پێموایە ئەگەر لێت جیا ببمەوە زۆر کارێکی شیاوم کردووە و جێگای ڕێزیشە و لەوانەیە تۆش زۆری پێ دڵمەند نەبی. بەڵام بەرەو دوورە وڵات مل پێوەدەنێم و ئیتر قەت ناگەڕێمەوە... هەتا هەتا. نامەوێ هاونشینی ئەم «سۆزی دڵ»ە بم... بەڵام ئیترنازانم چۆن بدوێم، هەموو شتێکم گوتووە... خوداحافیز، کاترینا ئیوانا؛ نابێ لێم قەڵس بی، چونکە من لەبەر چاو لەچاو هاتنی تۆش بێ دەڕۆم. چونکە زۆر لە تۆ زیاتر تەمبێ بووم و تالاوم بە گەروودا کراوە. خوداحافیز! تۆقەت لەگەڵ ناکەم. هێندەت بە ئانقەست ئازار داوم، لەم کاتەدا ناتوانم لێت ببوورم. دواتر ڕەنگە لێت خۆش بم، بەڵام ئێستا تۆقەت لەگەڵ ناکەم.» پاشان بە بزەیەکی بەزۆرییەوە گوتی: «Den Danke، Dame، begehr ich nicht"[4] و بە شێوەیەکی سەخت و چاوەڕوان نەکراو واینواند کە ئەویش لەگەڵ بەرهەمی شیلەر ئاشنایە و ئەو ئاشنایەتییەش بەڕادەیەکە، کە لەبەر دەیخوێنێتەوە ـ بەڵام ئالیووشا بە هیچ شێوەیەک بڕوای نەدەکرد. لە ژوورەکە چووە دەرێ، بێ‌ئەوەی خوداحافیزی لە خانەخوێکەی واتە مادام خۆخلاکۆف بکا. ئالیووشا دەستی لێک هەڵپێکا و بەپەلە و هیوابڕاوانە هەرای لێکرد: «ئیوان! بگەڕێوە، ئیوان!» چونکە بۆی دەرکەوت ناگەڕێتەوە، هەناسەیەکی هەڵکێشا و دیسان هاواری کرد: «نەخێر، کەس ناتوانێ بیگێڕێتەوە! هەمووی

---

4- «خاتوونی من پاداشێکی ئەوتۆم لە تۆ ناوێ.» دێڕێک لە شیعری شیلەر، بە ناوی «دەستەوانە".

خەتای منە، خەتای من. من داممەزراند! ئیوان بە ڕقەوە قسەی دەکرد. زۆر تووڕە و بێئینسافانە.» ئەو قسانەشی وەک شێت و هار دەردەبڕی.

کاترینا ئیوانا لە ناکاو ڕۆیی بۆ وەتاغەکەی دیکە.

مادام خۆخلاکۆف شڵەژاو و بەتاڵووکە سرتاندی بە گوێی ئالیووشادا: «تۆ هیچ تاوانێکت نییە، کارەکەشت زۆر بەجێ بوو، وەکو فریشتە وای. من ئەوەندەی لە دەستم بێ هەوڵدەدەم ئیوان فیۆدۆرۆویچ لەو بڕیارە پاشگەز بکەمەوە و نەهێڵم بڕوات.»

ئالیووشا ئەگەرچی بەجارێ شڵەژا بوو، بەڵام بەو قسانە گەشایەوە. کاترینا ئیوانا کتوپڕ گەڕایەوە. دوو گەڵای سەد ڕۆبڵیی بەدەستەوە بوو.

رووی لە ئالیووشا کردو بە دەنگێکی ئارام و لەسەرەخۆ، وەک ئەوەی هیچ نەقەومابێ، گوتی: «ئالکسی فیۆدۆرۆویچ داوات لێدەکەم پیاوەتییەکم لەگەڵ بکەی. حەوتوویەک ـ ئەرێ، پێموایە حەوتوویەک لەمەوبەر بوو ـ دیمیتری فیۆدۆرۆویچ گومانی ئەوەی لە سەر بوو کە کردەوەیەکی سەرەڕۆیانە و ناعادلانەی ئەنجامداوە ـ کردەوەیەکی زۆر دزێو. مەیخانەیەکی گلاو لێرەیە و لەو شوێنە تووشی ئەو ئەفسەرە دەرکراوە دەبێ، ئەو ئەفسەرەی وا باوکت کاری پێدابوو. دیمیتری فیۆدۆرۆویچ ڕقی لەو ئەفسەرە هەڵدەستێ، ڕیشی دەگرێ و ڕایدەکێشێ بۆسەر شەقام، لەبەر چاوی خەڵک ئەو سووکایەتییەی پێدەکا و هەتا مەودایەکی زۆر هەروا ڕایدەکێشێ. بۆیان گێڕاومەتەوە کاتێک کوڕە چکۆلەکەی لە ڕێگای قوتابخانە چاوی بەو دیمەنە دەکەوێ، هەڵدێ بۆلای دیمیتری فیۆدۆرۆویچ و دەستدەکا بە پاڕانەوە. دەڵێن لەو کاتەدا کە خەڵکی دەورەیان دابوون و هەموو قاقا پێدەکەنین. ئەمجار لەبەر خەڵکەکە دەپاڕێتەوە یارمەتیی بدەن. ئالکسی فیۆدۆرۆویچ بمبوورە، ناتوانم بەبێ ڕق و بێزاری بیر لەو کردەوە ناحەزەی بکەمەوە.... ئەو کردەوەیەش کە تەنیا لە دیمیتری فیۆدۆرۆویچ دەوەشێتەوە، کاتێک ڕقی هەڵدەستێ و خوێن بەرچاوی دەگرێ، لە وتن نایە... و نازانم بە چ زمانێک باسیبکەم. سەبارەت بەو کابرا قوڕبەسەرەش پرسیارم کردووە، دەڵێن

پیاوێکی هەژار و بێچارەیە و ناوی ئیسینگریفە. لە ئەرتەشدا تووشی هەڵە دەبێ و لە سەر ئەوە دەری دەکەن. ناتوانم بڵێم لە سەرچی بووە، ئێستاش خۆی و بنەماڵەکەی زۆر لە تەنگانەدان و نانی شەوێیان نییە. بنەماڵەیەکی لێقەوماون. شەش سەرخێزانن، پێموایە ژنەکەشی شێتە. لەمێژە لێرە دەژین. لە نووسینگەیەک کاری دەکرد و هەقدەستێکی نەمرنەژییان پێدەدا، بەڵام ئێستا هیچ داهاتێکی نییە. پێموابوو ئەگەر... یانی پێموابوو.... نازانم. مێشکم بەجارێ شڵەقاوە، دەزانی چی! دەمویست داوا لە تۆ بکەم، ئالکسی فیۆدۆرۆویچی خۆشەویست، بچی بۆلای، بیانوویەک بدۆزەوە و بچۆ ـ دەزانی مەبەستم ئەوەیە بچی بۆلای ئەو سەروانە ـ پەککو خودایە منیش چەندە خراپ دەدوێم! خۆشم نازانم دەڵێم چی. دەبێ زۆریش وریا و لێزانانە بچی، ئەو کارەش تەنیا لە دەست تۆ دێ.» ـ ئالیووشا سوور هەڵگەڕا ـ «ئەم یارمەتییەی بۆ بەرە، ئەو دووسەد ڕۆبڵە. دڵنیام وەری دەگرێ... بەڵام هانیبدە وەری‌بگرێ... یان، مەبەستم چییە؟ چاو لێکە، ناکرێ لە ڕێگای قەرەبوو کردنەوەوە، لە شکایەت کردن پاشگەزی کەیەوە (چونکە پێموایە دەیویست شکایەت بکا)، وەکو دیارییەک، وەکو یارمەتییەکی مرۆڤ‌دۆستانە. یارمەتییەک لە لایەن منەوە، دەزگیرانی دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، نەک لە لایەن ئەوەوە... دەمویست خۆم بچم، بەڵام تۆ چاکتر دەزانی ئەو کارە بکەی. چاکتر لە بارەکەی دەزانی. ماڵەکەیان لە شەقامی دەریاچەیە، لە ماڵی ژنێکدا دەژین ناوی کالمیکۆفە... ئالکسی فیۆدۆرۆویچ بیکە بەخاتری خودا ئەو کارەم بۆ بکە، ئێستاش زۆر ماندووم، دەچم پشوویەک بدەم، خوداحافیز.»

هێندە بەپەلە گەڕایەوە و خۆی کرد بە پشت پەردەکەدا، ئالیووشا فریانەکەوت قسە بکات، ئەگەرچی دەیویست شتێک بڵێ، چونکە زۆردڵپڕ بوو. بێ‌ئەوەش توانایی نەبوو بڕواتە دەرێ. بەڵام مادام خۆخلاکۆف دەستی گرت و بەدوای خۆیدا ڕایکێشا. لەبەر هەیوانەکە دیسان وەک پێشوو ڕایگرت.

بە سرتە گوتی: «ئەوە زۆر بە تڕوتۆپە، هێندەش لەخۆ ڕازی و جینگزییە، لەگەڵ تڕی خۆشی بەشەڕ دێ؛ بەڵام دڵۆڤان و شۆخوشەنگ و دڵاواشە. ئاخ

نازانی چەندەم خۆش دەوێ. بەتایبەت هێندێ جار. لەگەڵ ئەوەشدا زۆر دڵشادم! ئالکسی فیۆدۆرۆویچی خۆشەویست، تۆ نەتدەزانی، بەڵام دەبێ پێتبڵێم کە هەمووومان، هەموو ـ هەردوو پوورەکەی، من و هەمووومان، تەنانەت لیزاش ـ لە مانگی ڕابردوودا لەخودا دەپاڕاینەوە و خوداخودامان بوو دەست لە دیمیتری گیانت هەڵگرێ، کە خۆشی ناوێ و بە هیچی نازانێ، بە دڵ پێمانخۆش بوو شوو بکا بە ئیوان فیۆدۆرۆویچ کە لاوێکی خوێندەوارە و زۆر کوڕێکی باشە و لە دنیادا لەو خۆشەویستتری نییە. ئێمە خەریکین پلانێک دادەڕێژین کە ئەو کارە سەر بگرێ و ئیوان و کاترینا پێکەوە زەماوەند بکەن. تەنانەت مانەوەی منیش لێرە ڕەنگە هەر لەبەر ئەوە بێ.»

ئالیووشا دەنگی هەڵێنا: «بەڵام ئەو دەگریا ـ دیسان لەوە دەچێ دڵی بریندار بووبێ.»

ـ ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، باوەڕ بە فرمێسکی ژن مەکە. لەو بارانەوە من لایەنگری لە ژنان ناکەم. من هەمیشە لایەنگری پیاوانم.

دەنگە ناسکەکەی لیزا لە پشت درگاکەوە هات: «دایە، تۆ خەریکی زۆری بە دەمەوە دەدەی. ئەوەندەی ڕوو مەدەیە.»

ئالیووشا، هەردوو دەستی بە دەموچاوییەوە گرت و داخی پەژیوانی و کەمتەرخەمی لە ناخەوە هەڵیدەچۆقاند، هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: «نا، هەمووی خەتای من بوو. من دەبێ سەرکۆنە بکرێم. خەتای من بوو.»

ـ نا وانییە، بە پێچەوانە، تۆ وەک فریشتە هەڵسوکەوتت کرد، وەک فریشتە. ئامادەم هەزارجار دان بەوەدا بنێم.

لیزا دیسان لە پشت درگاکەوە دەنگی هات: «دایە، کوا وەک فریشتە هەڵسوکەوتی کردووە؟»

ئالیووشا وەک ئەوەی گوێی لە وتەکانی لیزا نەبووبێ، درێژەی بە قسەکانی دا:

«هەر لەخۆڕا پێموابوو حەز لە ئیوان دەکا و ئەوی خۆشتر دەوێ، بۆیە ئەو قسە گەوجانەیەم کرد... بڵێی ئاکامی کارەکە بە کوێ بگا؟»

لیزا گوڕاندی: «ئەوە باسی کێ دەکەن؟ بۆ جوابی من نادەنەوە؟ دایە تۆ ئاخری دیقم پێدەکەی.»

هەر لەو کاتەدا کڵفەتەکەیان بە هەڵەداوان هات.

ـ کاترینا ئیوانا نەخۆشە... دەگری، جینگڵ دەدا، کەوتۆتە باڵەپڕژێ، وەک مەلی سەربڕاو، پێموابێ سەرودڵی لێهاتووە.

لیزا بە لەبزێکی پڕ لە دڵەخورپەوە هاواری کرد: «ئەوە چیبووە؟ دایە، وەختە شێت بم، من خەریکە لە داخان سەرودڵم لێدێ نەک ئەو!»

ـ لیزا بیکە بەخاتری خودا مەقیژێنە، جەرگت خواردووم. کچێک لە تەمەنی تۆدا باش نییە هەموو شتێک بزانێ. ئەوەندە خۆت لە کاری گەورەکان هەڵمەقوتێنە. پاشان دێم و ئەوەی بە پێویستی بزانم بۆت دەگێڕمەوە. ئاخ خودایە، ڕوحممان پێبکەی؛ ئەوە هاتم، ئەوە هاتم... ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، سەرودڵ لێهاتن و تووشی هێرشی عەسەبی بوون دیاردەیەکی باشە؛ زۆر باشە کە تووشی ئەو هێرشە عەسەبییە بووە. ڕاست ئەوەیە کە دەبێ ببێ، لەو کاتانەدا من دژی ژنانم و دژی هەموو ئەو فرمێسک و هێرشە عەسەبییانەم. یۆلیا، هەڵێ پێیبڵێ هەر ئێستا دەگەمێ. بەڵام ڕۆیشتنی ئیوان فیۆدۆرۆویچیش بەو شێوەیە من پێموایە خەتای کاترینایە. دەزانم ئیوان ناڕوا. لیزا بیکە بۆخاتری خودا ئەوەندە مەقیژێنە! ئەها بەڵێ، ناقیژێنی. منم دەقیژێنم. بمبوورە کچم. بەڵام من زۆر شادم زۆر زۆر شادم، زۆر شاد! ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، سەرنجتدا ئیوان فیۆدۆرۆویچ هەر ئێستا چووە دەرێ، ئەو هەمووەی درێژدادڕی کرد و چووە دەرێ، کارەکەی منداڵانە بوو! پێموابوو خوێندەوارە و لاوێکی زانکۆییە، کەچی کتوپڕ زۆر ئاڵەتی و بەپەلە و هەرزەکارانە هەڵسوکەوتی کرد؛ بەو لاوی و بێئەزموونییەش، زۆر جوان بوو، وەک تۆ... کاتێکیش کە ئەو شیعرە ئاڵمانییەی خوێندەوە، ڕاست لە تۆ دەچوو! بەڵام دەبێ هەڵێم، دەبێ هەڵێم! ئالکسی فیۆدۆرۆویچ زووکە و فەرمانەکە بەجێ بێنە و خێرا بگەڕێوە. لیزا، چیتدەوێ؟ بەخاتری خودا،

تەنانەت دەقیقەیەکیش ئالکسی فیۆدۆرۆویچ ماتڵ مەکە خێرا دەگەڕێتەوە بۆلات.

مادام خۆخلاکۆف بە هەڵەداوان ڕۆیشت. بەر لە ڕۆیشتن، ئالیووشا دەیویست بۆ دیتنی لیزا درگاکە بکاتەوە.

لیزا قیژاندی: «نابێ، ئێستا بە هیچ شێوەیەک نابێ. لە کەلێنی درگاکەوە قسە بکە. چۆنە بووی بە فریشتە؟ دەمهەوێ لەوە بگەم.»

- بەهۆی گەوجییەتییەکی زۆرەوە، لیزا! خوداحافیز!

- ناتوانی هەرئاوا بڕۆی، پەلە مەکە.

- لیزا خەمێکی گەورەم لە دڵدایە! زوو دەگەڕێمەوە، بەڵام ئەو خەمە لە سەر دڵم بۆتە گرێ.

ئەوەی گوت بەرەو دەرێ پێیپێوەنا.

# (٦)

## سۆزی دڵ لەماڵۆچکەدا

بەڕاستی خەمێکی هێندە قورس خۆی لە دڵی ئالیووشا وەرپێچا بوو، کە هەتا ئەو کاتە لە ژیانیدا هەستی بە خەمی وا نەکردبوو. چونکە وەک گەوجێک خۆی کردبوو بە ژووریدا و خۆی لە کارێک هەڵقووتاندبوو، کە نەدەبوو بیکا. مەسەلەی ئەوین. بە ڕوخسارێکی سوورهەڵگەڕاوەوە بۆ سەدەمین جار بەخۆی گوت: «من کوا لەوە دەگەم؟ شتێک کە تێیناگەم بۆ لەخۆڕا خۆی تێهەڵدەقوتێنم لەخۆڕا دەمەوەری دەکەم؟ ئاخ، شەرمەزار بوونیش هیچ دەردێک دەوا ناکا. شەرمەزاری تەنیا سزایەکە کە مستەهەقم بیچێژم. گرفتاری ئەوەیە کە بەڕاستی لەوانەبوو ببمە هۆی ناشادی و ناخۆشییەکی زیاتریش... خۆ باوە زووسیما ناردمی ئاشتیان بکەمەوە، ئەوەیە ڕێگای ئاشت کردنەوە و یەکخستنەوە؟» ئەو کاتە لە ناکاو وەبیری هاتەوە چۆن هەوڵی داوە دەستیان بنێتە نێو دەستی یەکتر و دیسان هەستی بە شەرمەزاری کرد. بەڵام کتوپڕ بەو ئاکامە گەیشت: «ئەگەرچی زۆر سادقانە هەڵسووکەوتم کرد، لە داهاتوودا دەبێ ژیرانەتر بجووڵێمەوە، « بەو بیرکردنەوە و بە ئاکام گەیشتنەش تەنانەت بزەیەکی نەهاتێ.

ڕاسپاردەکەی کاترینا ئیوانا گەیاندییە شەقامی دەریاچە، دیمیتریی براشی ماڵەکەی هەر لەو نزیکانە، لەولای شەقامی زەریاچەوە هەڵکەوتبوو. ئالیووشا هاتە سەر ئەوەی لە پێشدا بچێ سەرێک لە دیمیتریی برای بدا، پاشان بچێ بۆلای سەروان ئیسینگریف. ئەگەرچی لە دڵیدابوو کە براکەی نابینێ.

ئاليووشا پێیوابوو دیمیتری بەقەستی خۆی لێ دوورەپەرێز دەکا و نایهەوێ چاوی پێیبکەوێ، بەڵام بەهەر شێوەیەک بێ دەبێ بیدۆزێتەوە. زەمان تێدەپەڕێ: لەو کاتەوە لە کلێسە هاتبووە دەرێ، بۆ ساتێکیش لەبیری پیر خافڵ نەبوو کە بە گیانەڵڵاوە بوو.

خاڵێکی تایبەت لە ڕاسپاردەکەی کاترینا ئیوانادا بوو کە بە تایبەتی ئەوە سەرنجی ئالیووشای ڕاکێشا و بەجارێ بەخۆیەوە سەرقاڵ کردبووە. کاتێک کە ناوی کوڕەکەی سەروانی هێنابوو کە منداڵێکی قوتابییە و بە گریانەوە هەڵاتووە بۆلای باوکی و لەبەر دیمیتری پاڕاوەتەوە، لەڕێوە ئەو منداڵەی وەبیر هاتەوە کە گازی لە قامکی گرتبوو، ئالیووشا پێیگوتبوو بە چ تاوانێک دەیهەوێ ئازاری بدا. ئێستا ئالیووشا لێی ڕوون بوو کە خۆیەتی، ئەگەرچی نەیدەزانی بۆ بەو یەقینە گەیشتووە. بیرکردنەوە لە مەسەلەیەکی دیکەش دەبووە هۆی هێوربوونەوەی، بۆیە هاتە سەر ئەوەی کە ئیتر بیر لەو شەیتانی و بیرە خراپە نەکاتەوە و خۆی بە گرێی پەشیمانی هەڵنەکزێنێ و کارێک بکا کە پێی سپێردراوە، جا چش هەرچی دەبێ با ببێ. ئەو بیرەش بە تەواوی بووە هۆی هێور بوونەوەی. بەرەو شەقامەکەی ماڵی دیمیتری بایدایەوە، هەستی بە برسییەتی دەکرد، ئەو کولێرەی لە ماڵی باوکی هەڵیگرتبوو، دەریهێنا و خواردی، خواردنی کولێرەکە هێزێکی وەبەرهێنایەوە.

دیمیتری لە ماڵێ نەبوو. خێزانی ماڵەکە، دارتاشێکی پیر بوو لەگەڵ کوڕ و ژنە پیرەکەی، زۆر بە دڕدۆنگی چاویان لە ئالیووشا کرد. پیرە پیاو لە وەڵامی پرسیارە پەیتا پەیتاکانی ئالیووشادا گوتی: «سێ شەوە لێرە خەوتووە. لەوانەیە ڕۆیشتبێ.» ئالیووشا تێگەیشت کە پیرەپیاو چۆنی پێکوتراوە ئاوا وەڵام دەداتەوە. کاتێک پرسیی چووە بۆ ماڵی گرووشنکا یان لە مەیخانەکەی تۆماس خۆی شاردۆتەوە (ئالیووشا بە ئانقەست ئاوا بە ئاشکرا قسەی دەکرد)، هەرسێکیان بە ترس و گومانەوە چاویان تێبڕی. ئالیووشا لە دڵی خۆیدا گوتی: «وادیارە، خۆشیان دەوێ، زۆر چاکیان ئاگا لێیەتی و پێوەی ماندوون، ئەوەش زۆر چاکە.»

هەرچۆنێک بوو ماڵی خانمی کالمیکۆفی لە شەقامی زەریاچە دۆزییەوە: ماڵێکی چکۆڵە و کۆن، لایەکی نشستی کردبوو، دیوارەکەی درزی بردبوو. سێ پەنجێرەی بەرەو شەقام و حەوشەیەکی پڕ لە قوڕوچڵپاوی هەبوو کە لە نێوەڕاستەکەیدا مانگایەک بەسترابۆوە. لە حەوشەکە تێپەڕی و دەرگای ژوورەکەیانی دییەوە. لەلای چەپی هەیوانەکە پیرێژنی خاوەن ماڵ و پیرەکچەکەی دەژیان. لەوە دەچوو هەردووکیان کەڕ بن. لە وەڵامی پرسیارە پەیتا پەیتاکانی ئالیوشادا، سەبارەت بە سەروان، زۆر بە زەحمەت یەکیان تێگەیشت کە کاری بە کرێنشینەکەیانە و ئاماژەی بە دەرگایەک کرد کە لەوسەری هەیوانەکە هەڵکەوتبوو، ژوورێکی چکۆڵە و دەرک و دیوار چەپرەک بوو و شوێنی ژیانی سەروان ژوورێکی ئاسایی بوو. ئالیووشا دەستی برد بۆ دەسکی درگاکە و ویستی بیکاتەوە، بەڵام بێدەنگیی نێو ژوورەکە سەرنجی ڕاکێشا و بە قسەکانی کاترینا ئیوانادا بۆی دەرکەوتبوو کە سەروان خاوەنی بنەماڵەیە. «یان هەموویان خەوتوون، یان ڕەنگە گوێیان لە دەنگم بووە و چاوەڕوانن درگاکەم لێبکەنەوە. واچاکە لە پێشدا لە دەرگاکە بدەم، » لە دەرگای دا. کەس جوابی نەدایەوە، بەڵام نەک خێرا، بەڵکو دوای دە چرکەیەک، کەسێک بە دەنگی بەرز و زۆر تووڕە گوڕاندی: «کێیە؟»

ئالیووشا دەرگاکەی کردەوە و لە کەرکەرۆکی درگاکە پێی نایە ئەودیو و چووە ژوورێ. ژوورێکی بەرفراوان بوو، بەڵام پڕ بوو لە کەلوپەڵ و شتومەکی ماڵێ و چەند کەس لە نێو ژوورەکەدا بوون. لەلای چەپە وەجاخێکی گەورەی ڕووسی داندرابوو. لە وەجاخەکەوە تاکو پەنجێرەکەی لای چەپە تەنافێک ڕایەڵ کرابوو و پەڕوپاڵی پێدا درابوو. لەبەری ڕاست و چەپی ژوورەکە چرپای درێژۆکە داندرابوو و لێفەیان بەسەردا دابوو. لە سەر چرپایەکی لای ڕاستە چوار باڵنج لە سەر یەک هەڵچندرابوون. باڵنجەکان لەژێرەوە بۆ سەرێ یەک لە یەکی چکۆلەتر بوون و وەک هەرەم دەچوو. لە سەر قەرەوێڵەکی دیکەیان تەنیا باڵنجێکی زۆر چکۆلە داندرابوو. سووچی ڕووبەڕووشیان پەردە کێشابوو. لە پشت پەردەکەوە تەختێک دەبیندرا کە بە

دار و تەختە ساز کرابوو، سەندەڵییەکیش لە پەنای داندرابوو. کورسییە دارین و زبرەکە، چوار گۆشە بوو، لەلای دەرگای وەتاغەکەوە تاکو بەر پەنجێرەکەی نێوەڕاست چووبوو. سێ پەنجێرەی ژوورەکە کە هەرکامیان چوار شووشەی چکۆلەی مەیلەوسەوزی تێگیرابوو، ڕووناکییەکی کەمیان دەدایە ژوورەکە، بە تەواوی پێوەدرابوون و ژوورەکە خەفە و شپرزە دیاربوو. تاوەیەک لە سەر مێزەکە داندرابوو و پاشماوەی هێلکەوڕۆنی تێدا مابوو، لەتێک نان و بترییەکی چکۆلەی ودکاشی لە پاڵدا بوو کە قومێک لە بنەکەیدا مابۆوە.

ژنێکی بەڕواڵەت ڕازاوە، شەوچەپکەنێکی کەتانیی لەبەردا، لە سەر کورسیلەی پەنا قەرەوێڵەکەی لای چەپە دانیشتبوو. دەموچاوە وردیلەکەی و ڕوومەتە تێکقوپاوەکەی بە ئاشکرا نەخۆشنی پێوە دیار بوو. بەڵام ئەوەی لە هەموو شتێک زیاتر بووە هۆی سەرسوڕمانی ئالیووشا، ڕوانینی ئەو ژنە بەستەزمانە بوو - ڕوانینێکی پڕ لە پرسیار و سەر سووڕهێنەر، لەگەڵ ئەوەشدا پڕ لە غروور. کاتێک ئالیووشا لەگەڵ مێردەکەی دەدوا، سەرنجە پڕ لە بایی بوون و پرسیارەکەی لە سەر زاری هەردووکیان لە هاتوچۆدا بوو. لە پاڵ ژنەدا، لە نزیک پەنجێرەکە کچێکی عازەب ڕاوەستابوو. قژی تەنک و مەیلەوسوور بوو، بەرگێکی هەژارانە، بەڵام زۆر خاوێنی لەبەردا بوو. هەر لەگەڵ چوونە ژوورەوەی ئالیووشا، بە بێزارییەوە چاوێکی لێکرد. لەپاڵ قەرەوێڵەیەکی دیکەدا کچێکیتر دانیشتبوو. ڕوخساری خەمی لێدەباری، نزیکەی بیست ساڵی تەمەن بوو، بەڵام لەشبەبار و پشت چەماوە. دواتر بە ئالیووشایان گوت، «لاقیشی سەقەتە» دارشەقەکانی لە سووچی قەرەوێڵە و دیوارەکە هەڵپەسێردرابوو، دەستی دەیگەیشتێ. چاوانی زۆر جوان و نەرم و دڵۆڤانی ئەو کچە بەستەزمانە، بە ئارامی لە ئالیووشایان دەڕوانی. پیاوێکی چلوپێنج ساڵانە لە سەر مێزەکە دانیشتبوو و پاشماوەی هێلکەوڕۆنەکەی دەخوارد. لاواز و کورتەباڵا و ڕێوەڵە بوو. تووکەسەری مەیلەوسوور بوو و ڕیشێکی زەرد و تەنکی هەبوو. زۆر لە گەسک دەچوو. (ئەو وێچوونەی

«گسکەکۆڵە» لەڕێوە لەبەر هۆیەک لە داڵغەی ئالیووشا دەرپەڕی؛ ئەوەی پاشان وەبیر هاتەوە.) دیاربوو کە ئەو پیاوە گوڕاندوویەتی «کێیە»، چونکە پیاوی دیکە لە ژوورەکەدا نەبوو. بەڵام کاتێک ئالیووشا چووە ژووریٚ، لە سەر ئەو کورسیلەی کە لە سەری دانیشتبوو هەستاو بە پڕتاو هات بۆلای ئالیووشا و هەر بەڕێوە بە دەسرەیەکی کۆنە دەموپەلی سڕی.

ئەو کچەی کە لە سووچی لای چەپ ڕاوەستابوو، بە دەنگێکی بەرز گوتی: «ڕاهیبێکە هاتووە سواڵ و سەدەقە بۆ کلێسە کۆ دەکاتەوە. بەڕاستی جێیەکی چاکیشی هەڵبژاردووە!» کابرا هەر لەڕێوە بۆلای کچە ورەسووڕا و بە دەنگێکی شڵەژاو و لەرزۆک وەڵامی دایەوە.

«نا، باربارا نیکۆلافنا خان، وا نییە، بە هەڵەچووی خانمگیان.» دیسان ڕووی کردەوە ئالیووشا و لێیپرسی: «قوربان، ئیزن بفەرموون لێتان بپرسم چی بۆتە هۆی ئەوەی ئێوە قوربان بێن بۆ ئەم کاولاشەی ئێمە؟»

ئالیووشا بە وردی چاوی تێبڕی. یەکەم جار بوو دەیدی. تووڕە و شڵەژاوی دەنواند. ئەگەرچی دیاربوو تازە عارەقی خواردۆتەوە. سەرخۆش نەبوو، وریاییەکی زۆر بە ڕوخسارییەوە دیاربوو، هەروەها ترسێکی غەریبیش دایگرتبوو. وەک کەسێک کە ماوەیەکی دوور و درێژ ملکەچ و فەرمانبەر بووبیٚ و ئێستا لەپڕ ئازادیان کردبیٚ و بیهەویٚ مل هەڵێنیٚ و خۆی بنوێنیٚ، یان چاکتر بڵێم، وەک کەسێک وابوو کە دەیهەویٚ زەبرێکی کاری لە کەسێکی دیکە بوەشێنیٚ، بەڵام دەترسیٚ زەبری وێکەویٚ. دەنگ و قسەکردنەکەی ڕەوان و جۆرێک خۆشیرین کردنی شێتانەی پێوە دیاربوو، هێندیٚ جار قیناوی و هێندیٚ جاریش مەرایی و زمانلووسی و هەرتاویٚ بە جۆرێک لەبز و زمانی دەگۆڕی. پرسیاری سەبارەت بە «کاولاشی ئێمە»ی کە پرسیبوو، سەرتاپای دەلەرزی و گلێنەی چاوی لە هێلوونەکەیدا وەک خولخولە هەڵدەسووڕان. هێندە لە ئالیووشا چووە پێشیٚ کە ئالیووشا ناچار بوو بە شێوەیەکی غەریزی هەنگاوێک بکشێتەوە دواوە. باڵتەیەکی کۆنی کەتانی تۆخی، پینەپینەی لەبەردا، پانتۆڵێکی دامەیی سپیواشیشی لە پادا، کە

دەمێک بوو لە کەڵک و کەرەم کەوتبوون. پانتۆڵەکەی زۆر تەنک و ناسک بوو. هێندەش بە بەری تەنگ بوو لەوانەبوو بپچڕێ.
ئالیووشا لە وەڵامدا گوتی: «من ئالکسی کارامازۆفم.»
کابراش هەر لەڕێوە هەڵیدایە: «زۆر چاک دەزانم قوربان، « بۆ ئەوەی دڵنیای بکا کە دەزانێ کێیە. «منیش قوربان سەروان ئیسنگیریفم، بەڵام حەزدەکەم بزانم چی بۆتە هۆی ئەوەی بێن بۆ ئێرە، قوربان...»
ـ ڕاستت دەوێ بۆ شتێکی تایبەت نەهاتووم. عەرزێکی چکۆلەم بوو لە خزمەتتاندا ـ هەڵبەت ئەگەر ئیزن بفەرموون.
«کەوایە فەرموون دانیشن قوربان، تکاتان لێدەکەم فەرموون دانیشن، قوربان، لە کومێدییەکانی قەدیمدا وایان دەگوت: «تکاتان لێدەکەم فەرموون دانیشن» خێرا کەمەی کورسیلەیەکی گرت و هێنایە پێشێ، (کورسیلەیەکی دارینی قورس بوو، بەرگی پێوە نەبوو) هێنای لە نێوەڕاستی ژوورەکە داینا، پاشان کورسیلەیەکی دیکەی وەک ئەوی هێنا بۆ خۆی و بەرەوڕووی ئالیووشا داینا و لەسەری دانیشت، هێندەش نزیک کە چۆکیان بە چۆکی یەکەوە بوو.
ـ نیکۆلای ئیلیچ ئیسنگیریف، قوربان، سەروانی پێشووی پیادەنیزامی ڕووس قوربان، خوێڕیگەری بووە هۆی ئابڕووچوونی، بەڵام هەروا سەروانە. ئەگەرچی چاکتر وایە بڵێم سەروان «بەڵێ قوربانۆف» چونکە نیوەی تەمەنم فێر بووم بڵێم «قوربان». ئەمەش وشەیەکە لەم دنیایەدا کاتێک پیاو لە عەرز دەدرێ، بەکاری دێنێ.
ئالیووشا بە بزەیەکەوە گوتی: «ڕاست دەکەی، بەڵام پێتوایە بێئیختیار بە زارتدا دێ یان بە ئانقەست؟
ـ خودا لەو سەرە ئاگای لێیە بێئیختیار بە زارمدا دێ و پێشتر قەت بە زارمدا نەدەهات! بە عومراتم ئەو وشەیەم بە زاردا نەهاتووە، بەڵام لەوەتا کەوتومەتە چاڵی نەگبەت و نەهاتییەوە، دەستمکردووە بە کوتنی ئەم قوربانە دێزەیە. دەستێکی بەهێز و زاڵم لە کاردایە. دەزانم حەز بە باسوخواسی تازە

دەکەی، بەڵام لە شوێنێکی وەکو ئەم ماڵەی من کە بۆ میوانداری نابێ، چۆن توانیومە سەرنجی ئێوە ڕاکێشم؟

ـ هاتووم ـ سەبارەت بەو مەسەلەیە.

سەروان بێسەبرانە پەڕییە نێو قسەکانی ئالیووشا: «سەبارەت بە کام مەسەلە؟»

ئالیووشا زۆر لە خۆی نووسا هەتا گوتی: «سەبارەت بە دیداری ئێوە لەگەڵ دیمیتریی برام.»

«کام دیدار، قوربان؟ نەکا مەبەستت ئەو دیدارە بێ، قوربان! ئەها تێگەیشتم، سەبارەت بە گسکە کۆڵەی من، گسکە کۆڵەی تایبەتی حەمام.»

خۆی ئەوەندە لە ئالیووشا بردە پێشێ چۆکی بە چۆکییەوە نا، زۆر سەیر بوو، وەک ژێی کەوان وێک هاتبوو.

ئالیووشا منجاندی: «کام گسکە کۆڵە؟»

دەنگێکی ئاشنا لە پشت پەردەکەوە هاتە گوێ ـ دەنگی کوڕەی قوتابی ـ گوتی: «باوەگیان، هاتووە شکایەت لە من بکات، گازم لە قامکی گرتووە.»

پەردەکە لادرا و ئالیووشا چاوی بە کوڕەکە کەوت لە سەر تەختێکی چکۆلە ڕاکشابوو، تەختەکەش کورسیلە و سەندەڵیی درابووە ژێر و لە سووچێکی ژوورەکە لە ژێر پەیکەرەکاندا ساز کرابوو. کوڕە لێفە کۆنێکی چرچ و لۆچ و باڵتەیەکی بەخۆیدا دابوو و تخێڵ بوو بوو. دیاربوو ناساغە، بە چاوە سوور هەڵگەڕاوەکانیدا دیاربوو تاویاو دایگرتووە. بەبێ ترس چاوی لە ئالیووشا بڕیبوو، دیاربوو شوێنەکەی خۆی پێ ئەمنە و هیچ کەس ناتوانێ دەستی بۆ بەرێ.

سەروان لە سەر سەندەڵییەکەی هەستا: «چی! گازی لە قامکتان گرت؟ گازی لە قامکی ئێوە گرت، قوربان؟

ـ بەڵێ. لەگەڵ قوتابییەکانی دیکە بەردەفڕکێیان دەکرد. بە شەش منداڵ بەردیان لەم کوڕەی تۆ هەڵدەکرد، چووم بۆلای، بەردێکی تێهەڵکردم و

بەردێکی لە سەریشم دا. لێمپرسی چمکردووە. کەچی ئاوقام بوو و بە قامکمدا نووسا، ئیتر نازانم بۆ ئاوای کرد.

سەروان ئاڵەتی بوو و گوڕاندی: «هەر ئێستا پشتی لە زگی نەرمتر دەکەم ـ هەر ئێستا!»

ـ بەڵام من بۆ شکایەت نەهاتووم، تەنیا بۆ تۆم گێڕایەوە... نابێ لێیبدەی. دیارە نەخۆشە.

«پێتوایە دەیدەمە بەر زەبری قامچی، قوربان؟ یانی من ئیلیۆشچکای خۆم دەگرم و لەبەر دڵی تۆ دەستدەکەم بە لێدانی؟» لە ناکاویش بەرەولای ئالیووشا وەرسووڕا و وەک ئەوەی بیهەوێ ئاوقای بێ، گوتی: «پێتخۆشە هەر ئێستا ئەو کارە بکەم، قوربان؟ زۆر بەداخەوەم سەبارەت بە قامکتان؛ بەڵام بەجێی لێدانی ئیلیۆشچکا، حەز دەکەی هەر ئێستا چوار قامکی خۆم لەبەر چاوت بەو چەقۆیە دەقرتێنم، با گڕی ڕق و تۆڵەتان دامرکێتەوە، قوربان. خۆ ناتەوێ پێنجەمین قامکیشم بپەڕێنم؟»

بوغزێک گەرووی گرت و قسەی بۆ نەهات. لێوی خۆی دەکرۆشت و هێندە ئاڵەدینی دنواند، پیاو دەیگوت شێت بووە و لەوانەیە بە گژ دار و بەرددا بچێ.

ئالیووشا هەروا لە سەر جێی خۆی دانیشتبوو، زۆر مات و لەسەرەخۆ گوتی: «پێموایە ئێستا تێگەیشتم، وادیارە کوڕەکەتان زۆر کوڕێکی باشە، باوکی خۆی خۆش دەوێ، بۆیە ئاوقای من بووە، زانیویە برای ئەو کەسەم وا سووکایەتیی بە ئێوە کردووە...» خەمبارانە دووپاتی کردەوە: «ئێستا تێگەیشتم. بەڵام دیمیتریی برام لە کارەکەی خۆی پەشیمانە و دەزانم، ئەگەر بۆی بلوێ دێ بۆلاتان، یان چاکتر وایە، ئێوە هەر لەو شوێنە ببینێ و لەبەر چاوی خەڵک داوای لێبوردنتان لێبکا. ئەگەر حەزتان لێیە؟»

ـ مەبەستتان ئەوەیە دوای کێشانی ڕیشم داوای لێبوردنم لێدەکا؟ پێشی وایە دڵم پاک دەبێتەوە و هەموو شتێک کۆتایی پێدێ. ها، قوربان،

ـ نا! بە پێچەوانە، ئێوە چۆنتان پێخۆشە و چۆن دەڵێن وادەکا.

- یانی ئەگەر داوا لە حەزرەتی ئەجەلیان بکەم لە هەمبەر مندا هەر لەو مەیخانەیە - ناوی «مترۆپۆلیس»ە یان لە نێو بازاڕ چۆک دادا و داوای لێبوردنم لێبکا، دەیکا؟

- بەڵێ، لە هەمبەرتاندا بە چۆکیشدا دێ.

- ئێوە دڵتان هەڵقرچاندم، قوربان. وەگریانت خستم و دڵت هەڵقرچاندم، قوربان، ! لەبەر دڵفراوانیی براکەتان کوڵی دڵم هەستاوە. ئیزن بفەرموون با بنەماڵەکەمتان پێبناسێنم. دوو کچ و کوڕەکەم، قوربان! ئەگەر بمرم، کێ بەخێویان دەکا و وەفریایان دێ، هەتا ئەو کاتەی زیندووم کێ جگە لەوان ئاگای لە منی چارەڕەش دەبێ؟ ئەوەش شتێکە کە خودا بۆ مرۆڤگەلی وەک منی بڕیوەتەوە ڕۆژی بەرێ لە نێو چاوەکەمی نووسیوە، قوربان! چونکە کەسێک هەر هەیە مرۆڤێکی لێقەوماوی وەک منی خۆش بوێت. قوربان.

ئالیووشا گوتی: «بەڵێ، بەڕاستی وایە!»

کچێک کە لە پاڵ پەنجێرەکەدا ڕاوەستابوو، لە ناکاو بۆلای باوکی وەرسووڕا و بە شێوەیەکی جاڕزانە و پڕسووکایەتی دەنگی هەڵێنا: «باوە گیان دەست لەو قۆڕیاتە هەڵگرە ! گەمژەیەک لێمان پەیدا بووە و تۆی ساویلکەش دەتهەوێ ئابڕوومان بەرێ!»

باوکی بە لەبزێکی تووڕە و ڕوانینێکی هەق پێدەرانە، گوڕاندی: «باربارا نیکۆلافنا، سەبرکە! ئیزنم بدە دەسەڵاتم بە سەر بیروڕای خۆمدا هەبێ.» پاشان ڕووی لە ئالیووشا کردەوە و گوتی: «بە دەست خۆی نییە، خووخدەی هەروایە، قوربان.

تاقە شتێک نەبوو لە نێو سروشتا

کە ئارەزووی خێر و چاکەی بۆ نەکا[5]

بەڵام، قوربان، ئیزن بفەرموون با ئارینا پترۆفنای خێزانمت پێبناسێنم. ژنێکی چل و سێ ساڵانەی ئاساییە، دەتوانێ لەجێی خۆی هەستێ، بەڵام زۆر کەم. لە بنەماڵەیەکی هەژار و بێبەشە. ئارینا پترۆفنا، ئەوەندە ڕووناخۆش

---

5- بەیتێک لە شیعری (دێو)ی پووشکین

مەبە، ئەمە ئالکسی فیۆدۆرۆویچ کارامازۆفە. هەستە ئالکسی فیۆدۆرۆویچ.» دەستی ئالیووشای گرت، بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو، یەک تەکان هەڵیستاند. «بۆ ئاشنایەتی لەگەڵ خاتوونێک دەبێ هەستییە سەرپێ، قوربان. خاتوون ئەمە ئەو کارامازۆفە نییە... کە.... برایەتی، زۆر تێگەیشتوو و خاکەڕاو لەسەرەخۆیە. وەرە ئارینا پترۆفنا، وەرە خاتوون، بەڵام سەرەتا ئیزنم بدە دەستت ماچبکەم.»

دەستی ژنەکەی گرت و بەڕێز و خۆشەویستییەوە ماچیکرد. کچەکەی پاڵ پەنجێرەکە بە ناقایلییەوە ڕووی وەرگێڕا. ژنە ڕوخسارە پڕ لە غروور و پرسیارەکەی گەشایەوە و گوتی:

ـ فەرموون دانیشن. ئاغای چرنۆمازۆف[6]

«کارامازۆف، خاتوون، کارامازۆف». بە منجە منج گوتی: «ئێمە لە بنەماڵەیەکی بێبەشین، قوربان.»

ـ چاکە کارامازۆف، یان هەرچییەکە، بەڵام من چرنۆمازۆفم پێ باشترە.... دانیشە. بۆ هەڵتساندە سەرپێ؟ بە من دەڵێ ڤەشەل، بەڵام من ڤەشەل نیم. بەڵام لاقم وەک خیگە ماسیوە و خۆشم وشکوڕەق بوومەتەوە. کاتی خۆی قەڵەو بووم، بەڵام ئێستا دەڵێی سیلدارم.

سەروان دیسان لە بنەوە منجاندی: ئێمە بنەماڵەیەکی هەژار و بێبەشین، قوربان.»

کچەی پشت چەماوە کە تاکو ئەو کاتە متەقی نەکردبوو، کتوپڕ گوتی: «پەککو. باوە پەککو! پاشان لەچکەکەی بە بەر چاویدا هەڵدا.

کچەی پاڵ پەنجێرەکە گوتی: «حەنەکچی!»

ژنە ئاماژەی بە کچەکانی کرد و گوتی: «خۆ بەسەرهاتی ئێمەت بیستووە؟ ئەوەش ماڵ و حاڵەکەمانە. شپرزە و شپڕێو. زۆرجار میوانی ناوەختمان لێپەیدا دەبوو. ئەو کاتەی مێردەکەم لە ئەرتەشدا بوو، لەو جۆرە میوانانەمان

---

6- «کارا» (Kara) بەشی یەکەمی وشەی «کارامازۆف» وشەیەکی تورکییە و یانی «ڕەش» لێرەدا، ئارینا پتروفنا، «چرنۆ"ی ڕووسیی لەجێی «کارا» دانا کە بە مانای «ڕەش"ە

زۆر بۆ دەهات، وەک دڵۆپە پەیدا دەبوون. نامەوێ هەڵیانسەنگێنم، هەرکەس بە سەلیقە و مەرامی خۆی. مەسەلەیەک هەیە دەڵێ دوو کەس ئەگەر خووخدەیان لە یەک بچێ، زۆر پێکەوە دەگونجێن و یەک دەکەون. ژنێکی ڕاهیبە دەهات بۆ ماڵمان، دەیگوت: «ئەلکساندر ئەلکساندرۆویچ پیاوێکی زۆر باش و لەبەر دڵانە، بەڵام ناستازیا پترۆفنا دەڵێی شەیتانە» من دەمگوت: دەی ئەوە بیروڕای خۆتە، تۆش هەر لە داردەمووکانە دەچی.» گوتی: «وا چاکە تۆ پێی زیادی دانەکێشی.» گوتم: «تۆ دەڵێی کۆڵەوەژی ڕەشی بە تۆ چی، کێ پێی گوتووی بێی بۆ ئێرە و دەرسم دادەی؟» گوتی: «بەڵام، تۆی دەمگەنیگ بۆنی دەمت ناخۆشە و من دەمم بۆن خۆشە.» «لە هەموو ئەفسەرەکانیش بپرسە بزانە بۆنی دەمی منیان پێناخۆشە؟» لەو کاتەوە هەر لە بیرمە و قەتم لەبیر ناچێتەوە. چەند مانگ لەمەوبەر هەر لەم جێگایەی ئێستام دانیشتبووم. ئەو ژینراڵەی کە بۆ گەردنئازایی جێژن دەهات بۆ ماڵمان، لە ناکاو وەژوور کەوت، لێمپرسی: «قوربان، وا هەیە ژنێک دەمی بۆگەن بێ؟» وەڵامی دایەوە: «بەڵێ، دەبێ پەنجێرەکە یان درگاکە بکەنەوە، با هەوای ژوورەکە بگۆڕدرێ.» هەموویان هەر وان! بۆنی دەمی من چییە؟ خۆ بەقەد بۆنی مردوو ناخۆش نییە، گوتم: «هەواکە لەوە زیاتر پیس ناکەم، ڕادەسپێرم جووتێ پێڵاوم بۆ بێنن، سەری خۆم هەڵدەگرم و دەڕۆم.» خۆشەویستەکانم دایکتان لۆمە مەکەن! نیکۆلای ئیلیچ، چبکەم ناتوانم ڕازی و بەختەوەرت کەم! دەزانم هیچکامتان منتان خۆش ناوێ. تەنیا ئیلۆشچکا کاتێ لە قوتابخانە دێتەوە هەڵدێ بۆ باوەشم و خۆشی دەوێم. دوێنێ سێوێکی بۆ هێنابوومەوە. ڕۆڵەکانم لە دایکتان ببوورن - بوونەوەرێکی چارەڕەش و تەنیایە، لێی ببوورن! بۆ ئەوەندەم لێ وەڕەزن؟ بێز لە بۆنی دەمم دەکەن، دەزانم!»

ژنەی چارەڕەش و شێتۆکە دای لە پرمەی گریان و فرمێسک بە ڕوومەتیدا هاتە خوارێ. سەروان هەڵات بۆلای.

«هاوسەرە خۆشەویستەکەم، بەسە ئیتر، دڵی خۆت نارەحەت مەکە! تۆ بێکەس نیت. هەموو خۆشیان دەوێی، خۆشمان دەوێی بڕوا بکە، هەموو

دەتپەرستین.» دەستیکرد بە ماچکردنی هەردوو دەستی. پاشان دەستی بە سەریدا هێنا و بە دەسرەیەک فرمێسکەکانی بۆ سڕی. ئالیووشا هەستیکرد، سەروانیش فرمێسک لە چاوی زاوە. سەروان زۆر بە گرژی و ڕووتاڵی چاوی لە ئالیووشا بڕی و لەگەڵ ئەوەی ئاماژەی بە ژنە شێت و وێتەکەی کرد، گوتی: «دیوتە قوربان، خۆ گوێت لێبوو، قوربان؟

ئالیووشا لە بن لێوەوە منجاندی: «بەڵێ، دیتم و گوێشم لێبوو.»

کوڕەکەیان لە سەر قەرەوێڵەکەی هەستا و دانیشت، چاوی لە باوکی بڕی و چاوی وا سوور بووبوو، دەتگوت ئاوری لێدەبێتەوە، قیژاندی: «باوە، باوە، بۆ قسەی لەگەڵ دەکەی، وێڵیکە!»

باربارا نیکۆلافنا، لە کاتێکدا بە شلەژاوی لاقی لە عەرزی دەوەژاند، گوڕاندی: «دەست لەو قۆڕیات و خۆنواندن و فێڵ و تەڵەکە هەقمەقانەیەت هەڵگرە، بە هیچ کوێ ناگەی!»

ـ باربارانیکۆلافنا، تووڕە بوونی ئەمجارەت بەجێیە. هەوڵدەدەم هەرچی زووتر دڵت ڕازی بکەم. تۆ چۆنت پێخۆش بێ وا دەکەم. وەرە ئالکسی فیۆدۆرۆویچ کڵاوەکەت لە سەر بنێ، منیش کڵاوی خۆم لە سەر دەکەم. پێکەوە دەچینە دەرێ. ئەم کچەی کەوا لێرە دانیشتووە، ناوی نینا نیکۆلافنایە، قوربان. لەبیرم چۆوە ئەویشت پێبناسێنم، قوربان. دەڵێی فریشتەیە و لە ئاسمانەوە هاتۆتە خوارێ بۆ نێو ئێمەی مرۆڤی خاکی... خۆزگە بمزانیبایە چیی لە دڵدایە! خۆ تێدەگەی؟

باربارانیکۆلافنا بە تووڕەیی گوتی: «چاوی لێکە چۆن وەک مێوژۆکە دەلەرزێ، دەڵێی فێی لێهاتووە!»

ـ ئەو کچەش کە لاقی لە عەرزی دەوەژێنێ و بە گەوجم دەزانێ، بەڕاستی وەک فریشتەی ئاسمانی وایە و هەقیەتی هەرشتێکم پێبڵێ. فەرموو، ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، وا چاکە کۆتاییی پێبێنین قوربان.

دەستی ئالیووشای گرت، لە وەتاغەکە چوونە دەرێ و هەتا سەر شەقام بەدوای خۆیدا ڕایکێشا.

## (٧)

# لە دەرەوە

ـ هەوایەکی خۆ و تازەیە قوربان، بەڵام لە باڵەخانەکەی مندا ئەم هەوا پاکە دەستناکەوێ! گەورەم، با تۆزێ شێنەیی‌تر پیاسە بکەین. لەوەی کە دلۆڤانانە گوێم دەدەیتێ سپاست دەکەم.

ئالکسی فیۆدۆرۆویچ گوتی: «منیش دەمهەوێ مەبەستێکی گرینگتان عەرز بکەم، بەڵام نازانم چۆنی دەستپێبکەم.»

ـ دڵنیام کارێکت بە من بووە، قوربان. دەنا لەخۆڕا نەدەهاتی بۆ دیدەنیم. مەگین بۆ سکاڵا لە دەست کوڕەکەم هاتبێتی. کە ئەوەش مەحاڵە قوربان. سەبارەت بەو کوڕەش قوربان، لەوێ نەمدەتوانی بۆتی باسبکەم، بەڵام لێرە با ڕووداوەکەی ئەو ڕۆژەت بۆ بگێڕمەوە. گسکە کۆڵەکەم حەوتووی پێشوو پڕو بژتر بوو ـ مەبەستم ڕیشمە، قوربان. ئەوە ناوێکە بە سەر ڕیشمدا بڕاوە، زیاتریش لە نێو منداڵانی قوتابیدا ئەم ناوە دەنگی داوەتەوە. دیمیتری فیۆدۆرۆویچی براشت ڕیشی گرتم و ڕایکێشام، خۆ هیچم نەکردبوو، هێندە تووڕە بوو خوێن بەرچاوی گرتبوو. بۆ بەدبەختی من کەوتمە داوی. هەر لە مەیخانەکەوە هەتا نێو بازاڕ ڕایکێشام. هەر لەو کاتەدا منداڵان لە قوتابخانە هاتنە دەرێ و ئیلۆشایان لەگەڵدا بوو. هەرکە چاوی بە من کەوت ئاوا بە دەست دیمیترییەوە پێوەبووم، بە هەڵاتن هات بۆلام. قیژاندی: «باوە، باوە!» دەستیکردە ملم، باوەشی پێداکردم. دەیویست ڕزگارم بکا لە چنگی دەیقیژاند و دەپاڕایەوە: «بەریدە، لێیببوورە.» بە دەستە چکۆڵەکانی دەستی دیمیتریی ـ

هەر ئەو دەستەی ڕیشمی گرتبوو ـ گرت و ماچیکرد، قوربان... لەو کاتەدا ڕەنگی ڕوخساریم دی... هەر لەبیرمە، قوربان، قەتم لەبیر ناچێتەوە.

ئالیووشا گوڕاندی: «سوێند دەخۆم کە دیمیتریی برام دێت بۆلات و بە شێوەیەکی سادقانە و بەداخ و پەشیمانییەوە داوای لێبوردنتان لێدەکا. تەنانەت ئەگەر پێت خۆشبێ هەروا لەو بازاڕەدا لەبەردەمتدا بە چۆکدا دێ... ناچاری دەکەم ئەو کارە بکا، ئەگەر نەیکا برای من نییە!»

ـ ئەها، کەوایە پێشنیارکردنە! لە لایەن ئەوەوە نەهاتووی. دڵە پڕبەزەیی و نەرمەکەی خۆت هانی داوی، قوربان. دەبوو ئەوە بفەرمووی قوربان. کەوایە ئیزنم بدەیە لەمەڕ دڵاوایی و جوامێری و فیداکاریی براکەتەوە بدوێم، چونکە لەو کاتەدا ئەوپەڕی لێبوردوویی نواند و دەستی لە ڕاکێشانم هەڵگرت و بەریدام. گوتی: «تۆ ئەفسەری، منیش ئەفسەرم، ئەگەر پیاوێکی دروستوحیسابیت دەستکەوێ شایەدیت بۆ بدا، بانگم بکە بۆ دوئیل. کارێک دەکەم دڵت خۆش بێ. چش لەوەی خوێڕی و هیچوپووچیشی.» ئەوە دەق و دۆغری وتەکانی بوو، قوربان. بەڕاستی خاوەنی دڵێکی گەورەیە و ڕەوشتێکی جوامێرانەی هەیە! لەگەڵ ئیلۆشا کشاینە دواوە. ئەو دیمەنەش سەربهوردێکی بنەماڵەییە و تاهەتایە ئیلۆشا لەبیری ناچێتەوە. گەورەیی و شەڕەف لە ئێمە ناوەشێتەوە، خۆت قازییە و قەزاوەت بکە، قوربان. تاوێک لەمەوبەر ماڵ و حاڵەکەمت دی، قوربان. ئەوە ژیانە من هەمە؟ سێ ئافرەت، یەکیان نوقوستان و نەخۆش، ئەوی دیکەیان کەلەلاو پشت چەماوە، سێهەمیش ساغە و زۆر زیرەک و وریایە. خوێندکاری زانکۆیە. قوربان. بە ئاواتەوەیە بگەڕێتەوە بۆ پترزبۆرگ. تاکو بۆ ڕزگاریی ژنانی ڕووسی لە ڕۆخی نەوا چالاکی بنوێنێ. باسی ئیلۆشاش ناکەم، قوربان. نۆ ساڵی تەمەنە. من لەم دنیایەدا زۆر بێکەس و لێقەوماوم. ئەگەر بمرم چییان بە سەر دێ؟ لە ئێوە دەپرسم قوربان. ئەگەر دیمیتری بانگ بکەم بۆ دوئێل و دەستەوبەجێ بمکوژێ، پاشان چی؟ ئەو قوڕبەسەرانە لێیان دەقەومێ. لەوەش خراپتر، ئەگەر نەمکوژێ، کۆڵەوار و گردەنشینم بکا: ئیتر توانای کارکردنم نابێ و خۆ دەمیشم نادووردرێ، چۆن

زگی خۆم و ئەو خێزانە ڕەشوڕووتە تێرکەم. کێ هەیە بگاتە فریامان و تێرمان کا؟ هیچ چارەیەکەم نامێنێ جگە لەوەی ئیلۆشا لە قوتابخانە بگێڕمەوە و بینێرم بۆ سواڵ. ئاکامی بانگکردنی ئەویش بۆ دوئێل ئەوە دەبێ، قوربان. قسەیەکی قۆڕ و گەوجانەیە قوربان. وانییە؟!»

ئالیووشا چاوی زیتکردەوە و دیسان دەنگی هەڵێنا: «ئەو دێت بۆ عوزرمایی و لە نێوەڕاستی بازاڕ بە سەر کەوشەکانتدا دەکەوێ.»

سەروان لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: «دەمویست شکایەتی لێبکەم. چاو لە یاساش بکە، دەمتوانی بە هۆی ئەو سووکایەتییەوە کە پێمکراوە، خەسارەتێکی زۆری لێبستێنم. بەڵام ئاگرافنا ئەلکساندرفنا ناردی بەدوامدا و گوڕاندی بە سەرمدا: «بە خەونیش بیر لەوە نەکەیتەوە! ئەگەر شکایەتی لێبکەی، لە تەواوی وڵات دەیکەم بەقاو، لەبەر بێشەرەفی لێی داوی و ئەو کاتە بانگ دەکرێیتەوە بۆ دادگا.» خۆ خودا بۆخۆی ئاگای لێیە، قوربان. ئەو فێڵ و تەڵەکە و بێشەرەفییانە لە کوێوە ئاو دەخواتەوە و من بە فەرمانی کێ جووڵاومەتەوە! خۆ من بەبێ فەرمانی خۆی و فیۆدۆرپاولۆویچ قامک بە ئاودا ناکەم. دادە خانم هەروەها گوتی: «ئەوەش بزانە، بۆ هەتاهەتایە لە سەر کارەکەت دەرتدەکەم و ئیتر چاوت بە فلسێک پارە ناکەوێ. لەگەڵ تاجرەکەشم قسە دەکەم» بەو ناوە بانگ لە پیرەمێردەکەی دەکا - «ئەویش دەرتدەکا!» ئەگەر ئەویش دەرمبکا، چۆن بەڕێدەچم؟ چاوی لەو دووکەسەیە، چونکە فیۆدۆرپاولۆویچ، بە هۆیەکی دیکە، لەوانەیە لە سەر کارەکەم دەرم بکا، هەروەها دەیهەوێ بە هۆی ئەو سفتانەوە کە ئیمزام کردووە لە دادگا شکایەتم لێبکا. بۆیە پاشگەز بوومەوە و لەسەری نەڕۆیشتم، قوربان. خۆ کاولاشەکەشمانت دی. ئێستا ئیزن بفەرموون لێتان بپرسم ئیلیۆشا قامکتی زۆر کوڵەوار کردووە؟ پێمخۆش نەبوو لە ماڵێ و لەلای خۆی باسی ئەو مەسەلەیە بکەم.»

- بەڵێ، زۆریش، دیاربوو زۆری ڕق هەستاوە. تۆڵەی تۆی لە من کردەوە. چونکە دەزانێ منیش کارامازۆفم. تازە تێگەیشتم. بەڵام ئەگەر دەتدی چۆن

بەرد لە هاوپۆلەکانی هەڵدەکا! زۆر کارێکی پڕ مەترسییە. لەوانەبوو بیشی کوژن. منداڵن و نەفام. یان بەردەکە لە سەروچاوی کەسێک دەدەن.

ـ ئەوە ڕووی داوە، قوربان. بە بەرد لێیانداوە. ئەمڕۆ بریندار بووبوو. سەری نەشکاوە، بەردەکە لە سینگی دراوە، ڕاست لە سەر دڵی دراوە. بە گریانەوە هاتەوە بۆ ماڵێ و ئێستا نەخۆشە.

ـ ئەی زانیوتە لە پێشدا ئەو دەستیپێکرد. لەبەر تۆیە وا ڕقی لێیان هەستاوە. ئەوان دەیانگوت ماوەیەک لەمەوبەر بە قەڵەمبڕ کوڕێکی بە ناوی کراسووتکین بریندار کردووە.

ـ ئەوەشم بیستووە، زۆر مەترسیدارە، قوربان. باوکی کراسووتکین لێرە کارمەندە، لەوانەیە ئەم مەسەلەیە تووشی گێرەوکێشەم بکا، قوربان.

ئالیووشا بە گەرموگوڕی گوتی: «بە باشی دەزانم ماوەیەک نەینێریتەوە بۆ قوتابخانە، بەڵکو تۆزێ ئارامبێتەوە و... ڕقەکەی دامرکێتەوە.»

سەروان دووپاتی کردەوە: «ڕق! خۆی سەرتاپا ڕقە، قوربان. ڕقەکەی لە چاو چکۆلەیییەکەی نییە. زۆر ڕقئەستوورە. تۆ نازانی، قوربان. ئیزن بفەرموون با بەسەرهاتەکەتان بە تێروتەسەلی بۆ وەگێڕم. لە دوای ئەو ڕووداوەی نێو بازاڕەکە، هەموو منداڵانی قوتابخانە بە وشەی گسکە کۆڵە ڕقیان هەڵدەستاند و دەیانبوغزاند. کوڕانی قوتابی وەچەیەکی بێبەزەیین، کاتێک بە تەنیان وەک فریشتەی خودا وان. بەڵام کە یەکدەکەون بەدفەڕ و بێبەزەیی دەبن. بە تەشەر و ناونیتکە هەستی ئیلۆشا دەڕووشێنن و ئەویش وەک ئاور هەڵدەبێ. ناهەقیشی نییە. کوڕێکی ئاساییە. لاوازە، هەست بە سووکایەتی دەکا. بەهۆی باوکییەوە تووشی ئەو شەرمەزارییە دەبێ، قوربان. ئەو بە تەنیایە، بەڵام لە تاوی باوکی ناچارە لە هەمبەریاندا ڕادەوەستێ و لەبەر باوکی و لەبەر حەقیقەت و عەداڵەت ناچارە خۆی بە ئاو و ئاوردا بدا، قوربان. ئەو وا نەبوو. ئەو ڕۆژە بە هەڵەداوان هات و دەستی براکەتی ماچ کرد و هاواری کرد: «لە باوکم خۆشبە، بیبوورە،» تووشی ڕووخانێکی سەیر بوو، تەنیا خودا دەزانێ ئەو ساتە چ ئازارێکی کێشا. منیش قوربان،

هەستم بەوە کرد. چونکە منداڵی ئێمە، منداڵی ئێوەنا، تەنیا منداڵی ئێمە ـ منداڵی فەقیر و هەژار کە هەمووکەس بە چاوی سووک تەماشایان دەکا ـ دەزانن مانای عەداڵەت چییە، قوربان. تەنانەت لە تەمەنی نۆ ساڵیدا. دەوڵەمەندان کوا لەوە دەگەن؟ئەوان بە عومراتی خۆیان لەو شتانە ناکۆڵنەوە و هەستی پێناکەن. بەڵام هەر لەو کاتەدا کە ئیلۆشای من لەو بازاڕە و لەبەر چاوی خەڵکی دەستی براکەتی ماچکرد، هەر لەو کاتەدا لە مانای عەداڵەت گەیشت، قوربان.» سەروان دیسان وەک شێت و ماخولیا هەڵبوو و گوتی: «ئەو هەقیقەتە لە ناخی ڕۆچوو و بۆ هەتا هەتایە وردیکرد، قوربان.» مشتی ڕاستەی لە لەپی دەستی چەپەی ڕاکێشا، دەتگوت دەیهەوێ نیشانیدا «ئەو هەقیقەتە» چۆنی ئیلۆشا ورد کرد. «ڕاست ئەو ڕۆژە، قوربان، نەخۆشکەوت و تاویاو لە جێدا خستی و ئەو شەوە هەتا بەیانی بەدەم چەقوچۆوە ڕاواندی. ئەو ڕۆژە قسەی لەگەڵ نەکردم، قوربان، بەڵام دەمزانی بە سیلەی چاو لێمدەڕوانی، ئەگەرچی ڕووی لە پەنجێرەکە بوو و واینواند خەریکی خوێندنەوەی کتێبە. بەڵام تێگەیشتم هۆشی لای دەرسەکەی نییە. ڕۆژی دوایی، منی تاوانبار بۆ لەبیر بردنەوەی خەمەکانم ئارەقم خواردەوە و مەستمکرد، قوربان. بۆیە شتێکی ئەوتۆم لەبیر نییە. خێزانیشم دای لە پڕمەی گریان ـ زۆرم هاوسەرەکەم خۆش دەوێ، قوربان. ـ چووم، ئەوی پارەم لە گیرفاندا بوو دام بە ئارەق و شەڕاب، بۆ ئەوەی خەمەکانمی پێ تەفروتوونا بکەم. لەبەر ئەوەش لێم دڵمەند مەبە، قوربان، لە ڕووسیا پیاوانی ئارەقخۆر چاکترین پیاوانن. بەڵێ چاکترین پیاوان لە نێو ئێمەدا ئارەقخۆرە لە زەبرەکانن. مەگین لە خەودا ئیلۆشام لەبیر چووبێتەوە. ئەو ڕۆژە منداڵەورتکە زۆریان ئازاردابوو، گاڵتەیان پێکردبوو، قوربان. وەدوای کەوتبوون و قاویان لێکردبوو: «گسکە کۆڵە، گسکە کۆڵەی باوەگیانیان گرتی و لە مەیخانەیان دەرکێشا. تۆش هەڵاتی و پاڕایەوە، بەڵام جوابیان نەدایەوە.»

«ڕۆژی سێهەم کە لە قوتابخانە هاتەوە، دیتم ڕەنگی هەڵبزڕکاوە و ماتە. لێمپرسی: «چییە؟ چ بووە؟!» وەڵامی نەدامەوە. لەو کاولاشەی ئێمەشدا هیچ

قسەیەک بەبێ بەشداریی خێزانم و کچەکان ناکرێ. کچەکانیش هەرڕۆژی یەکەم بە مەسەلەکەیان زانیبوو. باربارانیکۆلافنا لێوی خۆی دەکورۆشت و خۆی دەخواردەوە: «جارێک بووە ئێوەی گەمژە و قەشمەرکارێکی ژیرانە بکەن؟» گوتم: «وایە، قەت بووە کارێکی ژیرانە ئەنجامبدەین؟» بۆ یەکەمجار بەو شێوەیە گێڕامەوە، قوربان. لای ئێوارە بۆ پیاسەکردن کوڕەم بردە دەرێ، با ئەوەش بزانی هەموو ڕۆژێک ئێوارانە دەچین بۆ گەڕان و پیاسەکردن، هەمیشەش لە شوێنێکەوە دەڕۆین. هەر ئەم ڕێگایەی ئێستا پێیدا دەڕۆین - لەبەر درگای ماڵێوە هەتا دەگاتە ئەو گابەردەی کە بە تەنیا لە ڕێگای بەر پەرژینەکان هەڵکەوتووە و نیشانەی دەستپێکردنی چیمەنی شارە و شوێنێکی خۆش و خەڵوەتە، قوربان. من و ئیلۆشا وەک هەمیشە دەستی یەکترمان گرتبوو و دەڕۆیشتین. دەستی چکۆڵە و قامکی باریک و سڕ - لەتاوی ژانی سینگی ئۆقرەی نییە. گوتی: «باوە، باوە!» گوتم: «دەڵێیچی ڕۆڵەگیان؟» تەماشامکرد چاوی پڕبوو لە ئاو. «باوە ئەو ناپیاوە بۆ وایلێکردی؟» گوتم: «ئیلۆشا گیان، بڵێم چی، چیم لەدەستدەهات.» «باوە، مەیبەخشە، قەت مەیبەخشە! لە قوتابخانە دەڵێن لەبەر ئەو کارەی دە ڕۆبڵی پارە پێداوی.» گوتم: «نا، ئیلۆشا بە هیچ شێوەیەک پارەی لێوەرناگرم. ئازای ئەندامم کەوتە لەرزین. بە هەردوو دەستی دەستمی گرت و دیسان ماچیکرد. گوتی: «باوە، باوە، بانگیکە بۆ دوئێل. لە قوتابخانە دەڵێن، تۆ ترسەنۆکی و ناوێری بانگی بکەی بۆ دوئێل و دە ڕۆبڵەکەی لێوەردەگری.» وەڵامم داوە: «ئیلۆشا، ناتوانم بانگی بکەم بۆ دوئێل.» بە کورتی ئەوەی ئێستا بۆ تۆم باسکرد، هەمووم پێگوت. گوێی بۆ شلکردم و گوتی: «باوە، هەرچۆنێکە مەیبەخشە. خۆم گەورە بم بانگیدەکەم بۆ دوئێل و دەیکوژم.» چاوی زیت کردەوە و بریقەی هات. هەڵبەت منیش باوکیم و دەبوو شتێک بڵێم. گوتم: «پیاو کوشتن گوناحە، تەنانەت لە دوئێلیشدا.» گوتی: «باوە، با گەورە بم، دەیدەم بە زەویدا، شمشێرەکەی لێدەستێنم و نووکی شمشێرەکە لە سەر قوڕقوڕاچکەی ڕادەگرم و دەڵێم: دەتوانم بتکوژم، بەڵام دەتبەخشم.» دیوتە لە ماوەی دوو

ڕۆژدا لەو زەینە چکۆلەیدا چەندەی پیلان داڕشتووە؛ حەتمەن لە ماوەی ڕۆژدا پیلانی تۆڵە کردنەوەی داڕشتووە و شەوێش هەتا بەیانی پێوەی جینگڵی داوە و بیری لێکردۆتەوە، قوربان.

بەڵام پێرێ بۆم دەرکەوت کاتێک دێتەوە بۆ ماڵێ، لە قوتابخانە زۆری لێدەدەن، ڕاست دەفەرمووی قوربان. ئیتر نایینێرم بۆ ئەو قوتابخانەیە. بیستوومە بەتاقی تەنیا لە هەمبەر تەواوی منداڵەکاندا ڕادەوەستێ و شەڕیان لەگەڵ دەکا. دڵی پڕە لە ڕق و بێزاری - بە گیانی ئەو تاقە کوڕەم زۆر دەترسم. دەترسم خۆی بە کونێکەوە نێ. جارێکی دیکە چووین بۆ پیاسە کردن. لێی پرسیم: «باوە، دەوڵەمەندەکان لە خەڵکانیتر بەهێزترن؟» گوتم: «ئەرێ، ئیلۆشا گیان، لە سەر زەوی هیچکەس بەقەد دەوڵەمەندان بەهێز نییە، کەس دەرەقەتیان نایە.» گوتی: «باوە، من دەوڵەمەند دەبم و دەبمە ئەفسەر و هەموو کەس دەبەزێنم. تێزار خەڵاتم دەکات و دەگەڕێمەوە بۆ ئێرە، ئیتر هیچ کەس پێم ناوێرێ.»... پاشان بێدەنگ بوو بەڵام هەروا لێوی دەلەرزی. گوتی: «باوە، ئێرە زۆر شارێکی ناخۆشە.» گوتم: «ئەرێ، کوڕم وایە، شارێکی باش نییە ڕاست دەکەی.» گوتی: «باوە، با بڕۆین بۆ شارێکی دیکە. شارێکی خۆش، بچین بۆ شارێک، کە خەڵکەکەی نەماننناسن.» گوتم: «ئیلۆشا، دەڕۆین، حەتمەن دەڕۆین. بەڵام خۆ دەبێ بڕێ پارە پاشەکەوت بکەین، دەنا لە شارێکی غەریب لێمان دەقەومێ.» تۆزێ دڵم حەسایەوە کە توانیم ئەو خەیاڵە تاڵانەی لەبیر بەرمەوە و سەرنجی بەرەو لایەکی دیکە ڕاکێشم. لە دنیای خەیاڵدا دەستمانکرد بە کۆچکردن بۆ شارێکی دیکە و ئەسپ و داشقە کڕین و.... «دایکت و خوشکەکانت سواری عارەبانەکە دەکەین و بە شتێک دایان دەپۆشین و وەڕێ دەکەوین. تۆ جارجارە سوار بەو من لە تەنیشتەوە بە پێیان دەڕۆم. چونکە دەبێ ئاگامان لە ئەسپەکەمان بێ، خۆ بەستەزمانە هەموومان ناتوانێ. ئیشەڵڵا ئاوا دەڕۆین و خۆمان لە چنگ ئەو شارە ڕزگار دەکەین.» بەو قسانە دەتگوت شاگەشکە بووە لە خۆشیانا، لە هەموو شتێک زیاتر کەیفی بە ئەسپ و عارەبانەکە ساز بووبوو. چونکە کوڕی ڕووسی لە

نێو ڕەوەی ئەسپدا لەدایکدەبێ و سواریی پێخۆشە. ماوەیەکی زۆر پێکەوە دواین. لە دڵی خۆمدا گوتم: خودایە زۆر شوکور توانیم زەینی بە شتێکی دیکەوە خەریک بکەم و دڵی ئارام بێتەوە.

«ئەمە قسەی پێرێیە، بەڵام دوێشەو هەموو شتێک گۆڕا. بەیانی چووبوو بۆ قوتابخانە، مات و مەلوول هاتەوە بۆ ماڵێ، زۆر مات بوو. لای عەسر دەستیم گرت و چووین بۆ گەڕان و پیاسە. قسەی نەدەکرد. بای دەهات و هەتاو بەدەرەوە نەبوو، هەر لە هەوای پایز دەچوو، تاریک و ڕوون بەسەردا هات هەروا پیاسەمان دەکرد. هەردووکمان مات و بێدەنگ. گوتم: «دەی کوڕەکەم، سەبارەت بە سەفەرەکەمان دەڵێی چی؟» لە دڵی خۆمدا گوتم بەڵکو باسوخواسەکەی ڕۆژی پێشووی وەبیر بێنمەوە. وەڵامی نەدامەوە. بەڵام هەستمکرد قامکی لە دەستمدا دەلەرزێ. لە دڵی خۆمدا گوتم: پەککو، وادیارە خراپ کەوتووە و شتێکی تازە لە گۆڕێدایە. گەیشتبووینە لای گابەردەکە، هەر ئەم شوێنەی ئێستا من و تۆ لێی ڕاوەستاوین. لە سەر بەردەکە دانیشتم. پۆلێک کۆلارە بە حەواوە دەجووڵانەوە و تێکدەهاڵان، نزیکەی سی دانە دەبوون. هەڵبەت ئێستا کاتی کۆلارە هەڵدانە، قوربان. گوتم: «چاو لێکە، ئیلۆشا، کاتی ئەوەیە ئێمەش کۆلارەکەی خۆمان بێنین و وەحەوای خەین، جا چاکی دەکەینەوە، ئەرێ لەکوێت داناوە؟» وەڵامی نەدامەوە، چاوی لە دوور بڕی و ڕووی لە من وەرگێڕا. لەو کاتەدا گژەبایەک هەڵیکرد و تەپوتۆزی ساز کرد. لە ناکاو خۆی خستە باوەشم و دەستی لە ملم کرد، سەرمی بە سنگی خۆیەوە گوشی، وەک ئەوەی بایەکە بیبات و بیهەوێ خۆی بە من بگرێتەوە. دەزانی کاتێک منداڵ بێدەنگ و غلوور دەبن و کاتێک خەمێکی گەورە دڵیان دادەگرێ، هەوڵدەدەن دان بە خۆیاندا بگرن و نەگرین. بەڵام لە ناکاو تاقەتیان لێدەبڕدرێ و فرمێسک بە چاویاندا دێتە خوارێ، قوربان. بەو سێڵاوی فرمێسکە گەرمە، قوربان، دەموچاوی خووساندم. زووڕە زووڕ دەگریا و وەک شەقشەقە دەلەرزی. دەتگوت گەشکەی لێهاتووە و هەروا کە لە سەر بەردەکە دانیشتبووم، دەیگوشیم بەخۆیەوە. لە پەستاش هاواری

دەکرد: «باوە، باوە، باوەگیان، بۆ ئەو سووکایەتییەی پێدەکردی؟» منیش هۆڕە هۆڕ دەگریام قوربان. لە باوەشی یەکتریدا هەنیسکمان دەدا و دەگریاین قوربان. گوتی: «باوە، باوە.» گوتم: «ئیلۆشان گیان، کوڕە جوانەکەم.» لەو کاتەدا هیچکەس ئێمەی نەدی، قوربان. خودا خۆی ئێمەی دی، هیوادارم ئەوە لە نامەی کردەوەمدا بنووسێ، قوربان. ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، قوربان، ئێمە دەبێ سپاس لە براکەت بکەین. کەوایە قوربان، لەبەر دڵی ئێوە لە ئیلۆشا نادەم و تەمبێی ناکەم، قوربان.»

بە لەبزێکی قێزەون و حەنەکچییانە دەدوا. لەگەڵ ئەوەشدا، ئالیووشا هەستیکرد کە تەواو متمانەی پێکردووە، ئەگەر کەسێکی دیکە بووایە لە جیاتی ئالیووشا، دەیزانی سەروان بە ڕوونی قسە ناکات و ئەوەی دەیڵێ لە دڵەوە نییە. هەر ئەوەش هیوای خستەوە دڵی ئالیووشا کە دڵی پڕبوو بوو هەسێڵی فرمێسکەکانی خەریک بوو کەلاوی دەکرد.

دەنگی هەڵێنا: «ئاخ، چەندەم پێخۆشە لەگەڵ کوڕەکەت ببمە برادەر و هاوڕێ! خۆزگە ئەو کارەت بۆ جێبەجێ بکردایەم...»

سەروان لەبن لێوەوە منجاندی: «بەسەرچاو، قوربان.»

ئالیووشا لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: «بەڵام ئێستا با شتێکی تەواو جیاوازت پێبڵێم. پەیامێکم بۆ هێناوی. هەر ئەو برایەی من، دیمیتری، سووکایەتیی بە دەزگیرانەکەشی کردووە، کچێکی باش و دڵاوایە و ڕەنگە تاریفیشت بیستبێ. هەقی ئەوەشم هەیە باسی ئەو خاتوونە بەڕێزەت بۆ بکەم کە چەندەی زوڵم لێکراوە، لەڕاستیدا ناچارم باسیشی بکەم. چونکە کاتێک بیستی ئەو سووکایەتییە بە ئێوە کراوە، دەشزانێ بارودۆخی ژیانی ئێوە چۆنە، هەر لەڕێوە ڕایسپاردم، ـ کە خێرا ـ ئەم یارمەتییە لەلایەن ئەوەوە بۆ ئێوە بێنم ـ بەڵام تەنیا لەلایەن ئەوەوە، نەک دیمیتریی برام کە وازی لێهێناوە، تەنیا لە لایەن ئەوەوە! خۆزگەی دەخواست و تکای لێدەکردی ئەو یارمەتییە وەرگری... چونکە هەردووکتان لە لایەن کەسێکەوە سووکایەتیتان پێکراوە. ئەو کاتێک ئێوەی وەبیر هاتەوە کە لە لایەن دیمیترییەوە ئەو سووکایەتییەی

پێکرا. سووکایەتییەکی وەک ئەوەی بە ئێوە کراوە، یانی ئاوا زاڵمانە. وەکو خوشکێک دەیهەوێ یارمەتیی براکەی بدات و دەستی بگرێ... پێیگوتم تکاتان لێبکەم ئەم دووسەد ڕۆبڵە وەرگرن و وەک یارمەتییەکی خوشکانە قەبووڵی بکەن. هیچکەسیش لەوە ئاگادار نییە، دڵنیابە هیچکەسیش نازانێ و قاوی بڵاو نابێتەوە. ئەمەش دووسەد ڕۆبڵەکە و سوێندت دەدەم کە وەریبگری، ئەگەر تەواوی خەڵکانی سەر زەوی دوژمنی یەکتر بن، هێشتا چەن کەسی باش هەر پەیدا دەبن.... ئێوە دڵێکی گەورەتان هەیە... دەبێ ئەوەش بزانی و تێبگەی.»

ئالیووشا دوو گەڵای شەق و تازەی گوڵ لە پشتی بۆ ڕاگرت. هەردووکیان لە پەنا گابەردی لای تەیمانەکە ڕاوەستا بوون. هیچکەسیش لەو نزیکانە دیار نەبوو. وا دیاربوو ئەو دوو گەڵا پارەیە شوێنێکی سەیری لە سەر سەروان داناوە. داچڵەکی، بەڵام سەرەتا لەبەر سەرسووڕمان، بە هیچ شێوەیەک بڕوای نەدەکرد دەمەتەقێکەیان ئاکامێکی ئاوای هەبێ. هیچ شتێک بەقەد وەرگرتنی ئەو یارمەتییە لە خەون و خولیاکانی دوور نەبوو ـ ئەویش ئەو گوژمەیە! پارەکەی وەرگرت، و هەتا ماوەیەک تاسا، بە شێوەیەکی تازە ڕەنگی ڕوخساری گۆڕا.

ـ ئەوە بۆ من؟ ئەو هەمووە پارەیە ـ دووسەد ڕۆبڵ! خودایەگیان! لەم چوار ساڵەی ڕابردوودا ئەوەندەم پارە بەخۆمەوە نەدیوە! خودای گەورە! دەشڵێ هی خوشکێکە... یانی خەون نابینم، ئەوە ڕاستە؟

ئالیووشا بە بزەیەکەوە گوتی: «سوێندت بۆ دەخۆم ئەوەی گوتم هەمووی هەقیقەتە.» سەروان سوور هەڵگەڕا.

«گوێ بگرە، قوربان. تۆ گیانی من، گوێم لێبگرە قوربان، ئەگەر وەری بگرم، وەک کەسێکی خوازەڵۆک و هیچوپووچ چاو لێناکرێم؟ ئالکسی فیۆدۆرۆویچ بە بڕوای ئێوە پێی سووک نابم؟ ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، گوێ بگرە قوربان گوێ بگرە.» ئەوەی گوت بە هەردوو دەستی ئالیووشای گرت. «هانم دەدەی وەری بگرم و دەڵێی خوشکێک بۆی ناردووم، بەڵام ئەگەر

وەری بگرم، لە ناخەوە، لە دڵەوە، سووک نابم لەبەر چاوت و لێم وەڕەز نابی؟ قوربان، ها؟»

ـ نا، نا، سوێندت بۆ دەخۆم، بە ئیمانم، خەمت نەبێ، هیچکەسیش جگە لە من لەوە ئاگادار نییە و نابێ ـ من و تۆ و ئەو و ژنێکی دیکەش کە دۆست و هاوڕێی گەورەی ئەو خاتوونەیە.

«کارت بە سەر ئەو خاتوونەوە نەبێ! گوێبگرە، ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، لە ساتێکی وەک ئێستادا دەبێ گوێم لێبگری، قوربان، چونکە تۆ نازانی ئەو دووسەد ڕۆبڵە بۆ من لە کاتێکی وەک ئێستادا یانی چی وچ جێیەک دەگرێ.» قسەی ئەو کابرا بێچارەیە وردە وردە دەشێواو خەریک بوو خولیا بوونێکی وەحشیانەی بە خۆیەوە دەگرت. تووشی شڵەژانێکی سەیر بووبوو و زۆر خێرا و بەپەلە دەدوا، دەتگوت دەترسێ نەهێڵن هەموو قسەکانی دەربڕێ.

«بێجگە لە وەدەستهێنانی شەرافەتمەندانەی ئەو پارەیە لە لایەن «خوشک»ێکەوە، خوشکێکی ئاوا بەڕێز و مەزن، ئێستا دەتوانم لە خێزانم و نینا و ئەو کچە فریشتە پشت چەماوەیەم، ئاگاداریبکەم. دوکتۆر هیرتێزنێستیۆب دڵی پێمسووتا و هات بۆ ماڵەکەم، ماوەی سەعاتێک هەردووکیانی معاینە کرد و گوتی: «تێناگەم.» بەڵام جۆرێک ئاوی گراوی بۆ نووسین کە لە دووکانی عەتارییەکانی ئێرە وەدەستدەکەوێ. گوتی: ئەوە بۆ حاڵیان باشە. برێ دەوا لە نێو ئاوەکە بکەن و خۆیانی پێبشۆن. ئاوکانەکە بایی سێکۆپکە و نزیکەی چل بترییان لەو ئاوە پێویستە؛ منیش پسوولەکەم هەڵگرت و لە سەر ڕەفەکە لە ژێر پەیکەرەکاندا شاردەمەوە، و ئێستاش هەر لەوێیە. دەستووری دا نینا بەو ئاوە ڕۆژی دووجار بەیانی و ئێوارە خۆی بشوا. بەڵام کوا لەو کاولاشە بێ جێ‌وڕێیەماندا دەتوانین ئەو کچۆڵە بەستەزمانە تیمار بکەین، قوربان. چونکە نە حەماممان هەیە، نە ئاومان هەیە و نە کڵفەت و یاریدەریشمان هەیە. نینای بێچارەش ژان سەرتاپای ماسوولکەکانی لەشی داگرتووە. هەتا ئێستاش پێموانییە ئەوەم بۆ باس کردبێتی. شەوانە لای ڕاستەی بە چریکە دەوێستێ و بە دەم ئازارەوە جینگڵ

دەدا. ئەو فریشتە بەستەزمانە هەتا بەیانی دان بە جەرگی خۆیدا دەگرێ و ئەو ژانە تامڵ دەکا، لەوە دەترسێ ئێمە خەوەکەمان لێ بزڕێ. هەر شتێکمان دەستبکەوێ دەیخۆین و ئەو بەردەماوەکەمان دەخوا، خۆراکێک کە بۆ سەگی دانێی نایخوا. "من شیاوی ئەوش نیم، ئەو بەردەماوەش لە من زیادە، چونکە من سەربازی ئێوەم، " ئەوە قسەی ئەو فریشتە چاوڕەشەیە و هەوڵدەدا بە چاوانی بیدرکێنێ. بە ئەرکی سەرشانی خۆمی دەزانم خزمەتی پێبکەم، بەڵام ئەو پێی‌خۆش نییە. "من کچێکی نوقستان و هیچوپووچم و بەکاری هیچکەسێ نایەم." پێیوایە شیاوی هیچ شتێک نییە، قوربان. بەڵام بەوخووخدە شیرین و فریشتەئاساییەی بۆتە هۆی دڵخۆشیمان و لە ڕاستیدا بەبێ ئەو و بەبێ وتە نەرم و نیانەکانی ئەو ژیانمان لێ تاڵ دەبێ! تەنانەت باربباراش ئاهۆن دەکاتەوە. سەبارەت بە باربارانیکۆلافناش خراپ بیر مەکەوە، ئەویش وەک فریشتە وایە، ئەویش زۆر بەستەزمان و مەزلوومە. هاوینێ هات بۆلامان و شازدە ڕۆبلی هێنابوو کە بە وانە وتنەوە و فێرکاری وەدەستی هێنابوو وپاشەکەوتی کردبوو، تاکو لە مانگی سپتامبردا، یانی ئێستا، پێی بگەڕێتەوە بۆ پترزبۆرگ. بەڵام پارەکەیمان لێوەرگرت و خەرجمانکرد، بۆیە ئێستا پارەی نییە کە پێی بگەڕێتەوە، قوربان. ئەگەرچی بیهەوێ بشگەڕێتەوە، ناتوانێ. چونکە دەبێ وەک کڵفەت کارمان بۆ بکا. وەک ئەسپێکی هێز لێبڕاو وایە کە هەموومانی هەڵگرتبێ. بە هەموومان ڕادەگا. شیووکوڵ و خاوێن کردنەوەیماڵەکە و گسک لێدان لە ئەستۆی ئەوە. خزمەت بە خێزانیشم دەکا و جێوبانەکەی بۆ ڕادەخا و دەیخەوێنێ. خێزانم زۆر وازیوازی و گرینۆک و جینگیزییە، قوربان! چاکە ئێستا بەو پارەیە دەتوانم پێشخزمەتێک بگرم، قوربان. ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، ئێستا دەتوانم دەوا و دەرمانیان بۆ بکڕم، دەتوانم کچە خوێندکارەکەم بنێرمەوە بۆ پترزبۆرگ قوربان. دەتوانم گۆشتی ڕەشەوڵاخ بکڕم و خۆراکێکی باشیان پێبدەم. خودایەگیان دەڵێی خەون دەبینم.!»

ئالیووشا شادی لە دڵی گەڕابوو، کە بووە هۆی دڵخۆشی و بەجێهێنانی ئارەزووی ئەو کابرا هەژار و لێقەوماوە.

سەروان کە لە خۆشیانا پێی وەعەرز نەدەکەوت، بەپەلە دەستیکرد بە قسەکردن و گوتی: «سەبرکە، ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، سەبرکە. دەزانی ئێستا من و ئیلۆشا دەتوانین بە ئارەزوومان بگەین. ئەسپێک و عارەبانەیەک دەکڕین، ئەسپێکی ڕەش. ئیلۆشا پێیخۆشە ڕەش بێ. هەروا کە چەند ڕۆژ لەمەوبەر بڕیارماندا کۆچبکەین. دۆستێکی قەدیمیم هەیە، پارێزەرە لە پارێزگای ک.... قوربان. لە کەسێکی باوەڕ پێکراوم بیستووە، ئەگەر بچم بۆ ئەوێ، لە دایەرەکەی خۆی دامدەمەزرێنێ و دەمکاتە نووسەری نووسینگەکەی. بەشکو ئەو پیاوەتییەم لەگەڵ بکا. نینا و خێزانم سواری عارەبانەکە دەکەم، ئیلۆشا لێیدەخوڕێ و منیش بە پێیان دەڕۆم، ئەگەر بمتوانیبایە یەکێک لە قەرزەکانم بدەمەوە زۆر چاک دەبوو، ڕەنگە بۆ ئەوەش ئەو پارەیە لێم سەروزیاد بێ!»

ئالیووشا دەنگی هەڵێنا: «خەمت نەبێ، هەرچەندەت پێویست بێ کاترینا ئیوانا دەتداتێ. منیش پارەم هەیە، هەرچەندت دەوێ دەتدەمێ. من بە برای خۆت بزانە و وەبزانە لە برای خۆتی وەردەگری. هەروەختێکیش بووت بمدەوە... (دەوڵەمەند دەبی، دەوڵەمەند دەبی، خەم مەخۆ!) ئەوەش کە دەتهەوێ بەرەو پارێزگایەکی دیکە کۆچبکەی زۆر فکرێکی باشە. دەبێتە هۆی دڵ حەسانەوەی خۆت و بە تایبەت کوڕەکەت. ـ پێویستە زۆر زوو بارگەوبنە تێکنێن، بەرلەوەی سەرماو سەغڵەتی زستان بەسەردا بێ. لەگەڵ گەیشتنە ئەوێ، بە نامە ئاگادارمان کەن و بێهەواڵمان مەکەن. ئێمە تازە هەتاهەتایە برای یەکتر دەبین... ئەوەش ڕاستە و خەون نییە!»

ئالیووشا لە خۆشیاندا دەیویست باوەشی پێدابکا. بەڵام چاوێکی لێکرد و لەجێی خۆی نەبزووت. سەروان بە ملێکی باریک و دەمولێوی وشک و بارگرتوو و ڕەنگێکی بزڕکاوەوە شێتانە ڕاوەستابوو، لێوی دەلەرییەوە و

دەتگوت دەیهەوێ شتێک بڵێ. دەنگی دەرنەدەهات، بەڵام لێوی لە پەستا دەجووڵا، لەبەرخۆیەوە قسەیدەکرد. زۆر سەیر بوو.

ئالیووشا، بە سەرسوڕمانەوە لێی پرسی: «چبووە؟»

سەروان دەتگوت زمانی لەگۆ چووە، بە شێوەیەکی سەیر و سەمەرە و وەحشی، چاوی زەق کردبۆوە و وەک ئەوەی لەو بڕیارە ناهومێد بووبێ لە ئالیووشای دەڕوانی، لەبەر خۆیەوە گوتی: «ئالکسی فیۆدۆرۆویچ.... من.... ئێوە، « هەر لەو کاتەدا بزەیەکی مانادارى هاتێ. «من، قوربان... ئێوە، قوربان... پێتخۆشە فێڵێکی چکۆڵە دەزانم، نیشانتیبدەم، قوربان؟» ئەوەشی کتوپڕ بە سرتەیەکی توند و خێرا و بە دەنگێکی پیاوانە دەربڕی.

- فێڵی چی؟

سەروان گوتی: «فێڵێکی جوان.» دەمی بۆلای چەپە خوار دەکردەوە، چاوی چەپەی بۆ سەرێ زەق کردبۆوە و لە ئالیووشای دەڕوانی.

ئالیووشا ترسی لێنیشت، لەپڕ گوڕاندی: «ئەوە چییە، شێت بووی، فێڵی چی؟»

سەروان لە ناکاو گوڕاندی: «جوان، تەماشاکە.» ئەو دووسەد ڕۆبڵەی کە لە ماوەی مشتومڕەکەیاندا لەنێوان قامکەکەڵە و زەرنەقووتەیدا بوو، بە توندی گرمۆڵەی کرد و لە قولەمیچەی دەستە ڕاستیدا گوشیی.

تووڕە و ڕەنگ بزڕکاو گوڕاندی: «دیتووتە قوربان، دیتووتە؟» لە ناکاو دەستی ڕاوەشاند و پارە گرمۆڵەبووەکەی فڕێدایە سەر خیزەکە. دیسان ئاماژەی پێکردن و نەڕڕاندی: «دیتووتە قوربان؟ چاو لەوێ بکە!»

وەک شێت و هار هەڵیکوتایە سەریان و وەبەر پێلاقەی دان و بەدەم پێلاقە پێدادان و هەناسەبڕکێوە گوتی:

ــ ئەوەش پارەکەتان قوربان! ئەوەش پارەکەتان، قوربان! ئەوەش پارەکەتان قوربان! ئەوەش پارەکەتان قوربان!

لەناکاو وەک تیسکەی تفەنگ گەڕایەوە و لەبەر دەمی ئالیووشا چەقی و بە قەڵافەتێکی غروور ئامێزەوە دەستی بۆ حەوا هەڵبڕی و هاواریکرد: «بڕۆ بەو کەسانەی تۆیان ناردووە بڵێ، گسکە کۆڵە ئابڕووی خۆی نافرۆشێ.»

پاشان بە توندی وەرسووڕایەوە و هەڵات؛ بەڵام هێشتا پێنج هەنگاو دوور نەکەوتبۆوە، ئاوڕی دایەوە و بە دەستی ماچێکی بۆ ئالیووشا حەوادا. پێنج هەنگاوی‌تر دوور نەکەوتبۆوە، دیسان بۆ دواجار ئاوڕی دایەوە. ئەمجارە ڕوخساری زەردەخەنەی پێوە دیار نەبوو، ڕوومەتی بە فرمێسک خووسابوو. بەدەم پرمەی گریانەوە هاواریکرد: «ئەگەر ئەو پارەیەم بۆ ئابڕووچوونمان لە تۆ وەرگرتایە، چم جوابی کوڕەکەم بدایەتەوە؟»

پاشانیش بێ‌ئەوەی ئاوڕ بداتەوە پێی پێوەنا و هەڵات. ئالیووشا بە خەمێکی قووڵەوە چاوی تێبڕی.

ئەوەشمان لەبیر نەچێ هەتا دوایین سات ئەو کابرایە نەی‌زانیبوو پارەکان کرمۆڵە دەکات و تووڕی هەڵدەدا. ئاوڕی نەدایەوە. ئالیووشا دەیزانی تازە ئاوڕ ناداتەوە. ئەویش وەدوای نەکەوت و قاویشی لێنەکرد، چونکە تێگەیشتبوو سەروان بۆ ئەو کارەی کرد. کاتێ لە چاو ون بوو، ئالیووشا پارەکانی هەڵگرتەوە. زۆر چرچ و لۆچ و گرمۆڵە بوون. لە خیز و خۆڵەکە هەڵچەقیبوون و ڕووشابوون، بەڵام نەدڕابوون. ئالیووشا لە سەر لەپی دەستی ڕاستەو پاستەی کردن و چرچولۆچەکەیانی ڕاستکردەوە. وەک پارەی تازە خشەخشیان دەهات. پاشان قەدیکرد، نایە گیرفانی و گەڕایەوە بۆلای کاترینا ئیوانا، تاکو ئاکامی ڕاسپاردەکەی پێ‌ڕاگەیەنێ.

# (١)

## دیاری کردن

مادام خۆخلاکۆف دیسان بەر لە هەمووکەس لووتی بە لووتی ئالیووشادا تەقی. هەڵەشە بوو، ڕووداوێکی گرینگ قەومابوو. دڵەخورپە و نیگەرانی کاترینا ئیوانا بووبووە هۆی بوورانەوەی و پاشان سەری لەگێژەوە هاتبوو، بە چاوانی بە مۆڵەق وێستاوەوە ڕاکشابوو و وڕێنەی دەکرد. کەوتبووە چەقوچۆ، سەرتاپای وەک گڕی تەندوور داییسا. ناردبوویان بە دوای هیرتێزنێستیۆب و پووورەکانیدا. پوورەکانی هاتبوون، بەڵام هیرتێزنێستۆب هێشتا نەهاتبوو. هەموویان چاوەڕێ بوون و لە وەتاغەکەی دانیشتبوون. هەروا بێهۆش بوو، ئەگەر ببێتە تاویاوی مێشک چی!»

مادام خۆخلاکۆف تەواو ترسی لێنیشتبوو، لەپەستا دەیگوت: «جیددییە، جیددی، « وەک ئەوەی هەرچی لەمەوبەر ڕوویداوە جیددی نەبووبێ. ئالیووشا بە دڵەخورپەوە گوێی ڕاگرتبوو، دەیویست دەستبکا بە گێڕانەوەی قسەکانی. مادام خۆخلاکۆف کتوپڕ هەڵیدایە. ئیتر دەرفەتی گوێ ڕاگرتنی نەبوو. تکای لێکرد لەگەڵ لیزا دانیشێ و هەر لەوێ چاوەڕێ بێ.

دەمی بردە بنگوێی ئالیووشا و بە سرتە گوتی: «ئالکسی فیۆدۆرۆویچی خۆشەویست، هەر ئێستا لیزا بەجارێ تووشی واقوڕمانی کردم. کەوتوومە دڵەوڕێزە، هەر ئەوەش بۆتە هۆی ئەوەی لێی خۆش بم. بێهێنە بەرچاوی خۆت، هەرکە تۆ ڕۆیشتی، سەبارەت بەوەی ئەمڕۆ و دوێنێ پێت پێکەنیوە، لە دڵەوە پەشیمانە، ئەگەرچی پێت پێ‌نەکەنیبوو، بەڵکو سەری خستبووە سەرت و ویستبووی سەری ئاشنایەتیت لەگەڵ داخا. بەڵام سەبارەت بەوە زۆر پەشیمانە و بەجارێ دڵی پڕ بووبوو. هەر بۆیە تووشی سەرسووڕمان بووم.

ئەو کاتێک بە من پێدەکەنێ پەشیمان نابێتەوە، هەر جارێ نەقڵ و نەزیلەیەکم بۆ ساز دەکا. زۆر جار پێم پێدەکەنێ، بەڵام ئەمجارەیان زۆر جیددیی دەنواند. سەبارەت بە بیروڕای تۆ بەردەوام خەریکی بیرکردنەوەیە. ئەگەر دەتوانی لێی دڵمەند مەبە و وەڕووی خۆتی مەهێنە. من بە گژیدا ناچم. چونکە کچێکی نازەنین و دڵناسکە، بڕوا بکە زۆریش بەهۆش و گۆشە. هەرتاوێ لەمەوبەر دەیگوت ئالیووشا هاوڕێی سەردەمی منداڵیمە. «گەورەترین هاوڕێی سەردەمی منداڵی.» ـ بیری لێبکەوە ـ «گەورەترین هاوڕێ ـ» خاوەنی هەست و هۆشێکی زۆر بەهێزە و لەگەڵ ئەوەشدا ئەو قسانە، شتێکی چاوەڕوان نەکراوە، کە کتوپڕ و بێئیختیار لە زارت دەردەپەڕێ. بۆ وێنە هەر لەم دواییانەدا باسی کاژێکی دەکرد: ئەو کاتەی لیزا منداڵ بوو دار کاژێک لە حەوشەکەماندا بوو، لەوانەیە ئێستاش هەر مابێ: بۆیە پێویست ناکا باسی ڕابردوو بکەم. ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، دارکاژ زۆر وەک مرۆڤ دەچێ، ئەویش وەک مرۆڤ زوو گۆڕانی بەسەردا نایە. گوتی: «دایە، کاتێ بیر لەو کاجە دەکەمەوە، کاجدانم وەژان دەکەوێ، « دەکرا ئەوە بە شێوەیەکی دیکە دربڕێ، چونکە ئەوە وشەیەکی گەوجانەیە. بەڵام قسەیەکی زۆر سەیری سەبارەت بە ئەو کرد کە ناتوانم دووپاتی بکەمەوە. ئەوە هەر لێیگەڕێ، من لە بیر خۆمم بردۆتەوە. دەی جارێ خوداحافیز! وا کەوتوومە دڵەخورپە لەوانەیە شێت بم. ئاخ، ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، لە ماوەی تەمەنمدا دووجار تووشی ئەو شێتی و دڵەخورپەیە بووم. بڕۆ بۆلای لیزا، دڵشادی بکە، وەک هەمیشە.» ڕۆیی بۆلای دەرگای ژوورەکەی لیزا و گوڕاندی: «لیزا، وەرە ئالکسی فیۆدۆرۆویچم بۆ هێناوی، ئەگەرچی ئەو هەموو سووکایەتییەت پێکرد. بەڵام لێت تووڕە نییە و دڵنیابە دڵی گەردی نەگرتووە. بە پێچەوانە زۆری پێسەیرە کە تۆ ئاوات بیر کردۆتەوە.»

ـ سپاس دایەگیان، وەرە ژوورێ ئالکسی فیۆدۆرۆویچ.

ئالیووشا چووە ژوورێ. لیزا تاڕادەیەک شێوابوو و دەست و لاقی تێکەڵ دەهات و دەموچاوی سوور هەڵگەڕابوو. دیاربوو شتێک تووشی

شەرمەزاریی کردووە و مرۆڤ زۆربەیان لەو کاتەدا تووشی ئەو حاڵەتە دەبن. خێرا دەستی کرد بە قسەکردن. دەتگوت لەو کاتەدا ئەم شتانە گرینگییەکی زۆریان هەیە بۆی.

- ئالکسی فیۆدۆرۆوویچ، دایکم باسی ئەو دووسەد ڕۆبڵەی بۆ گێڕاومەتەوە. ئەوەشی پێگوتم کە تۆ بردووتە بۆ ئەو کابرا ئەفسەرە چارەڕەشە... باسی سووکایەتی پێکرانەکەشی بۆ گێڕاومەتەوە... خۆ دەزانی دایکم ئەگەرچی تەواو هۆشی لەسەرەخۆ نییە و جاری وایە لەپڕ هەڵدەبێ و دۆ و دۆشاو تێکەڵ دەکا... کاتێ ئەوەم بیست، دەستمکرد بە گریان. پێمبڵێ بزانم، پارەکەی لێوەرگرتی، حاڵوباڵی ئەو چارەڕەشە چۆن بوو؟

ئالیووشا وەڵامی دایەوە: «ڕاستت دەوێ پارەکەم نەدایە، ئەوەش باسێکی دوور و درێژە.» ئەوەشی جۆرێک دەربڕی کە ئەویش ناتوانێ بیر لە شتێکی دیکە بکاتەوە، جگە لەوەی کە بە ئامانجەکەی نەگەیشتووە. لەگەڵ ئەوەشدا لیزا بە جوانی بۆی دەرکەوتبوو کە ئەویش خۆی گێل دەکا و هەوڵدەدا باسی شتێکی دیکە بکا. ئالیووشا بەرەوڕووی مێزەکە دانیشت. دەستیکرد بە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکە. بەڵام هەر لە سەرەتای قسەکانییەوە خۆی شلوێ نەکرد و بە تەواوی سەرنجی لیزای بۆلای خۆی ڕاکێشا. لە تەنگژە و ئابلۆقەی خەمێکی قووڵدا گیری خواردبوو، بەڵام بە هەستێکی بەهێز و زاڵەوە قسەی دەکرد و توانیی زۆر ورد و بەڕێوجێ بەسەرهاتەکە بگێڕێتەوە. لە ڕابردوودا، لە مۆسکۆ پێیخۆشبوو سەردانی لیزا بکا و کاروبار و ڕووداوەکانی ڕۆژانەی بۆ باسبکا، بیرەوەریی سەردەمی منداڵی و باسی ئەو کتێبانەی کە خوێندبوویەوە، هەمووی مووبەموو بۆ باسدەکرد. هێندێجار دەستیاندەکرد بە خەیاڵپڵاو و نەقڵ و چیرۆکی پێکەنینی و گاڵتەجاڕییان بۆ یەکتر دەگێڕاوە. ئێستا هەردووکیان لە ناکاو هەستیانکرد گەڕاونەتەوە بۆ ڕابردوو، بۆ دوو ساڵ لەمەوبەر لە مۆسکۆ. لیزا بەجارێ کەوتە ژێر کاریگەریی قسەکانی ئالیووشا. بەتایبەت کاتێک بە ئیحساسێکی گەرمەوە باسی ئیلیۆشچکای بۆ کرد. کاتێک لە کۆتایی قسەکانیدا گوتی ئەو کابرا

چارەڕەشە پارەکەی فڕێداوە و پاشان وەبەر پێلاقەی داوە، لیزا بێئیختیار دەستی کێشا بەڕانی خۆیدا و هاواریکرد:

- پارەکەت پێنەدا! بۆ هێشتت هەڵێ؟ خۆشەویستەکەم نەدەبوو بهێڵی هەڵێ!

ئالیووشا، بە خەمباری لە سەر کورسییەکەی هەستا و بە نێو ژوورەکەدا دەستیکرد بە ڕاوێچکە کردن و گوتی: «نا، لیزا، چاکتر کە وەدوای نەکەوتم.»

ـ چۆن؟ بۆ باش بوو؟ ئێستا نانیان نییە بیخۆن و دەبێ دەستیان لێدابشۆین.

ئالیووشا، خەمبارانە بە نێو ژوورەکەدا دەهات و دەچوو، گوتی: «نا وا نییە، هەرچۆنێک بێ ئەو دووسەد ڕۆبڵەیان بەدەستدە گەیەنم. سبەینێ بە دەستیان دەگا، دڵنیابە سبەینێ وەری دەگرن.» لە ناکاو لەبەر دەمی لیزادا ڕاوەستا ودرێژەی بە قسەکانی دا: «دیوتە لیزا چ دەستەگوڵێکم بە ئاودا دا، بەڵام ئەوەشم لەبەر بەرژەوەندی و چاکەکاری بوو.»

- کام دەستەگوڵ، کام چاکەکاری؟

- پێتدەڵێم، ئەو مرۆڤێکی خۆ بەکەم زانە و خووخدەیەکی لاوازی هەیە. زۆری چەرمەسەرێ و کوێرەوەری دیتووە و لەگەڵ ئەوەشدا زۆر ڕۆحسووک و ڕووخۆشە. پێمسەیرە بۆ وا کتوپڕ دڵی گەردی گرت و گۆڕانی بەسەردا هات، چونکە دڵنیام هەتا دوایینسات خۆشی نەیدەزانی پارەکان تووڕهەڵدەدا و وەبەر پێلاقەیان دەدا، ئێستا بۆم دەرکەوتووە زۆر شت هەبوو کە ئەوی تووشی ئەو حاڵەتە کرد... بەو حاڵوباڵەشەوە جگە لەوە هیچیتری بۆ نەدەکرا... پێموایە بۆیە وا تێکچوو لەبەر چاوی من سەبارەت بەو پارەیە گەشابۆوە و خۆشحاڵیی دەربڕیبوو و نەیتوانیبوو شادییەکەی بشارێتەوە. ئەگەرخۆشحاڵ نەبوایە، کە زۆریش نەبوو؛ ئەگەر دەرینەبڕیبایە، ئەگەر وازی وازی بوایە و بڕوبیانووی بهێنایەتەوە، هەر ئەو کارەی خەڵکی دیکە لە کاتی وەرگرتنی پارەدا دەیکەن، دەکرا ڕۆنی وەرگرتنی ئەو پارەیە لە لەشی خۆی هەڵساوێ. بەڵام شادییەکە زۆر سادقانە بوو و هەر ئەوەش بووە هۆی ئەوەی هەست بە شەرمەزاری و پەشیمانی بکا. لیزا، نازانی چەندە

مرۆڤێکی سادە و سادقە - گرفتەکەش هەر لەوەدایە. لە تەواوی ماوەی قسەکانیدا، بە دەنگێکی لاواز و لەرزۆک دەدوا. نازانی چەندە بەپەلە قسەیدەکرد و چۆن پێدەکەنی، پێموا دەشگریا - باسی کچەکانی خۆی دەکرد - باسی ژیان و بارودۆخی ژیانی لە شارێکی دیکە دەکرد... کاتێ هەموو کولۆکۆی دەروونی خۆی هەڵڕشت و لەوەیکە شاراوەترین چەمک و لایەنەکانی ژیانی خۆی ئاشکرا کردبوو، هەستی بە شەرمەزاری دەکرد. هەربۆیە لەڕێوە منی لەبەر چاو کەوت. ئەو کەسێکی هەژار و دەستتەنگ و دڵناسکە. ئەوەی زیاتری تووشی شەرمەزاری کردبوو، ئەوەبوو کە زۆر زوو تەسلیم بوو و منی وەک دۆستی خۆی وەرگرت.

سەرەتا هێندەی نەمابوو ئاوقام بێ و هەوڵدا بمترسێنێ، بەڵام هەرکە چاوی بە پارەکە کەوت. باوەشی پێداکردم و لە پەستا دەستی دەگوشیم. پێموا لەبەر ئەوە بوو هەستی بە سووک بوونی خۆی دەکرد و منیش لەو کاتەدا ئەو شەکرەم شکاند. لە ناکاو پێمگوت ئەگەر پارەی بە دەستەوە نییە، ماڵی بچێتە شارێکی دیکە، پارەی پێدەدەین و لەڕاستیدا پارەی خۆمی دەدەمێ، هەرچەندێکی پێویست بێ. هەر ئەوەش بووە هۆی سەرسووڕمانی. بیری کردەوە بۆ من دەمهەوێ یارمەتیی بدەم؟ دەزانی، لیزا، بۆ کەسێک کە ئازار و کوێرەوەریی دیبێ، زۆر دژوارە تێبگا خەڵکی چۆنی چاو لێدەکەن و لەوانەیە خۆیان بە خاوەن بژیوی بزانن.... ئەوەم بیستووە، باوە زووسیما بۆی باس کردووم. نازانم چۆنی دەربڕم، بەڵام خۆشم زۆرجار ئەوەم دیتووە. خۆشم بە تەواوی هەست بەو شتە دەکەم. لە هەمووشی خراپتر ئەوەیە، ئەگەرچی هەتا دوایینسات نەیدەزانی پارەکان تووڕ هەڵدەدا، بەڵام لە دڵیدابوو کە ئەو کارە دەکا، لەوە دڵنیام. هەر ئەوەش ئەوی ئاوا تووشی شادی کرد. دڵی خەبەری دابوو... لەگەڵ ئەو هەموو خەم و ئازارەشدا تەنیا ڕێگای بەرژەوەندی ئەوە بوو. لە ڕاستیدا پێموایە هەلی لەوە چاکتر هەڵنەدەکەوت.

لیزا کە بە واق و ڕمانێکی لەڕادەبەدەرەوە چاوی لە ئالیووشا بڕیبوو دەنگی هەڵێنا: «بۆ، بۆ هەلی لەوە چاکتر هەڵنەدەکەوت؟»

- چونکە ئەگەر پارەکەی وەرگرتایە، سەعاتێک دوای گەیشتنەوە ماڵێ لە شەرمانا دەکەوتە گریان، بەڵێ دڵنیام وا دەبوو. بەیانی زوو خۆی دەگەیاندە لای من و ڕەنگە پارەکانی بۆ فڕێ بدایەم و وەبەر پێلاقەی بدایەن. هەر ئەو کارەی ئەمڕۆ کردی. بەڵام ئێستا بە غروور و سەربەرزییەوە چۆتەوە بۆ ماڵێ، ئەگەرچی دەزانێ «خۆی زایە کردووە». بۆیە ئێستا هیچ شتێک لەوە ساناتر نییە کە سبەینێ هانیبدەم ئەو دووسەد ڕۆبڵە وەرگرێ، چونکە ئیتر بەرگریی لە ئابڕووی خۆی کردووە و پارەکەی تووڕ هەڵداوە و پێشێلی کردووە... کاتێک ئەو کارەی کرد، نەیدەزانی سبەینێ دیسان بۆی دەبەمەوە، چونکە دەزانم زۆری ئەو پارەیە پێویستە. ئەگەرچی ئێستا بەخۆی دەنازێ، تەنانەت هەر ئەمڕۆ لە دڵی خۆیدا دەڵێ چۆن خۆم لەو یارمەتییە گەورە بێبەش کرد و لەکیس خۆمم دا. شەوێ زیاتر لە هەموو کاتێ، بیری لێدەکاتەوە و خەونی پێوە دەبینێ. هەتا سبەینێ لەوانەیە پەشیمانبێتەوە و بە هەڵەداوان بێ بۆلام و داوای لێبوردن بکا. ڕاست لەو کاتەدا منیش هەڵدەدەمێ و دەڵێم: «فەرموو، تۆ مرۆڤێکی لەخۆباییت. بۆم دەرکەوت. بەڵام ئێستا ئەو پارەیە وەرگرە و لە ئێمەش ببوورە!» دەزانم ئەو کاتە وەریدەگرێ!

ئالیووشا لەگەڵ وتنی ئەو قسانە، هێندەی هەست بە شادی دەکرد دەتگوت ڕۆنی قازت لێداوە. «دەزانم ئەو کاتە وەریدەگرێ!» لیزا دەستی بەیەکدا دا.

- بەڵێ، ڕاست دەکەی! ئێستا بە تەواوی تێگەیشتم. ئاخ، ئالیووشا، تۆ چۆن ئەو هەمووە دەزانی؟ بەو گەنجییە ئاوا لەگەڵ ڕاز و نهێنی ناخ و دڵ ئاشنای... من قەت سەرم لەو شتانە دەرناچێ.

ئالیووشا بەوپەڕی شادییەوە درێژەی بە قسەکانی دا: «ئێستا گرینگ ئەوەیە پێی بسەلمێنین ئەگەر ئەو پارەیەشمان لێوەرگرێ، هاوشانی ئێمەیە و زۆریش لە ئێمە زیترە.»

ـ ئالکسی فیۆدۆرۆویچ «لە ئێمە زیتر» دەستەواژەیەکی جوانە. دەی درێژەی پێبدە، درێژەی پێبدە!

ـ مەبەستت ئەوەیە دەستەواژەی «لە ئێمە زیتر» لە زماندا نییە؛ بەڵام گرینگ نییە چونکە....

«ئەیەڕۆ، نا، نا، دەزانم گرینگ نییە. ئالیووشای بەڕێز، بمبوورە... دەزانی هەتا ئێستا چەندم ڕێز بۆ دادەنای ـ یانی ڕێزم بۆ دادەنای ـ وەک هاوشان؛ بەڵام ئێستا بە شێوەی لەخۆم زیتر ڕێزت بۆ دادەنێم.» بە هەستێکی ئاگرینەوە گوتیشی: «لە قسە بێ سەروبەرەکانم دڵمەند مەبە. من بوونەوەرێکی بێکەڵک و گچکەم، بەڵام تۆ، تۆ! گوێ بگرە ئالکسی فیۆدۆرۆویچ. لە هەموو بۆچوونەکەی ئێمەدا، مەبەستم بۆچوونی تۆ... نا، چاتر وایە ئەوە بە بۆچوونی ئێمە بزانین ـ ئێمە، ئەو، یانی ئەو کابرا چارەڕەشە بە سووک و چرووک نازانین ـ بە بۆچوونی خۆمان ئەو بە کەسێکی ڕۆحزل و سەربەرز دەزانین، وا نییە؟ تەنانەت لەو کاتەشدا کە لێمان ڕوونە پارەکە وەردەگرێ؟

ئالیووشا، وەک ئەوەی خۆی بۆ ئەو پرسیارە ئامادە کردبێ، وەڵامی دایەوە: «نا لیزا، ئەوە بە سووک و چرووکزانین نییە. کاتێ بەرەو ئێرە دەهاتم لە ڕێگا بیرم لەوە دەکردەوە. چۆن دەکرێ ئەوە بە سووک و چرووک زانینبێ، لە کاتێکدا هەموومان وەک ئەو واین. ڕاست وەک ئەو واین. خۆ دەزانی ئێمەش وەک ئەو واین، لەو شیاوتر و چاکتر نین. ئەگەر چاکتر بین، دەبێ ڕاست خۆمان لەجێی ئەو دانێین... تۆ نازانم، لیزا، بەڵام پێموایە من لە زۆر لایەنەوە گیانێکی شەکەت و مەلوولم هەیە، بەڵام ئەو وەک من دڵمردوو نییە و بەپێچەوانە دەروونی پڕە لە هەست و سۆزی جوان... نا لیزا، ئەو بە سووک و چرووک نازانم. دەزانی لیزا، حەزرەتی پیر جارێکیان فەرمووی دەبێ وەک منداڵ ئاگات لە زۆربەی خەڵک بێ و لە تاقمێکیان وەک نەخۆشی لەجێدا کەوتوو ئاگاداری و پەرستاری بکەی.»

ـ ئاخ، ئالکسی فیۆدۆرۆویچی ئازیز، کەوایە وەرە با وەک نەخۆش ئاگاداری لە خەڵک بکەین!

ـ زۆر چاکە لیزا، من ئامادەم. ئەگەرچی سەرتاپای لەشم بە تەواوی ئامادە نییە. هێندێ جار کاسەی سەبرم پڕ دەبێ و برێ لە شتەکان نابینم. تۆ لەگەڵ من جیاوازی.

ـ ئەیەڕۆ، ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، دەنا من باوەڕ ناکەم وابێ. بەڵام زۆریش خۆشحاڵم.

ـ منیش زۆر شادم کە وادەڵێی لیزا.

«ئالکسی فیۆدۆرۆویچ تۆ زۆر پیاوی چاکی. بەڵام هێندێجار خۆت فەرمی دەنوێنی، بەڵام لە ڕاستیدا ڕێزەیەک فەرمی نیت.» لیزا بە ویرەویرێکی بەلەز و توورەوە گوتی: « برۆ بۆ لای دەرگاکە، بە هێواشی بیکەوە، بزانە دایکم خۆی لێگرتووین، یان نا.»

ئالیووشا چوو دەرگاکەی کردەوە و گوتی: نا، کەس لە پشت درگاکە نییە.

لیزا کە جارلەگەڵ جار ڕوخساری سوور هەڵدەگەڕا، درێژەی پێدا: «وەرە بۆ ئێرە، ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، دەستت بدە دەستم ـ ئاوا. دەبێ دان بە شتێکی گەورەدا بنێم، دوێنێ ئەو نامەیەم بە گاڵتە بۆ ناردی، تەواو، تەواو بە جیددی بۆم نووسییت.» پاشان هەردوو دەستی بەبەر چاوییەوە گرت. دیاربوو بەو دان پێنانە زۆر شەرمەزارە.

لەناکاو دەستی ئالیووشای گرت و سێجار لە سەر یەک ماچیکرد.

ئالیووشا بەوپەڕی شادییەوە هاواریکرد: «ئاخ لیزا، چ کارێکی باشت کرد! دەزانی بە تەواوی خاترجەم بووم کە نامەکەت جیددییە.»

«دڵنیام؟ بە شەڕەفم!» دەستی بردە ئەولاوە بەڵام بەرینەدا، بەجارێ سوورهەڵگەڕا و بە خۆشحاڵییەوە زەردەیەکی گرت. «من دەستی ماچدەکەم ئەو دەڵێ: «چ کارێکی باشت کرد.»

سەرزەنشتەکەی زۆر نابەجێ نەبوو، بەڵام ئالیووشا زۆر سەیر خۆی دۆڕاندبوو.

به نەرمی گوتی: «لیزا، پێمخۆشە هەمیشە دڵشادت کەم، بەڵام نازانم چۆن ئەو کارە بکەم.»

- ئالیووشای خۆشەویست، تۆ بێهەست و کەمتەرخەمی. چاو ئەو کابرایە، منی بۆ هاوسەری هەڵبژاردووە و پێی وایە کەڵەبابی خۆی بە لەپەوە لێناوە. دڵنیاشە کە نووسراوەکەم جیددی بووە. ئەو قسەیە! ئەوەش ئەوپەڕی ڕووهەڵماڵدراوییە و نازانم چ ناوێکی لێبنێم جگە لەوە.

ئالیووشا بە پێکەنینێکی کتوپڕەوە پرسیی: پێتوایە بەهەڵە چووم ئەگەر هەست بە متمانە بکەم و لەوە دڵنیا بم؟»

لیزا کە بە حەز و شادییەوە چاوی تێبڕیبوو هاواریکرد: «ئەیەڕۆ، ئالیووشا، وا نییە بەسەری تۆ، پێموایە کارێکی باشیشت کردووە.» ئالیووشا، هەروا کە دەستی لیزای گرتبوو، بەرینەدا و ئارام لەجێی خۆی ڕاوەستا. لە ناکاو دانەوییەوە و لێوی بە لێوییەوە نا و ماچیکرد.

لیزا گوڕاندی: «ئەیەڕۆ، ئەوە بۆ وادەکەی؟» ئالیووشا زۆر بە خۆیدا شکایەوە.

- لیزاگیان بمبوورە نەدەبوو... وادیارە زۆر گەوجم... گوتت بێهەستم، بۆیە ماچمکردی... بەڵام وادیارە خۆم گەوج کرد.

لیزا پێکەنی و دەستی بە دەمووچاوییەوە گرت. «ئەویش بەو جلوبەرگەوە!» بە پێکەنینەوە وەک ئەوەی دوعا بکا دەستی هەڵبڕی. بەڵام لە ناکاو لە پێکەنین کەوت و زۆر جیددی و تا ڕادەیەک خۆی ڕووتاڵ کرد.

- ئالیووشا، دەبێ ماچوموچ وەلانێین. هێشتا ئەو شتە نیم و دەبێ ماوەیەکی دوور و درێژ چاوەڕێ بین. بەڵام پێمبڵێ، تۆ کە ئەوەندە زیرەک و خاوەن فەرهەنگ و تێگەیشتووی، بۆ گەوجێکی وردیلە و گردەنشینی وەک منت هەڵبژاردووە؟ ئالیووشا، من زۆر دڵخۆشم چونکە تەنانەت تۆزقاڵێکیش شیاوی ئەوە نیم.

- من پێموایە هەی و زۆریش. هەر لەم ڕۆژانەدا بە یەکجاری کلێسە بەجێ دەهێڵم. خۆم لە چنگ تەرکەدنیایی دەرباز دەکەم. کاتی ئەوەیە زەماوەند

بکەم. دەزانم، خۆی پێیگوتم زەماوەند بکەم. لە تۆش چاکترم پێشک نایە زەماوەندی لەگەڵ بکەم. هیچکەسی دیکەش جگە لە تۆ شوو بە من ناکا. زۆرم بیر لێکردۆتەوە. گرینگ ئەوەیە تۆ لە منداڵییەوە من دەناسی و تایبەتمەندییەکت هەیە کە من نیمە. تۆ لە من بەڕەحم و دڵۆڤانتری. لە سەروو هەموو شتێکەوە، تۆ لە من بێتاوانتری. من خۆم لەقەرەی زۆر شت داوە.... ئاخ، تۆ نازانی، بەڵام منیش کارامازۆفم. جێی خۆیەتی پێم پێبکەنی و گاڵتەم پێبکەی. ناونیتکەم لێهەڵدەی. هەروا پێبکەنە، زۆرم پێخۆشە ئاوا دەکەی، وەک منداڵی چکۆڵە دەتریقێیەوە. بەڵام وەک شەهید بیر دەکەیتەوە.

- وەک شەهید؟ چۆن؟

- بەڵێ لیزا، ئەو پرسیارەی ئێستا کردت: (بە ڕووشاندنی هەستی ئەو کابرا بەستەزمانە، نەبووباینە هۆی سووکایەتی پێکردنی.) ئەو پرسیارە پرسیاری مرۆڤێکی کوێرەوەری و ئازارچێشتووە... بڕوانە، نازانم چۆنی دەرببڕم، بەڵام هەرکەسێک بیر لەو جۆرە پرسیارانە بکاتەوە توانایی ئازارچێشتنی هەیە. تۆ بە دانیشتن لە سەر ئەو سەندەڵییە تەگەردارەی تایبەتی شەل و گردەنشینان، دیارە بیرت لە زۆر شت کردۆتەوە.

لیزا بە دەنگێکی گڕ و لەرزۆکەوە، کە لە خۆشیانا دەنگی دەرنەدەهات، ورتاندی: «ئالیووشا دەستت بدە دەستم. بۆ دەستت دەکێشییە دواوە؟ گوێ بگرە، با شتێکت پێبڵێم. کاتێ لە کلێسا هاتییە دەرێ چی لەبەر دەکەی؟ چ جلوبەرگێک؟ پێمەکەنە، ڕقیشت هەڵنەستێ، ئەوە بۆ من زۆر گرینگە.»

ـ سەبارەت بە جلوبەرگ بیرم لێنەکردۆتەوە. لیزاگیان تۆ هەرچیت پێخۆش بێ ئەوە لەبەر دەکەم.

- پێمخۆشە کۆتی مەخمەری شینی تۆخ و جلیسقەی سپیی ڕێڕێ لەبەر کەی. کڵاوی چەرمینی خۆڵەمێشینیش لە سەر نێی... دەی ئالیووشا پێمبڵێ بزانم، کاتێ گوتم نووسراوەکەم بە گاڵتە بۆ نووسیوی، باوەڕت کرد و پێتوابوو بەڕاستمە؟

- نا، بڕوام نەدەکرد.

- ئاخ، ئالیووشا، تۆ قەت نایە سەررێ.

- دەزانی چی، لەوە گەیشتبووم کە تۆ دڵت بۆ من دەکورکێنێ، بەڵام وام دەنواند تۆ سەرساردی، دەمویست کارەکەت بۆ ئاسان کەمەوە.

- دەی ئەوە خراپتری کرد! خراپتر و چاکتر لە هەموو شتێک! ئالیووشا، پڕ بەدڵ خۆشمدەوێی. بەر لەوەی ئەمڕۆ بەیانی بێی بۆ ئێرە، بەختی خۆم تاقی کردەوە. لە دڵی خۆمدا گوتم سۆراخی نامەکەم دەگرم، ئەگەر تۆ بە هێوری دەریبهێنی و پێمبدەی. (کە ئەو چاوەڕوانییەشم لە تۆ هەبوو) بۆم دەردەکەوت بێهەست و کەمتەرخەمی و ڕێزەیەک منت خۆش ناوێ، کوڕێکی گەمژە و حەپۆلی و بەکاری هیچ شتێک نایەی و من دۆڕاو و بەهەڵەچووم. بەڵام تۆ نامەکەت لە ماڵێ لێ بەجێمابوو، هەر ئەوەش دڵخۆشی کردم. دەزانم بەقەستی بەجێت هێشت، لەبەر ئەوەی نەمدەیتەوە، چونکە دەتزانی سۆراخی دەگرم! وانییە؟

- ئاخ لیزا، بە هیچ شێوەیەک وانییە. هەر ئێستا نامەکەم پێیە، ئەمڕۆ بەیانی لە گیرفانمدا بوو، هەر لەم گیرفانەمدایە، ئەوەتا.

ئالیووشا بە پێکەنینەوە نامەکەی درهێنا و لە دوورەوە نیشانی دا.

- بەڵام نامەوێ پێتی بدەمەوە. هەر لە دوورەوە چاوی لێبکە.

- دەی کەوایە درۆتکرد؟ بە جلوبەرگی ڕاهیبانەوە درۆتکرد!.

ئالیووشا بە پێکەنینەوە گوتی: «تۆ وایدانێ، بۆیە درۆمکرد، لەبەر ئەوەی نامەکەت نەدەمەوە.» لە ناکاو بە تینوتاوێکەوە گوتیشی: «ڕۆح و گیانم لەلای ئەو نامەیە.» دیسان سوور هەڵگەڕا. «هەتا بمێنم هەروا بەلامەوە شیرینە و وەک ڕۆح و گیانم دەیپارێزم نایدەمە دەست هیچکەسێک!»

لیزا گەشایەوە و بە بزەیەکی شیرینەوە چاوی تێبڕی. هەمیسان بە نەرمونیانی گوتی: «ئالیووشا، چاوێک لە پشت دەرگاکە بکە بزانە دایکم خۆی لێ نەگرتووین.»

- باشە، بەچاوان لیزا گیان، چاوی لێدەکەم؛ بەڵام واچاکترە چاوی لێنەکەم. بۆ پێتوایە دایکت ئەوەندە پەست و چرووکە؟»

لیزا وەک کیژ هەڵبەزییەوە و گوڕاندی: «پەست و چرووکی چی؟ ئەگەر بیهەوێ ئاگای لە کچەکەی بێ، هەقی خۆیەتی، ئەوە ئیتر پەست و چرووکی نییە! با خەیاڵت تەختکەم، ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، ئەگەر ڕۆژێک ببمە دایک و کچێکی وەک خۆمم هەبێ، بە هەقی خۆمی دەزانم خۆی لێبگرم و ئاگام لێی بێ!»

- بەڕاستتە لیزا؟ خۆ ئەوە کارێکی جوان نییە.

- ئاخ خودایە! ئەوە چ پێوەندییەکی بە پەست و چرووکییەوە هەیە؟ ئەگەر گوێی لە دەمەتەقێیەکی ئاسایی بگرتایە، دەکرا بە کارێکی خراپی بزانین، بەڵام کاتێک کچەکەی لە ژوورێکی دەرگا داخراودا لەگەڵ پیاوێکی جحێڵ بە تەنیایە... ئەوەش تێبگە ئالیووشا، ئەگەر شووت پێبکەم، دڵپیسیت لێدەکەم و با ئەوەشت پێبڵێم، نامەکانت دەخوێنمەوە، گیرفانت دەپشکنم، لە ئێستاوە خۆت ئامادە بکە.

ئالیووشا لەبەرخۆیەوە گوتی: «بەڵێ، وایە، ئەگەر ئاوا... بەڵام ئەوە کارێکی باش نییە.»

- ئاخ ئالیووشا گیان، ڕەنگە خوێڕیگەری بێ، هەر لە ڕۆژی یەکەمەوە دەست ناکەین بە شەڕەچەقە. واباشە ڕاستییەکەت پێبڵێم. دەزانم، سیخوڕی و خۆگرتن لە خەڵک کارێکی هەڵە و ناحەزە، بەڵام هەق بە من نییە و تۆ ڕاست دەکەی، بەڵام من دڵپیسیت لێدەکەم.

ئالیووشا بە پێکەنینەوە گوتی: «دەی چۆنت پێخۆشە وا بکە؛ دەزانم هیچت وەچنگ ناکەوێ.»

- ڕاستم پێبڵێ ئالیووشا، تەسلیمی من دەبی؟ سەبارەت بەوەش دەبێ بڕیار بدەین.

- زۆرم پێخۆشە ئەو کارە بکەم، لیزا، دڵنیابە وادەکەم. بەڵام لە کاروباری زۆر گرینگدا نا. تەنانەت ئەگەر لەگەڵیشم هاوڕا نەبی، لە کاروباری گرینگدا ئەرکی خۆم بەجێ دێنم.

«وایە؛ بەڵام با ئەوەشت پێبڵێم ئامادەم نەک هەر لە کاروباری گرینگدا، بەڵکو لە هەموو شتێکدا تەسلیمی تۆبم.» لیزا بەگوڕ و تینێکەوە دەنگی هەڵێنا: «هەر ئێستا ئامادەم سوێند بخۆم ـ لە هەموو شتێکدا و تەنانەت هەتا ئاخری تەمەنم. بە ڕەزایەتی خۆمەوە ئەو کارە بکەم. زۆریشم پێخۆشە! جگە لەوە، سوێند دەخۆم کە سیخوڕی و دڵپیسیت لێنەکەم. تەنانەت تاقە جارێکیش. هیچ کاتێک تەنانەت نامەیەکیشت ناخوێنمەوە. چونکە هەق بەتۆیە و بە من نییە. ئەگەر بۆ سیخۆڕی کردن وەسوەسەش بم، دەزانم ئەو کارە ناکەم، چونکە تۆ بە کارێکی دزێوی دەزانی. تۆ ئێستا ویژدانی منی.... حاڵی بووی ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، بۆ بەینێکە ئەوەندە خەمباری ـ دوێنێش و ئەمڕۆش؟ دەزانم دڵەخورپە و گرفتاریت زۆرە، بەڵام تێگەیشتووم جگە لەوانە پەژارە و خەمێکی تایبەتیت هەیە، خەمێکی نهێنی، ڕەنگە!»

ئالیووشا بە لەبزێکی خەماوییەوە وەڵامی دایەوە: «وایە، لیزا خەمێکی شاراوەم هەیە. دەزانم خۆشتدەوێم، چونکە هەستمپێکردووە.»

لیزا بە ترس و لەرز و دڵەکوتەوە پرسیی: خەمی چی؟ سەبارەت بەچی؟ دەتوانی پێمبڵێی؟»

ئالیووشا بە حەپەساوی گوتی: «لیزا، دوایی پێتدەڵێم ـ پەلەمەکە. ئێستا ڕەنگە نەتوانی لەوە تێبگەی ـ ڕەنگە منیش نەتوانم ئەوەی لە دڵمدایە دەریببڕم.»

ـ براکانت و باوکت بوونە هۆی ئەو نیگەرانییەت!

ئالیووشا، خەمبارانە ورتاندی: «بەڵێ، براکانیشم.»

لیزا کتوپڕ دەنگی هەڵێنا: «ئالیووشا، زۆرم ڕق لە ئیوان فیۆدۆرۆویچی براتە.»

ئالیووشا ئەو قسەیەی پێسەیر بوو، بەڵام وەڕووی خۆی نەهێنا و هیچ وەڵامێکی نەدایەوە.

ـ براکانم خەریکن یەکتری دەخۆن، هەربینا خۆشیان و باوکیشمیان لە نێو برد و عالەمێکیشیان بەخۆیانەوە بەقوڕدا بردە خوارێ. چەنڕۆژ

لەمەوبەریش باوە پایسی ئەوەی پێگوتم: «وزە و توانای کارامازۆفانەیە.» وزەیەکی دنیایی و تۆسن و هەوسار پساندوو. بڵێی ڕۆحی خودا بە سەر ئەو توانایی و وزانەدا بگەڕێ؟ تەنانەت لەوەش ناگەم. تەنیا ئەوەندە دەزانم منیش کارامازۆفم... من و تەرکە دنیایی! یانی من ڕاهیبم، لیزا؟ هەر ئێستا گوتت من ڕاهیبم.

- بەڵێ، گوتم.

- لەوانەیە هەر ئیمانم بە خوداش نەبێ.

لیزا، نەرم و لەسەرەخۆ گوتی: «ئیمانت نییە؟ مەبەستت چییە؟» بەڵام ئالیووشا وەڵامی نەدایەوە. ئەم وتانەی دواییی شتێکی زۆر نهێنی و زەینیی تێدابوو، لەوەدەچوو بۆخۆشی سەری لێی دەرنەچێ، بەڵام بەوحاڵەشەوە زۆری ئازار دەدا.

- بەڵام لەسەرووی هەموو ئەوانەوە، پیرەکەم، باشترین مرۆڤی دنیا خەریکە دەڕوا، ئەم دنیایە بەجێ دێڵێ. خۆزگە دەتزانی لیزا، چۆنی ڕمووده بووم و خووم پێگرتووە. لەپاش ئەو تەنیا دەمێنمەوە... دێم بۆلای تۆ، لیزا... ژیانی داهاتوومان پێکەوە ڕادەبوێرین.

- ئەرێ، پێکەوە، پێکەوە! لەمەبەدواوە هەمیشە پێکەوە دەبین، هەتا کۆتایی تەمەن دەست لەیەک بەرنادەین. گوێ بگرە ئالیووشا گیان، وەرە ماچمبکە.، ئیزنت پێدەدەم ماچمبکەی.

ئالیووشا ماچیکرد.

«باشە، ئەمجار بڕۆ، خودات لەگەڵ!» پاشان خاچی کێشا. «هەتا زیندووە، خێراکە بچۆ بۆلای. وادیارە دڵڕەقانە ڕامگرتووی. ئەمڕۆ دوعا بۆ هەردووکتان دەکەم. ئالیووشا، ئێمە بەختەوەر دەبین! بە چاوی خۆت دەبینی بەختەوەری ئامێزمان بۆ دەکاتەوە. بڵێی وابێ؟»

- وایە لیزا منیش دڵم خەبەری داوە، بەختەوەر دەبین.

ئالیووشا وای بە باش زانی نەچێ بۆلای مادام خۆخلاکۆف، بێ ئەوەی خوداحافیزیی لێبکا، خەریکبوو لە دەرگاکە دەچووە دەرێ. بەڵام کاتێ

دەرگاکەی کردەوە، مادام خۆخلاکۆف لە هەمبەریا چەقیبوو. لەگەڵ قسەی کرد، ئالیووشا تێگەیشت بەقەستی چاوەڕوان ڕاوەستاوە.

مادام خۆخلاکۆف دەمی هەڵماڵی و گوتی: «ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، چاو و دڵم ڕوون، چاک دەیبڕن و دەشی دوورن. ئەو قسە قۆڕ و منداڵبازاڕییە چییە وەڕێتان خستووە؟ دڵنیابن بە خەونیش نایبینن.... گەوجییەتییە، گەوجییەتی... خەیاڵتان خاوە!»

ئالیووشا گوتی: «بەڵام ئەوە بە لیزا مەڵێ، ئێستا باش نییە ئەو قسەیەی پێبڵێی و دڵی بشکێنی.»

ـ ئامۆژگارییەکی ژیرانە لەلایەن پیاوێکی جحێڵ و ماقووڵەوە. یانی دەفەرمووی لەبەر دڵسۆزی و بەزەیی لەگەڵی ڕێککەوتووی، چونکە نەتدەویست نارەزایەتی دەربڕی و ڕقی هەستێنی؟

ئالیووشا پیاوانە گوتی: «نانا، وانییە، ئەوەی گوتم جیددی بوو.»

ـ شتی وا ئەستەمە و بڕوا ناکەم. ناتوانم بیریشی لێبکەمەوە، ئیتر لەمەبەولاوە ناهێڵم پێت بەوماڵەدا بێ. دڵنیابە لەگەڵ خۆم دەیبەم و ناهێڵم لێرە بێ.

ئالیووشا پرسیی: «جابۆ؟ هێشتا خۆ زۆری ماوە. ڕەنگە ناچار بین ساڵ و نیوێکی دیکە دەست ڕاگرین.»

ـ جوانە، ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، ڕاستدەکەی، بەڵام ئێوە لە ماوەی ئەو ساڵ و نیوەدا هەزارجار شەڕەچەقە وەڕێ دەخەن و لێک جیا دەبنەوە.بۆیە من پێمخۆش نییە و دڵم لەو کارە ئاو ناخواتەوە. ڕەنگە ئەو نیگەرانییەشم لەخۆڕا بێت، بەڵام بۆ من زەبرێکی کاریگەرە. هەستێکی وەک فامیۆسۆفم هەیە، لە دوایین دیمەنی «ئاخ لە ئاوەز[1]»دا. تۆم وەک چاتسکی دێتە بەرچاو و ئەویش وەک سۆفیا، بیهێنە بەرچاوی خۆت، منیش هەڵاتوومە خوارێ بۆ سەر پلیکانەکان بۆ ئەوەی چاوم پێت بکەوێ. لەو شانۆیەشدا دیمەنی پڕ کارەسات لە سەر پلیکانەکان خۆ دەنوێنێ. هەموو شتێکم گوێ لێبوو؛ ئەژنۆم دەلەرزێ

1- شانۆنامەیەکی بەناوبانگی ئا. ئێس. گریبایدۆفە.

و خەریک بوو دەکەوتم بە عەرزیدا. کەوایە باسی شەوانی پڕ لە خۆف و دڵەخورپە و ئازارە ڕۆحییەکانی ئەم دواییانەی ئەوە بوو!ئەوە بۆ کچ بە مانای ئەوینە و بۆ دایک بە مانای مەرگ. هەر لەوانە بوو دستەوبەجێ بە عەرزیدا بچمە خوارێ. بەڵام هێشتا مەسەلەی گرینگم نەهێناوەتە گۆڕێ، وادیارە ئاوتان لە ئاوەڕۆ دەرکردووە. ئەو نامەیە چییە نووسیویەتی؟ خێرا پیشانم بدە، دەی زووکە.

- نا، پێویست ناکا. پێمبڵێ کاترینا ئیوانا حاڵی چۆنە؟ دەبێ بزانم.

- هێشتا خەریکی وڕینە و قسەی هاتەران پاتەرانە. وەهۆش نەهاتۆتەوە. پلکەکانی لێرەن، بەڵام دەستەوەستان بەلایەوە دانیشتوون و هەناسە هەڵدەکێشن. هێرتێزنتسیۆب هات، بەڵام ئەویش ئەوەندەی ترس لێنیشت کە تێدا مابووم چبکەم. هێندەی نەمابوو بنێرم بە شوێن نۆشدارێکدا بێت و پێیڕابگا و ئاگای لێبێ. بە کەژاوەکەی من بردیانەوە بۆ ماڵێ. تۆ و ئەو نامەیەش ئەوە بۆ من بوونەتە دەردی سەرباری دەردان! لەوانەیە بۆ ساڵ و نیوێک هیچ ڕووداوێک نەقەومێ. ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، تۆ ئەو کەسەی ئیمانت پێیەتی، تۆ گیانی ئەو پیرەت کە لە حاڵی گیانکەنشت دایە، ئەو نامەیەم پیشانبدە. من دایکی ئەوم. ئەگەر بڕواشم پێناکەی، هەر بە دەستی خۆتەوە ڕایگرە تا دەیخوێنمەوە.

- نا، کاترینا ئاسپینا، پیشانتنادەم. تەنانەت ئەگەر لیزاش ئیزن بدا، من کاری واناکەم. سبەینێ دێمەوە، ئەگەر پێت خۆش بێ، دەتوانین سەبارەت بە زۆر شتان بدوێین. بەڵام ئێستا دەبێ بڕۆم، خوداحافیز.

ئالیووشا ئەوەی گوتو بە هەڵەداوان لە پلیکانەکان چووە خوارێ و گەیشتە سەر شەقام.

## (٢)

## ئیسمیر دیاکۆڤ بە گیتارەوە

لە ڕاستیدا ئالیووشا دەرفەتی ئەوەی نەبوو کات بەفیڕۆ بدا. تەنانەت ئەو کاتەش کە ماڵئاوایی لە لیزا کرد، ئەو بیرەی بە زەیندا هات کە دەبێ بۆ دۆزینەوەی دیمیتریی برای چارەیەک وەدۆزێ. درەنگوەخت بوو، کاتژمێر لە سێ نزیک بووبۆوە. ئالیووشا فکر و زکری لەلای کلێسە و پیرە کەلەلاکەی بوو. بەڵام دیتنی دیمیتریی لە هەموو شتێک بە گرینگتر دەزانی. وای هەست دەکرد کارەساتێکی گەورە و دڵتەزێن خەریکە دەقەومێ، ئەو هەستەش سات لەدوای سات زیاتر لە زەینی ئالیووشادا ڕەگاژۆی دەکرد. بەڵام ئەو کارەساتە چی بوو؟ لەو کاتەدا چی بە براکەی دەگوت؟ ڕەنگە نەشی توانیبایە دەقودۆغر باسیبکا، «تەنانەت ئەگەر ڕۆژی دەرەکەشم بەبێ من بمرێ، هەموو ماوەی تەمەنم بەو بیرەوە خۆم لۆمە و سەرکۆنە ناکەم، کە بۆچی هیچم لەدەست نەهات و هەروا دەستم لە سەر دەستم دانا و کارێکم نەکرد، زۆر بە پەلە و سەرساردانەش بە پەنایدا تێپەڕیم و چوومەوە بۆ ماڵێ. ئەگەر ئەو جۆرەی کە دڵم دەیهەوێ، کارەکەم بەدەستەوە بێ، ئامۆژگارییە بەنرخەکەی ئەوم لە گوێ گرتووە و بەڕێوەم بردووە.»

پلانەکەی ئەوەبوو دیمیتریی برای خافڵگیر بکا، بە سەر محەجەرەکاندا باز بدات و وەک ڕۆژی پێشوو، بچێتە نێو باخەکە و لە خانە باخەکەدا دانیشێ. ئالیووشا لەبەر خۆیەوە گوتی: ئەگەر دیمیتری لەوێ نەبێ، هەواڵی چوونەکەی بە تۆماس یان ژنانی ماڵەکە ڕاناگەیێنێ و هەروا لە نێو ئەو خانەباخەدا دەمێنێتەوە، تەنانەت ئەگەر ناچاربێ هەتا ئێوارەش لەوێ دانیشێ. ئەگەر وەک پێشوو دیمیتری لە بۆسەی گرووشنکادا بووبێ، زۆر وێدەچێ

هاتبێ بۆ نێو ئەو خانەباخە. لەگەڵ ئەوەشدا ئالیووشا زۆری بیر لە چۆنیەتیی پلانەکەی نەکردەوە، بەڵام هاتە سەر ئەوەی وەدوای کەوێ، تەنانەت ئەگەر ناچاربێ ئەو ڕۆژە نەگەڕێتەوە بۆ کلێسە.

هەموو شتێک بەبێ ڕاوەستان بەڕێوەچوو. هەر لەو شوێنەی ڕۆژی پێشووەوە بە پەرژینەکەدا هەڵگەڕا و بە دزییەوە خۆی کرد بە نێو باخەکەدا. نەیدەویست هیچکەس پێی بزانێ. ژنانیماڵەکە و تۆماسیش، ئەگەر لەوێ بوایەن، لەوانەیە دەرهەق بە براکەی وەفادارییان بنواندبایە و فەرمانیان بەجێ بهێنایە و ئیزنیان نەدایە ئالیووشا پێ بنێتە نێو باخەکەوە، یان لەوانەبوو بە دیمیتری ڕاگەیەنن کەسێک بە دوایدا دەگەڕێ.

خانەباخەکە چۆڵ بوو. ئالیووشا دانیشت و چاوەڕوان ما. چاوێکی لە دارودیوارەکەی کرد و کۆنتر لە پێشووی هاتە بەرچاو. ئەگەرچی ئەمڕۆش هەواکەی وەک دوێنێ خۆش نەبوو، بەڵام ئەمجارە چکۆلە و نەوی هاتە بەرچاوی. گردییەکی چکۆڵە بە سەر مێزەکەوە بوو، بێگومان جێگای پەرداخی پڕ لە براندی بووە و لێی ڕژاوە. بیر و خەیاڵی گەوجانە مێشکی داگرتبوو، بیر و خەیاڵێکی بێجێ و خۆڕایی. وەک ئەوەی پیاو لە چاوەڕوانییەکی پڕ لە خەم و پەژارەدا هەڵبچۆقێ. بۆ وێنە، بە سەرسامی لەخۆی پرسی بۆ ڕاست لە جێگاکەی دوێنێ دانیشتووە و نەچۆتە شوێنێکی دیکە. ئاخری هەستی بە شەکەتی و دڵەدواییەکی زۆر کرد - دڵەدوای ئەو چاوەڕوانی و ئامانجە تەمومژاوییە بوو کە نەیدەزانی بەکوێ دەگا. بەڵام نزیک چارەگێک دوای دانیشتنەکەی، گوێی لە دەنگی ژەنینی گیتار بوو لەو نزیکانەوە دەهات. بیست هەنگاوێک لەولاترەوە، خەڵکی لە نێو دار و دەوەنەکاندا دانیشتبوون. ئالیووشا لەپڕ وەبیری هاتەوە ڕۆژی پێشوو کاتی هاتنە دەرێ لە خانەباخەکە چاوی بە ڕاخەرێکی کۆن کەوتبوو لەلای چەپی دەوەنەکان و پەنا تەیمانەکە ڕاخرابوو. لەوە دەچوو ئێستا خەڵکی لەسەری دانیشتبێتن، هەرواش بوو.

دەنگی گۆرانی چڕینی لاوێک بەرز بۆوە، گیتاری دەژەنی و دەنگی هەڵێنابوو:

*بە دڵێکی پڕ هیواوە*
*لەگەڵ یارم دەستەملانم*
*ئەی خودایە ڕەحمێ بکە*
*بە من و بە ئەو*
*بە من و بە ئەو*
*بە من و بە ئەو!*

گۆرانیبێژەکە بێدەنگ بوو، لە دەنگی پیاوێکی سووک و خوێڕی دەچوو. دەنگێکی دیکەشی هاتە گوێ، دەنگی ژنێکی بەناز و نووز، دەنگێکی دلڕفێن و شەرمێونانە، پرسیی:

- پاول فیۆدۆرۆویچ بۆ ماوەیەکە لێمان ناپرسی؟ چ بووە وا لووتمان پێدا ناهێنی؟

دەنگی پیاوێکی ماقووڵ و بەئەدەب، بەڵام بەویقارێکی پڕ هەیبەتەوە وەڵامی دایەوە: «نا بەهیچ شێوەیەک وا نییە، خاتوون.» دیاربوو ئەو پیاوە خۆی قورس و قایم ڕاگرتبوو، ژنە دەیویست خۆی لە دڵیدا جێبکاتەوە، ئالیووشا لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەو کابرایە بە دەنگیدا لە ئیسمیر دیاکۆف دەچێ. ئەو ژنەش ڕەنگە کچی ئەو ماڵە بێ کە لە مۆسکۆوە هاتوون، هەر ئەو کچەی کە جلوبەرگی کەلبەدوون و ڕیشکۆدار لەبەر دەکا و بۆ سووپ خواردن دەچێ بۆ لای مارتا.»

دەنگی ژنە گوتی: «من زۆرم حەز لە شیعری سەرواداره، بۆ دەستت لە گۆرانی گوتن هەڵگرت؟

پیاوە دەستی پێکردەوە:

***خۆشبێ دڵداری ئازیز***
***تاجی شاهیم بۆ چییە***
***خوایە تۆ ڕەحمێ بکە***
***بە من و بە ئەو!***
***بە من و بە ئەو!***

***بە من و بە ئەو!***

دەنگی ژنەکە گوتی: «ئەوجارەی دیکە خۆشتر بوو، کە گوتت، خۆش‌بێ دڵدارەکەی خۆم.»

«هەواکەشی نەرم و نیانتر بوو. پێموایە ئەمڕۆ لەبیرت چۆتەوە.»

ئیسمیر دیاکۆف لەسەرخۆ گوتی: «خانم، شیعرەکە قۆڕە!»

ـ ئەیەڕۆ وا مەڵێ، من زۆرم حەز لە شیعرە.

ـ خانم هەتا ئەو جێگایەی من بزانم، شیعر شتێکی قۆڕە. بڕوانە کێ قسەی سەروادار دەکا؟ ئەگەر بڕیار بێ هەمووومان قسەی سەروادار بکەین، تەنانەت ئەگەر فەرمانی حکوومەتیشی لە سەر بێ، ناچارین کەمتر قسە بکەین، وانییە؟ ماریاکاندراتیفنا شیعر بەکاری هیچ نایە.

دەنگی ژنە بە شێوەیەکی دڵڕفێنانەترەوە گوتی: «تۆ چەندە وردبین و بەهۆشی! چۆن دەتوانی ئاوا بە ناخی شتەکاندا پچییە خواریێ؟»

ـ خانم، دەمتوانی زۆر لەوەش باشتر بم، دەمتوانی زۆر لەوە زیاتریش بزانم و تێبگەم، ئەگەر ناوچاوانەکەم بیهێنایە و لە منداڵییەوە چارەنووسم ئاوای لێنەهاتایە. ئەگەر ئاوا نەبوایە، هەرکەسێک لەبەر داکەوتن لە داوێنی شتێکی بۆگەن گاڵتەی پێبکردایەم و بە زۆڵی بزانیبایەم، بانگمدەکرد بۆ دوئێل و دەمتۆپاند. لە مۆسکۆش زۆریان ئەوە بە چاودا داومەتەوە. خانم لە سایەی گریگۆری واسیلیەویچەوە ئەو قسەیە لە مۆسکۆش دەنگی دابۆوە. گریگۆری واسیلیەویچ هەمیشە بەهۆی ئەو لەدایکبوونە پڕ تاوانەوە سەرکۆنەم دەکا. دەڵێ: «منداڵدانیت دڕاند، « بەڵام ئەگەر بەر لە لەدایکبوونم بیان کوشتایەم دەستخۆشیم پێ‌دەکوتن، با ئەو دنیایەم هەر نەدیتبایە. لە بازاڕ دەیانگوت، تەنانەت دایکی تۆش وەدوام دەکەوت و بەوپەڕی بێشەرمییەوە دەیگوت تووکە سەری لە گسکە کۆتەرە دەچوو، «بستە باڵا» و خریلە بوو. بەجێی ئەوەی بڵێ کورتە باڵا» بۆ دەیگوت «بستە باڵا»؟ چونکە دەیویست وای‌بنوێنێ کە زۆری بەزەیی پێیدا دێ. واتە فرمێسکی بە درۆی بۆ هەڵدەوەرێنێ. خۆی وەک خەمخۆری دەنواند. وەکو هەستی مرۆڤێکی لادێیی.

کوا لادێییەکی ڕووسی لەچاو مرۆڤێکی خوێندەوار هەست و فامی هەیە؟ بەهۆی نەزانینییەکەوەیەوە بە هیچ شێوەیەک ناتوانین بڵێین خاوەن هەستە. لە سەردەمی منداڵیمەوە هەتا ئەمڕۆ، هەرکاتێ گوێم لە وشەی «بستە باڵا» دەبێ، لەوانەیە لەداخانا شەق بەرم. ماریاکاندرا تیفنا، لە ڕووسیا وەڕەزم و بە دڵ ڕقم لێیەتی.

ـ ئەگەر نیزامی بۆایەی یا سەربازی سوارە نیزام، ئەو قسەیەت نەدەکرد، دڵنیام ئەو کاتە بۆ بەرگری و پاراستنی ڕووسیا سینگی خۆت دەکردە قەڵغان.

ـ ماریا کاندراتیفنا، نامەوێ ببمە سەربارى سوارەنیزام، چونکە ئەو کاتە دەخوازم نیزامی سەربازی لەبەریەک هەڵوەشێنم.

ـ ئەی ئەو کاتە ئەگەر دوژمن هێرشی هێنا، کێ بەرگریمان لێدەکا؟

ـ پێویست بە بەرگری ناکا. ساڵی ۱۸۱۲ ناپلئۆنی یەکەم ئیمپراتۆڕی فەڕەنسا، باوکی ئەم ئیمپڕاتۆڕەی[2] ئێستا، کەوتە خۆ و بە لەشکەرێکی زۆرەوە هێرشیکردە سەر ڕووسیا و ئەگەر بیتوانیبایە دەست بە سەر وڵاتدا بگرێ زۆر باش دەبوو. نەتەوەیەکی تێگەیشتوو بە سەر نەتەوەیەکی زۆر گەوج و نەفامدا زاڵ دەبوو خاکەکەی ئەوی بە خاکی خۆیەوە دەلکاند و ئەو کاتە ئێمە دامەزراوەیەکی تەواو جیاوازمان دەبوو، خانم.

ماریاکاندرا تیفنا، کە زۆر بەناز و غەمزەوە قسەی دەکرد، بە مەکرێکی تایبەتەوە گوتی: «یانی پێتوایە ئەوان لە وڵاتەکەی خۆیان ژیانیان زۆر لە ئێمە چاکترە؟ پێتوایە لە ئێمە پێشکەوتووترن؟ دەنا من چڵێ مووی بۆرە پیاوێکی قرتیی ڕووسی کە دەیناسم، بە سێ لاوی ئینگلیزی نادەم.»

ـ هەرکەس بۆچوونێکی هەیە خانم.

ـ تۆ زیاتر وەک پیاوێکی بیانی دەچی ـ ڕاست وەک بیانییەکی لووت بەرز و بەتەشەخوس. ئەوە بە تۆ دەڵێم، ئەگەرچی بە شەرمەزارییەوە ئەوە دەڵێم.

ـ ئەگەر حەز دەکەی بزانی و ڕاستت دەوێ مرۆڤی ئەوێش و ئێرەش لە شڕ و دڕیدا یەک لەیەک خراپترن و کەس دەسک لە دوویان ناکا. هەموویان

---

2– ناپلیئۆنی سێهەم، هەڵبەت برازای ناپلیئۆنی یەکەم بوو.

فیڵاوی و گزیکارن، خانم. جیاوازییەکەشی لەوەدایە مرۆڤی هەرچی و پەرچیی ئەویٚ پیڵاو و پۆستاڵی بۆیاغکراو لەپێدەکەن. بەڵام مرۆڤی هەرچی و پەرچیی ئێرە لە نێو زبڵوزاڵدا دەتلێنەوە و مێشێکیشیان میوان نییە. ڕووسییەکان قامچی لێدانیان دەوێ، خانم. هەروەک دوێنێ فیۆدۆر پاولۆویچ گوتی و خودا هەڵناگرێ قسەکەشی بەجێیە. ئەگەرچی شێتە و کوڕەکانیشی هەر شێتن.

ـ تۆ خۆت گوتت ڕێزێکی زۆرت بۆ فیۆدۆر پاولۆویچ هەیە.

ـ بەڵام ئەو من بە خوێڕیلەیەکی بۆگەن دەزانێ و پێی وایە ناتوانم کەللەشەقی بکەم. بەهەڵەش چووە. ئەگەر پارەیەکم لە دەستدا بووایە، زۆر لەمێژبوو تێمدەتەقاند. خانم، دیمیتری فیۆدۆرۆویچ خووخدە و ئاکاری لە خوێڕیش خوێڕییانەترە. ئەو سەری لە هیچ شتێک دەرناچێ و لەگەڵ ئەوەشدا هەموو کەس ڕێزی بۆ دادەنێ. من ڕەنگە قوڵە ئاشپەزێک بم، بەڵام ئەگەر نێوچاوانەکەم بیهێنایە دەمتوانی ڕیستۆڕانێک لە پترۆفکای مۆسکۆ بکەمەوە. چونکە دەستاوی من بێوێنەیە و لە مۆسکۆ هیچکەس نییە جگە لە بیانییەکان کە شارەزاییەکی باشی لە ئاشپەزیدا هەبێ. دیمیتری فیۆدۆرۆویچ سواڵکەرێکی خوێڕییە، بەڵام ئەگەر بڕیار بێ لەگەڵ کوڕی کێنت ململانێ بکا و بانگی بکا بۆ دوئێل. بەبێ ڕاوەستان دەچێ. نازانم من چیم لە ئەو کەمترە. خۆ ئەو زۆر لە من حەپۆلترە. ئەوەتا لەخۆڕا ئەو هەموو پارەیەی لە ئاو کرد!

ماریاکاندرا تیفنا لەپڕ گوتی: «ڕەنگە دوئێل شتێکی زۆر باش بێ.»

ـ لە چ لایەنێکەوە پێت باشە؟

ـ لەوانەیە زۆریش مەترسیدار بێ و زۆریش ئازایانە. بەتایبەت کاتێک ئەفسەرانی لاو، دەمانچە بە دەستەوە دەگرن و لەبەر خاتری ژنێک بە یەکترییەوە دەنێن. دیمەنێکی زۆر سەرنجڕاکێش دەبوو ئەگەر ئیزن بدرایە کچانیش لە دوئێلدا بەشداریبکەن، ئەگەر وابوایە من بەشبەحاڵی خۆم بە سەر دەچووم!

- کاتێک تەقە لە کەسێک دەکەی، زۆر خۆشە. بەڵام کاتێک ڕەقیبەکەت ڕاست سێرەی لە دەمت گرتووە، گەوجییەتیی خۆتت بۆ دەردەکەوێ. ماریا کاندراتیفنا، دوو لاقی دیکەش قەرز دەکەی و هەڵدێی.

- مەبەستت ئەوەیە لە کاتێکی وادا خۆت هەڵدێی؟

بەڵام ئیسمیر دیاکۆف گوێی پێنەدا. دوای تاوێک بێدەنگی، گیتارەکەی دیسان کەوتەوە کار و ئەویش هەر بەو هەوایەی پێشوو تێی چریکاند:

*هەرچیت پێخۆشە بیڵێ*

*سەرم هەڵدەگرم، دەڕۆم*

*بەرەو ژیانێکی خۆش*

*بەرەو مەڵبەندێکی دوور*

*سەرم هەڵدەگرم، دەڕۆم*

*با بەس بێ شین و گریان،*

*قەت ناکەم شین و گریان،*

*نامهەوێ شین و گریان.*

بەڵام لەو کاتەدا ڕووداوێکی چاوەڕوان نەکراو قەوما. ئالیووشا لە ناکاو پشمی. هەردووکیان بێدەنگ بوون. ئالیووشا هەستا و ڕۆیشت بۆ لایان. ئیسمیر دیاکۆف جلوبەرگێکی خاوێنی لەبەردا بوو. پۆستاڵی بۆیاغکراوی لەپێ کردبوو. سەر و فۆلکەی چەور کردبوو و دەقی دابوو. گیتارەکەی لە سەر کۆشی دانابوو. هاودەنگەکەی کچی بنەماڵەکە بوو، کراسێکی شینی کاڵی لەبەردا بوو بە لفکە و سۆرانیی درێژەوە. عازەب بوو، ئەگەر ڕوخساری خڕ و شڵە نەبوایە، بەژن و باڵایەکی نالەباری نەبوو.

ئالیووشا زۆر لەسەرەخۆ و سەبوورانە پرسیی: «دیمیتریی برام بەم زووانە دێتەوە؟»

ئیسمیر دیاکۆف بە ئارامی هەستا سەرپێ؛ ماریاکاندرا تینفاش هەستا.

ئیسمیر دیاکۆف، ئارام و بەدەمارانە وەڵامی دایەوە: «من چووزانم! خۆ من پاسەوانی ئەو نیم.»

ئالیووشا لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: «هەروا پرسیم، گوتم ڕەنگە بزانی لەکوێیە!»
- نەخێر نازانم و ناشمهەوێ بزانم، قوربان. - بەڵام دیمیتری پێیگوتم تۆ لە ڕووداوەکانی بنەماڵە ئاگاداری و بەڵێنیشت داوە هەرکاتێک ئاگرافنا ئەلکساندرفنا بێت پێی ڕاگەیێنی.
ئیسمیر دیاکۆف بێئەوەی خۆی شلوێ بکا چاوی تێبڕی و پرسیی:
- دەروازە سەعاتێک دەبێ داخراوە. بفەرموون لەکوێوە هاتنە ژووری؟
«بەسەر شیشبەندەکاندا بازمدا، لە کۆڵانی پشتەوە، ڕاست بەرەو خانەباخەکە ڕۆیشتم.» پاشان ڕووی لە ماریاکاندرا تیفنا کرد و درێژەی بە قسەکانی دا: «هیوادارم بمبوورن. زۆر بەپەلە بووم بۆ دۆزینەوەی براکەم.»
ماریاکاندرا تیفنا بە شانازیی زانی کە ئالیووشا داوای لێبووردنی لێدەکا و بە دەنگێکی زایەڵەدارەوە گوتی: «ئەیەڕۆ، پێتوانەبێ ئەو کارەتانم پێ ناحەزە! چونکە دیمیتریش زۆرجار هەر لەوێوە دێتە نێو باخەکەوە. ئێمە نازانین لێرەیە یان نا، ڕەنگە لە نێو خانەباخەکەدا دانیشتبێ.»
- من زۆر تامەزرۆم بیبینمەوە، تکاتان لێدەکەم ئەگەر دەزانن شوێنەکەیم پێبڵێن، بڕوا بکەن کارێکی زۆر گرینگم پێیەتی.
ماریاکاندرا تیفنا گوتی: «خۆ قەت بە ئێمە ناڵێ.»
ئیسمیر دیاکۆف دیسان هەڵیدایە: «ئەگەرچی وەک برادەرێک دەهاتم بۆ ئێرە، بەڵام دیمیتری فیۆدۆرۆویچ لێرەش بەوپەڕی بێڕەحمییەوە لە پەستا پرسیاری ئەربابم لێدەکا و ئازارم دەدا. دەپرسێ: «خەبەر چییە؟ ئێستا لەوێ چ خەبەرە؟ کێ دێت و کێ دەڕوا؟» چونکە ناتوانم هەواڵی زیاتری پێڕاگەیێنم، تا ئێستا دووجار هەڕەشەی کوشتنی لێکردووم.»
ئالیووشا بە سەرسوڕمانەوە پرسیی: «هەڕەشەی کوشتن؟»
- پێتوایە بەو خووخدەیەوە، کە خۆتان دوێنێ دیتتان، لەو کارانە سڵ دەکاتەوە؟ دەڵێ ئەگەر ڕێگا بە ئاگرافنا ئەلکساندرفنا بدەم شەوێ لێرە بمێنێتەوە، یەکەم کەسم کە سزاکەی دەبینم. قوربان زۆری لێدەترسم، ئەگەر

ئەو ترسەم نەبوایە، پۆلیسم ئاگادار دەکرد. خودا دەزانێ کارێکی بەدەمەوەیە قوربان!

ماریاکاندرا تیفنا گوتی: «جەنابی ئەرباب چەند ڕۆژ لەمەوبەر پێیگوت: وەک ئەسپۆن دەتهارِم!»

ئالیووشا گوتی: «هاهـ ئەگەر کوشتن و هارِین لە گۆڕێدا بێ، گوێی مەدەیە، هەر قسەیە. ئەگەر ببینم، سەبارەت بەوەش لەگەڵی دەدوێم.»

ئیسمیر دیاکۆف وەک ئەوەی تۆزێ گەشبین بووبێ گوتی: «چاکە، تەنیا شتێک کە دەتوانم پێتبڵێم ئەمەیە. من وەک دۆست و هاوسێیەکی دێرین لێرەم و ئەگەر نەهاتبایەم سەیر دەبوو. لە لایەکی تریشەوە، ئیوان فیۆدۆرۆویچ ئەمڕۆ سەرلەبەیانی ناردمی بۆ شوێنی نیشتەجێ بوونی براکەتان لە شەقامی زەریاچە. بەبێ نامە، قوربان، منی ڕاسپارد ئەو پەیامەی پێڕاگەیێنم، کە دیمیتری فیۆدۆرۆویچ لەم ڕیستۆڕانەی نێو بازاڕ دەیهەوێ شێوی لەگەڵ بخوا، قوربان. چووم بەڵام ئەگەرچی سەعات هەشت بوو، دیمیتری لە ماڵێ نەبوو. ژنی خاوەن ماڵەکەیان گوتی: «لێرەبوو، بەڵام لەمێژە ڕۆیشتووە.» قوربان. لەوە دەچێ کەین و بەینێکیان هەبێ. ڕەنگە هەر ئێستا لەگەڵ ئیوان فیۆدۆرۆویچ لە ڕیستۆرانەکە بێ. چونکە ئیوان بۆ شێو نەهاتۆتەوە بۆ ماڵێ و فیۆدۆر پاولۆویچ سەعاتێک لەمەوبەر بە تەنیا شێوی کرد و ڕۆیشت بخەوێ. بەڵام تکات لێدەکەم مەڵێ من ئەو قسانەم بۆ کردووی، چونکە وەک ئاوخواردنەوە دەمکوژێ و حەیاتم لێدەبڕێ قوربان.»

ئالیووشا بەپەلە دووپاتی کردەوە: «ئیوانی برام ئەمڕۆ دیمیتریی بۆ ڕیستۆران بانگهێشت کرد؟»

- بەڵێ قوربان.
- مەیخانەی مترۆپۆلیس لە نێو بازاڕ؟
- بەڵێ بانگهێشتی کردووە بۆ ئەوێ قوربان.

ئالیووشا لەخۆشیانا خەریک بوو شاگەشکە بێ، هاواری کرد: «زۆر ویدەچێ لەوێ بن. سپاس ئیسمیر دیاکۆف. سپاس. هەواڵێکی گرینگت دامێ. هەر ئێستا دەچم بۆ ئەوێ.»

ئیسمیر دیاکۆف قاوی لێکرد: «نەڵێی من پێمگوتووی قوربان.»

- نانا، وا دەچم، پێیان وابێ بە هەڵکەوت ڕێم کەوتۆتە ئەوێ. خەمت نەبێ.

ماریاکاندرا تیفنا هەرای کرد: «ڕاوەستە با درگاکەت بۆ بکەمەوە.»

- نا بە سەر نەردەکاندا باز دەدەم، لەوێوە نزیکترە.

ئەوەی ئالیووشا بیستبووی، بەجارێ ئاراوقارای لێ‌هەڵگرتبوو. بە هەڵەداوان بەرەو مەیخانەکە سەری پێوەنا. بەو جلوبەرگە ڕاهیبانەیەوە چوونە مەیخانەکە نەدەکرا. بەڵام لە درگاکەوە دەیتوانی سۆراخی براکانی بگرێ و بانگیان بکاتە دەرێ. بەڵام لەگەڵ گەیشتنەبەر مەیخانەکە، پەنجێرەیەک کرایەوە و ئیوان قاوی لێکرد.

- ئالیووشا دەتوانی ئێستا بێی بۆلام یان نا؟ ئەگەر بێی زۆرت سپاس دەکەم.

- پێمخۆشە بێم، بەڵام نازانم بەم جلوبەرگەوە...

- من لە وەتاغێکی ئەلاحیدەم. لەو پلیکانانەوە وەرەسەرێ. هەڵێ ئەوە دێم بۆ لات.

دوای تاوێک ئالیووشا لە پەنا براکەی دانیشت. ئیوان بە تەنیا خەریکی شێوخواردن بوو.

## (٣)

## برایان پێکەوە ئاشنا دەبن

بەڵام ئیوان لە وەتاغێکی ئەلاحیدە نەبوو، لە جێگایەک بوو بە پەردە لە وەتاغەکە جیا کرابۆوە. شوێنێک بوو کە هاتوچۆی بەسەرەوە نەبوو و هیچ کەس نەیدەدیتن. یەکەم وەتاغ بوو لەبەر دەرگای هاتنە ژوورەوە، ڕفحەیەک بە دیوارەکەوە بوو. پێشخزمەتەکان وەک خولخولە لەم ژوور بۆ ئەو ژوور هەڵدەسووڕان. تەنیا مشتەرییەک لە وەتاغەکەدا بوو، ئەویش نیزامییەکی پیری خانەنشینکراو بوو لە قوژبنێک دانیشتبوو و چایی دەخواردەوە. بەڵام لە وەتاغەکانی دیکەی مەیخانەکە وەک هەمیشە بەزم و ڕەزم و ژاوەژاوی مشتەری و قاو کردنی پێشخزمەتەکان و دەنگی هەڵپچڕانی سەری بتڵ و تەقوتۆقی تۆپی بیلیارد و دەنگی ئۆرگ و پیانۆ وڵاتی داگرتبوو. ئالیووشا دەیزانی ئیوان کەموایە بێ بۆ ئەو مەیخانەیە و لەسەریەک زۆر کەم هاموشۆی مەیخانە دەکا. لە دڵی خۆیدا گوتی: کەوایە بۆیە هاتووە بۆ ئێرە لەگەڵ دیمیتری قەراریان داناوە لێرە یەکتری ببینن. بەڵام دیمیتری لەوێ نەبوو.

ئیوان دیاربوو زۆر شادە لەوەی ئالیووشای وەگیر خستووە. گوتی: «پێیان بڵێم شفتەی ماسیت بۆ بێنن یان شتێکی دیکە؟ پێموایە تەنیا لەگەڵ چایی نێوانت هەیە.» شێوی کردبوو و خەریکی چایی خواردنەوە بوو.

ئالیووشا بە بزەیەکەوە گوتی: «واچاکە لەپێشدا شفتەی ماسیم بۆ بێنن، برسیمە، پاشان چایی دەخۆم.»

ئەی مرەبای بلاڵووک؟ لێرە هەیانە. لەبیرتە بە منداڵی لە ماڵی پالیۆف چەندت مرەبای بلاڵووک پێخۆش بوو؟

- لەبیرتە؟ کەوایە مرەباش دەخۆم. ئێستاش هەروا پێمخۆشە.

ئیوان بانگی خزمەتکارەکەی کرد و داوای شفتەی ماسی و مرەبا و چایی کرد.

ـ هەموو شتێکم لەبیرە، ئالیووشا. تۆشم لەبیرە ئەو کاتەی یازدە ساڵت تەمەن بوو منیش پازدە ساڵان بووم. جیاوازییەکی وەها لەنێوان پازدە و یازدەدایە کە لەو تەمەنەدا برا هیچکات پێکەوە نابنە هاوڕێ. تەنانەت نازانم تۆم خۆش دەویست یان نا. کە چووم بۆ مۆسکۆ، هەتا چەن‌ساڵی هەوەڵ تۆم هەر لەبیریش نەبوو. ئەو کاتە، کە تۆش هاتی بۆ مۆسکۆ، پێموایە تەنیا جارێک چاومان بە یەکتر کەوت. ئێستاش ئەوە بۆ سێ‌مانگ دەچێ لێرەم و هەتا ئێستا قسەیەکمان لەگەڵ یەکتر نەکردووە. سبەینێ دەمهەوێ لێرە بڕۆم، هەر ئێستا بیرم لەوە دەکردەوە چۆن چاوم پێتبکەوێ و خوداحافیزیت لێبکەم. بەوە چاک بوو خۆت لێرەوە تێپەڕییت.

ـ یانی زۆر تامەزرۆی دیدارم بووی؟

ـ زۆریش، دەمهەوێ بەبێ پێچوپەنا بتناسم و داوا لەتۆش دەکەم من بناسی. ئەو کاتە ماڵئاوایی لە یەکتر دەکەین. پێموایە بەر لەجیابوونەوە لە خەڵکی، چاکتر وایە بیانناسین. سەرنجم داوی لەو چەند مانگەدا چۆنت چاو لە من دەکرد. نیگایەکی بەردەوام و پڕ لە داوام لە چاوتدا دەدی. من خۆ لەبەر ئەو ڕوانینە ڕەمزاوییانەتدا ناگرم. هەر بۆیە لە تۆ دوورەپەرێز کەوتووم. لە دڵی خۆمدا دەمگوت ئەو پیاوە وردیلانەیە قورس و قایم ڕاوەستاوە. ئەگەرچی پێدەکەنم، بەڵام دڵنیابە بەڕاستمە. تۆ قورس و قایم ڕاوەستاوی، وانییە؟ زۆرم ئەو کەسانە خۆشدەوێ کە ئاوا قورس و قایم ڕادەوەستن. جا پاڵەپشتییان هەرچی هەیە با ببێ. تەنانەت ئەگەر کەسانێکی وەک تۆ وردیلەش بن. چاوانی پڕ لە داخوازییان ئیتر ئازارم نادەن. پاشان عاشقی ئەو چاوانەت بووم. ئەو چاوە پڕ داخوازییانەت ئالیووشا. وادیارە لەبەر هۆیەک خۆشت دەوێم. وایە؟

ـ من بەڕاستی خۆشم دەوێی، ئیوان. دیمیتریی برام سەبارەت بە تۆ دەڵێ ـ ئیوان گۆڕاوە! من دەڵێم ئیوان مەتەڵێکە بە کەس هەڵنایە. بەڵام ئێستا شتێک سەبارەت بە تۆ دەزانم، کە هەتا ئەمڕۆ بەیانی نەمدەزانی.

ئیوان پێکەنی و گوتی: «چییە؟»

ئالیووشا پێکەنی: «تووڕە نابی.»

ـ نا، فەرموو، تووڕە نابم.

ـ تۆش لاوی، وەکو ئەو لاوانەیتر کە بیست و سێ ساڵیان تەمەنە، تۆش وەکو ئەوان گەنج و تازە باڵغ و خوێنشیرینی، لە ڕاستیدا خاویلکەشی! ئێستا بڵێ بزانم زۆر خراپم سووکایەتی پێکردووی؟

ئیوان بە گەرموگوڕی و خۆشخولکی دەنگی هەڵێنا: «بەپێچەوانە، ئەو وێکچوونە تووشی سەرسووڕمانی کردووم. بڕوا بکە لەدوای دیداری ئەو ڕۆژە لەگەڵ کاترینا ئیوانا، جگە لە خاویلکەیی و خدەی مندالانەی خۆم بیرم لە هیچی دیکە نەکردۆتەوە، هەروەک لە دڵی مندا بی وایە. زۆرجار لێرە بە تەنیا دانیشتووم و لە دڵی خۆمدا گوتوومە: ئەگەر بڕوام بە ژیان نەبێ و ئەگەر متمانەم بە ئەو ژنە نەمێنێ کە خۆشم دەوێ، ئیمانم بە ڕێکوپێکیی شتەکان نامێنێ و لە ڕاستیدا دێمە سەر ئەو باوەڕەی کە هەموو شتێک بێنەزم و قیزەونە و ڕەنگە دۆزەخێکی پڕ لە شەیتانیش بێ. ئەگەر هەموو ترسێکی سەرکوێرکەری مرۆڤ بە سەر ڕۆحمدا ببارێ و ژیانم لێبکاتە ژەقنەمووت ـ هەروا دەمهەوێ بژیم و ئەگەر بۆ تاقە جارێک لە جامی ژیان بچێژم، هەتا دوا قوم و خڵتەکەشی هەڵنەقوڕێنم دەمی لێناکەمەوە! ئەگەرچی دڵنیاشم لە تەمەنی سی ساڵیدا جامەکە وەلا دەنێم، تەنانەت ئەگەر چۆڕەشم لێ نەبڕیبێ، وازی لێدێنم ـ چدەکەم و ڕوو لەکوێ دەکەم خۆشم نازانم، بەڵام هەتا دەگەمە تەمەنی سی ساڵی لێم ڕوونە لاوییەتیم بە سەر هەموو شتێکدا زاڵدەبێ و دەیانبەزێنێ ـ بە سەر هەموو سەرکوێری و بێزارییەکدا. زۆرجار لە خۆمم پرسیوە بڵێی لە دنیادا ناهومێدییەک هەبێ بە سەر ئەم تینوێتییە شێتانە و ناشیاوەی مندا زاڵبێ؟ بەو ئاکامەش گەیشتووم بوونی نییە، یانی

هەتا ئەو کاتەی دەبمە سی ساڵان و تاڕادەیەک کامڵدەبم، ئەو تامەزرۆییەم لەکیس دەچێ. هێندێ لە خەڵکانی بیرکورت و خۆپەرست و دەغەزدار، بەتایبەت شاعیرانی بەرچاو تاریک ئەم تاسە و تینوێتییە و ئەم ژیان خۆشەویستییە بە شتێکی خراپ و ناحەز دەزانن. ئەوەش ڕاستە تامەزرۆ بوون بۆ ژیان و بایەخ نەدان بە شتەکانی دیکە یەکێ لە تایبەتمەندییەکانی بنەماڵەی کارامازۆفە. بێگومان تۆش هەروای، بەڵام بۆ دەبێ شتێکی سووک و چرووکانە بێ؟ وزەی مایل بە ناوەند لەم هەسارەیەی ئێمەدا هەروا خاوەنی هێزێکی ترسناکە، ئالیووشا. من حەزم لە ژیانە. بەو پێیەش درێژە بە ژیان دەدەم. تەنانەت ئەگەر بڕواشم بە نەزمی جیهان نەبێ. حەزم لە پشکووتنی وردە چڕۆی بەهارانەیە، ئاسمانی ساماڵم خۆش دەوێ. هێندێ مرۆڤم خۆش دەوێ. هێندێ لەو کەسانەی کە جاری وایە بێ ئەوەی خۆشمان بزانین بۆ، خۆشمان دەوێن. هێندێ لە ئاکارە گەورەکانی مرۆڤم پێباشە و حەزی پێدەکەم. ئەگەرچی ماوەیەکی زۆرە ئیتر بڕوام پێیان نەماوە. لەگەڵ ئەوەشدا بەپێی خووخدەی دێرین پیاو بە دڵ ڕێزیان بۆ دادەنێ. ها ئەوەش شفتەی ماسی، بخۆ، با تۆزێ هێزت بێتەوە بەر. لەوە چاکتر هەر نییە، لێرە شێوەی سازکردنەکەی باش دەزانن. دەمهەوێ بە فەڕەنگدا بگەڕێم ئالیووشا، لێرەوە وەڕێدەکەوم. دەزانم ڕەنگە بەرەو گۆڕستان بچم، بەڵام گۆڕستانێکی پیرۆز و خۆشەویستە لەلام، بەڵێ، مردووەکانیشی کە لەوێدا خەوتوون خۆشەویستن. ئەو بەردەی لە سەر گۆڕەکەیانە باسی ئەو ژیانە گەرموگوڕە دەکا کە لە ڕابردوودا ڕایان بواردووە. کڕنۆشیان بۆ دەبەم و کلیلەکانیان ڕادەمووسم کە ئەو ئیمانە بەهێزەیان بەکاری خۆیان و هەقیقەت و شەڕ و تێگەیشتنی خۆیان بووە. بە سەر گۆڕەکانیاندا دەگریم، ئەگەرچی بەدڵ بڕوام بەوە هەیە کە لە مێژە هیچ شتێک جگە لە مەرگ و گۆڕستان لە گۆڕێدا نەبووە. لەبەر هیوابڕاوی ناگریم، بەڵکو لەبەر ئەوەی لەگەڵ گریانەکەمدا
نەبووە. لەبەر هیوابڕاوی ناگریم، بەڵکو لەبەر ئەوەی لەگەڵ گریانەکەمدا
هەست بە شادی دەکەم و گیانم لە هەست و سۆزدا ئەوق دەکەم. وردە

چرۆی تازە پشگوتووی بەهارانم خۆش دەوێ[3]، ئاسمانی ساماڵ و هیچی‌تر. نامەوێ باسی ئاوەز و مەنتق بکەم، مەبەستم خۆشەویستییەکی ڕاستەقینەیە لە ناخی دڵەوە. مرۆڤ، یەکەم هێزی لاویی خۆی خۆش دەوێ. ئەرێ لەم وتە و زمان پاراوییەی من هیچت هەڵکڕاند ئالیووشا؟» ئیوان لەپڕ بە پێکەنینەوە ئەوەی پرسی.

«زۆر چاک تێگەیشتم ئیوان. مرۆڤ دەخوازێ لە ناخی دڵەوە، ئاشق بێ. ئەو قسەیەشت زۆر جوان بوو، زۆر دڵخۆشم کە بۆم دەرکەوت ئەوەندەت ژیان خۆش دەوێ و لەلات شیرینە. پێموایە چاکتر وایە هەموو کەسێک لە دنیادا ژیانی لە هەموو شتێک خۆشتر بوێ.»

- یانی ژیانی زیاتر لە مانای خۆی بەلاوە شیرین بێ؟

- بەڵێ، دەبێ خۆشی‌بوێ، بەڵام جیا لە مەنتق - بە دەردی تۆ دەڵێی - دەبێ جیا لە مەنتق بێ و تەنیا ئەو کاتەیە کە مرۆڤ لە مانای ئەو دەگا. زۆر لەمێژە وا بیر دەکەمەوە پێموایە نیوەی کارەکەت بە ئاکام گەیشتووە و بەرهەمەکەیت وەدەست کەوتووە. تۆ ژیانت خۆشدەوێ، ئێستا دەبێ هەوڵبدەی نیوەکەی دیکەی بەئاکام بگەیەنی. ئەو کاتەیە ڕزگار دەبی.

- بۆ دەتهەوێ ڕزگارمبکەی! خۆ نەفەوتاوم، ئیتر ئەو نیوەی دیکە چ مانایەکی هەیە؟

- چاکە، پیاو دەبێ مردووەکەت ڕاچڵەکێنێ، ئەگەرچی ڕەنگە نەشمردبێ. باشە لێمگەڕێ با چاییەکەم بخۆمەوە. ئەو دەمەتەقێیەمانم زۆر پێخۆش بوو ئیوان.

- دەزانم چاک گەشاویەتەوە. زۆرم پێخۆشە کە ئاوا خاوەن ئیمانی. تۆ مرۆڤێکی بەورە و خۆڕاگری ئالیووشا. ڕاستە دەڵێن دەتهەوێ واز لە کلیسا بێنی.؟

- بەڵێ، پیرەکەم فەرمووی دەست لە تەرکە دنیایی هەڵگرم و بگەڕێمەوە سەر ژیانی ئاسایی.

---

3- دێڕێکی پووشکینە، لە شعری «گزەبای سووتێنەر هەروا هاژەی دێ.»

ـ کەوایە دەتوانین زوو زوو یەکتر ببینین. بەر لەوەی ببمە سی ساڵان، یانی ئەو کاتەی کە واز لە جامەکە بێنم، یەکتر دەبینین. باوکم نایەوێ هەتا تەمەنی حەفتا ساڵی[4] واز لە خواردنەوە بێنێ. ڕاستت دەوێ بە هیوایە بە هەشتا ساڵیش بگا، خۆی وا دەڵێ. تەواو بە ڕاستیشیەتی، ئەگەرچی پیاوێکی حەنەکچییە و بەس. لە سەر ڕەوەزە بەردێک ڕاوەستاوە، لە سەر هەوەسبازیی خۆی ـ ئەگەرچی دوای گەیشتنە سی ساڵی، لە ڕاستیدا لەوانەیە شتێکی دیکەی وەگیر نەکەوێ پیاو لە سەری ڕاوەستێ... بەڵام مانەوە هەتا حەفتا ساڵان شوورەییە. چاکتر وایە پیاو هەتا سی ساڵان لە سەری بمێنێتەوە. دەکرێ خۆت فریو دەی و «سێبەری شکۆ و گەورەیی» بە سەر خۆتەوە ببینی. ئەرێ ئەمڕۆ دیمیتریت نەدیوە؟

«نا، بەڵام ئیسمیر دیاکۆفم دی، « ئالیووشا خێرا خێرا و بە وردی چۆنیەتیی دیدارەکەی خۆی لەگەڵ ئیسمیر دیاکۆف گێڕایەوە. ئیوان زۆر بە تامەزرۆیی گوێی ڕاگرتبوو و لە پەستا پرسیاری لێدەکرد.

ئالیووشا درێژەی بە قسەکانی دا: «بەڵام داوای لێکردم لەم بارەوە هیچ بە دیمیتری نەڵێم.» ئیوان نێوچاوانی تێکنا و سەری داخست.

ئالیووشا پرسیی: «لە داخی ئیسمیر دیاکۆف ئاوا تێکچووی؟»

ئیوان وەک بە زۆر قسەی پێ بکەی، گوتی: «بەڵێ، تف لە چارەی. ڕاستت دەوێ دەمویست چاوم بە دیمیتری بکەوێ، بەڵام ئێستا ئیتر پێویست ناکا.

ـ کاکە، بەم زووانە دەتهەوێ بڕۆی؟

ـ بەڵێ.

ئالیووشا بە نیگەرانییەوە پرسیی: «ئەی باوکم و دیمیتری؟ کێشەی ئەوان بە کوێ دەگا؟»

ئیوان بە تووڕەیی گوڕاندی: «تۆش ئەوەت کردۆتە بنێشتە خۆشەکە! بە من چی. مەگین من پاسەوانی دیمیتریم؟» بەڵام دوای ئەوە لەپڕ بزەیەکی تاڵ

4– لە کتێبی پیرۆزدا هاتووە تەمەنی مرۆڤ حەفتا ساڵە.

و مانـاداری گـرت. «ڕاسـتت دەوێ وەڵامـی قـائین[5] کـە سـەبـارەت بـە بـرا کوژراوەکەی بە خودای دایەوە، وا نییە، پێموا هەر لەو کاتەدا بیرت لەوە دەرکردەوە! دەی بە قەرەمەقەر، چاویان دەرێ، خودای دەکرد یەکتریان دەکوشت. خۆ من ناتوانم لێرە بمێنمەوە و کێشکیان بدێرم. دەتوانم؟ ئەوەی دەبوو بیکەم، کردم و دەمهەوێ بڕۆم. پێتوایە بەغیلی بە دیمیتری دەبەم و لەم سێ مانگەی ڕابردوودا هەوڵمداوە کاترینای شۆخ و شەنگی لێ هەڵفریوێنم؟ نا، کاکی خۆم، کارێکی تایبەتم هەبوو. کارەکەم تەواو کرد و لە سەر ڕۆیشتنم. هەر ئێستا تەواومکرد، خۆت شایەد بووی.»

ـ لەماڵی کاترینا ئیوانا؟

ـ بەڵێ خۆشم بە یەکجاری نەجاتدا. لە کۆتاییدا هەر کارێکم بە دیمیتری هەبێ پێوەندی بە خۆمەوە هەیە و بە دیمیتری مەڕبووت نییە. کاری خۆم بوو و دەبوو لە گەڵ کاترینا ئیوانا یەکلایی کەمەوە. تۆش دەزانی خۆ، بە پێچەوانەی دیمیتری جۆرێک هەڵسوکەوتی کرد، دەتگوت کەین و بەینێکیان هەیە. داوام لێنەکرد ئەو کارە بکەم، بەڵام ئەو کاترینا ئیوانای بە ڕێزەوە بە من سپارد و دوعای بەخێریشی بۆ کردین. زۆر دزێوە، ئاخ ئالیووشا، خۆزگە دەتزانی ئێستا دڵم چەندە ئاسوودەیە! بڕوا دەکەی، بۆ خواردنەوە لێرە دانیشتم و زۆری نەمابوو داوای شامپانی بکەم، تاکو یەکەم سەعاتی ڕزگاریم بکەم بە جێژن. سەیرە نزیکەی شەش مانگی خایاند و بە یەکجاری تووڕم هەڵدا و وازم لێ هێنا. ڕێزەیەکیش بیرم بۆ ئەوە نەدەچوو، تەنانەت دوێنێش، ئەگەر بمویستایە کۆتایی پێ هێنانی زۆر سانا بوو.

ـ باسی ئەشق دەکەی ئیوان؟

ـ ئەگەر پێت خۆشبێ، بە سەر چاو. زۆر سەیر ئاشقی ئەو کچە بووبووم. ئەو کچە بە جارێ هۆشی لێ بڕیبووم. ئەوین و خۆشەویستییەکەی وای لێ کردبووم، خۆمم ئازار دەدا و ئەویش زۆری ئازار دەدام. وام لێهات کێشکی

---

5- خودا بە قائین (قابیل)ی گوت: هابیلی برات لە کوێیە؟ گوتی: نازانم، بۆ من پاسەوانی براکەمم؟» عەهدی عەتیق، سیفری دۆزینەوە، بەشی چوارەم.

بدێرم و چاوی له سەر هەڵنەگرم... بەڵام له ناکاو هەموو شتێک شێوا و دەم له پووش مامەوە! ئەمڕۆ بەیانی به ئەوین و سۆزێکی زۆرەوە دەدوام، بەڵام کاتێ لەوێ دوور کەوتمەوە دام له قاقای پێکەنین و بڕوا دەکەی؟ هەقیقەتەکەیم پێ گوتووی.

ئالیووشا چاوی له ئەدگاری براکەی کرد، گەشابۆوە، گوتی: «وا دیارە زۆر زۆر دڵخۆشی.»

- با ئەوەشت پێبڵێم، له ڕاستیدا هیچ گرینگایەتییەکم پێ نەدەدا! ها! ها! ئاخری دەردەکەوێ که من گرینگایەتیم پێنەداوە. لەگەڵ ئەوەشدا کاتێ لەگەڵی کەوتمە دەمەتەقێ، زۆری سەرنجڕاکێشام. بە جارێ تووشی دڵەکوتەی کردبووم. بڕوا بکه هەر ئێستا دڵم بۆی دەکورکێنێ. هەر بۆیه واز هێنان لەو عەشقه زۆر دژوار بوو. پێتوایه شاتوشوت دەکەم؟

- نا، بەڵام ڕەنگه ئەشقێکی ڕاستەقینه نەبووبێ.

ئیوان دەستیکرد به پێکەنین و کوتی: «ئالیووشکا، ئەوەنده بیر له عەشق مەکەوە، ئەو کاره له تۆ ناوەشێتەوە. کارێکی باشت کرد ئەمڕۆ بەیانی پەڕییته نێو قسەکان! له بیرم نەبوو لەبەر ئەو کاره جوانه ماچتبکەم... بەڵام زۆری ئازار دام! من دەمزانی خۆشی وەک من له ناخەوه هەڵدەقرچێ، دەزانێ به دڵ خۆشمدەوێ. له ڕاستیدا ئەویش دڵی به منەوەیه نەک دیمیتری. به پێچەوانه دیمیتری بۆته هۆی خەم و خەفەتیشی. ئەوەی ئەو کاته پێمگوت پێچ وپەنای تێدا نەبوو. هەقیقەت بوو. بەڵام ناخۆشییەکەی لەوەدایه وێدەچێ هەتا پازده بیست ساڵی دیکه بۆی دەرنەکەوێ که دڵی به دیمیترییەوه نییه و ئەگەرچی ئازارمدەدا، بەڵام منی خۆشدەوێ، ڕەنگه قەتیش بەو ئاکامه نەگا، ئەگەرچی ئەمڕۆ ئەو پەندەشی پێدرا. واشی به باش دەزانم بۆ هەتا هەتایه لێره بڕۆم. ئەرێ به ڕاستی حاڵی چۆنه، دوای ڕۆیشتنی من چی قەوما؟

ئالیووشا پێیگوت که تووشی هێرشی عەسەبی بووه و بێهۆش کەوتووه، ئێستاش هەر وایه وڕێنه دەکا.

- پێتوانییه مادام خۆخلاکۆف خۆی سازاندوویەتی؟

ـ نا، پێموانییە.

ـ دەبێ لە بنج و بناوانی ئەو کارە بگەم. هیچ کەسیش بە هۆی هێرشی عەسەبییەوە نامرێ. گرینگ نییە. خودا بوورانەوەی وەک دەوای ئارام بوونەوە بە ژنان بەخشیوە. تازە من پێم بە وێدا ناچێتەوە، بۆ دیسان لەخۆڕا خۆمیان تێ هەڵقوتێنم؟

ـ بەڵام خۆ پێتگوت هیچ کاتێ گرینگایەتیی بە تۆ نەداوە!

ـ بە قەستی وامگوت. ئالیووشکا، دەهێڵی داوای شامپانی بکەم؟ وەرە با بە بۆنەی ڕزگار بوونی منەوە دەستبکەین بە خواردنەوە. خۆزگە دەتزانی چەندە دڵخۆشم!

ئالیووشا لە ناکاو کوتی: «نا برا گیان، وا چاکە نەخۆینەوە. چونکە هەتا ڕادەیەک هەست بە پەژارە دەکەم.»

ـ ئەرێ لە مێژە بۆم دەرکەوتووە دڵتەنگ و خەمباری، وایە.

ـ کەوایە بڕیارت داوە سبەینێ بەیانی بڕۆی؟

ـ بەیانی؟ کوا گوتم بەیانی دەڕۆم... بەڵام ڕەنگە بەیانیش بڕۆم. بڕوا دەکەی، بۆیە بۆ نان خواردن هاتووم بۆ ئێرە، تاکو لەگەڵ ئەو پیرە پیاوە لە سەر سفرەیەک دانەنیشم، چونکە پێمخۆشە کوێر بم و نەیبینم. هەتا ئەو جێیەی کە پێوەندیی بە ئەوەوە هەیە، دەبوو زۆر بەر لە ئێستا بڕۆیشتبایەم. تۆ بۆ ئەوەندە بە ڕۆیشتنی منەوە هیلاکی؟ بەر لە ڕۆیشتن کاتێکی زۆرمان هەیە. کاتێک بە بارتەقای هەتا هەتایی!

ـ ئەگەر سبەینێ دەڕۆی، مەبەستت لە هەتا هەتا چییە؟

ئیوان بە پێکەنینەوە کوتی: «بۆ ئێمە چ فەرقێکی هەیە؟ بۆ ئاخافتن و بۆ مەبەستێک کە ئێمەی کێشاوەتە ئێرە، دەرفەتێکی زۆرمان هەیە. بۆ ئەوەندە تووشی سەرسامی بووی؟ وەڵامم بدەوە: بۆ لێرە دیدەنیی یەکترمان کرد؟ تاکو باسی دڵداریی من و کاترینا ئیوانا بکەین؟ باسی باوکم و دیمیتری؟ سەفەری هەندەران؟ بارودۆخی نالەباری ڕووسیا؟ ئیمپڕاتۆر ناپلیۆن؟ ها؟»

ـ نا.

- کەوایە دەزانی بۆچی. بۆ خەڵکی دیکە مەسەلەکە جیاوازە؛ بەڵام ئێمە لە تافی هەرزەکاریماندا سەرەتا دەبێ بە پرسیارە ئەبەدییەکانمان بگەین. چارەی ئێمەش هەر ئەوەیە. لاوانی ڕووسی ئێستا جگە لە پەرسڤی ئەبەدی باسی هیچ شتێکی دیکە ناکەن. ئەویش ڕاست لە کاتێکدا کە فکر و زکری پیران بە پەرسڤی کار و کردەوەوە خەریکە. لەم سێ مانگەی ڕابردوودا بۆ بەو چاوە پڕ لە پرسیارانەوە تێم ڕادەمای؟ دەتویست لێم بپرسی ئیمانم بە چی هەیە، یان ئیمانم هەر نییە؟ لەو سێ مانگەدا مەبەستت هەر ئەوە بوو ئاوا چاوت لێدەکردم. وا نییە؟

ئالیووشا بە بزەیەکەوە گوتی: «ڕەنگە وا بووبێ. ئیوان، خۆ ئێستا پێم پێ ناکەنی؟»

- من و پێکەنین؟ من نامەوێ هەستی برا چکۆلەکەم کە ماوەی سێ مانگە بەو چاوە پڕ لە پرسیارەوە تێم ڕاماوە بڕووشێنم. ئالیووشا، چاو لە چاوم بڕە! خۆ منیش کوڕێکی وەک تۆم. بەڵام تەرکە دنیا نیم. کوڕانی ڕووسی تا ئێستا چییان کردووە؟ مەبەستم تاقمێکمانە. بۆ وێنە لەم مەیخانە بۆگەنەدا یەکتر دەبیننەوە و لە قوژبنێک دادەنیشن. بەر لەوە بە عومراتی خۆیان یەکتریان نەدیوە و کاتێک لە مەیخانە دەڕۆنە دەر، هەتا چل ساڵی دیکە یەکتر نابیننەوە. لەو دانیشتنە زوو تێپەڕەشدا باس لە چی دەکەن؟ باسی پرسیاری ئەبەدی، باسی بوونی خودا و هەرمان و زیندوو بوونەوە؟ ئەوانەی کە ئیمانیان بە خودا نییە، باسی سۆسیالیسم یان ئانارشیسم دەکەن، بە شێوەیەکی نوێ باس لە بارودۆخی ژیان و مرۆڤایەتی دەکەن، بە جۆرێک کە هەموو مەبەستەکانیان لە دەوری ئەو پرسیارانە دەخولێتەوە و کردوویانەتە بنێشتە خۆشەکە و هەروەها کۆمەڵێ لە کوڕانی ڕەسەن زادەی ڕووسی جگە لە مشتومڕ سەبارەت بەو پرسیارە ئەبەدییانە کارێکی دیکە نازانن! وا نییە؟

«بەڵێ، بۆ ڕووسییە ڕاستەقینەکان پرسیار و لێکۆڵینەوە سەبارەت بە خودا و هەرمان، یان وەک تۆ دەڵێی هەر ئەو پرسیارە هەمیشەییانەی بوونەتە بنێشتە خۆشەکەی سەر زاران گرینگە. هەڵبەت ئەوەش بەر لە

هەموو شتێک سەر هەڵدەدا و بۆیەشە لەو بارەوە قسە و دەردە دڵ دەکەن.»
ئالیووشا ئەوەی گوت و هەر بەو بزە و سەرنجە دڵۆڤانانە و پڕ لە پرسیارەوە چاوی لە ئیوانی برای بڕی.

ـ باشە ئالیووشا، تۆش هەستت بەوە کردووە جاری وایە زۆر زۆر گەوجانەیە پیاو ڕووسی بێ، بەڵام هیچ شتێک لەوە گەوجانەتر نییە کوڕانی ڕووسی ئاوا کاتی خۆیان بە فیڕۆ دەدەن. بەڵام کوڕێکی ڕووسی هەیە ناوی ئالیووشایە کە یەکجار زۆرم خۆشدەوێ.

ئالیووشا لە ناکاو پێکەنی و گوتی: «چەندە جوانت بەیان کرد!»

ـ دەی بێژە بزانم لە کوێوە دەستپێبکەم؟ فەرمان بدە دەی. باسی بوونی خودا، ها؟

«لە کوێوە پێت خۆشە دەستپێبکە، تەنانەت لە بێ بایەخەکانییەوە. دوێنێ لە ماڵی باوکم گوتت خودا نییە.» ئالیووشا بە وردی لە ئیوان ڕاما.

دوێنێ کاتی شێو خواردن بە قەستی ئەو قسەیەم کرد، ویستم سەر بخەمە سەرت، بەڵام زوو بۆم دەرکەوت زۆری پێ تێکچووی، بەڵام ئێستا بە خراپی نازانم لەو بارەوە لەگەڵت بدوێم، بەڕاستیش ئەو باسەم بە لاوە گرینگە. دەمهەوێ زیاتر لە یەک نزیک بینەوە. ئالیووشا، چونکە زۆرم خۆشدەوێی. دۆست و هاوڕێم نییە و دەمهەوێ ئەمجارە تاقیی بکەمەوە و هاوڕێیەکی دڵسۆزم هەبێ. جوان بیری لێبکەوە، ڕەنگە منیش ئیمانم بە بوونی خودا هەبێ.» ئیوان پێکەنی، «وا دیارە پێت سەیرە، ها؟»

ـ جا دیارە، هەڵبەت ئەگەر بە گاڵتەت نەبێ.

ـ گاڵتە؟ دوێنێ لە حوجرە پیری کلێسەش پێیگوتم گاڵتە دەکەم. کاکی خۆم، بیستووتە تاوانبارێکی پیر لە سەدەی هەژدەهەمدا هەبوو، گوتی ئەگەر خودا نەبوایە، پێویست بوو دایهێنن. S'il n'existait Pas Dieu، il faudrait I'inventer[6] لە ڕاستیدا مرۆڤ خودای داهێناوە. ئەوەی زۆریش سەیر و سەر سووڕهێنەرە ئەوەیە کە لە ڕاستیدا خودا بوونی هەبێ؛ شتێکی دیکەش

6- «ئەگەر خودا نەبوایە، دایان دەهێنا.» دێڕێک لە ڕیسالەیەکی وۆڵتێر.

سەیرە کە ئەو شێوە ئەندێشەیە، یانی ئەندێشەی پێویست بوونی وجوودی خودا بچێتە زەینی بوونەوەرێکی دڕ و وەحشیی وەک مرۆڤەوە. ئەوەش هێندە پیرۆز و هەست بزوێن و حەکیمانە و مەزنە و ئیحتیبارێکی گەورەیە بۆ مرۆڤ هەر باسی مەکە. بەڵام با سەبارەت بە خۆشم بدوێم. زۆر لە مێژە هاتوومە سەر ئەوەی بیر لەو مەسەلەیە نەکەمەوە کە خودا مرۆڤی خوڵقاند، یان مرۆڤ خودای داهێنا. باسی ئەو مەسەلانەش ناکەم کە کوڕانی ڕووسی سەبارەت بەو مەبەستە سازاندوویانە و هەموویان لە گریمانەکانی فەڕەنگ وەرگرتووە. چونکە ئەوەی لە فەڕەنگ گریمانەیە، لە لای کوڕانی ڕووسی مەسەلەیە و نەک هەر بۆ کوڕان بۆ مامۆستاکانیشیان. چونکە مامۆستایانی ڕووسی ئەغڵەب هەر ئەو کوڕانەن.

هەر بۆیە هیچکام لە گریمانەکان لە قەڵەم ناخەم. چونکە ئێستا مەبەستی وتووێژەکەمان شتێکی دیکەیە. من خەریکم هەوڵدەدەم بەپەلە باسی خووخدە و سروشتی خۆم بکەم، یانی بیدرکێنم کە چ جۆرە مرۆڤێکم. ئیمانم بەچی هەیە و بەهیوای چیم. وایە یان نا؟ کەوایە دەبێ ڕاست و ڕەوان پێت بڵێم ئیمانم بەخودا هەیە. بەڵام ئەوە بزانە؛ ئەگەر خودا هەیە و ئەگەر بەڕاستی ئەو دنیای خولقاندووە، کەوایە هەر بەو جۆرەی کە دەزانین دنیای لە سەر پێوانەی هەندسەی ئەقلیدێس و زەینی مرۆڤ، بە شێوەی سێ ڕەهندی بە حەواوە خولقاندووە. لەگەڵ ئەوەشدا، فەیلەسووفان و ئەندازیارانێکی زۆر بوون و هەن لەوە بەگومانن کە تەواوی جیهان، یان بە شێوەیەکی گشتیتر بڵێین تەواوی هەستی، بەپێی هەندسەی ئەقلیدێس خولقا بێ ئەوان تەنانەت غیرەتی ئەو خولیاو خەونەیان وەبەر خۆیان ناوە کە بڵێن دوو هێڵی تەریب بە پێی ئەو هەندەسەیە لە سەر زەوی هیچکات بەیەک ناگەن. لەوانەشە لە شوێنێکی بێکۆتایی بەیەک بگەن. بەو ئاکامەش گەیشتووم چونکە سەرم لەوەش دەرناچێ، نابێ چاوەڕوانیی ئەوەشم ببێ سەرم لە بوونی خوا دەرچێ. بە خاکەڕایی دانی پیادەنێم کە بۆ لێکدانەوەی ئەو جۆرە پرسیارانە مێشکم کارناکا. من زەینێکی خۆڵینە و ئەقلیدێسیم هەیە و چۆن دەتوانم

مەسەلەگەلێک شیکەمەوە کە پێوەندیی بەم دنیایەوە نییە؟ ئالیووشاگیان ئەو ئامۆژگارییەشم لەگوێ بگرە، قەت بیر لەو شتە مەکەوە. بەتایبەت خوا و بوون و نەبوونەکەی. بۆ زەینێک کە بە ئەندێشەیەکەوە خولقاوە کە تەنیا سێ ڕەهەندی هەیە، ئەو چەشنە پرسیارانە بە تەواوی بێهوودە و خۆڕایین. لەبەر ئەوەیە ئیمانم بەخودا هەیە و لەوبابەتەوە دڵخۆش و ئەرخەیانم. دوای ئەوە، ئیمانم بە حیکمەتی ئەو و ئامانجی ئەو هەیە ـ بەگشتی لەوپەڕی زەین و ڕوانگەی ئێمەوەیە ـ ئیمانم بە نەزمی شاراوە و مانای ژیان هەیە. ئیمانم بەو هەماهەنگی و نەزمە ئەبەدییە هەیە، کە دەڵێن ڕۆژێک هەمووومان ئاوێتەی دەبین. هەروەها ئیمانم بەو «وشە»یەش هەیە کە جیهان بەرەولای ئەو دەڕوا. خودی ئەویش «لەگەڵ خودا» بوو و خوداشە.[7] هەتا ئاخر و هەتا بێ برانەوە. ئەوەش هەموو چەشنە ناو و مانایەکی هەیە. هەر دەڵێی لە سەر ڕاستەڕێیەکی بێکۆتاییم! لەگەڵ ئەوانەشدا، بڕوام پێبکە لە ئاکامدا ئەم دنیایەی خودام قەبووڵنابێ، ئەگەرچی دەشزانم بوونی هەیە، بەڵام بەهیچ شێوەیەک قەبووڵم نییە. وانییە کە ئیمانم بە خودا نەبێ، دەبێ ئەوە بزانی من دنیای بە دەستی ئەو خولقاوم قەبووڵ نییە و ناتوانم قەبووڵی بکەم. با زیاترت بۆ ڕوون بکەمەوە. وەک سەردەمی منداڵی ئیمانم بەوە هەیە کە ڕەنج و ئازار شیفای هەیە و قەرەبوو دەبێتەوە. هەموو پڕوپووچییە پڕ لە پەستی و لێکدژەکانی مرۆڤ وەک تراویلکەیەکی چاوخەڵەتێن، وەک سازکراوی قێزەونی زەینی ئەقلیدێسی بەبێ توانا ئاوەزی بێ برانەوەی مرۆڤ دەپووکێتەوە. لە کۆتاییی دنیادا، لە چرکەساتی هەماهەنگی ئەبەدیدا شتێکی وا خۆشەویست وەڕاست دەگەڕێ و دەبێتە هاوسەنگییەک بۆ دڵی هەمووان. بۆ ئارام کردنەوەی هەموو دڵە ڕەنجاوەکان. بۆ کەفارتی هەموو سزاکانی مرۆڤایەتی و ئەو خوێنانەی بەدەستی مرۆڤ ڕژاون، جگە لەوەش ئەگەر بواری ئەوە بدا هەموو تاوانەکانی مرۆڤ ببەخشرێن و هەموو بە

---

7- «سەرەتا وشە هەبوو وشە لەلای خودا بوو. وشەکە خودی خودا بوو.» ئینجیلی یوحەننا، بەشی یەکەم.

سەرهاتەکانی مرۆڤ موو بە موو لێکداتەوە ـ بەڵام ئەگەر تەواوی ئەوانەش وەڕاست بگەڕێ، هێشتا قەبووڵم نییە. تەنانەت ئەگەر دوو هێڵی تەریبیش بە یەک بگەن و بە چاوی خۆم بیبینم، بیبینم و بڵێم هێڵەکان پێک گەیشتوون، دیسان قەبووڵم نییە. ئەوەی لەزاتی مندایە ئەمەیە. ئالیووشا ئەوە بیر و بڕاوی منە. ئەوەشم بێپەردە و لە ناخی دڵەوە درکاند. بە قەستیش ئاخافتنەکەم بەشێوەیەکی گەوجانە دامەزراند. بۆیە دانم بە هەموو شتێکدا نا، چونکە تۆش هەر ئەوەت دەویست. تۆ نەتدەویست سەبارەت بە خودا هیچ ببیستی، بەڵکو دەتویست بزانی برا خۆشەویستەکەت ژیانی لە سەر چ ڕێباز و بنەمایەکە. منیش هەموویم پێگوتی. ئیوان ئاخافتنە ڕەوان و گەرموگوڕەکەی بە هەستێکی ئاشکرا و چاوەڕوان نەکراوەوە کۆتایی پێهێنا.

ئالیووشا لە ئیوانی برای ڕاما و لێی پرسی: «بۆ قسەکانت «گەوجانە» دەستپێکرد؟»

ـ یەکەم لەبەر ئەوەی ڕووسیم. وتوێژی ڕووسییەکانیش لە سەر ئەو جۆرە مەبەستانە هەمیشە گەوجانە دەستپێدەکا و تەواو دەبێ. هەروەها، هەرچەندە گەوجانەتر بێ لە ڕاستەقینە نزیکترە. هەرچەند گەوجانەتر بێ، ڕوون و ئاشکراترە. گەوجییەتی بێ گرێوگۆڵ و سادەیە. وریایی خۆی دەگنخێنێ و شاراوەیە. وریایی بێ سەرەوبەرە و هیچوپووچە.

بەڵام هەقمەقی سادق و بێ پێچ و پەنایە. ئاخافتنەکەم بە هیوا بڕاوی گەیاندووە، هەرچەندەش هەقمەقانەتر دووابێتم، بەلامەوە باشترە.

ئالیووشا گوتی: «ئەوەم بۆ ڕوون دەکەیەوە بۆچی دنیات قەبووڵ نییە؟»

«مەعلوومە، خۆ شتێکی نهێنی نییە. ئامانجیشم هەرئەوەیە کە پێیبگەم. برا وردیلە خۆشەوسیتەکەم، نامەوێ هەتلەت بکەم یان لە قەڵای مێردانت دەرکێشم. ڕەنگە بمهەوێ بەدەستی تۆ شیفا بدرێم.» ئیوان وەک منداڵێکی ساوا و هێدی، لە ناکاو زەردەیەکی گرت. ئالیووشا تا ئێستا زەردەخەنەی وای بە سەر لێوی ئیوانەوە نەدیتبوو.

# (٤)
# نافەرمانی

ئیوان ئاوای گوت:» دەبێ ڕاستی شتێکت پێبڵێم. قەت بەوە نەگەیشتووم کە مرۆڤ دەتوانێ دراوسێکانی خۆی خوشبوێ. بەبڕوای من، هەرئەو دەروجیرانانەن پیاو ناتوانێ خوشیبووێن. لەوانەیە بکرێ لە دوورەوە خۆشتبوێن. جارێکیان لەشۆێنێک سەربردەی پیاوێکی خودام خوێندەوە، ناوی «یوحەننای خاوەن بەزەیی» بوو. پارسەکێکی برسی و لە سەرمانا کەسیرە بوو دەچێ بۆ لای و داوای لێدەکا گەرمی کاتەوە، ئەویش دەیباتە نێو پێخەفەکەی خۆیەوە و لە باوەشی دەگرێ و دەم بە دەمییەوە دەنێ و هەناسەی گەرمی خۆی دەگا بە دەمێدا. دەم بە دەمی کەسێکەوە دەنێ کە بەهۆی نەخۆشییەکی قورسەوە بۆگەن و قیزەون بووە. من پێموایە ئەو کارەی بۆ ڕیا کردووە. لەبەر خۆشەویستی و ڕەحمێک کە ئەرک بەسەریدا سەپاندبێ، وەک تاعەت و چلەگرتنێک کە لە سەری فەڕز بووبێ. چونکە خۆشەویستی دەبێ شاراوە بێ، ئەگەر ئاشکرا بێ خۆشەویستییەکە لە نێو دەچێ.»

ئالیووشا گوتی: «باوە زووسیما یەکدوو جار ئەوەی کردووە. ئەویش دەیگوت ئەغڵەب جار ئەدگاری هێندێ کەسی کە ڕێبواری ڕێگای ئەوین نین، وایلێدەکا هەستی خۆشەویستیم بۆی نەبێ. لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵگا پڕە لە ئەوین، ئەویش عەشقی مەسیحییانە. خۆم لەوە دەگەم ئیوان.»

«من تا ئێستا لەوە نەگەیشتووم و تووشیشی نەهاتووم. کۆمەڵی بێژماری مرۆڤیش لەم بوارەوە لەگەڵ من هاوڕان. پرسیارم ئەوەیە، بڵێی ئەم شتە پێوەندیی بە خووخدەی خراپی مرۆڤەوە هەبێ، یان لە هەوێن وسروشتی مرۆڤدایە. بە بڕوای من ئەشقی مەسیحییانە بۆ مرۆڤ وەک

پەرجۆیەک وایە کە لە سەر زەوی مەحاڵە. ئەو خودا بوو. بەڵام من نیم. بۆ وێنە، وایدانێ من بە سەختی ئازار دەکێشم. کەسێکی دیکە تێناگا من چ ژان و ئازارێک دەکێشم، چونکە ئەو کەسێکی دیکەیە و «من» نییە. بۆیە کەموایە کەسێک لە ئازار و ژانی کەسێکی دیکە بگا. (ئەوەش مایەی تەشەخوسە) بە بڕوای تۆ بۆ تێی‌ناگا؟ چونکە بۆنێکی ناخۆشم لێدێ. چونکە ئەدگارێکی حەپۆلانەم هەیە. چونکە جارێک پێلاقەم بە لاقیدا داوە. جگە لەوەش ئازارەکان جیاوازن؛ ئازاری سووکایەتی و ڕووشکێنی لەوجۆرە ئازارانەی کە پیاو سووک و چرووک دەکا ـ بۆ وێنە، برسییەتی ـ بژیودەرکەم ڕەنگە تێبگا؛ بەڵام کاتێک بە ئازارێکی گەورەتر دەگەین ـ بۆ وێنە ئازارکێشان لەبەر ئەندێشە، ئیتر بژیودەرەکەم لەوە ناگا. ڕەنگە بەوهۆیەوە بێ کە ئەدگاری من لەبەر گوشاری ئەو ئەندێشەیە بزڕکاوە و بەبڕوای ئەو لە ئەدگاری مرۆڤ ناچێ. بۆیە خێرا من لە خێروبێری خۆی بێبەش دەکا، کە بەهیچ شێوەیەک لەبەر نینۆک وشکی و قڕنیسی نییە. سواڵکەرەکان، بەتایبەت ئەو سواڵکەرانەی نەجیم و شەرمێونن، نابێ خۆیان ئاشکرا بکەن، بەڵکو واچاکە لە ڕێگای ڕۆژنامەوە داوای سواڵ و سەدەقە بکەن. پیاو دەتوانێ بە شێوەیەکی شاراوە، یان دوور بەدوور دەروجیرانی خۆی خۆش بووێ، بەڵام لە نزیکەوە هەتا ڕادەیەک مەحاڵە. ئەگەر بڕیار بێ ئەو کارە لەبەر چاوی خەڵک، یان لە سەر پەردەی شانۆ بەڕێوە بچێ، یان لە شوێنێک کە سواڵکەرەکان دێنە سەر پەردە و بە جلوبەرگی هاورێشمین و پینەپینەوە و بەکەوشی قەیتان پچراوەوە، دەستدەکەن بە سەما و بە هەڵپەڕکێ و داوای سواڵ و سەدەقە دەکەن، ئەو کاتە لەوانەیە پیاو پێیخۆش بێ چاویان لێبکا. بەڵام تەنانەت ئەو کاتەش خۆشماننناوێن. با لەوە زیاتری لە سەر نەڕۆم. هەر ئەوەندەم دەویست بیروڕای خۆمت بۆباسبکەم. دەمویست بە شێوەیەکی گشتی باس لە ئازارەکانی مرۆڤایەتی بکەم. بەڵام واچاکە خۆمان تەنیا بە ئازاری منداڵانەوە نەبەستینەوە. هەر ئەمەش پانتایی باسەکەم تا ڕادەیەکی زۆر بەرتەسک دەکاتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا چاکتر وایە زۆر لە دنیای منداڵان نەترازێین،

ئەگەرچی مەبەستی باسەکەم لێ کەمبایەخ دەکا. بەڵام بەرلە هەموو شتێک پیاو دەتوانێ منداڵی لە نزیکەوە خۆش بووێ، تەنانەت کاتێک کە زۆر پیس و چەپەڵیش بن، تەنانەت ئەگەر ناشیرین و دزێویش بن. (بەڵام پێموایە منداڵان قەتقەت ناحەز و دزێو نین.) هۆی دووهەمیش کە بۆ نامەوێ باسی گەورەکان بکەم ئەوەیە جگە لە دزێوی و قێزەونی و موستەهەقی نەبوونی خۆشەویستی، سزا دەدرێن - ئەوان سێویان خواردووە و خێر و شەڕ دەناسن. هەمووشیان «وەک خودا[8]»یان لێهاتووە. بەڵام هەروا خەریکی سێو خواردنن، بەڵام منداڵان هیچیان نەخواردووە و بێگوناح و پاکن. ئالیووشا تۆ منداڵانت خۆشدەوێ. دەزانم کە زۆریشت خۆشدەوێن. دەشزانم لەوە دەگەی کە بۆ دەمهەوێ زیاتر باسی ئەوان بکەم. ئەگەر ئەوانیش لە سەر زەوی تووشی ئازارێکی تاڵ و ترسناک بن، دەبێ بەهۆی گەورەکانیانەوە ئەو ئازارە بچێژن. دەبێ بەهۆی گەوەرکانیانەوە کە سێویان خواردووە تووشی ئەو ئاکامە تاڵە بن. بەڵام ئەم بەڵگانە پێوەندیی بە دنیایەکی دیکەوە هەیە. ئەوەش لە دەرەوەی چوارچێوەی فامی مرۆڤە لە سەر ئەم دنیایە. مرۆڤی بێتاوان نابێ لەبەر تاوانی کەسانێکی دیکە ئازار بکێشن، ئەویش بەتایبەت ئەو منداڵە پاک و بەستەزمانانە! ڕەنگە سەرت لە من سووڕ مابێ. بەڵام منیش زۆرم منداڵ خۆشدەوێ. دیوتە ئالیووشا مرۆڤی زاڵم و تووڕە و دڕندەش، یانی ماڵباتی کارامازۆفیش هێندێ جار منداڵیان خۆش دەوێ. منداڵان هەتا ئەو کاتەی چکۆڵەن - بۆ وێنە هەتا تەمەنی حەوت ساڵان - زۆر لە گەورەکان دوورن. جیاوازییان زۆرە، بوونەوەرێکی جیاوازن و هەر دەڵێی لە ڕەگەزێکی جیاوازن. لە بەندیخانە تاوانبارێکم دەناسی لە سەردەمی چەتەییەکەیدا بنەماڵەیەکی بە تێکڕایی کوشتبوو، کە حەوت کەسیان منداڵ بووبوون. بەڵام کاتێ لە زیندان بوو خۆشەویستییەکی سەیری بۆ منداڵان هەبوو. ڕۆژ تا ئێوارێ لەبەر دەلاقەی بەندەکەی ڕادەوەستا و لەو منداڵانەی دەڕوانی کە لە حەوشەی بەندیخانەکەدا یارییان دەکرد. لەگەڵ کوڕێکی چکۆڵە سەری

---

8- هەڵسەنگێندرێ لەگەڵ «سیفری سەرهەڵدان» بەشی سێهەم

ئاشنایەتیی داخستبوو و دەهاتە بەر دەلاقەی بەندەکەی و سەیر خوویان بە یەک گرتبوو... نازانی بۆ دەمهەوێ ئەوەندەت قسە بۆ بکەم ئالیووشا؟ ژانەسەرم گرتووە و خەمبارم، وەختە دڵم بتۆقێ.»

ئالیووشا بە سەرسامی گوتی: «هێندە غەریب و سۆزدارانە دەدوێی هەر دەڵێی گۆڕاوی.»

ئیوان وەک ئەوەی قسەی براکەی نەبیستبێ، لە درێژەی وتەکانیدا گوتی: «ماوەیەک لەمەوبەر لە مۆسکۆ تووشی کابرایەکی بولغاریایی بووم باسی جینایەتی تورکان و چرکسییەکانی بۆ کردم کە لە سەرانسەری بولغاریا لە ترسی شۆڕشی یەکپارچەی ئیسلاوەکان ئەنجامیان دابوو. ئەوان گوندەکانیان سووتاندبوو، دەستدرێژییان کردبووە سەر ژنان و منداڵان. گوێچکەی پیاوانیان بە بزمار بە دیوارەوە داکوتابوو هەروا ڕایانگرتبوون و ڕۆژی دوایی لە داریان دابوون. جینایەت و کردەوەی وایان کردبوو کە پیاو ناتوانێ بیریشی لێبکاتەوە. خەڵک هێندێ جار باسی دڕەندەیی ئاژەڵ دەکەن، دەڵێن بۆتە ئاژەڵی دڕندە، بەڵام ئەوە بێئینسافییە و تۆمەتێکی گەورەیە دەرهەق بە جڕوجانەوەر. چونکە هیچ دڕندە و جانەوەرێک ناتوانێ بەقەد مرۆڤ زاڵم و خوێنڕێژ بێ. چونکە زوڵم و زۆرەکەی زۆر فێڵاوی و هونەرمەندانەیە. شێر تەنیا نێچیرەکەی هەڵدەدڕێ و دەیخوا، هەر ئەوەشی لەدەست دێ. قەت بیر لەوە ناکاتەوە گوێچکەی خەڵک بە دیوارەوە مێخکوت بکا، تەنانەت ئەگەر تواناییی ئەو کارەشی ببێ، نایکات. ئەو تورکانە چێژ لە ئەشکەنجە کردنی منداڵانیش وەردەگرن. ورگی دایکان دەدڕن و منداڵەکەیان دەردێنن و فڕێی دەدەن بۆ حەوا و بە نووکی نێزەیانەوە دەکەن. ئەو کارەشیان لەبەر چاوی ژنان و دایکان وەک ڕابواردن و گەمەیەکی خۆش چاوی لێدەکرد. ئەوەش دیمەنێکی دیکە کە پێموایە زۆر جێی سەرنجە. دایکێکی ترساو بێنە بەرچاوی خۆت کە وەک مێوژۆکە دەلەرزێ. منداڵێکی بە باوەشەوە، کۆڕێک تورک گەمارۆی دەدەن. وادیارە حەزیان لە گەمەیەکی سەرنج ڕاکێشە. منداڵەکە بە باوەشی دایکییەوە دەلاوێننەوە و ختیلکەی دەدەن تاکو وەپێکەنین دەکەوێ.

مندالْ دەستدەکا بە پێکەنین. هەر لەو کاتەدا یەکێ لەو تورکانە لوولەی چەکەکەی لە مەودایەکی نزیکەوە بەرەو دەموچاوی مندالْەکە دەگرێ. مندالْەکە لەبەر شادی دەتریقێتەوە. دەستە وردیلەکانی بۆ تفەنگەکە درێژ دەکا و تورکەش لەو کاتەدا قامک بە پەلەپێتکەدا دەنێ و مێشکی مندالْە لەبەریەک بڵاو دەبێ. هونەرمەندانە بوو، نا؟ ڕاستت دەوێ تورکان زۆریان دڵ بە گەمە و یاریی بەتام و چێژەوە هەیە.»

ئالیووشا پرسیی: «کاکە مەبەستت چییە؟»

«پێموایە ئەگەر شەیتان وجودی نەبێ و مرۆڤ خولْقاندبێتی، ئەوی بە شکڵ و شێوەی خۆی خولْقاندووە.»

ئالیووشا گوتی: «یانی هەر ئەو جۆرەی کە خودای داهێنا؟»

ئیوان بە پێکەنینەوە گوتی: «زۆر خۆشە دەتوانی وشەکان دووپات بکەیەوە. هەر بەوجۆرەی کە پۆلۆنیۆس لە «هاملێت»دا دەڵێ؛ (وشەکانم بۆخۆم دەگێڕیتەوە.) زۆر دڵخۆشم. خودای تۆ وادیارە زۆر خودای چاکە. هەڵبەت ئەگەر مرۆڤ ئەوی لە سەر شکڵ و شێوەی خۆی خولقاندبێ. هەر ئێستا پرسیت مەبەستم چییە. دەزانی چی، من زۆرم حەز لە کۆ کردنەوەی ڕووداوە چکۆڵەکانە و باوەڕت بێ تەنانەت هەقایەت و چیرۆکی زۆرم لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکان بڕیوە و ئێستا کۆمەڵە چیرۆکێکی باشم هەیە. هەڵبەت تورکەکانیش جێی خۆیان لەو کۆمەڵە چیرۆکەدا کردۆتەوە، بەڵام تاچێک و غەوارەن. نموونە گەلێکیشم لە وڵاتەکەی خۆمان هەیە کە زۆر لە هی تورکان باشترە. زانیوتە ئێمە قامچی خواردنمان بەلاوە شیرینە و ئەوەش لە زاتی نەتەوایەتیی ئێمەدایە. مێخکوت کردنی گوێچکە بە دیوارەوە لە زەینی ئێمەدا ناگونجێ. چونکە هەرشتێک بێ، ئێمە فەرەنگیین بۆیە هەمیشە دار و قامچیمان بە سەرەوەیە و ناتوانین دەستیشی لێ هەڵگرین. ئێستا لە هەندەران قامچی لە هیچکەس نادرێ. ڕەنگە شێوەی سزادانەکانیان مرۆڤانەتر بێ، یان یاسا و ڕێسایەکیان داناوە کە ئیتر ناوێرن قامچی لە هیچکەس بدەن. بەڵام لە سەرێکی دیکەوە قەرەبووی دەکەنەوە، کە وەک ئەو شێوەیەی ئێمە

نەتەوایەتییە. هێندەش نەتەوایەتییە کە لە نێو ئێمەدا بە کردەوە ئەستەمە. ئەگەرچی خەریکە بە سەرمانیدا دەسەپێنن، چونکە بزووتنەوەی مەزهەبی لە نێو چینی بالآدا دەستی پێکردووە. ڕیسالەیەکی چاکم هەیە لە زمانی فەڕەنسییەوە وەرگێڕدراوە. شێوەی سەربڕینی قاتڵێکی تێدا هاتووە، کە ناوی ڕیچاردە و لەم دواییانەدا، پێنج ساڵ لەمەوبەر پێموایە لاوێکی بیست و پێنج ساڵان بووە و لە کاتی سزا دانەکەیدا تۆبە دەکات و دێتە سەر دینی مەسیح. ئەم ڕیچاردە گوایە زۆڵبووە و دایکی لە تەمەنی شەش ساڵاندا دەیدا بە شوانێک لە چیاکانی سویسڕا. ئەو شوانە گەورەی کرد و باری هێنا تاکو کاریان بۆ بکا. لە نێو ئەواندا وەک بێچووە ئاژەڵێکی وەحشی بارهات. شوانەکان هیچیان پێنەدەدا. جلوبەرگ و خۆراکیشیان نەدەدایە. لە تەمەنی حەوت ساڵیدا، لە کاتی باران و سەرمادا دەیاننارده بەر مێگەل و زۆر بێبەزەییانە لەگەڵی دەجوولانەوە و پێیان وابوو هەرچۆنێکی ڕادەن هەقیانە. چونکە ڕیچاردیان وەک کۆیلە وەرگرتبوو و ئەوانیش بە پێویستیان نەدەزانی تەنانەت خۆراکیشی بدەنێ. ڕیچارد خۆی دەگێڕێتەوە کە لەو ساڵانەدا [9] وەک «کوڕێکی خۆشگوزەران» لە ئینجیلدا، بە ئاواتەوە بوو لەو شڵقاوە بخوا کە دەیاندا بە بەرازە دابەستراوەکان بۆ ئەوەی قەڵەو بن. بەڵام تەنانەت نەیاندەهێشت لەوەش بخوا. هەرکاتێکیش لەو خۆراکەی بەرازەکانی دەدزی، قامچییان بۆ دەخستەکار. سەردەمی منداڵی و گەنجیی بەو جۆرە ڕابوارد. تا ئەو کاتەی گەورە بوو و بەڕادەیەک بەهێز بوو کە نەیانتوانی بەرگریی لێبکەن، هەر بۆیە لەوێ ڕۆیشت و بوو بە چەتە. ئەو کوڕە وەحشییە بوو بە کرێکار و بە شێوەی ڕۆژانە لە ژنێو کاری دەکرد. ئەوەی پەیدای دەکرد، دەستبەجێ دەیخوارد و لە زۆر جێگاش بە نانەزگی کاریدەکرد، وەلحاسڵ ژیانێکی گۆڵیی ڕادەبوارد. لە ئاکامدا پیرە پیاوێکی کوشت و ماڵ و سامانەکەی تالان کرد، هەر بۆیە قۆڵبەستیان کرد و دوای دادگایی کران بە مەرگ مەحکووم بوو. خەڵکی ئەوێ زوو هەڵناچن و بەکەوچکە ئاوێ ناکەونە

9- ئینجیلی لووقا، بەشی پازدەهەم.

مەلە. لە بەندیخانەدا زۆر زوو قەشەکان و ئەندامانی کۆڕی برایەتی مەسیح و ژنانی مرۆڤدۆست و... یارمەتییان دا. لە زینداندا فێری خوێندنەوە و نووسینیان کرد و ئینجیلیان بۆ شیکردەوە. ئامۆژگارییان کرد و ئەوەندەیان بە گوێدا هەڵخوێند هەتا دانی بە تاوانەکەیدا نا. ئیمانی بە دینی مەسیح هێنا. بۆ دادگای نووسی من ڕمووزنم، دێوەزمەیەکی کوێرم. بەڵام خودای مەزن بینایی پێبەخشیم و بە هانامەوە هات. تەواوی خەڵکی ژنێوی تووشی سەرسووڕمان کردبوو. ـ هەموو خەڵکانی مرۆڤدۆست و ئایینی ژنێو. هەموو عێلی ئەشرافی و نەجیمزادان ڕژانە نێو بەندیخانە و ڕیچاردیان لە ئامێز گرت و ماچیانکرد: "تۆ برای ئێمەی. خودا بە هاناتەوە هاتووە." ڕیچاردیش لە ناخی دڵەوە دەکوڵا و فرمێسکی هەڵدەڕشت: «بەڵێ! خودای دڵۆڤان بە هانامەوە هاتووە! لە تەواوی ماوەی منداڵیمدا تەنیا دڵخۆشیم ئەوە بوو ژەمێکم خۆراکی بەراز دەستبکەوێ. بەڵام ئێستا تەنانەت لوتف و بەزەیی خودام بە نسیب بووە و من لە باوەشی خودادا دەمرم!» بەڵێ بمرە، ڕیچارد لە باوەشی خودادا بمرە! چونکە تۆ خوێنت ڕشتووە و دەبێ سزا بدرێی. ئەگەرچی سەردەمێک تەماحت لە خۆراکی بەراز دەکرد و لە سەر دزینی چۆڕێ شلّقاو دار و قامچیت نۆش دەکرد. هەقی خۆشت بوو لێت بدەن. (چونکە ئەو کارە هەڵەیە و دزیکردن حەرامە.)؛ بەڵام ئێستا پیاوت کوشتووە و دەبێ بمری.» ڕۆژی ئاخر ڕیچارد بەوپەڕی بێهێزییەوە، لە گریان زیاتر هیچی لە دەست نەدەهات. سات لە دوای سات دووپاتی دەکردەوە: "خۆشترین ڕۆژی تەمەنم ئەمڕۆیە. خەریکم دەڕۆم بۆلای خودا." قەشەکان و داوەران و ژنانی مرۆڤدۆست هاواریان دەکرد: "بەڵێ، ئەمڕۆ خۆشترین ڕۆژی تەمەنتە، چونکە خەریکی دەڕۆی بۆ لای خودا!" تاقمێکی زۆر بەپێیان و سوارە بە شێوەیەکی ڕێکوپێک بەدوای عارەبانەی هەڵگری ڕیچارددا دەڕۆیشتن کە بەرەو گۆڕەپانی سزا دەچوو. لە گۆڕەپانەکە ڕیچاردیان دابەزاند و پێیانگوت: "بمرە براکەم، لە باوەشی خودادا بمرە، چونکە تەنانەت تۆش وەبەر لوتفی خودا کەوتی!" بەوشێوەیە ڕیچارد کە

لەلایەن خەڵکەوە ماچباران دەکرا، بردیانە سەر سەکۆی سزا و بەرەولای گیووتینەکەیان برد. ئیمانداران بە شێوەیەکی برایانە ملیان پەڕاند، چونکە کەوتبووە بەر لوتفی یەزدان. بەڵێ ئەوە دیاردەیەکی شاز و هەڵبژاردەیە. ئەو ڕیسالەیەش تاقمێک لە مرۆڤدۆستانی ڕووسی لە چینی ئەشرافزادان و مزگێنیدەرانی ڕزگاری لە ژێر تیشکی ئیمانی مەسیحدا، بە زمانی ڕووسی وەریانگێڕاوەتەوە. هەر بە خۆڕاییش لە نێو خەڵکدا دابەشیانکردووە تاکو چاو و دڵیان پێی ڕوون بێتەوە. بەسەرهاتی ڕیچارد زۆر سەرنجڕاکێشە. چونکە ڕووداوێکی نەتەوایەتییە. ئەگەرچی بە بڕوای ئێمە پەڕاندنی سەری کەسێک بێبایەخ و هیچە. چونکە ئەو بۆتە برامان و وەبەر لوتف و بەزەییی خودا کەوتووە. لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە شێوەی تایبەتی خۆمان هەیە، کە زۆر لەوە خراپترە. گەمەی مێژوویی ئێمەش ئەوەیە بەخواستی خۆمان و بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ دەبینە هۆی ئازاری ئەموئەو. نێکراسۆف لە نووسراوەیەکدا باسی کابرایەکی لادێیی دەکا کە بە خەرەزەنگ لە چاوی ئەسپێک دەدا. «لە چاوە سەبوورەکە»ی هەموو کەسێک ڕەنگە چاوی بەو شێوە دیمەنە کەوتبێ[10].

ڕەنگ و مۆری ڕووسیی پێوەیە. نێکراسۆف دەڵێ ئەو ئەسپە، ئەسپێکی پیر و چکۆڵە بوو. بارێکی قورسی لێ نرابوو و توانای نەبوو بەڕێدا بڕوا. ئەو لادێیە دەیداتە بەر زەبری خەرەزەنگ، دڕندانە لێیدەدا، ئەوەندەی لێدەدا کە لە ئاکامدا بە بادەی ڕق و ستەم مەست دەبێ و خۆشی نازانێ چدەکا. بێبەزەییانە و شەلمکوێرم ناپارێزم تێی بەردەبێ. "ئەگەرچی پیر و بێهێزی، بەڵام دەبێ ئەو بارە هەڵگری، دەنا دەبێ بتۆپی." ئەسپی چارەڕەش هەرچەند لەخۆ دەنووسێ و هێز وەبەر خۆی دەنێ ناتوانێ، ئەویش دەست دەکا بە لێدانی چاوە پڕ ئاوەکانی، «چاوە سەبوورەکەی» ئەو ئاژەڵە بەستەزمانە. ئەو ئەسپە چارەڕەشە تۆقیوانە هەوڵدەدا بارەکە بەرێ، کەوتۆتە هانکە هانک و ئازای ئەندامانی دەلەرزێ. لەپەستا سەرسم دەدا و خەریکە بکەوێ. بەڵام ئەوە ئەسپێکە و بەس، خوداش ئەسپی بۆ لێدان و خەرەزەنگ خواردن داوە بە

10- «تا شەفەق» دۆستۆیۆفسکی ئەم دیمەنەی لە «تاوان و سزا"شدا هێناوە.

مرۆڤ. ئەوەش تاتارەکان فێریان کردین و قامچیان بە یادگاری بۆ بەجێ هێشتین. بەڵام دەکرێ قامچی لە مرۆڤیش بدەی! ئاغایەکی خوێندەوار و خاوەن فەرهەنگ، لەگەڵ ژنەکەی بە شوولکە تەڕ لە کچەکەی خۆیان دەدەن کە حەوت ساڵی تەمەن بووە. دەقی ئەوەشم لەلایە. کابرا بەوە دڵخۆشە کە شوولکە تەڕی بەدەستەوەیە. گوتوویە: "چاکی هەڵدەتەزێنێ" هەر بۆیە دەستدەکا بە هەڵتەزاندنی کچەکەی. بۆم دەرکەوتووە مرۆڤی وا هەیە هەر زەبرێک دەوشێنێ مەیل و تاسەی قوڵپدەدا و هەرچەند زیاتر بوەشێنێ هەوەس و تاسەی زیاتر دەبێ. دەقیقەیەک دەوەشێنن، پێنج دەقیقە دەوەشێنن.دە دەقیقە دەوەشێنن. هەرچەندە زیاتریش بوەشێنن دڕندەییەکەیان زیاتر پەرە دەستێنێ. منداڵە هەتا دەتوانێ دەقیژێنێ، دەزیڕێنێ، لە ئاکامدا توانای قیژاندنیشی نامێنێ. بە هەناسەبڕکێوە دەڵێ: "باوە! باوە!" وایلێدێ کابرای دێوەزمە بەرەو دادگا ڕاکێش دەکرێ. وەکیل دەگیرێ. ڕووسییەکان زۆر لەمێژە وەکیلیان ناو ناوە «ویژدانێکی بەکرێگیراو» ئەو وەکیلە بۆ پارێزگاری لە کابرای تاوانبار دەڵێ: "دوسییەیەکی زۆر سادەیە. ڕووداوێکی ڕۆژانەی بنەماڵەیە. باوکێک منداڵەکەی دەعاملێنێ. بۆیە زۆر کارێکی ناحەز و شوورەییە بۆ ئێمە ئەو گرفتە چکۆلەمان کێشاوەتە دادگا." ئەندامانی کۆڕی داد، کە بەو قسەیە قانع بوون، حوکمی ڕەزایەتیان دەرکرد. خەڵکیش بە دیتنی ئەو دیمەنە و ئازادبوونی کابرای دڕندەدەستیان کرد بە چەپڵەڕێزانی شادی. مخابن لەوێ نەبووم! ئەگەر لەوێ بووایەم، پێشنیارم دەکرد یارمەتییەکیشی بۆ کۆ بکەنەوە و خەڵاتی بکەن!... دیمەنێکی سێحراوی بوو، وانییە؟

«بەڵام هێشتا سەبارەت بە منداڵان چیرۆکی چاکترم لەلایە. سەبارەت بە منداڵانی ڕووسی زۆرم مەتڵەب کۆ کردۆتەوە ئالیووشا. کچێکی پێنج ساڵانە دایکی و باوکی "کەسانێکی زۆر بەڕێز و هێژا و خوێندەوار و نەجیمزادە" لێی بەڕقدا دەچن. دەبێ ئەوەش دووپات بکەمەوە کە ئەم مەبەستە زۆربەی مرۆڤەکان دەگرێتەوە، مەبەستم ئەم مگێزی منداڵ ئازاردانەیە. تەنیا منداڵانیش. ئەم ئەشکەنجەگەرانە دەرهەق بە خەڵکانیتر و گەورەکان

کردەوەیان زۆر بە نەرمونیان و خێرخوازانەیە، ڕاست وەک فەڕەنگییە خاوەن فەرهەنگ و مرۆڤدۆستەکان؛ بەڵام سەیر حەز بە ئازاردانی منداڵان دەکەن. لەلایەکەوە زۆریشیان منداڵ خۆش دەوێ. تەنیا بێدەسەڵاتی و بێهێزیی منداڵانە ئەو ئەشکەنجەگەرانە هان دەدا. ڕاست بڕوا و متمانەی فریشتەئاسای منداڵی بەستەزمان و بێپەنایە، خوێنی پیس و گەماری ئەو ئەشکەنجەگەرانە وەکوڵ دێنێ. هەڵبەت لە ناخی هەموو مرۆڤێکدا دڕندەیەک وەرکەوتووە - دڕندەی ڕق، دڕندەی ئاگری هەوەس کە بە قیژەی قوربانیی ئەشکەنجەکراو ڕادەچەنێ. دڕندەیەکی هەوسار پساندووی بێیاسا، دڕندەی نەخۆشییێک کە لە دوای شڕودڕی و باداری و نەخۆشیی گورچیلە سەر هەڵدەدا.

«ئەو کچە بەستەزمانە پێنج ساڵانەیە، دایک و باوکە خاوەن فەرهەنگەکەی بە هەموو شێوەیەک ئازاریدەدەن. لێیدەدەن، بە قامچی هەڵیدەتەزێنن، بەبێ هیچ بنۆسێک هێندەی لێڕەبا دەدەن و سیخورمەی تێدەکوتن و بە شەپ تێی هەڵدەدەن هەموو گیانی وەک کەوکەمانە شین و ڕەش هەڵدەگێڕن. پاشان لەوەش زیاتر شووی لێ هەڵدەکێشن و لە کاتی سەرما و بەستەڵەکدا دەیکەنە نێو مەبال و دەرگای لە سەر دادەخەن. چونکە داوای لێنەدەکردن شەوانەش لەو ئاودەستەی بێننە دەرێ، (پێیان وایە منداڵێکی پێنج ساڵان کە وەک فریشتە خەو دەیباتەوە، دەکرێ فێر بێت و لەخەو ڕاپەڕێ و داخوازییەکی هەبێ) میز و پیسی بە سەروچاویدا دەکەن و ناچاری دەکەن بیخوا. دایکیشی، ئەرێ دایکیشی ئەو کارەی لەگەڵ کردووە. جا بیهێنە بەرچاوی خۆت دایکێکی ئاوا زورە زووڕی منداڵە زیندانی و بەستەزمانەکەی لە نێو ئاودەستەوە بگاتە گوێی و خەوی لێبکەوێ! سەرت لەوە دەردەچێ کە بوونەوەرێکی چکۆڵە، کە تەنانەت لەوە ناگا چ بەلایەکیان بە سەر هێناوە، لەو شوێنە پیسەدا، لەو ئاودەستە سارد و تاریکەدا بە دەستە چکۆلەکانی لە سینگە پڕ ژانەکەی خۆی دەدا و فرمێسکە زوڵاڵ و بێڕقەکەی پێشکەش بە خودای خۆشەویست و دڵۆڤان دەکا تاکو ئاگای لێیبێ؟ براکەم، هاوڕێکەم، مریدە ئیماندار و خاکەڕاکەم، تۆ دەتوانی لەو کارە دزێو و پڕ لە شوورەییە بگەی؟ لەوە دەگەی

که بۆ دەبێ ئەو جۆرە دڵڕەقی و باوەڕە قۆڕە لە کۆمەڵدا هەبێ و ئازادیش بێ؟ دەڵێن بەبێ ئەوە مرۆڤ نەیدەتوانی لە سەر زەوی بژی. چونکە نەیدەزانی چۆن لە خێر و شەڕ ئاگادار بێ. بۆ دەبێ لەو خێر و شەڕە نەگبەتی و دزێوە بگا، کە ئەوهەمووە گرانی بۆ تەواو دەبێ؟ ئاخر ئەگەر تەواوی دنیا پڕ لە ماریفەت و ئیمان و خواپەرستیبێ، بەقەد دۆعای ئەو منداڵەی بایەخ نییە کە لەبەر «خودای خۆشەویست و دڵۆڤان» دەپاڕێتەوە! باسی ئازاری گەورەکان ناکەم ئەوان سێوەکەیان خواردووە. لەعنەتیان لێبێ. گلێنەیان دەرێ! بەڵام ئەو منداڵانە! ئالیووشکا خەریکم دەبمە هۆی ئازارت، بۆ ئاوا تێکچووی؟ ئەگەر پێت خۆشبێ لەوە زیاتری لە سەر ناڕۆم.»

ئالیووشا لەبەرخۆیەوە گوتی: «گوێی مەدەیە. منیش دەمەوێ ئازار بکێشم.

«دیمەنێکی دیکە.تەنیا دیمەنێکی دیکە. چونکە زۆر سەرنجڕاکێش و بەرچاوە. لەمبەینانەدا لە کۆمەڵە کتێبێکی دەسنووسی ڕووسیدا خوێندمەوە کە لە «ئەرشیڤ»دا ڕاگیرابوو. ناوەکەیم لەبیر نەماوە. دەبێ دیسان بیخوێنمەوە. ناوەکەیم لەبیر نەماوە. دەبێ دیسان چاوی لێبکەمەوە. لە ڕۆژانی ڕەشی کۆیلەداریدا کە لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا ڕوویداوە. کەوایە بژین ڕزگارکەرانی خەڵک! لەو سەردەمەدا ژینراڵێک بوو لەگەڵ دەستوپێوەندە ئەشرافی و خاوەن مڵکە گەورەکان، یەکێ لەو کەسانە -کە پێموایە ئەو وەختەش دانووی لەگەڵ کەس نەکولاوە - دوای خانەنشینکران لە کاری دەوڵەتی و حەسانەوە و لاق ڕاکێشان پێیوادەبێ ژیان و مەرگی ڕەعیەتەکان لە دەستی خۆی دایە و هەرچۆنی پێیخۆشبێ دەتوانێ ڕایدا. ئەو کاتانە مرۆڤی ئاواش هەبووە. ئەو ژینراڵەش کە باسمانکرد دەچێ لە سەر مڵکەکەی خۆی دادەنیشێ و دوو هەزار ڕەعیەتی دەبێ و بە شێوەیەکی زۆر زاڵمانە کاریان لێدەکێشێ و ژیان لەو خەڵکە ڕشوڕووت و هەژارانە دەکاتە زەقنەمووت. کولانە سەگی وای بووە جێگای سەد تانجی و تولەی تێدا بۆتەوە. نزیکەی سەد کەسیشی سەگەوان گرتبوو کە هەموویان سوارە بوون و یۆنیفۆرمیان لەبەردا بووە. ڕۆژێک کوڕی یەکێک لەو ڕەعیەتە هەژارانە، کە تەمەنی هەشت

ساڵان بووە، بەردێک دەهاوێ و لە لاقی تولەی خۆشەویستی ژینڕاڵ دەدرێ و برینداری دەکا. "ئەو تولە خۆشەویستەم بۆ دەشەلێ؟" پێی دەڵێن ئەو کوڕە بەردی هاویشتووە و لاقی تولەکەی بریندار کردووە. "دەی کەوایە تۆ ئەو کارەت کردووە؟" ژینڕاڵ چاوێک لە سەرتاپای کوڕە دەکا. "بیگرن." دەیگرن و لە کاتێکدا دەستی بە داوێنی دایکییەوە گرتبوو بە ڕاکێش ڕاکێش دەیبەن و ئەو شەوە هەتا بەیانی زیندانیی دەکەن. بەیانی زوو ژینڕاڵ بە پۆز و هەوایەکی شاهانەوە دێتە دەرێ. ڕەوەیەک تاژی و سەگەوان و ڕاوچی هەموو بە سواری لە دەوری کۆ دەبنەوە. ژینڕاڵ سواری ئەسپەکەی دەبێ. تەواوی ڕەعیەتەکان بە ژن و منداڵەوە دێنن بۆ چاوترسێن کردن لەوێ ڕایاندەگرن. دایکی کوڕە لە ڕیزی پێشەوە ڕادەوەستێ. کوڕە لە بەندەکەی دێننە دەرێ. ڕۆژێکی سارد و خەمناک و تەمومژاویی پایز بوو. کزەی زریان چزەی لە لووت و دەست و پلی خەڵکی ڕووتەڵە هەڵدەستاند و تفت هەڵاویشتبایە دەیبەست، ڕۆژی واش خودا دایناوە بۆ ڕاو. بە فەرمانی ژینڕاڵ کوڕەیان ڕووت کردەوە. کوڕە لە سەرمانا وەک شەقشەقە دەلەرزێ. ئەگەرچی لە ترسانا ئەژنۆی شکاوە، بەڵام ناوێرێ بشگری... فەرماندەر فەرمان دەردەکا. "هەڵیبڕن با هەڵێ." سەگەوانەکان دەگوڕێنن: "هەڵێ دەی! هەڵێ!" کوڕە هەڵدێ... ژینڕاڵ دەنەڕێنێ: "ئەو تانجی و تولەیانەی تێبەردەن!" تەواوی تاژی و تولەکان وەسەر کوڕە دەکەون. هەڵدەکوتنە سەری و لەبەر چاوی دایکی لەتوپەتی دەکەن!.. وەک دەگێڕنەوە دوای ماوەیەک ژینڕاڵ لە سەر کارەکەی لادەبەن چونکە توانایی بەڕێوەبەرایەتیی نابێ. باشە لە سەر چی؟ یانی گوللەبارانی دەکەن؟ تەنیا لەبەر ڕازی کردنی دڵی ئێمە؟ ئالیووشکا، بۆ قسە ناکەی؟ دە شتێ بڵێ!»

ئالیووشا بە بزیەکی خەماوی و ڕوخساری بزڕکاوەوە سەری هەڵێنا و لەبەرخۆیەوە گوتی: «گوللەباران!»

ئیوان بەوپەڕی شادییەوە گوڕاندی: «ئافەرەم! ئەگەر ئەوەش بڵێی مانای ئەوەیە کە... ڕاهیبێکی باشی! ئالیووشا کارامازۆف دیارە شەیتانێکی چکۆلە لە نێو دڵتدا هەڵکورماوە.»

ـ ئەوەی گوتم هیچ نەبوو، بەڵام...

ئیوان گوڕاندی: «ئەوەی جێی سەرنجە هەر ئەوەیە، ئەم «بەڵام»ە. ئەی خاوەن ئیمان، با پێتبڵێم کاری هیچوپووچ لە سەر زەوی زۆر پێویستە. دنیا لە سەر هیچوپووچ دامەزراوە و بەبێ ئەوەش ڕەنگە هیچ شتێک سەرنەگرێ. چونکە ئەوەی دەیزانین هەر دەیزانین!»

ـ تۆ چی دەزانی؟

ئیوان وەک وڕێنە بکا درێژەی بە قسەکانی دا: «من سەرم لە هیچ شتێک دەرناچێ. ئێستاش نامەوێ لەو شتانە بگەم. دەمەوێ ڕاستەقینەکان بگرم و بەرینەدەم. زۆر لەمێژە بڕیارمداوە نەزانم. ئەگەر بمهەوێ لە شتێک بگەم، خەیانەتم بە هەقیقەت و ڕاستی کردووە. هەر بۆیە بڕیارمداوە ڕاستی و هەقیقەت بگرم و دەستی لێ بەرنەدەم.

ئالیووشا بە لەبزێکی تاڵەوە هاواریکرد: «بۆ ئازارم دەدەی؟ پێمدەڵێی مەبەستت چییە یان نا؟»

ـ ئەی چۆن پێتناڵێم، مەبەستم هەر ئەوە بووە. تۆ زۆر خۆشەویستی لەلام. ناشمهەوێ هەروا لێتگەڕێم بڕۆی. بە زووسیماشت ناسپێرم.

ئیوان ماوەیەک بێدەنگ بوو. لە ناکاو ڕەنگی هەڵبزڕکا و خەمێکی قورس دایگرت.

«دەزانی چی! بۆیە باسی منداڵانم هێنا گۆڕێ، تاکو مەسەلەکە ڕوونتر کەمەوە. باسی ئەو فرمێسکانەی مرۆڤیش ناکەم کە ڕووکار و ناخی زەویی خووساندووە. بەقەستی لە سەر ئەو مەسەلەیەی خۆم پێداگری دەکەم. من گەنەکەوڵەیەکم و هیچی تر، بەوپەڕی خاکەڕاییشەوە دەزانم کە ناتوانم لەوە بگەم بۆچی دنیا بەو شکڵەی کە هەیە دامەزراوە. پێموایە مرۆڤ خۆی شیاوی لۆمەیە. بەهەشتیان پێدان. ئازادییان ویست و ئاگریان لە ئاسمان ڕفاند،

ئەگەرچی دەیانزانی خێری لێنابینن. بۆیە پێویست ناکا دڵسۆزییان بۆ بکەم. بە فامی ئەقلیدێسی و خۆڵینەی خۆم سەروبنی تێگەیشتوییم ئەوەیە کە ئازار هەیە و هیچ کەسیش تاوانبار نییە. مەعلوول بەدوای عیللەتدا دێ، ڕاست و ڕەوان هەموو شتێک وەگەڕ دەکەوێ و بواری خۆی دەدۆزێتەوە، بەڵام ئەوە قۆڕیاتێکی ئەقلیدێسییە، ئەوەش دەزانم، بەڵام ناتوانم بەخۆمی بسەلمێنم کە لەگەڵیدا بژیم! ئەوە کوا مایەی هێمنایەتی و حەسانەوەم کە هیچکەس تاوانبار نییە و مەعلوول ڕاست و ڕەوان و سانا بەدوای عیللەتدا دێ و دەزانم دەبێ تۆڵە و سزایەک لە گۆڕێدا بێ دەنا خۆم لە نێو دەبم. ئەویش تۆڵە و سزایەک نەک لە کات و شوێنێکی بێبڕانەوە، بەڵکو هەر لێرە لە سەر ئەم زەوییە، بە مەرجێک بە چاوی خۆم بیبینم. باوەڕم بەوەش هەیە. دەمهەوێ بیبینم، ئەگەر تا ئەو کاتە مردبێتم، چاکتر وایە دیسان کفن بدڕم و گۆڕەکەم هەڵتەکێنم، چونکە ئەگەر بەبێ من ئەو ڕووداوە بقەومێ، ئەوپەڕی بێئینسافییە. ئاشکراشە کە ئازارم نەچێشتووە. لەوانەیە تەنیا بوونی من و تاوان و ئازارەکانم ببێتە هۆی هەماهەنگی و مایەی ژیانی داهاتوو بۆ کەسێکی تر. دەمەوێ بەچاوی خۆم ببینم گورگ و مەڕ پێکەوە ئاو دەخۆنەوە و قوربانی هەڵدەستێتەوە و بکوژەکەی خۆی لە ئامێز دەگرێ. دەمهەوێ ئەو کاتەی کە هەمووان لە ناکاو تێدەگەن کە ئەم هەموو گێرەوکێشەیە بۆچی بووە، لەوێ بم. تەوای مەزهەبەکانی دنیا لە سەر ئەو ئارەزووە ڕۆنراون و من ئیمانم بەوە هەیە. بە کاتێک کە مەسەلەی منداڵ دێتە گۆڕێ، سەبارەت بە ئەوان دەبێ چبکەم؟ ئەوەش پرسیارێکە و سەرم لە وەڵامەکەی دەرناچێ. بۆجاری سەدەم پاتەی دەکەمەوە کە پرسیارگەلێکی زۆر هەیە، بەڵام تەنیا منداڵانم هەڵبژاردووە. چونکە سەبارەت بە ئەوان ئەوی دەیڵێم، بەبێ هیچ وەڵامێک وەک ڕۆژی ڕوون ئاشکرایە. گوێ بگرە! ئەگەر بڕیارە هەمووان ئازار بکێشن تاکو ئەرکی خۆیان دەرهەق بە هەماهەنگیی ئەبەدی بەجێبێنن، منداڵان کاریان بە سەریانەوە چییە؟ تکات لێدەکەم ئەوەم پێبڵێ! پیاو لەوە ناگا لەبەرچی ئەوانە ئازار دەکێشن و بۆچی دەبێ ئەرکی سەرشانی خۆیان دەرهەق بە

هەماهەنگیی ئەبەدی بەجێبێنن! بۆ دەبێ ئەوانیش مادەیەک ساز بکەن بۆ پیتاندنی خاک لەبەر هەماهەنگیی داهاتوو. سەرم لە بەشداریی تاوان لە نێوان مرۆڤەکاندا دەرناچێ. هەروەها سەرم لە تۆڵە و کوشتنەوەش دەرناچێ. بەڵام ئەو تاوانە هاوبەشە ناتوانێ لە نێوان منداڵاندا هەبێ. ئەگەر لە ڕاستیشدا وابێ و ئەوان بەرپرسی تاوانی گەورەکانیان بن، هەقیقەتێکی وا پێوەندیی بەم دنیایەوە نییە و من تێیناگەم. ڕەنگە قسە نەقاڵێک بڵێ ئەو منداڵە گەورە دەبێ و تاوان دەکا. بەڵام خۆ دیتت گەورە نەبوو و لە تەمەنی هەشت ساڵاندا سەگەل لەتوپەتیان کرد. ئاخ، ئالیووشا کفر ناکەم! دەشزانم چ قیامەتێک هەڵدەستێ، کاتێک ئەوەی لە عەرز و ئاسمانە لە سروودێکی ئایینیدا تێکدەهاڵێن و ئەوەی ژیاوە و دەژی بە دەنگی بەرز هاواردەکا: "خودایە، تۆ عادڵی؛ چونکە ڕێگاکانت ڕوون و ئاشکران." کاتێک ئەو دایکە، ئەو ڕمووزنە دڵڕەقە لە باوەش دەگرێ کە منداڵەکەی کردۆتە چێشتەی سەگەل و هەرسێکیان وێکڕا بە چاوی فرمێسکاوییەوە هاوار دەکەن: "خودایە، تۆ عادڵی!" هەڵبەت ئەو کاتە مرۆڤ تاجی ماریفەت لە سەر دەنێ و هەموو شتێک ئاشکرا دەبێ. بەڵام شتێک کە ئازارم دەدا ئەوەیە کە ناتوانم ئەو هاوسەنگییە قەبووڵبکەم. هەتا لە سەر ئەو دنیایەش بژیم، پەلەی ئەوەمە توانایی و تاقەتی خۆم هەڵسەنگێنم. چاو لێکە ئالیووشا ڕەنگە لە ڕاستیدا ئەو شتە ڕووبدا بەڵام لەوانەیە تا ئەو کاتە من نەمێنم، تاکو گۆڕەکەم هەڵتەکێنم و چاوم پێیبکەوێ. منیش ڕەنگە بە دیتنی ئەو دایکەی کە ئەشکەنجەگەری کوڕەکەی لەئامێز دەگرێ، لەگەڵ هەمووان هاوار بکەم: "خودایە، تۆ عادڵی!" بەڵام لەو کاتەدا نامەوێ دەنگ هەڵبڕم. هەتا دەرفەتم ماوە. پەلەی ئەوەم دەبێ خۆم بپارێزم و بەگشتی چاوپۆشی لە هاوسەنگیی گەورەتر بکەم. تەواوی ئەو هاوارانە بە فرمێسکی ئەو منداڵە ئازار چێشتووە نابێ، کە بە مشتە چکۆڵەکانی لە سینگی خۆی دەدا و لەو مەبالە بۆگەنەدا بە فرمێسکە ڕوونەکانی لە خودا دەپاڕایەوە "خودای خۆشەویست و دڵۆڤان"! چونکە ئەو فرمێسکانە بە هیچ شتێک قەرەبوو ناکرێنەوە. دەبێ ئەو فرمێسکانە قەرەبوو

بکرێنەوە، دەنا عەداڵەت و هاوسەنگی ناتوانێ لەکاردا بێ. بەڵام چۆن؟ چۆنمان ئەو فرمێسکانە بۆ قەرەبوو دەکرێنەوە؟ بێژی ئەو کارەمان بۆ بلوێ؟ بە تۆڵەساندنی ئەو فرمێسکانە؟ بەڵام من چکارم بە تۆڵە کردنەوەی ئەو فرمێسکانەیە؟ من کارم بە سەر دۆزەخی زاڵمانەوە چییە؟ دۆزەخ بەکاری چی‌دێ، لەبەر ئەوەی ئەو منداڵانە ئازاری خۆیان چێشتووە؟ ئەی ئەگەر دۆزەخێک لەئارادا نەبێ، عەداڵەت و هاوسەنگی دەبێ بەچی؟ دەمهەوێ لێبوردوو بم. دەمهەوێ ئامێزم ئاواڵەکەم بۆ لەباوەش گرتن. نامهەوێ ئازاری زیاتر بچێژم. ئەگەر ئازاری منداڵان نرخی ئەو ئەشکەنجانە زیاد بکا کە قەرەبوو کردنەوەیان پێویستە، ئەو کاتە نارەزایەتی دەردەبڕم و دەڵێم هەقیقەت بایەخی ئەو تاوانەی نییە. ناشمهەوێ ئەو دایکە لەو زاڵمە ببوورێ کە منداڵەکەی بە زیندوویی کردە خۆراکی سەگەل! هەقی نییە لێی ببوورێ! لێیگەڕێ ئەگەر پێیخۆشە لەبەر دڵی خۆی لێی‌خۆشبێ. لێیگەڕێ با لەبەر ئازاری بێسنوور و سووتانی جەرگی دایکانەی خۆی لەو زاڵمە ئەشکەنجەگەرە خۆش بێ. بەڵام هەقی ئەوەی نییە ئازاری منداڵە ئەشکەنجەکراوەکەی ببەخشێ، تەنانەت ئەگەر منداڵەکەش لە ئەشکەنجەگەرەکە ببوورێ، دایکی هەقی نییە لێیببوورێ! ئەگەر واشبێ، ئەگەر ئەوان نەوێرن لەو زوڵمانە خۆشبن، عەداڵەت و هاوسەنگی چیی بە سەر دێ؟ بێژی لە سەرانسەری جیهاندا کەسێک هەبێ هەقی لێبوردنی هەبێ و بتوانێ لە تاوانبار خۆشبێ؟ من عەداڵەتم ناوێ، ئەو هاوسەنگییەم بۆچییە؟ لەبەر دڵسۆزی بۆ مرۆڤایەتی ئەوەم ناوێ. پێم باشترە بە ئازاری سزا نەدانەوە سەر بنێمەوە. تەنانەت ئەگەر تاوانباریش بووبێتم. جگە لەوەش بۆ هاوسەنگی سزایەکی زۆر قورس داوادەکرێ و لە تاقەتی ئێمەشدا نییە، بۆ ئەو کارە ئەو هەموو ئازارە بچێژین. کەوایە پەلەی ئەوەمە بلیتی چوونە ژوورەوەیان پێبدەمەوە و نەمهەوێ. ئەگەر مرۆڤێکی ڕاستبووبێتم ئەرکی سەرشانمە لە زووترین کاتدا بیان‌دەمەوە. هەر ئەو کارەشم هەیە بیکەم. ئالیووشا وانییە کە خودام قەبووڵنەبێ، بەڵام بەوپەڕی ڕێزەوە بلیتەکەیان پێدەدەمەوە.»

ئاليووشا کە سەری داخستبوو لەبن لێوەوە منجاندی: «ئەوە نافەرمانییە.»
ئیوان بە گرژی گوتی: «نافەرمانی؟ بەداخەوەم کە ئەوە بە نافەرمانی دەزانی. مرۆڤ ناتوانێ لە نافەرمانیدا بژی. منیش دەمهەوێ زیندوو بمێنم. خۆت پێمبڵێ، زووکە جوابم دەوە. وایدانێ خەریکی دانانی بناغەی چارەنووسی مرۆڤی، بەو ئامانجەوە کە لە کۆتاییدا مرۆڤەکان بەختەوەر دەکەی و سەفا و شادی و هێمنایەتییان دەدەیەوە. بەڵام پێویست بێ بوونەوەرێکی وردیلە ـ وای دانێ ئەو منداڵە چکۆلەی بە مست لە سینگی خۆی دەدا ـ هەتا سنووری مەرگ ئەشکەنجە بدەی و ئەو بینایە لە سەر هێی فرمێسکی تۆڵە نەکراوەی ئەو هەڵچنی. ئایا قەبووڵتە ئەو بینایە بنچینەکەی لە سەر ئەو مەرجە دارێژی؟ زووکە پێمبڵێ، ڕاستییەکەیم پێبڵێ.»
ئاليووشا بە هێمنی گوتی: «نا، قەبووڵم نییە.»
ـ ئەی دەتوانی ئەو ئەندێشەیەت پێباش بێ کە ئەو مرۆڤانەی بیناکەیان بۆ ساز دەکردی، ڕازی بن کە بەختەوەری و چارەنووسیان لە سەر بناغەی خوێنی قیساس نەکراوی منداڵێک دامەرزێ؟ بەو ڕەزایەتەش هەتا هەتایە بەختەوەر بمێننەوە؟
ئاليووشا لەکاتێکدا چاوی زیتەی دەهات گوتی: «نا، پێم باش نییە براکەم. هەر ئێستا گوتت بێژی لە تەواوی دنیادا مرۆڤێک هەبێ هەقی لێبووردنی هەبێ و بتوانێ لە تاوانبار خۆشبێ؟ بەڵام کەسێک هەیە، ئەو دەتوانێ لە هەموو شتێ خۆشبێ. لەبەر هەرکەسێک و هەر شتێک، چونکە ئەو گیانی پاکی خۆی لەبەر خاتری هەموو کەس و هەموو شتێک کردە قوربانی. ئەوت لەبیر چۆتەوە، لە سەر ئەو بینا ساز دەکرێ و ئەوانیش هاوار لە ئەو دەکەن: خودایە تۆ عادڵی، چونکە ڕێگاکانت ڕوون و ئاشکرا کراوە!»
ـ ئاخ مەبەستت ئەو وجوودە بێتاوانە و خوێنەکەیەتی! نا، ئەوم لەبیر نەچۆتەوە. بە پێچەوانە، تا ئێستا لە خۆمم پرسیوە چۆن لە پێشدا ناوی ئەوت نەهێنا گۆڕێ. چونکە تۆ لە باسەکانتدا زۆربەی کات سەرەتا باسی ئەو دەکەی. دەزانیچی ئاليووشا، ـ پێنەکەنی ها! نزیکەی ساڵێک لەمەوبەر

شیعرێکم هۆنیوەتەوە. ئەگەر بتوانی پێنج خولەکی دیکە کاتی خۆت لەگەڵ من بەفیڕۆ بدەی، دەیخوێنمەوە بۆت.

ـ تۆ شیعرت هۆنیوەتەوە؟

ئیوان بە پێکەنینەوە گوتی: «نانا، نەمهۆنیوەتەوە. بە عومراتی خۆم دێڕە شێعرێکیشم نەهۆنیوەتەوە. بەڵام ئەو شێعرەم بە پەخشان نووسی و لەبەرم کرد. کاتی نووسینی شیعرەکە لەوانە بوو دڵم بێخود بێ. تۆ یەکەم خوێنەری شیعرەکەمی ـ مەبەستم ئەوەیە یەکەم بیسەری.» ئیوان بزەیەکی هاتێ: «بۆ نووسەر چاوپۆشی لە بیسەرێک بکا؟ پێتخۆشە بۆتی بخوێنمەوە؟»

ئالیووشا گوتی: «زۆریشم پێخۆشە.»

ـ ناوی شیعرەکەم «پشکێنەری مەزن»ە؛ زۆر بێتام بووە، بەڵام دەمهەوێ بۆتی وەخوێنم.

## (٥)

## پشکێنەری مەزن

ئیوان بە پێکەنینەوە گوتی: «ئەوەش دەبێ پێشەکییەکی هەبێ - یانی پێشەکییەکی ئەدەبی، هە، هە، منیش سەرم لە دارشتنی پێشەکیی ئەدەبی درناچێ. با ئەوەشت پێبڵێم، چیرۆکەکەی من لە سەدەی شازدەهەمدا دەقەومێ. لەو سەردەمەدا ئەو جۆرەی کە شیاو بوو لە قوتابخانە فێری بی، ئەوە بوو کە لە شیعردا هێزی ئاسمانی بۆ سەر زەوی بێنن. جگە لە دانتە، لە فەرەنسا نووسەران و هەروەها ڕاهیبانی کلێسە، شانۆیەکیان هەبوو، لە لەودا «مادۆنا»[١١] پیاوانی خودا و فریشتەکانی مەسیح و خودا خۆی دەهاتنە سەر پەردە و دەوریان دەگێڕا. لەو سەردەمەدا، ئەو کارە بە شێوەیەکی سانا بەڕێوە دەچوو. لەسەردەمی دەسەڵاتی لوویی یازدەهەمدا بۆ شادیانەی دۆلفین[١٢] لە تالاری گشتیی شاری پاریس شانۆیەکی ئەخلاقی و بەلاشیان بۆ خەڵک بردە سەر پەردە، چیرۆکەکەشی پشتکووڕی نۆتردام بوو. ناوی شانۆکەیان نابوو:

"Le bon jugement de latres sainte et gracieuse viergemarie"[13]

کە مەریەمی پیرۆز خۆشی دێتە سەر شانۆ و «bon jugement» خۆی ڕادەگەیەنێ. لە مۆسکۆش هەتا سەردەمی پێتری مەزن هێندێ جار شانۆی لەو شێوەیە، تایبەت بە سەردەمی دێرین بەڕێوە دەبرا. بەڵام جگە لەو شانۆیانە هەموو جۆرە ئەوسانە و «هۆنراوە»یەک لەسەرانسەری جیهان بڵاو بووبۆوە و لەواندا بەپێی پێویست، گەورەکان و فریشتەکان و هەموو

---

11- Madonna وشەیەکی ئیتالیاییە بە مانای «خاتوونەکەم» کە بە مریەمی پیرۆزیان گوتووە.

12- نازناوی کوڕە گەورەی پادشای فەرەنسا.

13-"داوەریی دڵسۆزانەی مریەمی پیرۆز و پاک و دڵاوا."

هێزە ئاسمانییەکان لەودا بەشدارییان دەکرد. لە کلێسەکانی ئێمەش ڕاهیبان دەستیان کردبوو بە وەرگێڕان و نووسینەوە و هۆنینەوەی ئەو چەشنە شیعرانە. ـ جا بیری لێبکەوە لە چ سەردەمێکدا ـ سەردەمی تاتارەکان، بۆ وێنە، ئەو شیعرە هەیە، (بەڵام بە زمانی یۆنانی) بەناوی "گەشت و گەڕانی خاتوونی ئێمە لە دۆزەخ"، کە وەسفەکانی لەلانی جەسارەتەوە شان لە شانی وەسفەکانی دانتە دەدا. خاتوونی ئێمە سەردانی دۆزەخ دەکا و حەزرەتی میکائیل بە نێو دۆزەخدا دەیگێڕێ و ئەشکەنجە جۆراوجۆرەکانی نیشاندەدا. ئەو تاوانباران و سزاکانیان دەبینێ. تاقمێکی زۆر لە تاوانباران دەبینێ لە نێو دەریاچەی گڕ و کڵپەدا دەسوتێن. هێندێکیان بە قووڵایی زەریاچەکەدا ڕۆدەچن، بە شێوەیەک کە ناتوانن بێنەوە دەرێ و "ئەوانەش ئەو کەسانەن کە خودا لەبیریان دەباتەوە." کە ئەوەش توانایی و دەسەڵاتی خودا نیشاندەدا. خاتوونی ئێمە مەلوول و خەمبار، بە چاوی فرمێسک هەڵوەرێنەوە سوجدە دەبا بۆ بارەگای بەرزی خودا و بۆ تەواوی «دۆزەخییەکان» داوای لێخۆشبوون دەکا ـ بۆ تەواوی ئەو کەسانەی لەوێ چاوی پێیان کەوتووە. بەبێ هێچ جیاوازییەک. وتووێژەکەی لەگەڵ خودا زۆر سەرنجڕاکێشە. لە خودا دەپاڕێتەوە و دەست لە پاڕانەوە و ڕجا هەڵناگرێ. کاتێک خودا ئاماژە بە دەست و لاقی چوار مێخە کێشراوی کوڕەکەی دەکا بە سەر خاچەکەیەوە و لێی دەپرسێ: «چۆن لە ئەشکەنجەگەرانی ئەو خۆش بم؟» مریەم داوا لە تەواوی پیاو چاک و شەهید و فریشتە و مەلاییکەتەکان دەکا لەگەڵی بپاڕێنەوە و سوجدە بەرن، تاکو خودا لە هەموو تاوانباران بەبێ جیاوازی خۆشبێ. دوای بەڵێن وەرگرتن لە خودا کە هەموو ساڵێ لە ڕۆژی" هەینی پیرۆزەوە هەتا یەکشەممەی دوای جێژنی پاک، دەست لە ئەشکەنجەی تاوانباران ڕاگرێ. تاوانباران هەر لەو کاتەدا لە نێو دۆزەخەوە هاوار دەکەن و ئەو سروودە دەڵێنەوە: "خودایە، لەو داوەرییەدا دەسەڵاتێکی بەئینسافانەت هەیە." ئەگەر شیعرەکەی منیش لەو کاتەدا بنووسرابایە، شتێکی وەک ئەوە دەردەهات. لە شیعرەکەی مندا خودا دێتە سەر شانۆ بەڵام هیچ ناڵێ، تەنیا

وەدیار دەکەوێ و تێدەپەڕێ. لەو زەمانەوە کە بەڵێنیدا بە فەڕ و شکۆوە بێت، پازدە سەدەی بەسەردا هاتووە. پازدە سەدە لەو کاتە تێپەڕیوە کە نێردراوەکەی نووسیی: "ئێستا، لە زووترین کاتدا دێم،" لەو ڕۆژە و لەو کاتەدا، هەروەک خۆی لەم دنیایەدا پێشوێژیی کردووە، هیچکەس تەنانەت «کوڕ»یش ئاگادار نییە، تەنیا «باوک» ئاگادارە[14]. بەڵام مرۆڤایەتی هەروا بەو ئەشق و ئیمانەوە چاوەڕوانە، بە ئیمانێکی قایمتریشەوە. چونکە پازدە سەدەیە مرۆڤ لە دیتنی ئایەتی ئاسمانی بێبەشە:

*ئیمانتان هەبێ بە ئیلهامی دڵ*

*چون ئاسمانەکان نادەن بەڵێنی*[15]

هیچ شتێک نامێنێ جگە لەوەی دڵ ئیلهامەکەی دێنێ. ڕاستە لەو سەردەمەدا مۆجزاتێکی زۆر هەبووە. پیاو چاکانی وا هەبوون مۆجزەی سەرسوڕ هێنەریان نواندووە. نەخۆش و مجرۆیان چاک کردۆتەوە. بە وتەی ژینامەنووسان «مەلەکەی ئاسمان» لە چەند کەس لەگەڵ مرۆڤانی پیرۆز چاوپێکەوتنی هەبووە. بەڵام شەیتان لەوە خافڵ نەبوو و سەبارەت بەو مۆجزانە خەڵکی تووشی شک و دڕدۆنگی کرد. هەر ئەو کاتە لە باکووری ئاڵمانیا ڕافزییەکی بەسام و نوێ سەر هەڵدەدا. ئەستێرەیەکی مەزن، «وەکو چرا پڕشنگدار» ـ یانی کلێسە ـ کەوتە نێو سەرچاوەی ئاوەکانەوە و هەموو دەریاکان تاڵبوون[16]. ئەو ڕافزییانە مۆجزەکانیان بە درۆ دەخستەوە و کارەکەیان کافرانە بوو. بەڵام ئەوانەی کە ئێماندار مانەوە لە سەر دین و خودا پەرستیی خۆیان سوورتر بوون. وەک ڕابردوو، فرمێسکی مرۆڤایەتی بەرەو دەرگانەی خودا هەڵفڕی. چاوەڕوانی هاتنی مەسیح بوون و خۆشیان ویست و هیوادار مانەوە و خۆزگەیان خواست وەک ڕابردوو لە ڕێگەی ئەشقی ئەودا ئازار بکێشن و گیانیان فیدا بکەن. سەردەمانێکی زۆر، مرۆڤ بە

14- بڕوانە ئینجیلی مەرقۆس، بەشی سێزدەهەم.

15- دێرە شیعرێکی شیلەر بەناوی «تاسەباری."

16- شرۆڤەی یوحەننا، بەشی هەشتەم.

ئیمان و گوڕ و تینەوە تاعەت و خوداپەرستیی کردووە و پاڕاوەتەوە: "ئەی خولّقێنەر، خودای مەزن، زوو دەرکەوە چاوەڕوانین" سەردەمانێکی زۆر بۆ هاتنی پاڕاونەتەوە. تا وایلێهات کەرەمی کرد و بۆسەر بەندەکانی خۆی نازڵبوو. بەر لە ئەو ڕۆژەش نازڵ بووبوو. بەڵام لەگەڵ چەند کەس لە پیاوانی پیرۆز و شەهیدان و چلەگرتووەکان هەروەک لە ژینامەی ئەواندا هاتووە، چاوپێکەوتنی هەبووە. لە نێو ئێمەدا تیۆچۆف، کە بڕوای تەواو بە وتەکانی دەکەین، شایەدیی دا کە:

لەژێر باری قورسی خاچدا
پاشای ئاسمان وەکو کۆیلە
پێی بە خاکی پاکتدا نا ئەی نیشتمان
سەرانسەری تەبەڕوک کرد.[١٧]

دڵنیابە هەرواش بوو. ئێستاش ئەو ڕازی بوو تاوێ خۆی پیشان خەڵکی بدات و هیوا بخاتە دڵی چەرمەسەری دیتووان و ئازار چێشتووانەوە. بەڵام وەک ئەو مندالانەی «ئەو»یان خۆش دەوێ. ناوەڕۆکی شیعرەکەی من لە شاری سویلی ئیسپانیا، لە ترسناکترین سەردەمی زەبروزەنگ و سەرکوتی بیروڕادا ڕوو دەدا. لە کاتێکدا کە هەموو ڕۆژێک، لەبەرخاتری خودا، ئاگر دەکەنەوە و لە autode[18] بەشکۆدا ڕافزییە خراپکارەکانیان دەسووتاند.

هەڵبەت دەرکەوتنەکەشی ئەو دەرکەوتنە نەبوو کە بەڵێنی دابوو لە ئاخر زەماندا، بەشکۆیەکی ئاسمانییەوە بێ و هاتنەکەشی ئەوندە لە ناکاو دەبێ "وەک برووسکەیەک لە ڕۆژهەڵاتەوە بێ تاکو ڕۆژئاوا." ئەو تەنیا ساتێک لەگەڵ ڕۆڵەکانی خۆی چاوپێکەوتنی کرد، ئەویش لە شوێنێک کە گڕ و بڵێسە دەورانـدەوری ڕافزییەکانی گرتبوو و قرچەقرچ دەسووتان. لە کۆتاییی کەرەمی خۆیدا، جارێکی دیکە لە قەلافەتی مرۆڤدا دەردەکەوێ و دێتە نێو خەڵکەوە. هەر بەو شکڵ و شێوەیەوە کە پازدە سەدە لەمەوبەر بۆ ماوەی

---

17- کۆپلە شیعرێکی ئیف.نای.تیۆچۆف (١٨٠٣-١٨٧٣) بەناوی «ئەم گوندە هەژارانە."
18- «ڕێورەسم"

سێ ساڵ لە نێو خەڵکدا گەڕا. کە هاتە خوارێ پێی‌نایە سەر «سەنگفەڕشی سوورەوەبووی» شارێکی باشوور، کە ڕۆژی پێشووی لەوێ نزیکەی سەد ڕافزیauto dete لە ad majorem gloriam Dei بەوپەڕی شکۆوە بە دەستی کاردیناڵ، پشکێنەری مەزن، لە بەرچاوی شا و هەموو دەستوپێوەند و پارێزەر و ئوسقۆف و ژنانی شۆخوشەنگ و دلڕفێنی شار و ئاپۆرەی خەڵک سوتێندرابوون.

«لەسەرەخۆ و بەبێ سەرنجڕاکێشانی خەڵک هات، ئەوە سەیرە هەموو ناسییانەوە. ئەوەش دەکرێ بە یەکێ لە چاکترین بەشی شیعرەکە بزانین. مەبەستم ئەوەیە بۆ ناسییانەوە؟ خەڵکی بێدەسەڵات و ڕەشوڕووت چوون بەرەوپیری و لە دەوری ئاپۆرەیان دا و بوونە سەر لە پێناوی. ئەویش بە نێویاندا دەگەڕا و بزەیەکی نەرم و دلۆڤانانەی لە سەر لێو بوو. هەتاوی ئەوین لە دڵیدا هەڵاتبوو و تیشک و بینایی و وزە لە چاوی دادەڕژا و ژیانی خەڵکی ڕووناک دەکردەوە و دڵیانی لێوڕێژ دەکرد لە خۆشەویستیی دوولایەنە. دەستی بە سەریاندا دەهێنا و تەقدیسی دەکردن و هەرکەس دەستی وێی کەوتبایە، تەنانەت لە جلوبەرگەکەشی، دەبووە مایەی شیفا و سلامەتی. پیرە پیاوێک کە لە منداڵییەوە کوێر بوو، لە نێو ئاپۆرەی خەڵکەکەوە هاواریکرد: "خودایە، بیناییم پێبدەوە با بتوانم بتبینم!" هەر لەڕێوە تانەی سەر چاوی لاچوو و بینایی وەدەستهێنایەوە. خەڵکەکە تێکڕا دەستیانکرد بە گریان و چوونە سوجدە و خاکی بەرپێیان ماچکرد. منداڵان گوڵبارانیان کرد و دەستیانکرد بە هاوار: "ڕزگار و بەختەوەرمان کە". تێکڕا پێکەوە دووپاتیان دەکردەوە: "ئەوە ـ ئەوە! حەتمەن خۆیەتی، جگە لە ئەو کەسی دیکە نییە و نابێ!" هەر لەو کاتەدا ئازیەتباران، دارەتەرمێکی چکۆڵەی سپی و سەرئاوەڵا دێننە دەرێ، ئەویش لەبەر پلیکانی کلێسەی سویل ڕادەوەستێ. لە نێو دارە مەیتەکەدا، منداڵێکی حەوساڵان، کچە تاقانەی شارۆمەندێکی بەناوبانگ ڕاکشاوە. منداڵەکە مردووە و سەرتاپایان لە گوڵ گرتووە. ئاپۆرەی خەڵک ڕوو لە دایکە چاو بە گریانەکەی دەکەن. دەڵێن: "ئەو

منداڵەکەت زیندوو دەکاتەوە." قەشەیەک کە بۆ ڕێوڕەسمی کفن و دفن هاتووە، گرژ و مات نێوچاوانی تێکدەنێ، بەڵام دایکی جەرگسووتاو بە گریانەوە خۆی دەدا بە سەر کەوشەکانیدا و هاوار دەکا: "ئەگەر خۆتی، منداڵەکەم بۆ زیندوو بکەوە!" کۆڕی ئازیەتباران بە تابووتەکەوە ڕادەوەستن. لەبەر پلیکانەکان دارەتەرمەکە لەبەر پێی دادەنێن. ئەویش بە دڵۆڤانی تێیدەڕوانێ و لەبن لێوەوە بە ئارامی دەڵێ: "کیژۆڵە، هەستە!" کچەش لەڕێوە هەڵدەستێ و لە نێو تابووتەکەدا دادەنیشێ و چاو بە دەوری خۆیدا دەگێڕێ: بە چاوی زیت و پڕ لە سەرسامییەوە زەردە دەگرێ و ئەو چەپکە گوڵە سپییەی لە نێو مشتیان نابوو، بە ئارامی دەگوشێ.

«هاوار و هۆڕژنی گریان و ژاوەژاوی خەڵک وڵاتی داگرت، هەر لەو کاتەشدا جەنابی کاردینال، پشکێنەری مەزن، بەپاڵ کلێسەکەدا تێدەپەڕێ. پیرە پیاوێکە نزیکەی نەود ساڵی تەمەنە، کەڵەگەت و ڕێکوپێکە. ڕوخساری چرچولۆچە و چاوی بە قووڵدا چووە، بەڵام وەک دوو کوانووی ئاگر هەروا دەدرەوشێنەوە. بە پێچەوانەی ڕۆژی پێشوو کە نەیارانی کلێسەیان دەسووتاند، جلوبەرگی زریقە و بریقەداری لەبەردا بوو ـ لەم کاتەدا عەبا زبر و کۆنەکەی بە شانیدا دابوو کە لە کلێسا لەبەری دەکرد. لە پشت سەرییەوە، دەستەو دایەرە و کۆیلەی خەمبار و نیگابانی پیرۆز ڕیزیان بەستبوو. لەگەڵ دیتنی ئاپۆرەی خەڵک ڕادەوەستێ و لە دوورەوە دەیانخاتە ژێر چاوەدێری. چاوی لە هەموو شتێکە و تابووتەکەی لێدیارە لەبەر پێی ئەودا دایانناوە. کە منداڵەکە دەبینێ هەڵدەستێ، ڕوخساری شین هەڵدەگەڕێ و گرژ دەبێ. برۆ پڕ و خۆڵەمێشینییەکەی تێکدەنێ و چاوی لە گڕی ڕقدا دەترووسکێتەوە. قامکی هەڵدێنێ و فەرمان بە نیگابانەکان دەدا قۆڵبەستی بکەن. دەسەڵاتی هەیە و خەڵکیش هەموو گوێ لە مست و سەر لە پێناوین بۆیە خێرا ڕێگا بۆ نیگابانەکان دەکەنەوە و نیگابانەکان لەگەڵ بێدەنگییەکی مەرگاوی «ئەو» دەگرن و دەیبەن. خەڵکەکەش تێکڕا و هاوکات لە هەمبەر پشکێنەری پیردا دەچنە سوجدە و نێوچاوانیان لە خاک دەسوون. ئەویش لەو بێدەنگییەدا

خەڵکەکە تەقدیس دەکا و تێدەپەڕێ، نیگابانەکان دیلەکە دەبەنە بەندیخانەی تەنگ و تاریکی کۆشکە قەدیمییەکەی پشکێنەری پیرۆز و درگای لە سەر دادەخەن. ڕۆژئاوا دەبێ و شەوی تاریک و گەرم و پشووبڕی سویل بەسەردا دێ. هەوا «بۆن و بەرامەی داری زەیتوون و لیمۆی پێوەیە.[١٩]» لە تاریکیی ئەنگوستەچاودا دەرگای ئاسنینی بەندیخانە لە ناکاو کرایەوە و جەنابی پشکێنەری مەزن دەست بە چرا وەژوور کەوت. بەتاقی تەنیایە. دەرگاکە زرمەی دێ و پێوەدەدرێتەوە. لەبەر دەرگاکەدا ڕادەوەستێ و هەتا ماوەیەک، دەقیقەیەک یان دوو دەقیقە، چاو لە چاوی دەبڕێ. ئاخری لەسەرەخۆ دەڕواتە پێشێ. چراکە لە سەر مێزێک دادەنێ و قسە دەکا:

"ئەوە خۆتی؟ یانی ڕاست خۆتی؟" بەڵام کاتێ هیچ وەڵامێک نابیستێ، درێژە بە قسەکانی دەدا: "وەڵامم مەدەوە، متەق مەکە. بەڕاستی دەتوانی بڵێی چی؟ چاکە دەزانم دەڵێی چی. هەقیشت نییە یەک وشە بەو قسانەی پێشووت زیاد بکەی. بۆچی هاتووی و بوویەتە لەمپەری سەر ڕێمان؟ چونکە هاتووی ببیتە کۆسپی سەر ڕیمان و خۆشت دەزانی. بەڵام دەزانی سبەینێ چی ڕوودەدا؟ نازانم کێی، گرینگیش نییە خۆتی یان کەسێکی شێوەی خۆتی، بەڵام سبەینێ مەحکوومت دەکەم و وەک خراپترین لە دین وەرگەڕاو بە سەر دارەوە ئاورت تێبەردەدەم. هەر ئەو خەڵکەش کە ئەمڕۆ خاکی بەر پێیان ماچدەکردی، سبەینێ بە ئاماژەیەکی من تێکڕا سووتەمەنی و ئاوردوو دێنن بۆ سووتاندنت. جوان حاڵیبە!" هەر لەو کاتەدا کە چاوی لە بەندییەکەی نەدەترووکاند، قورساخ و بیرمەندانە گوتیشی: "بەڵێ ڕەنگە بشزانی."

ئالیووشا کە مات و واق وڕماو گوێی ڕاگرتبوو، بە بزەیەکەوە گوتی: «ئیوان باش تێناگەم. یانی چی؟ ئەوە چیرۆکێکی خەیاڵییە یان، هەڵەیەکە لەلایەن پیرە پیاوەوە؟»

ئیوان بە پێکەنینەوە گوتی: «ئەگەر ڕێئالیسمی نوێ وای مێشکت خراپ کردووە خەیاڵ هەستت ناجووڵێنێ، بەڵام ئەوەی ئاخری قەبووڵبکە. ئەگەر

---

19- لە شانۆی «میوانی بەردین» (دۆن ژوان)، بەرهەمی پووشکین.

پێت‌خۆشە نموونەیەک لە qui pro quo[20] هەبێ، با وا بێ.» هەروا بە پێکەنینەوە درێژەی پێدا: «ڕاستە پیرەپیاو نەوەد ساڵی تەمەن بوو و زۆریش تامەزرۆی بیرۆکەی داتاشراوی خۆی بوو. ڕەنگە ڕواڵەتی بەندییەکەش تووشی سەرسووڕمانی کردبێ. یان لەوانەیە لە ڕاستیدا وتە هاتەران‌پاتەرانەکانی بووبێتە هۆی ئەوەی پیرەپیاوی نەوەد ساڵانە تووشی گومانبێ، کە ڕۆژی پێشوو لە ڕێوڕەسمی ڕافزی سووتاندندا لە ڕادەبەدەر تووشی دڵەخورپە بووبوو. لە لایەکی ترەوە چ گرنگایەتییەکی هەیە کە qui pro quo بووبی یان خەیاڵێکی سەرەڕۆیانە؟ ئەوەی گرینگە ئەوەیە قسەی دەکرد و لەوەی کە نەوەد ساڵ متەقی نەکردبوو بە ئاشکرا دەدوا.

- بەندییەکەشی هەروا بێدەنگە و چاوی تێبڕیوە و هیچ ناڵێ؟

ئیوان دیسان بە پێکەنینەوە گوتی: «وەلحاسڵ ناچارە. پیرە پیاو پێیگوتووە کە هەقی نییە لە سەر قسەکانی پێشووی بڕوا. دەکرێ بڵێین ئەوەش بنەڕەتیترین لایەنی ئایینی کاتۆلیکی ڕۆمییە. لانیکەم بیروڕای من وایە. دەڵێن: «هەموو شتێک لە لایەن تۆوە بە پاپە بەخشراوە و کەوایە هەموو شتێک بە دەست پاپە و پێویست بە هاتنی تۆ ناکا. لانیکەم نابێ هەتا ماوەیەک خۆلەکاریان هەڵقوتێنی.» هەرچۆنێک بێ یەسووعییان وا دەڵێن و تەنانەت نووسیویشیانە. من لە بەرهەمی عالمەکانیاندا خوێندوومەتەوە. پیرە پیاو لێی دەپرسێ: "ئایا هەقت هەیە یەکێک لەو ڕازە دنیاییانەی کە لێوەی هاتووی بۆ ئێمە ئاشکرا بکەی؟" هەر خۆشی وەڵامەکەی دەداتەوە: "نا، هەقت نییە. تۆ نابێ یەک وشە بەو قسانەی پێشووت زیاد بکەی و ئیزنت نییە ئەو ئازادییەی کە لە کاتی ژیانتدا لەم دنیا تاریفتدەکرد لە خەڵکی بستێنییەوە. هەر شتێکی تازە ئاشکرا بکەی زیان لە ئازادیی مرۆڤ دەدەی. چونکە وەک مۆجزەیەک دەنوێنێ و ئازادیی بیروڕای مرۆڤ، ئەو سەردەمە، یانی هەزار و پێنجسەد ساڵ لەمەوبەر لەلای تۆ بایەخدارتر لە هەموو شتێک بوو. مەگین ئەو زەمانە بەردەوام نەتدەگوت: "ئازادتان دەکەم؟" پیرەپیاو لە ناکاو بە بزەیەکی

---

20- «کەسێک بەجێی کەسێکی‌تر"

خەماوییەوە درێژەی بە قسەکانی دا: "بەڵام ئێستا ئەم پیاوە «ئازاد»انەت دیوە." پیرەپیاو بە گرژی چاوی تێبڕی و لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: «بەڵام لە ئاکامدا کارەکانمان بە ناوی تۆوە بە ئەنجامگەیاند. پازدە سەدە لەگەڵ ئازادیی تۆ ئارەقمان ڕشت، بەڵام ئێستا دەفتەرەکەی پێوەدراوە و وەلانراوە. یانی باوەڕ دەکەی؟ وەک پەز چاوم لێدەکەی و واش دەنوێنی لە دەستم قەڵس نیت. بەڵام با پێتبڵێم، خەڵکی ئەمڕۆ پێیانوایە زیاتر لە هەموو وەختێ ئازادییان هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا ئازادیی خۆیان بۆ ئێمە هێناوە و خاکەڕایانە لەبەر پێی ئێمەدا دایانناوە. بەڵام ئەم کارە کاری ئێمە بووە. ئەمە بوو ئەوەی تۆ کردت؟ ئەمە بوو ئازادیی تۆ؟"

ئالیووشا هەڵیدایە: «دیسان تێناگەم. کاتێ تانە و تەشەری لێدەدا، گاڵتە دەکا؟»

«نا، بۆخۆی و بۆ کلیساکەی ئەوە بە شانازی دەزانێ، کە ئاخری شکستیان بە ئازادی داوە و کارێکیان کردووە خەڵک بەختەوەر بێ. «چونکە ئێستا» (هەڵبەت خەریکە باسی دادگای بیروڕا پشکنی دەکا) بۆ یەکەم جار، بیرکردنەوە لە بەختەوەریی مرۆڤایەتی مسۆگەر بووە. مرۆڤێکی یاخی خولقاوە و یاخی چۆن دەتوانێ بەختەوەر بێ؟ "پێیدەڵێ": بە تەواوی وریاییان پێدای، بەڵام تۆ گوێت نەدانێ، تەنیا ڕێگایەک کە دەکرا لەوێوە مرۆڤ بە بەختەوەری بگا تۆ ڕەتتکردەوە. بەڵام بەختەوەرانە کاتی ڕۆیشتن کارەکەت بە ئێمە سپارد. تۆ بەڵێنیت داوە، کەلامی خۆت کردە بناغە، مافی پێوەندی و وازهێنانت بە ئێمە[21] دا. هەڵبەت ئێستا ناتوانی لەبیری ساندنەوەیدا بی. کەوایە بۆ هاتووی ببی بە کۆسپی سەر ڕێمان؟»

ئالیووشا پرسیی: «مانای «بە تەواوی وریاییان پێدای» ئیتر چییە؟»

- چاکە ئەمە پوختەی ئەو شتەیە کە پیرەپیاو دەبێ بیڵێ. گوێ بگرە.

---

21- بەراورد بکرێ لەگەڵ وتاری عیسا بۆ پترس، ئینجیلی مەتی، بەشی شازدەهەم. «منیش کلیلەکانی ئاسمان بە تۆ دەسپێرم: ئەوەی تۆ لە سەر زەوی پێوەندی بدەی لە ئاسمان پێوەند دەدرێ: ئەوەی لە سەر زەویش لە یەکتر جیا بێتەوە لە ئاسمانیش لێک جیا دەبێتەوە."

«پیرە پیاو لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێ: «ڕۆحی زانا و ترسێنەر ڕۆحی خۆ فەوتێن و دژەبوون، ڕۆحی مەزن، لە بیابان لەگەڵت دووا. لە کتێبیشدا بە ئێمەیان گوتووە تۆی تووشی «بیرە بیرە» کرد، وایە؟ مەگین ئەوەی ئەو لە سێ پرسیاردا بۆ تۆی ئاشکرا کرد و لەوەی وا تۆ ڕەتتکردەوە، ئەوەی لە کتێباندا ناویان ناوە «بیرە بیرە»، شتێکی ڕاستتریش پەیدا دەبێ؟ لەگەڵ ئەوانەشدا ئەگەر لە سەر زەوی مۆجزەیەکی سەرسووڕهێنەر بووبێ، لەو ڕۆژەدا ڕوویداوە، گەلاڵەی ئەو سێ پرسیارە خۆی بنەمای مۆجزە بوو. ئەگەر بلوایە لەگەڵ باسەکەدا بیهێنیتە بەرچاوی خۆت کە ئەو سێ پرسیارەی ڕۆحی ترسێنەر لە کتێبەکاندا بسڕدرێتەوە و ناچار بین ئەوانە بگێڕینەوە و سەرلەنوێ دایانهێنینەوە، بۆ ئەو کارەش هەموو زانایانی سەر زەویمان کۆ دەکردەوە ـ دەسەڵاتداران قەشەی پایەبەرز و بیرمەندان و فەیلەسووفان و شاعیرانمان بۆ کاری داهێنانی ئەو سێ پرسیارە ڕادەسپارد، بە شێوەیەک کە نەک هەر بۆ بارودۆخەکە باش و لەبار بێ، بەڵکو لە سێ وشەدا و لە سێ شرۆڤەی مرۆڤانەدا تەواوی مێژووی داهاتووی جیهان و مرۆڤایەتی بەیان کەن. بە بڕوای تۆ هەموو زانایانی سەر زەوی دەیانتوانی لە باری قووڵیی کاکڵ و شوێندانەرییەوە، هاوتای ئەو سێ پەرسڤە داهێنن کە ڕۆحی زانا و دەسەڵاتدار لە بیابان لەگەڵ تۆدا هێنایە گۆڕێ؟ هەر لەو پرسیارانە و لە پەرجۆی ئەو بەیانانەوە، دەتوانین تێبگەین کە لێرە سەر وکارمان نەک لەگەڵ هۆشی بزۆزی مرۆڤ، بەڵکو لەگەڵ موتڵەق و هەتا هەتاییە. چونکە لەو سێ پرسیارەدا هەموو مێژووی داهاتووی مرۆڤایەتی، بەگشتی بۆتە یەکەیەکی جێگرتوو و پێشوێژی کراو و کۆی دژوازییە مێژووییەکان، کە سروشتی داخراوی مرۆڤ لەوانەدا تاقانەیە. لەو سەردەمەدا زۆر ڕوون و ئاشکرا نەبوو، چونکە داهاتوو نەناسراو بوو، بەڵام ئێستاکە هەزار و پێنجسەد ساڵ تێپەڕیوە، دەبینم کە هەموو شتێک لەو سێ پرسیارەدا، بەجۆرێک کە تێبگەی پێشوێژی کراوە و وەها جێگیر بووە کە ناتوانی هیچی پێزیاد بکەی یان لێی کەمکەیتەوە.

«ویژدانی خۆت بکە قازی هەق بە کێبوو ـ بە تۆ بوو یان بەو کەسەی پرسیاری لە تۆ کرد؟ یەکەم پرسیار وەبیر خۆت بێنەوە، مانای ئەوان ـ نەک دەقاودەقی وشەکان ـ ئاوا بوو: «تۆ دەچی بۆ دنیا، بەڵام بە دەستی بەتاڵ دەچی، بە وادە و بەڵێنیی ئازادییەوە دەچی، بەڵام ئەو خەڵکەش لەبەر فەقیرحاڵی و زاتە یاخییەکەیان ناتوانن لەوە بگەن. لێی دەترسن و زراویان تۆقیوە ـ چونکە تا ئێستا بۆ مرۆڤ و کۆمەڵگای مرۆڤایەتی هیچ شتێک تاڵ و پشوبڕتر لە ئازادی نەبووە. بەڵام ئەو بەردانە لەو بیابانەدا لەتوکوت و بێکەڵک دێنە بەرچاوت. ئەو بەردانە بکە بە نان و خەڵکیش وەک مێگەل گوێلەمست و سەرلەپێناوت دەبن. ئەگەرچی هەتا هەتایە لەرزی ئەوەیان لە دڵدا دەبێ نەکا دەستت بکێشیتە دواوە و ئەو نانەیان پێڕەوا نەبینی. «بەڵام تۆ ڕازی نەبووی مرۆڤ لەو ئازادییە بێبەشکەی و پێشنیارەکەت ڕەت کردەوە. لە دڵی خۆشدا گوتت ئەگەر گوێ لە مستی بە نان بکڕدرێ، ئازادی چەندە دەژی؟ وەڵامتدایەوە مرۆڤ تەنیا بە نان بەڕێدەچێ. بەڵام ئەوەش بزانە هەر لەبەر ئەو «نانە زەوینییە» ڕۆحی بە گژتدا دێ، لەگەڵت بەشەڕ دێ و دەتبەزێنێ، هەموو خەڵکیش لایەنگری لەو دەکەن و هاواردەکەن: «کێ دەتوانێ شان لە شانی ئەو دڕندەیە بدا؟ ئەو ئاگری لە ئاسمانەوە بە ئێمە داوە!» ئەوەش بزانە سالانێکی زۆر تێدەپەڕن و مرۆڤایەتی بە زاری زاناکانی خۆی هاوار دەکا هیچ جنایەتێک نەبووە، کەوایە تاوانیش لە گۆڕێدا نییە و تەنیا برسییەتی لە ئارادایە، ئەو جینایەتانەش لە برسییەتییەوە سەرچاوە دەگرن. «خەڵکی تێر بکە و پاشان گەورەییت لێیان بوێ!» ئەمەش هەر ئەو شتەیە کە لە هەمبەر تۆدا بەرزی دەکەنەوە و هەر بەوەش پەرستگاکەی تۆ تێکدەڕمێنن. لەو جێگایەی کە پەرستگاکەی تۆی لێبوو، بینایەکی نوێ ساز دەکەن، قەڵای بەسامی بابول دیسان ساز دەکرێتەوە، ئەگەرچی وەک قەڵاکەی پێشوو تەواو نەدەبوو، لەوانەشە تۆ بووبووایەتییە کۆسپی ئەو کارە و دەتتوانی تاکو هەزار ساڵ خەڵک لە دەست ئەو ڕەنج و ئازارە ڕزگار بکەی. چونکە ئەوان دوای هەزار ساڵ ئازارکێشان، بە قەڵاکەی خۆیانەوە

دەگەڕانەوە بۆلامان. دەگەڕان بە دوای ئێمەدا، ئێمەش خۆمان لە بوودڕ و ئەشکەوتاندا دەشاردەوە، چونکە دیسان دەستیان دەکردەوە بە ئەشکەنجە و قەلاچۆمان. ئێمە دەدۆزنەوە و بەسەرماندا دەنەڕێنن: «تێرمان کەن، چونکە ئەوان کە بەڵێنی ئاگری ئاسمانیان پێدابوون، بەڵێنەکەیان نەبردە سەر! «ئەو کاتە ئێمەش بینای قەلاکەیان بۆ تەواو دەکەین، چونکە کەسێک دەتوانێ بیناکەیان بۆ تەواو بکا، کە زگیان تێربکا. تەنیا ئێمەشین بە ناوی تۆوە تێریان دەکەین. بە درۆش وادەنوێنین بە ناوی تۆوەیە. ئاخ، قەتقەت ناتوانن بەبێ ئێمە خۆیان تێربکەن! هەتا ئەو کاتەی ئازاد بژین هیچ زانستێک نانیان نادا، لە کۆتاییدا ئازادیی خۆیان فڕێدەدەنە بەرپێی ئێمە و پێمان دەڵێن: «بمانکەنە کۆیلەی خۆتان بەڵام تێرمان کەن. «لە ئاکامدا خۆیان تێدەگەن کە ئازادی و نانی زۆر و زەوەند بۆ هەموان دابین ناکرێ و ناتوانی بیریشی لێبکەیتەوە. چونکە هەرگیز ناتوانن لە نێوان خۆیاندا بەشیبکەن. بەو ئاکامەش دەگەن کە هیچکات ناتوانن ئازاد بن، چونکە بێهێز و شەڕانی و بێبایەخ و خیشەسەرن. بەڵێنی نانی ئاسمانیت پێدان، بەڵام دیسان دەیڵێمەوە، ئایا لە ڕوانگەی مرۆڤی بێهێز و هەمیشە تاوانبار و یاخی و خوێڕییەوە، مرۆڤ دەتوانێ لەگەڵ نانی زەوینی بەربەرەکانێ بکا؟ ئەگەر لەبەر خاتری نانی ئاسمانی هەزاران و دەیان هەزار مرۆڤ پێڕەویت لێبکەن، ئەو ملوێنان ملوێن مەخلووقاتەی کە ناتوانن لەبەر نانی ئاسمانی چاوپۆشی لە نانی زەوینی بکەن چییان بە سەر دێ؟ یان تۆ تەنیا دەتوانی بژیوی هەزار کەسی گەورە و بەهێز دابین بکەی، هەزاران کەسیش، بە بارتەقای گەڵای داران، هەژار و بێهێزن و خۆشیان دەوێ و تەنیا بە هیوای گەوران و خاوەن هێزان دەژین؟ نا ئێمە بژیوی بێهێزەکانیشمان هەیە. ئەوان تاوانبار و یاخین، بەڵام ئەوانیش ئاخری دەبنە گوێڕایەڵ و سەرلەپێناو. سەریان لە ئێمە سووڕ دەمێنێ و وەک خودا چاومان لێدەکەن. چونکە ئێمە ئامادەین. ئەو ئازادییە کە ئەوەندە لەبەر چاوی ئەوان بەسام و بڤەیە، تاملبکەین و بە سەریدا زاڵیش بین ـ ئازاد بوون بۆ ئەوان هەتا ئەو ڕادەیە سامناکە. بەڵام پێیان دەڵێین کە ئێمە خزمەتکاری

ئێوەین و بە ناوی تۆوە فەرمانیان پێدەدەین. دیسانهەڵیاندەفریوێنین. چونکە ئیزن بە تۆ نادەین جارێکیتر بگەڕێیتەوە بۆلامان. ئەو هەولْخەڵەتاندنە هۆی ئازارمانە، چونکە ناچارین درۆ بکەین، ئەمەیە بەڵگەی یەکەم ڕۆژی بیابان و ئەوەشە ئەو شتەی کە لەبەر ئازادی بە هەموو شتێکی ئەم وڵاتە دراوە و تۆ لەگەڵ ئەوەشدا ڕەتی دەکەیەوە و ڕازی گەوەری جیهانیش لەم پرسیارەدا شاردراوەتەوە. بە هەڵبژاردنی «نان» حەز و ئارەزووی جیهانی و تا هەتاییی مرۆڤایەتیت، بەگشتی و تاکەکەسی بە شێوەیەکی یەکپارچە ـ بۆ دۆزینەوەی کەسێک کە بیپەرستن ـ بەجێ هێناوە. هەتا ئەو کاتەی مرۆڤ ئازاد بژی؛ ئاوا بێپسانەوە و خەمبارانە بۆ هەموو شتێک، وەک گەڕان بەدوای کەسێکدا بۆ پەرستن هەوڵنادا. بەڵام مرۆڤ دەگەڕێ بەدوای شتێکدا کە لەوپەڕی چۆن و بۆچی دامەزراوە تاکو هەموو خەڵکان لەڕێوە بۆ پەرستنی ئەو ڕازیبن. چونکە ئەو خەڵکە بەستەزمانە دەربەستی ئەوەن بزانن ئەم لەگەڵ ئەو دەتوانێ چی بپەرستێ، کە هەر ئەو شتە بێ کە هەمووان ئیمانیان پێیەتی و دەیپەرەستن. ئەوەی کە گرینگ و بنەڕەتییە ئەوەیە کە هەموو «پێکەوە» لەوێدا بن. ئەم تەمایەش بۆ بەشداری کردنی هەمووان لە پەرستندا، هەر لە ڕۆژی بەرێوە لێقەومانی سەرەکیی هەموو مرۆڤێک بە تەنیا، بە بارتەقای هەموو مرۆڤایەتییە. ـ لەبەر بەشداریکردن لە پەرستندا یەکتریان داوەتە بەر شیر و تیر. خوداگەلێکیان قوت کردۆتەوە و لەگەڵ یەکتر کەوتوونە ململانێ و ڕقەبەرایەتی: «خوداکانی خۆتان وەلانێن و دەستبکەن بە پەرەستنی خوداکانی ئێمە، دەنا خۆتان و خوداکانتان دەکوژین!» هەتا ڕۆژی پەسڵانیش هەروا دەبێ، تەنانەت کاتێکیش خوداکانیان لە سەر زەوی بەرپیوار بووبێتن، ڕاست بەو چەشنە لە هەمبەر بتاندا سوجدە دەبەن. لەو ڕازە بنەڕەتی و سروشتییەی مرۆڤ حەتمەن ئاگاداری، بەڵام ئەو ئاڵا سەرەونخوون کراوەت ڕەتکردەوە کە درابووە دەستت تاکو هەموو مرۆڤایەتی هاندا سوجدەت بۆ بەرن کە ئەویش ئاڵای نانی زەوینی بوو. کەچی تۆ لەبەر خاتری ئازادی و نانی ئاسمانی نەتویست. بڕوانە بەر لەوە چترد دیسان بە ناوی ئازادی! با

پێتبڵێم هیچ دڵەخورپەیەک بۆ مرۆڤ لەوە بە ئازارتر نییە کە بتوانێ بە تاڵووکە کەسێک پەیدا بکا تاکو ئازادیی پێببەخشێ، ئازادییەک کە ئەم خەڵکە چارە ڕەشە لەگەڵی لەدایکبوون. بەڵام تەنیا کەسێک دەتوانێ ئازادییەکەیان لە ئەستۆ بگرێ کە بتوانێ ویژدانیان ئارامبکاتەوە. لە ناندا ئالایەکی لەشکان نەهاتووت پێشکەش کرا؛ نان بدە با خەڵکی بتپەرستن، چونکە هیچ شتێک بەقەد نان بۆ مرۆڤ گرینگ نییە. بەڵام هەرکاتێک کەسێک جگە لە تۆ دەست بە سەر ویژدانیاندا بگرێ و هەڵیان فریوێنێ، لەڕێوە واز لە تۆ دێنن و وەدوای ئەو کەسە دەکەون کە ویژدانیانی خستۆتە ژێر ڕکێفی خۆی. لەم بارەوە هەق بە تۆیە چونکە جەوهەری ژیانی مرۆڤ تەنیا زیندوو بوون نییە، بەڵکو ئەو ئاواتەیە کە بۆی دەژین. هەر کاتێک مرۆڤ نەزانێ بۆ زیندووە هەرگیز حەزی لە ژیان نابێ و مەرگ بەئاوات دەخوازێ، ئەگەر تەنانەت سەرتاپاشی لە نان بگرن. ئەوەش ڕاستە بەڵام دەتوانین چ ئاکامێکی لێ وەرگرین؟ تۆ بەجێی ئەوەی دەست بە سەر ئازادیی مرۆڤدا بگری، گەورەترت کردەوە لەبەر چاویان. بۆ نازانی مرۆڤ مەرگی زۆر پێخۆشترە لەوەی چاک و خراپە لێکبکاتەوە؟ هیچشتێک لەبەر چاوی مرۆڤ شیرینتر لە ئازادیی ویژدان نییە. لەگەڵ ئەوەشدا هیچ شتێک لەوە ترسناکتر نییە تۆ بەجێی ئەوەی ویژدانی مرۆڤ بەهۆی یاسای بنەڕەتییەوە ئارام کەیتەوە، سەیر و سەمەرەترین و گوماناویترین و دژوارترین و پیوارترین ئەسلی جیهانت بۆ دەستەبەرکردن کە لە توانای مرۆڤدا نەبوو. تۆ گوتت حەز و خۆشەویستیت بەرانبەر بە مرۆڤ نییە، بەڵام ئێستا هاتووی و وادەنوێنی کە گیانی خۆتیان بۆ فیدا دەکەی. بەجێی ئەوەی دەست بە سەر ئازادیی مرۆڤدا بگری و هێمنایەتییان بە دیاری بۆ بێنی، ژیانت لێتاڵکردن و تووشی ڕەنج و ئازاری هەتا هەتاییت کردن. تۆ ئەشقی ئازادی مرۆڤت دەویست تاکو ئازادانە پێڕەویت لێبکەن و ئاشق و سەر لە پێناوت بن. بەجێی یاسای وشک و کۆن، مرۆڤ دەبێ لەمەبەولاوە بە دڵێکی ئازادەوە، تەنیا وێنە و پەیکەرەی تۆ لە هەمبەر خۆیدا دانێ و بیکاتە ڕێنما و لە نێوان خێر و شەڕدا کڵاوی خۆی

بکاته قازی. بەڵام نەتدەزانی ئەگەر لە ژێر باری بەسامی هەڵبژاردندا لە پێ بکەوێ، تەنانەت حاشا لە پەیکەرەکەشت و لە خۆشت دەکا؟ ئاخر دەنەڕێنن و دەڵێن ڕاستەقینە و تۆ دوو شتی لێکجیاوازن. چونکە ناکۆکی و ڕەنجێکی زۆرت تووشی خەڵک کردووە و هێندەت پرسیاری بێوەڵام بۆ دروستکردوون تووشی قاڕەسەرێ بوون.

«"کەوایە دەتوانم بڵێم لە ڕاستیدا تۆ خۆت بوویە هۆی کاول بوونی مەزنایەتیی خۆت، هەر بۆیە لە هەموو کەس زیاتر شیاوی لۆمە و سەرکۆنەی. لەگەڵ ئەوشدا چیت پێبڕا؟ سێ دەسەڵات هەیە، تەنیا ئەو سێ دەسەڵاتە دەتوانێ بە سەر ویژدانی ئەم سەرەڕۆ بێهێزانەدا زاڵبێ و بۆ بەختەوەریی خۆیان هەتا هەتایە هیوادariyan بکا و بیانخاتە ژێر ڕکێفی خۆی - ئەو هێزانەش بریتین لە پەرجۆ و ڕاز و دەسەڵات. تۆ دەستت بە ڕووی هەرسێکیانەوە ناوە و بناغەی نموونەیەکت داڕشتووە. کاتێک کە ڕۆحی زانا و ترسێنەر، تۆی لە سەربانی پەرستگا دانا و پێیگوتی: «ئەگەر دەتهەوێ بزانی کوڕی خودای یان نا، خۆت فڕێدە خوارێ، چونکە لە کتێبی پیرۆزدا نووسراوە کە فریشتان دەتگرنەوە و ناهێڵن بکەویتە عەرزی و ئاسیوت پێبگا. دوای ئەوە بۆت دەردەکەوێ کوڕی خودای یان نا، دەشیسەلمێنی کە ئیمانێکی قایمت بە باوکت هەیە.» بەڵام خۆت بوارد و نەتوێرا خۆت فڕێ بدەی. ئاخ، ئەو کارەت زۆریش لووت بەرزانە و باش بوو، وەک خودا، بەڵام ڕەچەڵەکی سەرەڕۆ و بێهێزی مرۆڤ دەتوانێ دەوری خودا بگێڕێ؟ کەوایە دەتزانی بە هەڵێنانەوەی هەنگاوێک و خۆ فڕێدانەخوارێ لەو سەربانە خودات تووشی وەسوەسە دەکرد و ئیمانی خۆشت لەدەستدەدا و ئیتر بڕوات پێی نەدەما. لە سەر ئەو زەوییەی کە هاتبووی بۆ ڕزگار کردنی، لەتوکوت دەبووی و ئەو ڕۆحە زانایەی کە وەسوەسەی دەکردی شاد دەبوو. بەڵام دیسان لێتدەپرسم، ئایا لە شێوەی تۆ زۆر هەیە؟ دەشتتوانی بۆ ساتێک باوەڕ بکەی کە مرۆڤیش لەوانەیە تووشی بیرەبیرەیەکی وا ببن؟ ئایا زاتی مرۆڤ واهەیە بتوانێ پەڕجۆیەک ڕەت بکاتەوە. لە ساتە مەترسیدارەکانی ژیانیاندا،

ئەو ساتانەی قووڵترین و ئازاراویترین گرفتی ڕۆحی پێکدێنن، بتوانێ ئازادانە ڕای خۆی دەربڕێ؟ دەتزانی کردەوەکانت لە کتێبدا تۆمار دەبێ و بۆ دوورترین زەمان و هەموو شوێنێکی زەوی دەچێ و هیوادار بووی کە مرۆڤ پێڕەوی لە تۆ بکەن و ئیمان بەخودا بێنن و داوای پەڕجۆ نەکەن. بەڵام نەتدەزانی کاتێک مرۆڤ مۆجزە ڕەتدەکاتەوە، خوداش ڕەتدەکاتەوە، چونکە مرۆڤ ئەوەندەی بە دوای مۆجزەوەیە، ئەوەندە بەدوای خوداوە نییە. چونکە مرۆڤ ناتوانێ بەبێ پەرجۆ تاقەت بێنێ و دەستدەکا بە خولقاندنی مۆجزە و پەرجۆی تازە و بۆلای پەرستنی خورافات و جادوو دەخوشێ، ئەگەر سەد هێندەش کافر و یاخی و لە دین وەرگەڕاو بێ. کاتێک کە بە جنێو و ناونیتکەوە خەڵک بەسەریاندا گوڕاندی: «لە خاچەکەت وەرەخوارێ و ئەوسا ئیمانت پێدێنین کە تۆ «ئەو»ی، لە خاچەکەت نەهاتییە خوارێ. لە خاچەکەت دانەبەزیت، چونکە نەتدەویست دیسان مرۆڤ پەلکێش بکەی بۆلای مۆجزە و کۆیلەیی، خواستیشت ئیمانێکی ئازادانە بوو کە لە سەر بنەمای مۆجزە نەبێ. تاسەباری عەشق و ئازادی بووی، نەک سوجدە و کرنۆشی کۆیلە لە هەمبەر دەسەڵاتێکدا کە ئەوی تووشی نەگبەتی و چارەڕەشی کردووە. بەڵام لەو بارەوە بایەخت بە مرۆڤدا، بەڵام دەبێ ئەوە بزانی ئەو خەڵکە ئەگەرچی لەزاتی خۆیاندا سەرەڕۆن، بەڵام لە ڕاستیدا کۆیلەن. چاو لە دەوروبەر بکە و کڵاوی خۆت بکە قازی، پازدە سەدە تێپەڕیوە و ئەوان هەروەک خۆیانن. کوا توانیوتە کێ بە پلە و پایەی خۆت بگەیەنی؟ سوێندت بۆ دەخۆم کە مرۆڤ لە زاتی خۆیدا زەبوونە و زۆر لەوە خوێڕیترە کە تۆ بیری لێدەکەیەوە و باوەڕت پێیەتی! پێتوایە بتوانێ ئەوەی تۆ دەیکەی ئەویش بیکا. ئەو هەموو ڕێزەت بۆ مرۆڤ دانا، بەڵام ئەوان هیچیان لە چاودا نییە و پێیان وایە لەبیرت بردوونەوە، ئەوەش هۆی ئەوە بوو تۆ لەڕادە بەدەر چاوەڕوانیت بوو ـ ئەی ئەو کەسەی ئەوانت لە خۆت خۆشتر ویستووە! ئەگەر ڕێزێکی کەمترت بۆ دانایەن، دیارە چاوەڕوانیشت لێیان کەمتر دەبوو. ئەوەش زیاتر لە ئەشق دەچوو، چونکە باری ئەویش سووکتر دەبوو. مرۆڤ زەبوون

و سەرکزە، ئەگەر ئێستا لە دەسەڵاتی ئێمە یاخی بووە هیچ باکێکمان نییە، چونکە بەهۆی سەرەڕۆیی و یاخی بوونەوە لە خۆی دەرچووە. ئەوەش وەک لەخۆبایی بوونی منداڵی قوتابی وایە. ئەوان منداڵانێکن لە قوتابخانە ئاژاوە ساز دەکەن و ناهێڵن مامۆستا بچێتە ژووری. بەڵام شادیی منداڵانەیان زوو کۆتایی پێدێ و گرانیشیان بۆ تەواو دەبێ. هەموو پەرستگاکان خاپوور دەکەن و زەوی بە خوێنی خۆیان پاراو دەکەن. بەڵام ئاخری ئەمانە، ئەم منداڵە ناهیرانە، تێدەگەن هەرچەندەش سەرەڕۆ بن، سەرەڕۆ گەلێکی بێدەسەڵاتن و تەنانەت ناتوانن ئاگایان لە یاخیگەرییەکەی خۆشیان بێ. لە فرمێسکی گەوجانەی خۆیاندا نوقم دەبن و لە ئاکامدا تێدەگەن کە «ئەو» سەرەڕۆی خولقاندوون و ڕەنگە ویستبێتی سەر بخاتە سەریان. بە هیوابڕاوی ئەوە دەڵێن و وتەکانیشیان بۆنی کفری لێدێ؛ دیسان تووشی خەفەتیان دەکا، چونکە زاتی مرۆڤ لەگەڵ کفر سازگار نییە و ئاخری ئەو تۆڵەیە لە خۆی دەکاتەوە. کەوایە پەژارە و نائارامی و ئاژاوە چارەنووسیان دەبێ، دوای ئەو هەموو ڕەنج و ئازارەی بۆ ئازادییان کێشات! نێردراوی مەزنی تۆ لە شرۆڤەکانیدا دەڵێ تەواوی ئەو کەسانەی لە یەکەم پەسڵاندا بەشدارییانکرد، چاوم پێیان کەوت ولە هەر هۆزێک دوازدە هەزار کەس لەوێ حوزووریان[22] هەبوو. بەڵام ئەگەر ژمارەیان ئاوا زۆر بووبێ لەوانەیە مرۆڤ نەبووبێتن و لە تاقمی خودایان بووبن. خاچەکەی تۆیان بە کۆڵدا دابوو، ساڵانێکی زۆر لە دەشت و بیابانی قاقڕ، بە کوللە و ڕەگە گیا بەڕێ چوون - بەڕاستی هەقتە بە شانازییەوە ئاماژە بکەی بەو منداڵە ئازادانەی، منداڵانی ئەشقی ئازادین، منداڵانی فیداکاریی و خاوەن شکۆن و بە ناوی تۆوە ئازادن. بەڵام لەبیرت نەچێ ئەوان تەنیا چەن هەزار کەس بوون و خودایانیشیان لەنێودا بوو، ئەی ئەوانی دیکە کێ بوون؟ چۆنیش دەتوانین مرۆڤە زەبوونەکانی دیکە لۆمە بکەین، چونکە نەیانتوانی لە هەمبەر دەسەڵاتدراندا ڕاوەستن؟ چۆن دەتوانی ئەو گیانە زەبوونە سەرکۆنە بکەی، کە نافامێ چ

22– شرۆڤەی یوحەننا، بەشی هەشتەم.

دیارییەکی ترسناکی بۆ هاتووە؟ نەکا تۆش بۆلای «هەڵبژاردان» هاتبێتی و لەبەر خاتری ئەوان بە پێغەمبەری گەیشتبێتی؟ ئەگەر واش بێ، ڕازێک لە گۆڕێدایە و ئێمە تێی‌ناگەین. ئەگەر ڕازیش بێ، ئێمە مافی ئەوەمان هەیە باسی ڕازێک بکەین و خەڵکی تێبگەیەنین کە بیروڕای ئازادی دڵیان و ئەشق و خۆشەویستییان هیچ نەقڵێکی نییە و بەڵکو ڕازێکە دەبێ کوێرانە و تەنانەت بە پێچەوانەی ویژدانی خۆیان پێڕەویی لێبکەن. هەرواشمان کردووە. ئێمە کاری تۆمان ئاسان کردۆتەوە و بنەماکەیمان لە سەر «پەرجۆ» و «ڕازو» و «خۆڕاگری» داڕشتووە. خەڵکی زۆریش دڵخۆشن کە دیسان وەک مەڕ و بزن خێویان هەیە و ئەو دیارییە ترسناکە کە تووشی ڕەنجێکی وەهای کردوون، لە کۆڵیان کەوتووە. ئایا لە فێرکردنی ئەو مەبەستەدا سەرکەوتوو بووین؟ پێمبڵێ! ئایا ئێمە مرۆڤمان خۆشنەویست کە ئاوا سەبوورانە بۆ بێهێزی هانمان دان و لە ڕێگای خۆشەویستییەوە باری سەرشانمان سووک کردن و تەنانەت بەفتوای خۆمان وامان لێکردن ئەو بێ‌هێزییە بە شتێکی باش بزانن؟ بۆچی ئێستا هاتووی و بوویەتە لەمپەری سەر ڕێمان؟ بۆ ئاوا چاوی دلۆڤانی خۆت تێبڕیوم و بە نیگا پرسیاربارانم دەکەی؟ تووڕە بە. من خۆشەویستیی تۆم ناوێ، چونکە خۆشم ناوێی. چ قازانجێکیشی هەیە کە شتێکت لێ‌بشارمەوە؟ پێتوایە نازانم لەگەڵ کێ دەدوێم. لە سەروبەری قسەکانم دەگەی و لە چاوتدا دەیخوێنمەوە. پێتوایە دەتوانم ڕازی خۆمانت لێ‌وەشارم؟ ئەمەش خواستی خۆتە و دەتهەوێ لە زمانی منی ببیستی. کەوایە گوێبگرە. ئێمە لەگەڵ ئەو کار دەکەین، نەک لەگەڵ تۆ ـ ڕازی ئێمەش ئەوەیە لەمێژە ـ هەشت سەدە دەبێ، بەرەولای «ئەو» بامان داوەتەوە و ئیتر کارمان بە تۆ نییە. ڕاست هەشت سەدە لەمەوبەر، ئەو شتەی تۆ بە توانج و لۆمەوە شانت لێ‌هەڵتەکاند و نەتویست، ئێمە لە «ئەو»مان وەرگرت. مەبەستم هەر ئەو دوایین دیارییەیە کە پێشکەشی کردی و سەر لەبەری ئەرز و ئاسمانی نیشاندای. ئێمە ڕمب و شمشێری قەیسەرمان لە «ئەو» وەرگرت و خۆمان کردە دەسەڵاتداری زاڵ بە سەر زەویدا. بەڵام تا ئێستا نەمانتوانیوە

کارەکانمان کاملبکەین. بەڵام ئۆباڵەکەشی لە ئەستۆی کێیە؟ ئاخ، کارەکە تازە خەریکە دەسپێدەکا، بەڵام دەستپێکردووە. دەبێ ماوەیەکی زۆر چاوەڕوان بین، زەویش ناچارە هەر ئاوا ڕەنجبکێشێ، بەڵام ئێمە سەردەکەوین و تاجی قەیسەری لە سەر دەکەین، پاشان پلانی بەختەوەریی جیهانی مرۆڤایەتی دادەڕێژین. بەڵام تۆ ئەو کاتە دەتتوانی تەنانەت شمشێری قەیسەریش وەرگری، بۆ ئەم دیارییەی دواییت ڕەتکردەوە؟ ئەگەر دوایین تەگبیری ڕۆحی زانات لە گوێ بگرتایە، دەتتوانی سەرلەبەری ئەو شتەی مرۆڤ سەر زەویی بۆ سەنگوسووژن دەدا بە ئاکام بگەیەنی ـ یانی کەسێک بۆ پەرستن، کەسێک بۆ ئاگاداریی ویژدانی ئەو و شێوەیەک بۆ یەکگرتن و یەکدڵی لە کۆمەڵگایەکی هاوڕا و یەکساندا. چونکە یەکسانی دوایین دڵەڕاوکێ و ئاواتی مرۆڤی جیهانی سێهەمە. مرڕۆڤ بە گشتی بەردەوام هەوڵیداوە حکوومەتێکی جیهانی دامەزرێنێ. زۆر نەتەوەی گەورە بە مێژووی گەورەوە هەبوون، بەڵام هەرچەندیان بەرزەوەندی پێکهێنابێ، زیاتر تووشی ناشادی بوون. چونکە پێویستیی یەکسانیی جیهانیان قووڵتر هەست پێکردووە. داگیرکەرانی گەورە، تەیموورە شەل و چەنگیزخان، وەک ڕەشەبا بە سەر ڕووبەری زەویدا گەڕان و هەوڵیاندا بە سەر تێکڕای دانیشتوانی زەویدا زاڵ بن. ئەوان هیچ نەبوون جگە لە بەیانی بێئیختیارانەی تاسەی یەکسانیی جیهانی. ئەگەر تۆش دنیا و گەورەیی و شکۆی قەیسەرت وەرگرتایە، حکوومەتێکی جیهانیت دادەمەزراند و ئاشتیی جیهانیت مسۆگەر دەکرد. چونکە کێ دەتوانێ بە سەر خەڵکدا دەسەڵاتداری بکا، ئەگەر نان و ویژدانیانی بە دەستەوە نەبێ؟ ئێمە شمشێری قەیسەرمان وەرگرت و هەڵبەت بە وەرگرتنی ئەو شمشێرە، حاشامان لە تۆ کرد و پێڕەویمان لە «ئەو» کرد. ئیتر سەردەمی فێڵ و تەڵەکە و مروڤخۆری بە سەر چووە. بەڵام لەمە بەدواوە، ئەو دەعبایە بەرەولای ئێمە دەخوشێ و لاقوقولمان دەلێسێتەوە و بە فرمێسکی خوێناوی شەلاڵی دەکا. ئێمەش لە سەر پشتی ئەو دەعبایە دادەنیشین و ئاوێنەکە بەرز دەکەینەوە، ئەو ئاوێنەی لەسەری نووسراوە: «ڕاز» بەڵام ئەو کاتە، تەنیا ئەو کاتە،

حکوومەتی ئاشتی و بەختەوەری بۆ مرۆڤ پێکدێ. تۆ بە هەڵبژاردەکانت دەنازی، بەڵام لەو هەڵبژاردانە زیاتر کەست نییە و ئێمە هێمنایەتی و خۆشی بە هەمووان دەدەین. ئەو کاتە زۆر لە هەڵبژاردەکان، کە ڕەنگە مرۆڤگلێکی خاوەن هێزیش بن، کە دەیانتوانی سەر تۆپی هەڵبژاردەکانیش بن، ئیتر لە چاوەڕوانیی تۆ بێهیوا دەبن و وزەی ڕۆح و تین و تاوی دڵیان بۆ هەوارێکی دیکە ڕادەگوێزن. لە ئاکامیشدا ئاڵای ئازادیی خۆیان لە هەمبەر تۆدا ڕادەشەکێنن. تۆ خۆت ئەو ئاڵایەت هەڵدا. بەڵام هەمووان بە هۆی ئێمەوە بەختەوەر دەبن. ئیتر نە سەرەڕۆیی دەکەن، نە یەکتریش لە نێو دەبن. هەر وەک لە ژێر ئاڵای تۆدا بن. دنەیان دەدەین کە ئازادیی خۆیان بە ئێمە بسپێرن، چونکە کاتێک بە ئازادی دەگەن کە تەسلیمی ئێمە بن. بەڵام ئەوەی کە ڕاست دەڕۆین یان درۆ دەکەین، ئەوان بەو ئاکامە دەگەن کە ڕاست دەکەین، چونکە مەترسیی کۆیلەیی و ئاژاوەیەک کە ئازادیی تۆ وەدیی هێناوە، قەتیان لەبیر ناچێ. ئازادی، ئازادیی بیر و زانست، ئەوان دەخاتە ئەو تەنگژیەوە و لەگەڵ ئەو جۆرە سەرسامی و نهێنییە بەرەوڕوویان دەکا. تاقمێ لەوان سەرەڕۆ و توندە تەبیعەتن، خۆیان لە نێو دەبەن. دیترانیش، کە یاخی و خوێڕیلەن، یەکتر لە نێو دەبەن. ئەو خەڵکەی دیکەش، بێهێز و ناشاد، تێکڕا بە مەرایی کردنەوە بە سەر کەوشەکانمدا دەکەون و بە نووزە و ناڵە دەڵێن: «بەڵێ هەق بە ئێوەیە. تەنیا ئێوە ڕازی «ئەو»تان لەدەستدایە و ئێمەش گەڕاوینەتەوە بۆلای ئێوە. ئێمە لە دەست خۆمان ڕزگار بکەن!» نانمان لێوەرگرن، بەڵام بەچاوی خۆیان دەبینن نانێک کە بە دەستی خۆیان کردوویانە، لێیان دەستێنین، تاکو بەبێ هیچ مۆجزەیەک پێیان بدەینەوە، بە چاوی خۆیان دەبینن کە بەرد ناکەین بە نان، بەڵام لە ڕاستیدا بۆ وەرگرتنی ئەو نانە لە دەستی ئێمە بەر لە خۆیان نانەکە شوکرانەبژێری دەکا! چونکە بە جوانی وەبیریان دێتەوە کە لە ڕۆژگارانی زوودا، بەبێ یارمەتیی ئێمە تەنانەت ئەو نانەش کە دیانکرد، لە دەستیاندا دەبوو بە بەرد. بەڵام لەو کاتەوە گەڕاونەتەوە بۆلای ئێمە، بەرد لە دەستیاندا دەبێ بە نان. زۆر چاک لە

بایەخی گوێڕایەڵی دەگەن! هەتا ئەو کاتەش کە مرۆڤ بۆی دەردەکەوێ، هەر ناشاد و هیوابڕاو دەبن. پێمبڵێ بزانم بۆ نەزانینیان کێ لە هەموو کەس زیاتر شیاوی لۆمەیە؟ کێ میگەلەکەی لە سەر مۆڵگە ڕادا و لەو دەشتە کاکی بەکاکییەدا چەواشەی کردن؟ بەڵام میگەل هەمیسان یەک دەگرنەوە و جارێکی دیکە گوێ لە مست دەبەنەوە و ئەو کەوی و گوێ لەمستییەش هەتاهەتایی دەبێ و پاشان ئێمە بەختەوەری و هێمنایەتیی ئەو خەڵکە بێهێز و خاکەڕایە، کە لە زاتی خۆیاندا هەروان بەخۆیان پێشکەشدەکەین. لە ئاکامیشدا هانیاندەدەین لەخۆبایی بن. چونکە تۆ بەرزت کردنەوە و فێری بادیهەوایی و لووت بەرزیت کردن. نیشانیاندەدەین کە بێهێزن و منداڵانێکی بەستەزمان و جێی بەزیین. بەڵام لەو شادییە منداڵانەش خۆشتر هەر نییە. لە ترسانا دەلەرزن و بە چاوی ڕێزەوە لە ئێمە دەڕوانن و دەخزێنە ژێر باڵی ئێمە و خۆیان مات دەکەن. سەریان لە ئێمە سوڕ دەمێنێ و لە هەمبەرماندا ترساو و قوشقی دۆش دادەمێنن. ئەو هەموو توانایی و زانایییەی ئێمە تووشی واق و وڕمانیان دەکات کە توانیومانە ئەو ڕانە ئاڵۆز و ملوێنییە کەوی بکەین، هەر بۆیە لە خۆشیانا پێیان وەعەرز ناکەوێ. لەبەر داماوی لە هەمبەر تووڕەیی ئێمەدا وەلەرزین دەکەون و ترس سەرتاپایان دادەگرێ. وەک منداڵان و ژنان سەردەکەنە سەر باسک و ئەژنۆی خۆیان و فرمێسک هەڵدەوەرێنن. هەر لەو کاتەدا بە ئاماژەیەکی ئێمە دەستدەکەن بە پێکەنین و سەما و شادی و وەک منداڵ دەکەونە قریشک و هۆڕ و هەڵبەزین. بەڵێ، کاریان بۆ دەدۆزینەوە، بەڵام لە کاتی پشوودانیدا ژیانیان وەک کایەی منداڵان لێدەکەین. تەنانەت ئیزنیان پێدەدەین تاوان بکەن، پێیان دەڵێین ئەگەر تاوان بەپێی فتوای ئێمە ئەنجامدرابێ، کەفارەتەکەی دەدەین. بۆیەش ئیزنی تاوانیان پێدەدەین چونکە خۆشمان دەوێن، سزای تاوانەکانیشیان خۆمان وەئەستۆ دەگرین. هەرواش دەکەین، ئەوانیش ئێمە بە دڵسۆز و ڕزگاریدەری خۆیان دەزانن کە لە بارەگای خودا کفارەی تاوانەکانیانمان وەئەستۆ گرتووە، هەر بۆیە دبنە گوێ لە مستی خۆمان و بە موو لە قسەمان لانادەن و هیچ ڕازێکمان لێناشارنەوە.

گراو و ژن و منداڵیان ـ بە پێی ئەوەی گوێڕایەڵ بوون یان سەرەڕۆ ـ لێ حەرام یان حەڵاڵ دەکەین. ئەوانیش لە خۆشیانا دەبنە فەرمانبەرمان و موو ناپسێنن. دژوارترین و بەژانترین ڕاز و نهێنیی ویژدانیان مووبەموو بە ئێمە دەڵێن و ئێمەش بۆ هەموویان وەڵام دەدۆزینەوە. ئەوانیش چونکە بڕوای قایمان بە وەڵامەکەی ئێمەیە دەگەشێنەوە، چونکە ئەوانمان لە چنگ دڵەخورپە و ئازارێکی ترسناک ڕزگار کردووە، کە لە ناخەوە عەجمانی لێ‌هەڵگرتوون. هەر بۆیە ملوێنان ملوێن خەڵک بەختەوەر دەبن، بێجگە لەو سەد هەزار کەسەی کە دەسەڵاتدارن. چونکە تەنیا ئێمە، ئێمە کە هەڵگری ڕاز و نهێنیین، ناشاد دەبین. ملوێنان ملوێن منداڵی بەختەوەر لە کۆمەڵدا دەبن و سەد هەزار ئازارکێشی خەمۆکیش کە ئۆباڵی ئەو هەموو خێر و شەڕەیان وەئەستۆ گرتووە. لەوپەڕی هێمنایەتیدا دەمرن، لە هێمنایەتیدا بە ناوی تۆوە دەکەونە گیانکەنشت و دوای مەرگیش لە نێو گۆڕەکەیاندا لە ڕزین و پووکانەوە زیاتر هیچ نابینن. بەڵام ئێمە ئەو ڕازە ڕادەگرین و بۆ بەختەوەرییان، بۆ پاداشی بەهەشت و هەرمان وەسەر تەماحیان دەخەین. ئەوەش بزانە ئەگەر لەو دنیا شتێک ببێ، دڵنیام بۆ کەسانێکی وەک ئەوان نابێ. پێشوێژی کراوە لەگەڵ سەرکەوتن دەگەڕێیتەوە، لەگەڵ هەڵبژاردان و خاوەن هێزان و غوللووران دێیتەوە. بەڵام ئێمە دەڵێن ئەوان تەنیا خۆیان ڕزگار کرد و ئێمەش هەموانمان ڕزگار کرد. بە ئێمەیان گوتووە ئەو بەستۆکەی سواری دەعبایەکی وەحشی بووە و «ڕاز»ی بە دەستەوەیە، ڕوو ڕەشە. هەر بۆیە خەڵکی ڕەشوڕووت ڕادەپەڕن و بەرگە هەورێشمین و شاهانەکەی لەبەردا شڕ دەکەن و لەشی «قێزەونی» ڕووت و قووت دەکەنەوە[٢٣]. بەڵام ئەو کاتە من هەڵدەستم و ملوێنان ملوێن منداڵی بەختەوەرت پیشاندەدەم کە هیچ خەبەرێکیان لە تاوان نییە. ئێمەش لەبەر بەختەوەری تاوانمان وەئەستۆ گرتووە، لە هەمبەر تۆدا ڕاستەوە دەبین و بە ڕاشکاوی دەڵێین: «ئەگەر دەتوانی و لەخۆت ڕادەبینی فەرمانمان پێبدە.» ئەوەش بزانە کە هیچ باکێکمان لە تۆ نییە. بشزانە من لە

23- شرۆڤەی یوحەننا، بەشی حەڤدەهەم.

بیابان بوم و بە ڕەگی گیا و کوللە بەڕێچووم. منیش بەو ئازادییەمدا هەڵکەوتووە کە تۆ خەڵکت پێ تەقدیس کردووە. منیش هەوڵم دەدا بیمە ڕیزی هەڵبژێردراوانتەوە. لە ڕیزی بەهێزان و دەسەڵاتداراندا، بەو تاسەیەوە کە «ژمارەکە کامڵ بکەم.» بەڵام وەخۆ هاتمەوە و خۆم شێتنەکرد. گەڕامەوە و چوومە ڕیزی ئەو کەسانەوە کە بەشوێن بەرژەوەندیی کاری تۆوە بوون. لەخۆباییەکانم بەجێ هێشت و لەبەر خاتری بەختەوەریی خاکەڕایان گەڕامەوە بۆلای ئەوان. ئەوەی بە تۆ دەڵێم وەڕاست دەگەڕێ و بنەمای دەسەڵاتداریمان دادەمەزرێ. دووپاتی دەکەمەوە، سبەینێ بە چاوی خۆت دەیبینی ئەو ڕەوە فەرمانبەرە چۆن بە ئاماژەیەکی من وەخۆ دەکەون بە کۆڵ و باوەش ئێزنگ و ئاوردوو دێنن بۆ سووتاندت، تاکو لەوە زیاتر نەبیتە کۆسپی سەر ڕێمان. چونکە ئەگەر کەسێک هەبێ و شیاوی ئەو ئاورەی ئێمە بێ، ئەوکەسە تۆی. سبەینێ دەتسووتێنم.»

ئیوان ئیتر بێدەنگ بوو. کاتێک قسەیدەکرد هۆشی لای خۆی نەبوو بە هەڵەپڕووکێ قسەی دەکرد. دوای تەواو کردنی وتارەکەی، لە ناکاو زەردەیەکی گرت.

ئالیووشا بە بێدەنگی گوێی ڕاگرتبوو. لە ئاخر و ئۆخری قسەکاندا بەجارێ شڵەژا بوو و چەند جار ویستی بپەڕێتە نێو قسەکانی و پێی ببڕێ، بەڵام دانی بە خۆیدا گرت. ئێستا تەواو هەڵچووبوو.

بە تووڕەیی و ڕەنگی سوورهەڵگەڕاوەوە گوتی: «خۆ ئەو قسانەت... زۆر بێتام و چەواشەکارانە بوو! شیعرەکەت تاریفی مەسیح بوو نەک زەمی ئەو - ئەو چەشنەی کە مەبەستت بوو. کێ سەبارەت بە ئازادی باوەڕ بەو قسانەت دەکا؟ کوا ئەوە شێوەی تێگەیشتنیەتی؟ لە کلێسەی ئۆرتۆدۆکس سەبارەت بە ئەوە بیروڕایان وانییە... ـ بیروڕای کلێسای ڕۆم وایە و تەنانەت بیروڕای خراپترین کاتۆلیک، تەنانەت پشکێنەران و یەسووعیان وایە!... بوونەوەرێکی خەیاڵیی وەک پشکێنەری مەزنی تۆ هەر نییە. ئەو تاوانانەی مرۆڤایەتی کە وەئەستۆیان گرتووە چییە؟ ئەو ڕازیارانە کە لەبەر بەختەوەریی مرۆڤایەتی

لەعنەتیان بۆ خۆیان کڕیوە، کێن؟ کێ دیتوونی؟ یەسووعییەکان دەناسین، ناویان بە خراپ زڕاوە، بەڵام لە ڕاستیدا وانین، هەرگیز وانین. ئەوانن ئەرتەشی ڕۆم کە بە سەر جیهاندا زاڵدەبن. لەگەڵ ئۆسقۆفی مەزنی ڕۆمی کە خۆی ئیمپڕاتۆڕە.... هەموویان ئامانجیان ئەوەیە. بەڵام هیچ چەشنە ڕازێک یان خەمێکی گەورە کاریان تێناکا... تەواوی هەوەس و ئارەزوویان بۆ دەسەڵاتە. بۆ گیڤەی دنیایی، بۆ سەڵتەنەتە ـ شتێکی وەک کۆیلەداریی جیهانی و بوونە ئەربابە ـ ئەوەی خۆی بۆ دەکوتن. ڕەنگە ئیمانیان بە خوداش نەبێ. ئەو پشکێنەرە زوورهانەی تۆش تەنیا خەیاڵێکە و هیچی دیکە.»

ئیوان بە پێکەنینەوە گوتی: «سەبرکە، سەبرکە! بۆ ئاوا هەڵبووی! دەڵێی خەیاڵە، باشە با قسەی تۆبێ! ڕەنگە خەیاڵیش بێ. بەڵام با پێتبڵێم، یانی بەڕاستی پێتوایە کلێسای کاتۆلیک لە سەدەکانی ڕابردوودا تەنیا هەوەس و تاسەی دەسەڵات و گیڤەی دنیایی بووە؟ ئامۆژگارییەکانی باوکە پایسیش هەر ئەوە بوو؟»

ئالیووشا بەلەز قسەکەی خۆی ڕاستکردەوە: «نا، نا، بەپێچەوانە، جارێکیان باوە پایسی شتێکی گوت، کە تاڕادەیەک لەو قسەی تۆ دەچوو... بەڵام ڕاست ئەو قسەیە نییە، بە هیچ شێوەیەک وەک ئەو نییە.»

«ئەو قسەیەی «بە هیچ شێوەیەک وەک ئەو نییە»ی تۆ هەواڵێکی بەنرخە. لە تۆ دەپرسم، بۆ یەسووعیان و ئەو پشکێنەرانەی مەبەستی تۆیە بۆ گیڤەی مادی یەک ناگرن؟ بۆ لە نێویاندا شەهیدێک نییە کە بە دەست خەفەتێکی گەورە و ئەشقی مرۆڤانەوە ئازار بکێشێ؟ وای دانێ لە نێو ئەوانەدا کە تامەزرۆی شتێکن جیا لە گیڤەی دنیایی، مرۆڤێکی وا هەبێ ـ ئەگەر تەنیا کەسێک وەک پشکێنەری پیری شیعرەکەی من هەبێ کە خۆی لە بیابان کوللە و ڕەگە گیای خواردبێ و شێتانە هەوڵی دابێ بە سەر جەستەی خۆیدا زاڵبێ، بۆ ئەوەی خۆی ڕزگار و کامل بکات. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەموو ماوەی تەمەنی ئاشقی مرۆڤایەتی دەبێ و لە ناکاو چاوی هەڵدێنێ و دەبینێ گەیشتن بە کەماڵ و ئازادی بەختەوەرییەکی گەورە نییە، ئەگەر لەو حاڵەدا مرۆڤ بەو

بڕوایە بگا کە ملوێنان خەڵک هەیە کە خودا بۆ مەخسەرە و لەخۆڕا خولْقاندوونی و قەت ناتوانن کەڵک لە ئازادیی خۆیان وەرگرن. ئەم یاخییە لێقەوماو و هەژارانەش هیچکاتێک ناتوانن ببنە ئەو دێوەی کە بینای ئەو قەڵایە تەواو بکەن. لەبەر ئەو گەوجانەش نەبوو کە کەماڵخوازی مەزن خەونی یەکسانیی خۆی دی. بە دیتنی هەموو ئەوانە ئەو دەگەڕێتەوە و لەگەڵ خەڵکی وریا و چاوکراواه یەک دەکەوێ. بەڕاستیش ئەو شتە ڕوویداوە.»

ئالیووشا زۆر بە تووڕەیی نەڕاندی: «لەگەڵ کێ یەک بکەوێ، کام خەڵکی وریا و زیرەک؟ ئەوان ئەو هەموو زیرەکی و ڕاز و نهێنییەیان نییە... ڕەنگە هیچ شتێک جگە لە لادینی لە گۆڕێدا نەبێ و ڕازیشیان هەر ئەوەیە. پشکێنەری تۆ ئیمانی بە خودا نییە، ڕازی ئەویش هەر ئەوەیە!»

«دەیجا چییە ئەگەر واشبێ! ئاکامەکەی بێنە بەرچاوت. ڕاست وایە و سەرلەبەری ڕازەکەش هەر ئەوەیە. مەگین هەر ئەوەش ئازار نییە؟ لانیکەم بۆ مرۆڤێکی وەک ئەو، کەسێک کە هەموو ماوەی تەمەنی لە بیابان بە هەدەر داوە، لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانێ لە چنگ نەخۆشیی بێچارەسەری ئەوین و خۆشەویستیی مرۆڤایەتی ڕزگار بێ. لە تەمەنی پیریدا بەو باوەڕە ڕۆشنە گەیشت کە هیچ شتێک بەقەد ئامۆژگاریی ڕۆحی مەزن و بەسام ناتوانێ بۆ خەڵکانی بێهێز و سەرەڕۆ و ناقیس کە بۆ گونگەڵ و چارەڕەشی خولْقاون بناغەی ژیانێکی باش ڕۆنێ. هەر بۆیە دوای بڕواهێنان بەو خاڵە، بۆی دەردەکەوێ کە دەبێ لە ئامۆژگاریی ڕۆحی زانا، ڕۆحی بە سامی مەرگ و فەوتان، پێڕەوی بکا و لە ئاکامدا درۆ و فڕوفێڵ قەبووڵ بکا، وشیارانەش خەڵک بۆ مەرگ و فەوتان ڕێنوێنی بکا. لەگەڵ ئەوانەشدا لە هەموو مەودای ڕێگادا فریویان بدا تاکو تێنەگەن بەرەو کوێیان پەلکێش دەکەن. تاکو خەڵکانی کوێر و هەژار لانیکەم لەو ڕێگایەدا خۆیان بە بەختەوەر بزانن. سەرنجی ئەوەش بدە. فریوەکە بە ناوی «ئەو»ەوەیە. هەر ئەوەی کە پیرەپیاو لە تەواوی ژیانیدا ئاوا بە گوڕ و تینەوە باوەڕی بە ئامانجی «ئەو» بوو. ئایا پڕ ئازار نییە؟ ئەگەر تەنیا کەسێکی ئاوا پێشەنگی لەشکرێکی تینووی دەسەڵات و

تەنیا لەبەر گیڤەی دنیایی بووایە، ئایا مرۆڤێکی ئاوا بۆ خولقانی تراژیدیا بەس نەبوو؟ لەگەڵ ئەوەشدا ئەم پێشەنگە بۆ ئافراندنی ئەندێشەی قۆقزی کلێسای ڕۆم بە تەواوی لەشکر و یەسووعی و باڵاترین ئەندێشەیانەوە سەروزیادە. بە ڕاشکاوی پێتبڵێم من ئیمانێکی پتەوم بەوە هەیە کە لە نێو ئەوانەدا وا پێشەنگی بزووتنەوەکە بوون، کەسێکی ئەوتۆ نەبووە. دەزانی؟ ڕەنگە لە نێو پاپەکانی ڕۆمیشدا کەسێکی وا هەبووبێ. دەزانی، ڕەنگە ڕۆحی ئەو پیرەپیاوە تووک لێکراوە کە مرۆڤایەتیی ئاوا خیشەسەرانە و بە شێوەی خۆی خۆش دەوێ، تەنانەت ئێستاش لە نێو گرووپی ئەو چەشنە پیرە پیاوانەدا، هەبێ. بوونەکەشی نەک بە هەڵکەوتبێ بەڵکو بەپێی قەرارداده. بە شێوەی گرێبەستێکی نهێنی کە ماوەیەکی زۆر لەمەوبەر بۆ پاراستنی ڕاز بەستراوە، تاکو لە مەترسیی هەژاران و خەفەتباران بیپارێزێ، تاکو بەو هۆیەوە بە بەختەوەرییان بگەیەنێ. بێگومان واشە و بەڕاستیش هەر دەبێ وابێ. پێموایە تەنانەت لە نێو فەراماسۆنەکانیشدا ڕازێکی ئاوا لەگۆڕێدا بووە و هەر بەو هۆیەوەیە کاتۆلیکەکان وەک ڕەقیبێک چاو لە فەراماسۆنەکان دەکەن کە دژی یەکیەتیی ئەندێشەیانن و ڕقیان لێیانە. بۆیە ئێستا زۆر پێویستە ڕەوەیەک و شوانێک هەبن. بەڵام بەو شێوەیە کە خەریکم بەرگری لە ئەندێشەی خۆم دەکەم. لەوانەیە نوسەرێکیش بم کە تاقەتی ڕەخنەی تۆم نەبێ. با لەوە زیاتری لە سەر نەڕۆم.

ئالیووشا هەڵیدایە: «ڕەنگە تۆش فەراماسۆن بی!» بە لەبزێکی زۆر خەمبارانەش درێژەی بە قسەکانیدا: «ئیمانت بەخودا نییە.» لەگەڵ ئەوەشدا هەستیکرد براکەی بە سووکایەتی و تیروتوانجەوە لەگەڵی دەدوێ و چاوی لێدەکا. لە ناکاو سەری داخست و پرسیی: «شیعرەکەت چۆن تەواو دەبێ؟ یان هەر ئەمە کۆتاییەکەی بوو؟

«دەمویست ئاوای تەواو بکەم. کاتێک کە پشکێنەر دەستی لە قسە هەڵگرت، ماوەیەک چاوەڕوان ما تاکو بەندییەکە وەڵامی بداتەوە. بێدەنگیی ئەو لە سەر شانی قورسایی دەکا. تێگەیشت کە بەندییەکە بە وردی سەرنجی

داوەتە قسەکانی. بە نەرمی چاوی لە چاوی بڕیوە و لەوە ناچێ وەڵامی بداتەوە. پیرە پیاو بە ئاواتەوە بوو «ئەو» شتێک بڵێ، ئەگەر وەڵامەکەی تاڵ و پڕ مەترسیش بێ. بەڵام ئەو لە ناکاو نەرم و بێدەنگ لە پیرە پیاو نزیک دەبێتەوە و لێوە چرچ و سپیھەڵگەڕاوەکانی ڕادەمووسێ. هەموو وەڵامەکەشی هەر ئەوەیە. پیرە پیاو لەرز دایدەگرێ، لێوی دەلەرێ. دەچێ بۆلای دەرگاکە دەیکاتەوە و پێیدەڵێ: «بڕۆ و ئیتر مەگەڕێوە... قەتقەت ڕوو لێرە مەکەوە!» بەرەو شەقام و گۆڕەپانی تاریکی شارەکە ڕەوانەی کرد. بەندییەکەش ملی ڕێی گرت و ڕۆیشت.

- ئەی پیرەپیاوەکە؟

ـ ماچەکە لە دڵیدا دەدرەوشێتەوە، بەڵام دەست لە بیرۆکەی خۆی هەڵناگرێ.

ئالیووشا خەمبارانە گوڕاندی: «تۆش لەگەڵ ئەو، هاوبیر وڕای؟ ئیوان دەستیکرد بە پێکەنین.

- دەی هەمووی وڕێنەیە ئالیووشا. شیعرێکی بێمانایە و لاوێکی بێمێشکی زانکۆیی نووسیویەتی، کە بە عومراتی خۆی نەیتوانیوە دێڕە شیعرێک بنووسێ. بۆ وا زوو باوەڕت کرد؟ یانی پێتوایە ڕاست دەچم بۆلای ژێزۆئیتەکان و دەچمە ڕیزی کەسانێکەوە کە کارەکانی «ئەو» ڕاستەوپاستە دەکەن؟ خودای دلۆڤان هیچ پێوەندییەکی بە منەوە نییە. پێمگوتی، تەواوی ویستی من ژیانە هەتا تەمەنی سیساڵان، دوای ئەویش... پەرداخی تەمەن بە عەرزیدا دەکێشم و وردوخاشی دەکەم!

ئالیووشا خەمبارانە دەنگی هەڵێنا: «بەڵام گەڵا و پەلکی ناسک و شلک و گڵکۆی جوان و ئاسمانی شین و ژنێک کە دڵت پێوەیەتی، چی لێدەکەی؟ چۆن دەژیی؟ چۆنت خۆشدەوێن؟ بەو دۆزەخەوە کە مێشکی داگرتووی چۆن هەڵدەکەی؟ وایە، ڕاست لەبەر ئەوە هەڵدێی تاکو پێوەندی بەوانەوە بکەی و بچیتە ڕیزیانەوە... ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە خۆتت دەکوشت، چونکە ناتوانی تاقەت بێنی!

ئیوان بە بزەیەکی سارد و سڕەوە گوتی: «وزەیەک هەیە کە دەتوانێ هەموو شتێک تامڵ بکا.»

- چ وزەیەک؟

- وزەی بنەماڵەی کارامازۆف ـ وزەی خوێڕییانەی ماڵباتی کارامازۆف.

- نوقم بوون لە نێو کاری پیس و ناحەزدا، خنکاندنی گیانی خۆت لە نێو گەندەڵیدا، ها؟

- ڕەنگە واش بێ... بەڵام ڕەنگە هەتا کاتێک کە دەبمە سی ساڵان لە دەست ئەوە ڕاکەم، پاشان...

ـ چۆن لە دەستی ڕادەکەی؟ بە کام ورەوە دەرباز دەبی؟ بە بیرۆکە جوانەکەت؟ ئەوە ئەستەمە.

- دیسان بە شێوەی بنەماڵەی کارامازۆف.

- مەبەستت ئەوەیە کە «ئیزنی هەموو شتێکت هەیە؟» هەموو کارێک ها؟

ئیوان نێوچاوانی تێکنا و کتوپڕ ڕەنگی هەڵبزڕکا.

«یانی تۆ ئەو قسەیەت قەبووڵە کە میۆسۆف کردبوویە بنێشتە خۆشەکە و دیمیتریش ئاوا سایلۆحانە کاوێژی کردەوە؟» ئیوان چزەبزەیەکی هاتێ. «بەڵێ ئەگەر پێتخۆش بێ دەتوانی ئیزنی هەموو شتێک بە خۆت بدەی، چونکە وەقسە هاتووە و منیش قسەکەی ڕەت ناکەمەوە و پێموایە شیکارییەکەی میتینکاش خراپ نییە.»

ئالیووشا بە بێدەنگی چاوی تێبڕی.

ئیوان لە ناکاو بە هەستێکی چاوەڕواننەکراوەوە گوتی: «براکەم، پێموابوو ئەگەر لێرە بڕۆم، لانیکەم تۆم هەیە، بەڵام ئێستا بۆم دەرکەوت تەنانەت لە دڵی تۆی خۆشەویستیشدا جیگام نییە. بۆیە چاوپۆشی لە «ئیزنی هەموو شتێک هەیە.» ناکەم. تۆش لەبەر خاتری ئەو چاوپۆشی لە من ناکەی، ها؟

ئالیووشا هەستا، چوو بۆلای و بە نەرمی لێوانی ڕامووسی.

ئیوان سەرخۆشانە هاواریکرد: «ئەوە لاسایی کردنەوەیەکی ئەدەبی بوو. تۆ ئەوەت لە شیعرەکەی من دزیوە، بەڵام سپاست دەکەم. هەستە ئالیووشا، کاتی ڕۆیشتنە، دەبێ هەردووکمان بڕۆین.»

لە مەیخانەکە چوونە دەرێ. بەڵام کاتێک گەیشتنە بەردرگای دەرێ بە جووت ڕاوەستان. ئیوان بە لەبزێکی جیددی گوتی: «گوێبگرە ئالیووشا، ئەگەر لە ڕاستیدا بتوانم خەمخۆری ئەو چرۆ ناسک و وردانە بم، لەگەڵ وەبیر هێنانەوەی تۆ خۆشەویستیی ئەوانیش لە دڵمدا دەپشکوێ. هەر بۆیە دڵنیام کە تۆ لەم دەوروبەرانەی و لێم نزیکی، هەر بۆیە زیاتر حەز بە ژیان دەکەم. دەی قسەکانم قانعی کردی؟ ئەگەر پێتخۆشە، بە دانپیانانی ئاشقانەی بزانە. ئێستا تۆ بە ڕێی ڕاستدا دەڕۆی منیش بەرێی چەپدا. هەر ئەوەش بەسە. گوێت لێیە؟ هەر ئەوەش بەسە. مەبەستم ئەوەیە تەنانەت ئەگەر سبەینێش نەڕۆم (کە پێموایە هەر دەڕۆم) دیسان چاومان بە یەکتر دەکەوێ. ئیتر لە سەر ئەو باسە مەڕۆ. تکات لێدەکەم.» لەپڕ بە لەبزێکی تووڕەوە درێژەی پێدا: «بەتایبەت نامەوێ سەبارەت بە دیمیتری قسەم لەگەڵ بکەی، تکات لێدەکەم هەر باسی مەکە. ئیتر لە تام دەرچووە، هێندەمان باسکردووە، وانییە؟ لەباتی ئەوەش بەڵێنییەکت دەدەمێ. کاتێ لە تەمەنی سیساڵیدا ویستم «پەرداخەکە بە عەرزیدا بکێشم»، لە هەرکوێیەک بم دەگەڕێمەوە بۆلای تۆ تاکو جارێکیتر پێکەوە قسە بکەین، ئەگەر تەنانەت لە ئەمریکاش بم، دڵنیا بە. بە ئانقەست دێمەوە. دیتنی تۆ زۆر خۆشە بەلامەوە، بەتایبەت لەو کاتەدا دەبێ چ ئاڵوگۆڕێکت بەسەردا هاتبێ. شەرتبێ بە شەرتی پیاوان، دێمەوە بۆلات. ڕەنگە هەشت نۆ دە ساڵ لە یەکتر دوور بین. ئێستا وەرە و بڕۆ بۆلای «پاتێرسیرافیکۆس»ی خۆت، لە سەرەمەرگدایە، ئەگەر بمرێ و تۆ لە ژوور سەری نەبی، دڵی من دێشێ کە بوومەتە هۆی ماتڵ بوونت. خوداحافیز. جارێکی دیکە ماچمبکە. زۆر چاکە، ئێستا بڕۆ.»

ئیوان لە ناکاو وەرسووڕا و بەبێ ئەوەی سەر هەڵێنێ و ئاوڕ بداتەوە ملی ڕێی گرت. ڕاست بەوجۆرە ڕۆیشت کە ڕۆژی پێشوو دیمیتری ڕۆیشتبوو و

ئالیووشای بەجێ هێشتبوو. ئەگەرچی ماڵئاواییەکە زۆر جیاواز بوو. وێکچوونی سەیری دڵەخورپە و خەفەتی ئەو کاتە وەک تیر بە زەینی ئالیووشادا تێپەڕی. ماوەیەک واق ما و چاوی لە ڕۆیشتنی براکەی بڕی. لەپڕ تێگەیشت کە ئیوان خۆی ڕادەوەشێنێ و دەڕوا و شانی ڕاستەی لە چاو شانی چەپەی تۆزێ داتەپیوە. بەر لەوە قەتی سەرنج نەدابوو. ئالیووشاش خێرا وەرسووڕا و بە هەڵەداوان بەرەو کلێسە وەڕێ کەوت. هەوا تاریک داهاتبوو و ئالیووشا تاڕادەیەک ترسی لێنیشتبوو. لە ناخیدا شتێکی تازە خەریک بوو ڕەگاژۆی دەکرد، بەڵام ئەو هۆیەکەی نەدەزانی. وەک دوێ شەو دیسان بای دەهات. کاتێک گەیشتە نێو دارستانەکەی نزیک حوجرە، کاجە پیرەکان لە دەوروبەری خەمبارانە دەشنینەوە و هاژەی با بەنێو لکوپۆپەکانیاندا ویرەویرەی دەکرد. هەڵدەهات. بە سەرسوڕمانەوە لە خۆی پرسی: «پاتێر سیرافیکووس[٢٤]» ـ ئەو ناوەی لە جێیەک وەرگرتبوو ـ لەکوێ؟ ئیوان، ئیوانی بێچارە، کەنگێ دەتبینمەوە؟... ئەوەش حوجرەکە. بەڵێ، بەڵێ، ئەو «پاتێر سیرافیکووس»ە و ڕزگارم دەکا. ـ بۆ هەتا هەتایە ڕزگارم دەکا!»

دواتر چەند جار سەری لەوە سووڕما کە چۆن توانیبووی کاتی جیابوونەوە لە ئیوان، دیمیتریی برای ئاوا بە تەواوی لەبیر بچێتەوە، ئەگەرچی ئەو ڕۆژە بەیانی تەنیا چەند سەعات لەمەوبەر، بڕیاری دابوو دیمیتری بدۆزێتەوە و دەست لە گەڕان هەڵنەگرێ، تەنانەت ئەگەر نەتوانێ ئەو شەوە بگەڕێتەوە بۆ کلێسەش.

---

24- قەشەیەک بوو لە شانۆنامەی «فاوێست"دا بەشی دووهەم، بەرهەمی گۆتە.

## (٦)

## تا ماوەیەک مرۆڤێکی زۆر نهێنیکار

ئیوان فیۆدۆرۆویچ، کە لە ئالیووشا هەڵبڕا، ڕۆیشتەوە بۆ ماڵێ، بۆ ماڵی فیۆدۆرپاولۆویچ. بەڵام پەژارەیەکی تاقەتبڕ حەجمانی لیٚهەڵگرتبوو. ئەو خەمەش لەگەڵ هەر هەنگاوێک کە بەرەو ماڵێی هەڵدێنایەوە زیاتر دەبوو. خەفەتەکەشی شتێکی سەیر نەبوو؛ ئەوەی سەیر بوو ئەوە بوو کە ئیوان فیۆدۆرۆویچ لە هۆیەکەی نەدەگەیشت. بەر لەوەش زۆرجار تووشی خەم و دڵەخورپە بووبوو، لەوکاتەشدا شتێکی غەریب هەستی ڕێک دەکوشی. ئەوەش لەکاتێکدا بوو کە لە هەموو ئەو شتانە دابڕابوو کە هێنابوویانە ئێرە و هەر ئەو ڕۆژە ئامادە دەبوو ڕێگایەکی دیکە هەڵبژێرێ و بەرەو داهاتوویەکی نوێ و نەناسراو وەڕێکەوێ. دیسان وەک هەمیشە تاق و تەنیا بوو. ئەگەرچی چاوەڕوانییەکی زۆر و هیوایەکی لەڕادەبەدەری بە ژیان هەبوو، بەڵام نەیدەتوانی بە ڕاشکاوی ڕاڤەی هیوا و چاوەڕوانییەکانی یان تەنانەت ئاواتەکانی بدا بە دەستەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەو کاتە، ئەگەرچی خەمی داهاتوویەکی نوێ و نەناسراو لە دڵیدا دەگەڕا، ئەوەی نیگەرانی دەکرد شتێکی تەواو جیاواز بوو. لەخۆی دەپرسی: «بڵێی لەبەر ئەوە بێ ڕقم لە ماڵی باوکمە؟ زۆر وێدەچێ. بە تەواوی لێی بێزار بووبێتم؛ هەر دەڵێی دوایین جاریشە لە دەرگا قێزەونەکەیەوە دەچمە ژوورێ. زۆری لێوەڕەزم... نا ئەمەش نییە. بۆئەوەیە ئەو قسانەم لەگەڵ ئالیووشا کردووە و لێشی جودا بوومەتەوە؟ ساڵانێکی زۆرە لەگەڵ تەواوی دنیا قڕوقەپم کردووە و دەڵێی مەلامەلایان لێکردووم. جاریواشە هەر لەخۆوە ئەم وەڕاوە و قسە هەڵلەقمەڵلەقانە پێکەوە دەنێم.»

لەڕاستیدا وێدەچوو بەهۆی خەم و دڵەخورپەی لاوییەوە بێ، بەهۆی دمارگرییەکی کاڵ و لاوانەوە. یان خەم و ناکام بوون و هیوابڕان لە ناخەوە. بەتایبەت هەڵبڕان لە کەسێکی وەک ئالیووشا کە بەڕاستی لە دڵەوە خۆشی دەویست. بێگومان ئەو خەمە لەوێوە سەرچاوەی دەگرت. ئەو خەمە حەتمەن هەر ئەوە بوو. بەڵام نا، بنووسەکەی ئەوە نەبوو، ئەویش نەبوو. «لە دەست خەفەت وەزاڵە هاتووم، بەڵام خۆشم نازانم چم دەوێ و بۆ ئاوام لێهاتووە. ڕەنگە هەر بیری لێنەکەمەوە باشتر بێ.»

ئیوان فیۆدۆرۆویچ هەوڵیدا «بیر نەکاتەوە»، بەڵام ئەوەش کەڵکی نەبوو. ئەوەی خەمەکەی ئاوا قورس و تاقەتپڕووکێن کردبوو، ئەوە بوو کە تایبەتمەندییەکی بێبایەخ و دەرەکیی هەبوو ـ هەستی بەوە دەکرد. دەتگوت کەسێک یان شتێک لە دەرەوەی ڕۆحی ڕاوەستاوە و هێندێجار خۆی بەسەردا دەسەپێنێ و ناچارە چاوی لێبکا. ڕەنگە مرۆڤ بەهۆی کار و سەرقاڵ بوون و مشتومڕەوە هێندێ جار بۆ ماوەیەکی زۆر هەستی پێنەکا، بەڵام هێندە مرۆڤ تووشی ئازار و ئەشکەنجە دەکا، ئاخری ناچارە هەستی پێبکا و ئەو شتە ملۆزم و مزیرە هەڵگرێ. زۆر جاریش شتێکی قۆڕ و بێکەڵکە ـ شتێکە لە سەر جێی خۆی دانەندراوە، پەڕۆیەکی فڕێدراو لە چەقی ژوورەکەدا، کتێبێک کە نەخرابێتەوە سەر جێگاکەی خۆی، و هتد... ئاخری ئیوان فیۆدۆرۆویچ، زۆر تووڕە و نێوچاوان ترش، گەیشتەوە ماڵێ و لە ناکاو نزیکەی پازدە هەنگاوی مابوو بگاتە باخەکە، شکی کرد کە چییە بۆتە هۆی خەم و دڵەخورپەی.

لەسەر خواجەنشینی بەر دەرگاکە دانیشت، ئیسمیر دیاکۆفی بەڕەڵڵا لەوێ دانیشتبوو و هەوای فێنکی بەرەبەیانی هەڵدەمژی. ئیوان فیۆدۆرۆویچ بە یەکەم ڕوانین بۆی دەرکەوت ئەوەی لە دالغەیدا بوو ئیسمیر دیاکۆفی بەرەڵڵا بوو کەوا ڕۆحی ئازار دەدا و لە ناخەوە ڕقی لێی بوو. لە ناکاو ئەوە بە زەینیدا هات و بۆی ڕوون بۆوە. بەرلەوە، کاتێک باسی دیدارەکەی خۆی و ئالیووشای بۆکرد، هەستی بە وەڕەزی و دڵگوشران کرد و هەر لەڕێوە

ڕقێکی ئەستوور دڵی داگرت. ئەو کاتەی قسەیان دەکرد بۆ ماوەیەک ئیسمیر دیاکۆفی لەبیر چوبۆوە، بەڵام هەروا لە داڵغەیدا مابوو. بەڵام هەر ئەو کاتەی لە ئالیووشا دابڕا و بەرەو ماڵێ ملی ڕێی گرت، ئەو هەستە لەبیر کراوە دیسان لە زەینیدا قوت بۆوە، بە ڕق هەستاوی لەخۆی پرسیی: «یانی دەبێ بوونەوەرێکی هیچوپووچ و قێزەونی وەک ئەوە ئاوا ببێتە هۆی ئازارم؟»

ئیوان فیۆدۆرۆویچ لەم دواییانەدا زۆر لە دەست ئەو پیاوە وەڕەز بوو، بەتایبەت لەم چەن ڕۆژەی ڕابردوودا. تەنانەت هەستی بەوە کرد ڕقێکی گەورە سەبارەت بەو بوونەوەرە نارەسەنە لە ناخیدا ڕیشاژۆ دەکا. ئەو ڕقەش ئەم ڕاستەقینەی لە کاتێکدا ژیاندەوە کە ئیوان فیۆدۆرۆویچ گەیشتە ئەو شوێنەی هەستی بە شتێکی تەواو جیاواز کرد. ئەو کاتە هۆگرییەکی تایبەتی بە ئیسمیر دیاکۆف هەبوو، تەنانەت پێشیوابوو مرۆڤێکی زۆر خاوەن فەرهەنگ و ڕەسەنە. هانی دابوو قسەی لەگەڵدا بکا، ئەگەرچی بەردەوام سەری لە ئاڵۆزی و بێئۆقرەیی زەینی خۆی سوڕمابوو. تێنەدەگەیشت ئەمە چییە ئاوا بەردەوام پێداگری لەسەر زەینی دەکا. ئەوان سەبارەت بە پەرسڤگەلی فەلسەفی مشتومڕیان دەکرد و تەنانەت سەبارەت بە خۆر و مانگ و ئەستێرەکان کە ڕۆژی چوارەم خولقێندران.

ڕووناکی لە ڕۆژی یەکەمدا چۆن بووە و دەبێ چۆنی تێبگەی؟ بەڵام ئیوان فیۆدۆرۆویچ زۆر زوو تێگەیشت، ئەگەرچی خۆر و مانگ و ئەستێرەکان دەتوانێ مەبەستێکی سەرنجڕاکێش بێ، بەڵام بۆ ئیسمیر دیاکۆف گرینگ شتێکی دیکە بوو و تەواو لەوە جیاواز بوو. بە هەموو شێوەیەک دەستیکرد بە خۆنواندن و بافیش، ئەویش بادیهەوا بوونێکی بێبنەما. ئیوان فیۆدۆرۆویچیش زۆری ئەوە پێناخۆش بوو. یەکەم شت کە بووە هۆی جاڕزبوونی هەر ئەوە بوو. دوای ئەوە گیروگرفتی دیکەش لە ماڵێدا ڕوویدا. گرووشنکاش هاتبووە کایەوە و سەبارەت بەو کارە قۆڕ و پڕ شوورەییەی دیمیتریی براشی دەدوان. بەڵام هەرکاتێک ئیسمیر دیاکۆف بە تین و تاوەوە باسی ئەو مەبەستەی دەکرد، مەحاڵ بوو کەسێک تێبگا مەبەستی لەو قسانە

چییە. ڕاستییەکەشی ئەوە بوو بێمەنتقی و پسپس بوونی هێندێ لە ئاواتەکانی کە بە هەڵکەوت دەریدەبڕین و بەردەوام بە شێوەیەکی تەمومژاوی قسەی دەکرد، شتێکی سەرسوڕهێنەر بوو. ئیسمیر دیاکۆف بەردەوام خەریکی تاقیکاری بوو. پرسیاری ناڕاستەوخۆی دەکرد کە دیاربوو لە پێشدا بیری لێنەکردۆتەوە، مەبەستی خۆشی سەبارەت بەوکارە باس نەدەکرد و زۆرجار لە هەستیارترین ساتدا لە قسە دەکەوت و متەقی نەدەکرد، یان قسەکەی دەگۆڕی. بەڵام ئەوەی لە هەموو شتێک زیاتر ئیوان فیۆدۆرۆویچی قەڵس کردبوو و ئیسمیر دیاکۆفی زیاتر لەبەر چاوی ڕەشدەکرد، ئەو خۆمانە خۆ نواندنەی بوو. نەک ئەوەی بارودۆخەکە لەبەر چاو نەگرێ و بێئەدەبی بکا؛ بەپێچەوانە، بەردەوام بەوپەڕی ڕێزەوە قسەیدەکرد. بەوحاڵەشەوە لەبیری ئەوەدابوو کە ـ خودا دەزانێ بۆ؟ ـ جۆرێ لێک حاڵی بوون لە نێوان خۆی و ئیوان فیۆدۆرۆویچدا هەیە. بەردەوام بە لەبزێ قسەیدەکرد کە نیشاندەری ئەوە بوو بەڵێنییەکیان لە نێواندا هەیە، ڕازێکیان لە نێواندایە کە سەردەمێک هەردوولا دانیان پیانابوو، تەنیا ئەوان تێیدەگەن و دەوروبەرییەکان سەریان لێی دەرنەدەچوو. بەڵام ئیوان فیۆدۆرۆویچ ماوەیەکی درێژخایەن ئاگاداری ئەو ڕاستییە نەبوو کە بۆچی ئاوا ڕق و بێزاری مێشک و دڵی تەنیوە، بەڵام لەم داواییانەدا بۆی دەرکەوتبوو لە کوێوە ئاو دەخواتەوە. بە هەستێکی پڕ لە ڕق و تووڕەیی هەوڵیدا، بە بێ ئەوەی لەگەڵ ئیسمیر دیاکۆف بدوێ یان سەرنجی پێبدا، لە دەرگاکە بڕواتە ژووری. بەڵام ئیسمیر دیاکۆف لە سەر خواجەنشینەکە هەستا، هەر بەوەدا ئیوان فیۆدۆرۆویچ لەڕێوە تێگەیشت کە دەیهەوێ لەگەڵی بدوێ. ئیوان چاوێکی لێکرد و ڕاوەستا، بەڵام چونکە بەجێی تێپەڕین، کە چەند سات لەمەوبەر بڕیاریدابوو، ڕاوەستا، بەجارێ وەک شێتی لێهات. بە ڕق و بێزارییەوە چاوی لە ئەدگارە کۆسە و زەرد هەڵگەڕاوەکەی ئیسمیر دیاکۆف و فۆکلە لوولەکەی سەر تەوێڵی بڕی. ئیسمیر دیاکۆف بە چاوی چەپەی چاوێکی لێقرتاند و

گرژییەوە، وەک ئەوەی بڵێ: «دەچی بۆکوێ؟ نابێ لێرەوە تێپەڕی، من و تۆی وریا و پڕ هۆش قسە و باسێکمان لە نێواندا هەیە و دەبێ پێکەوە بدوێین.»

ئیوان فیۆدۆرۆویچ لەرز دایگرت: «دوورەکەوە لێم، چەپەڵ، گەلحۆ من کارم بە تۆ نییە.» لە سەر زمانی بوو، بەڵام بەوپەڕی واقوڕمانەوە دەنگی خۆی بیست کە دەڵێ: «باوکم هێشتا هەر خەوتووە یان لە خەو هەستاوە؟»

ئەم پرسیارەی لەسەرەخۆ و سەبوورانە پرسی و خێرا، دیسان بەوپەڕی سەرسووڕمانەوە لە سەر خواجەنشینەکە دانیشت. بۆ تاوێک خورپە کەوتە دڵی؛ ئەوەشی دواتر وەبیر هاتەوە. ئیسمیر دیاکۆف دەستی نابووە پشتی و هەر لەو کاتەدا بە متمانە و تاڕادەیەک تووڕەیییەوە چاوی لە چاوی بڕی و لە هەمبەریا ڕاوەستا.

بە ئانقەست و تەشەرەوە گوتی: «حەزرەتیان هێشتا خەریکی لالەخەوە.» (وەک ئەوەی بڵێ: «یەکەم کەس تۆ بووی قسەتکرد، نەک من.»). دوای تاوێک، درێژەی دایە: «قوربان، سەرم لە ئێوە سووڕماوە، « چاویشی بە ناز و دەمارەوە لە عەرزی بڕی و لاقی ڕاستەی هێنایە پێشێ و نووکی جزمە بریقەدارەکەی هێور هێور لە زەوی دەکوتا.

ئیوان بە ئەوپەڕی تواناییەوە هەوڵیدەدا، دان بەخۆیدا بگرێ، بە تووڕەیی گوڕاندی: «بۆ سەرت لە من سووڕماوە؟» هەر لە پڕیش، بێزارانە تێگەیشت هەست بە کونچکاوییەکی سەیر دەکا و بەبێ ئەوەی قانع بێ، ناتوانێ لەوێ بڕوا. ئیسمیر دیاکۆف لە ناکاو سەری هەڵێنا و بە بزەیەکی خۆمانەوە گوتی: «قوربان، بۆ ناچی بۆ چێرماشینیا؟» چاوی چەپەی هەڵگێڕابۆوە و دەتگوت دەڵێ: «ئەگەر مرۆڤێکی وریا بی دەزانی بۆ پێدەکەنم.»

ئیوان بە سەرسوڕمانەوە پرسیی: «بۆ بچم بۆ چێرماشنیا؟»

ئیسمیر دیاکۆف دیسان بێدەنگ بوو.

پاشان بە ئارامی و ڕواڵەتەن بە گرینگ نەزانینی وەڵامەکە گوتی: «قوربان، فیۆدۆر پاولۆویچ خۆی ئەو داواکارییەی لە ئێوە بوو.» دەتگوت بە ئاماژە دەڵێ: «لەبەر هۆیەکی دیکە ماتڵت دەکەم، بۆ ئەوەی شتێکم کوتبێ.»

ئیوان فیۆدۆرۆویچ، لەوە زیاتر خۆی پێڕانەگیرا و هەڵبوو، ئاخری بە تووڕەییەوە هاواریکرد: «نەگبەتی. پێمبڵێ بزانم چت دەوێ؟!»

ئیوان فیۆدۆرۆویچ لاقی ڕاستەی کێشایە دواوە و خۆی ئەمبارەوبار کرد، بەڵام هەر بەو لەسەرەخۆیی و نەرمە بزەیەوە چاوی تێبڕی.

ـ گرینگ نییە قوربان ـ تەنیا لەبەر خاتری دەمەتەقێ.

هەر دووکیان بێدەنگ بوون. نزیکەی خولەکێک هیچیان متەقیان نەکرد.

ئیوان فیۆدۆرۆویچ دەیزانی دەبێ هەستێ و خۆی تووڕە بکا. ئیسمیر دیاکۆفیش لە هەمبەریا ڕاوەستابوو و دەتگوت چاوەڕوانە بزانێ تووڕە دەبێ یان نا. لانیکەم ئیوان فیۆدۆرۆویچ وای هەستدەکرد. ئاخری بەقەستی هەستان تەکانێکی لە خۆی دا.

ئیسمیر دیاکۆف بە دەرفەتی زانی و بە ڕاشکاوی گوتی: «ئیوان فیۆدۆرۆویچ کەوتوومە بارودۆخێکی دژوارەوە. نازانم چبکەم.» لەگەڵ دوایین قسەی هەناسەیەکی هەڵکێشا، ئیوان فیۆدۆرۆویچ دیسان دانیشتەوە.

ئیسمیر دیاکۆف لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: «هەردووکیان دلووکارن قوربان. لە منداڵ خراپترن. مەبەستم باوکت و دیمیتری فیۆدۆرۆویچی براتە. فیۆدۆرپاولۆویچ هەر لە خەو هەڵدەستێ دەستدەکا بە پرتەوبۆڵە و کونەجەرگی کردووم. لە پەستا لێم دەپرسێ: «گرووشنکا هاتووە؟ ئەی بۆ نایەت؟» هەروا هەتا نیوەشەو و دوای نیوەشەویش ئەوە کاریەتی. ئەگەر ئاگرافنا ئەلکساندر فنا نەیەت (کە زۆر وێدەچێ قەستی هاتنی نەبێ)، سبەینێ بەیانی دیسان دەستدەکاتەوە بە بۆڵەبۆڵ: «بۆ نەهات؟ کەنگێ دێ؟» ـ هەر دەڵێی خەتای منە. لەوەش خراپتر قوربان، لەگەڵ هەوا تاریک بوون، تەنانەت زووتریش دیمیتریی برات بە تفەنگەوە لێمان پەیدا دەبێ: «جوان گوێ بگرە بۆرە پیاوی خوێڕی، گەمژەی چڵپەخۆر. ئەگەر وریا نەبی و پێمنەڵێی هاتووە، بەر لە هەموو کەسێک تۆ دەکوژم.» کاتێک ڕۆژ دەبێتەوە ئەویش وەک باوکت کونەجەرگم دەکا. «بۆ نەهاتووە؟ بەم زووانە دێ؟» ئەویش پێیوایە خەتای منە خاتوونەکەی نەهاتووە، ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژیش قەڵس و ئاڵەتیتر

دەبێ. کارێکی کردووە لەوانەیە لە ترسانا ڕۆژێک خۆم بکوژم، قوربان. متمانەم بە هیچیان نییە قوربان.»

ئیوان فیۆدۆرۆویچ بە ڕقهەستاوی گوتی: «ئاخر تۆ بۆ خۆتی تێهەڵدەقوتێنی؟ خەریکی سیخوڕی بۆ دیمیتری دەکەی، خوێڕی؟

ـ هیچ ڕێیەکی دیکەم نییە قوربان. ئەگەرچی لە ڕاستیدا خۆشیان تێهەڵناقوتێنم. بڕوام پێبکە. سەرەتا لەبزم نەدەگەڕا و نەمدەوێرا وەڵام بدەمەوە؛ بەڵام بە زۆری لێمی دەوێ نۆکەرێکی وەک لیچاردا[25] بم بۆی. لەوکاتەشەوە بەردەوام هەڕەشە و گوڕەشەم لێدەکا: «گەمژەی هیچوپووچ، وریا نەبی و هەواڵی هاتنەکەیم پێنەدەی، دەتکوژم.» قوربان لێم ڕوونە سبەینێ تووشی گەشکەیەکی دوور و درێژ دەبم.

ـ مەبەستت لە «گەشکەی دوور و درێژ» چییە؟

ـ گەشکەی دوور و درێژ، ماوەیەکی زۆر دەخایەنێ قوربان ـ چەند سەعات، یان ڕەنگە یەک دوو ڕۆژ قوربان. جارێکیان سێ ڕۆژی خایاند. ئەو کاتە لە وەتاغی ژێر هەورەبانەکە کەوتمە خوارێ، بۆ چەند چرکەیەک چاک دەبووم و دیسان واملێدەهاتەوە. هەتا سێ ڕۆژ نەمتوانی بە تەواوی وەهۆش بێمەوە. فیۆدۆرپاولۆویچ ناردی بە شوێن هیرتێز نستیۆبدا، کە پزیشکی ئەم ناوچەیە. ئەویش سەهۆڵی لە سەر سەرم دانا و دەرمانێکی دیکەشی بۆ نووسیم.... هەموو پێیان وا بوو دەمرم.

ئیوان فیۆدۆرۆویچ گوتی: «بەڵام دەڵێن هیچکەس نازانێ کەنگێ سەرودڵی لێدێ.» پاشان بە کونچکاوییەکی تایبەت و تووڕەییەوە پرسیی: «چی دەبێتە هۆی ئەوەی بڵێی سبەینێ تووشی سەرودڵ دەبی؟»

ـ خاڵی سەرەکی ئەوەیە. پێشبینی ناکرێ قوربان.

ـ جگە لەوەش، ئەو کاتە لە وەتاغی ژێر هەورەبان کەوتییە خوارێ.

ـ هەموو ڕۆژێ دەچم بۆ وەتاغی ژێر هەورەبانەکە. لەوانەیە سبەینێ دیسان لەوێوە بکەومە خوارێ. ئەگەر لەوێشەوە نەکەومە خوارێ، لە پلیکانی

25– ناوی نۆکەرێکە لە «چیرۆکی بووادا دەبێتە هۆی کوژرانی ئەربابەکەی

ئەمبارەکەوە دەکەومە خوارێ قوربان. چونکە هەموو ڕۆژێک دەبێ بچمە ئەمبارەکەش قوربان.

ئیوان فیۆدۆرۆویچ چاوی تیبڕی و بە مۆڕەیەکەوە گوتی: «دەزانم خەریکی قسەی قۆڕ دەکەی و لەو وڕێنانەشت تێناگەم. مەبەستت ئەوەیە دەتهەوێ لە سبەینێوە بۆ ماوەی سێ ڕۆژ خۆت نەخۆش بخەی، ها؟»

ئیسمیر دیاکۆف کە دیسان سەری داخستبوو و پەنجەی لاقی ڕاستەی لە زەوی دەکوتا. لاقی ڕاستەی نووشتاندەوە و لاقی چەپەی هێنایە پێشێ و بە چزەبزەیەکەوە گوتی:

ـ ئەگەر بمتوانیبایە ئەو فێڵە بکەم، یانی وا بنوێنم خەریکە گەشکەم لێدێ ـ ئەوەش بۆ کەسێک کە خووی بە فێ و گەشگەوە گرتووە، دژوار نییە ـ هەقی تەواویشم بەدەستە کە بۆ ڕزگار کردنی گیانم پەنا بۆ فێڵێکی وا بەرم، قوربان. چونکە ئەگەر تەنانەت ئاگرافنا ئەلکساندرفناش، کاتێک کە نەخۆشم، بێ بۆ ژوانی باوکتان، ئەو حەزرەتە نەخۆشێک سەرکۆنە ناکا، چونکە هەواڵی پێنەداوە. لەوانەیە هەر لەڕووشی هەڵنەیەت.

ئیوان فیۆدۆرۆویچ کە لەبەر توورەیی پەڕەی لووتی دەلەرزی، گوڕاندی: «گیانت داوەشێ، بۆ ئەوەندە دەترسی؟ تەواوی قسەکانی دیمیتری هەڕەشەیەکی عەجوولانەیە و ئەو کارە ناکا. دڵنیابە تۆ ناکوژێ، ئەگەر کەسێکیش بکوژێ، ئەو کەسە تۆ نیت!»

ـ لە پێش هەموو کەسێکدا قوربان، وەک مێشوولە دەمکوژێ. ئەوەش هیچ، دەترسم پێی زیاتر داکێشێ و بەڵایەک بە سەر باوکت بێنێ، منیش بە تاوانی هاودەستی لەگەڵی قۆڵبەست بکەن.

ـ تۆ بۆ بەو تاوانە دەگرن؟

ـ پێیان وادەبێ لەگەڵی هاودەستم. چونکە وەک ڕازێکی گەورە لە عەلامەتەکان ئاگادارم کردەوە، قوربان.

ـ کام عەلامەت؟ بە کێت گوت؟ دێزەی خوێڕی ڕوونتر بیڵێ بزانم.

ئیسمیر دیاکۆف بە قەڵافەتێکی دەمارگرانەوە گوتی: «ناچارم دان بە ڕاستییەکدا بنێم کە لەم کارەدا لەگەڵ فیۆدۆرپاولۆویچ ڕازێکمان لە نێواندایە. هەر وەک خۆشت دەزانی (هەڵبەت ئەگەر بزانی) لە چەند ڕۆژی ڕابردوودا لەگەڵ تاریک بوونی هەوا درگاکە لە سەر خۆی دەداخا. تۆ بەینێکە سەر لە ئێوارە دەچییە وەتاغی نهۆمی سەرێ و دوێنێ هەر نەهاتییە خوارێ قوربان. کەوایە ڕەنگە بزانی چۆن بە وردبینییەوە دەرگاکە لە سەر خۆی دادەخا و تەنانەت ئەگەر گریگۆری واسیلیەویچیش بێتە بەر دەرگاکە، هەتا دەنگی نەناسێ درگاکە ناکاتەوە. بەڵام گریگۆری واسیلیەویچ بە دەنگییەوە نایەت، چونکە ئێستا تەنیا هەر منم لە وەتاغەکەیدا خزمەتی پێدەکەم قوربان. لەو کاتەوە قرە و هەرای لە سەر ئاگرافنا ئەلکساندرفنا هەڵاییساندووە ئەو ئەرکەی پێسپاردووم. بەڵام شەوانە، بە فەرمانی خۆی دەچم بۆ وەتاغی خزمەتکاران و نابێ بخەوم، بەڵکو دەبێ لە حەوشە کێشک بدێرم و پیاسە بکەم و چاوەڕوانی هاتنی ئاگرافنا ئەلکساندرفنا بم. لەم چەن ڕۆژەی پێشوودا چاوەڕوانی بەجارێ ئۆقرەی لێبڕیبوو. ئەو پێیوایە ئەو خاتوونە لە دیمیتری فیۆدۆرۆویچ (یان خۆی گوتەنی میتکا)، دەترسێ قوربان. «هەر بۆیە» خۆی گوتەنی «شەودرەنگان لە دەرگای پشتەوە دێ بۆلام.» دەڵێ: «هەتا نیوەشەو و درەنگتریش چاوەڕوان بە. ئەگەر هات، بە هەڵاتن وەرە و ئاگادارم بکە. یان لە نێو باخەکەوە لە پەنجێرەکە بدە. سەرەتا بە ئەسپایی دوو جاری لێدە، ئاوا، یەک، دوو، پاشان سێ جار توندتر، تەق، تەق، تەق، ئەو کاتە خێرا تێدەگەم کە ئەو هاتووە و خێرا درگاکە دەکەمەوە.» شتێکی دیکەی فێرکردووم بۆ کاتی قەومانی ڕووداوی چاوەڕواننەکراو. سەرەتا دوو زەبری توند و خێرا یەک، دوو، پاشان زەبرێکی زۆر توند. ئەو کاتە تێدەگا کە ڕووداوێکی لە ناکاو قەوماوە و دەبێ چاوم پێبکەوێ. درگاکەم بۆ دەکاتەوە تاکو بچمە ژوورێ و لەگەڵی بدوێم. ئەوەش بۆ کاتێکە کە ئاگرافنا ئەلکساندرفنا خۆی ناتوانێ بێت و هەواڵێکی ناردووە. جگە لەوەش لەوانەیە دیمیتری فیۆدۆرۆویچ بێت، هەر بۆیە دەبێ ئاگاداری بکەم کە دیمیتری هاتووە. ئەو حەزرەتە زۆر لە دیمیتری

فیۆدۆرۆویچ دەترسێ. بەجۆرێک کە تەنانەت ئەگەر ئاگرافنا ئەلکساندرفناش لە پاڵیدا بێ و دەرگایان گاڵە دابێ. کاتێک سەروکەللەی دیمیتری فیۆدۆرۆویچ پەیدا دەبێ، لەسەرمە خێرا ئاگاداری بکەم و سێجار لە درگاکە بدەم. بەم شێوەیە، یەکەم نیشانەی پێنج زەربەی بەومانایەیە، کە ئاگرافنا ئەلکساندرفنا هاتووە. دووهەمین نیشانەی سێ زەربە بەمانایەیە کە: «هەواڵێکی گرینگم پێیە بۆتان.» ئەو حەزرەتە چەندین جار ئەوەی پیشانداوم و بۆی باس کردووم. چونکە جگە لە من و خۆی هیچ عیبادولبەشەرێک ئەو ڕەمزە نازانێ قوربان. هەر بۆیە بەبێگومان و دوودڵی دەرگاکە دەکاتەوە (زۆر لە بانگ کردنی بە دەنگی بەرز دەترسێ). بەڵام ئێستا دیمیتری فیۆدۆرۆویچیش ئەو ڕەمزە دەزانێ.»

- چووزانێ؟ تۆ پێتگوتووە؟ چۆن توانیت پێیبڵێی؟

ـ لە ترسانا قوربان. بۆ دەمویرا بیشارمەوە و پێی نەڵێم؟ دیمیتری فیۆدۆرۆویچ هەموو ڕۆژێ پێداگریی دەکرد کە: «خەریکی هەڵمدەفریوێنی، دەتهەوێ شتێکم لێبشاریتەوە؟ چاوت دەردێنم.» هەر بۆیە لە ترسانا ئەو ڕەمزانەم پێگوت، بۆ ئەوەی وەفاداریی نۆکەر ئاسابیم ببینێ و بزانێ فێڵ و تەڵەکە لە کارمدا نییە و ئەوەی دەیزانم پێمگوتووە.

- ئەگەر پێتوایە لەو ڕەمزانە کەڵک وەردەگرێ و هەوڵدەدا بێتە ژووری پێشی پێبگرە.

ـ بەڵام ئەگەر سەرودڵم لێبێ، چۆن دەتوانم بەرگریی لێبکەم، قوربان. تەنانەت ئەگەر بزانم تا چ ڕادەیەک هیوابڕاوە و عەجمانی لێ هەڵگیراوە، ناوێرم بەرگری لە هاتنە ژوورەوەی بکەم.

ـ گیانت داوەشێ، چۆن ئەوەندە دڵنیای کە سەرودڵت لێدێ؟ بە شێتم دەزانی؟

- چۆن دەوێرم ئێوە بە شێت بزانم قوربان. من بەو هەموو ترسەوە کە دڵی داگرتووم تاقەتی هیچم نییە. هەست دەکەم فێم لێدێ. لە دڵم چەقیوە. هەر ئەو ترسەش واملێدەکا.

ـ دەک دارزێی! ئەگەر فیت لێبێ، گریگۆری کێشک دەدێرێ. لە پێشدا گریگۆری لەو ڕووداوە ئاگادار بکە، دڵنیابە ئیزنی پێنادا بێتە ژووری.

ـ بەبێ فەرمانی باوکت، ناوێرم ئەو ڕەمزانە بە گریگۆری واسیلیەویچ بڵێم. بەڵام ئەگەر پێتوایە گریگۆری واسیلیەویچ گوێی لە ترپەی پێی دەبێ و بەرگری لە هاتنە ژوورەوەی دەکا، دەبێ پێتبڵێم گریگۆری لە دوێنێوە نەخۆشکەوتووە و مارتا ئیگناتیفنا دەیهەوێ سبەینێ دەوا و دەرمانی بۆ ساز کات و بیداتێ. ئەوەش شێوەیەکی ماریجە کردن بوو کە خۆیان بە باشیان دەزانی. مارتا ئیگنا تیفنا ئاوێتەیەکی لە گوڵ و ڕەگی گیا و گژ هەیە، قوربان، کە زۆر باشە و یەکاویەکە. خۆی لە ڕازی ئەو دەرمانە ئاگادارە و ساڵی سێ جاری دەرخواردی گریگۆری واسیلیەویچ دەدا قوربان، یانی لە کاتێکدا کە پشت ئێشەکە حەجمانی لێدەبڕێ و لە پێی دەخا. لەو کاتەدا مارتا ئیگناتیفنا خاولێیەک لەو دەمکراوەدا دەخووسێنێ و بۆ ماوەی نیو سەعات هێندەی لە پشتی هەڵدەساوێ هەتا سووری هەڵدەگێڕێ و دەماسێ. لە کۆتاییشدا پاشماوەکەی دۆعایەکی بەسەردا دەخوێنێ و دەرخواردی دەدا، قوربان. هەمووی نا، لەو کاتانەدا بڕێکیشی بۆ خۆی گل دەداتەوە و دەیخوا چونکە هیچکامیان ئارەق و شەڕاب ناخۆنەوە قوربان، هەر خێرا خەویان لێدەکەوێ و هەتا ماوەیەکی زۆر وەخەبەر نایەن. کاتێکیش گریگۆری واسیلیەویچ لە خەو هەڵدەستێ، دەرد و عەلەمی لێدەبڕێ، بەڵام مارتا ئیگناتیفنا تووشی ژانەسەر دەبێ قوربان. هەر بۆیە ئەگەر مارتا ئیگناتیفنا سبەینێ ئەو تیمارکارییە بکا، گوێیان لە هیچ نابێ و بە جووت خەویان لێدەکەوێ و ناتوانن بەرگری لە دیمیتری فیۆدۆرۆویچ بکەن، قوربان.

ئیوان فیۆدۆرۆویچ گوڕاندی: «ئەو قۆڕیاتە چییە؟ وادیارە هەموو شتێک بە پێی پیلان دەڕواتە پێشێ، تۆ سەرودڵت لێدێ، و ئەوان بێهۆش دەبن.» لە ناکاو لە دەمی دەرپەڕی: «هەوڵدەدەی ئاوا پلانەکەت جێبەجێ بکەی؟» بە شێوەیەکی تووڕە و تۆقێنەر ناوچاوی تێکنا.

- چۆن دەتوانم قوربان؟.... ئەویش لە شوێنێک کە هەموو شتێک پێوەندیی بە پلانەکانی دیمیتری فیۆدۆرۆویچەوە هەیە؟ بۆ کاری وابکەم؟... ئەگەر بیهەوێ کارێک بکا، هەر دەیکا؛ ئەگەر نەشیهەوێ بیکا، خۆ من نایبەم بیدەم بە سەر باوکیدا.

ئیوان فیۆدۆرۆویچ، هێندەی ڕق هەستابوو چەقۆت لێدایە خوێنی نەدەهات، لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: «جا بۆ بچێ بۆلای باوکم؟ ئەویش بە نهێنی. ئەگەر خۆت گوتەنی، ئاگرافنا ئەلکساندرفنا هەر نەیەت چی؟ خۆشت ئەوە دەزانی و لەو ڕۆژەوە هاتوومەوە بۆ ئێرە، بۆم ڕوون بۆتەوە کە هەمووی خەیاڵپڵاوی پیرەپیاوە و ئەو ژنە هیچکات نایەت بۆلای. ئەگەر ئەو نەیەت ئیتر دیمیتری خۆ شێت نەبووە شاڵاو بۆ باوکم بەرێ و پێیدا هەڵپڕژێتەوە؟ پێمبڵێ بزانم ڕای تۆ چییە!»

- خۆت باشتر دەزانی دیمیتری فیۆدۆرۆویچ بۆ دێت بۆ ئێرە قوربان. ئیتر ڕای منت بۆچییە؟ ئەو کاکەی تۆ تەنیا لەبەر ئەوە دێ، ڕقی هەستاوە و دەیهەوێ داخی دڵی خۆی بڕێژێ. یان، ڕەنگە ئەو نەخۆشییەی من تووشی دڕدۆنگیی کردبێ و وەک دوێنێ بە هەڵەداوان بێت و ژوورەکان بگەڕێ و بۆی ڕوون بێتەوە گرووشنکا بەدزییەوە دەرباز بووە یان نا. ئەوەش بە باشی دەزانێ کە فیۆدۆرپاولۆویچ پاکەتێکی گەورەی هەیە سێهەزار ڕۆبڵی پارە تێدایە و بە تیلماسکێکی پەمەیی بەستوویە، سێ مۆری لێداوە و بە خەتی خۆی نووسیویەتی: «بۆ فریشتەکەم گرووشنکا، ئەگەر بێت.» سێ ڕۆژ دواتریش ئەمەی پێزیاد کرد: «بۆ مەلووچکە جوانەکەم.» ئەو کاری ئاوا دەکا قوربان.

ئیوان فیۆدۆرۆویچ تا ڕادەیەک حەپەسا بوو: «قسەی قۆڕ دەکەی! خۆ دیمیتری نایە بۆ دزینی پارە و لەبەر پارە باوکم ناکوژێ. ئەو شێت و گەوج و وەحشییە ڕەنگبوو دوێنێ بەخاتری گرووشنکا بیکوژێ، بەڵام دزی ناکا.»

ئیسمیر دیاکۆف خوێنساردانە و بەڕاشکاوی گوتی: «ئێستا بەجارێ بۆ پارە پەکی کەوتووە و زۆری پێویستە. تۆ نازانی چەندەی پارە پێویستە و

خۆی بۆ بە ئاو و ئاوردا دەدا. لە لایەکیشەوە ئەو سێ هەزار ڕۆبڵە بە پارەی خۆی دەزانێ. خۆی ئەوەی بە من کوت: «باوکم هێشتا سێ‌هەزار ڕۆبڵ بە من قەرزدارە» جگە لەوەش، شتێکی دیکەش لە نێواندایە قوربان. یانی زۆر وێدەچێ ئاگرافنا ئەلکساندرفنا مەیلی لێبێ، ئەو هاندا زەماوەندی لەگەڵ بکا - مەبەستم ئەرباب فیۆدۆر پاولۆویچە قوربان - یانی ببێتە خاتوونی ئەم ماڵە قوربان. خۆم دەزانم سامسانۆف، ئەو بازرگانەی پارێزەری، سەبارەت بەو مەبەستە بە دەمییەوە پێدەکەنی و بە ڕاشکاوی پێیدەگوت ئەو کارە زۆر کارێکی باشە و بە هیچ شێوەیەک گەوجانە نییە. هەر ژنێک تۆزێک ئەقڵی هەبێ، نابێتە ژنی سرۆسوالکەرێکی وەک دیمیتری فیۆدۆرۆویچ. کەوایە بەوپێیە، ئیوان فیۆدۆرۆویچ بێهێنە بەرچاوی خۆت ئەو کاتە نە دیمیتری فیۆدۆرۆویچ، نە ئێوە و نە ئالکسی فیۆدۆرۆویچ، لەپاش مەرگی بابت تەنانەت ڕۆبڵێکتان میرات پێنابڕێ. چونکە ئاگرافنا ئەلکساندرفنا تەنیا لەبەر ئەوە شووی پێکردووە کە دەست بە سەر هەموو ماڵ و سامانەکەیدا بگرێ. بەڵام ئەگەر باوکتان ئێستا بمرێ، حەتمەن چلهەزار ڕۆبڵی لەپاش بەجێ دەمێنێ. تەنانەت میرات بۆ دیمیتری فیۆدۆرۆویچیش بەجێ دەهێڵێ، ئەگەرچی ئەو هەمووەی ڕقلێیەتی. چونکە وەسیەتنامەی نەنووسیوە... دیمیتری فیۆدۆرۆویچ بە باشی لەوە ئاگادارە.»

ئیوان فیۆدۆرۆویچ لێوی خۆی گەست و ڕەنگی بزرکا و پەڕییە نێو قسەکانی ئێسمیر دیاکۆف: «کەوایە بۆ پێشنیارم پێدەکەی بچم بۆ چێرماشنیا؟ مەبەستت لەوە چییە؟ ئەگەر لێرە بڕۆم دەزانی چی ڕوو دەدا؟» ئیوان فیۆدۆرۆویچ هەناسەیەکی توندی هەڵکێشا.

ئێسمیر دیاکۆف ماقووڵانە و بە هێمنی گوتی: «ڕاست وایە قوربان.» بەڵام بە وردی چاوی لە ئیوان فیۆدۆرۆویچ بڕی و خستییە ژێر چاوەدێری.

ئیوان فیۆدۆرۆویچ خوێن بەری چاوی گرتبوو، بەڵام دانی بە خۆیدا گرت و وەڵامی دایەوە: «مەبەستت لە ڕاست وایە، چییە؟»

ئیسمیر دیاکۆف بە شێوەیەکی زۆر سادقانە چاوی لە چاوە ڕقتێزاوەکانی ئیوان فیۆدۆرۆویچ بڕی و وەڵامی دایەوە: «بۆیە قسەمکرد چونکە بۆتان بەداخەوەم. ئەگەر بەجێی ئێوە بوایەم دەستم لە هەموو شتێک هەڵدەگرت... بۆ ئەوەی تووشی بارودۆخێکی وابم، قوربان.» هەردووکیان بێدەنگ بوون.

«دیارە مرۆڤێکی زۆر گەمژەی و جگە لەوەش... خوێڕی و هیچوپووچی.»

ئیوان فیۆدۆرۆویچ لەپڕ لە سەر خواجەنشینەکە هەستا. دەیویست ڕاست لە دەرگای باخەکە بڕواتە ژووریٚ، بەڵام لەپڕ ڕاوەستا و بۆلای ئیسمیر دیاکۆف وەڕسووڕا. شتێکی سەیر ڕوویدا. ئیوان فیۆدۆرۆویچ سوور هەڵگەڕا و لێوی خۆی گەست و هەردوو مستی قووچاند و هێندەی نەمابوو بە مست لە ئیسمیر دیاکۆف بەربیٚ. بەڵام ئیسمیر دیاکۆف تیٚگەیشت، لەپڕ داچڵەکی و کشا دواوە. بەڵام ئەو ساتە بەبیٚ هیچ کوتانخواردنێک ئیسمیر دیاکۆف نەجاتی بوو. ئیوان فیۆدۆرۆویچیش بەبێدەنگی و شڵەژاوی بەرەو درگاکە ملی پێوەنا.

لەناکاو بە دەنگێکی بەرز و ڕاشکاوانە گوتی: «سبەینیٚ دەمهەویٚ بچم بۆ مۆسکۆ، ئەگەر دەتهەویٚ بزانی - سبەینیٚ زوو. تێگەیشتی؟!» خۆشی پاشان سەری سووڕما کە وتنی ئەو قسەیە بە ئیسمیر دیاکۆف چ پێویستییەکی دەکرد.

ئیسمیر دیاکۆف، کە لەوە دەچوو چاوەڕوانی بیستنی ئەو قسەیە بیٚ وەڵامی دایەوە: «زۆر کاری چاکە قوربان. چونکە ئەگەر لێرش شتێک بقەومیٚ پیاو دەتوانیٚ برووسکەت بۆ بنێریٚ بۆ مۆسکۆ قوربان.»

ئیوان دیسان لەجێیخۆی ڕاوەستا و بەپەلە بەرەولای ئیسمیر دیاکۆف وەڕسووڕا. بەڵام گۆڕانێکیشی بەسەردا هاتبوو. هیچ حاڵەتێکی ئاشنایی و گویٚ پێنەدان بە تەواوی بە ڕوخسارییەوە نەمابوو. سەرنج و چاوەڕوانی بە ئەدگارییەوە دیاربوو. بە وردی، بەڵام بە شێوەیەکی شاراوە و پڕ پاڕانەوە.

دەکرا لەو چاوانەیدا کە لە ئیوان فیۆدۆرۆویچی بڕیبوو بخوێنییەوە کە: «ناتەویٚ هیچی دیکە بڵێی؟»

ئیوان فیۆدۆرۆویچ، کە لەبەر هۆیەکی نادیار دەنگی هەڵێنابوو، لە ناکاو نەڕاندی: «بۆ ناکرێ برووسکەم بۆ بنێرن بۆ چێرماشنیا ـ ئەگەر ڕووداوێک بقەومێ؟»

ئیسمیر دیاکۆف بە حاڵەتێکی بێلایەنانەوە، بەڵام ڕاست چاوی لە چاوی ئیوان فیۆدۆرۆویچ بڕیبوو. بە نەرمی ورتاندی: «با دەکرێ بۆ چێرماشنیاشی بنێرین قوربان.»

ـ بەڵام مۆسکۆ لە چێرماشنیا دوورترە. بۆ ئەوەی خەرجی ڕێگام کەمتر بچێ، یان ئەو ڕێگا دوورە نەگوتم، بۆیە پێداگری لە سەر ئەوە دەکەی بچم بۆ چێرماشنیا؟

ئیسمیر دیاکۆف بە دەنگێکی لەرزۆک و لە ژێر لێوییەوە منجاندی: «بەڵێ، ڕاست مەبەستم ئەوەیە قوربان...» پاشان بە بزەیەکی دێزانەوە چاوی لە ئیوان فیۆدۆرۆویچ بڕی و دیسان ویستی پشتاوپشت بکشێتەوە. بەڵام بەوپەڕی سەرسوڕمانەوە ئیوان فیۆدۆرۆویچ دای لە قاقای پێکەنین. کاتێک لە دەرگاکەشەوە تێپەڕی هەروا پێدەکەنی. هەرکەس لەو کاتەدا چاوی پێیبکەوتایە، تێدەگەیشت کە لە دڵەوە پێناکەنێ. خۆشی نەیدەزانی لەو کاتەدا چ هەستێکی هەیە. دەتگوت بە ڕقێکی ئەستوور و شێتانەوە دەڕوات و هەنگاو هەڵدێنێتەوە.

## (٧)

## «وتوویژ لەگەڵ مرۆڤی وریا هەمیشە بەنرخە»

هەر بەو ڕقە شێتانەیەشەوە قسەی دەکرد. هەرکە خۆی بە ژووریدا کرد و چاوی بە فیۆدۆرپاولۆویچ کەوت لە وەتاغی میوانداری، دەستی ڕاوەشاند و گوڕاندی: «دەچمە سەرێ بۆ ژوورەکەی خۆم، نایەم بۆلای تۆ. خوداحافیز!» تێپەڕی و هەوڵیدا چاو لە باوکی نەکا. وێدەچوو لەو کاتەدا پیرەپیاو لەبەر چاوی زۆر تاڵ و دزێو بێ؛ بەڵام پیشاندانی ئەو چەشنە نەیارییە بۆ فیۆدۆرپاولۆویچیش هۆی سەرسووڕمان بوو. دیاربوو پیرەپیاو نایهەوێ هیچی پێبڵێ و بە قەستی بۆ دیتنی ئەو هاتۆتە وەتاغی میوانداری. لەگەڵ ئەوەی ئەو چەشنە چاکوخۆشییەی زۆر پێخۆش بوو، بە بێدەنگی لەجێی خۆی چەقی. چاوێکی تەوساویی لە کوڕەکەی کرد کە بە پلیکانەکاندا وەسەر دەکەوت. هێندەی چاو لێکرد هەتا لەبەر چاوی ون بوو.

خێرا لە ئیسمیر دیاکۆفی پرسیی کە بەدوای ئیوان فیۆدۆرۆویچدا هاتبووە ژووری: «ئەوە بۆ ئاوا دەکا؟»

ئیسمیر دیاکۆف خۆی لەو باسە گێلکرد و لەبنەوە ورتاندی: «چووزانم، ڕەنگە لەبەر هۆیەک ڕقی هەستابێ قوربان!»

- هەردووک چاوی دەرێ! خودای دەکرد دەدرا. سەماوەرەکە بێنە و خێرا بڕۆ. جوان سەرنج بدە و وریا بە! هیچ هەواڵێک نەبوو؟

ئەو کاتە، زنجیرە پرسیارێک بەدوای ئەو بەرسڤەدا هاتە گۆڕێ، هەر لەوجۆرە پرسیارانەی کە چەن سات لەمەوبەر ئیسمیر دیاکۆف لەمەڕ ئەوانەوە سکاڵای کردبوو، هەمووشی سەبارەت بە هاتنی میوان و ژوانەکەی بوو. بۆیە بە سەر ئەو پرسیار و وەڵامانەدا تێدەپەڕین. نیو سەعات دواتر دەرگای ماڵەکەی گاڵەدا و پیرەپیاوی دەلوو، لە سەر هەست چاوەڕوان دانیشت بۆ بیستنی پێنج زەربەی پەنجێرەکە. هەر تاونەتاوێک هەڵدەستا و لە نێو

ژوورەکەدا دەستی دەکرد بە پیاسە کردن. جارناجاریش لە پەنجێرەکەوە چاوی لە تاریکی دەبڕی و هیچی نەدەدی.

زۆر درەنگوەخت بوو. بەڵام ئیوان فیۆدۆرۆویچ هەروا بێدار بوو و بیری دەکردەوە. ئەو شەوە هەتا درەنگانێ، هەتا سەعات دوو، خەوی لێنەکەوت. بەڵام ناچینە سەرباسی بیرۆکەکانی. لێرەشدا جێینییە لە ناخی ئەو ورد ببینەوە ـ نۆبەی ئەوەش دێ. تەنانەت ئەگەر لەو بارەوە هەوڵێکیش بدرایە، شەرحی بیرۆکەکانی زۆر دژوار دەبوو. چونکە بیرۆکەیەکی ئەوتۆ لە زەینیدا نەبوو. بەڵکو شتێکی زۆر شاراوە و پڕ دڵەخورپە زەینی داگرتبوو. خۆی هەستیدەکرد ئۆقرەی لێبڕاوە. هەروەها هەموو چەشنە تاسە و هەوەسێکی سەیر و تاڕادەیەک سەرسوڕ هێنەر بە سەریدا زاڵبوو. بۆ وێنە نیوەشەو، لەپڕ هاتە سەر ئەوەی بڕواتە خوارێ، دەرگاکە بکاتەوە و بچێ بۆ وەتاغی خزمەتکاران و ئیسمیر دیاکۆف خوری‌شۆر بکا. بەڵام ئەگەر بنۆسەکەیان لێ‌بپرسیبایە، نەیدەتوانی دەلیلێکیان بۆ بێنێتەوە؛ مەگین ئەو بەڵگەیە بێنێتەوە کە ئەو هەتیوە بەرەڵڵایە وەک مرۆڤێکی خوێڕی لە هەموو کەس زیاتر لەم دنیایەدا سووکایەتیی پێکردووە و ڕقی لێیەتی. لە لایەکی‌تریشەوە، ئەو شەوە چەند جار ترسێکی سەیر و پڕسووکایەتی بەسەریدا زاڵبوو و هەستیدەکرد بەجارێ مجرۆی کردووە. ژانەسەری کردبوو، سەری لە گێژەوە دەهات و چاوی ڕێشکە و پێشکەی دەکرد. گڕی قینێک لە دڵیدا بڵێسەی دەکێشا. دەتگوت دەیهەوێ تۆڵە لە کەسێک بکاتەوە. تەنانەت لە ئالیووشاش. بە وەبیر هێنانەوەی ئەو وتووێژەی لەگەڵی کردبوو، ڕقی لە ئەویش هەڵدەستا. جاری وابوو لە خۆشی بێزار دەبوو. تاڕادەیەک لەبیری چووبۆوە بیر لە کاترینا ئیوانا بکاتەوە، دواتر سەریشی لەوە سوڕ ما، بەتایبەت کە وەبیری هاتەوە بە شاتوشووتەوە بە کاترینا ئیوانای گوتبوو ڕۆژی دوایی دەچم بۆ مۆسکۆ، لە دڵی خۆشیدا گوتبووی: «قسەی قۆڕ دەکەی، نارۆی، واز هێنانیشت، ئەو جۆرەی فڕوفیشاڵی بۆ دەکەی، سانا نییە.»

ماوەیەک دوای ئەوە، بە وەبیرهێنانەوەی ئەو شەوە، بە شێوەیەکی قێزەونانە وەبیری هاتەوە کە بۆ ئاوا بە نهێنی هەستابوو، دەتگوت ترسی

ئەوەی لە دڵدایە چاویان لێببێ. درگاکەی کردبۆوە و چووبووە سەر پلیکانەکان و گوێی لە ترپەی پێی فیۆدۆرپاولۆویچ بوو کە لە خوارەوە پیاسەی دەکرد، ماوەیەکی درێژیش ـ پێنج دەقیقەیەک ـ لەگەڵ جۆرێک کونچکاویی سەیر و سەمەرە، بە دڵەکوتەوە هەناسەی لە سینگیدا کۆ کردەوە و هەستی ڕاگرت. بۆ واشی کردبوو؟ بۆ گوێی هەڵخستبوو؟ نەیدەزانی بڵێ چی. دوای ئەوە، هەتا کۆتاییی تەمەنی ئەو «کارە»ی بە «شوورەیی» دەزانی و لە دڵەوە بە خوێڕییانەترین کردەوەی ژیانی خۆی لهقەڵەمدەدا. لەو کاتەدا هەستی بە ڕق و تووڕەیی سەبارەت بە باوکیشی نەدەکرد. بەڵام زۆر تامەزرۆ بوو بزانێ لەو خوارەوە چۆن پیاسە دەکات و چی دەکات. پێیوابوو سەری بە پەنجێرەکەوە ناوە و چاوی لە تاریکی بڕیوە و گوێی هەڵخستووە و لە سەر هەست چاوەڕوانە کەسێک لە دەرگاکە بدا. ئیوان فیۆدۆرۆویچ دووجار چووە سەر پلیکانەکان و ئاوا گوێی هەڵخست.

نزیکەی سەعات دوو کە هەموو شتێک ئارام بۆوە و تەنانەت فیۆدۆر پاولۆویچیش لە پێخەفەکەی خزا، ئیوان فیۆدۆرۆویچیش چووە نێو جێگاکەیەوە و بەوخەیاڵەی کە خێرا خەوی لێدەکەوێ، چاوی قووچاند، چونکە زۆری هەست بە شەکەتی دەکرد. لەڕێوە خەوی لێکەوت. چووە خەوێکی خۆش و بێخەونەوە. بەڵام بەیانی زوو سەری سەعات حەوت، کاتێک هەوا تەواو ڕووناک بووبۆوە لە خەو هەستا. کە چاوی هەڵێنا، هەستی بە نەشە و لەشسووکییەکی سەیر کرد و سەرسام بوو. خێرا لە پێخەوەکەی هاتە دەرێ و خۆی پۆشتە کردەوە. پاشان جانتاکەی هێنا و دەستیکرد بە پێچانەوەی کەلوپەلەکانی. بەیانی ڕۆژی پێشوو ژنە جلشۆرەکە جلوبەرگەکانی بۆهێنا بۆوە. ئیوان فیۆدۆرۆویچ کە دەیدی هەموو شتێک لەبار و تەیارە بۆ سەفەرکردنە کتوپڕەکەی، بزەیەکی هاتێ. هەر بەڕاستیش سەفەرەکەی لە ناکاو بوو. ئەگەرچی ئیوان فیۆدۆرۆویچ ڕۆژی پێشوو گوتبووی (بە کاترینا ئیوانا و ئالیووشا و ئیسمیر دیاکۆف) سبەینێ دەڕۆم. وەبیری هاتەوە کاتێ خزا پێخەفەکەیەوە لەبیری سەفەردا نەبوو، یان لانیکەم؛ بە خەونیش نەیدیبوو کە بەیانی یەکەم کاری پیچانەوەی جانتای سەفەر دەبێ. ئاخری بارگەوبنەی

سەفەری پێچایەوە. نزیک سەعات نۆ بوو کە مارتا ئیگنا تیفنا بە پرسیاری هەمیشەییەوە وەژوور کەوت. کە: «لەکوێ چایی مەیل دەفەرموون، لە وەتاغەکەی خۆتان یا لە خوارێ؟» ئیوان فیۆدۆرۆویچ هەتا ڕادەیەک شاد و دڵخۆشی دەنواند. بەڵام قەڵافەتی و قسە و ئاکاری جۆرێک لەز و هەڵەپڕووکێی پێوە دیاربوو. سڵاوێکی گەرمی لە باوکی کرد و چاکوچۆنیشی لەگەڵ کرد، ئەگەرچی چاوەڕوانی وەڵام نەبوو و گوتی هەتا سەعاتێکی دیکە بۆ هەمیشە دەگەڕێتەوە بۆ مۆسکۆ و داوای لە باوکی کرد بنێرێ بە دوای فایتووندا. باوکی ئەو هەواڵەی بیست بێئەوەی سەری سووڕ بمێنێ، بە شێوەیەکی سارد و سڕ و دوور لە ئەدەب، لەبیری نەبوو بۆ ڕۆیشتنی کوڕەکەی خۆی وانیشاندا کە بەداخەوەیە. بەجێی ئەو کارە، یەکێ لە مامەڵەکانی خۆی وەبیر هاتەوە و لە خۆشیانا پێی وەعەرز نەدەکەوت.

ـ تۆ چ بنیادەمێکی دوێنێ بە منت نەگوت! قەیناکا، پێکەوە ڕێکدەکەوین. کوڕە خۆشەویستەکەم، وەرە ئەو خزمەتە بە باوکی خۆت بکە. ئەگەر ڕۆیشتی لە ڕێ سەرێکیش لە چێرماشنیا بدە. زۆر دوور نییە. لە یەختەرمەخانەی ولۆفیاوە بە دەستی چەپدا بای دەدەیەوە و هەشت کیلۆمەتر دەڕۆی دەگەیە چێرماشنیا.

ـ بەداخەوە ناتوانم. هەتا وێستگەی شەمەندەفەر پەنجا کیلۆمەترە و شەمەندەفەری مۆسکۆ ئەمشەو سەعات حەوت وەڕێ دەکەوێ، ئەگەر بتوانم فریای بکەوم.

ـ سبەینێ یان دووسبەی برۆ بۆ ئەوێ، بەڵام پیاوەتی بکە و ئەمڕۆ بچۆ بۆ چێرماشنیا. دڵخۆشکردنی باوکت بەزایە ناچێ! ئەگەر لەبەر کارێک لێرە گیرم نەکردایە زۆر لەمەوبەر خۆم دەچووم. چونکە مامەڵەیەکی گرینگ و بەپەلەم لەوێ بەدەستەوەیە. بەڵام لێرە من... ئێستا کاتی ئەوەم نییە و دەبێ لێرە بم... چاو لێکە، لەوێ دوو پەڵە دارستانم هەیە، لە دوو شوێن هەڵکەوتوون، یەکیان لە «بێگیچۆف»ە و ئەوی دیکەیان لە «دیاچکینۆ»یە، هەروا بەیار ماونەتەوە. بنەماڵەی ماسلۆف، بازرگانێکی پیرە و کوڕەکەی، تەنیا هەشت هەزار ڕۆبڵم دەدەنێ و بۆ تەختە و کاریتەیان دەوێ. بەڵام ساڵی پێشوو کڕیارێکم بوو دوازدە هەزار ڕۆبڵی دەدامێ، بەڵام لە دەستم دەرچوو. خراپییەکەی لەوەدایە

دارستانەکان لەم نزیکانە نین و لێرەش پیاو کەسی وەگیر ناکەوێ پێی بفرۆشێ. بنەماڵەی ماسلۆف جۆرێک تایبەتمەندییان هەیە. پیاو دەبێ ئەوەی دەیدەنێ قەبووڵی بکا، چونکە لێرە هیچکەس ناوێرێ شان لە شانیان بدا و بپەڕێتە نێو مامەڵەکەیانەوە. قەشەیەک لە ئیلیسنکۆیە، پێنج شەممەی ڕابردوو بۆی نووسیبووم: کڕیارێک پەیدا بووە و ناوی گۆرستکینە و بازرگانێکی دەوڵەمەندە و من دەیناسم. باشییەکەی لەوەدایە خەڵکی ئەم دەوروبەرە نییە و خەڵکی پاگریۆبۆفە. هەر بۆیە هیچ باکێکی لە بنەماڵەی ماسلۆف نییە. گوتوویە بۆ کڕینی ئەو دوو پەڵە دارستانە یازدە هەزار ڕۆبڵمان دەداتێ. گوێت لێیە؟ قەشە نووسیویەتی لە حەوتوویەک زیاتر لێرە نابێ، هەر بۆیە دەبێ خێرا بچی مامەڵەکە تەواو بکەی.

ـ دەی، بۆ قەشەکە بنووسە خۆی مامەڵەکەت بۆ بکا.

ـ ناتوانێ ئەو کارە بکا. سەری لە مامەڵە دەرناچێ. زۆر پیاوی چاکە و دەکرێ سەری پێبسپێری، بەڵام لە مامەڵە ناگات. هێندەشم بڕوا پێیەتی دەتوانم بیست هەزار ڕۆبڵی پێبسپێرم بۆم هەڵگرێ و تەنانەت پسوولەشی لێوەرنەگرم. بەڵام وەک منداڵ وایە و قشقەڕەیەکیش دەتوانێ هەڵیفریوێنێ. لەگەڵ ئەوەشدا زۆر پیاوێکی زانا و بیرمەندە، بڕوا دەکەی؟ ئەو گۆرستکینەش وەک پیاوێکی لادێیی وایە و کەپەنکی شین لەبەر دەکا. باسی خووخدەشی مەکە یەکێک لەو پیاوە هیچوپووچانەی ڕۆژگارە. لە دەست درۆ و دەلەسەکانی عالەم وەزاڵە هاتوون و گرفتەکەش ئالێرەدایە. جاری وایە درۆی وادەکا پیاو سەری سوڕ دەمێنێ. پێرارەکە گوتی ژنەکەم مردووە و ژنێکی دیکەم هێناوە، بەڵام بڕوا بکە یەک وشەشی ڕاست نەبوو. ژنەکەی نەمردووە و ئێستاش هەر ماوە، حەوتووی دوو جاریش مێردەکەی خوریشۆر دەکا. بۆیە ئەگەر گوتی دارستانەکان بە یازدە هەزار ڕۆبڵ دەکڕم، دەبێ وریا بی کڵاوت لە سەر نەنێ.

ـ بۆ ئەو مامەڵەیە منیش بەکار نایەم، منیش سەرم لێی دەرناچێ.

ـ تاوێ سەبرکە! لە دەستت دێ، پێتدەڵێم چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ گۆرستکین بکەی. زورم سات و سەودا لەگەڵ کردووە. دەبێ چاو لە ڕیشی بکەی؛ ڕیشێکی پیس و باریک و سووری هەیە. وەختی قسەکردن ئەگەر ڕیشی

بلەرزێ و تووڕە بێ، بارودۆخەکەی بە قازانجە و ڕازی دەبێ مامەڵەکە بکات. بەڵام ئەگەر دەستی چەپەی بە ڕیشیدا بێنێ و چزەبزەی بێتێ ـ ئەوە دەیهەوێ کڵاوت لە سەر بنێ. چاو لە چاوی مەکە، بە چاویدا هیچت بۆدەر ناکەوێ. تەڵەکەبازێکی شەشخەتە و هەرچڵە ڕیشێکی شەیتانیکی لە بندایە! یادداشتێکت دەدەمێ پیشانی بدەی. بەناوی گۆرستکین بانگی دەکەن. بەڵام ناوی ڕاستەقینەی خۆی «لیاگافی[26]»یە؛ بەڵام بەو ناوە بانگی مەکە چونکە قەڵس دەبێ و پێیناخۆشە. ئەگەر لەگەڵی ڕێککەوتی و زانیت مامەڵەکە بە قازانجە، خێرا نامەم بۆ بنێرە. هەر ئەوەندە بنووسی: «درۆ ناکات» تەواوە. مامەڵەکەی لە سەر یازدە هەزار لەگەڵ دامەزرێنە، دەتوانی هەزاریشی بۆ داشکێنی، بەڵام لەوە زیاتر مەیە خوارێ. بیری لێبکەوە جیاوازیی نێوان هەشت هەزار و یازدە هەزار چەندەیە. وەک ئەوە وایە پیاو سێ‌هەزار ڕۆبڵی لەخۆڕا بۆ دابباری. دۆزینەوەی کڕیار هەروا گۆترە و سانا نییە، منیش پێویستییەکی زۆرم بە پارەیە. هەر ئەوەندە ئاگادارم بکەی مامەڵەکە سەریگرتووە، بە پڕتاو خۆم دەگەیەنمێ و جێبەجێی دەکەم. هەرچۆنێک بێ وەختی بۆ تەرخاندەکەم. بەڵام ئەگەر قسەی ئەو قەشەیە ڕاست نەبێ، بۆ لەخۆڕا ئەو ڕێگایە بکوتم؟ دەی کوڕمگیان دەچی؟

ـ نا، پێمناکرێ. لە سەر من حیساب مەکە.

ـ وەرە پیاوەتی بکە و ئەم کارە بۆ باوکی خۆت جێبەجێ بکە. قەتم لەبیر ناچێ. ئێوە دڵتان نییە، هیچکامتان ـ عەیبەکەتان هەر ئەوەیە! ئاخر کوڕم ڕۆژێک و دوو ڕۆژ بۆ تۆ چ گرینگایەتییەکی هەیە؟ دەتهەوێ بچی بۆکوێ، ـ بۆ وێنیز؟ ئەگەر بچی بۆ وێنیزیش دەتوانی دوو ڕۆژی دیکە سەبر بکەی. ئالیوشام دەنارد، بەڵام ئەو بەکاری ئەو شتانە نایە. تۆ دەنێرم چونکە زیرەکتری و ئەو کارەت لەدەست دێ، پێتوایە تێناگەم؟ تۆ لە تەختە و کاریتە ناگەی، بەڵام سەرت لە مامەڵە دەردەچێ. هەر ئەوەندە تێبگەی ئەو کابرایە درۆ دەکا یان نا، تەواوە. پێمگوتی، چاو لە ڕیشی بکە ـ ئەگەر ڕیشی بزواند، بزانە ڕاستدەکا.

---

26– یانی تاژی ڕاو، تانجی

ئیوان فیۆدۆرۆویچ بە پێکەنینێکی تاڵەوە گوڕاندی: «کەوایە ناچارم دەکەی بچم بۆ ئەو چێرماشنیا بەقوڕگیراوە؟»

فیۆدۆرپاولۆویچ بەو پێکەنینە تاڵەیدا لە مەبەستەکەی نەگەیشت.

ـ کەوایە دەچی، ها؟ هەر ئێستا یادداشتەکەت بۆ دەنووسم.

ـ نازانم دەچم یان نا. لە ڕێگا بیری لێدەکەمەوە و بڕیاردەدەم.

ـ قسەی قۆڕ مەکە! هەر ئێستا بڕیارەکەت بدە. ڕۆڵە گیان هەر ئێستا دڵنیام بکە. ئەگەر مامەڵەکەش سەری‌گرت، تەنیا دێڕێکم بۆ بنووسە: بیدە دەست قەشەکە، خێرا دەینێرێ بۆم. ئیتر لەوە زیاتر ماتڵتناکەم. دەتوانی بڕۆی بۆ ڤێنیز. بۆ گەڕانەوەشت هەتا یەختەرمەخانەی ولۆفیا قەشە عارەبانەت بۆ دەگرێ.

پیرە پیاو لە خۆشیاندا پێی وەعەرز نەدەکەوت. یادداشتەکەی نووسی و ناردی بەدوای عارەبانەدا. خۆراکێکی سادەیان لەگەڵ بترییەک براندی هێنا. فیۆدۆر پاولۆویچ کاتێ دڵخۆشدەبوو، دەستیدەکرد بە چەنەوەری، بەڵام ئەمڕۆ وێدەچوو دان بەخۆیدا بگرێ. بۆ وێنە باسی دیمیتریی نەکرد و خۆی لەو دارەتە هەر نەدا. گوێی بەو جوداییە هەر نەدەبزوا و لەڕاستیدا، دەتگوت وشەیەکی بۆ گوتن دەستناکەوێ. ئیوان فیۆدۆرۆویچ زۆرچاک لەوە گەیشتبوو. لەبەر خۆیەوە گوتی: «ڕەنگە لەدەست من وەزاڵە هاتبێ.» تەنیا ئەو کاتەی کوڕەکەی هەتا سەر پلیکانەکان بەڕێکرد، وای‌نیشاندا نیگەران و بێ‌ئۆقرەیە. ویستی ماچیبکا. بەڵام ئیوان فیۆدۆرۆویچ خێرا سەری بۆ دواوە کێشایەوە و دیاربوو نایهەوێ باوکی ماچیبکا. فیۆدۆر پاولۆویچ خێرا تێگەیشت و ڕەق ڕاوەستا.

لەسەر پلیکانەکان لە پەستا دەیگوت: «چاکە خودات لەگەڵ، خودات لەگەڵ! ئەگەر ڕێت کەوتەوە ئەملایە، حەتمەن وەرە بۆلام. هەمیشە بە دیتنت دەگەشێمەوە. چاکە خودات لەگەڵ!»

ئیوان فیۆدۆرۆویچ سواری عارەبانەکە بوو.

باوکی بۆ دواایینجار هەرای کرد: «خودات لەگەڵ، ئیوان! لێم دڵگیر مەبە!»

هەموو خێزانی ماڵەکە بۆ بەڕێ کردنی هاتنە دەرێ ـ ئیسمیر دیاکۆف و مارتا و گریگۆری. ئیوان هەریەکی دە ڕۆبڵی پێدان. کاتێک لە نێو کەژاوەی عارەبانەکەدا دانیشت، ئیسمیر دیاکۆف پەڕییە سەرێ و ڕووپۆش و پەردەکەی ڕێکوپێک کرد.

لەناکاو ئیوان فیۆدۆرۆویچ لە دەمی دەرپەڕی: «دیوتە... خەریکم دەڕۆم بۆ چێرماشنیا.» دیسان وەک ڕۆژی پێشوو، دەتگوت وشەکان بەبێ ئیختیار لە زاری دەردەپەڕن. ئەویش پێکەنی، پێکەنینێکی تایبەت و قەڵسانە. هەتا ماوەیەکی زۆریش ئەو پێکەنینەی هەر لەبیر بوو.

ئیسمیر دیاکۆف، چاوێکی مانادار‌ی لێکرد و ڕاشکاوانە وەڵامی دایەوە: «کەوایە ڕاستە دەڵێن: «وتووێژ لەگەڵ مرۆڤی وریا هەمیشە بەنرخە».»

عارەبانەکە وەڕێکەوت. ئیوان هیچ هیوا و تاسەیەک لە دڵیدا نەبوو. بەڵام بە تامەزرۆیی چاوی لە دەور و پشتی خۆی دەکرد، چاوی لە مەزرا و تەپک و یاڵ و دارستان و ڕەوە قورینگی ژوور سەری دەکرد کە بە ئاسمانی ساماڵەوە باڵیان لێدەدا. لەپڕدا هەستی بە شادییەکی زۆر کرد. ویستی لەگەڵ عارەبانەچییەکە بکەوێتە قسە و سەبارەت بە وەڵامی ئەو گەلحۆیە هەستی بە هۆگرییەکی زۆر دەکرد؛ بەڵام ماوەیەک دواتر تێگەیشت تاقە وشەیەکیش حاڵی نەبووە و لە ڕاستیدا وەڵامی ئەو گەوجە پیاوەشی نەبیستووە. بێدەنگ بوو، ئەو بارەشی هەر پێخۆش بوو. هەوای تازە و نەرم و فێنک و ئاسمانی ساماڵ و پڕشنگدار. وێنەی ئالیووشا و کاترینا ئیوانا لە زەینییدا دەشنایەوە. بە نەرمی بزەیەکی هاتێ، فوویەکی لەو تاپۆ ئاشنایانە کرد و لە داڵغەی خۆی دەرهاویشتن. لە دڵی خۆیدا گوتی: «بۆ ئەوان کاتێکی زۆر هەیە.» بە پڕتاو گەیشتنە یەختەرمەخانەکە و ئەسپەکانیان گۆڕی و بە هەشتاو بەرەو ولۆفیا وەڕێ کەوتن. «بۆ وتووێژ لەگەڵ مرۆڤی وریا هەمیشە بەنرخە؟ مەبەستی لەو قسەیە چی بوو؟» ئەم بیرۆکەیە دەتگوت چنگی لە گەرووی گیر کردووە و پشووی سوار بووبوو. «ئەی بۆ پێمگوت دەچم بۆ چێرماشنیا؟» گەیشتنە یەختەرمەخانەی ولۆفیا. ئیوان فیۆدۆرۆویچ لە عارەبانەکە دابەزی و عارەبانەچییەکان دەوریان دا و بۆ کرێی هەشت کیلۆمەتر ڕێگای چێرماشنیا

کەوتنە چەنە لێدان. پێیگوتن ئەسپەکان تیمار بکەن. چووە حەوشەی یەختەرمەخانەکە و چاوی لە دەوروبەری کرد. چاوی بە ژنی خاوەنی یەختەرمەخانەکە کەوت و لەپڕ گەڕایەوە بەر دەرگاکە.

ـ ناچم بۆ چێرماشنیا. کاکینە، بڵێی بۆ گەیشتن بە شەمەندەفەری سەعات حەوت درەنگ نەبووبێ؟

ـ هەر ئێستا جێبەجێی دەکەین. عارەبانەکە ساز بکەین؟

ـ خێرا. سبەینێ ناچن بۆ شار هیچکامتان؟

ـ بۆچی. ئەم میترییە دەچێ.

ـ میتری گیان کارێکم بۆ دەکەی؟ بچۆ بۆلای باوکم، فیۆدۆرپاولۆویچ کارامازۆف، پێیبڵێ ئیوان نەچووە بۆ چێرماشنیا. دەتوانی بچی؟

ـ ئەیچۆن ناتوانم. من لە زووەوە ڕێزێکی زۆرم بۆ فیۆدۆرپاولۆویچ هەیە.

ئیوان فیۆدۆرۆویچ بە پێکەنینەوە گوتی: «ها ئەوەش بگرە چونکە دەزانم ئەو هیچی لەدەست دەرنایە.»

میتریش بە پێکەنینەوە گوتی: «خاترجەمبە هیچم ناداتێ. سپاست دەکەم قوربان. حەتمەن ئەو پەیامەی پێدەگەیێنم.»

سەری سەعات حەوت ئیوان فیۆدۆرۆویچ سواری شەمەندەفەر بوو و بەرەو مۆسکۆ وەڕێکەوت. «ماڵئاوا ئەی ڕابردوو. ئیتر بۆ هەمیشە لە دنیای قەدیم دابڕاوم و هیوادارم ئیتر هیچ هەواڵ و زایەڵەیەکی بەرگوێم نەکەوێ. ژیانی نوێ بگرە و هاتم. تێکەڵ شوێن و ژیانی نوێ دەبم و ئیتر ئاوڕ بۆ ڕابردوو نادەمەوە.!»

بەڵام بەجێی شادی، خەفەتێکی گەورە گیانی داگرت و تووشی دڵەخورپەیەک بوو، کە وێنەی ئەوەی بە عومراتی خۆی نەدیتبوو. ئەو شەوە هەر لە دەریای بیردا نوقمبوو. شەمەندەفەر دەفڕی. دەمەو بەیانیش کە لە مۆسکۆ نزیک بۆوە، لە ناکاو خەم و خەفەت بەرۆکی بەردا.

لەبەر خۆیەوە ورتاندی: «مرۆڤێکی هیچوپووچم!»

هەر لەو کاتەدا فیۆدۆرپاولۆویچ شادی لە دڵی گەڕابوو کە کوڕەکەی ڕەزامەندانەتر بەڕێکردبوو. دوو سەعات دواتریش هەروا هەستی بە شادی

دەکرد و خەریکی خواردنەوەی براندی بوو. بەڵام لەپڕ شتێک قەوما کە بۆ هەموو خێزانی ماڵەکە ناخۆش و پڕ ئازار بوو. «هێمنایەتیی فیۆدۆرپاولۆویچیشی»بە تەواوی شێواند. ئیسمیر دیاکۆف بۆ هێنانی شتێک رۆیشت بۆ ئەنبارەکە ولە پلیکانەکان کەوتە خوارێ. بەختەوەرانە مارتا ئیگناتیفنا لە حەوشە بوو و زرمەکەی بیست. کەوتنەکەی نەدی بەڵام گوێی لە رمبە وناڵەکەی بوو. ناڵەیەکی غەریب و تایبەت کە لەمێژبوو بە گوێی ئاشنا بوو. ناڵەی مرۆڤێکی سەرودڵ لەگەڵ کە بە هۆی گەشکەوە دەکەوێ. ئەوان نەیاندەزانی ڕاست لەو کاتەدا گەشکەی لێدێ کە لە پلیکانەکان دەچێتە خوارێ و بە هۆی ئەوەوە بێهۆش دەکەوێ. یان هەناسەبڕکێ و زەبری وێکەوتوو بووبووە هۆی ئەو سەرودڵ لێهاتنەی ئیسمیر دیاکۆف. ئەویان لەبەر پلیکانی ئەنبارەکەدا دی کە وەک مار جینگڵی دەدا، کەف بەلا دەمیدا دەهاتە دەرێ، سەرەتا پێیان وابوو جێیەکی شکاوە ـ دەستی یان لاقی ـ بەڵام بە وتەی مارتا ئیگناتیفنا، «خودا ڕوحمی پێکردبوو.» هیچکوێی نەشکابوو، بەڵام هێنانە دەرەوەی لەو ئەنبارە تاریکە زۆر دژوار بوو. یارمەتییان لە دەروجیرانان وەرگرت و هەرچۆنێک بوو هێنایانە دەرێ. فیۆدۆرپاولۆویچ لەو ماوەیەدا هەروا بە سەریانەوە وێستابوو. ئەو زۆر ترساو و شڵەژاوی دەنواند و یاریدەشی دەدان. ئیسمیر دیاکۆف وەهۆش نەهاتەوە. تاوێک جینگڵدانەکەی ڕاوەستا. بەڵام دیسان دەستیپێکردەوە و هەموو بۆیان دەرکەوت کە ڕووداوەکەی پارەکە قەوماوەتەوە کە لە ژووری ژێر هەورەبانەکەوە کەوتە خوارێ. وەبیریان هاتەوە کە لەو کاتەدا سەهۆڵیان لە سەر سەری دانابوو. ئەنبارەکە هەنووکە سەهۆڵی لێبوو و مارتا ئیگناتیفنا چوو لەتێکی هێنا. بەو ئێوارە درەنگوەختە فیۆدۆرپاولۆویچ ناردی بە شوێن دوکتۆر هێرتێز نستێوبدا و ئەویش بە هەڵەداوان خۆی گەیاندێ. دوکتۆر پیرەپیاوێکی بەڕێز بوو، لەو پارێزگایەدا لەوی ڕاست و دروستتر و بەویژدانتر تێدانەبوو. دوای فەحس کردن، گوتی هێرشەکە زۆر دژوار بووە و لەوانەیە ئاکامی تاڵی بەدواوە بێ. ئێستاش بە تەواوی سەری لێیدەرناچێ. بەڵام ئەگەر هەتا سبەینێ بەیانی ئەم ماریجە و دەوا و دەرمانە چارەسەری نەکا، دەبێ دەوا و دەرمانی دیکەی

بدەمێ. نەخۆشەکەیان بردە ژووری خزمەتکاران، بردیانە وەتاغێک لەپەنا وەتاغەکەی گریگۆری و مارتا ئیگناتیفنا.

دوای ئەوە، فیۆدۆر پاولۆویچ ئەو ڕۆژە نەهاتی دوای نەهاتی بە سەر شانیدا دەهات. شێوەکەیان مارتائیگنا تیفنا لێی‌نا و سووپەکە لە چاو سووپی ئیسمیر دیاکۆف «دەتگوت چڵکاوە» گۆشتی مریشکەکەشی هێندە وشک و بێتام بوو نەدەجاورا و قووت نەدەچوو. مارتا ئیگناتیفنا، لە جوابی لۆمەی تاڵی ئەربابەکەیدا کە هەقیشی بوو، گوتی: «مریشکەکە زۆر پیر بوو، و منیش دەورەی فێربوونی ئاشپەزیم نەدیوە.» شەوێ دیسان گرفتێکی دیکە بۆ فیۆدۆرپاولۆویچ هاتە پێشێ. بۆی دەرکەوت کە گریگۆری سێ ڕۆژ لەمەوبەر نەخۆش کەوتبوو، لەبەر ژانی پشتی کەلەلا کەوتووە. فیۆردۆر پاولۆویچ خێرا چایەکەی هەڵقوڕاند و دەرگای لە سەر خۆی پێوەدا. دڵەخورپە و چاوەڕوانی ئۆقرەی لێ‌هەڵگرتبوو. ئەو شەوە، بە دڵنیایی هیوای بە هاتنی گرووشنکا بوو. ئەو ڕۆژە سەر لە بەیانی ئیسمیر دیاکۆف خاترجەمی کردبوو کە گرووشنکا «بەڵێنی ژوانی داوە و دێ بۆلای.» دڵی پیرەپیاو کەوتبووە خورپە و کوتەکوت. بە وەتاغە چۆڵەکاندا دەگەڕا و گوێی هەڵدەخست. دەبوو گوێ‌قوڵاغ بێ. لەوانەبوو دیمیتری فیۆدۆرۆویچ لە جێگایەک بۆ گرووشنکا چووبێتە بۆسەوە و کاتێک گرووشنکا لە پەنجێرەکە دەدا، (ئیسمیر دیاکۆف دوو ڕۆژ لەمەوبەر پێیگوتبوو کە گرووشنکا لەکوێ و چۆن لە پەنجێرەکە دەدا) خێرا درگاکەی بۆ بکاتەوە. نابێ تاقە ساتێکیش لە ڕاڕەوەکە ڕاوەستێ. نەکا خودای نەخواستە دڵی گەرد بگرێ و هەڵێ. فیۆدۆر پاولۆویچ کەوتبووە گێژاوێکی تاقەتبڕەوە، ئەگەرچی دڵی بەو هیوا و ئاواتە شیرینانە هەرگێز کەلاوڕێژ نەبوو. بەڵام ئەمجارەیان تا ڕادەیەکی زۆر هیوادار بوو بێتە ژوانی.

## (١)

## باوە زووسیما و زیارەتکەرانی

ئالیووشا کاتێک بە دڵی خەمین و بە ژانەوە چوو بۆ حوجرەی پیرەکەی، هەتا ڕادەیەک بە سەرسوڕماوی لەجێی خۆی ویشک بوو. بەجێی کەسێکی نەخۆش کە بە گیانەڵڵاوە بێ، یان لە هۆش خۆی چووبێ، هەر ئەو جۆرەی کە دەترسا وای ببینێ، بەڵام دیتی لە سەر کورسیلەکەی دانیشتووە و ئەگەرچی شەکەت و نەخۆشە، بەڵام ڕوخساری نوورانییە و بزەی تێزاوە. زیارەتکەران دەورەیان داوە و بە ئارامی خەریکە قسەیان بۆ دەکا. نزیکەی چارەگێک بەر لە هاتنی ئالیووشا لە پێخەفەکەی هاتبووە دەرێ. زیارەتکەران زووتر لە کاتی خۆی لە حوجرەکەدا کۆ بووبوونەوە و چاوەڕوانی لە خەو هەستانی بوون. چونکە باوە پایسی دڵنیای کردبوون کە «حەزرەتی پیر لە خەو هەڵدەستێ و هەر ئەو جۆرەی بەیانی بەڵێنی داوە، جارێکی دیکە لەگەڵ خۆشەویستەکانی دەدوێ.» باوە پایسی ئیمانێکی تەواوی بەو بەڵێنە و وشە بە وشەی قسەکانی پیر هەبوو. ئەگەر ئەوی لەسەرە مەرگدا بدیبایە و ئەگەر بیدیبایە دوایین هەناسەی هەڵدەکێشێ، بەڵام بەڵێنی داوە هەستێ و ماڵئاواییان لێبکا. تەنانەت بڕوای بە مردنیشی نەدەکرد و هەروا چاوەڕوان بوو ئەو خوالێخۆشبووە زیندوو بێتەوە و وادە و بەڵێنەکەی بەرێتە سەر. بەیانی کە بۆ خەوتن ڕاکشابوو، باوە زووسیما پێیگوتبوو: «هەتا جارێکی دیکە لەگەڵ ئێوە خۆشەویستانم نەدوێم، نامرم. دەبێ جارێکی دیکە چاوم بە ڕوخساری نازەنینتان ڕوون بێتەوە و کولۆکۆی دڵمتان بۆ هەڵڕێژم.» ئەو ڕاهیبانەی بۆ ئەو دوایین وتووێژەی باوە زووسیما کۆ بووبوونەوە،

هەموویان ساڵانێکی زۆر بوو سەر لە پێناوی بوون. ئەوان چوار کەس بوون؛ باوە یوسف و باوە پایسی و باوە میخاییل نیگابانی حوجرەکەی، کە پیاوێکی پەنجا ساڵان بوو و زۆریشی خوێندەواری نەبوو. ئەو لە ماڵباتێکی هەژار و بێبەش بوو، خاوەنی ئیمان و ئیرادەیەکی پتەو و بەهێز بوو. قەڵافەتێکی چلەکێشانەی هەبوو کە نیشاندەری تێگەیشتوویی بوو. ئەگەرچی دەیویست وا خۆی نیشان نەدا و هەتا ڕادەیەک شەرمی لەو ئاکارە و قەڵافەتی خۆی دەکرد. چوارەمین کەسیش باوە ئانفیم، ڕاهیبێکی کورتەباڵای پیر و خاکەڕا بوو. لە چینی هەرە بێبەشی لادێ بوو. خوێندەواریی زۆر نەبوو، کەمدوو بوو، بە دەگمەن قسەی دەکرد و زۆر خاکەڕا بوو. چاوی جۆرێک بوو، دەتگوت لە دەست شتێکی گەورە و زاڵ هەراسانە و هۆشی لێبڕیوە. باوە زووسیما زۆری ئەو کەسایەتییە سام لێنیشتووە خۆش دەویست و بە ڕێزێکی تایبەتەوە هەڵسووکەوتی لەگەڵ دەکرد، ئەگەرچی کەمتر لەو کەسانەی دیکە قسەی لەگەڵ دەکرد، ئەگەرچی ساڵانێکی زۆر پێکەوە لە «ڕووسی پیرۆز» گەڕابوون. ئەمە باسی زۆر لەمەوبەرە، چل ساڵ لەمەوبەر، ئەو کاتە باوە زووسیما ژیانی تەرکە دنیاییی خۆی لە کلێسەیەکی چکۆلە و هەژار دەست پێکردبوو. ئەو کلێسەیە لە کاسترۆما بوو ماوەیەک دوای ئەوە، بۆ زیارەت پێبەپێی باوە ئانفیم گەڕابوو و یارمەتییان بۆ کلیسە فەقیرەکەیان کۆ کردبۆوە. چوارکەس لە وەتاغی خەوەکە بوون، ئەو وەتاغەی پێشتریش باسمانکرد، زۆر چکۆلە بوو و هێندە تەنگەبەر بوو ئەو چوار کەسە (کە پورفیریی تازە مریدیش لەوێ ڕاوەستا بوو) بە حاڵەحاڵ جێیان بووبۆوە و یەکی کورسیلەیەکیان لە وەتاغی نشیمەن هێنابوو کە بە دەوری باوە زووسیماوە دانیشن. هەوا خەریک بوو تاریک دادەهات. چرا و مۆمی بەر پەیکەرەکان وەتاغەکەی ڕووناک کردبۆوە. باوە زووسیما کە چاوی بە ئالیووشا کەوت لەبەر درگاکە بە حەپەساوی ڕاوەستاوە، شادانە بزەی هاتێ و دەستی بۆ هەڵێنا.

- بەخێر بێی، کوڕە هێمنەکەم، بەخێر بێی، کوڕە خۆشەویستەکەم، تۆش هاتی. دەمزانی دێی.

ئالیووشا چوو بۆلای، لە هەمبەریا چۆکی دادا و دەستی کرد بە گریان. لە دڵەوە دەکوڵا، سەرتاپای دەلەرزی و دەیویست هۆڕە هۆڕ بگری.

باوە زووسیما دەستی ڕاستەی بە سەریدا هێنا و بە زەردە خەنەوە گوتی: «مەگری، جارێ بۆم مەگری. خۆ دیتووتە دانیشتووم و قساندەکەم. ڕەنگە بیست ساڵی دیکەش بمێنم. هەر ئەو جۆرەی کە ئەو ژنە دڵۆڤان و بەڕێزەی خەڵکی ویشگۆرییە، دوێنێ لیزاوتا گچکەکەی لە باوەشدا بوو، ئەو ئاواتەی بۆ خواستم. خودا ئاگاداری ئەو دایک و کچۆڵەیە بێ.» باوە زووسیما خاچی خۆی کێشا. «پورفیری، ئەرێ نەزرییەکەیت برد بۆ ئەو جێگایەی پێمگوتی؟»

مەبەستی ئەو شەست کوپکە بوو کە دوێنێ ئەو ژنە بۆنخۆشە هێنابووی کە بیدەین بە «کەسێکی لەخۆی هەژارتر». ئەو خێر و خێراتانەی کەفارەتێکە و کەسێک بە خواستی خۆی دەیبەخشێ. باوە زووسیما پورفیریی ڕاسپارد بوو ئەو پارەیە بدا بە بێوەژنێکی سەغیربار کە شەش منداڵی هەتیوی هەبوو و بە هۆی سووتمانی ماڵەکەیەوە تووشی هەژاری و داماوی بووبوو. پورفیری لە وەڵامدا گوتی بە پێی فەرمان پارەکەم گەیاند و «لە لایەن ژنێکی چاکەکار و نەناسراوەوە» دامە دەست ئەو ژنە لێقەوماوە.

پیر لە درێژەی قسەکانیدا بە ئالیووشای گوت: «هەستە، کوڕە خۆشەویستەکەم. دادەی چاوم لێکە. چوویەوە بۆ ماڵێ و چاوت بە براکەت کەوت؟» ئالیووشا پێی سەیر بوو کە پیر ئاوا بە وردی و دڵنیاییەوە پرسیاری لێدەکرد، ئەویش تەنیا سەبارەت بە یەکێک لە براکانی - بەڵام کامیان؟ کەوایە ڕەنگە ئەمڕۆش و دوێنێش ئەوی لەبەر خاتری براکەی ناردبێتەوە بۆ ماڵێ.

ئالیووشا وەڵامی دایەوە: «چاوم بە برایەکیانم کەوت.»

- مەبەستم براگەورەکەتە، ئەوەی دوێنێ کڕنۆشم بۆ برد.

ئالیووشا گوتی: «دوێنێ دیتم، بەڵام ئەمڕۆ نەمدیتەوە.»

- بۆ دۆزینەوەی پەلە بکە، سبەینێش بڕۆ و لێی خافڵ مەبە، دەست لە هەموو شتێک هەڵگرە و بە لەز وەدوای کەوە. ڕەنگە هێشتا دەرفەت مابێ بەرگری لە کارەساتێکی سامناک بکەی. دوێنێ بۆیە کڕنۆشم بۆ برد، ئازارێکی گەورە لە بۆسەی دایە.

لەناکاو بێدەنگ بوو و لەوە دەچوو بیر بکاتەوە. قسەکانی سەیر بوو. باوە یوسف کە شایەدی ئەو دیمەنەی دوێنێ بوو، لەگەڵ باوە پایسی چاوێکیان لە یەکتر کرد. ئالیووشا نەیتوانی لەو پرسیارە خۆی ببوێرێ کە: «گەورەم، جوان لە قسەکانت ناگەم... ئەو ئازارە گەورە چییە لە بۆسەی کاکمدایە؟» دەنگی دەلەرزی و دڵەکوتەی پێکەوتبوو.

«هەر مەپرسە. وادیارە دوێنێ چاوم بە شتێکی ترسناک کەوت... هەر دەڵێی هەموو داهاتوویم لە چاوانیدا دەخوێندەوە. سەرنجێک لە چاویدا دیار بوو - ئەو جۆرە سەرنجەی کە چاوی داگرتبوو بەجارێ تووشی ترس و دڵەڕاوکێی کردم. جارێک یان دووجار لە ماوەی تەمەندا سەرنجی ئاوام لە چاوی پیاوێکدا دیوە... وەک ئەوەی وێنەی چارەنووسی داهاتووی تێدا دیار بێ، بەداخەوە ئەو چارەنووسەش وەڕاست گەڕا. ئالکسی تۆم نارد بە دۆیدا، چونکە پێموابوو ئەدگاری برایانەت یارمەتیی دەدا. بەڵام هەموو شتێک و هەموو چارەنووسێک بە دەست خودایە. ئەگەر دەنکی گەنم بکەوێتە عەرز و نەمرێ، بە تەنیا دەمێنێتەوە: بەڵام ئەگەر بمرێ، بەرهەمی باشی دەبێ. ئەمەت لە بیر بێ.» پیر بە بزەیەکی ئارامەوە، گوتی: «ئالکسی تۆشم زۆر بە ئارامی تەقدیس کرد، لەبیرت نەچێ.» ئەوەی سەبارەت بە تۆ بیری لێدەکەوە ئەمەیە. لەم دیوارانە دەچیتە دەرێ، بەڵام وەک ڕاهیبێک لە دنیادا دەژیی، زۆرت نەیار دەبێ، بەڵام تەنانەت دوژمنەکانیشت خۆشیان دەدوێی. ژیانت پڕ دەبێ لە خەم و ناکامی. بەڵام لە نێو ئەو ناکامییانەدا بەختەوەری دەدۆزیتەوە. ژیان تەقدیس دەکەیت و کارێک دەکەی خەڵکیش تەقدیسی بکەن - کە ئەوەش زۆر گرینگە. زات و خووخدەی تۆ ئەوەیە ئیتر.» پاشان ڕووی لە ڕاهیبەکان کرد و بە بزەیەکی نەرموونیانەوە گوتی: «باوکان و مامۆستایان، هەتا ئەمڕۆ

تەنانەت بەخۆشیم نەگوتووە بۆ ڕوخسارە جوان و جحێڵەکەیم ئەوەندە لەلا خۆشەویستە. ئێستا پێتان دەڵێم. ڕوخساری بۆ من هەواڵدەر و بووژێنەرەوەی یاد و بیرەوەرییە. لە سەردەمی منداڵیمدا، برایەکی لەخۆم گەورەترم هەبوو، لە تەمەنی حەڤدەساڵیدا لەبەر چاوم گیانیدا. دواتر لە ماوەی تەمەنمدا وردە وردە بەو باوەڕە گەیشتم کە ئەو برایەم ڕێنوێن و نیشانەیەک بووە لە عالەمی باڵا بۆ من. چونکە ئەگەر ئەو نەهاتبایەتە ژیانمەوە، ڕەنگە قەت نەبووبایەم بە ڕاهیب و پێم نەنایەتە ئەم ڕێگا پیرۆزەوە، لانیکەم وا بیر دەکەمەوە. ئەو سەرەتا لە کاتی منداڵیمدا خۆی پیشاندام و ئێستا لە کۆتایی تەمەنمدا، وادیارە جارێکی دیکە هاتۆتەوە بۆلام. باوکان و مامۆستایان، سەرسووڕهێنەرە کە ئالکسی، ڕواڵەتەن تۆزێ شێوەی ئەو دەدا، بەڵام لەبارەی ڕۆحییەوە هەر دەڵێی ئەوە و زۆرجاران پێموابوو ئەم گەنجە ڕاست براکەی خۆمە و لە کۆتایی زیارەتمدا وەک بیرهێنەرەوەیەک و مایەی ئیلهامێک، بە شێوەیەکی نهێنی و ڕازاوی هاتۆتەوە بۆلام. بەجۆرێک کە ئەو خەون و خولیا غەریبە تووشی سەرسووڕمانی کردووم.» ڕووی کردە ئەو مریدەی کە دەستەونەوزەر لە خزمەتیدا ڕاوەستابوو و گوتی: «گوێت لێیە پورفیری؟ زۆرجاران هەستم بەوە کردووە کە ڕەنگت تێکدەچوو و جۆرێک بەخیلی دڵی دادەگرتی کە ئالکسیم لە تۆ خۆشتر دەوێ. ئێستا بۆت دەرکەوت هۆی چیبوو، بەڵام تۆشم بەقەد ئەو خۆش دەوێ و زۆر جاران خەمی تۆ خەفەتباری کردووم. دۆستانی خۆشەویست، دەمەوێ باسی ئەولاوە، یانی براکەمتان بۆبکەم، چونکە وجوودێکی خۆشەویستتر و گرینگتر و شوێندانەرتر لەو لە ژیانمدا نەبووە. دڵم لێوڕێژ لە خۆشەویستی و هیوایە و لەم ساتەدا ژیانی خۆم وا دێتە بەرچاو کە تازە دەستمپێکردۆتەوە.»

لێرەدا دەبێ بڵێم ئەو داویین ئەخافتنەی باوە زووسیما لەگەڵ هاوڕێکانی کە لە سەرەمەرگدا هاتبوون بۆ دیدەنیی، تا ڕادەیەک لە نووسراوەدا ماوەتەوە. ئالکسی فیۆدۆرۆویچ کارامازوف ماوەیەک دوای مردنی پیرەکەی ئەوانەی لەبەر نووسیوییەوە. بەڵام ئایا ئەوە تەنیا وتوێژێک بوو کە لەو

سەردەمەدا ئەنجام درا، یان یادداشتگەلێک بوو لە وتوێژەکانی پێشوو لەگەڵ مامۆستاکەی و خستبوویە سەریەک، بەتەواوی لێم ڕوون نییە. لە نووسراوەکەیدا، وتاری باوە زووسیما بێ پسانەوە دەڕواتە پێشێ، وەک ئەوەی سەربردەی خۆی وەک چیرۆکێک بۆ هاوڕێکانی بگێڕێتەوە، ئەگەرچی لە ڕەوایەتەکانی دیکەی ژیاننامەکەدا دەردەکەوێ و شکی تێدا نییە وتووێژی ئەو شەوەی گشتی بووە. ئەگەرچی زیارەتکەران زۆر نەپەڕینە نێو قسەکانییەوە، ئەوانیش جارجار قسەیان دەکرد، چونکە باوە زووسیما نەیدەتوانی لەسەریەک ئەوەندە قسە بکات، چونکە پیری بڕستی لێبڕیبوو، زۆر جاریش هەناسەی سوار دەبوو و دەنگی دەرنەدەهات و بۆ پشوودان لە سەر جێگاکەی ڕادەکشا. ئەگەرچی خەوی لێنەدەکەوت و هاوڕێکانیشی بەجێیان نەدەهێشت. جارێک یان دووجار وتووێژەکە بە ئینجیل خوێندنەوەی باوە پایسی ڕاگیرا. شیاوی باسیشە هیچکەس پێیوانەبوو باوە زووسیما ئەو شەوە دەمرێ. چونکە لەو ئێوارەیەی تەمەنیدا، دوای خەوێکی قووڵی ڕۆژانە، دەتگوت لەپڕ هێزێکی تازەی هاتۆتەوە بەر و لە ماوەی ئەو وتوێژەدا توانیی خۆی ڕاگرێ. لەوە دەچوو تین و تاوی خۆشەویستی ئەو وره و توانایەی پێدابێ؛ بەڵام بۆ ماوەیەکی کەم چونکە دوای ئەوە خۆری ژیانی ئاوا بوو... بەڵام ئەوە ڕادەگرین بۆ دوایی. ئێستا تەنیا وام بە باش زانی بپەرژێمە سەر گێڕانەوەکەی ئالکسی فیۆدۆرۆویچ کارامازۆف و نامهەوێ خۆ لە قەرەی باسە وردەکان بدەم. وا باشترە چونکە کورت و پوخت دەبێ و نابێتە هۆی ماندووبوونی خوێنەر. ئەگەرچی باشترە دووپاتی بکەمەوە، ئالیووشا زۆربەی وتوێژەکانی پێشووشی پێ‌زیاد کردووە.

## (٢)

# سەربردە و وتاری قەشە و ڕاهیبی کۆچکردوو، حەزرەتی زووسیما، وەرگیراو لە وتەکانی خۆی، بە قەڵەمی ئالکسی فیۆدۆرۆویچ کارامازۆف

ئەو یادداشتانەی پێوەندیی بە سەربردەکەوە هەیە

**(١) براکەی باوە زووسیما:**

باوکان و مامۆستایانی خۆشەویست، من لە پارێزگایەکی دوورە دەستی باکوور، لە شاری و... لە دایکبووم. باوکم لە تایەفەیەکی ڕەسەن بوو، بەڵام بەناوبانگ و خاوەن پلە و پایە نەبوو. دوو ساڵانە بووم مردووە و بە هیچ شێوەیەک وەبیرم نایە.ماڵۆچکەیەکی دارینەی بۆ دایکم بە میرات جێهێشت، لەگەڵ بڕێک پارە و کەلوپەلی ماڵێ، ئەویش ئەوەندە زۆر نەبوو. هەر ئەوەندەی کە دایکم و منداڵەکانی پێیبەڕێ بچن. منداڵەکان دوو دانە بوون. براکەم لە من گەورەتر بوو. براکەم ناوی مارکێل بوو منیش زینۆفی. ئەو هەشت ساڵ لە من گەورەتر بوو. زۆریش هار و بزێو بوو، بەڵام دڵۆڤان و ڕۆحسووک. تانە و تەشەریشی لە هیچکەس نەدەدا. لە ماڵێدا لەگەڵ من و دایکم و پێشخزمەتەکان زۆر ڕووخۆش و لەسەرەخۆ بوو. بۆ خوێندن ئازا و زیرەک بوو، بەڵام لەگەڵ هاوپۆلەکانی نەدەسازا. وا نەبوو شەڕیان لەگەڵ بکا، دایکم ئەوانەی بۆ گێڕاومەتەوە. شەش مانگ بەر لە مردنی، لە تەمەنی حەڤدەساڵیدا، لەگەڵ شاربەدەرێکی سیاسی ئاشنا بوو، ئەو پیاوەیان لە سەر ئازادیخوازی لە مۆسکۆوە بۆ شارەکەی ئێمە تاراندبوو و بە تاقی تەنیا لەو ڕۆژگارەدا ژیانی بە سەر دەبرد. ئەو شاربەدەرە بیرمەندێکی باش بوو و لە زانستگا پلەی هەرە بەرزی فەلسەفەی وەدەستهێنابوو. نازانم چۆن بوو هۆگرییەکی زۆری بە مارکێل هەبوو و داوای لێدەکرد زوو زوو سەردانی بکا. کاکم هەموو ڕۆژێ

عەسر دەچوو بۆلای، سێ مانگەی زستان بەو شێوەیە پێوەندییان بوو. تا ئەوەی بانگیانکرد بۆ پترزبۆرگ، تاکو لە سەر داوای خۆی پلە و پایەکەی دیسان وەدەستکەوێتەوە، چونکە لەوێ دۆست و هاورێی دەسترۆیشتووی هەبوو.

سەرەتای رۆژانی پارێز بوو. مارکێل رۆژووی نەدەگرت، قسەی خراپی دەکرد و پێکەنینی بە رۆژوو دەهات. دەیگوت: «هەمووی قۆرِیاتە و خوداش هەر نییە، « من و دایکم و پێشخزمەتەکانی تۆقاندبوو. من ئەودەم نۆ ساڵان بووم، بۆیە زۆر لەو قسانە دەترسام. چوار پێشخزمەتمان هەبوو، هەموویان کۆیلەی زەرخرید بوون و مالیکێکی ئاشنامان کرِیبوونی. لەبیرمە دایکم یەکێ لەو چوار کەسە کە ناوی ئافیمیای ئاشپەز بوو، لەبەر پیری بە شەست رۆبڵ فرۆشتی و پێشخزمەتیکی ئازادی گرت بەجێی ئەو.

لە شەشەمین حەوتووی رۆژانی پارێزدا، براکەم کە زۆر لاواز و بێ داروبار بوو، چەن جار تووشی دەردەباریکە بووبوو، نەخۆش کەوت. کەڵەگەت بوو بەڵام دالگۆشت و باریکەڵە بوو، بەژن و باڵایەکی جوانیشی هەبوو. پێموایە سەرما لێیدابوو و باپەرِی کردبوو، کاتێ دوکتۆرمان هێنا سەری بە سرتە بە دایکمی گوت سیلی گرتووە و بەحاڵە حاڵ رەنگە بگاتە بەهارێ. دایکم دای لە پرمەی گریان و لەبەر کاکم دەپارِایەوە و هانیدەدا بچێ بۆ کلێسە و تۆبە بکا و فەرزی پیرۆز بەجێ بێنێ. چونکە هێشتا دەیتوانی بەرێدا برِوا. ئەو قسانەشی جۆرێک بە گوێی کاکمدا دەدا کە شک نەکا ئەو نەخۆشییە پیسەی گرتووە و ترسی لێبنیشێ. بەڵام ئەو قسانەی دایکم قەڵسی کرد و زۆری قسەی ناحەز و کفراوی بە کلێسە گوت. بەوحاڵەشەوە چوو دەماڵی فکرەوە. خێراش تێگەیشت نەخۆشییەکەی سەختە و جێگای مەترسییە، بۆیە دایکم داوای لێدەکا بچێ بۆ دانپیانان و تۆبە کردن و بەجێهێنانی ئەو فەرزە پیرۆزە. لە راستیدا، لەمێژبوو تێگەیشتبوو حاڵی باش نییە و هەستی بە بێهێزی خۆی دەکرد.ساڵێک بەر لە دەرکەوتنی نەخۆشییەکەی کاتی شێوکردن بە من و دایکمی کوت: «زۆرتان لەگەڵ نامێنم، رەنگە لە ساڵێک زیاتر زیندوو نەمێنم.» کە دواتر دەرکەوت قسەکەی پێشوێژییەک بوو وەراست گەرِا.

سێ ڕۆژ تێپەڕی و حەوتووی پیرۆز بەسەردا هات. بەیانی ڕۆژی سێشەممە کاکم سازبوو بچێ بۆ کلێسە. گوتی: «دایە، ئەم کارە تەنیا لەبەر دڵی تۆ دەکەم، بۆ ئەوەی ببێتە هۆی ڕەزایەت و هێور بوونەوەی دڵت.» دایکم لەبەر شادی و خەفەت دەستیکرد بە گریان. لەبەر خۆیەوە گوتی: «بۆیە گۆڕانێکی ئاوای بەسەردا هاتووە، ڕەنگە کۆتاییی ژیانی نزیک بووبێتەوە.» بەڵام نەیتوانی ماوەیەکی زۆر هاتوچۆی کلێسە بکات و لە جێدا کەوت، بۆیە ناچار بوو لە ماڵێ فەرزی تۆبە و دانپیانان بەجێ بێنێ.

ئێوارەی یەکێک لە ڕۆژەکانی جێژنی پاک بوو، ڕۆژێکی خۆش و تاووساو بوو، هەوا بۆن و بەرامەی دەپڕژاند. لەبیرمە ئەو شەوە هەتا بەیانی کۆخی و خەوی لێنەکەوت. ئیتر لەوەبەدواوە شەوانە کۆخە و پشووسواری حەجمانی لێهەڵدەگرت. بەڵام بەیانی خۆی پۆشتە دەکردەوە و هەوڵی دەدا لە سەر کورسیلەیەکی لانکەیی دانیشێ. ئێستاش لەبەر چاومە، دڵۆڤان و هێدی دادەنیشت و بەوحاڵە پەرۆشەیەوە زەردەی دەگرت و ڕوخساری شاد و گەشاوە بوو. گۆڕانێکی سەیری بەسەردا هات، پەرستارێکی پیر کە پێیڕادەگەیشت، چووە ژوورەکەی و گوتی: «خۆشەویستەکەم، ئیزن بدە چرایەک لە هەمبەر پەیکەرەی پیرۆزدا هەڵکەم.» چونکە بەر لەوە نەیدەهێشت و چراکەی دەکوژاندەوە.

ـ هەڵیکە، باشە هەڵیکە، وادیارە جاران هەڵەبووم بەرگریی ئەو کارەم لێدەکردی. کاتێ چراکە هەڵدەکەی، دوعا دەخوێنی و منیش لە خۆشیی تۆ دەستدەکەم بە دوعا کردن.

ئەو قسانە بەلای ئێمەوە زۆر سەیر بوو و دایکم دەچووە وەتاغەکەی خۆی و دەگریا، بەڵام کاتێک دەچوو بۆلای کاکم فرمێسکەکانی دەسڕی و خۆی شاد و بێخەم نیشاندەدا. ئەو دەیگوت: «دایەگیان مەگری، من ماوەیەکی زۆر دەژیم و ئەوەندە دەمێنم شادیتان لەگەڵ بکەم و ژیانیش لەبەر چاوم خۆش و شیرینە.»

ـ ئاخ کوڕە خۆشەویستەکەم، چۆن دەتوانی باسی شادی بکەی، لە شوێنێک کە شەوانە بە پشووسواری و چەقوچۆوە ڕادەکشێی و کۆخە وا پیرانت پێدەکا. لەوانەیە سینگت لەبەریەک بچێ.

کاکم وەڵامی دایەوە: «دایەگیان مەگری، ژیان وەک بەهەشت وایە، ئێمەش هەموومان بەهەشتیین، بەڵام نایبینین، ئەگەر بیبینین، ڕۆژی دوایی لە سەر زەوی بەهەشتمان دەبێ.»

هەموو سەریان لە قسەکانی سوڕ مابوو، قسەکانی سەیر بوو و ڕاشکاوانە قسەیدەکرد. شوێنی لە سەر هەموومان دانابوو و دەگریاین. دۆست و ئاشنا دەهاتن بۆ دیدەنیمان. پێیدەگوتن: «خۆشەویستەکانم، من چیمکردووە ئێوە ئەوەندەتان خۆشدەوێم؟ چۆن دەتوانن مرۆڤێکی وەک منتان خۆش بووێ؟ بۆ هەتا ئێستا نەمدەزانی و ڕێزی ئەو هەموو خۆشەویستییەم لەبەر نەبوو؟

کاتێک پێشخزمەتەکان دەچوون بۆلای، لەپەستا دەیگوت: «ئازیزانی دڵسۆز و دلۆڤان، بۆ ئەوەندەم خزمەت پێدەکەن، کوا من شیاوی ئەوەم؟ ئەگەر خودا ئیرادەی لە سەر بێ و بمێنم، قەرەبووی خزمەتەکانتان دەکەمەوە، چونکە هەموو خەڵک ئەرکی سەر شانیانە خزمەت بە یەکتر بکەن.» دایکم، هەروا کە گوێی ڕاگرتبوو، سەری دەلەقاند. «خۆشەویستەکەم نەخۆشین بۆتە هۆی ئەوەی وا بڵێی.»

ئەو دەیگوت: «دایەگیان، خۆشەویستەکەم، دەبێ خزمەتکار و ئەرباب بم، بەڵام ئەگەر وایە، من دەبمە خزمەتکاری خزمەتکارەکانم. ڕاست ئەو جۆرەی ئەوان خزمەت بە من دەکەن. جگە لەوەش، دایەگیان، هەرکام لە ئێمە دەرهەق بە مرۆڤەکانی دیکە تاوانمان کردووە و منیش لە هەموو کەسێک زیاتر.»

دایکم بەڕاستی پێکەنینی بەو قسەیە هات، بەچاوی فرمێسکاوییەوە بزەی دەهاتێ. «بۆ، بۆ دەرهەق بە هەموو مرۆڤەکان و لە هەموو کەس زیاتر تاوانت ئەنجامداوە؟ دزان و پیاوکوژان تاوانبارن، بەڵام تۆ چیتکردووە کە خۆت لە هەموو کەس بە تاوانبارتر دەزانی؟»

دەیگوت: «دایکە خۆشەویستەکەم، هێزی دڵەکەم، « (لەو کاتەدا دەستی کردبوو بەو قسە و وشە ناسکانە) هێزی دڵەکەم، خۆشەویستەکەم، بڕوا بکە هەر کەسەی بەخاتری کەسێکی دیکە و هەموو شتێک، بەرپرسە. نازانم چۆنی دەربڕم، بەڵام بە بڕوای من ئاوایە و بەڕاستیش هەروایە. ئێمە گوێمان بەو شتانە

نابزویّ و هەروا دەژیین و توورە دەبین و خۆشمان نازانین؟» بەم جۆرە ئەو هەموو ڕۆژیّ شادتر و سەرودڵ خۆشتر دەبوو و بە تاسەیەکی زیاتر لە ڕۆژی پێشووەوە هەڵدەستا. کاتێک دوکتۆر دەهات، کە پیاوێکی پیری ئاڵمانی بوو، ناوی ئایزێن ئیشمیت بوو، بە گاڵتە پێیدەگوت:

ـ دەی دوکتۆر ڕۆژێکی دیکەم لەم دنیایە مۆڵەت ماوە؟

دوکتۆر لە وەڵامدا دەیگوت: «زۆرت ماوە، ساڵانێکی زۆر هەر دەمێنی.»

بەسەرسامی دەیگوت: «ساڵانێکی زۆر؟ بۆ ڕۆژان ببژێرین؟ بۆ مرۆڤ ڕۆژێک سەروزیادە بۆ ئەوەی بەختەوەری بناسیّ. خۆشەویستانم، بۆ شەڕ و ئاژاوە ساز دەکەین و هەوڵدەدەین یەکتری ببوغزێنین و خۆمان لە کەسانی دیکە پیّ زیاتر بیّ؟ دەبیّ ڕاست بڕۆین بۆ سەیرانگا و پیاسە کردن و گەمە و یاری. یەکترمان خۆشبویّ، قەدری یەکتر بزانین و یەکتر ماچبکەین و مەتحی ژیان بکەین.»

دوکتۆر کاتیّ دایکم هەتا بەردەرگای لەگەڵ چوو، پێیگوت: «کوڕەکەت زۆری نەماوە، نەخۆشیی خەریکە شوێن لە سەر زەینیشی دادەنیّ.»

پەنجێرەی ژوورەکەی بەرەو باخ بوو. باخەکەمان پڕ لە دار و درەختی پیر و نەمام و لاوێن بوو، تازە خەریک بوو چرۆیان دەردەکرد. مەل و پەڕۆکی بەهاری بەنێو لق و پۆپەکاندا دەفڕین و لەبەر پەنجێرەکاندا جریوە جریویان بوو. کاتیّ چاوی بەو چۆلەکانە کەوت، مەتحی کردن و داوای لێبوردنی لە ئەوانیش کرد، «پەڕۆکە ئازادەکان، فڕندە بەختەوەرەکان، لێم ببوورن، چونکە دەرهەق بە ئێوەش تاوانم کردووە.» هیچکام لە ئێمە ئەو کاتە لەو قسانەی نەدەگەیشتین، بەڵام ئەو فرمێسکی شادیی هەڵدەوەراند. دەیگوت: «بەڵیّ وەک شکۆ و گەورەیی خودا باڵندە و درەخت و چیمەن و ئاسمان لە دەوروبەرم بوون، بەڵام من بە ڕوورەشی و سپڵەیی دەژیام و بیّحورمەتیم دەکرد و چاوم بەرایی نەدەدا ئەو هەموو جوانی و شکۆیە ببینم.»

دایکم بە گریانەوە دەیگوت: «تۆ بۆخۆت بە تاوانبار دەزانی؟»

دایەگیان، خۆشەویستی دڵەکەم، لە خۆشیاندا دەگریم، نەک لەبەر خەم. ئەگەرچی ناتوانم بۆت باسبکەم، پێمخۆشە لە هەمبەر ئەوانەدا خۆم چکۆڵە کەمەوە، چونکە نازانم چۆن خۆشەویستیی خۆم دەربڕم. من دەرهەق بە هەموو کەس تووشی تاوان بووم، ئەوانیش لێمدەبوورن و بەهەشتیش هەر ئەوەیە. مەگین ئێستا لە بەهەشت نیم؟

زۆر شتی دیکەشی دەگوت کە لەبیرم نەماوە. لەبیرمە جارێکیان هیچکەس لە ژوورەکەی نەبوو، چووم بۆلای. عەسرێکی تاووساو بوو. خۆر بەرەو ڕۆژئاوا ملی پێوەنابوو و پڕشنگە خوارەکەی هەموو ژوورەکەی ڕووناک داگیرابوو. بانگی کردم بۆلای خۆی. منیش چووم. دەستی نایە سەر شانم و بە خۆشەویستی و ڕێزەوە چاوی لە چاوم بڕی: چەن ساتێک ماق ما و هەروا چاوی تێبڕیم. پاشان گوتی: «دەی بۆ ناچی یاری بکەی؟ بڕۆ بەجێی منیش چێژ لە ژیان وەرگرە.»

هاتمە دەرێ و ڕۆیشتم بۆ یاریکردن. دوای ئەوە، زۆر جاران لە ماوەی ژیانمدا لە ناخەوە گریاوم کاتێ وەبیرم دەهاتەوە کە پێیگوتم بەجێی منیش چێژ لە ژیان وەرگرە. زۆر قسەی جوان و بێوێنەی تری دەکرد، کە بە داخەوە ئەو کاتە لێی تێنەدەگەیشتین. سێ حەوتوو دوای جێژنی پاک بۆ هەمیشە چاوی لێکنا و بەجێی هێشتین. لەسەرە مەرگدا هیچ ئاڵوگۆڕێکی بەسەردا نەهات، تەواو هۆشی لە سەر خۆی بوو، بەڵام نەیدەتوانی قسە بکا. شادی دەنواند، چاوی زیتەی دەهات و تەماشای دەکردین. بە دەممانەوە دەگرژییەوە و بانگی دەکردین بۆلای خۆی. تەنانەت لە نێو شارەکەشدا باس باسی مەرگی ئەو بوو. ئەوانە کاریان تێکردم بەڵام نەک زۆر، لە ڕێوڕەسمی ناشتنیدا زۆر گریام. ئەو وەختە هێشتا خۆمم نەناسیبوو، منداڵ بووم. بەڵام شوێن و هەستێکی سەیر و شاراوەی لە ناخمدا جێهێشت و هەمیشە ئامادەی خۆ دەرخستن و وەڵامدانەوە بووم لە کاتی پێویستدا. لە ڕاستیدا هەرواشی لێهات.

**(٢) شوێنی کتێبی پیرۆز لە ژیانی باوە زووسیمادا:**

من و دایکم بە تەنیا ماینەوە. دۆستان وەک ئامۆژگاری کردن دایان بە گوێی دایکمدا، کە ئەویش وەک دایکان و باوکانی دیکە من بنێرێ بۆ پترزبۆرگ. گوتیان: «تۆ تەنیا ئەو کوڕەت هەیە و دەستەنگیش نییت، ئەگەر لێرە ڕایگری ڕەنگە داهاتوویەکی باشی نەبێ.» پێشنیاریان کرد بمنێرێتە فێرگەی نیزامی لە پترزبۆرگ، بۆ ئەوەی دواتر بچمە ڕیزی گاردی سەڵتەنەتییەوە. دایکم ماوەیەکی زۆر دەستی لە دڵی نەدەبۆوە و هەڵبڕان لەو تاقە کوڕەی بۆ تامڵ نەدەکرا. بەڵام ئاخری بڕیاریدا بمبا بۆ فێرگەی نیزامی لە پترزبۆرگ و بە چاوی فرمێسکاوی و دڵی تەنگەوە بردمی و بڕوای وابوو ئەو کارە بۆ بەختەوەریی من دەکا. دوای ئەوە ئیتر چاوم پێی نەکەوتەوە. چونکە ئەویش سێ ساڵ دواتر کۆچی دوایی کرد. لە تاوی من و براکەم ئەو سێ ساڵەی بە خەمباری و عازیەتباری ڕابواردبوو.

ئەوەی لە سەردەمی منداڵی وەبیرم دێ هەمووی شیرینە، چونکە هیچ بیرەوەرییەک بەقەد یەکەم ماڵی سەردەمی منداڵی خۆش نییە. هەڵبەت ئەگەر خۆشەویستی و تەباوڕەبایی لە بنەماڵەکەدا هەبێ. لە ڕاستیدا، بیرەوەریی شیرین لەوانەیە لە ماڵی ناخۆش و خراپیشدا هەبێ، بەو شەرتەی دڵ بە دوای شتە جوان و شیرینەکاندا بگەڕێ. لەگەڵ وەبیر هێنانەوەی ماڵەکەمان یاد و بیرەوەریی کتێبی پیرۆزیش سەرهەڵدەدا. ئەگەرچی منداڵ بووم، بەڵام زۆر تامەزرۆی خوێندنەوەی کتێبان بووم. ئەو کاتە کتێبێکم هەبوو، لەو زنجیرە کتێبانەی حەدیسی پیرۆز. کتێبەکە ناوی (چوارسەد حەدیسی سەردەمی کۆن و سەردەمی نوێ) بوو. فێری خوێندنەوەی بووم. ئێستاش ماوە و لە سەر تاقەکەیە. وەک یادگارێکی خۆشەویستی ڕابردوو هەڵمگرتووە. لەبیرمە هەشت ساڵم تەمەن بوو بەرەو هەستی مەزهەبی ڕاکێشرام. دایکم ڕۆژی دووشەممە بەر لە جێژنی پاک بۆ عیشای ڕەببانی بردمی بۆ ماڵی خودا، (وەبیرم نایە ئەو کاتە کاکم لەکوێ بوو). ڕۆژێکی خۆش بوو و وا دەزانم ئێستایە و لەبەر چاومە. کوانوویەک هالاوی لێهەڵدەستا و نەرم نەرم هەڵمەکە بڵاو دەبۆوە،

لە پەنجێرەیەکی چکۆڵەوە تیشکی خۆر دەهاتە ژووری و بە ژێر تاقی گومبەزییەکەوە تیشک و هەڵمەکە ئاوێتە دەبوون و شەپۆلی دەدا. ئەو دیمەنە تووشی هەیەجانی کردم، بۆیە تۆوی کەلامی خودا لە دڵمدا چەکەرەی دا. لاوێک هاتە نێوەڕاستی کڵێساکە، کتێبێکی گەورەی بەدەستەوە بوو. کتێبەکە ئەوەندە گەورە بوو و ئەو کاتە پێمسەیر بوو چۆنی دەتوانیّ، کتێبەکەی لە سەر ڕەحلێکی گەورە دانا، کردییەوە و دەستی کرد بە خوێندنەوەی. بۆ یەکەمجار تێگەیشتم لە کلیسای خودادا شتێک دەخوێننەوە. وەک هەقایەت دەیگێڕایەوە: لە ولاتی «عەوس» پیاوێک دەژیا، ئەو پیاوە دیندار و لەخودا ترس بوو. ماڵ و سامانێکی زۆری هەبوو، سەدان سەری وشتر و مەڕ و یەکسم هەبوو. منداڵەکانی بە تێروتەسەلی دەژیان و بە دیتنی ئەو هەموو ماڵ و سامانە خەنی بووبوون. باوکیان زۆری خۆش دەویستن و دوعای بۆ دەکردن. «لەوە دەترسا کوڕەکانی بەو خواردن و خۆشڕابواردنە تووشی گوناح بووبێتن.» وا ڕێکەوت شەیتان لەگەڵ کوڕەکانی خۆی چوونە بارەگای یەزدان. بەخودای گوت عەرز و ئاسمان و ژێر زەویش گەڕاوم. خودا لێیپرسی: چاوت بە ئەیوب کەوت، ئەو بەندە ئیمانداره‌م.؟» خودا کە ئاماژەی بەو بەندە پیرۆز و مەزنەی خۆی کرد لافی بە سەر شەیتاندا لێدا. شەیتانیش پێکەنینی بە قسەکەی هات. «ئەو بەندەیەت بە من بسپێرە، جا ئەوسا دەبینی چۆنت لێ یاخی دەبێ و دژایەتیت لەگەڵ دەکا و جنێوت پێدەدا.» خوداش ئەو پیاوە عادڵەی، کە ئەو هەمووە خۆش دەویست، دایە دەست شەیتان. شەیتانیش هەر لەڕێوە وەک برووسکە ڕاسا، کوڕەکانی و وشتر و مەڕ و ماڵات و سامانەکەی لە نێو برد و هیچی بە دەست نەهێشت. ئەیووب کە ئەوەی دی جلوبەرگی لەبەر خۆی داماڵی و سەری نایە عەرزی و هاواری کرد: «بە ڕووتی لەدایک بووم و بە ڕووتیش دەچمە ئامێزی خاک؛ خودا خۆی داویەتی و خۆشی ساندوویەتەوە. پیرۆز و مەبارەک بێ ناوی خودا هەتا دنیا بە دنیایە.»

باوکان و مامۆستایان، بمبوورن ئەگەر دەگریم، بە دەستی خۆم نییە. سەر لەبەری سەردەمی منداڵیم هاتۆتەوە بەرچاو و وەک ئەو کاتە بە سینگی منداڵێکی هەشت ساڵانە هەناسە دەکێشم. وەک ئەو سەردەمە هەست بە ترس و شادی و سەرسوڕمان دەکەم. ئەو کاتە ڕەوەی وشتر خەیاڵیان داگیر کردم. شەیتانیش کە ئاوا قسەی لەگەڵ خودا دەکرد و خوداش کە ئاوا بەندەکەی خۆی تووشی زیان و نابوودی کرد، بەندەکەشی کە هاواری دەکرد: «پیرۆز و مەبارەک بێ ناوی تۆ، شوکرانەبژێرم، ئەگەرچی ئەو سزا قورسەت پێڕەوا دیم.» دوای ئەوە ئاوازی نەرم و دڵبلاوێنی کلێسە: «ئیزن بفەرموو با دوعا و پاڕانەوەم بگاتە بارەگاکەت.» دیسان هالاو لە کوانووکە هەستا و قەشە چۆکی دادا و دەستیکرد بە پاڕانەوە. لەوەبەدواوە - هەر دوێنێ دیسان ئەو کتێبەم خوێندەوە - قەت نەمتوانیوە ئەو چیرۆکە پیرۆزە بخوێنمەوە و فرمێسک هەڵنەوەرێنم. ئەو چیرۆکە چ گەورەیی و ڕازێکی قووڵی تێدایە. دواتر هێندێ وشەی سووک و لۆمە و لەقەم و وتەی گاڵتەجاڕانەم بە گوێ گەیشتەوە، تاقمێکی هەرزە و لەخۆبایی دەیانگوت: «خودا خۆشەویستترین بەندەی خۆی بۆ ڕابواردن دایە دەست شەیتان، جگەرگۆشەکانی لێستاند، ئازای ئەندامی بە کوان و دمەڵ دارزاند و بێچارە بە تەڵەزمە بەرد و لەتکە سواڵەت کێم و زووخی لەشی خۆی پاک دەکردەوە. جەستەی هەموو کرمەڕێز بوو. ئەوەشی تەنیا لەبەر ئەوە کرد، تاکو لەبەر چاوی شەیتان خۆی ڕانێ و بڵێ: چاو لێکە بەندەی من لەبەر ئەشقی من ئامادەیە چ ئازار و ئەشکەنجەیەک تامڵ بکا!» بەڵام گەورەیی ئەو لە ڕاستیدا وەک ڕازێکی شاراوە وایە و لەو کتێبەدا ژیانی هەرمان و ژیانی مرۆڤی خاکی پێکەوە گرێدراوە و لە سەر هەقیقەتی دنیایی هەقیقەتی جاویدانی ڕۆنراوە. خوڵقێنەر ڕاست وەک ڕۆژانی سەرەتای خوڵقان کە هەموو ڕۆژێکی بەو مەتح و پیاهەڵدانە ڕادەبوارد: «ئەوەی خوڵقاندوومە بێحیکمەت نییە، » چاو لە ئەیووب دەکا و دیسان پەسنی دەسکاری خۆی دەکا. ئەیووبیش بە مەتحکردنی خودا و جگە لە ئەو خۆی بە بەندەی تەواوی ئافەریدەکانی خودا دەزانێ هەر لە ڕۆژی بەرێوە هەتا دنیا بە دنیایە، چونکە

هەر لەبەر ئەو کارە بۆتە پێغەمبەر و ئەو ئەرکەی پێ‌سپێردراوە. خودایەگیان چەندە کتێبێکی چاکە. (کتێبی ئەیووب) چەندەی پەند و ئامۆژگاری تێدایە! کتێبی پیرۆزیش خۆی زۆر کتێبی چاکە، چ مۆجزەیەکە و لەڕێی ئەوەوە چ تواناییەک بە مرۆڤ دراوە. وەک چوارچێوەیەک وایە دنیا و مرۆڤ و سروشت و زاتی مرۆڤی تێگیراوە و هەموو شتێکی تێدایە، یاسایەکە بۆ هەموو شتێک و هەموو سەردەمێک. چەندەی ڕاز و نهێنی تێدایە و ئاشکرا کراوە. خودا سەر لەنوێ ئەییووبی بووژاندەوە و سارێژی کرد. دیسان ماڵ و سامانی پێداویە. ساڵانێکی زۆر ڕادەبرێ و خودا منداڵی دیکەی دەداتێ و دڵیان پێدەبەستێ. بەڵام چۆنی ئەو منداڵە تازانە خۆش بوێ، کە منداڵەکانی پێشووی نەماون. داخی ئەوان جەرگی بەسێڵەوە داوە؟ بە وەبیر هێنانەوەی ئەوان چۆن دڵ بەو منداڵە تازانە ببەستێ، ئەگەرچی زۆریش خۆشەویست بن؟ بەڵام دەیتوانی، دەیتوانی. ئەوەش ڕازی گەورەی ژیانی مرۆڤە کە خەمی کۆنە وردە وردە لەبیر دەچێتەوە و شادی و خۆشی جێگای دەگرێتەوە. هێمنایەتیی پیری جێگای بزۆزی و کەفوکوڵی لاوی دەگرێتەوە. من هەموو ڕۆژێک خۆری تازە هەڵاتوو تەقدیس دەکەم و وەک ڕابردوو دڵم بۆ دیداری تامەزرۆیە. بەڵام ئێستا خۆرنشینم خۆشتر دەوێ، پڕشنگە بەرز و خوار و خێچەکانی و ئەو یادە نەرموونیانەی لەگەڵ پڕشنگی خۆر دەژییتەوە. وێنەگەلێکی زۆر خۆشەویست کە سەرلەبەری تەمەنی درێژ و پڕ بەختەوەریم ـ لە سەروو ئەوەشەوە «هەقیقەتی ئاسمانی» کە پڕشنگدار و بەخشندە و ئاشتیهێنەرە ـ پێوە گرێداوە. تەمەنم خەریکە دەگاتە کۆتایی، ئەوەم لێڕوونە، بەڵام هەر تاقە ڕۆژێک لە تەمەنم مابێ، هەستدەکەم ژیانی خاکیی من لەگەڵ ژیانی تازەی ئازاد و نەناسراوـ بەڵام نزیک ـ لە پێوەندی‌دایە و نزیک بوونەوەکەی گیانم وەلەرزین دەخا، زەینم ڕووناک دەکاتەوە و دڵم کەلاوڕێژ دەکا لە فرمێسکی تاسە و شادی.

هاوڕێیان و مامۆستایان، زۆر جاران بیستوومە لەم دواییانەشدا زۆر جار بەگوێم دەگاتەوە ـ قەشەکان و لە سەروو ئەوانیشەوە قەشەی گوندەکان، لە هەموو لایەکەوە لە دەست داهاتی کەم و چارەنووسی لێڵیان سکاڵایانە. بە

ڕاشکاوی دەڵێن و تەنانەت دەشینووسن ـ خۆم خوێندوومەتەوە ـ بە هۆی داهاتی کەمەوە، دڵ ساردن و تاقەتیان نییە کەلامی خودا فێری خەڵک بکەن. ئەگەر پێڕەوانی لووتێر و لەدین وەرگەڕاوان بێن و بەندەکانی خودا گومڕا بکەن، ئەوان کاریان بە سەریانەوە نییە و بەریان لێبەرەڵڵا دەکەن، چونکە مووچە و بەراتەکەیان کەمە. خودا بکا داهاتەکەیان زۆر بێ، چونکە زۆر بەلایانەوە گرینگ و خۆشەویستە، سکاڵاشیان بە جێیە و هەقیانە. بەڵام ڕاستتان دەوێ ئەگەر کەسێک لەو بارەوە گلەیی و سکاڵاشی هەبێ، نیوەی ڕاستی خەتای ئێمەیە. چونکە لەوانەیە ئەو کەسە سەری نەپەرژێ و بڵێ هەموو کاتێک سەرقاڵی کار و باری ئاییننییە. بەڵام هەموو کاتێک وانییە، تەنانەت لە حەوتوودا سەعاتێکی وەخت هەیە بۆ زکر و تاعەتی خودا. سەرتا سەری ساڵ کار ناکات و دەستیش لە ڕەش و سپی نادا. وا چاکە حەوتووی جارێک، سەعاتێک لە ئێوارە، سەرەتا ئەگەر بۆی بلوێ منداڵانیش لە خۆی کۆ کاتەوە ـ باوکی ئەو منداڵانە بە گوێیان دەگاتەوە و ئەوانیش دێن بۆ لای. بۆ ئەو کارەش پێویست ناکا ژووری گەورە ساز بکەن. چاکتر وایە ئەو بیان بات بۆ ماڵەکەی خۆی. خۆ ماڵەکەی بە قوڕناگرن. تەنیا سەعاتێک لەوێ دەبن. وا باشە ئەو کتێبە بکاتەوە و دەستبکات بە خوێندنەوەی، بە بێ ئەوەی قسەی کەڵەکەڵە و بێ سەرە و بەرە بکات. هێدی و دڵۆڤان و دوور لە دەمار و خۆنواندن. شاد بێ لەوەی بۆیان دەخوێنێتەوە و ئەوانیش بە تامەزرۆیی گوێیان ڕاگرتووە. ئەو خۆی کەلامی خودای خۆش دەوێ و تەنیا جار و بار ڕادەوەستێ و هێندێ وشە و زاراوە هەیە خەڵکی ڕەشۆکی تێیناگەن، بۆیان شیدەکاتەوە. خەمتان نەبێ، ئەوان لە هەموو شتێک دەگەن. دڵی ئیماندار لە هەموو شتێک دەگا! وا باشە بە سەر هاتی ئیبراهیم و سارایان بۆ بخوێنێتەوە، ئیسحاق و ڕەبکا، چۆنییەتیی چوونی یەعقووب بۆلای لابان و زۆران گرتن لەگەڵ خودا لە خەونیدا و بە گوتنی «ئەم شوێنە پیرۆزە» شوێن لە سەر زەینی ئیمانداری لادێیی دادەنێ. واباشە بخوێنێتەوە، بەتایبەت بۆ منداڵان، کە براکانی یوسف ئەو منداڵە نازدار و دڵناسکە، ئەو پێغەمبەرەیان خستە نێو

بیرەوە و بە باوکیان گوت گورگ خواردوویەتی. کراسە لە خوێن شەلاڵەکەشیان پیشان باوکیان دا. وا باشە بۆیان بخوێنێتەوە کە براکانی دواتر بۆ وەدەست هێنانی گەنم چوون بۆ میسر، یوسف لەوێ دەسەلاتدارێکی گەورە بوو و ئەوان نەیان ناسییەوە، ئازاری دان و تۆمەتباری کردن و بنیامینی برای بە بارمتە لای خۆی گلدایەوە، هەمووشی لە بەر خۆشەویستی: « خۆشم دەوێن و لە بەر خۆشەویستی ئازارتان دەدەم.» چونکە قەتی لە بیر ناچێ لە گوێ بیرەکە و لە بە قرچە قرچ و کوڵەکوڵی هەتاو فرۆشتیان بە بازرگانان. ئەویش لاقی لە عەرزی وەژاندبوو و گریابوو، لە بەر براکانی پاڕابۆوە بە کویلەتی نەی فرۆشن بە کەسێکی نەناس و غەوارە. بەڵام کاتێک چاوی پییان کەوت. دوای ئەو هەموو ساڵە، لە ڕادەبەدەر ڕێزی لێگرتن، بەڵام لە بەر خۆشەویستیی زۆر ئازاریدان. ئاخریش دڵی بڕوایی نەدا ئازار چێشتنەکەیان ببینێ، ڕۆیشت لەلایان و لە سەر جێوبانەکەی ڕاکشا و دەستیکرد بە گریان. دوای گریانێکی زۆر، چاوی سڕی و شاد و لێو بە بزە گەڕایەوە بۆ لایان و گوتی: «براکانم، من یوسفی براتانم!» چاکتر وایە زیاتریان بۆ بخوێنێتەوە کە یەعقووبی پیر کاتێک بۆی دەرکەوت، کوڕە نازدارەکەی زیندووە، شادی لە دڵی گەڕا. وڵاتەکەی خۆی بەجێ‌هێشت و چوو بۆ مەسر و لە وڵاتی غەریبایەتی کۆچی دوایی کرد. پێشبینیی گەورەی خۆی کە لە ماوەی تەمەنیدا وەک ڕازێکی سەر بە مۆر لە دڵی خەمبار و سەبووریدا شاردبوویەوە، بە میرات بەجێی‌هێشت و ئەویش ئەوە بوو، لە ڕۆڵەکانی و لە یەهوودا و هیوای گەورەی جیهان مەسیحای ڕزگاریدەردا سەر هەڵدەدا.

باوکان و مامۆستایان، بمبوورن و قەڵس مەبن، ئەگەر وەک منداڵ دەستم کردووە بە گێڕانەوەی باسێک کە هەمووتان لە من باشتری دەزانن و سەد هێندەی من شارەزایانەتر دەتوانن بەیانی بکەن و چەنەچەن ناکەن. وەک جەزم بووبێتم وایە، گریان بەدەست خۆم نییە و داوای لێبوردنتان لێدەکەم، چونکە هێندە ئاشقی کتێبی پیرۆزم بۆیە بە خوێندنەوە و باسکردنی ئەو کتێبە حاڵم لێدێ. لێی گەڕێن ئەویش ـ قەشەی خودا ـ بگری و دڵنیابێ بیسەرانی تووشی

دڵەکوتێ دەبن. تەنیا تۆوێکی زانست پێویستە ـ لە دڵی خەڵکی ڕەشۆکیدا دایچێنی و لە نێو تاریکاییی گیانیدا، لە کاتی ڕمووده بوون بە تاواندا، وەک خاڵێکی ڕووناک، وەک بیرهێنەرەوێیەکی گەورە، هەر دەمێنێ. پێویست بە فێرکردن و باسکردنی زۆریش ناکا، بە ئاسانی لە هەمووی تێدەگا. پێیان وایە خەڵکی ڕەشۆکی تێناگەن؟ چیرۆکی پڕدڵەخورپەی یەستری جوان و وەشتیی لەخۆباییان بۆ بخوێننەوە. یان چیرۆکی پڕ مۆجزەی یونس لە زگی ماسیدا. حەدیسەکانی پێغەمبەریشتان لە بیر نەچێ، ئەو حەدیسانە بە تایبەت لە ئینجیلی لۆقا هەڵبژێرن. (ئەو کارەی من کردم) پاشان کردەوەی پێغەمبەران و بەسەرهاتی ئیمان هێنانی «پۆلس» پێغەمبەر، (ئەم بە سەرهاتەتان بە هیچ شێوەیەک نابێ لە بیر بچێ) ژیاننامەی پیاوچاکان و شەهیدانیان بۆ بخوێننەوە، بۆوێنە، ژیاننامەی ئالکسی ئەو پیاوەی خودا، هەر وەها لە سەروو هەموویانەوە، مریەمی مەسری ئەو شەهیدە پاک و غەیب وێژەی خودا ـ دەتوانن بە ئەو چیرۆکە سادە و ساکارانە دڵیان داگیرن بکەن و ببنە خۆشەویستیان. گوێ بە دەستەنگی و هەژاری مەدەن، حەوتووی سەعاتێک بۆ ئەو کارە تەرخان بکەن، تەنیا سەعاتێکی ناقابیل. جا ئەو کاتە بۆتان دەردەکەوێ خەڵکی ئێمە چەندە خێرخواز و هەقناسن و سەد هێندەی کارەکەتان هەق و مزتان دەدەنێ.

سەریان لە دلۆڤانیی قەشە سوڕ دەمێنێ و وشە هاندەرەکانی لە گوێ دەگرن، بیری لێدەکەنەوە و بە دڵخوازی خۆیان لە کاتی کاری مەزراوماڵێدا یارمەتیی دەدن و لە ڕادەبەدەر ڕێزی بۆ دادەنێن ـ بەم شێوەیە گرفتی ماڵێی پیاوی ئاینی چارە سەر دەکرێ. ئەو مەسەلەیەش هێندە سانایە جاری وایە پیاو نازانێ چۆنی بدرکێنێ و دەترسێ پێی پێبکەنن و لە گەڵ ئەوەشدا زۆر ڕاستە! ئەو کەسەی ئیمانی بە خودا نەبێ، باوەڕی بە خەڵکی خوداش نابێ. ئەو کەسەی بڕوای بە خەڵکی خودا هەبێ، ئیمانی بە پاکی و گەورەیی خوداش دەبێ. ئەگەرچی تا ئەو کاتە بڕواشی پێی نەبووبێ، ئاخری بەو ئاکامە هەردەگا.

تەنیا خەڵک و توانایی ڕۆحی داهاتوویان دەبێتە هۆی ئیمان هێنانی بێ دینەکانی ئێمە، ئەو کەسانەی کە خۆیان لە زێدەکەیان نامۆ کردووە.

کەڵکی کەلامی مەسیحیش تەنیا ئەوەیە بیکەینە سەر مەشقی خۆمان. بەبێ کەلامی خودا خەڵک چەواشە دەبن، چونکە گیانیان تینووی کەلام و هەموو شتێکی چاک و پاقژە.

بەلاوی، نزیکەی چل ساڵ لە مەو بەر بۆ کۆکردنەوەی یارمەتی بۆ کلێسەکەمان، من و باوە ئانفیم سەر لە بەری ڕووسیامان لێکدا، شەوێک لە قەراغ چۆمێکی گەورە لە لای دەستەیەک ماسیگری پاپۆڕەوانماینەوە. لاوێکی جوانچاکی لادێیی، هات بۆ لامان، هەژدە ساڵان بوو. ناچار بوو ڕۆژی دوایی بەیانی زوو بە هەڵەداوان بگەڕێتەوە و بار و بەندیلی بازرگانێک بەرێ بۆ ڕۆخی ڕووبارەکە. تێگەیشتم بە چاوی ڕوون و نەرم لە هەمبەرما وێستاوە و چاوی لە چاوم بڕیوە. شەوێک لە شەوانی مانگەشەوی گەرم و ئارامی مانگی ژوئەن بوو، تەمێکی فێنک لە چۆمە بەرینەکە هەڵدەستا. شڵپە شڵپی ماسییەکمان بیست. پەلەوەر، چووبوونەوە هێلانەکەیان، هەموو شتێک جوان و بێدەنگ مەتحی خودایان دەکرد. تەنیا من و ئەو کوڕە لاوە خەومان لێنەکەوتبوو و باسی جوانیی ئەم دنیایەی خودا و ڕازە گەورەکەیمان دەکرد. لەم دنیایەدا چڵە گیاو کوللە و مێروو و قالۆنچەی زێڕین، هەموویان بەشێوەیەکی سەر سوڕهێنەر ڕێ و شوێنی خۆیان دەناسن. ئەگەر چی شعووریان نییە، بەڵام شایەدی بۆ ڕازی خودا دەدەن و سات لە دوای سات بە ئەنجامی دەگەیەنن. دیتم ئەو لاوە کەوتۆتە دڵەکوتێ، پێیگوتم لێرەوارو باڵندەکێوییەکانم خۆش دەوێ. باڵندە باز بوو، دەنگی هەموو فڕندەکانی دەناسی و بانگی دەکردن. گوتی: «هەموو شتێکی ئێرە باشە، هیچ شتێکم لە جەنگەڵ باشتر پێشک نایە.»

لە وەڵامیدا گوتم: «بەڕاستی وایە، هەموو شتێک باش و جوانە، چونکە هەقیقەتە. بڕوانە ئەسپ، ئەو ئاژەڵە زەلامەی زۆر لە مرۆڤ نزیکە، یان گای فەقیر و بەستەزمان، بژیوی مرۆڤ دابین دەکا، کاری بۆ دەکا، بڕوانە چەندە

دەرهەق بە مرۆڤ وەفادار و سەر لە پێناون. ئەگەرچی زۆر جار دڵڕەقانە لێیان دەدەن، چ دڵنیایی و نەرمی و جوانییەک لە چاویاندا دیارە! زانینی ئەوەش کە تاوان تخوونیان ناکەوێ، زۆر دڵهەژێنە، چونکە هەموویان بەگشتی ـ جگە لە مرۆڤ ـ بێتاوانن و مەسیح بەر لە ئێمە لە گەڵ ئەوان بووە.»

پرسیی: «بۆ مەسیح لە گەڵ ئەوانە؟»

گوتم: «جگە لەوە نابێ، چونکە وشە بۆ هەمووانە. تەواوی ئەوەی ئافرێنراوە و لە عەرز و ئاسمانانە، تەنانەت گەڵا و چرۆش، هەوڵی گەیشتن بە وشەیانە. مەتحی شکۆی خودا دەکەن و لە هەمبەر مەسیحدا فرمێسک هەڵدەوەرێنن. ئەوەش بێ ئیختیار و بە هۆی ڕازی ژیانە بێ تاوانەکەیانەوە ئەنجامدەدەن.» گوتیشم: «لەو پەڕی لێڕەوار، ورچی دڕندە و بەسام دەگەڕێ، لەگەڵ ئەوەشدا ترسناک و دڕندەیە بەڵام بێ تاوانە.» هەروەها گوتم:» ڕۆژێک ورچێکی پیر دەچێ بۆ لای پیاوێکی مەزن و ئیماندار، ئەو پیاوچاکە لە چارداخێکی چکۆڵەی نێو دارستانێکدا دەژیا، پیاوە زۆر دڵۆڤانانە و بێترس دەچێ بۆ لای و لەتێ نانی پێدەدا و دەڵێ: «بڕۆ مەسیح پشت و پەنات بێ»، ورچەش زۆر بە هێوری بەقسەی دەکات و بێ ئەوەی ئازاری پێبگەیێنێ، ملی ڕێ دەگرێ و دەڕوا. لاوەکە زۆر شادمان بوو کە ورچەکە ئازاری بەو پیاوچاکە نەگەیاند و بۆ ئەوەش کە مەسیح پشت و پەنای ئەویش بوو، گوتی: «بەڕاستی خۆشە، ئەو کارانەی خودا چەندە باش و جوان و بەڕێوجێن!» ئارام و دڵخۆش چووە ماڵێ فکرەوە. بۆم دەرکەوت کە ئەولاوە تێدەگا. پاشان وەک پەپوولەیەکی بێ تاوان خەوی لێکەوت. جحێڵی چەندە خۆشە لە خودا بەزیاد بێ! منیش هەتا خەوم لێکەوت هەر دوعام بۆ کرد. خودایە هێمنایەتی و ڕووناکی بە سەر بەندەکانتدا ببارێنە.

**(٣) بیرەوەریی سەردەمی لاویی باوە**

**زووسیما، بەر لەوەی ببێتە ڕاهیب. دوئێل**

ماوەی هەشت ساڵ لە فێرگەی نیزامی پترزبورگ بووم. بەو فێربوونە نوێیەی ئەوێ زۆربەی بیرەوەرییەکانی منداڵیم ڕەش داگەڕان، ئەگەرچی لە بیرم نەچوونەوە. بیر و بڕوا و خووخدەیەکی تازەم بە خۆوە گرت و بوومە بوونەوەرێکی زاڵم و هیچوپووچ تا ڕادەیەک درندە. تەڕپوشی و ڕێز و هەڵسوکەوتی کومەڵایەتی و زمانی فەڕەنسی فێر بووم. بەڵام هەموومان، کە خۆشم وابووم، بە چاوی مێگەلێک لە سەربازەکانمان دەڕوانی. لەو بارەوە ڕەنگە من لە ئەوانی دیکەش خراپتر بووم. چونکە لە هەموو هاوڕێکانم زیاتر کارتێکەریم لە سەر بوو. کاتێک بەجلوبەرگی ئەفسەرییەوە لە فێرگەکە چووینە دەرێ، ئامادە بووین لە بەر خاتری شەرافەتی گوردانەکەمان گیانی خۆمان فیدا بکەین، بەڵام هیچکام لە ئێمە لە مانای ڕاستەقینەی شەرافەت نەدەگەیشتین، ئەگەر کەسێکیش تێگەیشتایە دەبوو بە گاڵتەجاڕی هەمووان. شانازیمان بە مەستی و بێبەندوبارییەوە دەکرد. ناڵێم زاتەن خراپ بووین، تەواوی ئەو لاوانە کەسێکی باش بوون، بەڵام ئاکاریان خراپ بوو، ئاکاری منیش لە هەمووان خراپتر. ئەوەی خراپتریشی دەکرد، گەیشتن بە پارە بوو. هەر بۆیە بەرە و عەیش ونۆش خوشیم و لە نێو گۆمی سەرەڕۆیی و خدەی لاوانەدا نوقم بووم و لە هیچ کارێکی ناحەز نەدەپرینگامەوە. هۆگریم بە متاڵا بوو، بەڵام سەیرە ئەو کاتە کتێبی پیرۆزم لێکنەدەکردەوە. ئەگەرچی هەمیشە لە بەر دەستمدا بوو، قەتی لێ‌هەڵنەدەبڕام. لەڕاستیدا ئەو کتێبەم «بۆ ڕۆژ و سەعات و بۆ مانگ و ساڵ» هەڵگرتبوو، ئەگەرچی تێیەدەگەیشتم.

دوای چوار ساڵ ژیان بەو شێوەیە، وا ڕێکەوت چووم بۆ شارۆچکەی... گوردانەکەمان لەوێ جێگیر بووبوو. خەڵکی ئەو شارۆچکەیەم بە میوانگر و دەوڵەمەند و خۆش گوزەران هاتە بەرچاو. چونکە خاوەن خولقوخوویەکی دڵتەڕو شادانە بووم و حەزم لە خۆش ڕابواردن بوو، لە هەموو لایەک ناوبانگم دەرکردبوو و هەر کوێ دەچووم بەڕووی خۆشەوە پێشوازییان

لێدەکردم. پاشان بارودۆخەکە گۆڕاو درگایەکی دیکەم لە بەردەمدا کرایەوە. دڵم کەوتە داوی کچێکی جوان و چاوکراوەوە، کچە لە بنەماڵەیەکی ڕێزدا بوو وخاوەنی خووخدەیەکی جوان و بەرز بوو. ئەوان دوڵەمەند و خاوەن پێگە و دەستڕۆیشتوو بوون. بە گەرموگوڕی و دڵفراوانی وەریان دەگرتم و هەستم دەکرد کچە بە ئەشق و خۆشەویستییەوە چاوم لێدەکا و ئەو خەیاڵەش ئەوەندەی دیکە ئاوری لە دڵم بەردابوو. دواتر هەستم بەوەکرد و بە تەواوی تێگەیشتم کە کوڵوکۆی عەشقی لە ناخمدا نەبووە، بەڵکو تەنیا لە خووخدە و بیرۆکەی بەرزی گەیشتووم، کە لەڕاستیدا چارەیەکم جگە لەوە نەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو سەردەمە لەبەر بادیهەوایی و خۆبەزلزانی نەمتوانی پێشنیاری خوازبێنیی پێبکەم، چونکە هەڵبڕان لە ژیانی تەنیایی و بزوزی سەردەمی لاوی و گیرفانی پڕ لە پارە تووشی خەفەت و پەژارەی دەکردم. هەر بۆیە هاتمە سەر ئەوەی هەتا ماوەیەک خۆ لەو دارەتە نەدەم و خۆم ڕاگرم. ئەو کاتە لە ناکاو فەرمانمان پێدرا بۆ ماوەی دوومانگ بچین بۆ شوێنێکی دیکە.

دوای دوو مانگ، کاتێ گەڕاینەوە بۆم دەرکەوت کچە لە گەڵ مالیکێکی دەوڵەمەندی جیرانیان زەماوەندی کردووە، پیاوێکی زۆر باش و دڵۆڤان بوو. هێشتا لاو بوو، بەڵام لە من بەتەمەنتر بوو. چاکترین زاوا بوو بۆ بنەماڵەی بووک و من وەک ئەو نەدەهاتمەوە. خاوەنی خوێندەواریی باڵا بوو، کە من ئەوەشم نەبوو. ئەو بارودۆخە چاوەڕوان نەکراوە و هەواڵە تاڵە وای تووشی داماوی کردم، بە جارێ زەینم شڵەژا و لەوانە بوو شێت بم. لەوەش خراپتر ئەوەبوو ـ کاتێک بۆم دەرکەوت ئەو مالیکە لاوە ماوەیەکی زۆر لەگەڵ کچە دەزگیران بوون و لە ڕاستیدا چەند جاریشم لە ماڵی ئەوان دیتبوو. بەڵام فیزو هەوا کوێری کردبووم و بەو پێوەندییەم نەدەزانی. ئەوەش زۆری خەفەتبار کردم کە هەموو کەس بەوەی زانیبوو بەڵام من نەمزانیبوو. ڕقێکی کتوپڕ و ئاگراوی ناخی داگرتم. بە ڕەنگیکی بزرکاو و نێوچاوانی گرژەوە هاتەوە بیرم کە چەند جار ویستبووم خۆشەویستی خۆم دەربڕم، بەڵام چونکە خۆی شلوێ نەدەکرد و وریاییشی پێنەدەدام، بەو ئاکامە گەیشتم کە

ڕەنگە لەو ماوەیەدا پێم پێکەنیبێ و بە گەوجی زانیبێتم. هەڵبەت دواتر بیستم و وەبیرم هاتەوە کە قەت لەو کیژە زانایە ناوەشێتەوە پێم پێکەنیبێ. بە پێچەوانە هەر کاتێک من دەمویست هەستی خۆم دەربڕم بە فیڵێک باسەکەی دەگۆڕی و مەبەستێکی دیکەی دێنایە گۆڕێ. بەڵام ئەو کاتە نەمدەتوانی بیر بکەمەوە و لە ناخەوە تامەزرۆی تۆڵە بووم. ئێستا سەرم سوڕماوە کە دێتەوە بیرم ئەو کاتە هەستی تۆڵە ساندنەوەم زۆر زاڵمانە بووە و لەگەڵ سرووشتی ڕۆحیی من سازگار نەبوو. چونکە خاوەنی خولق و خوویەکی نەرمونیانم، ناتوانم بۆ ماوەیەکی زۆر ڕقی کەسێک لە دڵی خۆمدا ڕاگرم. هەر بۆیە دەبوو خۆم تووڕە و تۆسن بنوێنم و لە ئاکامدا تووشی سەرەڕۆیی و قین و بوغزێکی ڕەش هاتم.

چاوەڕێی دەرفەتێک مامەوە و هەڵکەوت لە حوزووری تاقمێکی زۆر سووکایەتی بە ڕەقیبەکەم بکەم. لە خۆڕا بەهانەیەکم دییەوە و سووکایەتیم پێکرد. کاتێک بیروڕای خۆی سەبارەت بە ڕووداوە گرینگەکەی ساڵی ٦ دەربڕی، پێی پێکەنیم و شکاندمەوە. بە وتەی خەڵک سووکایەتییەکەشم زۆر زیرەکانە و شوێن دانەر بوو. ئەو کاتە داوام لێکرد لەو بارەوە زیاتر بدوێ و کارەکەشم هێندە بێ ئەدەبانە بوو بە جارێ پێی تێکچوو. چونکە هاوشانی یەکتر نەبووین و من لە ئەو کەم تەمەنتر بووم، پلە و پایەشم لە کۆمەڵدا لەو لە خوارتر بوو. بۆیە کاسەی سەبری پڕ بوو و ئامادە بوو بۆ دۆئێل لە گەڵمدا. دواتر بۆم دەرکەوت بە هۆی ڕق و بە خۆداشکانەوەی لەو کۆڕەدا بڕیاری داوە سینگی خۆی بە گوللەوە بنێ، هەتا ڕادەیەک بەخیلیشی پێدەبردم، ڕەنگە بەر لە زەماوەندەکەشی، سەبارەت بە ژنەکەی هەر وا ئێرەیی پێ بردبێتم. بۆیە پێیوابوو ئەگەر لە هەمبەر ئەو سووکایەتییەی مندا بێدەنگ بێ و خۆی لە دوئێل ببوێرێ و بە گوێی ژنەکەی بگاتەوە، لەوانە بوو لە بەر چاوی سووک بێ و خۆشەویستییەکەی دەرهەق بە ئەو ساردبێتەوە. لە زووترین کاتدا شایەدێکم پەیدا کرد، ئەویش پێشەنگی هێزەکەمان بوو. لەو

سەردەمەدا دوئێل سزای قورسی بە دواوە بوو، بەڵام لە نێو ئەفسەراندا باو بوو ـ دەمارگرژیی دڕندانە هێندێ جار ئاوا بە هێز دەبێ و ڕیشە دادەکوتێ.

کوتاییی مانگی ژوئەن بوو. بڕیارماندا سەعات حەوتی ڕۆژی دوایی لە قەراغ شار یەکتر ببینینەوە ـ بەڵام ئەو کاتە ڕووداوێک بووە هۆی گۆڕان و گەڕانەوەم لە ژیاندا. شەوێ، کاتی گەڕانەوە بۆ ماڵێ ڕقم لە ـ ئافانسی ـ خزمەتکارەکەم هەستا و بە هەموو هێزی خۆم دوو زللەم خێواندە لاڕوومەتی و خوێن بە دەمولووتیدا هاتە خوارێ. ئەو کوڕە فەقیرە زۆر لە ماوەی سەربازییەکەی تێنەپەڕیبوو، پێشتریش لێمدابوو بەڵام نەک ئاوا دڕندانە. بڕوام پێبکەن ئەگەرچی ئەو کارە چل ساڵ لەمەوبەر بوو بەڵام بە شەرم و ژانەوە دێتەوە بیرم. چوومە سەر جێگاکەم و نزیکەی حەوت سەعات خەوتم. کاتێک لە خەو ڕاپەڕیم، ڕۆژ هەڵاتبوو. هەستام ـ ئیتر نەمتوانی بخەوم ـ چوومە بەر پەنجێرەکە و کردمەوە. بەرەوڕووی باخەکە ڕاوەستام، خۆر بەرز ببۆوە، گەرم و جوان بوو، باڵندە دەیان جریکاند. لە دڵی خۆمدا گوتم: یانی چی، هەستێک لە دڵمدایە وەک پەستی و شوورەیی دەچێ؟ ڕەنگە هۆی ئەوە بێ خوێنی کەسێک دەڕێژم؟ لە بەر خۆمەوە گوتم: نا، پێموانییە ئەوە بێ. هی ئەوەیە لە مردن، لە کوژران دەترسم؟ نا؛ نا ئەوەش نییە... لە پڕ تێگەیشتم چیە. هۆی ئەوە بوو شەوی ڕابردوو لە ئافانیسم دابوو! ئەو دیمەنە لە بەر چاوم لا نەدەچوو، دەتگوت دیسان دووپات دەبێتەوە؛ ئافانسی بەرەوڕووم ڕاوەستا بوو و من بە زللە وەری گەڕابوومێ و ئەو قیت ڕاوەستا بوو، هەر دوو دەستی بەردابۆوە و سەری هەڵێنابوو و چاوی لە چاوم بڕیبوو و دەتگوت مەشق دەکا. لەگەڵ هەر زەبرێک لاتراسکەی دەبەست و تەنانەت نەیدەوێرا دەستی هەڵێنێتەوە و بە بەر چاوییەوە بیگرێ. ئێستا مرۆڤێک کە تووشی ئەم ڕۆژە ڕەشە بووە، هەر وەها مرۆڤێک کە هاوڕەگەزی خۆی ئازاردەدا! چ جینایەتێک! دەتگوت خەنجەرێک هەموو جەستەم ونجڕ ونجڕ دەکا. لە کاتێکدا کە خۆر هەڵاتبوو و گەڵای داران دەشنینەوە و دەدرەوشانەوە و پەلەوەر جریوەیان دەهات، ڕاوەستا بووم، بەڵام دەتگوت

زمانم لە گۆ چووە... دەستم بە بەر چاومەوە گرت و خۆم دا بە سەر جێوبانەکەمدا و دەستمکرد بە فرمێسک هەڵوەراندن. پاشان مارکێلی برامم وەبیر هاتەوە کە لە سەرەمەرگدا بە خزمەتکارەکانی گوتبوو: «خۆشەویستەکانم، بۆ چی خزمەت بە من دەکەن، بۆ خۆشتان دەوێم، کوا من شیاوی ئەوەم ئێوە خزمەتم پێبکەن؟» بە زەینمدا هات بڵێی شیاوی ئەوە بم؟ ئاخر کوا من بۆ ئەوە دەبم کەسێکی دیکە، هاوڕەگەزێک، خوڵقاو لە سەر شێوە و ئەدگاری خودا، خزمەت بە من بکا؟ بۆ یەکەم جار لە ژیانمدا ئەم پرسیارە خۆی بە سەردا سەپاندم. کاکم گوتبووی: «دایە گیان، خۆشەویستەکەم، لە ڕاستیدا هەمووومان لە هەمبەر یەکتریدا بەرپرسین، مخابن مرۆڤەکان لەوە تێناگەن. ئەگەر لەو بگەیشتبایەن، دەستەوبەجێ دنیا دەبووە بەهەشت.»

هەروا کە دەگریام، لە دڵی خۆمدا گوتم: «خودایە دەکرێ ئەمەش درۆ بێ؟ لە ڕاستیدا، ڕەنگە من لە خەڵکی زیاتر ئەرکی بەرپرسایەتیم لە سەر شان بێ و لە هەموو خەڵکی دنیاش تاوانبارتربم» لە ناکاو، هەر چی هەقیقەتە بەڕووناکی لە بەر چاوم زەق بوونەوە: دەمویست چبکەم؟ دەمویست مرۆڤێکی باش و زیرەک و بە شەڕەف بکوژم کە هیچ خراپەیەکی بۆ من نەبووە. ژنەکەی هەتا ئاخری تەمەن لە بەختەوەری بێ بەش بکەم و تووشی ئازار بێت و دیقبکات. بەم جۆرە لە سەر پێخەفەکەم ڕاکشام وگوێم بە تێپەڕینی کات نەدا. لە ناکاو شایەدەکەم ـ پێشەنگەکە ـ بە دەمانچەوە هات بمبا.

گوتی: « زۆر چاک لە خەو هەستاوی، وەختی ئەوەیە برۆین، هەستە!» نەمدەزانی چبکەم. بەبێ بڕیار بەملا و بەولادا هەڵدەخولام. بەو حاڵەشەوە بەرە و عارەبانەکە کەوتینەڕێ. پێمگوت: «تاوێک لێرە ڕاوەستە، خێرا دەگەڕێمەوە. جزدانی پارەکەم لە بیر چووە.» بە هەڵەداوان گەڕامەوە و ڕاست ڕۆیشتم بۆ لای ژووورە چکۆلەکەی ئافانسی و گوتم: «ئافانسی، دوێنێ دوو زللەم لێدای، بمبوورە.»

داچڵەکی لەوە دەچوو زۆر ترسابێ، چاوی تێبڕیم؛ تێگەیشتم کە ئەم لێبوردنە بەس نییە و لە ڕێوە بە جلوبەرگی ئەفسەرییەوە کەوتم بە سەر کەوشەکانیدا و سەرم لە بەر پێی دانا و گوتم: «بمبوورە.»

ئەمجار بە جارێ تووشی سەرسووڕمان بوو.

«قور... قوربان ئەوە بۆ ئاوا دەکەی؟ کوا من حەدی ئەوەم هەیە؟ دەستی کرد بە گریان، هەر وەک پێشتری من، هەر دوو دەستی بە بەر چاوییەوە گرت؛ ڕوویکردە پەنجێرەکە و دای لە هۆڕژنی گریان و ئازای ئەندامی وەلەرزین کەوت. بە هەڵەداوان گەڕامەوە بۆ لای شاهیدەکەم و پەڕیمە سەر عارەبانەکە. گوتم: « ئامادەم.» لێمپرسی: « تائێستا مرۆڤی سەرکەوتووت دیوە؟ فەرموو ئەوە لە بەردەمت ڕاوەستاوە. وا کەوتبوومە نەشە، لە مەودای ڕێگادا هەر پێکەنیم و قسەمکرد، لە بیریشم نییە دەمگوت چی. چاوی تێبڕیم: « وایە کاکی خۆم، دیارە پیاوێکی ئازا و بەجەرگی و شەرافەتی جلوبەرگەکەمان دەپارێزی».

کاتێک گەیشتینە شوێنی دیاری کراو، ئەوان چاوەڕوانمان بوون. یەکی دوازدە هەنگاویان لە یەکتر دوور خستینەوە. دەبوو ئەو لە پێشدا تەقە بکا. شاد و بە نەشە ڕاوەستام و چاوم لە چاوی بڕی؛ چاوم نەدەترووکاند، بە خۆشەویستییەوە چاوم لێدەکرد، چونکە دەمزانی چی دەکەم. گوللەکەی تەنیا سەرچیخ لاجانگ و گوێچکەمی گرت. گوڕاندم: «خودایە زۆر شوکور هیچ کەس نەکوژرا.» پاشان وەرسووڕام و ئەوەندەی دەستم گرتی دەمانچەکەم فرێدا نێو دار و دەونەکانەوە.

گوڕاندم: «جێی تۆ ئەوێیە.»

ڕوومکردە ڕەقیبەکەم و گوتم: «قوربان هیوادارم منی گەمژە ببووری کە سووکایەتیم پێکردی و هانمدای تەقەم لێبکەی. من زۆر لە ئێوە خراپترم. ئەوەش بەو کەسە بڵێ کە لە دنیادا لەوت خۆشەویستتر نییە.»

هەرکە ئەوەم گوت، هەرسێکیان بە سەریاندا گوڕاندم.

ڕەقیبەکەم بە تووڕەیی نەڕاندی: «پیاوی چاک، ئەگەر نەتدەویست شەڕ بکەی، بۆ لە کۆڵم نەبوویەوە و ئەو پەندەت پێدام؟»

بەپێکەنینەوە وەڵامم دایەوە: « دوێنێ گەوج بووم، ئەمڕۆ ئەقڵم لە سەر خۆیە.

گوتی: «سەبارەت بە دوێنێ باوەڕت پێدەکەم، بەڵام ئەو کارەی ئەمڕۆت جێی سەر سووڕمانە و بۆم قەبووڵناکرێ.»

دەستم بە یەکدادا و دەنگم هەڵێنا: «بژیی، لەو بارەشەوە لە گەڵتا هاوڕام، هەق بە تۆیە!»

- دەی ئاخری تەقە دەکەی یان نا؟

گوتم: «نا، نایکەم. ئەگەر پێتخۆشە دیسان تیرێکم پێوەنێ، بەڵام چاکتر وایە ئەو کارە نەکەی.»

شاهیدەکانیش، بە تایبەت شاهیدەکەی من، گوڕاندی: «بەو کارەت بەرەوڕوو بوون لەگەڵ دوژمنەکەت و داوای لێخۆشبوون دەتهەوێ ئابڕووی گوردانەکەمان بەری! جا ئەوە کارە، ئەگەر دەمزانی ئاوا دەکەی...

ڕاوەستا بووم بەرە و ڕوویان و ئیتر پێنەدەکەنیم. گوتم: «بەڕاستی لەم سەردەمەدا دۆزینەوەی کەسێک کە لە گەوجییەتیی خۆی پەژیوان بێتەوە و بە ئاشکرا و لە بەر چاوی خەڵک ئاوا دان بە هەڵەی خۆیدا بنێ، جێی سەر سووڕمانە؟»

شاهیدەکەم دیسان گوڕاندی: «بەڵام لە دوئێلدا نا.»

گوتم: « ئەوەی جێی سەر سووڕمانە هەر ئەمەیە. چونکە لە گەڵ گەیشتنە ئێرە دەبوو دان بە هەڵەی خۆمدا بنێم، بەر لەوەی ئەو گوللەیەک بتەقێنێ. بەر لەوەی تووشی تاوانێکی گەورەی بکەم، بەڵام ژیانی خۆمان وا ناحەز کردووە، کە بەو شێوەیە مەحاڵ بوو داوای لێبووردنی لێبکەم. تەنیا دوای ئەوەی لە مەودای دوازدە هەنگاوەوە کەوتمە بەر سێرەی دەمانچەی ڕەقیبەکەم، قسەکانم بایەخی دەبێ بۆی. بەڵام ئەگەر کاتی بەرەوڕوو بوون و بەر لە تەقەکردن داوای لێبووردنم بکردایە، حەتمەن دەیانگوت: «ترسەنۆکە، بە

دیتنی دەمانچە زاوری چووە. گوێ بە قسەکانی مەدەن.» کاکینە چاو لە نێعمەتەکانی خودا بکەن لە دەوروپشتی خۆتان، ئاسمانی ساماڵ و هەوای پاک و گژوگیای تەرچک و باڵندە، سروشت ڕازاوە و بێتاوانە، ئێمەش، تەنیا ئێمە، بێخودا و گەوج و حەپۆلین نازانین ژیان بە هەشتە، چونکە دەبێ لەوە بگەین، هەرکات لەوە گەیشتین ژیان بە هەموو جوانییەکانییەوە دەبێتە بەهەشت، ئەوسا دەتوانین یەکتر لە باوەش بگرین و دەستبکەین بەگریان.»

دەکرا زۆر لەوە زیاتری لە سەر بڕۆم، بەڵام نەمتوانی ـ دەنگم لە بەر نەشەو شادی زمانی وەتەتەڵە خستم و قسەم بۆ نەهات. لە دڵمدا هەستم بە بەختەوەرییەکی ئەوەندە گەورە دەکرد کە بە عومراتی خۆم نەمدیبوو.

ڕەقیبەکەم گوتی: «وتەکانت هەمووی جوان و بەڕێوجێن، وا دیارە مرۆڤێکی ڕەسەن و تێگەیشتووی.»

گوتم: «پێبکەنە» خۆشم پێکەنیم، «بەڵام دواتر باوەڕ بە قسەکانم دەکەی.»

گوتی: «بەڵێ، هەرئێستا باوەڕ بە قسەکانت دەکەم. تکات لێدەکەم دەستت بخە نێو دەستم، چونکە دەزانم مرۆڤێکی ڕاستوێژی.»

گوتم: «نا، ئێستا نا، دواتر ئەگەر بە شایانت زانیم و شیاوی پلە و پایەی ئێوە بووم، تەوقەم لە گەڵدا بکە، وا باشترە.»

گەڕاینەوە بۆ ماڵێ، لە تەواوی ماوەی ڕێگادا شاهیدەکەم لۆمەی کردم و من ماچمکرد. هەموو هاوقەتارەکانم لەو مەسەلەیە ئاگادار بوون و لێم کۆبوونەوە و ئەو ڕۆژە هەتا ئێوارە سەرکۆنەیان کردم.

گوتیان: «ئابڕووی جلوبەرگەکەمانت بردووە. دەبێ دەست لە کارەکەت بکێشیتەوە.»

تاقمێکیش لایەنگرییان لێکردم و گوتیان: «لە هەمبەر گوللەدا ڕاوەستاوە.»

ـ بەڵێ ڕاوەستاوە، بەڵام لە گوللەی دووهەم ترساوە و داوای لێ خۆشبوونی کردووە.

ـ ئەگەر لە کوژران بترسایە، بەر لە داوای لێخۆشبوون، سەرەتا بە دەمانچەکەی تەقەی دەکرد، بەڵام ئە دەمانچەکەی فڕێدا نێو داروەدەوەنەکان. نا وادیارە شتێکی دیکە لە گۆڕێ دایە، شتێکی باش. جۆرێک ڕەسەنایەتی.

چاوم لێدەکردن و گوێم بۆ قسەکانیان شلکردبوو و کەیفم پێدەکرد. گوتم: «دۆستان و هاوقەتارانی خۆشەویستم، بۆ دەست لە کارکێشانەوەم خەمتان نەبێ، چونکە ئەو کارەم کردووە و ئەمڕۆ ئیستیعفانامەکەم ڕادەست کردووە و ئەگەر لێم قەبووڵبکەن، لە ئەرتەش دەچمە دەرێ و دەڕۆم بۆ کلێسە.»

بەبیستنی ئەو قسەیە هەموو دەستیانکرد بە پێکەنین.

ـ دەی ئەوەت زووتر بگوتبایە و خۆت ڕزگار بکردایە، ئێمە خۆ ناتوانین ڕاهیب محاکەمە بکەین.

پێدەکەنین و خۆیان پێڕاگیر نەدەکرا، نەک بۆ لۆمە و تانە، بەڵکو لە بەر شادی و دڵسۆزی. هەر لە ڕێوە هەستی دۆستانەی خۆیان دەربڕی، تەنانەت ئەوانەش کە وەبەر تیروتانەیان دابووم. مانگێکی تەواو، بەر لە هاتنەوەی حوکمەکەم و واز هێنانم لە ئەرتەش، پێیاندەگوتم: «کاکی قەشە.» هەموو بە زمانی شیرین و دۆستانە لەگەڵم دەدوان و دەیان ویست دڵسۆزیم بۆ بکەن و لەو کارە پاشگەزم بکەنەوە: «خۆت گەوج مەکە، کوا ئەوە کارە؟»

دەیانگوت: «نا، مرۆڤێکی ئازا و بەجەرگە، لە هەمبەر گوللەدا ڕاوەستا و دەیتوانی ئەویش تەقە لە ڕەقیبەکەی بکاتەوە، بەڵام شەوی پێشوو خەونی دیوە دەبێتە ڕاهیب، بۆیە ئەو کارە مرۆڤانەیەی کرد.»

خەڵکی شارەکەش هەر وایان هەڵسوکەوت لەگەڵ دەکردم، تا ئەو کاتە زۆر دڵسۆزانە وەریان دەگرتم، بەڵام سەرەنجێکی وایان نەدەدامێ. زۆری پێنەچوو لە بیروبڕوام گەیشتن و بانگهێشتیان دەکردم بۆ ماڵێ. پێیم پێدەکەنین، بەڵام لە دڵەوە خۆشیاندەویستم. ئەوەشم لە بیر نەچێ ئەگەرچی بەڕاشکاوی باسی دوئێلەکەی ئێمەیان دەکرد، بەڵام فەرماندەر و کاربەدەستان گوێیان نەدایە، چونکە ڕەقیبەکەی من خزمی نزیکی ژێنڕاڵەکەمان بوو، چونکە کارەکە خوێنڕێژی و ئاکامی ناخۆشی لێنەکەوتەوە

و من ئیستیعفام دابوو، کارەکەیان بە گاڵتە زانی. هەر بۆیە ئەو کاتە بەبێ ئەوەی گوێ بدەمە پێکەنینەکەیان، بە دەنگێکی بەرز و نەترسانە دەستمکرد بە قسەکردن. چونکە پێکەنینەکەیان دڵسۆزانە بوو و لە ڕووی قین و بوغزەوە نەبوو. ئەو وتووێژانەش زیاتر عەسرانە بەڕێوە دەچوو، بەتایبەت ژنان زۆریان حەز بەقسەکانم دەکرد و داوایان لە پیاوان دەکرد گوێ ڕابگرن.

هەر کەسە و بە پێکەنینەوە دەیانگوت: « ئاخەر چۆن دەبێ من بەرپرسی هەموان بم؟ بۆ وێنە دەکرێ من بەرپرسی تۆ بم؟»

وەڵامم دایەوە: «ڕەنگە ئەوە نەزانن، چونکە لە مێژە دنیا ڕێگایەکی جیاوازی گرتۆتە بەرو گەورەترین درۆ بە ڕاست دەزانین و چاوەڕوانیمان لە خەڵکیشە درۆمان لە گەڵ بکەن. لێرەدا بۆ یەکەم جار لەژیانمدا سادقانە و باش دووام و هەمووتان وەک شێتم چاو لێدەکەن و پێم پێدەکەنن، ئەگەر چی بە چاوی خۆشەویستییەوە لێم دەڕوانن.»

خانەخوێکەم بە پێکەنینەوە گوتی: «ئاخر چۆن دەتوانین لە خۆشویستنی تۆ خۆ بپارێزین؟» ژوورەکە پڕ بوو لە خەڵک. لە ناکاو ژنێکی جحێڵ کە ئەو دوێلە لە بەر ئەو بەڕێوە چوو و تەنیا لەم دواییانەدا ویستبووم ببێتە ژنی داهاتووم، هەستا سەرپێ. نەمزانیبوو کەنگێ هاتووە. هات بۆ لام و دەستی هێنا پێشێ و گوتی:

- با پێتبڵێم، من یەکەم کەسم کە پێتان پێناکەنم. بە پێچەوانە، بە چاوی فرمێسکاوییەوە سپاستدەکەم و ڕێزم بۆ خۆت و کردەوەکەت هەیە. مێردەکەشی هات بۆ لام، پاشان هەموو هاتنە پێشێ و ئەوەندەی نەمابوو دەستبکەن بە ڕامووسینم. دڵم لە شادی لێوڕێژ بووبوو. بەڵام پیاوێکی گەڕاوە سەرنجی ڕاکێشام. بە ناو دەمناسی، بەڵام ئاشنایەتیم لەگەڵی نەبوو و هەتا ئەو شەوە لەبزم لە لەبزی نەگەڕابوو.

**(٤) میوانی پڕپێچوپەنا**

ماوەیەکی زۆر بوو لەو شارە خاوەن پلە و پایە بوو. هەموو ڕێزیان بۆ دادەنا، چونکە دەوڵەمەند بوو و ناوبانگی بە چاکەکار دەرچوو بوو.

گوژمەیەکی زۆری پارە دابوو بە هەتیوخانە و نەخۆشخانەی تایبەتی لێقەوماوان و ئەو خێر و خێراتەشی بە شێوەی نهێنی دەکرد، ئەو کارانەشی لە پاش مەرگی دەرکەوت. پیاوێکی پەنجا ساڵانە بوو، تارادەیەک نەدوێن و خوڵک ناخۆش بوو. دەساڵێک دەبوو ژنی هێنابوو، ژنەکەی جوان و جحێڵ بوو و سێ منداڵی هەبوو. ڕۆژێکیان لای عەسر بە تاقی تەنیا دانیشتبووم، لە پڕ درگای ژوورەکەم کرایەوە و ئەو کابرایە وەژوور کەوت.

با ئەوەشم لە بیر نەچێ، ئیتر لەو شوێنەی پێشوو نەمابووم. هەر ئەو کاتەی وازم لە ئەرتەش هێنا، ژوورێکم بە کرێ گرت، ئەو پیرێژنەی ژوورەکەم لێبەکرێ گرتبوو کۆنە ژنی دەفتەردارێکی دەوڵەتی بوو. پێشخزمەتی ئەو ژنە کاروبارەکانی منیشی بەڕێوە دەبرد. بۆیەش ماڵەکەم گوێستەوە، دوای گەڕانەوە لە دوئێل، لە ڕووم هەڵنەدەهات چاو لە چاوی ئافانسی بکەم و ناردمەوە بۆ گوردان. چونکە کاتێک پیاو کارێکی ناحەز دەکا و تووشی شەرمەزاری دەبێ، هێندێ جار دەست بۆ کاری گرینگتریش دەبا.

میوانەکەم گوتی: «لە چەند ڕۆژی ڕابردوودا لە زۆر ماڵان بە تامەزرۆیی گوێم بۆ قسەکانت شلکردووە و ئاخری بڕیارم دا لە نزیکەوە لە گەڵت ئاشنابم، تاکو خۆمانەتر لە گەڵتدا بدوێم. کاکی بەڕێز دەتوانی ئەو لوتفە دەرهەق بە من بکەی؟»

«بە سەر چاو، بە شانازیشی دەزانم خزمەتێکم لە دەست بێ.» ئەوەم گوت، بەڵام هەر لە یەکەم ساتەوە قەڵافەتی ئەو کابرایە سەیر سەرنجی ڕاکێشام و تا ڕادەیەک لەقسەکەی خۆم پەشیمان بوومەوە. چونکە خەڵکی ئەگەرچی بە تامەزرۆیی گوێیان بۆ قسەکانم شلکردبوو، بەڵام هیچکەس ئاوا بە قەڵافەتێکی جیددی و ناو چاوی گرژ و مۆنەوە نەهاتبوو بۆ لام. ئەو هاتبووە ماڵێ بۆدیدەنیم و دوای ئەوەی دانیشت گوتی:

- ئێوە مرۆڤێکی زۆر بە جەرگ و ئازان. چونکە وێراتان بەبێ پێچوپەنا قسەبکەن و مەترسیی ئەوەش بوو ئەو قسانە ببنە هۆی ئەوەی لە بەر چاوی هەموان ڕەشبن.

لە وەڵامیدا گوتم: «ئەو تاریفەی ئێوە زێدەوەسفە و من ئەوەندەش تاریف هەڵگر نیم.»

بەرسڤی دامەوە: «نا، زێدە وەسف نییە. بڕوام پێبکە ئەو کارە زۆر لەوە دژوارترە کە بیری لێدەکەیتەوە. هەر ئەوەش شوێنی لە سەر من دانا و هەر ئەوەش بووە هۆی ئەوەی بێم بۆ لاتان. تکایە پێمبڵێن، هەڵبەت ئەگەر ئەو کونچکاوییەی من نارەحەتت ناکا. لەو ساتەدا کە بۆ دوئێل ڕاوەستای و داوای لێخۆشبوونت کرد، وەک لە بیرت بێ هەستت چۆن بوو؟ پرسیارەکەم بە پرسیارێکی گەوجانە مەزانە. بە پێچەوانە بۆ ئەو پرسیارە بنۆسێکی نهێنیم هەیە کە ڕەنگە دواتر بۆت باسبکەم. هەڵبەت ئەگەر ئیرادەی خودای لە سەر بێ و ئاشنایەتییەکەمان ڕەنگێکی خۆمانەتر بە خۆوە بگرێ.»

لە تەواوی ئەو ماوەیەدا کە قسەی دەکرد، چاوم لە چاوی بڕیبوو، « بۆیە لە ناکاو هەستمکرد بە تەواوی لێی دڵنیام و متمانەی پێدەکەم. منیش زۆر کونچکاو بووم، چونکە هەستمکرد ڕازێکی سەیر لە ناخیدا هەیە.

وەڵاممدایەوە: «پرسیت لەو کاتەدا کە داوای لێخۆشبوونم لە ڕەقیبەکەم کرد چ هەستێکم هەبووە. بەڵام چاکتر وایە هەر لە سەرەتای ڕووداوەکەوە باسی شتێکتان بۆ بکەم، کە تا ئێستا هیچکەس لێی نەبیستووم.» ئەوەی لە نێوان من و ئافانسیدا ڕووی دابوو، چۆن خۆم دابوو بە سەر کەوشەکانیدا، هەمووم بۆ گێڕایەوە. لە کۆتاییدا گوتم: «هەر بەو مەسەلەیەدا بۆت دەردەکەوێ کە دوئێلەکە و تەنانەت مردنیش بۆ من ئاسان بووبۆوە، چونکە هەنگاوی یەکەمم لە ماڵەوە هەڵێنابۆوە و بە گرتنە بەری ئەو ڕێگایە، بۆم دەرکەوت چوونە پێشەوە ساناتر لە گەڕانەوەیە و تەنانەت دەبێتە هۆی شادی و بەختەوەریش.»

کاتێ گوێی بۆ ڕاگرتبووم، زۆر بە تاسەشەوە چاوی تێبڕیبووم، گوتی: «تەواوی بەسەرهات و قسەکانت سەرنجڕاکێش بوو. من دیسان دێمەوە بۆ دیدەنیت.» ئیتر دوای ئەو ڕۆژە هەموو ئێوارەیەک دەهات بۆ دیدەنیم. ئەگەر باسی خۆی بۆ بکردایەم، پێکەوە دەبووینە دۆست و هاوڕێی گیانی و گیانێک

دەبووین لە دوو جەستەدا. بەڵام بە هیچ شێوەیەک باسی خۆی نەدەکرد و بەردەوام سەبارەت بە خۆم و ژیانم پرسیاری دەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا، زۆری هۆگر بووبووم و سەبارەت بە هەست و ژیانم بەڕاشکاوی بۆی دەدوام. لە دڵی خۆمدا دەمگوت پێویست ناکا لە ڕاز و نهێنییەکانی ژیانی ئاگادار بم. بە بێ ئەوەش دەتوانم تێبگەم پیاوی چاکە یان نا. لەگەڵ ئەوەشدا، بیرم لەوە دەکردەوە ئەو مرۆڤێکی جیددییە و لە من گەورە تریشە، کەچی دێ بۆ دیدەنیی لاوێکی وەک من و وەک هاوشانی خۆی چاوم لێدەکا. زۆر شتیشی لێوە فێربووم و کەڵکم لە ئەزموونەکانی وەرگرت، چونکە خاوەنی بیر و زەینێکی بەرز و ڕووناک بوو.

لە ناکاو پێیگوتم: «سەبارەت بەوەی ژیان بەهەشتە زۆرم بیرکردۆتەوە.» هەر وەها لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: «لە ڕاستیدا جگە لەوە بیر لە هیچ شتێکی دیکە ناکەمەوە.» چاوێکی لێکردم و بزەی هاتێ. «لە ئێوە زیاترم بڕوا پێیەتی، دواتر پێتدەڵێم بۆ.»

گوێم بۆ شلکرد و لە دڵی خۆمدا گوتم وا دیارە دەیهەوێ شتێکم پێبڵێ. لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: «بەهەشت لە ناخی هەموومانداییە و هەر ئێستا ئالێرەی جەستەمدایە ـ دەستی بە سینگییەوە نا ـ و ئەگەر بمهەوێ سبەینێ بۆ هەتا هەتایە لێم ئاشکرا دەبێ.»

چاوم لێکرد، زۆر بە هەڵەپڕووکێ قسەیدەکرد و بە شێوەیەکی زۆر گوماناوی چاوی تێبڕیبووم و دەتگوت دەیهەوێ وەقسەم بێنێ.

ـ هەروەها جگە لە تاوانەکانی خۆمان، هەموومان لە هەمبەر یەکتردا بەرپرسین و ئەرکی بەرپرسایەتیی یەکترمان لە سەر شانە، لەم بارەوە بەڕاستی هەق بە تۆ بوو و ئەوەش کە توانیت لە ڕێوە لە هەموو گرنگایەتییەکانی ئەو مەسەلەیە بگەی، زۆر باشە. لەڕاستیشدا ئەم مرۆڤانە لەوە دەگەن، ژیانی ئەولا بە خەون نازانن و وەک ڕاستەقینەیەکی زیندوو چاوی لێدەکەن.

بە قەڵسی گوڕاندم بە سەریدا: «کەنگێ، کەنگێ وەڕاست دەگەڕێ؟ بڵێی ئەو بەهەشتە و ژیانی ئەولا بوونی هەبێ؟ بڵێی ئەمە تەنیا خەون و خەیاڵی ئێمە نەبێ؟»

گوتی: «یانی بڕوات پێی نییە. مەوعیزەی بۆ دەکەیت و خۆت باوەڕت پێی نییە؟ بڕوا بکە هەر ئەم ـ خۆت گوتەنی ـ خەون و خەیاڵە وەڕاست دەگەڕێ و شکی تێدانییە. بەڵام نەک ئێستا، چونکە هەموو ڕەوشتێک یاسای تایبەت بە خۆی هەیە و ڕەوشتێکی ڕۆحی و ڕەوانییە. بۆ گۆڕینی دنیا و سەر لە نوێ خولڤاندنەوەی، مرۆڤ دەبێ لە بارەی ڕەوانییەوە بکەونە سەر ڕێیەکی‌تر. هەتا ئەو کاتەی بە شێوەیەکی ڕاستەقینە نەبووبێتییە برای هەمووان، برایەتی سەرناگرێ. هیچ چەشنە فێرکارییەکی زانستی، هیچ چەشنە قازانجێکی گشتی، مرۆڤ وا ڕاناهێنێ کە ملک و سامان و بەرژەوەندییەکانی خۆی بە شێوەیەکی یەکسان بە سەر هەمووانیدا دابەشبکات. هەموو کەس بەشی خۆیان بەکەم دەزانن و هەمیشە بەخیلی و سکاڵا و شەڕ و کێشە لە ئارادا دەبێ. دەپرسی کەنگێ سەردەگرێ، بەڵام لە پێشدا دەبێ لە گەڵ سەردەمی "جودایی" تێکەڵ بین.»

پرسیم: «مەبەستت لە «جودایی» چییە؟»

ـ ئەم جوداییە لە هەموو شوێنێک ڕەگاژۆی کردووە و لە سەروو هەمووشیانەوە لەم سەردەمەی ئێمەدا ـ بە تەواوی بڵاو نەبۆتەوە، هێشتا بە حەددی خۆی نەگەیشتووە. چونکە هەموو کەس هەوڵدەدا کەسایەتیی خۆی بەجیا ڕاگرێ و دەیهەوێ لەبارترین ژیان بۆ خۆی دابینبکات. بەڵام لە هەمان کاتدا هەموو هەوڵەکانی بۆ گەیشتن بە ژیانێکی لەبار بە ناکامی دەگا و دەبێتە هۆی لە نێو چوونیشی، چونکە لە جیاتی خۆناسین لە نێو جوداییەکی تەواودا نوێ دەبێتەوە. لەم سەردەمەی ئێمەدا سەر لە بەری مرۆڤایەتی لە بەر یەک هەڵوەشاوە و دابەش بووە و هەر کەسە و ئەسپی خۆی تاودەدا و ئاورە سوورە لە خۆم دوورە، خۆی لە هەموو کارێک دوورە پەرێز ڕادەگرێ، خۆی و ماڵ و سامانەکەی لە خەڵکی دەشارێتەوە و لە ئاکامیشدا ئەو خەڵکی لە

خۆی دەتارێنێ و خەڵکیش ئەو لە خۆیان تەرە دەکەن. ماڵ و سامان پێکەوە دەنێ و لە بەر خۆیەوە دەڵێ: «ئێستا چەندە دەسەڵاتدارم و چەندەش لە ئەمان دام.» تەماح وا کوێری دەکا، تێناگا چەندەی لە سەریەک هەڵچنیوە و زیاتر بە زەلکاوی بێ هێزی و فەوتاندا ڕۆدەچێ. چونکە عادەتی گرتووە تەنیا پشت بە خۆی ببەستێ و لەهەمووان دابڕێ. خۆی وا بارهێناوە کە ئیمانی بە خەڵک و مرۆڤایەتی و یارمەتییان نەبێ. تەنیا لەوە زندەقی چووە و دڵی سوارە، نەکا پارە و دەسەڵات و سامانەکەی کە بە زەحمەت پەیدای کردووە. لە دەستی بێتەوە. لەم سەردەمەدا و لەهەموو شوێنێک مرۆڤەکان تێناگەن کە هێمنایەتی و دڵ حەسانەوەی ڕاستەقینە لە یەکگرتن دایە، نەک لە هەوڵی تاکە کەسی و جودایی‌خوازیدا. بەڵام ئەم لێک هەڵبڕانە پڕ مەترسییە دەبێ هەر چۆنێکە کۆتایی پێ‌بێ و خەڵکی بزانن چۆن لە خۆڕا و بەشێوەیەکی ناسروشتی دڵیان ڕەشبووە و لە یەکتر دابڕاون. ئەم دەبێتە ڕۆحی زەمان و خەڵکی سەرسام دەبن، چۆن ئەو ماوە دوور و درێژە لە تاریکیدا دانیشتوون و ڕووناکییان نەدیوە. ئەو کاتەیە کە نیشانەی «کوڕی مرۆڤ» بە ئاسمانەوە دەبیندرێ... بەڵام تا ئەو کاتە، دەبێ هەروا ئاڵاکە شەکاوە ڕاگرین. هێندی جار مرۆڤ دەبێ ببێتە سەرمەشق، تەنانەت ئەگەر ناچار بێ ئەو کارە بە تاقی تەنیاش ئەنجامبدا و کردەوەکەی شێتانە بنوێنێ. بەم شێوەیە گیانی مرۆڤ لە تەنیایی ڕزگار بکاو ئەوان بەرەو ئەشقێکی برایانە هانبدا. تەنانەت ئەگەر بە شێتیشی بزانن، تەنیا لە بەر ئەوەی ئەو ئەندێشە گەورەیە نەفەوتێ.

هەموو عەسرانەمان بەو دەمەتەقێ و مشتومڕانە ڕادەبوارد. دەستمان لە هاموشۆی دەر و جیرانان هەڵگرت و ئیتر بۆ کۆڕەکانیان نەدەچووین. هەروەها ئەو بازاڕ گەرمییەی پێشووشم نەمابوو. ئەوەش لەبەر ئەوە نەبوو لە بەر چاویان کەوتبێتم، چونکە هەروا خۆشیان دەویستم و ڕێزیان بۆ دادەنام. بەڵام ناکرێ حاشا لەوەش بکەین کە دەسەڵاتێکی گەورە لە کۆمەڵگادا باو بوو. منیش بە چاوی ڕێزەوە چاوم لە میوانە پڕپێچوپەناکەم دەکرد، چونکە جگە لەوەی بەبیر و بەهرەمەند بوو، تێگەیشتم کە پلانێکی لە

زەینیدا دارِشتووە و ڕەنگە خەریکی خۆ ئامادە کردن بێ بۆ کارێکی گەورە. ڕەنگە هەر لە بەر ئەوەش ئاوا هۆگریی بە من هەبوو کە زۆرم خۆ لە ڕاز و کارەکەی هەڵنەدەقوتاند و بەپرسیاری ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ نەمدەویست سەر لە کاری دەرهێنم. بەڵام ئاخری تێگەیشتم کە دەیهەوێ شتێکم پێ‌بڵێ. لە ڕاستیدا ئەوەشم مانگێک دوای هاتنەکەی بۆ دەرکەوتبوو.

جارێکیان پێیگوتم: «دەزانی خەڵک لیمان دڕدۆنگ بوون و لە خویان دەپرسن بۆ ئەوەندە دێم بۆ دیدەنیت. بەڵام قەیناکا با هەروا بە گومان بن، چونکە زۆر زوو هەموو شتێکیان بۆ ڕوون دەبێتەوە.»

هێندێ جار سەیر تووشی دڵە خورپە و جۆرێک حاڵ لێهاتن دەبوو و خێرا هەڵدەستا و دەڕۆیشت. چاوێکی پشکێنەرانەی لێدەکردم و لە دڵی خۆمدا دەمگوت هەر ئێستا بێ پەردە و بەڕاشکاوی شتێکم پێدەڵێ.» بەڵام لە ناکاو دەستیدەکرد بە قسە و باسی شتێکی ئاسایی دەکرد. زۆر لە دەست ژانەسەریش سکاڵای دەکرد. ڕۆژێکیان کتوپڕ دوای قسە کردنێکی زۆر و پڕدڵەخورپە، ڕەنگی سپی هەڵگەڕا و هەروا چاوی تێبڕیبووم، چاوی بە مۆڵەق وێستا و کەوت بە لادا. گوتم: «چییە» چبووە؟ ئەوە بۆ وات لێهات؟ ـ ساتێک بەر لەوە باسی ژانەسەرەکەی کردبوو.

ـ من... دەزانی من... کەسێکم کوشتووە!

ئەوەی گوتو بە ڕوخساری وەک هومایی سپی هەڵگەڕاوی زەردیەکی گرت: «بۆچی زەردە دەگرێ؟» ئەو فکرە بەر لەوەی شتێکی دیکە سەرنجم ڕاکێشێ، لەزەینم دەرپەڕی. منیش ڕەنگم سپی هەڵگەڕا.

گوڕاندم: «دەڵێی چی؟»

بەبزەیەکی سارد و سڕەوە گوتی: «دیوتە وتنی یەکەم وشە چەندە دژوارە. بەڵام ئێستا کە دانم پیاناوە، هەستدەکەم یەکەم هەنگاوم هەڵێناوەتەوە و دەڕۆمە پێشێ.»

تا ماوەیەکی زۆر نەمدەتوانی بڕوای پێبکەم. لەو کاتەدا بڕواشم پێنەکرد، تا وای لێهات سێ ڕۆژ لە سەر یەک هات بۆ دیدەنیم و هەموو شتێکی بۆ

باسکردم. پێموابوو شێتبووە، بەڵام ئاخری بەوپەڕی سەرسوڕمانەوە تێگەیشتم، جینایەتەکەی جینایەتێکی گەورە و سامناک بووە.

چاردە ساڵ پێشتر، بێوەی مالیکێکی کوشتبوو، ژنێکی جوان و جحێل و دەوڵەمەند بوو و ماڵی لە شارەکەی ئێمە بوو. بۆی شێت و شەیدا دەبێ و هەستی خۆشەویستی خۆی دەردەبڕێ و هەوڵدەدا دڵی نەرم بکات و شووی پێبکا. بەڵام ئەو دڵی بە کەسێکی ترەوە بوو، ئەفسەرێکی خاوەن پلە و پایە و نەجیم و لە بنەماڵەیەکی ڕەسەن. کە ئەو کاتە لە گۆڕەپانی شەڕ بووە و چاوەڕێی گەڕانەوەی چاوەڕوان نەکراوی بووە. هەر بۆیە جوابی ئەم ناداتەوە و داوای لێدەکا ئیتر نەچێت بۆ دیدەینی. دوای لێک هەڵبڕان، چونکە لە کەلێن و قوژبنی ماڵەکە شارەزا بوو، بڕیار دەدا ئەگەر ئابڕوو چوونیشی بە دواوە بێ، نیوەشەو لە نێو باخەکە و قوونەبانەکەوە بۆی بچێتە ماڵێ. بەڵام هەروەک زۆر جاران بیستوومانە، جینایەت کردن بە هۆی بێباکی و لەخۆڕادینی زۆرەوە، لە جینایەتی تر سەرکەوتووانەتر دەبێ.

لە ڕۆچنەی هەورەبانەکەوە دەچێتە سەربان و بە پەیژەکەدا دەچێتە خوارێ. چونکە دەیزانی ئەو دەرگایەی پاڵ قاڵدرمەکە هێندێ جار بە هۆی کەمتەرخەمیی پێشخزمەتەکانەوە داناخرێ. بۆیە هیوادار بوو ئەو شەوە دەرگاکە دانەخرابێ و هەرواش بووبوو. بە تاریکی خۆی دەگەیێنێتە ژووری خەوەکەی کە شەوخەفێکی لێهەڵکرابوو. وەک ئەوەی بە ئانقەست چووبێتن هەر دوو هاودەمەکەی بەبێ وەرگرتنی مۆڵەت چووبوون بۆ جێژنی لەدایک بوونی ئاشنایەکیان هەر لەو شەقامە. پێشخزمەتەکانی دیکەش لە وەتاغی خزمەتکاران یان لە چێشتخانەی قاتی ژێروو خەوتبوون. هەرکە چاوی بە ژووری خەوەکەی دەکەوێ، هەوەسی بڵێسە دەستێنێ و پاشان ڕقێکی دەخەزدارانە و بەخیلانە دڵی دادەگرێ و وەک مرۆڤێکی مەست و بێئیختیار خەنجەرێک لە سەر سینگی دەدا و تەنانەت ناهێڵێ نووزەی بێتە دەرێ. پاشان بە فێڵ و تەڵەکەیەکی شەیتانانە و دڵڕەشانە پیلانێک دادەڕێژێ کە تاوانەکە بکەوێتە ئەستۆی خزمەتکارەکان. بەو پەڕی خوێڕیەتییەوە جزدانی پارەکەی

هەڵدەگرێ، بەکلیلی ژێر باڵنجەکەی درگای دۆڵابەکە دەکاتەوە و هێندێ شتی تر هەڵدەگرێ. ئەو کارەش جۆرێک دەکات، کەوا بنوێنێ پیشخزمەتیکی گەمژە کردوویەتی. دەست لەشتە بە نرخەکان و قەباڵە و تاپۆکان نادات و تەنیا پارە هەڵدەگرێ. برێک لە زێڕ و زەمبەرە درشتەکان هەڵدەگرێت و دەست بۆ خشڵ و ئاڵتوونە زەریفەکان نابا کە دە هێندەی ئەوان گرانبابیتر بوون. هێندێک شتیش وەک یادگاری هەڵدەگرێ بۆ خۆی. کە دواتر بە تێروتەسەلی باسی دەکەین. دوای ئەو کردەوە بێ بەزەییانە و چەپەڵە، بە ئەسپایی لە کوێوە هاتبوو هەر بەوێدا دەگەڕێتەوە.

چەند ڕۆژ دواتر، کە هەواڵی قەتڵەکە بڵاو دەبێتەوە، هیچکەس بە خەونیش بیری لەوە نەدەکردەوە بکوژەکە ئەو بێ! چونکە هیچ کەس ئاگاداری حەزلێکردوویی ئەو نەبوو. هەمیشە ئارام و لەسەرخۆ بوو، هاوڕێیەکیشی نەبوو، سفرەی دڵی لەلا بکاتەوە. ئەویان وەک ئاشنای کوژراوەکە چاو لێکرد. ئەویش نەک ئاشنایەکی نزیک، چونکە لە دوو حەوتووی ڕابردوودا تەنانەت نەچووبوو بۆ سەردانیشی. یەکێ لە بەندە زەرخڕیدەکانی ئەو ژنە، کە ناوی پیووتێر بوو، خێرا شکیان پەڕییە سەری و هەموو بنۆس و بەڵگەکانیش ئەوەیان دەسەلماند. ئەو کوڕە دەیزانی خاتوونەکەی ئەو ڕاستییەی پووشبەسەر نەکردایە ـ ئەگەر یەکێ لە بەندە زەرخڕیدەکانی بگیرایەن بە سەر باز، دەبوو ئەو بەرن. چونکە خزم و کەسی نەبوو و هەڵسوکەوتیشی نەدەکەوتە بەر دڵان. کاتێک لە مەیخانەیەک مەستی دەکا، خەڵک لێی دەبیستن کە هەڕەشەی کوشتنی لە خاتوونی کردووە. دوو ڕۆژ بەر لە مەرگی ژنە، کوڕە هەڵاتبوو و هیچکەس بە سەروسۆراخی نەدەزانی. ڕۆژێک دوای کوژرانی خاتوون لە دەرەوەی شار دەیبینن مەست و سەر خۆش ملی ڕێی گرتووە و خوداوڕاستان دەستی ڕاستەشی خوێناوی دەبێ. دەڵێ خوێنی لووتم بەربووە، بەڵام هیچکەس باوەڕی پێناکا. هاودەمەکانی خاتوونیش دەڵێن ئێمە چووین بۆ کۆڕی جێژن و کاتێ گەڕاینەوە دەرگای حەوشەکەکرابۆوە. هەروەها هێندێک وردەشتی دیکەش ئاشکرا دەبێ و

پێشخزمەتی بەستەزمان تاوانبار دەکەن. قۆڵبەستی دەکەن و بەتاوانی قەتڵ دادگایی دەکرێ. بەڵام حەوتوویەک دوای گیرانەکەی لە بەندیخانە تاویاوێکی قورس دایدەگرێ وتا دەیگەیەننە نەخۆشخانە، بێهۆش دەکەوێ و دەمرێ. مەسەلەکەش لێرەدا تەواودەبێ و دەدرێتە دەست ئیرادەی خودا. قازی و پارێزەرانی دادگا و خەڵکی شارەکە تێکڕا لە سەر ئەوە کۆک دەبن کە بکوژ ئەو پێشخزمەتە بووە و لە نەخۆشخانە مردووە. کەوایە پەروەندەکە دەبەستن و سزای تاوانەکە دەکەوێتە دەست خودا.

ئەو میوانە پڕپێچوپەنایەی من کەئێستا هاوڕێم بوو، گوتی سەرەتا ڕێژەیەک تووشی عەزاوی ویژدان نەبووە. ماوەیەکی زۆر ژیانی لێ‌تاڵ دەبێ، بەڵام نەک بەو هۆیە، بەڵکو بە هۆی پەشیمان بوونەوە لەو کردەوەیە و کوشتنی ژنێک کە ئەو هەمووەی حەز لێکردبوو. ئەو ژنە لە ژیاندا نەمابوو و پێیوابوو بە کوشتنی ئەو ئەشقی خۆی کوشتووە. هەروەها ئاوری هەوەس هەروا لە نێو دەمارەکانیدا شەپۆلی دەدا. بەڵام بۆ کوشتن و ڕشتنی خوێنی مرۆڤێک هەر گوێشی نەبزواوە.بەڵام فکری ئەوەش کە دەبێتە ژنی کەسێکی دیکە، بە جارێ ئارا و قارای لێ‌هەڵگرتووە و خۆی بە بەرهەق زانیوە. هەر بۆیە ماوەیەکی زۆر وا بە خۆی دەسەلمێنێ کە جگە لەوە چارەیەکی دیکەی نەبووە.

سەرەتا کە ئەو پێشتخزمەتە قۆڵبەستدەکەن، دەکەوێتە دڵەوڕێزە، بەڵام نەخوشیی و مەرگە خێراکەی ئەو کوڕە دڵنیای دەکا و بەوە دڵی دەحەسێتەوە کە مردنی ئەو پێشخزمەتە بە هۆی گیران و ترسەوە نەبووە، بەڵکو ڕۆژی هەڵاتنەکەی شەوێ هەتا بەیانی مەست و کەلەلا لە سەر زەویی تەڕوتلیسک دەخەوێ، سەرمای دەبێ و ئەو لەرز و نۆبەتێ قوورسە دایدەگرێ. دزینی پارە و شتەکانی دیکە زۆری ئازار نادا، چونکە وا بە خۆی دەسەلمێنێ کە ئەو دزییەی لە بەر تەماح نەکردووە و بۆ سڕینەوی گومان و شوێنەونکێ ئەو کارەی کردووە. پارەکە زۆر نەبووە و ماوەیەک دوای ڕووداوەکە هەموو پارەکە و بڕێکی دیکەش دەبات و دەیدا بە هەتیوخانەیەک لەو شارە. ئەو

کـاره دەکـا بـۆ ئـەوەی سـەبـارەت بـە دزییـەکـە ویژدانـی ئاسـوودە بـێ. ڕاستیەکەشی ئەوەیە هەتا ماوەیەکی زۆر دڵی ئارام دەبێتەوە. ـ خۆی ئەوەی پێگـوتم ـ پاشـان پـێدەنێتـە بـواری چالاکییـەکـی گـەوەتـرەوە و درێـژە بـە خزمەتـەکـەی دەدا. ئـەرکێکی زۆر دژوار و پڕ زەحمـەت هـەڵدەبژێرێ و دوو ساڵی وەختی خۆی بۆ دادەنێ. چونکە خاوەنی ئیرادەیـەکی پتـەو بووە، هـەتا ڕادەیەک ڕابردوو لە بیر دەباتەوە. هەر کاتێکیش وەبیری دێتەوە، هەوڵدەدا بە هیچ شێوەیەک فکری لێنەکاتەوە. لـە کاروبـاری چاکە و خێروخێراتدا چالاکی دەنوێنێ و بناغەی چەند هەتیوخانە و ناوەندەی چاکەکاری دادەمـەزرێنێ، بە تـەواوی توانـاوە یارمـەتییـان دەدا. لـە هـەر دوو پێتـەختـەکـە واتـە مۆسـکۆ و پترزبـوگ کـاری چـاک و شـیاو ئـەنجامـدەدا. لـە هـەر دوو شـارەکـەش وەک ئەندامی ئەنجوومەنی چاکەکاری هەڵدەبژێردرێ. لە گـەڵ ئـەوەشـدا ڕابـردووی وەبیر دێتەوە و ئازارەکەی ئارا و قارای لێهەڵدەگرێ. پاشـان ئاشقی کچێکی جوان و وریا دەبێت و زۆر زوو زەماوەندی لە گەڵ دەکا، بەو هیوایەی ژیانی هاوبەشی لە تەنیایی و ناهومێدی دەریهێنێ و بـەدەسـتپێکردنی ژیـانی تـازە و بـەجـێ هێنـانی ئـەرکـی بنـەماڵـە و ژن و منـداڵ خـۆی لـە چنـگ بیـرەوەرییـە کۆنەکانی دەرباز بکا. بەڵام ڕاست پێچەوانەی چاوەڕوانییەکەی دەبێ. تەنانەت لەیەکەم مانگی زەماوەندەکەیدا بەردەوام ئەو خەیاڵە ئازاریدەدا، کە: «ژنەکـەم خۆشی دەوێم ـ بەڵام ئەگەر بزانێ چی؟» کاتێک ژنەکەی پێیدەڵێ بـەم زووانـە منـداڵم دەبـێ، دەکـەوێتـە دڵـەخورپـە. «ژیـانێکم وەدی هێنـاوە، بـەڵام ژیـانێکم ساندۆتەوە.» دەبێتە باوکی منداڵان. «چۆن بوێرم خۆشم بوێن. بیان عـاملێنم و وەبـەر خویندنیان بنێم، چۆن دەتـوانم باسـی مـەزنایـەتییـان بۆ بکـەم؟ مـن خوێن ڕێژم.» منداڵـەکانی هـەموویـان وریـا و زیـرەک دەبـن و پێیخۆشـدەبێ بیانلاوێنێتەوە. «ناتوانم چاو لە ڕوخسارە پاک و بێگـەردەکـەیان بکـەم، شـایانی ئـەوەنـیم.» ئـاخری خـوێن، خـوێنی کـوژراوەکـە و ژیـانێکی شـیرین کـە هەڵیپڕووکاندبوو. خوێنێکی ڕژاو کە هاواری تۆڵەی کردبوو، بـە جـارێ ژیـانی لێتاڵ دەکا و خەونی هاشەوپاشە دەبینێ. بەڵام چونکە خـاوەنی ئیرادەیـەکی

پتەو بووە، ماوەیەکی زۆر تاقەت دێنێ و دانبەخۆیدا دەگرێ. لە دڵی خۆشیدا دەڵێ: «بەم ئازار و عەزاوە شاراوەیە کەفارەتی هەموو تاوانەکان دەدەمەوە.» بەڵام ئەو هیوایەشی دەملەپووش دەمێنێتەوە و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر ئازاری ویژدان تەنگی پێهەڵدەچنێ و ئۆقرەی لێهەڵدەگرێ.

به هۆی چاکەکارییەکانیەوە خەڵکی زۆری ڕێز بۆ دادەنێن، وەک ئەوەی هەموو بە دیتنی ناوچاوە تاڵ و عەبووسەکەی ترسیان لێنیشتبێ. بەڵام هەرچی زیاتری ڕێز بۆ دادەنێن، ئەو زیاتر هەست بە ئازار دەکا و ئۆقرەی لێهەڵدەگیرێ. لای من دانی بەوەدا نا کە چەن جار ویستوویەتی خۆی بکوژێ. بەڵام بیرۆکەیەکی دیکە مێشکی دادەگرێ ـ بیرۆکەیەک کە سەرەتا مەحاڵ بوو و نەیدەتوانی بیری لێبکاتەوە، ئەگەرچی ئاخری وا بە سەر ڕۆحیدا زاڵبوو نەیدەتوانی خۆی لە چنگ دەرباز بکا. لە خەونیدا هەڵدەستێ و دەڕواتە دەرێ و لە هەمبەر خەڵکیدا دان بە تاوانەکەیدا دەنێ. ماوەی سێ ساڵ ئەو خەونە دەستی لە کۆڵ ناکاتەوە و بە شێوەی جۆراوجۆر چنگ لە مێشکی گیر دەکا. ئاخری بەو ئاکامە دەگا ئەگەر دان بە تاوان و جینایەتەکەیدا بنێ، ڕۆحی شیفا دەدرێ و هەتا هەتا هێمنایەتی باڵی بە سەردا دەکێشێ و گیانی ئاسوودە دەبێ. بەڵام ترس و دڵەخورپە دایدەگرێ و نازانێ چۆن ئەو کارەبکا. هەتا ئەو کاتەی کە ڕووداوی دوێنێکەی من بەسەردا دێ. «بە دیتنی ئەو کارەی تۆ، منیش بڕیاری خوم داوە.» چاوم لێکرد، دەستم بە ڕانمدا دا و گوتم:

ـ یانی ڕووداوێکی ئاوا بێ بایەخ بووە هۆی ئەوەی تۆ ئەو بڕیارە گرینگە بدەی؟

وەڵامیدایەوە: «بڕیارەکەی من سێ ساڵ بوو لە مێشکمدا گووڕابوو و ڕووداوەکەی تۆ بە یەکجاری ڕسکاندی. کاتێک بیرم لەو کارە جوانەی تۆ کردەوە خۆمم لۆمە کرد و بەخیلیم پێبردی.» ئەوەشی بە ڕوویەکی ناخۆشەوە دەربڕی.

گوتم: «بەڵام بڕوا بە قسەکەت ناکەن. ئەو ڕووداوە چاردە ساڵ لەمەبەر قەوماوە.»

ـ بەڵگەم هەیە، بەڵگەی گەورە و باوەڕ پێکراو. ئەوانە دەنوێنم. منیش هەستامە سەر پێ و هاوارمکرد، لە باوەشم گرت و ڕامموسی.

(وەک ئەوەی هەموو شتێک پێوەندیی بە منەوە بێ) گوتی: «شتێک، شتێکم پێبڵێ. ژنەکەم، منداڵەکانم! ژنەکەم لە حەیبەتدا دیقدەکا. ئەگەر چی منداڵەکانم ملک و سامانەکەیان لەدەست نابێتەوە، بەڵام تاهەتایە وەک منداڵی تاوانبارێک چاویان لێدەکەن! چ بیرەوەرییەک، چ بیرەوەرییەک لە دڵیاندا بەجێ دێڵم!»

هیچم نەگوت.

ـ هەڵبڕان لە ژن و منداڵەکەم و بەجێ هێشتنیان بۆ هەمیشە؟ هەتا هەتا، دەزانی هەتا هەتا!

بە ئارامی دانیشتم و لە بەر خۆمەوە دوعایەکم خوێند. پاشان هەستام، هەستم بە مەترسی دەکرد.

چاوی تێبڕیم و گوتی: «چیبکەم؟»

گوتم: «بڕۆ! لە هەموو جێگایەک بیکە بە قاو. هەموو شتێک دەڕوا و تێدەپەڕێ، تەنیا هەقیقەت دەمێنێتەوە. منداڵەکانت گەورەبن، لە بڕیارە گەورەکەت دەگەن و شانازیت پێوە دەکەن.»

ئەو کاتە وەک بڵێی بڕیاری خۆی داوە، بەجێیهێشتم. بەو حاڵەشەوە ماوەی دوو حەوتوو هەموو ڕۆژێک عەسرانە دەهات بۆ لام. هەر وا خەریکی خۆ ئامادە کردن بوو، بۆ ئەو کارەش هەروا دوو دڵ بوو و لە سەری ساغ نەدەبۆوە. دڵم پێی دەسووتا. ڕۆژی وابوو دەهات بڕیاری ئاخری دەدا و بە تین و تاوەوە دەیگوت:

ـ دەزانم ئەو کاتەی دان بە تاوانەکەدا دەنێم، دنیا لە بەر چاوم دەبێتە بەهەشت. چاردە ساڵ لە دۆزەخدا بووم. دەمهەوێ ئازار بکێشم. سزاکەی ببینم و دەستبکەمەوە بە ژیانێکی ئاسایی. دەتوانین بە تاوانباری لە دنیا دەرچین، بەڵام گەڕانەوە لە گۆڕێدا نابێ. ئێستا ناوێرم جیرانەکەم و تەنانەت

منداڵەکانی خۆمم خۆش بوێ. خودایە گیان! منداڵەکانم ڕەنگە لەوە بگەن کە چ ئازارێکم چێشتووە و چ سزایەک دراوم، هەر بۆیە مەحکوومم ناکەن! خودا لە توانایيدا نییە، بەڵکو لە هەقیقەتدایە.

پێمگوت: « هەموو لە کردەوە جوان و مەزنەکەت دەگەن، ئەگەر خێراش تێینەگەن، دواتر بۆیان دەردەکەوێ. چونکە ڕێزت بۆ هەقیقەت داناوە. هەقیقەتی ئاسمانی، نەک هەقیقەتی زەوینی.»

بە ڕواڵەتێکی هێمنانەوە، دەڕۆیشت، بەڵام ڕۆژی دوایی دیسان دەهاتەوە: خەمۆک و ڕەنگ بزڕکاو و لۆمەکار.

ـ هەر کاتێک دێم بۆ لات، هێندەم ئەو چاوە پڕ پرسیارانەت تێدەبڕی، وەک ئەوەی بڵێی: «هێشتا لە قاوت نەداوە!» تۆزێ سەبرکە، دڵت لە من نەهێشێ. ئەو جۆرەی بیری لێدەکەیتەوە، وانییە. چونکە ئەوە کارێکی هەروا سادەنییە. ڕەنگە ئەو کارە هەر نەکەم. تۆ خۆ ناچی ڕاپۆرتم لێبدەی، ها؟

دوای ئەوەی بە وردی چاوێکم لێکرد و دەترسام هەر چاویشی لێبکەم. بە دەست دڵەوڕێزەوە ئازارم دەکێشا و خەم و خەفەت دایدەگرتم و شەوانە خەو نەدەچووە چاوم.

لە درێژەی قسەکانیدا دەیگوت: «هەر ئێستا لە لای هاوسەرەکەمەوە هاتووم. دەزانی وشەی «هاوسەر» یانی چی؟ کاتێ هاتمە دەرێ، منداڵەکان دەیانگوت: «باوەگیان خودا حافیز، زوو بگەڕێوە و گۆڤاری منداڵانمان لە گەڵ بخوێنەوە» نا، تۆ سەرت لەوە دەرناچێ، کەس لە دەردی کەس ناگا.»

چاوی بریقەی دەهات و لێوی دەلەرزی. لە ناکاو شتێکی کێشا بە مێزەکەدا و کەلوپەلی سەرمێزەکە هەموو هەڵبەزینەوە ـ یەکەم جار بوو وایدەکرد، چونکە پیاوێکی هێدی و لەسەرەخۆ بوو.

گوتی: «ئاخر کوا پێویست بەوە دەکا؟ بۆ ئەو کارە بکەم؟ هیچکەس مەحکووم نەکراوە و هیچکەسیش بەجێی من بۆ سیبریا ڕاپێچنەکراوە، ئەو کوڕەش لەرز و تۆبەتێ کوشتی. ئەوەندەشم لەو ماوەیەدا ئازار چێشتووە، تاوانی خوێنی ژنەم داوەتەوە. جگە لەوەش باوەڕم پێناکەن و بڕوا بە

بەڵگەکانیشم ناکەن، پێویست بە دان پیانان دەکا، ها؟ ئامادم لە بەر خاتری ڕشتنی ئەو خوێنە، هەتا کۆتایی تەمەنم ئازار بکێشم. هەر لە بەر ئەوەی ژن و منداڵەکانم تێدانەچن. یانی پێت کارێکی عادڵانەیە ئەوانیش بەهۆی منەوە لە نێو بچن؟ پێتوا نییە کارێکی هەڵەیە؟ لەو بارەوە چی بە باش دەزانی؟ پێتوایە خەڵک لەوە بگەن و ڕێزی بۆ دانێن؟

لەبەر خۆمەوە گوتم: «خودایەگیان! لە کاتێکی ئاوادا بیر لە ڕێزی خەڵکی دەکاتەوە!» ئەوەندەی بۆ بە داخەوە بووم ئەگەر بووبوایەتە هۆی هێور بوونەوەی، هاوبەشیم لە چارەنووسیدا دەکرد. دیتم هۆشی لە لا نەماوە و خەریکە دڵی بێخود بێ. واقم وڕما بوو و بە دڵ و ئاوەزم تێگەیشتم مانای ئەو بڕیارە چییە.

دیسان گوتی: «سەبارەت بە چارەنووسم بڕیارێک بدە!»

بەمنجەمنج گوتم: «بڕۆ قاو بڵاو بکەوە.» دەنگم دەرنەدەهات، بەڵام هەر چۆنێک بوو درکاندم. وەرگێڕاوە ڕووسییەکەی «سەردەمی نوێ» لە سەر مێزەکە بوو، دەستم دایە و ئینجیلی یوحەننا، بەشی دوازدەهەم، ئایەتی بیست و چوارم پیشاندا:

«ئامین، ئامین، پێتان دەڵێم ئەگەر دەنکە گەنم بکەوێتە عەرز و نەمرێ، بەتەنیا دەمێنێتەوە، بەڵام ئەگەر بمرێ داهاتی زۆر دەداتەوە.»

هەر ئەو کاتەی پێی نایە ژوورێ، خەریکی خوێندنەوەی ئەو ئایەتە بووم. خوێندییەوە.

گوتی: «ڕاستە.» زەردەیەکی تاڵی گرت و دوای ئیستێک گوتی: «ئەوەی لەو کتێبانەدا نووسراوە، ترسناکە. ئاسانە بیانخەیتە ئەستۆی کەسێکی دیکە. کێ ئەوانەی نووسیوە؟ دیارە مرۆڤ نووسیویەتی و شکی تێدا نییە؟»

گوتم: «خودای گەورە نووسیویەتی.»

دیسان بەبزەیەکەوە و ئەمجارە تاڕادەیەک بەڕقەوە گوتی: «زۆربڵەیی بۆ تۆ ئاسانە.» دیسان کتێبەکەم هەڵگرت، لاپەڕەکانیم هەڵدایەوە و بەشی دەهەم ئایەتی سی ویەکم پیشاندا، کە ڕیسالەیەک بوو بۆ عیبرانییەکان. خوێندییەوە:

«کەوتنە دەست خودای زیندوو زۆر سامناکە.»

ئەوەی خوێندەوە و کتێبەکەی دانا، سەرتا پای دەلەرزی.

گوتی: «کتێبێکی بەسامە. حاشای لێناکرێ کە ئایەتێکی بەجێ و تایبەتت هەڵبژاردووە» هەستا سەرپێ. گوتی: «چاکە! خودا حافیز، ڕەنگە ئیتر چاوم پێت نەکەوێتەوە... لە بەهەشت یەکتر دەبینینەوە. کەوایە لەم چاردەساڵەدا «لە دەست خودای زیندوو» دابووم، دەبێ ئاوا بیر لەو چاردە ساڵە بکەینەوە. سبەینێ لە بەر ئەو دەستە دەپاڕێمەوە ڕزگارمبکات.»

دەمویست لە ئامێزی بگرم و ماچیبکەم، بەڵام نەموێرا ـ ڕۆخساری شڵەژاو و خەمبار بوو. ڕۆیشت. لە دڵی خۆمدا گوتم: «خودایەگیان، ئەو ڕۆیشت و دەبێ چبکا و لە گەڵ چی بەرەوڕوو بێ؟» لە هەمبەر پەیکەری پیرۆزدا چۆکم دادا و لە بەردەمی دایکی دوو دنیادا، پارێزەر و یارمەتیدەری تیژ باڵمان، گریام و بۆی پاڕامەوە. نیو سەعات دوعام بۆ کرد و فرمێسکم هەڵوەراند ئێوارەیەکی درنگ وەخت بوو، وڵات تاریک داهاتبوو. لە پڕ دەرگاکە کرایەوە و هەمیسان خۆی بە ژووریدا کرد. پێم سەیر بوو.

پرسیم: «چووی بۆ کوێ؟»

گوتی: «پێموایە شتێکم لە بیر چووە... دەستەسڕەکەم، پێموایە... دەی ئەگەر هیچیشم لە بیر نەچووبێ، لێمگەڕێ با تاوێک لێرەبم.»

دانیشت. لە ژوور سەری ڕاوەستام. گوتی: «تۆش دانیشە.» دانیشتم. نزیکەی دوو دەقیقە هیچمان متەقمان نەکرد. بەوردی تێم ڕاما و لە ناکاو زەردەیەکی گرت ـ ئەوەم هەر لە بیرە ـ پاشان هەستایە سەر پێ، بەگەرمی لە ئامێزی گرتم و دەستیکرد بە ماچکردنم.

گوتی: «لەبیرت بێ ئەوە دووهەمین جارە دێم بۆ لات. گوێت لێیە؟ لە بیرت بێ!»

یەکەم جار بوو ئاوا ڕووهەڵماڵدراوانە دەی کردمە بەردەنگی خۆی. پاشان چووە دەرێ. لە بەر خۆمەوە گوتم: «سبەینێ.»

هەرواش بوو. ئەو ڕۆژە نەمدەزانی سبەینێکەی ڕۆژی لە دایک بوونیەتی. چەند ڕۆژ بوو لە ماڵ نەچووبوومە دەرێ، بۆیە لەوە ئاگادار نەبووم. لەو ڕۆژەدا زۆر جاران کۆڕێکی گەورەی دەگرت و تەواوی خەڵکی شار دەچوون. ئەمجارەش هەر بەو شێوەیە بوو. دوای شام دێتە نێوەڕاستی هۆڵەکە، کاغەزێک بەدەستەوە، بە شێوەی فەرمی ڕاپۆرتێک لە هەمبەر خەڵکەکەدا دەخوێنێتەوە زیاتر ڕووی قسەی لە سەرۆکی دایەرەکەی دەبێ کە ئەویش لەوێ حوزووری دەبێ، بە دەنگێکی بەرز چۆنیەتیی ڕووداوەکەی بۆ دانیشتوانی کۆڕەکە باسدەکا. لە کۆتاییدا دەڵێ: «وەک ڕمووزن لە نێو ئێوەی مرۆڤ دەچمە دەرێ. خودا خۆی نیشانداوم. دەمهەوێ لە بەر ئەو تاوانە گەورە پاشماوەی ژیانم ئازار بکێشم!»

پاشان هەموو ئەو شتانەی کە ماوەی چاردە ساڵ بوو شاردبوویە، دەری هێنا و لە سەر مێزەکەی دانان. ئەو شتانەی کە پێیوابوو دەبنە بەڵگە بۆ تاوانەکەی: ئەو خشڵ و زمبەرانەی بۆ شوێنەونکێ لە ژنەی دزیبوو. خاچ و میداڵیایەک کە لە ملی ژنەی داماڵیبوو. وێنەی لە قەتحەگیراوی مێردی ژنە و دەفتەری یاداشت و دوو نامە، یەکیان هی دەزگیرانەکەی بوو کە بۆی نووسیبوو بە زووترین کات دێ بۆ لای، هەروەها وەڵامی ناتەواوی ژنەکە لە سەر مێزەکە بوو کە ویستبووی ڕۆژی دوایی بۆی بەڕێبکا. ئەو دوو نامەیەی لە گەڵ خۆی هێنابوو - بۆ چی؟ «بۆ لە جیاتی لە نێو بردنی ئەوانە وەک بەڵگەی تاوان، چاردە ساڵ لە لای خۆی ڕایگرتوون؟

ئەوەی ڕووی دا ئەمە بوو: هەموو تاسان و ترس دایان دەگرێ، ئەگەر چی زۆر بە وردی گوێیان بۆ ڕاگرتبوو، بەڵام باوەڕی پێناکەن و پێیان وا دەبێ شێت بووە. چەند ڕۆژ دواتر لە هەموو شاردا دەبێتە دەمگۆ کە ئەو کابرا فەقیرە شێت بووە. کاربەدەستانی دادگاش ناتوانن واز لە پێداچوونەوەی پەروەندەکە بێنن، بەڵام ئەوانیش زۆری گوێ نادەنێ و دەستی لێهەڵدەگرن. ئەگەر چی ئاڵتوون و نامە و شتەکان تووشی گومانیان دەکات، بەڵام بەو ئاکامە دەگەن کە ئەو شتانە ئەگەر ڕاستیش بن، نابنە هۆی سەلماندنی

تاوانێک. چونکە لەوانەیە ژنە ئەو شتانەی لە کاتی ژیاندا وەک یادگاری پێدابێ، یان داوای لێکردبێ بۆی هەڵگرێ و بیپارێزێ. ئەگەر چی دواتر ئەو بەڵگانە لە لایان دۆستان و خزمانی ژنەوە بە ڕاست دەزاندرێ و هیچ شک و گومانێک لە گۆڕێدا نامێنێ. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وایلێهات بە هۆی ئەوانەشەوە. نەیان توانی هیچ شتێک بسەلمێنن. پێنج ڕۆژ دوای ئەوە، لە نێو شار دەنگی داوە کە کابرا نەخۆشە و ژیانی لە مەترسی دایە. ناتوانم باسی چۆنییەتی نەخۆشییەکەی بکەم، گوتیان تووشی نەخۆشیی دڵ بووە. بەڵام دەرکەوت کە هاوسەرەکەی داوای لە پزیشکەکان کردووە بە هەموو شێوەیەک تاقیکاریی لە سەر بکەن، دوکتۆرەکان بەو ئاکامە دەگەن کە حاڵی گۆڕاوە و گوشاری ڕۆحی شێتی کردووە. خەڵکی بۆ پرسیار دەهاتن بۆ لای من، بەڵام هیچم ئاشکرا نەدەکرد. ئەگەر دەشمویست بچم بۆ ملاقاتی نەیاندەهێشت. زیاتریش ژنەکەی بەرگریی لێدەکردم.

پێیدەگوتم: «تۆ بوویەتە هۆی نەخۆشییەکەی. ئەو هەمیشە خەمبار و مات بوو. بەڵام لە ساڵی ڕابردووەوە خەڵکی بۆیان دەرکەوت، زۆر سەیر تووشی شڵەژان بووە و کاری سەیر و سەمەرە دەکا، ئێستاش تۆ بوویەتە هۆی لە نێو چوونی. قسەکانی تۆ بەو دەردەی برد، چونکە لە ماوەی ئەو مانگەی ڕابردوودا هەر لەگەڵ تۆ بووە.» لەڕاستیدا نەک هەر ژنەکەی تەواوی خەڵکی شار بەگژمدا دەهاتن و سەرکۆنەیان دەکردم. دەیانگوت «کار کاری تۆیە.» من متەقم نەدەکرد و لەڕاستیدا دڵشادیش بووم، چونکە دەمدی ڕەحمەتی خودا دەڕژێ بە سەر کەسێکدا کە دژ بە خۆی ڕاپەریوە و دەیهەوێ خۆی سزا بدا. بڕوام بە شێت بوونەکەی نەدەکرد. ئاخری ئیزنیان دام چاوم پێیبکەوێ، پێداگریی دەکرد کە بمبینێ و ماڵئاواییم لێبکا. هەر کە چاوم پێیکەوت تێگەیشتم کە چەن سەعاتێکی دیکە دەژی. وشک و ڕەق بووبۆوە، دەستی دەلەرزی و کەوتبووە هەناسەبڕکێ. بەڵام ڕوخساری ڕەزایەت و بەختیاریی پێوە دیار بوو.

گوتی: «هەموو کارێکم تەواو کرد و دڵنیا بووم. لە مێژە تامەزرۆی دیدارتم، بۆ نەدەهاتی؟»

نەمگوت نەیانهێشتووە چاوم پێی‌بکەوێ.

- خودا ڕەحمی پێکردم و بانگمدەکا بۆ لای خۆی. دەزانم دەمرم، بەڵام دوای ئەو چەند ساڵە، بۆیەکەم جارە هەست بە شادی و ئاسوودەیی دەکەم. ئێستا دەوێرم منداڵەکانم خۆش بوێ و ماچیان بکەم. نە ژنەکەم و نە قازییەکان و نە خەڵکی شارەکە، هیچکام باوەڕم پێناکەن. منداڵەکانیشم قەت باوەڕ ناکەن. لەم بارەشەوە هەست بە ڕەحمەتی خودا دەکەم و وەک لە بەهشت بم وایە، دڵشادم کە ئەرکی خۆم بەجێ هێناوە.

نەیدەتوانی بدوێ. وەهەناسەبڕکێ کەوتبوو، دەستمی بە گەرمی دەگوشی و بە تاسەوە چاوی تێبڕیبووم. زۆری قسە نەکرد. ژنەکەی لە پەستا سەری دەکێشا. بەڵام دەرفەتی هێنا بە سرتە پێمبڵێ:

- لە بیرتە ئەو شەوە دوو جار هاتم بۆلات؟ گوتم "لە بیرت بێ". دەزانی بۆ گەڕامەوە؟ بۆیە گەڕامەوە بتکوژم!

داچڵەکیم.

- کاتێ لە لای تۆ ڕۆیشتم، بەو شەوە تاریکە بە شەقامەکاندا پیاسەمکرد و لە گەڵ خۆمدا کەوتمە کێشە. لە ناکاو وام ڕق لە تۆ هەستا و لێت بێزار بووم، بە جارێ ئۆقرەم لێ‌هەڵگیرا و لە دڵی خۆمدا گوتم. ئێستا ئەو تەنیا کەسێکە هاڵاوەتە دەست و لاقم و بۆتە قازیم. ناتوانم حاشا لە بەڵێنەکەم بکەم، چونکە ئەو ئاگاداری هەموو شتێکە. ترسی ئەوەشم نەبوو ڕاستیم لێ‌بڵێی (بیرم لەوە هەر نەدەکردەوە) بەڵام لە دڵی خۆمدا گوتم: «ئەگەر دان بە تاوانەکەمدا نەنێم، چۆن دەتوانم چاو لە چاوی بکەم؟» ئەگەر لەو سەری دنیاش بوایەی تۆفیرێکی نەبوو. ئەو بیرەم بۆ تامڵ نەدەکرا کە تۆ زیندوو بی و هەموو شتێک بزانی و مەحکوومم بکەی. هێندەم ڕق لێت هەستا بوو، دەتگوت بنۆسی کارەکە تۆی و شیاوی لۆمە و سەرکۆنەی. بۆیە گەڕامەوە بۆ لات، وەبیرم هاتەوە خەنجەرێکت لە سەر مێزەکە داناوە. دانیشتم و داوام

لە تۆش کرد دانیشی. دەقیقەیەکی تەواو بیرم کردەوە. ئەگەر بمکوشتبایەی، بەو قەتڵە دەبوومە هۆی فەوتانی خۆم، واتە دانم بە قەتڵەکەی پێشووشدا نەدەنا. بەڵام بیرم لەوە هەر نەکردەوە لەو کاتەدا نەموسیت بیری لێبکەمەوە. تەنیا ڕقم لە تۆ بوو و لەو کاتەدا دەموسیت تۆڵەی هەموو شتێک لە تۆ بکەمەوە. خودا لە دڵمدا شەیتانی بەزاند. بەڵام ئەوەش بزانە بە عومراتی خۆت ئەوەندە لە مەرگ نزیک نەبوویتەوە.

حەوتوویەک دواتر بۆ هەمیشە چاوی لێکنا. ئاپۆرەی خەڵک لەڕێورەسمی ناشتنیدا بەشدارییانکرد. قەشەی مەزن مژولیایشێکی پڕهەست و سەرنج ڕاکێشیکرد. تێکرای خەڵک سەبارەت بەو نەخۆشییە ترسناکەی ئاوا تەمەنی تاواندەوە، دەدوان و دەگریان. بەڵام دوای ناشتنەکەی تەواوی خەڵک ڕقیان لێهەڵگرتم و چاویان بەرایی نەدەدا بمبینن. تاقمێک، سەرەتا چەند کەس و پاشان زیاتر، دوای مردنەکەی بەو باوەڕە گەیشتن و هاتن بۆ لام و بە تاسەمەندییەوە پرسیاریان لێدەکردم، چونکە مرۆڤ پێی خۆشە سەرەنگری بوون و بەدناو بوونی عادڵان ببینێ. بەڵام زمانی خۆم گرێدا و دوای ماوەیەک لەو شارە ڕۆیشتم. پێنج مانگ دواتر بە پشتیوانیی خودا پێم نایە ئەم ڕێگا ئەمن و پیرۆزەوە و سپاسی ئەو قامکە پیوارەم کرد کە بە ئاماژە ئاسمانییەکەی بەرەو ئەم ڕێگایە ڕێنوێنیی کردم. بەڵام هەموو ڕۆژێک، هەتا ئەمڕۆش، لە دۆعا و پاڕانەوەکانمدا ئەو بەندەی خودایەم ـ میخاییل ـ لەبیرە، چونکە ئەو بێچارەیە ئازارێکی زۆری کێشا.

# (٣)

## ئاخافتن و ئامۆژگارییەکانی باوە زووسیما

(٥) ڕاهیبی ڕووسی و پلە و پایەی گریمانەییی ئەو

باوکان و مامۆستایان، ڕاهیب چکارەیە؟ لەم سەردەمەدا، لە دنیای خاوەن ژیاری ئەمڕۆدا، تاقمێک بە چاوی سووک لێیدەڕوانن وەک وشەیەکی ناحەز و جنێو کەڵکی لێوەردەگرن، ڕۆژ لە گەڵ ڕۆژیش ڕاهیب زیاتر لە بەر چاوی خەڵک سووک دەبێ. بە داخەوە تاقمێکیش تەوەزل و زگهانک و هەرزە و خوازەڵۆکی بێشەرم و حەیاش لە نێو ڕاهیبەکاندا هەیە. کەسانی خوێندەوار ئاماژە بەوانە دەکەن: «ئێوە لەش گران و تەوەزەلن، ئەندامێکی خوێڕیی کۆمەڵگان، لە سەر بەرهەمی ڕەنجی خەڵکی زگ بەردەدەنەوە، ئێوە تاقمێک سواڵکەری بێ ئابڕوون.» لەگەڵ ئەوشدا زۆرمان ڕاهیبی خاکەڕا و سەبوور هەیە کە ئاواتەخوازی خەڵوەتخانە و چلەکێشان و پاڕانەوەی پڕتین و تاون. ئەوانە کەمیان ئاوڕ لێدەردرێتەوە و کەس ناویان ناهێنێ. ڕەنگە خەڵکی تووشی سەرسامی بن، ئەگەر بڵێم هەر ئەم قەشە سەبوورانە کە ئاواتە خواز و تامەزرۆی عیبادەت و پاڕانەوەن لە تەنیاییدا، دەبنە، هۆی ڕزگاریی ڕووسیا و دەیبووژێننەوە. چونکە لە ڕاستیدا ئەمان لە هێمنایەتی و بێدەنیگدا « خۆیان بۆ ڕۆژان و سەعات و مانگ و ساڵان» ئامادە دەکەن. لە گەڵ ئەوەشدا هەوڵدەدەن لە سووچی خەڵوەتخانەکەیاندا، دینی مەسیح و پەیکەرەکەی وەک چۆن لە باوکانی دێرین و پێغەمبەران و شەهیدانیان وەرگرتووە، وەک پاقژیی هەقیقەتی خودا خاوێن و بێگەرد ڕایگرن. لەگەڵ گەیشتنی کاتی خۆی، لە هەمبەر دینە بن بۆشەکانی دنیادا بەرزی دەکەنەوە. ئەوەش بیرۆکەیەکی زۆر گەورەیە و وەک ئەستێرەیەک لە ڕۆژهەڵاتەوە هەڵدێ.

بڕوای من سەبارەت بە ڕاهیب ئەوەیە، پێتانوایە هەڵە بێ؟ ئایا لەخۆباییانەیە؟ چاو لە دنیاپەرستان بکەن و هەموو ئەوانەی خۆیان لە خەڵکی خودا بە زیاتر دەزانن، پێتان وانییە نووری خودا و هەقیقەتی خودا لەواندا چەواشە بووە؟ ئەوان خاوەن زانیارین، بەڵام زانست هیچی تێدا نییە جگە لە شتێک کە هەستپێدەکرێ. جیهانی مەعنەوی و پاژی بەرزتریشی واتە بوونی مرۆڤ، بەجارێ تووڕ هەڵدراوە و لەگەڵ چەشنێک سەرکەوتن و تەنانەت لەگەڵ بێزاری، دوور فڕێدەدرێ. دنیا بە تایبەت لەم دواییانەدا وایلێهاتووە، حکوومەت بانگی ئازادی دەدا، بەڵام چی لەو ئازادییەیاندا دەبینین؟ هیچ شتێک جگە لە کۆیلەیی و خۆکوژی! چونکە دنیا دەڵێ:

ـ تۆ هەواو هەوست هەیە و دایدەمرکێنیتەوە، چونکە تۆش ئەو مافەت هەیە کە دەوڵەمەندترین و بەهێزترین مرۆڤەکان هەیانە. لەڕازیکردنی نەفس و تەنانەت زیاد کردنیشی مەترسە.» ئەوەش نەزمی نوێی دنیایە. ئازادی لەوەدا دەبینن. چی بەدوای مافی زیادکردنی هەواوهەوەسدا دێ؟ دەوڵەمەندی، جودایی و خۆکوژیی ڕۆحیی پێوەیە و هەژاری، بەخیلی و کوشتن؛ چونکە هەقیان پێدراوە، بەڵام کەرەسەی ڕازیکردنی ویستەکانیان پیشاننەداون دەڵێن دنیا، بە سەرکەوتن بە سەر مەوداکان و فڕینی بیرۆکەکان بە حەوا دا، زۆر خۆش و شیرینتر دەبێ و لە کۆمەڵگایەکی برایانەدا زیاتر و زیاتر لێک گرێ دەدرێن. مخابن ناکرێ دڵ بەو جۆرە بەڵێنیی یەکبوونە ببەستین. لێکدانەوەی ئازادی بەشێوەی زێدەڕەوی لە هەواو هەوەسدا سروشتی مرۆڤ چەواشە دەکاتەوە، چونکە زۆربەی مگێز و هەوەس و خووخدەکانیان بێمانا و گەوجانەیە و بیرۆکەی قۆڕ و بێتام لە نێویاندا گەشە دەکا. تەنیا بۆ ئەوە دەژین بەخیلی بە یەکتر بەرن. زگەڕۆیی و بافیش و لووت هەڵێنان، خواردن و سەردان و هاموشۆی یەکتر، بە پێویست زانینی عارەبانە و پلە و پایەی کۆمەڵایەتی و کۆیلەداری، ئەمانە بوونەتە هۆی ئەوەی هەست و ئابڕوویان لە نێو بچێ. مرۆڤ ئەگەر نەتوانێ بە ئەم حەز و ئاواتانەی بگا پەنا بۆ خۆکوژی دەبا. ئەم شتانە لە نێو خەڵکی هەژار و ڕەشوڕووتدا بەرچاوە، بەڵام ئەو

جیاوازییەیان هەیە ئاواتە وەدی نەهاتووەکانیان و بەخیلی و چاوبرسی بوونی خۆیان لە مەستیدا دەشارنەوە. بەڵام زۆر زوو بەجێی شەڕاب خوێن دەنۆشن. چونکە بەرەو ئەو ڕێگایە دەکێشرێن. لە ئێوە دەپرسم ئایا مرۆڤێکی ئاوا ئازادە؟ یەکێ لەو «لایەنگرانی ئازادی» یەم دەناسی و خۆی پێیگوتم، کاتێک لە زیندان تووتنی وەدەستناکەوێ، لە حەیبەتان هێندەی نامێنێ بۆ جگەریەک خەیانەت بە ڕێبازەکەی خۆی بکا! هەر مرۆڤێکی ئاواشە دەڵێ: «من بۆ مرۆڤایەتی تێدەکوشم» مرۆڤێکی ئاوا چۆن دەتوانێ خەبات بکا، چیی لە دەست دێ؟ ڕەنگە کارێکی چووکەی لە دەست بێ، بەڵام ناتوانێ ماوەیەکی زۆر لە سەر پێی خۆی ڕاوەستێ. سەیریش نییە بەجێی وەدەست هێنانی ئازادی ببنە کویلە و نۆکەر و بەجێی خزمەت کردن بە ئامانجی برایەتی و یەکیەتیی مرۆڤ بکەونە چاڵی جودایی و تەنیاییەوە. هەروەک لە سەر دەمی لاویمدا میوانە پڕپێچوپەناکەم پێیگوتم. بۆیە ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ زیاتر بیرۆکەی خزمەت بە مرۆڤایەتی و ئەشقی برایەتی و یەکیەتیی مرۆڤ لە دنیادا لە نێو دەچێ. لەڕاستیدا ئەو بیرۆکەیەش هێندێ جار بەشتێکی قۆڕ و بێمانا دەزانن و وەک گاڵتەجاڕی لێی دەڕوانن. چونکە کاتێک خووخدەی لە ڕادە بەدەری ویست و هەوەس دەست و پێی دەخاتە کوتو زنجیرەوە، چۆن دەتوانێ واز لەو عادەتە چەق بەستووانە بێنێ؟ ئەو تاق کەوتۆتەوە و کاری بە سەر مرۆڤایەتییەوە نەماوە! توانیویانە ماڵ و کەلوپەلی زیاتر کۆ بکەنەوە، بەڵام شادی و هیوا لە دنیادا بە جارێ لە کەمیی داوە.

ڕێگای تەرکە دنیایی جیاوازە، پێکەنینیان بە نوێژ و ڕۆژوو دێ، لە گەڵ ئەوەشدا (ڕێگای گەیشتن بە ئازادیی ڕاستەقینە لەواندایە.) من ویستە گەندەڵ و ناپێویستەکان هەڵدەپاچم و هەستی لەخۆبایی بوون و سەرەڕۆیی لەغاو دەکەم و دەیهێنینە ژێر ڕکێفی ئیتاعەتەوە. بە پشتیوانیی خودا دەگەم بە ئازادیی ڕۆح و لەگەڵ ئەویشدا شادیی مەعنەوی دەستەبەر دەبێ. کێ دەتوانێ بیرۆکەیەکی گەورە پەروەردە بکات و بیگەشێنێتەوە ـ ئەو دەوڵەمەندەی تاق کەوتۆتەوە، یان ئەو کەسەی خۆی لە چنگ ماڵی دنیا و خووخدەکان ڕزگار

کردووە؟ ڕاهیب لۆمە دەکەن چونکە خەڵوەتنشینی دەکا: «خۆت لە نێو چوار دیواریی کلێسەدا شاردۆتەوە و بۆ ڕزگاریی خۆت هەوڵ دەدەی و خزمەت کردنی برایانەشت هەر لە بیر نییە، کۆمەڵگا و مرۆڤایەتیت خستۆتە پشت گوێ!» بەڵام دەبینن لە بواری ئەشقی برایانەدا کامیان گیان فیداترن. چونکە ئەوانن تاق کەوتوونەتەوە نەک ئێمە، چاویشیان بەرایی دیتنی ئێمە نادا. لە ڕۆژگارانی دێریندا ڕێبەرانی خەڵک لە نێو ئێمەدا هەڵدەکەوتن. بۆ دیسان لە نێو ئێمەدا سەر هەڵنەدەن؟ هەر ئەو زاهیدە سەبوور و خاکەڕایانە ڕادەپەڕن و خزمەت بە ڕێگای ئەو ئامانجە گەورەیە دەکەن. ڕزگاریی ڕووسیا بە ئیرادەی خەڵکەوەیە و ڕاهیبی ڕووسی بەردەوام لایەنگری خەڵک بووە. ئێمە تاق دەکەوین ئەگەر خەڵکی تاق بکەون. خەڵکی هەر ئەو ئیمانەیان هەیە کە ئێمەش هەمانە. ئاشتی خوازی بێ ئیمانیش هەرگیز لە ڕووسیا کارێک بەڕێوە نابا. تەنانەت ئەگەر زۆر زۆریش ڕاستویژ و کارامە بێ. ئەوەتان لە بیر نەچێ! خەڵکی لە دین وەرگەڕاوان دەبینن و بە سەریاندا زاڵدەبن، ڕووسیاش تاقانە و ئۆرتۆدۆکس دەبێ. ئاگاداری لە گوندنشینان بکەن و ئاگاتان لە دڵیان بێ. بۆ فێرکردن و بارهێنانیان بە نەرمی و بەرە بەرە بچنە پێشێ. ئێوە وەک ڕاهیبێک ئەو ئەرکەتان لە سەر شانە، چونکە لادیی خودا لە دڵیان دایە.

(٦) سەبارت بە ئەربابان و خزمەتکارن:

بڵێی ئەرباباان و فەرمانبەران لە باری ڕۆحییەوە ببنە برا؟

هەڵبەت دەبێ و حاشا لەوە ناکەم گوندنشینەکانیش تاوانباریان تێدایە و ئاگری گەندەڵێش ڕۆژ لە گەڵ ڕۆژ پتر پەرە دەستێنێ و وڵاتی داگرتووە. ڕۆحی دوورەپەرێزی و تاق کەوتنەوەش خەڵکی داگرتووە. سووت و سەلەم خۆرانی گۆمەڵگا وەک زەروو سەریان هەڵداوە. بازرگانان برسی و تامەزرۆی پلە و پایەن، هەوڵدەدەن خۆیان وەک خاوەن فەرهەنگ و ژیار نیشانبدەن. بەڵام ئەوەی نەیانبێ فەرهەنگە و لەم ڕێگایەدا بەوپەڕی خوێڕییەتییەوە دابونەریتی دێرینی خۆیان پێ سووکە و تەنانەت ئیمانی باب

و باپیرانیان بەشتێکی سووک و بێبایەخ دەزانن. دەچنە دیداری شازادە و سڵاوات لە دیداری لێدەدەن، ئەگەر چی نەگۆڕاون و هەر ئەو لادێیە گەندەڵن کە بوون. لادێیی خەریکە لە نێو مەستی و بێ هۆشیدا دەڕزێن و ناتوانن دەست لەو عادەتەیان هەڵگرن. چ زوڵمێکە لە هاوسەر و منداڵەکانیان! هەمووشی بە هۆی مەستییەوە! منداڵی دە ساڵانم دیوە لە کارگاکان کار دەکەن، زەڕدەڵ و ڕەقەڵ، ڕیوەڵە و کۆم و خەمبار. کارگەی تەنگوترش و هاڕوهۆڕی مەکینە، ڕۆژ تا ئێوارێ ئارەق دەڕێژن. زمانی پیس و مەشرووب، مەشرووب ـ ئایا ئەوەی دڵی منداڵ دەیخوازێ ئەوەیە؟ ئەو پێویستی بە تیشکی خۆر و کایەی منداڵانەیە، سەرمەشقی باش و خۆشەویستیی دەوێ. ئەی ڕاهیبان، ئەم بارودۆخە نالەبارە دەبێ بەرگریی لێبکرێ. ئەشکەنجە و ئازاری منداڵان نابێ بمێنێ، ڕاپەڕن و لەو بارەوە بۆ خەڵک بدوێن، پەلە بکەن لەو کارەدا پەلە! خودا خۆی ڕووسیا ڕزگار دەکا. چونکە گوندنشینان هەر چەندە گەندەڵ و تاوانباریش بن، ناتوانن چاوپۆشی لە تاوان بکەن، دەشزانن وەبەر لەعنەتی خودا دەکەون و ئەو تاوان و گەندەڵکاریانە هەڵەیە. بۆیە خەڵکی ئێمە هەر وا ئیمانیان بە عەداڵەتی خودا هەیە. هیوایان بە ڕەحم و بەزەییی خودایە و فرمێسکی پەشیمانی هەڵدەوەرێنن.

لە نێو چینی دەوڵەمەنددا بارودۆخەکە جیاوازە، ئەوان پێڕەوی لە زانست دەکەن و دەیانهەوێ تەنیا لە سەر بناغەی ئاوەز ئەو عەداڵەتە دامەزرێنن. وەک پێشووش بە سەر مەسیحدا ناگوڕێنن کە تاوان بوونی نییە و تاونباریش هەروا. ئەو وتەیەش دژوازییەکی تێدایە، چونکە ئەگەر خودایەک لە ئارادا نەبێ، تاوان شتێکی بێ مانایە! لە فەڕەنگ خەڵک بە قینەوە دژ بە دەوڵەمەندان ڕادەپەرن و ڕێبەرانی خەڵکیش بەردەوام خەڵک فێری خوین ڕشتن دەکەن و پێیاندەڵێن هەر کارێک بکەن هەقیان بەدەستە. بەڵام ڕقەکەیان «دەبێتە بێزاری، چونکە کارێکی زاڵمانەیە.» بەڵام خودا خۆی ڕووسیا نەجات دەدا. نەجات بە هۆی خەڵکەوەیە، بە هۆی ئیمان و سەبوورییانەوەیە.

باوکان و مامۆستایان، ئاگاتان لە ئیمانی خەڵک بێ، ئەوەش بەزایە ناچێ. لە تەواوی ماوەی تەمەنمدا ویقاڕی ئەم خەڵکە مەزنەم دیوە، ویقاڕی ڕاستەقینە و شیاویان سەرنجی ڕاکێشاوم. دیتوومە و دەتوانم شایەدیی بۆ بدەم، دیتوومە و تووشی سەر سووڕمانی کردووم. قەڵافەتی هەژارانەی خەڵکی ڕەشۆکیم دیوە کە تووشی تاوان و شوورەیی بوون. ئەوان بەندەی سەرکز و ملکەچی کەس نین و تەنانەت دوای دوو سەدە کۆیلەیی، لە کردەوە و باوەڕدا ئازادن و لەگەڵ ئەوانەشدا، سەرەڕۆیی و تۆڵە و بەخیلی لەزاتیاندا نییە. «تۆ دەوڵەمەند و ڕەسەن و نەجیمزادەی، وریا و لێزان و تێگەیشتووی، پیرۆزت بێ و خودا مەبارەکی بکا. ڕێزت بۆ دادەنێم، بەڵام دەزانم منیش مرۆڤم. بەبێ ئێرەیی بردن و مەرایی ڕێزت بۆ دادەنێم، لەپلە و پایەی مرۆڤدا ویقاڕی خۆم دەسەلمێنم.»

بەڕاستی ئەگەر ئەو قسانەش ناکەن (چونکە هێشتا نازانن ئەم قسانە چۆن دەربڕن) شێوەی کردەوەیان ئاوایە. خۆم دیتوومە، خۆم تێگەیشتووم، باوەڕ دەکەن گوندنشینانی ڕووسیای ئێمە هەرچەندە هەژارتر بن، ئەم هەستە بێ شاتوشووتە سەرنج ڕاکێشترە. چونکە دەوڵەمەندان لە زۆر لایەنەوە تووشی گەندەڵی بوون. زۆربەی ئەوانەش پێوەندیی بە سەر ساردی و کەترەخەمیی ئێمەوە هەیە. بەڵام خودا خەڵکی خۆی ڕزگار دەکا، چونکە ڕووسیا لە خاکەڕاییدا گەورەیە. لە خەونمدا داهاتوو بە چاو دەبینم و هەردەڵێی بەڕاستی دیتوومە. حەتمەن وەڕاست دەگەڕێ و مسۆگەر دەبێ. تەنانەت گەندەڵترین دەوڵەمەندانیش لە هەمبەر هەژاراندا خەجاڵەتی لە ماڵ و سامانی خۆیان دەکێشن. هەژارانیش بە دیتنی ئەو خاکەڕایی و خۆ بەکەم زانینەیان، تێدەگەن و لە هەمبەریانا ڕاناوەستن و بە دڵشادی و دڵۆڤانی وەڵامی شەرمەزارییە ئابڕوومەندانەکەیان دەدەنەوە. بڕوا بکەن ئاخری کار بەو جێیە دەگا و هەموو شتێک بەرەو ئەو ئالییە بەڕێوەیە. یەکسانی، تەنیا لە ویقاری مەعنەویی مرۆڤدا دەبێ بدۆزرێتەوە. ئەوەش تەنیا لە نێو ئێمەدا بەر چاو دەکەوێ. ئەگەر برا بوایەین میرات و بەشەماڵ دەهاتە گۆڕێ، بەڵام بەر لەوە هیچکات

سەبارەت بە بەشکردنی ماڵ و سامان پێکنایەن. ئێمە ئاگاداری لە پەیکەرەی مەسیح دەکەین و دەزانین وەک ئەڵماسێکی گرانبایی و درەوشاوە هەموو دنیا ڕووناک دەکاتەوە. هیوادارم وابێ، هیوادارم!

باوکان و مامۆستایان، جارێکیان تووشی ڕووداوێکی دڵتەزێن بووم. لە سەردەمی دەربەدەریمدا، لە شاری ک ـ چاوم بە خزمەتکارە قەدیمییەکەم، ئافانسی، کەوت. هەشت ساڵ دوای ئەوەی لێک هەڵبڕاین، خوداوڕاستان لە نێو بازار تووشم بوو، ناسیمیەوە و بە هەڵەداوان هات بۆ لام و لە خۆشیاندا باوەشی پێدا کردم. «قوربان ئەوە ئێوەن؟ هەر بەڕاستی خەون نابینم؟» بردمییەوە بۆ ماڵی خۆیان. ئەویش لە ئەرتەش هاتبووە دەرێ، ژنی هێنابوو و دوو منداڵی هەبوو. خۆی و ژنەکەی لە نێو بازار دەسفرۆش بوون وەک دێوەرە هەرایان دەکرد و لەو ڕێگایەوە بژیوی خۆیان دابین دەکرد. ماڵەکەی هەژارانە، بەڵام خاوێن و دڵگر بوو. سەماوەرەکەی داگیرساند و ناردی بە دوای ژنەکەیدا، دەتگوت هەنتەشی من لەوێ بۆ ئەوان وەک جێژن وایە. منداڵەکانی هێنا بۆ لام: «باوە تەقدیسیان بفەرموو.»

گوتم: «من کوا حەدی ئەوەم هەیە تەقدیسان بکەم؟ تەنیا ڕاهیبێکی خاکەڕام و هیچی تر. دوعایان بۆ دەکەم. ئافانسی پاولۆویچ لەو ڕۆژە بەدواوە هەمیشە دوعام بۆ تۆش کرووە. چونکە هۆی هەموو شتێک تۆ بووی.» هەتا ئەو جێیەی توانیم بە سەرهاتەکەم بۆ باسکرد. چۆن بیردەکەنەوە؟ ئەو هەر وا چاوی تێبڕیبوم و بڕوای نەدەکرد کە من ئەربابەکەی پێشووی بم، کە ئەو کاتە ئەفسەر بووم و ئێستا بەو قەڵافەت و شکڵ و شێوەوە لە هەمبەریدا وێستاوم؛ تەنانەت دەستیشی کرد بە گریان.

گوتم: «بۆ دەگریی؟ دۆستی بەڕێز، قەتم لە بیر ناچێتەوە، چاکتروایە شادیم بۆ بکەی چونکە ڕێگای من ڕێگایەکە نزیک بە شادی و خۆشی.»

زۆری قسە نەدەکرد، بەڵام لە پەستا هەناسەی هەڵدەکێشا و بە ڕووخۆشی سەری بۆ دەلەقاندم.

پرسیی: «ماڵەکەت چیی بە سەر هات؟»

لە وەڵامیدا گوتم: «پێشکەش بە کڵێسەم کرد. لە گەڵ قەشەکانی دیکە پێکەوە دەژیین.»

دوای خواردنەوەی چاییەک خودا حافیزیم کرد، لە ناکاو نیوە ڕۆبڵی لە گیرفانی دەرهێنا و وەک دیاری پێیدام بۆ کڵێسە. نیوە ڕۆبڵی دیکەی بە بەپەلە خستە مستمەوە:

«ئەوەش بۆ خۆت باوەگیان ڕەنگە بە کارت بێ.»

نیوە ڕۆبڵەم وەرگرت و کڕنۆشم بۆ خۆی و ژنەکەی برد و چوومە دەرێ. لە ڕێگا لە دڵی خۆمدا دەمگوت: «هەمسیان پێکگەیشتن، ئێستا ئەو لە ماڵی خۆیەتی و من بەڕێوەم، بێگومان هەناسە هەڵدەکێشین و سەرمان ڕادەوەشێنین. لە گەڵ ئەوەشدا بە هۆی شادییەوە بزەمان دێتێ وەبیرمان دێتەوە کە خودا چۆن ئەو دیدارەی بۆ ڕێکخستن.» دوای ئەوە ئیتر چاوم پێی‌نەکەوتەوە. من ئەربابی بووم و ئەو خزمەتکارم، بەڵام ئێستا کە بە دڵێکی پاک و بێگەردەوە یەکترمان ڕاموسی، پێوەندییەکی گەورەی مرۆڤانە لە نێوانماندا دامەزرا. زۆرم بیر لێکردۆتەوە و ئەوەی ئێستاش بیری لێدەکەمەوە: بڵێی ئەم یەکگرتنە سادقانەیە لە کاتی خۆیدا لە نێو خەڵکی ڕووسیادا جێ بکەوێ؟ بڕوام وایە مسۆگەر دەبێ و کاتی ئەوە نزیک بۆتەوە.

سەبارەت بە خزمەتکاران با ئەوەش بڵێم، ئەو کاتەی گەنج بووم، زۆر جار ڕقم لە خزمەتکارەکانم هەڵدەستا؛ «ئاشپەز چێشتەکەی زۆر بە گەرمی هێنابووە سەر سفرەکە. خزمەتکار ئوتووی لەجلوبەرگەکان نەدابوو.» بەڵام ئەوەی لە هەموو کەس چاکتری فێرکردم. یەکێک لە بیرۆکەکانی کاکم بوو کە بەمنداڵی پێیگوتم: «ئایا من شیاوی ئەوەم کەسێکی دیکە خزمەتم پێبکا و لە بەر هەژاری و ناهیری خۆی ملکەچ و گوێڕایەڵی من بێ؟» ئەو کاتە لە خۆمم پرسی: ئەو بیرۆکە ساکارە ئاوا درەنگ بە زەینمان دەگا؟ نەبوونی پێشخزمەت لە دنیادا مەحاڵە. بەڵام کارێک بکەن خزمەتکارەکەتان لە باری ڕۆحییەوە ئازادتر لەو کاتە بێ کە هێشتا نەبووبووە خزمەتکار. بۆ ناتوانم خزمەتکاری خزمەتکارەکانم بم و کارێک بکەم لەوە تێبگات و بێ هیچ

دەمارگیرییەک لە لایەن منەوە، یان بڕوا پێنەکردن لە لایەن ئەوەوە؟ بۆ دەبێ بەزەییم بە پێشخزمەتەکەمدا نەیەت؟ بۆ دەبێ نەیبەمە نێو بنەماڵەکەم و بەو کارە دڵی خۆم شاد بکەم؟ تەنانەت ئێستاش دەتوانین ئەو کارە بکەین. بەڵام لە داهاتوودا دەبێتە هۆی گەورەیی مرۆڤ، ئەوەش کاتێک کە بەدوای گرتنی پێشخزمەتەوە نەبین، یان وەک ئێستا نەمانهەوێ هاوڕەگەزێکی خۆمان بکەینە خزمەتکار و کاری لێبکێشین. بە پێچەوانە لە ناخی دڵەوە حەز دەکا ببێتە خزمەتکاری هەمووان، ئەو جۆرەی کە ئینجیل پێمان دەڵێ.

ئایا ئەمە خەونە کە مرۆڤ شادیی خۆی تەنیا لە کردەوەی باش و پڕ لە ڕەحمەتدا بدۆزێتەوە و وەک ئێستا چێژ لە زوڵم و زۆر و زگەڕۆیی و داوێن پیسی و تڕزلی و ڕقەبەرایەتی و بەخیلی وەرنەگرێ؟ لە سەر ئەو باوەڕەم ئەمە خەون نییە و کاتەکەی نزیک بۆتەوە. خەڵکی پێدەکەنن و دەپرسن: «کەنگێ کاتی ئەوە دێ، بڵێی بەم زووانە بگاتێ؟» بڕواموایە بە پشتیوانیی مەسیح ئەم کارانە بە ئاکام دەگەیەنین. لە مێژووی مرۆڤایەتیدا گەلێک بیرۆکە هەبووە کە دە ساڵ بەر لە سەر هەڵدانیان هیچکەس بە بیرایشیدا نەهاتووە. بەو حاڵەشەوە کاتێک کە جەنگەی ئەوە هات سەر هەڵدەن، گەشە دەکەن و لە سەرتاسەری زەوی بڵاو دەبنەوە. بۆیە ئێستای ئێمەش هەروایە و خەڵکەکەمان دەبنە سەرتۆپی جیهان و دەدرەوشێنەوە، مرۆڤەکانیش دەڵێن: «ئەو بەردەی کە مێعارەکان وتیان بە کار نایە، بۆتە بەردی چینی دیواری پەرستگا[1].» جێی خۆشییەتی لە لۆمەکاران بپرسین: ئەگەر هیوای ئێمە خەون و خەیاڵە بینای خۆیان و شتەکانی دیکە کەنگێ بە شێوەیەکی عادڵانە و تەنیا بە ئەقڵی خۆیان و بە بێ یارمەتیی مەسیح دادەمەزرێنن؟ ئەگەر بڵێن ئەوانەن کە بەرەو دوورەپەرێزی دەڕۆنە پێشێ، تەنیا ساویلکەترینەکەیان باوەڕی پێدەکەن، ساویلکەییەکەشیان بە ڕادەیەکە کە پیاو تووشی سەرسووڕمان دەکا. ڕاستییەکەشی ئەوەیە خەونەکەیان گوماناویترە لە خەونی ئێمە. عەداڵەتیان کردۆتە ئامانجی خۆیان. بەڵام بە حاشا کردن لە مەسیح ئاخری لە

---

1- ئنجیلی مەتی، بەشی بیست و یەکەم.

سەر زەوی لافاوی خوێن وەڕێدەخەن. چونکە خوێن، خوێن دەخوازێ و هەر کەسێ شمشێر بە دەستەوە بگرێ، شمشێر لە نێوی دەبا[2]. ئەگەر لە بەر خاتری پەیمانی مەسیح نەبوایە، شەڕەکە هێندەی دەخایاند تەنیا دوو کەس لە سەر زەوی دەمانەوە و ئەوانی دیکە یەکتریان دەکوشت. ئەو دوو کەسەش لە بەر هەوا و غروور چاویان بەرایی نەدەدا یەکتر ببینن و یەکیان ئەوی دیکەی دەکوشت و پاشان ئەویش خۆی لە نێو دەبرد. ئەگەر لەبەر وادە و بەڵێنەکەی مەسیح نەبوایە، کە لە بەر خاتری خاکەڕایان و سەبووران ڕۆژەکان کورت دەبنەوە، ئەم کارەش مسۆگەر دەبوو.

دوای ڕووداوی دوئێلەکەم، ئەو کاتەی هێشتا جلوبەرگی ئەفسەریم لە بەردابوو، لە نێو کۆرێک لە خزمەتکاراندا قسەمکرد و لە بیرمە وتەکانم هەموویانی تووشی سەرسووڕمان کرد. دەیان پرسی: «چی! یانی خزمەتکارەکانمان لە سەر مێز دانیشێنین و چاییان بۆ دانێین؟ وەلامم دانەوە: «بۆ نا، لانیکەم جاروبار» هەموو دایان لە قاقای پێکەنین. پرسیارەکانیان گەمژانە بوو، وەلامی منیش ڕوون و ئاشکرا نەبوو، بەلام بیرۆکە ناوەکییەکەی هەتا ڕادەیەک دروست و بەجێ بوو.»

**(٧) سەبارەت بە دوعا و ئەوین و پێوەندی لە گەڵ دنیاکانی دیکە:**

پیاوی جحێڵ، لە عیبادەت خافڵ مەبە. ئەو کاتەی عیبادەت دەکەی، ئەگەر عیبادەتەکەت دوور لە ڕیا بێ، هەستێکی نوێ و مانایەکی نوێ بەخۆوە دەگرێ و ئازایەتییەکی نوێت پێدەبەخشێ و تێدەگەی کە عیبادت فێربوونە. لەگەڵ ئەوەشدا لە بیرتبێ، هەر کاتێک توانیت بەردەوام ئەم ڕستەیە بڵێوە: «خوایە، بە سەر هەموو ئەوانەدا کە لە هەمبەر تۆدا دیار دەکەون و دەتپەرستن، ڕەحمەت ببارێنە.» چونکە لە هەموو کات و ساتێکدا هەزاران کەس ئەم دنیایە بەجێ دێڵن و ڕۆحیان بەرەو لای خودا دەفڕێ. زۆر کەسانیش هەن نەناسراو و خەمبار و هیوابڕاو لە قوژبنێکی چۆڵ و هۆڵدا

2- ئنجیلی مەتی. بەشی بیست و شەشەم.

بەتەنیایی سەر دەنێنەوە و هیچکەس دڵۆپە فرمێسکیکیان بۆ هەڵناوەرێنێ و تەنانەت نازانن کەسێکی وا هەر بووشە لە سەر زەوی. «بۆیە لەوانەیە لەو سەری دنیا دوعای بە خێری تۆ سەر کەوێ بۆ دەرگانەی خودا و ببێتە هۆی لێخۆشبوونیان. ئەگەرچی نەتدەناسین و ئەوانیش تۆیان نەدەناسی. بۆیە ئەو کەسەش چەندە بزوێنەر و دڵخۆشکەرە کە بە ترسەوە لە هەمبەر خودادا ڕاوەستاوە و هەستدەکا کەسێک دۆعا بۆ ئەویش دەکات و مرۆڤێک لە سەر زەوی هەیە ئەوی خۆشدەوێ. خوداش بە دڵۆڤانییەکی زیاترەوە چاو لە هەردووکتان دەکا. چونکە ئەگەر تۆ ئەوەندەی دڵسۆزی بۆ دەکەی، خودایەک کە لە ڕادەبەدەر لە تۆ دڵسۆزتر و بە بەزەییترە، ڕەحم و خۆشەویستیی زیاتر دەبێ.

برایان، لە تاوانی خەڵکی مەترسن. مرۆڤتان بە تاوانیشەوە خۆش بوێ، چونکە خۆشەویستیی ئێوە ترووسکەیەک لە خۆشەویستیی خودایە و بەرزترین خۆشەویستیی سەر زەوییە. تەواوی خوڵقاوەکانی خوداتان خۆش بوێ و هەموو دەنکە خیز و پەلک و گەڵا و تاڵە تیشکێکی ڕووناکی خوداتان بە لاوە ئازیز بێ. هەموو بوونەوەر و ئاژەڵ و گژوگیایەکتان خۆشبوێ، هەموو شتێکتان خۆشبوێ. ئەگەر هەموو شتێکتان خۆش بوێ، هەست بە ڕازی ئاسمانیی ناخیان دەکەن و هەر کاتێکیش هەستیپێبکەن، ڕۆژ لە گەڵ ڕۆژ زیاتر تێیدەگەن، لە کۆتاییشدا بە خۆشەویستییەکی هەمە لایەنەوە تەواوی دنیاتان خۆش دەوێ. جڕوجانەوەرتان خۆشبوێ: خودا سەر چاوەی ئەندێشە و شادیی پێبەخشیون. مەیان ورووژێنن، ئازاریان پێمەگەیەنن، بێبەشیان مەکەن، بە پێچەوانەی ویستی خودا مەجووڵێنەوە. ئەی مرۆڤ، بە هۆی گەورەیی خۆتەوە فیز بە سەر ئاژەڵ و بوونەوەراندا لێمەدە؛ ئەوان لە تاوان بەدوورن. تۆش بەوە گەورەی، بە هاتنت زەویت ڕمووده کرد و ئاسەواری ئەو ڕمووده کردنە لە پاش خۆت بەجێدێڵی ـ مخابن ئەم مەسەلەیە هەتا ڕادەیەک سەبارەت بە یەک بەیەکی ئێمە ڕاستە! بەتایبەت منداڵانتان خۆش بوێ، چونکە ئەوانیش وەک فریشتە لە تاوان بەدوورن، ئەوان دەژین

بۆ ئەوەی دڵمان ساف و بێ غەور بکەن، ڕاست وەک ئەوەی ڕێنوێنیمان بکەن. قوربە سەر ئەو کەسەی منداڵێک ئازار دەدا! باوە ئانفیم فێریکردم منداڵانم خۆشبوێ. ئەم کەسایەتییە دلۆڤان و بێدەنگە لە سەردەمی دەربەدەریماندا زۆر جار بەو قەرەپووڵانەی پێیاندەدا‌ین شیرینی و چوکلێتی بۆ منداڵان دەکڕی. بەلای هەر منداڵێکدا تێپەڕیبایە خۆشەویستیی خۆی بۆ دەردەبڕی، زاتی ئەو کابرایە ئاوایە.

هێندێک لە ئەندێشەکان مرۆڤی سەرسوڕماو وەدیدێنن، بە تایبەت بەدیتنی تاوانی خەڵکی، لە خۆشی دەپرسێ ئایا چاکتر وایە زۆرەملی بەکار بێنێ یان خۆشەویستی خاکەڕایانە؟ بەردەوام بڕیاربدەن خۆشەویستیی خاکەڕایانە بەکار بێنن. ئەگەر هەمووتان یەک دەنگ لە سەر ئەو خاڵە پێکبێن، دەتوانن دەست بە سەر تەواوی دنیادا بگرن. خۆش ویستنی خاکەڕایانە زۆر زۆر بەهێزە، بە هێزتر لە هەموو شتێکە، وەک هیچ شتێکی دیکە ناچێ.

هەموو ڕۆژێک و هەموو سەعاتێک، هەموو خولەکێک بەدەوری خۆتانا بگەڕێن و ئاگاداری خۆتان بن و سەرنجبدەن و بزانن وێنەکەتان وێنەیەکی جوان و ڕازاوەیە؟ بە پەنا منداڵێکدا تێدەپەڕن، بە ڕقەوە تێدەپەڕن، بە زمانی تاڵ و قسەی ناخۆش و دڵی ڕەقەوە تێدەپەڕن و لەوانەیە ئەو منداڵە نەبینن. بەڵام ئەو ئێوەی دیتووە و وێنە ناحەز و دزێوەکەتان دەکەوێتە سەر پەردەی دڵە پاک و بێدەسەڵاتەکەی. لەوە ئاگادار نین، بەڵام لەوانەیە تۆوی شەڕتان لە ناخیدا چاندبێ و تۆوەکە شین ببێ. هەمووشی بەو هۆیەوەیە کە سەرنجتان بەو منداڵە نەداوە. چونکە خۆشەویستییەکی ڕاست و خێرخوازانەتان لە دڵتاندا پەروەردە نەکردووە. برایان، خۆشەویستی مامۆستایە، بەڵام مرۆ دەبێ بزانێ چۆنی وەدەستبێنێ. چونکە وەدەستهێنانەکەی زۆر دژوارە و بە نرخێکی گران دەکڕدرێ. بە هەوڵێکی بەردەوام و بێ وچان وەدەست دێ. چونکە نابێ ئەو خۆشەویستییە جاروبارە و کاتی بێ، بەڵکو بۆ هەتا هەتا. هەموو کەسێک دەتوانێ جاروبار خۆشەویستیی خۆی دەربڕێ، تەنانەت مرۆڤە شڕودڕەکانیش.

براکەم داوای لێبووردنی لە باڵندەکان دەکرد. ڕەنگە بێمانا بنوێنێ، بەڵام دروستە. چونکە هەموو شتێک لە ئەقیانووس دەچێ، هەموو شتێک لە گەڕدایە و پێکەوە ئاوێتە دەبن. پەلەپیتکەیەک لە شوێنێک، لەو سەری دنیاش بزووتنەوە و لەرە وەدی دێنێ. لەوانەیە داوای لێبووردن لە باڵندان بێ مانا بێ، بەڵام پەلەوەران لە پەناتان شادتر دەبن ـ لانیکەم تۆزێک شادتر ـ منداڵان و هەموو ئاژەڵانیش هەروا. بەو مەرجەی ئێوە لە ئێستا مەزن و بەشەرەفتر بن. هەموو شتێک لە ئەقیانووس دەچێ، ئەم قسەی منتان لە بیر نەچێ. ئەو کاتە، خۆشەویستییەکی هەمەلایەنە لە دڵتاندا بڵێسە دەستێنێ و وەک جەزم بوویەک، بۆ پەلەوەران دەپاڕێنەوە و دوعا دەکەن ئەوانیش لە تاوانیان خۆشبن. ئەو جۆرە حاڵ لێهاتنەتان لە لا بەڕێز بێ، هەر چەندەش بەلای خەڵکەوە بێ ماناش بنوێنێ.

دۆستانی بەڕێزم، بۆ ئەوەی شادبن لە بەر خودا بپاڕێنەوە و دوعا بکەن. منداڵان و پەلەوەران شاد بکەن و بەهەشت بۆ خۆتان مسۆگەر بکەن. مەهێڵن تاوانی خەڵکی لە کارەکانتاندا تووشی پەرۆشیتان بکا. لەوەش مەترسن کە کارەکەتان سووک بێ و لە برەو بکەوێ. مەڵێن: «تاوان بەهێزە، خراپە بەهێزە، شەیتاناوا بەهێزە، ئێمەش تەنیا و بێ پشتیوانین و شەیتاناوا داماندەڕزێنێ و ناهێڵێ کارە چاکەکانمان بە ئاکام بگا.» ڕۆڵەکانم، لە دەست ئەو ناهومێدییە ڕاکەن و تەنیا یەک ڕێگاش بۆ دەربازبوون هەیە، کەوایە خۆتان بە بنۆسی تاوانی هەموو مرۆڤەکان بزانن، دۆستانی خۆشەویست هەقیقەت ئەمەیە. چونکە هەر کاتێک خۆتان بە هۆی تاوانی هەموو مرۆڤەکانەوە بە بەرپرس زانی، خێرا تێدەگەن کە لە ڕاستیدا وایە. لە بەر خاتری هەموو کەس و هەموو شتێک ئێوە شیاوی سەرکۆنەن. بەڵام بە داسەپاندنی سەرەڕۆیی و بێهێزی خۆتان بە سەر خەڵکدا، هاوبەشی غرووری شەیتان دەبن و دەکەونە دژایەتی کردن لەگەڵ خودا.

ئەوەندەی بیر لە غرووری شەیتان دەکەمەوە بەوە دەگەم: لە سەر زەوی تێگەیشتنی بۆ ئێمە دژوارە، کەوایە هەڵەکردن و بەشداربوون لەو تاوانەدا

زۆر سانایە. تەنانەت ئەگەر پێمان وابێ کارێکی باش و مەزنە. لە ڕاستیدا، ناتوانین لە زۆربەی هەستە بەهێزەکان و بزووتنەوەی زاتیمان تێبگەین. نەوەک ئەوە ببێتە کۆسپ و لەمپەری سەر ڕێتان و پێتان وابێ ناتوانێ بۆ هەموو شتێک ببێتە هۆی ڕوون بوونەوە. چونکە خودای مەزن ئەو شتەی لێیان دەوێتەوە کە تێیدەگەن، نەک ئەوەی کە ناتوانن. خۆتان لەمەبەدواوە بەو ئاکامە دەگەن و ئەو کاتە هەموو شتێک بە جوانی دەبینن و سەبارەت بەوان بیانووتان بەدەستەوە نابێ. لە ڕاستیدا، لەوە دەچێ ئێمە لە سەر زەوی گومڕا و چەواشە بین. ئەگەر لەبەر خاتری ئەو پەیکەرەی مەسیح نەبوایە کە لە هەمبەرماندایە، بە جارێ لێمان دەقەوما و لە نێو دەچووین، هەر بەو جۆرەی دوای تۆفانی (نوح) ڕەگەزی مرۆڤ تووشی فەوتان هات. زۆرشت لە سەر زەوی لەبەر چاوی ئێمە ونە، بەڵام بۆ قەرەبووی ئەوە، هەستێکی عارفانە و پڕ بایەخی پێداوین کە بتوانین ژیانمان لەگەڵ دنیای دیکە و دنیای ئاسمانی پێوەند بدەین. پنج و ڕیشەی ئەندێشە و هەستیشمان لەم دنیا نییە، بەڵکو لە دنیاکانی دیکەیە. هەر بۆیە فەیلەسووفەکان دەڵێن لە سەر زەوی ناتوانین لە هەقیقەتی شتەکان بگەین.

خودا لە دنیاکانی دیکە تۆوی وەرگرت و لە سەر ئەم زەوییە چاندی. دارو باخەکانی هەڵچوون و ئەو ڕووەکەی توانیی بڕوێ چەکەرەی دا و زەویی قەڵەشتەوە و هەڵچوو. ئەوەی لە سەر ئەم عەرزە بڕوێ و گەشە بکا، دەژی و تەنیا بە هۆی هەستی پێوەندی بە دنیاکانی دیکەوە کە زیندووە. ئەگەر ئەم هەستە لە ئێوەدا کز بێ یان بفەوتێ، گەشە کردنی ئاسمانیش لە ناختاندا دەمرێ. ئەو کاتە ژیانتان لە بەر چاو دەکەوێ و تەنانەت وردە وردە لێشی بێزار دەبن. ئەوەی بیری لێدەکەمەوە ئەمەیە.

## ئیمانی کامڵ

بەتایبەت ئەوەتان لە بیر نەچێ کە ناتوانن سەبارەت بە هیچکەس حوکم دەرکەن، چونکە هیچکەس ناتوانێ حوکم بە سەر تاوانبارێکدا بدا. چونکە دەبێ بزانێ خۆشی بەقەد ئەو کەسە تاوانبارە کە لە هەمبەریدا ڕاوەستاوە، ڕەنگە لە هەموو کەسیش زیاتر بە هۆی ئەو تاوانەوە شیاوی سەرکۆنە بێ. هەر کاتێک لەوە گەیشت دەتوانێ حاکم بێ و حوکم بدا. ئەگەر چی ئەو قسەیە بێ مانا دەنوێنێ، بەڵام ڕاستە. ئەگەر خۆم دروستکار بوایەم، ڕەنگە تاوانبارێکیش نەبوایە بەرە و ڕووم ڕاوەستێ. ئەگەر دەتوانن گوناحی تاوانبارێک کە لە دڵتاندا حوکمی بە سەردا دەدەن. وەئەستۆ بگرن، خێرا ئەو کارەبکەن، خۆتان بەجێی ئەو ئازار بکێشن و لێگەڕێن بە بێ هیچ لۆمەیەک بەڕێی خۆیدا بڕوا. تەنانەت ئەگەر یاساش ئێوە دەکاتە حاکمی ئەو، تا ئەو جێیەی بۆتان دەلوێ هەر ئەو جۆرە هەڵسوکەوتی لە گەڵدا بکەن، چونکە ئەو دەڕوات و بە شێوەیەکی زۆر لەوە تاڵتر خۆی مەحکووم دەکا. ئەگەر دوای ماچەکەی ئێوە، بێ ئەوەی کارتێکەریی لە سەر بێ بڕوات و گاڵتەتان پێبکا، دیسان لە کارەکەتان پەشیمان مەبنەوە و مەهێڵن ئەو کردەوەیەی کابرای تاوانبار ببێتە کۆسپی سەر ڕێتان. دەردەکەوێ کە هێشتا کاتی نەهاتووە، بەڵام کاتی خۆی هەر دێ. ئەگەر نەش یەت گرنیک نییە، چونکە ئیتر کەسێکی دیکە بەجێی ئەو تێدەگا و ئازار دەکێشێ، حوکم بۆ خۆی دەردەکا و خۆی مەحکووم دەکات و حەقیقەت تەواو دەبێ. بڕوای تەواوتان بەوە ببێ، بەبێ هیچ شک و گومانێک بڕواتان پێی ببێ، چونکە تەواوی هیوا و ئیمانی پیاوانی خودا لەوە دایە.

بێوچان هەوڵبدەن. ئەگەر شەوانە کاتێک دەخزێنە نوێنەوە بێتەوە بیرتان کە: «کارێک کە دەبوو بیکەم و ئەرکی سەر شانم بوو، نەمکردووە.» هەستن و خێرا ئەو کارە جێبەجێ بکەن. ئەگەر ئەو کەسانەی لە دەورروبەرتانن

دڵڕەق و ڕقلەزگ و دەخەزدارن و گوێ بە قسەکانتان نادەن، خۆبدەن بە سەر کەوشەکانیاندا و لە بەریان بپاڕێنەوە و داوای لێبوردن بکەن. چونکە لە بەر کەللەرەقی و گوێنەبیسیی ئەوان، ئێوە دەبێ لۆمە بکرێن. ئەگەر بە هۆی دوژمنایەتی و بوغزاوی بوونییەوە ناتوانن لەگەڵیان بدوێن، لە کاتی بێدەنگی و تەنیاییدا، بەخاکەڕاییەوە بچنە خزمەتیان و ڕێزیان لێبگرن و هیچ کات هیوا بڕاو مەبن. ئەگەر تەواوی مرۆڤەکان ڕووتان لێوەرگێڕن و تەنانەت بە زۆر دەرتان بکەن، خەمتان نەبێ و کاتێک بەجێتان دەهێڵن و تەنیا دەکەون چۆک دادەن و زەوی ماچ باران بکەن. بە فرمێسک پاراوی بکەن، چونکە میوەی شیرین بەرهەم دێنێ، تەنانەت ئەگەر هیچ کەسیش چاوی پێتان نەکەوت و گوێی لە دەنگی گریان و هاوارەکەتان نەبوو. قەت ناهومێد مەبن و ئیمانتان لاواز نەبێ، تەنانەت ئەگەر تەواوی خەڵکی گومڕا بوون و تەنیا ئێوە ئیماندار مانەوە. تەنانەت ئەو کاتەش لە قوربانی غافڵ مەبن و لە سووچی تەنیاییدا شوکرانەبژێریی خودا بکەن. ئەگەر دوو کەس لە ئێوە پێکەوە دانیشن ـ ئەو کاتە تەواوی دنیا دێتە گۆڕێ، دنیای ئەوین «زیندوو». بە خۆشەویستییەوە یەکتر لە ئامێز بگرن و شوکری خودا بکەن. چونکە تەنانەت ئەگەر تەنیا لە ناخی ئەو دوو کەسەشتاندا بێ، هەقیقەتی «ئەو» کامڵدەبێ. ئەگەر خوتان تووشی تاوانێک بوون و هەتا کاتی مەرگ بۆ ئەو تاوانەتان، یان بۆ ئەو تاوانە لە ناکاوەتان گریان، بۆ خەڵکی شادی بکەن، بۆ مرۆڤی عادڵ و ڕاست شادی بکەن، شادی بکەن ئەگەر ئێوە تاونبارن، ئەو عادڵە و تاوانی ئەنجامنەداوە.

ئەگەر خراپەکاریی خەڵک ڕقی هەستاندن و تووشی پەرۆشی و خەمی کردن، تەنانە ئەگەر هەستتان بەوە کرد کە ئەو خراپکارە دەبێ سزا بدرێ و تۆڵەی لێبکرێتەوە، لە پێش هەموو شتێکدا هەوڵبدەن ئەو هەستە لە دڵتان دەربواێن. هەر خێرا بڕۆن خۆتان ئازار دەن و خەم بخۆن، وەک ئەوەی خۆتان ئەو تاوان و هەڵەیەتان کردبێ. ئەو خەم و ئازارە قەبووڵبکەن و شانی وەبەر بدەن، دڵتان ئاسوودە دەبێ و تێدەگەن کە ئێوەش خەتابارن، چونکە

دەتانتوانی تەنانەت وەک تەنیا مرۆڤێکی بێ تاوان، ببنە چرای ڕێگای خراپەکاران، بەڵام نەبوون. ئەگەر ئەو چرایە بووایەن، ڕێگاتان بۆ خەڵکانی دیکەش ڕووناک دەکردەوە و ڕەنگە خراپەکار بە هۆی ئەو ڕووناکییەی ئێوەوە تخوون تاوان نەکەوتایە. بەڵام ئەگەر ئەو ڕووناکییەشتان بڵاوکردەوە و دیتتان نەبۆتە هۆی ڕزگاریی خەڵکی، خۆڕاگر بن و گومان لە توانایی تیشکی ئاسمانی مەکەن. ئیمانتان بەوە هەبێ ئەگەر ئەوان ڕزگار نەبوون، دوای ئەوە ڕزگار هەر دەبن. ئەگەر دوای ئەوەش دیتان نەهاتوونەتە سەر ڕێ، کوڕەکانیان ڕزگار دەبن، چونکە ڕووناکییەکەی ئێوە نامرێ، تەنانەت کاتێک کە خۆشتان نەمێنن. مرۆڤی عادڵ و پاک دەمرێ، بەڵام ڕووناکییەکەی هەر دەمێنێ. مرۆڤ بەردەوام هەر وابووە لە دوای مەرگی ڕێنیشاندەرەکەی دێتە سەر ڕێ و ڕزگار دەبێ. مرۆڤ حاشا لە پێغەمبەرەکانیان دەکەن، دەیانکوژن، بەڵام شەهیدەکانیان خۆشدەوێ و ڕێز بۆ ئەو کەسانە دادەنێن کە دەیانکوژن. ئێوە کار بۆ هەمووان دەکەن، ئێوە بۆ داهاتوو تێدەکۆشن. بە دوای پاداشەوە مەبن، چونکە پاداشتان لەم دنیایەدا زۆر گەورەیە: شادیی خودایی کە تەنیا بە مرۆڤی عادڵی دەبەخشن. ترستان لە گەوران و لە دەسەڵاتداران نەبێ، زانا و پاک و بێکرێژ بن. ئەندازە ڕاگرن. زەمان بە جوانی بناسن و متاڵای بکەن. کاتێک تەنیا دەکەون، دوعا بکەن. نێوچاوان لە خاک هەڵسوون و ماچکردنیتان بە لاوە پیرۆز بێ. زەوی ماچبکەن و بە ئەشقێکی بەردەوام و گەرموگوڕەوە خۆشتان بوێ. تەواوی ئینسانەکانتان خۆش بوێ، خۆشەویستیتان بۆ هەموو شتێک هەبێ. بەشوێن ئەو شادی و نەشەیدا بگەڕێن. زەوی بە فرمێسکی شادی پاراو بکەن و ئەو فرمێسکانەتان بەلاوە خۆشەویست بێ. ئەو حاڵ لێهاتن و جەزم بوونە بە شوورەیی مەزانن، بەلاتانەوە پیرۆزی بێ، چونکە دیاریی خودایە و دیارییەکی مەزنە، ئەو دیارییە بە هەمووکەس نادرێ، تەنیا بە هەڵبژاردانی دەدەن.

**() سەبارەت بە دۆزەخ و ئاوری دۆزەخ و ئەندێشەی عارفانە:**

باوکان و مامۆستایان، لە خوم دەپرسم «دۆزەخ چییە؟» بەبڕوای من بۆ ئازاری ئەو کەسەیە کە خۆشەویستی نازانێ. جارێکیان لەو پەڕی ئاسمانەکان و لەو جێگایەی کە زەمان و مەکان پێوانە ناکرێ، مەخلووقێکی پاک کاتی هاتن بۆ سەر زەوی، توانایی گوتنی ئەو وتەیەی پێدرا: «من هەم و خۆشەویستی دەزانم.» جارێک تەنیا جارێک، ساتێک لە ئەشقی «زیندوو»ی پێدرا و لە بەر خاتری ئەو ژیانی زەوینی خولقا و بە زەمان و ساڵ و وەرزکانییەوە پێیان دا، بەڵام خولقاوی بەختەوەر ئەو دیارییە بە نرخەی ڕەت کردەوە و نەیویست، پێی شتێکی سووک و چرووک بوو و گاڵتەی پێکرد، بۆیە دڵڕەق مایەوە. مرۆڤێکی ئاوا دوای بەجێ هێشتنی ئەم زەوییە، تووشی ئێبراهیم دەبێ و لە گەڵی دەکەوێتە قسە، هەروەک لە بەسەرهاتی پیاوی دەوڵەمەند و ئیلعازاردا[3] هاتووە، بەهەشت بە چاوی خۆی دەبینێ و دەتوانێ بچێ بۆ لای خودا. بەڵام ڕاست ئەم عەزاوەی ئەوە کە بەبێ خۆشەویستی کەسێک، بەرەو دەرگانەی خودا سەر هەڵدەبڕێ، دەیبەنە لای ئەو کەسانەی کە خۆشەویستیان لە دڵدا بووە و ئەو خۆشەویستییەکەیانی بە سووک و چرووک زانیوە. چونکە ئەو بە ڕوونی دەیبینێ و بە خۆی دەڵێ: «ئێستا تێگەیشتم، ئەگەرچی تامەزرۆی خوشەویستیم، بەڵام ئەوینی من مەزنایەتی و فیداکاریی تێدا نابێ، چونکە ژیانی زەوینیی من کۆتایی پێهاتووە و ئێبراهیم تەنانەت بە دڵۆپێک ئاوی «زیندوو[4]» (یانی دیاریی ژیانی خاکی و چالاک)شەوە نایەت ئەم تینوێتی و سیوشکە هەڵاتنە ڕۆحییەم دامرکێنێ کە لە ناخمدا بڵێسەی سەندووە. ئەگەر چی لە سەر زەوی بە چاوی سووک تەماشامکرد؛ ژیانێکی دیکەم نابێ و کاتێکی دیکەش لە گۆڕێدا نییە! ئیتر گەڕانەوەش نییە. تەنانەت ئەگەر بمهەوێ ژیانی خۆم بە تامەزرۆیی فیدای خەڵکی بکەم، تازە کار لە کار ترازاوە، چونکە ئەو ژیانەی کە دەکرا لە بەر

---

3- بڕوانە ئینجیلی لۆقا، بەشی شازدەهەم

4- مەبەست لە «ئاوی زیندوو» ئاوی حەیاتە. بڕوانە ئینجیلی یوحەننا، بەشی چاردەهەم.

خاتری خۆشەویستی فیدای بکەی تێپەڕیوە و ئێستا لە نێوان ئەو ژیانە و ئەم هەستییەدا گێژاوێکی بەسام هەڵکەوتووە.»

بە جۆرێک باسی ئاوری دۆزخ دەکەن کە وەک مادە بوونی هەیە. نامەوێ خۆ لە قەرەی ئەو ڕازە بدەم و لێی تێدەپەڕم. بەڵام پێموایە ئەگەر ئاگر بە مانای مادە لە گۆڕێدا بێ، پێیان خۆش دەبێ، چونکە بە بڕوای من ئازاری جەستە بە قەد ئازاری ڕۆحی و مەعنەوی دژوار نییە و ڕەنگە زووتر لە بیر بچێتەوە. لە گەڵ ئەوەشدا ئازاری ڕۆحانییان لە سەر هەڵناگیرێ، چونکە ئەوە ئازارێکی دەرەکی نییە، بەڵکو لە ناخیاندایە. ئەگەر لە سەریشیان هەڵگیرێ، پێموایە بۆ ئەو مەخلووقاتە بێچارەیە دژوار و تاڵتر دەبێ. چونکە تەنانەت ئەگەر عادڵان لە بەهەشت، بە دیتنی ئازاری ئەوان، لێیان خۆشبن و لەبەر خۆشەویستیی لە ڕادەبەدەری خۆیان بانگیان بکەن بۆ بەهەشت، ئازارەکەیان زیاتر دەکەن، چونکە سیوشکە هەڵاتنێکی سووتێنەرتر لە ناخیاندا هەڵدەگیرسێنن، «بۆ ئەوەش خۆشەویستییەکی دوولایەنە و هەقناسانە پێویستە و ئێستا ئیتر بۆیان نالوێ. لە گەڵ ئەوانەشدا لە دڵەوە ترسم لێنیشتووە و پێموایە تێگەیشتن لەو ئەمرە مەحاڵە و ئاخری دەبێتە هۆی ئۆخژن و ئاسوودەییان. چونکە دوای ئەوەی خوشەویستیی دروستکارانیان قەبووڵکرد، بێ ئەوەی وەڵامێکی بۆ بدۆزنەوە، ئاخری لەم سەرداخستن و ڕازی بوونەدا و لەم خۆبەکەم زانین و خاکەڕاییەدا وێنە و دیمەنی ئەو عەشقە گەرموگوڕە دەبیننەوە کە لە سەر زەوی هەمیەتیان پێنەدا و بە چاوی سووک تەماشایان کرد. دۆستان و برایانی خۆشەویست، بەداخەوەم کە ناتوانم ئەم مەسەلەیە بەڕوون و ڕاشکاوی بەیانکەم.

بەڵام قوڕ بە سەری ئەوانەی لەم دنیا خۆیان کوشتووە و خۆیان بوونەتە خۆرەی خۆیان و شەق لە بەختەوەریی خویان هەڵدەدەن. پێموایە لەم دنیایەدا لەوانە چارەڕەشتر نییە. دەڵێن دوعا کردن و پارانەوە بۆ ئەو کەسانە تاوانە و کڵێسەش ڕواڵەتەن چاوپۆشیی لەوانە دەکا و دەیانڕەتێنێ. بەڵام لە دڵەوە بڕواموایە تەنانەت دەکرێ بۆ ئەوانەش دوعا بکەین. خۆشەویستی هیچ کاتێک

نابێته هۆی ئازاری مەسیح. چونکە باوکان، مامۆستایان دان بەوەدا دەنێم کە لە ماوەی تەمەنمدا بۆ ئەو کەسانە پاڕاومەتەوە و تەنانەت ئێستاش هەموو ڕۆژێ دوعایان بۆ دەکەم.

بەداخەوە تاقمێک هەن کە تەنانەت لە دۆزەخیشدا، لە بەر بیرتەسکی سەر لە هەقیقەت و بیرکردنەوە دەرناکەن و پێیان وایە لە هەموو شتێک دەگەن و هەروا بادیهەوا و سەرەڕۆ دەمێننەوە. هێندێک مرۆڤی ترسناک هەن کە بە تەواوی خۆیان داوەتە دەست شەیتان و ڕۆحە لە خۆباییەکەی. ئەو جۆرە مرۆڤانە بۆ بە ئارەزووی خۆیان چوونەتە دۆزەخ و بەگیان و دڵ ئازاری سووتان تامڵ دەکەن؟ چونکە خۆیان نفرینیان لە خۆیان کردووە و بەو نفرین کردنەی خۆیان نفرینیان لە خودا و ژیانیش کردووە و بەردەوام لە ڕق و قینی ئاوێتەی غرووری خۆیان بژیو وەردەگرن، ڕاست وەک برسییەکی بیابان کە خوێنی خۆی دەمژێ و دەردەکەی هەروا بێدەرمانە. چونکە بەخشین و لێبوردنی ڕەتکردەوە و ئەو خودایەی بە نەحلەت کرد کە ئەوانی بۆ لای خۆی بانگکردووە، بۆیە ناتوانن بەبێ هەستی ڕق و دەخەزداری خودای زیندوو بە چاوی خۆیان ببینن و دەخوازن خودا بوونی نەبێ و مەخلووقاتی خۆی لە نێو بەرێ. هەر بەو هۆیەوە بەردەوام لە ئاگری ڕقی خۆیاندا دەسووتێن و تینووی مەرگ و نەمانن. بەڵام قەت بە ئارەزووی خۆیان ناگەن و دەستیان بە مەرگ ڕاناگا...

***

لێرەدا دەستنووسەکەی ئالکسی فیۆدۆرۆیچ کارامازۆف دەگاتە کۆتایی. ئەم نووسراوە ناتەواو و پڕ کەموکووڕییە. بۆ وێنە ژیاننامەی باوە زووسیما تەنیا سەبارەت بە سەردەمی لاوییەتی. لە بیروڕا و فێر کارییەکانیدا وتەگەلێک دەردەکەوێ کە دیارە لە سەردەمی جیاواز و لە وەڵامی پرسیارە جۆراوجۆرەکاندا بەیانی کردووە. وتەکانی ئەو لە دوایین ساتەکانی ژیانیدا لە وتەکانی دیکە جیا نەکراوەتەوە، بەڵام تایبەتمەندیی گشتی ئەوان دەتوانین لە دەستنووسەکەی ئالکسی فیودۆرۆویچ هەڵکرێنین.

مەرگی پیری کلێسە لە کۆتاییدا زۆر چاوەڕوان نەکراو بوو. چونکە ئەوانەی کە لەو ئێوارە درەنگ وەختەدا لە دەوری بوون، تێگەیشتن کە مەرگی پیر نزیکە، بەڵام نەیانزانی ئاوا کتوپڕە. بەڵام بەپێچەوانە دۆستەکانی هەروا کە باسمکرد بە دیتنی ئەو، کە ئەو شەوە نەیانزانی ئاوا دڵشاد و زمان پاراو بوو، پێیانوابوو لانیکەم بۆ ماوەیەک لەش ساغیی وەدەست هێناوەتەوە. دواتر بە سەر سووڕمانەوە گوتیان تەنانەت پێنج دەقیقە بەر لە مردنەکەی مەحاڵ بوو پێشبینی بکرێ. لە ناکاو ژانێکی قورسی لە سەر سینگی هەست پێکرد، ڕەنگی پەڕی و دەستی بە سەر دڵییەوە گرت. هەموو بە پەلە هەستان و لێی چوونە پێشێ. بەڵام بەو حاڵەشەوە کە دیار بوو ئازارێکی زۆر دەکێشێ، هەروا چاوی پێدا دەگێڕان و زەردەی دەگرت. هێور هێور لە سەر کورسیلەکە خزی، کەوتە سەر چۆک و ناوچاوانی نایە سەر عەرزەکە. باسکی بڵاوکرد و وەک ئەوەی بە شادییەوە سوجدە بەرێ و لەگەڵ خوێندنی دوعا عەرزی ماچبکا (هەر ئەو جۆرە فێری کردبوون)، ئارام و دڵشاد ئەمری خودای بەجێ هێنا.

هەواڵی مەرگی خێرا خەڵوەتگاکەی داگرت و گەیشتە کلێسەش. نزیکترین هاوڕێکانی ئەو خوالێخۆشبووە و ئەو کەسانەی کە بە ئەرکی خۆیان دەزانی، بەپێی دابی ئایینی دێرین قۆڵیان بۆ کفن و دفنی هەڵماڵی. هەموو ڕاهیب و قەشەکان کۆبوونەوە و بەر لە کازیوە هەواڵیان بە خەڵکی شار ڕاگەیاند. کە ڕۆژ بۆوە هەموو خەڵکی شار باسی ئەو ڕووداوەیان دەکرد و ئاپۆرەی خەڵکی لە شارەوە بەرە و کلێسە شەپۆلی دەدا. لە کتێبی دواییدا بە تێروتەسەلی باسی ئەوە دەکەم. بەڵام لێرەدا ئەوە دەڵێم کە بەر لە ڕۆژئاوا ڕووداوێکی دیکە قەوما کە هێندە چاوەڕوان نەکراو و غەریب بوو، بە جارێ ڕاهیبان و خەڵکی شاری تووشی سەر سوڕمان کرد. کە دوای ئەو هەموو ساڵە، خەڵکی شار ئەو ڕۆژەیان هەروا لە بیر ماوە.

# (١)

## بۆگەنێکی پشووبڕ

تەرمی باوە زووسیما بە پێی ئاینی باوی جێ کەوتوو بۆ ناشتن ئامادە کرا. هەر وەک هەمووان دەزانن، تەرمی قەشە و ڕاهیبان وسڵ نادرێ. بەپێی «ڕێوڕەسمی کلێسە»: «ئەگەر هەرکام لە ڕاهیبان مردن، ڕاهیبی بەڕێوەبەری ئەو ڕێوڕەسمە تەرمی مردووەکە بە ئاوی گەرم دەشوا، پاشان بە لفکەیەک خاچی نێوچاوان و سینگ و دەست و لاقی دەکێشێ. هەر ئەوەش تەوارە.» ئەو کارانە لە ئەستۆی باوە پایسی بوو، دوای شۆردن و خاچ کێشانەکەی جلوبەرگی لە بەر کرد و کفنی تێوە پێچا، بەپێی دابی خۆیان دەبوو لە دوو لاوە کفنەکە هەڵقلێشابێ بۆ ئەوەی کاتێک تێوەی دەچێن بە شێوەی خاچ لە سەر سنگی گرێ درێ. کڵاوێکی قەشانەیان بە خاچی هەشت گۆشەوە لە سەر نا، دەموچاویان ئاوەڵا هێشتەوە و بە تۆڕێکی ڕەش دایانپۆشی و پەیکەرێکی حەزرەتی مەسیحیان خستە نێو مشتییەوە. بەیانی هەر بەو شێوەیە کە پێچابوویانەوە، خستیانە نێو تابوتەوە. (تابووتەکە لە مێژ بوو ئامادە کرابوو) تابووتەکەیان ئەو ڕۆژە لە حوجرەکە و ژووری گەورەی پیر دانا کە مریدان و هاوڕێکانی لەوێ کۆ دەبوونەوە. چونکە مردووەکە قەشەیەکی مەزن بوو، دەبوو ڕاهیبان ئینجیلی لە سەر بخوێنن نەک کتێبی دوعا. هەر بۆیە باوە یوسف دەستیکرد بە ئینجیل خوێندن. باوە پایسی دەیویست شەو و ڕۆژێک لە ژوور سەری هاوڕێکەی ئینجیل بخوێنێ. بەڵام لەو کاتەدا ئەویش وەک سەرپەرستی حوجرەکە سەرقاڵ بوو، مەبەستێکی زۆر دەگمەن و کەس نەبیستوو و شڵەژانێکی «نەشیاو» و چاوەڕوانییەکی

بێ سەبرانە ڕاهیبەکانی داگرت. هەروەها لە نێو زیارەتکەرانی هوتێلەکەی کلێسە و ئاپۆرەی خەڵکی شاردا ژاوەژاو و هەراوهۆریایەک دەستی پێکردبوو و جار لەگەڵ جاریش زیاتر دەبوو. سەرپەرستی کلێساکە و باوە پایسی هەوڵیان دەدا هەر چۆنێکە خەڵکەکە ئارام بکەنەوە.

کاتێ کە خۆر هەڵات و تاووبان گەرم بوو، تاقمێکی زۆر لە خەڵک نەخۆشەکانیان هێنا، کە زیاتریان منداڵ بوون. بۆ ئەو کارەش بە جارێ ئاراوقارایان لێهەڵگیرابوو و چاوەڕوانی ئەو کاتە بوون، چونکە بڕوایان وابوو تەرمی پیری کلێسە شیفای پێوەیە و ئەو ودەمە دەستەوبەجێ کاری خۆی دەکا. لەو کاتەدا دەرکەوت کە خەڵکی شارەکەمان چەندیان باوە زووسیما لە ماوەی ژیانیدا وەک پیاو چاکێکی مەزن قەبووڵبووە. ئەوانە هاتبوون هەموویان لە چینی هەژار و بێبەش نەبوون. ئەو چاوەڕوانییە لە لایەن ئیماندارانەوە ئاوا بە پەلە و ڕاشکاوانە و تەنانەت بێسەبرانە و هەتا ڕادەیەک پێداگرانە، بووە هۆی ئەوەی باوە پایسی ئەو کارانە بە وەسوەسەیەکی شەیتانی بزانێ. ئەگەرچی ئەو خۆی شتێکی وای زووتر پێشبینی کردبوو. دەرکەوتنی ڕاستەقینەی ئەو هەستەش بۆ ئەو، ئەوپەڕی چاوەڕوانی بوو. باوە پایسی کاتێک لە گەڵ هەر کام لەو ڕاهیبانە بەرەوڕوو دەبوو کە ئاوا تووشی شڵەژان بووبوون، لۆمەی دەکردن. دەیگوت: «چاوەڕوانییەکی ئاوا بێ سەبرانە بۆ شتێکی دەگمەن نیشانەی بیرتەسکییە، بۆ خەڵکی دیکە قەیناکا بەڵام «بۆ ئێمەی تەرکە دنیا شیاو نییە.»

بەڵام زۆریان گوێ پێنەدا. ئەویش تێگەیشت و زۆری پێناخۆش بوو. لەگەڵ ئەوەشدا باوە پایسی خۆشی (ئەگەرچی ئەو قسانەی بە ڕاست بوو) لە ناخەوە تا ڕادەیەک ئەو هیوایانەی لە دڵدا بوو، نەیدەتوانی خۆی لێببوێرێ. ئەگەر چی لە دەست چاوەڕوانی و بێ سەبریی زۆری ئەو خەڵکە ڕقی هەستا بوو و ئەو کارەی بە غروور و کەم ئەقڵی دەزانی. لەگەڵ ئەوەشدا بە دیتنی هێندێ کەس بە جارێ گیانی دادەگیرا، کەسانێک کە بە هاتنیان تووشی گومان و دڕدۆنگییان دەکرد. لە نێو ئەوانەدا وا خزابوونە حوجرەکەی پیری

خوالێخۆشبووەوە، ڕقێک دڵی داگرت (کە لەڕێوەش خۆی لۆمە کرد) کە چاوی بەڕاکیتین کەوت. هەر وەها ئەو ڕاهیبە ئابدۆرسکییە، کە هەر وا لە کلێسەکەدا دایکوتابوو. باوە پایسی لە بەر هۆیەکی کتوپڕ بە هۆی هەنتەشی ئەو دوانەوە تووشی شک و گومان بوو، ئەگەرچی لەڕاستیدا لەوانە بوو دەرهەق بە هەمووان ئاوا بیر بکاتەوە.

ڕاهیبی ئابدۆرسکی لە هەموو خەڵکەکەی دیکە زیاتر هەراوهوریای ساز کردبوو. لە هەموو شوێنێک قوت دەبۆوە، گوێی هەڵدەخست و پرسیاری دەکرد. لە هەموو لایەکەوە بەشێوەیەکی تایبەت و گوماناوی خەریکی خووتەخووت بوو. قەڵافەتی جۆرێک بێ ئوقرەیی و ڕقی پێوە دیاربوو.

بەڵام ڕاکیتین هەروەک دواتر دەرکەوت، لە سەر داخوازی تایبەتی مادام خۆخلاکۆف ئاوا زوو خۆی گەیاندبووە حوجرەکە. بەیانی کاتێک ئەو ژنە ڕۆحسووک و ساویلکەیە لە خەو هەستا، هەواڵی مەرگی باوە زووسیمایان پێدا، چونکە ڕێگایان پێنەدا بچێ بۆ حوجرەکە، جۆرێک کونچکاوی دایگرت و لەڕێوە ڕاکیتینی نارد بۆ ئەوێ، تاکو هەموو شتێک بخاتە ژێر چاوەدێری و هەر بە نیو سەعات جارێک لە ڕووداوەکان ئاگاداری بکاتەوە. چونکە ڕاکیتینی بەئیماندارترین و دروستکارترین پیاوی جحێڵ دەزانی. ئەوەش بۆ ڕێ خۆش کردن و خۆڕێکخستن لەگەڵ خەڵکی زیرەک بوو، هەر کارێک بیزانیبایە بە قازانجییەتی لێی ڕانەدەوەستا.

ڕۆژێکی تاوساو بوو. زۆربەی زیارەتکەران لە دەوروبەری گۆڕەکان گۆمیلەکەیان بەستبوو. کە ژمارەیان بەتایبەت لە دەوری کلێساکە زۆرتر بوو و تاک و تووکێش لە دەوری حوجرەکە گۆڕی لێبوو. باوە پایسی هەروا کە بە دەوری حوجرەکەدا دەخولایەوە، لە ناکاو ئالیووشای وەبیر هاتەوە. کە لەو شەوە بە دواوە نەیدیبوو. هەر لەو کاتەدا کە وەبیری هاتەوە، چاوی پێی کەوت لە سووچێکی دووری باخەکە لە سەر گۆڕی ڕاهیبێک دانیشتووە کە سالانێکی زۆر بە هۆی پاکی و پیاوچاکییەوە ناوبانگی دەرکردبوو. پشتی کردبووە حوجرەکە و ڕوو بە دیوارەکە دانیشتبوو و دەتگوت لە پشت کێلەکە

خۆی شاردۆتەوە. باوە پایسی، چووە پشت سەری، دیتی هەر دوو دەستی بە بەر چاوییەوە گرتووە و دەگری و لە گەڵ کوڵی گریان سەرتاپای دەلەرێتەوە. باوە پایسی تاوێک لە پشت سەری ڕاوەستا.

بە دڵپڕی گوتی: «مەگری، کوڕە خۆشەویستەکەم، مەگری، بۆ دەگریی؟ شادی بکە، مەگری. نازانی ئەمڕۆ گەورەترین ڕۆژی ئەوە؟ بیهێنە بەر چاوی خۆت، ئەو ئێستا لەم ساتەدا، لە کوێیە!» ئالیووشا دەستی لە چاوی کردەوە و لە باوە پایسیی ڕوانی، چاوی وەک چاوی منداڵێک ماسیبوو. بەڵام خێرا، بێ ئەوەی زمانی بگەڕێ، ڕووی وەرگێرا و دیسان هەر دوو دەستی بە بەر چاوییەوە گرتەوە.

باوە پایسی، خەمبارانە گوتی: «ڕەنگە باشتر وابێ بگریی، کەوایە بگری کوڕم. ئەو فرمێسکانە مەسیح بۆی ناردووی.»

لەگەڵ ئەوەی لە ئالیووشا دوورکەوتەوە، بە خۆشەویستییەوە بیری لێکردەوە و لە دڵی خۆیدا گوتی: «فرمێسکە جەرگبڕەکەی دەبێتە هۆی ئارام بوونەوەی ڕۆحی و دڵە خۆشەویستەکەی شاد دەکا.» بەو حاڵەشەوە بە پڕتاو لەوێ دوور کەوتەوە، چونکە هەستیدەکرد بە دیتنی ئەو لەوانەیە خۆشی کوڵی گریانی هەستێ. زەمان تێدەپەڕێ و ڕێوڕەسمی کلێسە و پرسەی پیری کلێسە، هەر کام لە کاتی خۆیدا بەڕێوە چوو. باوە پایسی دیسان لە پاڵ تابووتەکەدا بە جێی باوە یوسف دانیشت و دەستیکرد بە ئینجیل خوێندن. بەڵام بەر لە سەعات سێی دوانیوەڕۆ ئەو ڕووداوە قەوما کە لە کۆتایی کتێبی پێشوودا ئاماژەم پێکرد. ڕووداوێکی چاوەڕوان نەکراو بوو بۆ هەمووومان و بە پێچەوانەی هیوای گشتی. کە دووپاتی دەکەمەوە، هەر ئەو ڕووداوە ئاساییە هەتا ئەمڕۆش لەم شارەی ئێمە و ناوچەکەدا لە بیر نەچۆتەوە. لێرەدا با ئەوەش بڵێم کە وەبیر هێنانەوەی ئەو ڕووداوە هەتا ڕادەیەک بە قێزەون دەزانم. ڕووداوێک کە بوو بە هۆی ئەو شڵەژانە ساویلکانەیە و کۆسپی خستە سەر ڕێی تاقمێکی بێ هەژمار، ئەگەر چی لە ڕاستیدا مەبەستێکی سروشتی و ئاسایی بوو. ئەگەر بمزانیبایە شوێن لە سەر

ڕۆح و دڵی قارەمانی سەرەکی یان قارەمانی داهاتووی چیرۆکەکەم دانانێ و ئاڵوگۆڕ لە ڕۆحی ناسکیدا پێک ناهێنێ و ڕێگای گەڕانەوەی ناخاتە بەر پێ و بیروهەستی نابزوێنێ و نابێتە بەرهەڵێخێکی قایم لە بەر دیواری بیریدا و ئامانجێکی دیاریکراوی بۆ دەست نیشانناکات، قەتم نەدەنووسی.

با بگەڕێینەوە سەر چیرۆکەکە. لەگەڵ کازیوەی بەیانی تەرمی باوە زووسیمایان خستە نێو تابووتەوە و هێنایانە وەتاغی دەرەوە. ئەوانەی لە دەوری تابووتەکە وێستابوون پرسیاری کردنەوەی پەنجەرەیان هێنایە گۆڕێ. بەڵام ئەو پێشنیارە بێ وەڵام مایەوە و گرنگایەتییەکی ئەوتۆیان پێنەدا. ڕەنگە تاقمێک لە ئامادە بووان لە دڵی خۆیاندا هەمیەتیان پێدابێ، بەڵام بەو ئاکامە گەیشتبێتن کە پێشبینیی گەنین و بۆگەنیو لە جەستەی پیاوچاکێکی وەک ئەو وڕێنەیەکی شێتانەیە و دەبێتە هۆی ئەوەی بەبێ ئیمان و نەفامی بزانن و تەنانەت پێی پێبکەنن. چونکە چاوەڕوانی شتێکی تەواو جیاوازیان هەبوو.

بەڵام زۆر زوو و لە دوانیوەڕۆی ئەو ڕۆژەدا هەستیان بە شتێک کرد. ئەوانەی دەچوونە ژوورێ و دەهاتنەوە دەرێ، هەستیان پێدەکرد، بەڵام هیچیان نەیاندەوێرا بیدرکێنن. سەرەتا بێدەنگیان لێهێنا. بەڵام سەعات سێ ئەو دیاردەیە وا بە ڕوونی ئاشکرا بوو، کە هەواڵەکە خێرا بە نێو تەواوی ڕاهیبان و زیارەتکەرانی حوجرەکەدا بڵاو بۆوە. هەر خێرا گەیشتە کڵێسە و هەموو قەشە و ڕاهیبەکانی سەرسامکرد. لە ماوەیەکی کەمیشدا ئەو هەواڵە بەشاردا بڵاو بۆوە و کافران و ئیماندارانی وەک یەک تووشی هەیەجان و سەرسوڕمان کرد. کافرەکان دەستیانکرد بە شادی کردن و تاقمێک لە ئیماندارانیش لە کافرەکان زیاتر دڵشاد بوون. چونکە «مرۆڤ حەز بە بەدناوی و گلانی پیاوچاکان دەکا»، هەر ئەو جۆرەی پیری کڵێسە لە ئامۆژگارییەکانیدا گوتبووی.

لە ڕاستیدا هەر لە سەرەتاوە تابووتەکە بۆگەنیوی لێدەهات، کە وردەوردە زیاتریش بوو. سەعات سێ ئیتر شک و گومانی بڕی. لە سەرانسەری مێژووی ڕابردووی کڵێسەی ئێمەدا هیچکەس شوورەییەکی ئاوای وەبیر نایە

و ئەو ئابڕووچوونە کە هەر خێرا و دوای ئاشکرا بوونی، لە نێو ڕاهیباندا وەک دەهۆڵ دەنگی دایەوە و جۆرێک ئاژاوەی نایەوە، کە ئیتر هیچی لەگەڵ نەدەکرا. دوای ئەوە، تەنانەت ساڵانێکی زۆر دواتریش تاقمێک لە ڕاهیبە ماقووڵەکان بە وەبیر هێنانەوەی ئەو ڕۆژە و دەنگدانەوەی ئەو ئابڕوو چوونە سەرسام بووبوون و بە جارێ زراویان چووبوو. چونکە لەڕابردوودا، گەلێک قەشە و ئوسقووف و ڕاهیب بە ژیانێکی پاقژەوە مردبوون. پیرە پیاوانێکی لە خوداترس کە پاکییەکەیان قەبووڵی هەمووان بوو. ئەگەرچی تابووتی ئەوانیش بۆ گەنیوی لێهاتووە و هەروا کە هەموو تەرمەکان بە شێوەیەکی سروشتی بۆگەن دەبن، بەڵام نەبووبوونە هۆی شوورەیی و تەنانەت تۆزێ دڵە خورپەش.

هەڵبەت لە ڕۆژگارانی دێریندا پیاوچاکانێک لە کلێسە هەبوون کە یادیان زیندوو ڕاگیراوە و دیاردەی تەبەڕوکی ئەوان بە پێی حەدیس ئاسەواری ڕزین و بۆگەن بوونیان پێوە نەدیتراوە. ڕاهیبان ئەم هەقیقەتەیان بە شتێکی پڕ گومان دەزانی و وەک حەدیسێکی پیرۆز و مۆجزە نوێن چاویان لێدەکرد. هەروەها، یارمەتیی خودا بەشێوەی وادەیەک بۆ پڕشکۆ بوونی گۆڕەکانیان لە داهاتوودا.

پیاو چاکێکی ئاوا، کە بە ڕێزێکی تایبەتەوە باسی دەکەن، ڕاهیبێکی پیر بوو بە ناوی ئەیووب. کە حەفتا ساڵ لەمەوبەر لە تەمەنی سەد و پێنج ساڵیدا کۆچی دوایی کردبوو. ئەو زاهیدێکی ناو بەدەرەوە بوو، زۆری هەوڵدەدا ڕۆژوو بگرێ و دوورەپەرێز بێ. ساڵانێک لەمەوبەر لە دەیەی دووهەمی ئەم سەدەیەدا مردبوو. گڵکۆکەی بەڕێز و حورمەتێکی تایبەت و ئاماژەی پڕ لە ڕاز، لەگەڵ هیوای گەورە، کە پێوەندیی بەوەوە هەبوو پیشانی زەیارەتکەرانیان دەدا. (گڵکۆکەی هەر ئەوە بوو کە باوە پایسی بەیانی ئالیووشای دیبوو لە سەری دانیشتووە.) بیرەوەرییەکی دیکەی کلێسا کە بەڕێزەوە باسیاندەکرد، یادی باوە وارسۆنۆفی بە ناوبانگ بوو. کە لە شێخییەتیدا لە باوە زووسیما لە پێشتر بوو. لە کاتی ژیانیدا تەواوی

زیارەتکەرانی کلێسە ئەویان بە پیاو چاکێکی دەلووکار دەزانی و ڕێزیان بۆ دادەنا. بەپێی حەدیسێک هەر دووکیان وەک ئەوەی زیندوو بن، لە تابووتەکەیاندا خەوتوون و کاتی بە خاک سپاردن هیچ داڕزینێکیان پێوە نەدیون و نێوچاوانیان نوورێکی خودایی پێوە دیار بووە. تەنانەت تاقمێکیان سوور بوون لە سەر ئەوەی کە بۆن و بەرامەیەکی خۆش لە تەرمەکەیان هەستاوە.

لەگەڵ ئەوەشدا، جگە لە یادەوەریی پڕ ئامۆژگاری، قسە و باسی گەوجانە و وڕێنە و قسەی تاڵیش لەپاڵ تابووتەکەی باوە زووسیمادا دەکەوتە بەرگوێ. من پێموایە چەن هۆی سەرەکی لەو کاتەدا لە کاردا بوو، یەکێ لەوانە کۆنەڕقێک بوو دەرهەق بە دامەزراوەی پیران کە وەک دابێکی نهێنی وابوو، ڕقێکی شاراوە بوو لە دڵی زۆربەی ڕاهیبەکاندا. تەنانەت لە سەروو ئەوانەشەوە، بەخیلییان بە پاکی و گەورەیی پیری خوا لێخۆشبوو دەبرد. پاکییەکی هێندە بەردەوام کە لە کاتی ژیانیدا گومان لێکردنی حەرام بوو. چونکە لە گەڵ ئەوە کە پیری ڕەحمەتی جێی خۆی لە زۆربەی دڵاندا کردبۆوە، زیاتر لە ڕێگای خۆشەویستییەوە کۆمەڵێکی خەڵک لە دەوری خۆی کۆ دەکردەوە، نەک مۆجزە. بۆیە بووبووە هۆی ئەوەی بەخیلی پێبەرن و نەیاری بە ئاشکرا و نهێنی، نەک هەر لە کلیساکەدا لە دنیای دەرەوەشدا هەبوو. نەبووبووە هۆی ئازاری هیچکەس، بەڵام « بۆ ئەویان ئەوەندە بە پاک و مەزن دەزانی؟» هەر ئەو پرسیارەش بە دووپات بوونەوەی لە پەستا و بەردەوام بوو بە ڕقێکی قورس و بێ بڕانەوە. پێموایە هەر بەو هۆیەوە بوو کەسانێکی زۆر بە بیستنی ئەو بۆهەڕنەهووتە شادی لە دڵیان گەڕا. هەر لەو سەروبەندەدا، تاقمێک هەبوون کە هەتا ئەمڕۆش سەر لە پێناوی پیری کلێسە بوون و تا ڕادەیەک ئەو ڕاستییە تووشی شەرمەزاریی دەکردن و ئەویان بە سووکایەتییەک دەزانی دەرهەق بە خۆیان. نەقڵەکەشی ئەمە بوو. لەگەڵ ئەوەی دیاردەی بۆگەنیو و ڕزین ئاشکرا بوو، دیار بوو ڕاهیبەکان ڕەنگیان تێکدەچوو. کاتێک پێیان دەنایە حوجرەکەوە زوو قیژیان هەڵدەشێوا و بە پەلە

دەردەپەڕینەوە دەرێ و ڕاستییەکەیان بۆ ڕاهیبانی دەرەوە دەگێڕایەوە. لە نێو ئەو ئاپۆرەیەدا تاقمێک ئازیەتبارانە سەریان دەلەقاند، بەڵام زۆربەیان تەنانەت نەیاندەتوانی شادیی خۆیان بشارنەوە، کە لە چاوە پڕ قینەکانیاندا بریقەی دەهات. ئێستا بۆ ئەو کارە هیچکەس لۆمەی نەدەکردن و نارەزایەتییان دەرنەدەبڕی. ئەوەش سەیر بوو، چونکە زۆربەی ئەو ڕاهیبانە سەر لە پێناوی پیری کلێسە بوون. بەڵام لەوە دەچوو چەند ڕۆژێک خودا ئیزنی دابێ کەمینەی ڕاهیبەکان فریان سوار بێ.

زیارەتکەرانیش، بەتایبەت کەسانی خوێندەوار، بۆ سیخوڕی و شۆڤاری تێڕژابوون. چەن کەس لە خەڵکی گوندیش چوونە حوجرەکەوە. تاقمێکی زۆریش لەو گوندییانە لە لای دەروازەی حوجرەکە کۆزیلکەیان بەستبوو. دوای سەعاتی سێ خەڵکێکی زیاتر کۆبوونەوە و بێگومان پێوەندیی بە ئەو هەواڵەوە هەبوو. کەسانێک هاتبوون کە جگە لەو ڕۆژە هیچکەس نەیدیبوون پێبنێنە ئەو حوجرەیەوە، چەند کەسایەتیی خاوەن پلە و پایەش وەبەر چاو دەکەوتن. بەڵام بە ڕواڵەت ئاسایی دیار بوون و باوە پایسی بە نێو چاوانێکی گرژەوە بە دەنگی بەرز و جییدی ئینجیلی دەخوێندەوە و دیار بوو گوێ بە ڕووداوەکانی دەوروپشتی نادا، ئەگەر چی ماوەیەک بوو هێندێ کردەوەی نائاسایی سەرنجی ڕاکێشا بوو. بەڵام وردە وردە سرتوخورتەکان بەرز بوونەوە و بە ئاشکرا بە گوێی ئەویش گەیشت. باوە پایسی لە ناکاو بیستی کە: «ئەمە نیشاندەری ئەوەیە کە حوکمی خودا لە حوکمی مرۆڤ ناچێ.» یەکەم کەس کە ئەو هەستەی درکاند، پیاوێکی ڕەشۆکی بوو کەبە ئیماندار ناوبانگی دەرکردبوو. ئەفسەرێکی بەساڵاچووی شارنشین بوو. بەڵام ئەو قسەی ڕاهیبەکانی بە دەنگێکی بەرز دووپات کردەوە، کە ماوەیەک بوو بە سرتە باسیاندەکرد. ئەوان ماوەیەک بوو بەو ئاکامە نەگبەتییە گەیشتبوون و لەوەش خراپتر جۆرێک خاترجەم بوونی سەرکەوتووانە سەبارەت بەو ئاکامە سات لە دوای سات زیاتر ئاشکرا دەبوو. زۆر زوو هاتنە سەر ئەوەی ئەو

ڕواڵەتە وەلا بنێن و دیار بوو هەست بەوە دەکەن کە هەتا ڕادەیەک هەقی ئەوەیان هەیە وەلای بنێن.

تاقمێک لە ڕاهیبان، سەرەتا بە داخ و کەسەرەوە دەیانگوت: «ئاخر بۆ دەبێ ئەو ڕووداوە بێتە پێشی؟ ئەو جەستەیەکی بچووکی هەبوو بە مەقاش گۆشتی لێنەدەگیرا و تەنیا پێست و یەسقان بوو، کەوایە بۆ دەبێ ئاوا تووشی گەنین بێ؟»

تاقمێکی دیکە بە پەلە گوتیان: «ڕەنگە نیشانەیەک بێ لەلایەن خوداوە» بیروڕای ئەوانیش هەر لە ڕێوە بە بێ هیچ نارەزایەتییەک، وەرگیرا. ئاماژەیان بەو خاڵەش کرد، ئەگەر ئەو بۆنە سروشتییە، ئەو جۆرەی کە سەبارەت بە مردووی تاوانبار، دواتر ئاشکرا دەبێ، یانی دوای تێپەڕینی لانیکەم بیست و چوار سەعات، بەڵام ئەم بۆگەنیوە زووڕەسە «لە جەغزی سروشت بەدەرە» و هەربۆیە دەستی خودا لە کاردا بووە و ئاماژیەکی پێوەیە. ئەو هۆیەش بە سەر زەینیاندا سەپا بوو و بەهیچ شێوەیەک حاشای لێنەدەکرا.

باوە یوسفی نازەنین، ئەو قەشە دڵۆڤان و کتێبدارەی کلێسە، کە باوە زووسیما هۆگرییەکی تایبەتی پێی هەبوو، هەوڵیدا وەڵامی تاقمێک لە زمانتاڵان و بەدوێژان بداتەوە کە: «ئەم بیروڕایە لە هەموو شوێنێک یەکسان نییە» و کلێسەی ئۆرتۆدۆکس قەت پێی وانییە جەستەی پیاوچاکان بۆگەن نابێ، بەڵکو تەنیا بۆچوونێکە، لە زۆربەی ناوچەکانی ئۆرتۆدۆکس، بۆ وێنە لە ئاتووس بۆگەنی مردوو جاڕزیان ناکا. لەوێ دیاردەی شکۆ و گەورەیی کەسی ڕزگار بوو، گەنینی لەش نییە، بەڵکو ڕەنگی یەسقانە. ئەویش کاتێک کە ساڵانێکی زۆر لە ژێرگڵدا بووە و داڕزیوە. باوە یوسف لە کوتاییدا گوتی: «ئەگەر یەسقانەکەشی وەک مێو زەرد بێ دیاردەیەکی گەورەیە لە لایەن خوداوە دراوە بە پیاوچاکی مردوو، ئەگەر یەسقانەکەشی ڕەش بێ نیشانەی ئەوەیە کە خودا ئەوی بە شیاوی ئەو گەورەیی و شکۆیە نەزانیوە ئەوە باوەڕی خەڵکی ئاتووسە و ڕێورەسمی ئۆرتۆدۆکس لەبەر یەک هەڵناوەشێ لە قەدیمەوە بە شێوەیەکی پاک و پاڵاوتە ئاگاداریی لێکراوە.»

بەڵام وتەی ئەو ڕاهیبە سەبوورە شوێنی دانەنا و تەنانەت بوو بە هۆی ئەوەی وەڵامێکی ڕشقنجاڕانەی بدەنەوە. ڕاهیبەکان بەو ئاکامە گەیشتن کە: «هەمووی خۆنواندن و قسەیە و گوێ پێدانی بێکەڵکە.» خەڵکی گوتیان: «ئێمە لە سەر ڕێوڕەسمی دێرین دەمێنین. لەم سەردەمەدا هەموو جۆرە ڕێوڕەسمێک بەڕێوە دەچێ. ئایا دەکرێ لە هەموو ئەوانە پێڕەوی بکەین؟»

ئەوانەی لە هەموو کەس زیاتر گاڵتەجاڕییان وەڕێ خستبوو، دەیانگوت: «ئێمەش بەقەد ئەوانمان باوکانی پیرۆز هەبووە. ئەوان لەوێ لە نێو ئەو تورکانەدا هەموو شتێکیان لە بیر چۆتەوە. ماوەیەکە ئایینەکەیان ڕمووده بووە و تەنانەت گازەنگیشان نییە.»

باوە یوسف بە خەم و کەسەرێکی زۆرەوە لەوێ دوور کەوتەوە، چونکە بە بڕوایەکی کەمەوە بیروڕای خۆی دەربڕیبوو، وەک ئەوەی خۆشی بڕوایەکی تەواوی پێی نەبێ. بە پەرۆشییەوە پێشبینیی دەکرد کەشتێکی خراپ خەریکە دادەمەزرێ و دیاردەی سەرەڕۆیی و نافەرمانی بەئاشکرا وەبەر چاو دەکەوت. وردە وردە هەموو ڕاهیبە ماقووڵەکان وەک باوەیوسف دانیان بەخۆدا گرت و هیچیان نەگوت. وایلێهات تەواوی ئەو کەسانەی پیری کلێسەیان خۆش دەویست و بە گیان و دڵ دامەزراوەی پیرانیان قەبووڵ بوو، بە جارێ سووکایەتییان پێکراوە هەر کاتێک چاویان بە یەکتر دەکەوت بە شەرمەوە چاویان لە یەکتر دەکرد. ئەوانە دەرهەق بە دامەزراوەی پیران بیرۆڕایەکی دوژمنکارانەیان هەبوو، بە فیز و هەواوە ملیان هەڵدەهێنا. بە شێوەیەکی تەوساوی دەیانگوت: «وراسۆنۆفیی ڕەحمەتی بۆگەنیوی لێنەدەهات و هەستمان بە بۆن و بەرامەیەکی خۆشیش دەکرد. بەڵام ئەویش ئەو شکۆیەی بە هۆی پلەوپایەی پیرییەوە وەدەست نەهێنابوو، بەڵکو هەرخۆی لە خۆیدا مرۆڤێکی پیرۆز بوو.» تاقمێک لە ناماقووڵەکانیان دەیانگوت: «فێرکارییەکانیشی هەڵە بوو، ئەو دەیگوت ژیان سەر چاوەی گەورەی شادییە و خەفەتخانە نییە.» دیسان هێندێ کەسی ناماقووڵتر بە توانجەوە دەیانگوت: «ئەو درێژە پێدەری بڕوا و ئایین بوو، بەڵام باوەڕی بە

دۆزەخی مادده نەبوو.» هێندێک لە بەرچاوتەنگانیش دەیانگوت: «زۆری پێداگری لە سەر ڕۆژوو نەدەکرد، شیرینی و چایی و مرەبای بلاڵووکی دەخوارد و لە ماوەی پارێزدا ژنان بۆیان دەنارد. ئایا ڕاهیبی خوداپەرست و تاعەت پاک دەبێ چایی بخواتەوە؟» نەیارترینیان بە بوغز لەزگی و قینەوە دەیانگوت: «ئەو بە پۆز و دەمارەوە دادەنیشت و خۆی بە پیاوی خودا دەزانی، کڕنۆش بردن و بەچۆکدا هاتنی خەڵکی لە هەمبەر خۆیدا بە پێویست دەزانی.» خیشەسەرترین دژانی دامەزراوەی پیران بە سرتوخورتێکی شەیتانانەوە دەیانگوت: «ئەو سووکایەتیی بە فەڕزی تۆبە و دانپیانانیش دەکرد.» لە نێو ئەوانەشدا تاقمێک ڕاهیبی پیرو بە ساڵاچوو وەبەر چاو دەکەوتن کە دینداریکی ڕاستوێژ و لە فەڕز و تاعەتدا زۆر پێداگر بوون. بەڵام لە کاتی ژیانی پیری ڕەحمەتیدا دەمیان نەدەجووڵا و ئێستا لە ناکاو دەمیان گرتبوو و ئەوەش لە هەموو شتێک خراپتر بوو. چونکە وتەکانیان شوێنی لە سەر ئەو ڕاهیبە لاوانە دادەنا کە هێشتا لە سەر بیروباوەڕی خۆیان سوور نەبوون. ڕاهیبی ئابدۆرسکی ئەوانەی بە وردی گوێ لێبوو، هەناسەی هەڵدەکێشا و ڕەزامەندانە سەری دەلەقاند. «بەڵێ، دیارە باوە فراپۆنت دوێنی بەڕاستی حوکمی دەردەکرد.» هەر لەو کاتەشدا باوە فراپۆنت پەیدا بوو، دەتگوت بە ئانقەست هاتووە «بۆ ئەوەی ئاڵۆزییەکە زیاتر بکا. با ئەوەشمان لە بیر نەچێ، حوجرە دارینەکەی لە پەنا پلوورەی مێشەنگوینەکان بوو و قەت لەوێ دوور نەدەکەوتەوە. تەنانەت نەدەهات بۆ کلێسەش، چونکە بڕێک دەلووکار بوو، چاوپۆشییان لێدەکرد و ئەو ئەرک و یاسا و ڕێسایەی لە سەر شانی ئەوانی دیکە بوو، لە سەر ئەو هەڵگیرابوو. بەڵام ئەگەر پێویست بوایە باسی هەموو هەقیقەتەکان بکرێ، ناچار دەبوون ئاوڕی لێبدەنەوە. چونکە زاهیدێکی خەڵوتنشین و گەورەی وەک ئەو کە شەو و ڕۆژ خەریکی عیبادەت بوو (تەنانەت جاری وابوو لە سوجدە دا خەوی لێدەکەوت) نەدەکرا هیچ فەرمانێکی بە سەردا بدەن. ئەگەر پێداگریشیان بکردایە، ڕاهیبان دەیانگوت: «ئەو لە هەموویان پیرۆزترە و لە تەریقەتێکی زۆر سەختتر لەو تەریقەتەی

ئێمە پێڕەوی دەکا. ئەگەر ناشچێ بۆ کلێسە، خۆی دەزانێ کاتی چوونەکەی کەنگێیە و ئەو ڕەوشتی تایبەت بە خۆی هەیە.» بە هۆی ئەو سرتوخورتە تاوانبارانەیەوە بوو کە باوە فراپۆنتیان ئاوا ئازاد کردبوو و هیچ ئەرکێکی ئایینییان پێ نەدەسپارد. هەر وەک هەمووان ئاگادار بوون، باوە فراپۆنت، باوەزووسیمای خۆش نەدەویست. ئێستاش لە حوجرەکەی خۆیدا هەواڵیان پێدابوو کە «حوکمی خودا وەک حوکمی مرۆڤ ناچێ» لە نێو ئەو کەسانەدا کە بەو هەواڵەوە خۆیان گەیاندە حوجرەکەی ڕاهیبی ئابدۆرسکی لە پێش هەموویانەوە بوو. ئێوارەی ڕۆژی ڕابردوو چوو بوو بۆ دیدەنیی، بەڵام بەپەلە و ترس لێنیشتبوو هاتبووە دەرێ. پێشتر گوتم، ئەگەرچی باوە پایسی بە هێز و خۆڕاگر ڕاوەستابوو و ئینجیلی بە سەر تابووتەکەدا دەخوێند. ڕووداوەکانی دەرەوەی نەدەدی و نەشی دەبیست. زۆربەی کردەوە و ڕووداوەکانی لە دڵی خۆیدا هەڵدەسەنگاند، چونکە ئەو کەسانەی دەوروبەری خۆی باش دەناسی. بەڵام خوڕاگرانە لە جێی خۆی نەبزووت و بەبێ هیچ ترس و دڵەڕاوکەیەک چاوەڕوانی ڕووداوی دیکە بوو، وردبینانە چاوی لە ئاکامی ئەو شڵەژانە گشتییە بڕیبوو.

لە ناکاو گوێی لە نەڕە و هەرایەک بوو لە بەر هەیوانەکەوە هات. دەرگای حوجرەکە لە سەر ڕەقی پشت کرایەوە و باوەفراپۆنت لە چوارچێوەی دەرگاکەدا چەقی. تاقمێک ڕاهیب و پۆلێک خەڵکی شارەکەی بەدواوە بوو. بەڵام ئەوان نەهاتنە ژوورێ. لە بەر پلیکان و سەرسەکۆکە ڕاوەستان و چاوەڕوان مانەوە بزانن باوە فراپۆنت دەڵێ چی و یان چی دەکا. چونکە ئەو لە پڕ خۆ بە ژوورێدا کردنەی لەوە نەدەچوو بێهۆ بێ و هەستیان بە مەترسییەک دەکرد. باوە فراپۆنت لە بەر دەرگاکە ڕاوەستا و هەر دوو دەستی هەڵێنا و چاوی مژمۆر و زیت و پڕ لە پرسیاری ڕاهیبی ئابدۆرسکی لە بن باسکی ڕاستیەوە لە ژوورێ ڕوانی. تەنیا ئەو لە بەر کونچکاویی زۆر نەیتوانیبوو لە بەر پلیکانەکان ڕاوەستێ و بەدوای باوەفراپۆنتدا هاتبووە سەرێ. بەڵام ئەوانی دیکە، کاتێک شەققەی دەرگاکە هات و کرایەوە بە

ترسێکی کتوپڕەوە کشانە دواوە. باوە فراپۆنت دەستی هەڵێنا و لە ناکاو نەڕاندی:

«ڕۆحە ناپاکەکان وەدەر دەنێم!» پاشان بە نێو ژوورەکەدا گەڕا و دەستی کرد بە خاچ کێشانی هەموو سووچ و دیوارەکانی حوجرە. ئەوانەی لە گەڵ باوە فراپۆنت هاتبوون، لە ڕێوە تێگەیشتن چ دەکا. چونکە دەیانزانی بچێتە هەر جێگایەک ئەو کارە دەکات، هەروەها هیچ نالێ و هیچ نابیستێ هەتا ڕۆحە ناپاکەکانی وەدەر نەنێ.

لەگەڵ هەر خاچ کێشانێک دووپاتی دەکردەوە: «شەیتان، دوور کەوە! شەیتان، دوور کەوە!» دیسان دەینەڕاند: «ڕۆحە ناپاکەکان وەدەردەنێم.» عەبا زبرەکەی خۆی لە بەر کردبوو و پەتێکی لە نێو قەدی بەستبوو. سینگە ڕووتەکەی بە مووی خۆڵەمێشین داپۆشرابوو، لەبن ژێرکراسە کەتانەکەیەوە دیار بوو. لاقی ڕووت بوو. هەروا کە خەریکی ڕاوەشاندنی دەستی بوو، زڕەی زنجیرە گرانەکانی لە بن عەباکەیەوە هەستا. باوە پایسی دەستی لە ئینجیل خویندن هەڵگرت و چووە بەردەمی و چاوەڕوان ڕاوەستا.

ئاخری هاتە قسە و بە گرژ و مۆنی چاوی تێبڕی: «باوکی بەڕێز بۆ هاتووی؟ بۆ ئەو هێمنایەتییە دەشێوێنی؟ بۆ ئەو مێگەلە خاکەڕاو گوێڕادێرە دەورووژێنی؟»

باوە فراپۆنت وەک شێت و هار گوڕاندی: «بۆ هاتووم؟ دەپرسی بۆ؟ مەبەستم لەو هاتنە چییە؟ هاتووم ئەو میوانە ناپاکانەتان، ئەو شەیتانە بۆگەنیوانە بکەمە دەرێ. هاتووم بزانم بە دزیی منەوە چەند دانەیان لێرە خۆیان مەڵاسداوە. دەمهەوێ بە گەسک ڕایان دەمە دەرێ.»

باوە پایسی بێباکانە لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: «تۆ ڕۆحی ناپاک وەدەر دەنێی بەڵام ڕەنگە خزمەتیشی پێبکەی. کێ دەتوانێ بە خۆی بڵێ «من پاک و پیرۆزم.» دەتوانی وابڵێی باوە؟»

باوە فراپۆنت هەڵچوو: «من ناپاکم، نەک پاک و پیرۆز. من لە سەر کورسیلە دادەنیشم و ئەوان ناچار ناکەم وەک بت بمپەرستن و سوجدەم بۆ

بەرن. خەڵکی ئەم دەوروزەمانە تەریقەتی ڕاستەقینە زایە دەکەن.» پاشان قامکی بۆلای تابووتەکە ڕاداشت و ڕووی لە ئاپۆرەی خەڵکەکە کرد و گوتی: «ئەم پیاوچاکە ڕەحمەتییەی ئێوە حاشای لە بوونی جندۆکە دەکرد و بۆ ڕزگاری لە دەستیان دەوای ڕەوانیی بۆ خەڵک دەنووسی. بۆیە وەک جاڵجاڵووکە لە سووچ و قوژبنی حوجرەکاندا خۆیان مات داوە، بۆیە ئێستا خۆی بۆگەنی لێپەیدا بووە. لەو بارەوە نیشانەیەکی گەورە لە لایەن خوداوە دەبینم.» ڕاستییەک کە ئاماژەی پێدەکرد، ئەمە بوو. ڕۆحە ناپاکەکان ڕاهیبێک دەخەنە ژێر گوشاری خۆیان و بە سەریدا زاڵدەبن. تاوای لێدێ لە کاتی بەئاگاییدا و لە خەیاڵیشدا دەستی لێهەڵناگرن. کاتێک بەوپەڕی ترسەوە ئەو مەبەستە لەگەڵ باوە زووسیما باسدەکا، ئەویش فەرمانی عیبادەتی بەردەوام ڕۆژوو گرتنی سەختی پێدەدا. بەڵام کاتێک عیبادەت و ڕۆژووش چاری ناکا، لەگەڵ عیبادەت و ڕۆژوو گرتن دەوایەکی تایبەتی دەداتێ. لەو سەردەمەدا خەڵکێکی زۆر تووشی سەر سووڕمان دەبن و لەو بارەوە دەکەونە مشتومڕ و سەریان دەلەقێنن و لە پێش هەموویانەوە باوە فراپۆنت لەوە سەرسام بووبوو. تاقمێک لە لۆمەکاران دەچن بۆ لای باوە فراپۆنت تاکو هەواڵی ئەو دەوا «سەیروسەمەرە»ی پێبدەن کە لە لایەن پیرەوە دراوە بەو ڕاهیبە نەخۆشە.

باوە پایسی بە دەنگێکی بەرز و وەک ئەوەی فەرمانی پێبدا گوتی: «باوە لێرە بڕۆ! حوکم کردن بۆ مرۆڤ نەهاتووە و تایبەتی خودایە. ڕەنگە لێرە «نیشانە» یەک ببینن کە نە من و نە تۆ و نە هیچکەس توانای تێگەیشتنی نەبێ» بە توندی و پێداگرانە دووپاتیکردەوە: «باوە، بڕۆ و مێگەلەکە مەئاڵۆزێنە.»

باوە فراپۆنت، تەمی دەمارگرژی بەری چاوی تەنیبوو و هەدای نەدەدا. «ئەو بەپێی حوکم و فەڕز ڕۆژووی نەدەگرت. بۆیە نیشانەکە دەرکەوتووە. ئەویش ئاشکرایە و شاردنەوەی تاوانە. ئەو بە شیرینی فریوی دەخوراد، ژنان شیرینییان لە گیرفانیان دەنا و بۆیان دەهێنا. چایی دەخواردەوە، زگەڕۆ بوو،

گەدەی لە شیرینی دەئاخنی و زەینیشی بەبیری خۆپەرستی... هەر بۆیە تووشی ئەم ئابڕوو چوون و ڕووڕەشییە بووە...»

باوە پایسیش دەنگی هەڵێنا: «باوە، قسەی سووک و هەرزە مەکە. ڕۆژوو گرتن و پارێز و چلەکێشانت جێگای ڕێزە، بەڵام قسەی جوان ناکەی، چونکە وەک لاوێکی هەرزە و نەفام قسەی بێ سەرە و بەرە و منداڵانە دەکەی. باوە پایسی لە کۆتاییدا گوڕاندی: «باوە لێرە بڕۆ دەرێ، فەرمانت پێدەدەم بڕۆ دەرێ!»

باوە فراپۆنت لە گەڵ ئەوەی تا ڕادەیەک خۆی دۆڕاندبوو، هەروا بە زمانێکی تاڵ گوتی: «دەڕۆم ئێوە عالم و بیرمەندن و بە چاوی سووک لە منی خاکەڕا دەڕوانن. بە زانستێکی کەمەوە هاتووم بۆ ئێرە و ئەوەی دەمزانی لە بیرم چۆتەوە. خودا خۆی منی بێ دەسەڵاتی لە کێشەی بیروردی و زانستی ئێوە پاراستووە.»

باوە پایسی لە ژوور سەری ڕاوەستا بوو، چاوەڕێی دژکردەوەی ئەو بوو. باوە فراپۆنت تۆزێ بێدەنگ بوو، لە ناکاو ڕوومەتی لە سەر لەپی دەستی ڕاستەی دانا و چاوی لە تابووتی پیر بڕی و بە دەنگێکی خەماوی گوتی:

«سبەینێ لە ژوور سەری دەخوێنن "ئەی پشتیوان و یارمەتیدەرمان" کە سروودێکی خۆش و پڕ شانازییە.» بە حەسرەوتەوە گوتیشی: «کاتێک کە من دەمرم تەنیا شتێک کە لە ژوور سەرم دەیخوێنن ئەمە دەبێ «چ شادییەکی بەختەوەرانە» کە سروودێکی کەم بایەخە.» لە ناکاو وەک شێت و هار هاواریکرد: «ئێوە بەفیز و تڕزلن، ئێرەش شوێنی دەمار و لەخۆبایی بوونە!» پاشان دەستی هەڵتەکاند و وەر سووڕا، بە هەشتا و لە پلیکانەکان چووە خوارێ. کۆمەڵێک خەڵک کە لە خوارەوە چاوەڕوانی بوون، تێک قژقژان. تاقمێکیان وەدوای کەوتن و تاقمێک لە جێی خویان مانەوە، چونکە دەرگای حوجرەکە هەر وا کرابۆوە. باوە پایسی کە بە دوای باوە فراپۆنتدا هەتا سەر پلیکانەکان هاتبوو، هەروا چاوی لە ڕۆیشتنەکەی بڕیبوو. بەڵام پیرە پیاوی تووڕە و تۆسن هێشتا هێور نەبووبۆوە. بیست هەنگاو

دوورنەکەوتبۆوە، لە ناکاو سەری بۆ لای خورنشین وەرسووڕاند کە خۆر تازە خەریکی ئاوابوون بوو. هەر دوو دەستی بەرز کردەوە و وەک ئەوەی کەسێک پاڵی پێوەنابێ دەمەوڕوو کەوت بە عەرزیدا. دەستی بۆلای خۆر هەڵبڕی و بە حاڵەتێکی شێتانەوە نەڕاندی: «خودای من سەر کەوتووە، مەسیح بە سەر خۆری دەمەوئێوارەدا زاڵبووە. ڕوومەتی بە عەرزەکەوە نووساندبوو و هەر دوو دەستی لێک بڵاوکردبوو، وەک منداڵ زووڕە زووڕ دەگریا. سەرتاپای بەو گریانە دەلەرییەوە. پاشان هەموو هەڵاتن بۆ لای. قسەی سەیر و سەمەرە و پڕمەی گریانی هاودڵانە هاتە گۆڕێ... دەتگوت جۆرێک لێوەیی هەوساری هەموویانی بە دەستەوە گرتووە».

تاقمێک بە سەر ترسدا زاڵبوون و هاواریانکرد. «ئەمەیە ئەو کەسەی کە پیاوی خودایە! مرۆڤی پاک و پیرۆز ئەمەیە!» خەڵکەکەش گوتیان: «ئەمەیە ئەو کەسەی کە دەبێ ببێتە پیری کلێسە.»

خەڵکەکەش تێکڕا گوڕاندیان: «ئەو نابێتە پیری کلێسە... قەبووڵی ناکا... خۆی ناخاتە خزمەتی ئایینێکی نفرین کراوەوە... نابێتە درێژە پێدەری ئەو گەوجییەتییە.» کوتنی ئەوەش کەتا کوێ شوویان لێهەڵکێشابوو، هەر باسی ناکرێ. بەڵام لەو کاتەدا دەنگی کەڵەزەنگی کلێسە بەرز بۆوە و بانگیکردن بۆ ڕێوڕەسمی ئاینیی. هەموویان خاچی خۆیان کێشا. باوە فراپۆنتیش هەستا و بێ ئەوەی چاو لە دەور و بەری خۆی بکا، لە کاتێکدا قسەیدەکرد و قسەکانی زیاتر وەک وڕێنە دەچوو، خاچی خۆی کێشا و گەڕایەوە «بۆ حوجرە دارینەکەی. چەند کەس وەدوای کەوتن و ئەوانی دیکە بڵاوەیان کرد و بەپەلە ڕۆیشتن بۆ ڕێوڕەسمەکە. باوە پایسی خوێندنی ئینجیلی بە باوە یوسف سپارد و چووە خوارێ. هەراوهوریای شێتانەی دەمارگرژان نەیدەتوانی ورەی بڕووخێنێ، بەڵام بە هۆیەکی تایبەتەوە، لە ناکاو خەمێکی قورس دڵی داگرت و لە ناخەوە هەستیپێکرد. ئارام لە جێی خۆی ڕاوەستا و لە خۆی پرسی: « بۆ ئەوندە دڵتەنگم؟» هەر لە پڕیش بە سەرسوڕمانەوە بۆی دەرکەوت خەفەتەکەی پێوندیی بە هۆیەکی چکۆڵە و تایبەتەوەیە. لە نێو ئەو

کوڕەدا کە دەیانویست هورووژم بکەنە نێو حوجرەکەوە، چاوی بە ئالیووشا کەوت، هەر ئەوەش بووە هۆی ئەوەی ئاوا تووشی خەم و دڵ گوشران بێ. بە سەر سامی لە خۆی پرسی: «یانی ئەو کوڕە ئاوا جێی خۆی لە دڵمدا کردۆتەوە؟» هەر لەو کاتەدا ئالیووشا بە لایدا تێپەڕی. بە هەڵەداوان دەڕۆیشت، بەڵام نەک بۆ لای کلێساکەوە. چاویان بەیەک کەوت. ئالیووشا خێرا سەری وەرسووڕاند و چاوی لە زەوی بڕی. باوە پایسی هەر بەو چاو لێکردنەی کوڕەدا هەستی کرد گۆڕانێکی گەورەی بە سەردا هاتووە.

باوە پایسی گوڕاندی: «تۆش وەسوەسە بووی؟ یانی تۆش لەگەڵ ئەو ئیمان لاوازانەی؟»

ئالیووشا ئارام لە جێی خۆی چەقی و چاوێکی مانادارى لە باوە پایسی کرد. بەڵام دیسان بەپەلە سەری وەرسووڕاند و دیسان چاوی لە عەرزەکە بڕی. لاتەنیشتی کردبووە باوە پایسی و چاوی لێنەدەکرد، بەڵام ئەو چاوی لە ئالیووشا بڕیبوو. باوە پایسی هەمیسان لێی پرسی: «بۆ کوێ ئاوا بە هەشتاو؟ گازەنگ ئەوە بانگت دەکا بۆ ڕێوڕەسمی ئایینی» بەڵام ئالیووشا دیسان متەقی نەکرد. حوجرە بەجێ دێڵی؟ ئەویش بەبێ ئیجازە و بەبێ داخوازیی متفەرک؟ ئالیووشا چزەبزەیەکی هاتێ و سەرنجێکی سەیر، سەرنجێکی زۆر سەیری باوکێکی دا کە مردای پێشووی و فەرمانڕەوای پێشووی دڵ و ئاوەزی بوو، پیرە خۆشەویستەکەی لە سەرە مەرگدا بە ئەوی سپاردبوو، لە ناکاو بە بێ ئەوەی زمانی بگەڕێ دەستی هەڵتەکاند، وەک ئەوەی گوێی پێنەدا و هیچ ڕێزێکی بۆی نەبێ. پاشان بە هەنگاوی خێرا و بە پەلە بەرە و دەروازەکە سەری پێوەنا و لە خەڵوەتخانەکە چووە دەرێ.

باوە پایسی کە بە سەرسووڕمانەوە چاوی تێبڕیبوو، لە بەر خۆیەوە گوتی: «دەزانم دیسان دەگەڕێتەوە[1]»

---

1- کاتێک تەرمی ڕاهیبێک لە حوجرەوە دەبەن بۆ کلێسە و لە کلێسەوە دەیبەن بۆ گۆڕستان، سرووودی «چ شادییەکی بەختەوەرانە...» دەخوێنن. ئەگەر مردووەکە ڕاهیبیش بێ و قەشەش بێ، سرووودی «ئەی پشتیوان و یارمەتیدەرمان» دەخوێنن "یاداداشتی دۆستۆیۆفسکی"

## (٢)

## ساتێکی پڕمەترسی

باوە پایسی لە ئاکامی بیر کردنەوەی خۆیدا سەبارەت بە گەڕانەوەی «کوڕە خۆشەویستەکەی» بە هەڵە نەچووبوو. لەوە دەچوو تا ڕادەیەک لە بارودۆخی ڕۆحیی ئالیووشا گەیشتبێ. لەگەڵ ئەوانەشدا دەبێ بەڕاشکاوی دان بەوە دابنێم کە زۆر دژوارە ئێستا بە شێوەیەکی ڕووناک و ڕاشکاوانە چۆنییەتیی ئەم ساتە پڕ لە شڵەژان و گرێپووچکەیەی ژیانی قارەمانی سەرەکیی چیرۆکەکەم شیبکەمەوە کە ئەو هەمووەم خۆش دەوێ و هێشتا بۆ کامڵبوون و پوختە بوون ڕێگایەکی زۆری لە بەرە. سەبارەت بە پرسیارە دڵهەژێنەکەی باوە پایسی «یانی تۆش وەسوەسە بووی؟ یانی تۆش لەگەڵ ئەو ئیمان لاوازانەی؟» دەتوانم بەجێی ئالیووشا وەڵام بدەمەوە، نا. ئەو لەگەڵ ئیمان لاوازەکان نەبوو. تەواو بە پێچەوانە. لە ڕاستیدا هەموو گێرەوکێشەکانی بە هۆی ئیمانە زۆرەکەیەوە بوو. بەو حاڵەشەوە گرفتارییەکانی هەروا لە جێی خۆی بوو، ئەوندەش پڕ ئازار بوو کە تەنانەت ماوەیەک دواتر ئالیووشا ئەو ڕۆژە خەماوییەی بە یەکێک لە تاڵترین و نەخسترین ڕۆژی تەمەنی خۆی دەزانی. ئەگەر بپرسن: «ئایا تەواوی کەسەر و شڵەژانی ئەو تەنیا بە هۆی ئەوەوە بوو کە تەرمی پیری کلێسە، بەجێی مۆجزە و پەرجۆ، ئاوا زوو بۆگەن بوو؟» دەبێ ڕاست و ڕەوان وەڵام بدەمەوە کە «بەڵێ، ڕاست ئەوە بوو.» بەڵام داوا لە خوێنەرانم دەکەم کە خێرا پێکەنینیان بە دڵسافی و سایلۆحیی قارەمانی لاوی چیرۆکەکەم نەیەت. جگە لەوەش من نامەوێ داوای ئەوە لە خوێنەرم بکەم چاوپۆشی لە عەیبەکانی بکا، یان ئیمانە سادەکەی بە هۆی گەنجییەوە، دەبێ خوێندەوارییە کەمەکەی بکەمە بیانوو بۆ

پۆشینی عەیبەکانی. بە پێچەوانە، دەبێ بڵێم ڕێزێکی سادقانەم بۆ تایبەتمەندییەکانی دڵ و ڕۆحی هەیە. بێگومان لاوێک کە بە وریاییەوە دەکەوتە ژێر کاریگەری و خۆشەویستییەکی کەمی هەبوو، زەینیشی لە چاو تەمەنی زۆر ڕووناک بوو. هەر بۆیە کەم بایەخ دەبوو ئەگەر دان بەو ڕاستییە دابنێم کە هیچ لاوێکی دیکە ئامادە نییە شان بداتە بەر ئەو ئەرک و زەحمەتەی قارەمانەکەی من. بەڵام لە هێندێک لایەنەوە، هەڵچوون بە هەستێکی (هەر چەند ناماقوولێش)، کە لە خۆشەویستییەکی گەورەوە هەڵدەقولا، چاکتر و شیاوترە لەوەی لاوێک ساردوسڕ و دڵمردوو بێ. بەڵام ئەم خاڵە لە تافی لاویدا بەر چاوە و پیاوێکی جحێڵ کە لە ئەویندا بە کەوچکە ئاوێک دەکەوێتە مەلە، پێموایە تووشی دڕدۆنگی دەبێ و ئەوەش زۆر گرینگ نییە ـ ڕەنگە کەسانێکی عاقڵ و بەبیر لێم بپرسن: «ئاخر خۆ هەموو لاوێک ناتوانێ باوەڕی بەو خورافات و پڕوپووچە هەبێ و قارەمانەکەی تۆ بۆ لاوانی دیکە نابێتە سەرمەشق.» دیسان وەڵامی ئەو پرسیارە دەدەمەوە: «بەڵێ! قارەمانەکەی من خاوەن ئیمان بوو، ئیمانێکی پیرۆز و پتەو، بەڵام بەو حاڵەشەوە نامەوێ داوای لێبووردنی بۆ بکەم.»

ئەگەر چی لە سەرەوە گوتم، (ڕەنگە زۆریش بە هەڵەپڕووکێ) نامهەوێ داوای لێبووردن بۆ قارەمانەکەم بکەم، بۆیە بۆ تێگەیشتن لە پاشماوەی چیرۆکەکەم پێویستە هێدی بدوێم. کەوایە دەبێ بڵێم باسی مۆجزە لە گۆڕێدا نەبوو. چەمەڕاییەکی ساویلکانە و بێ ئۆقرە لەزەینیدا نەبوو کە پێی وابێ مۆجزە بۆی دێنێتە دی. بەهۆی سەرکەوتنی ئەندێشەیەکەوە کە دەیهێنا بەر چاوی خۆی ـ نانا، بە هیچ شێوەیەک ـ ئەوەی بەر لە هەموو شتێک دەهاتە زەینییەوە، شێوە و ئەدگارێک بوو، ئەدگاری پیرە خۆشەویستەکەی. ئەدگاری ئەو پیاوە پیرۆزەی کە ڕێز و حورمەتێکی زۆری بۆی هەبوو ـ لەو کاتەدا، ئالیووشا پێویستی بە پەرجۆ نەبوو. لە ڕاستیدا تەواوی ئەو خۆشەویستییەی سەبارەت بە «هەرکەس و هەرشتێک» لە دڵە گەنج و بێگەردەکەیدا بوو،ساڵی ڕابردوو تەواوی لە سەر کەسێک کۆ کردبۆوە ـ ڕەنگە بەهەڵەش ـ لە سەر پیرە خۆشەویستەکەی. لە ڕاستیدا ئەو کەسەی وەک زاتێکی کامڵ و بەری لە عەیب قەبووڵ کردبوو، هەر

بۆیە تەواوی هێز و وزەی لاوانەی خۆی لە ڕێگای ئەوزاتە کامڵ وبێ عەیبەدا دەدی. تەنانەت لەو کاتەدا جگە لە ئەو بیری لە «هیچکەس وهیچ شتێک» نەدەکردەوە. دواتر وەبیری هاتەوە کە لەو ڕۆژە تاڵ و سامناکەدا وا سەری لێشێوابوو، دیمیتریی برای لە بیر چووبۆوە کە ڕۆژی پێشوو ئەو هەمووە خەمبار و شڵەژاو بوو. هەروەها لە بیری چووبۆوە ئەو دووسەد ڕۆبڵە بەرێ بۆ باوکی ئیلیۆشا، ئەگەرچی دوێنێ ئێوارێ ویستبووی ئەو کارە بکا. بەڵام ئەوەی بە پێویستی دەزانی مۆجزە نەبوو، بەڵکو تەنیا « عەداڵەتی مەزن» بوو، چونکە لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە ئەو زەبرە کاریگەر و کتوپڕە، بە شێوەیەکی بێ بەزییانە دڵی بریندار کردووە و ڕێز و حورمەتی نەماوە. بۆ ئەو «عەداڵەت»ەی ئالیووشا چاوەڕوانی بوو، هەر ئەو پێشهاتە نەبوو کە بە شێوەیەکی دژوار وەک مۆجزەی لێهاتبوو، تاکو لەڕێوە بە هۆی خۆڵەمێشی مامۆستا خۆشەویستەکەیەوە وەڕاست بگەڕێ؟ دەی خۆ هەموو دانیشتووانی کلێسە ئەو بیرۆکە و هیوایەیان لە مێشکدا بوو، تەنانەت ئەوانەش کە ئالیووشا ڕێزی بۆ بیر و باوەڕیان دادەنا. بۆ وێنە خودی باوە پایسی. هەر بۆیە ئالیووشاش بێ ئەوەی کێچی گومان بکەوێتە کەولێ، وەک ئەوان ـ ڕاهیبەکانی دیکە ـ خەونەکانی خۆی لێک دایەوە. ساڵێک تەمەنی لە کلێسە تێپەڕی و هەر ئەوە بووە هۆی ئەوەی ئەو چاوەڕوانییە لە دڵیدا گەشە بکا. بەڵام ئەو تینووی عەداڵەت بوو، بەڵێ عەداڵەت نەک مۆجزەی هەتاڵ و بەتاڵ.

ئەوا ئێستاش ئەو مرۆڤەی بەبڕوای ئەو دەبوو سەر بەرزتر لە تەواوی خەڵکی جیهان بێ، هەر ئەو مرۆڤە، بە جێی ئەوەی شکۆیەکی هێژا بۆ خۆی دابین بکات، لە ناکاو سووک و چرووک بووبوو! بۆچی؟ کێ حوکمی لێکردبوو؟ کێ ئەو فتوایەی دابوو؟ ئەوە ئەو پرسیارانە بوون کە دڵە ساوا و بێ ئەزموونەکەی ئالیووشایان ڕێک دەگوشی. بەبێ شەرمەزاری و تەنانەت بە بێ جاڕز بوون، بۆی تامڵ نەدەکرا کە پیرۆزترین پیرۆزان کەوتۆتە بەر تیرو تانەو تاقمێکی گەوج و نەفام سووکایەتیی پێدەکەن. کە بە پێی پلە و پایە زۆر لە ئەو لە خوارتر بوون. تەنانەت ئەگەر مۆجزەیەکیش لە گۆڕێدا نەبووایە و ئەگەر شتێکی

سەیر و گرینگیش لە ئارادا نەبووایە کە ببێتە هۆی ڕوون کردنەوەی هیواکانی. ئیتر ئەم سووکوچرووکییە بۆ چی؟ کەوایە ئەو زوو بۆگەن بوونە، یان بە وتەی ڕاهیبە دەخەزدارەکان، «بەدەر لە جەغزی سروشت»، بۆ چی؟ کە واتە ئەم «دیاردە ئاسمانییە» کە لەگەڵ باوە فراپۆنت بە سەرکەوتوویی بانگەوازیان بۆ کرد، بۆچی بوو و بۆ پێیان وابوو کە هەقی بانگەواز کردنیان هەیە؟ کەوایە عەداڵەت و دەستی خودا لە کوێیە؟ بۆ چی خواستی خودا لە «ساتێکی پڕ مەترسیدا» (بە بڕوای ئالیووشا) وەدەر نەکەوت، وەک ئەوەی بە خواستی خۆی یاسای کوێر و کەڕ و بێبەزەیی سروشتی قەبووڵکردبێ؟ هەر بەو هۆیەوە دڵی ئالیووشا تواتوا بووبوو. هەڵبەت هەروەک گوتوومە، لەوەش دڵتەزێنتر ئابڕوو چووون و سووکوچرووک بوونی خوشەویستترین خۆشەویستەکانی گیانی هەڵدەچۆقاند! ئەم خەم و خۆ خواردنەوەیەی قارەمانی ڕۆمانەکەم ڕەنگە بێبنەما و ناماقووڵانە بێ، بەڵام دیسان بۆ جاری سێهەم پاتەی دەکەمەوە. ئامادەم دانی پیا بنێم کە ئەمەش لەوانەیە بە هۆی ساویلکەییی خۆمەوە بێ. خۆشحاڵم کە قارەمانی ڕۆمانەکەم لەو کاتەدا خۆی زۆر ماقووڵ نیشانندەدا، چونکە مرۆڤی ماقووڵ هەمیشە لە کاتی خۆیدا دێتە سەر ئەقڵ، بەڵام لە کاتێکی تایبەتیدا ئەگەر تاسە و ئەشق لە دڵی گەنجێکدا نەخولقێ ئەی کەنگێ و لە کوێ دەخولقێ؟ بەو حاڵەشەوە چاوپۆشی لەو خاڵە غەریب و سەرسووڕهێنەرە ناکەم، کە لەم کاتە نەخس و تەمومژاوییەدا خۆی بەزەینی ئالیووشادا کرد. ئەو خاڵە تازەیەش کاریگەرییەکی پڕ ئازار بوو کە لە پاش ئاخافتنەکەی لەگەڵ ئیوانی برای بەجێمابوو و ئێستا زەینی ئالیووشای ئابلۆقە دابوو. هەر لەو ساتەشدا بۆی دەرکەوت. نەک ئەوەی دیواری ئیمان و بنەما سەرەکییەکەی ڕۆحی ڕووخەک بووبێ. خودای خۆی خۆشدەویست و ئیمانێکی قایمی پێی هەبوو. ئەگەرچی لە ناکاو بە دژی ئەو هەڵوێستی گرتبوو، لەگەڵ ئەوانەشدا. کاریگەرییەکی پڕ ئاواز و شەیتانی کە بە هۆی ئاخافتنی دوێنێ لەگەڵ ئیوانی برای لە داڵغەیدا مابوو، ئێستا لە ناکاو لە گیانیدا بووژایەوە و وا دیار بوو ڕووپەڕی زەینی داگرتووە.

هەوا خەریک بوو تاریک دادەهات کە ڕاکتین لە کاژستانەکە تێپەڕی و لە نێوان خەڵوتخانە و کلێسادا، لە ناکاو چاوی بە ئالیووشا کەوت لە ژێر دارێک ڕاکشاوە و نێو چاوانی بەعەرزەکەوە ناوە و چرتە ناکا. لەوە دەچوو خەوی لێکەوتبێ. چوو بۆ لای و هەرای لێکرد.

بە سەرسووڕمانەوە گوتی: «ئالکسی، لێرەی؟ یانی دەبێ ئاوا...»

قسەکەی تەواو نەکرد. ویستی بڵێ: «یانی دەبێ ئاوا کەوتبێتی بەعەرزیدا؟» ئالیووشا چاوی لێنەکرد، بەڵام ڕاکیتین بەو جووڵە ئەستەمە خێرا تێگەیشت کە گوێی لە دەنگی بووە و لە مەبەستی گەیشتووە.

ڕاکیتین لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: «چبووە؟» بەڵام ڕوخساری کە لە بەر سەرسوڕمان گرژ بووبوو، وردە وردە جێی خۆی دایە بزەیەک کە تانەو توانجی لێدەباری.

- گوێ بگرە، دووسەعاتە بە دواتا دەگەڕێم. لە پڕیکدا غەیب بووی. ئەوە لێرە چ دەکەی؟ ئەوە چ گەوجییەتییەکە؟ دا هەستە چاوم لێکە...

ئالیووشا سەری هەڵێنا، هەستا دانیشت و پاڵی دا بە دارەکەوە. نەدەگریا، بەڵام کەسەر و تووڕەیی بە ڕوخسارییەوە دیار بوو. بەو حاڵەشەوە چاوی لە ڕاکیتین نەدەکرد و لە لای شانی ئەوەوە چاوی لە دوور بڕیبوو.

- دەزانی بە جارێ ڕەنگت تێکچووە؟ شێواوی! ئیتر ئەو هێمنایەتییەی جارانی پێوە دیار نییە. ڕقت لە کێ هەستاوە؟ کێ دڵی ئێشاندووی؟ ئالیووشا کە هەروا چاوی زیت کردبۆوە و لە شوێنێکی نادیاری دەڕوانی، دەستی هەڵتەکاند و گوتی: «لە کۆڵم بەوە، بڕۆ.»

- ئەها، تێگەیشتم! هەموو سەرمان لێشێواوە. ڕاست وەک کەسانێکی حەپۆل و ساویلکە دەستمانکردووە بە گوڕەگوڕ! تۆ وەک فریشتە وای ئالیووشا. ڕاستت دەوێ سەرم لێت سووڕماوە و ماوەیەکی زۆرە تووشی سەرسامییەکی وا نەبووم. من وەک پیاوێکی زانا و خوێندەوار لە تۆم دەڕوانی...

ئالیووشا ئاخری چاوی لێکرد، بەڵام بە شێوەیەکی سارد و سڕ، وەک ئەوەی گوێی لە قسەکانیشی نەبێ.

ڕاکیتین دیسان واق وڕماوانە گوتی: «یانی ورچەکەت هەر لەبەر ئەوە تۆپیوە، چونکە ئەو پیرە پیاوە بۆگەن بووە؟» خۆ تۆش لە سەر ئەو باوەڕە نییت کە پیر بە مردوویی مۆجزەیەک دەکات؟»

ئالیووشا بە قەڵسی گوڕاندی: «باوەڕ دەکەم و باوەڕم کردووە و زۆر چاکیش، ئیتر چتدەوێ؟»

ـ هیچ گیانەکەم. بە قوربانی ئەو ئەقڵەت بم، ئاخر ئەمڕۆ کوڕە قوتابیی سێزدە ساڵانیش باوەڕ بەو قۆڕیاتە ناکەن. دەی کەوایە... تۆ ئێستا لە خودا توورەی و خەریکی بە گژیدا دەچییەوە. چونکە خودا پیرەکەتی بە شیاو نەزانیوە ئەو پلە و پایەی بداتێ. پەککوو مرۆڤی چۆن هەیە!

ئالیووشا ماوەیەک نێو چاوانی تێک ناو کتوپڕ چاوی زەق کردەوە... بەڵام نەک بەڕقەوە. پاشان بزەیەکی بە زۆری نیشتە سەر لێوی و گوتی:

ـ لە خودای خۆم یاغی نابم. بۆیە وادەکەم، «دنیاکەیم قەبووڵ نییە.» ڕاکیتین چەند ساتێک بیری لە وەڵامەکەی کردەوە: «مەبەستت چییە دنیاکەیت قەبووڵ نییە؟ ئەوە ئیتر چ گەوجییەتییەکە؟»

ئالیووشا وەڵامی نەدایەوە.

ـ وڕێنە و قسەی قۆر بەسە. بابچینە سەر عەسڵی مەتڵەب. ئەمڕۆ هیچت خواردووە؟

– لە بیرم نییە... پێموایە خواردوومە.

ـ ڕەنگت زرد بووە، خەریکی دەبووریێتەوە، پیاو بەزەیی پێتدادێ. بیستوومە دوێشەو خەو نەچۆتە چاوت، لەوێ کۆبوونەوەتان بووە. شتێک بخوێ باشە. دوای ئەو قاڵمە قاڵم و ئازارە، پێموانییە لە پەنچکێ نان زیاترت خواردبێ. بڕێک سۆسیسم لە گیرفاندایە. لە شاری کرێم بۆ نێو ڕێ، بەڵام پێموانییە تۆ سۆسیس بخۆی...

– لەتێکم بدەیە.

ـ سەیرە، هەمووتان شێت بوون! یاغی بوونی هەمیشەیی و شیروتیر کێشان! کاکی خۆم، نابێ ئەو هەلەمان لە کیس بچێ. بابچین بۆ ماڵی ئێمە، خۆشم

دەمەوێ چۆڕێ ودکا هەڵدەم. ماندوویەتی هێزی لێبڕیوم پێموایە ودکا بۆ تۆ حەرامە... یان دەتەوێ قومێک بخۆیەوە؟

- چوڕێک ودکاشم دەیە.

ڕاکیتین بەواق وڕماوی چاوی تێبڕی: «سەیرە! کاکی خۆم، سەرم لە تۆ سووڕماوە. دەی ئێستا ودکا بێ یان سۆسیس هەلێکی باشە و نابێ لە کیسی بدەین. هەستە بابڕۆین.»

ئالیووشا بە بێدەنگی هەستا و بەدوای ڕاکیتیندا ملی ڕێی گرت.

- ئەگەر وانچێکای برات ئەوەی بدیبایە - سەری سووڕ نەدەما؟ ئەرێ زانیوتە ئێوان فیۆدرۆیچی برات ئەمڕۆ ڕۆیشت بۆ موسکۆ؟ ئالیووشا بە ساردوسڕی وەڵامی دایەوە: «ئەرێ» لە ناکاو دیمیتریی برای وەبیر هاتەوە، ئەویش بۆ ساتێک. ئەگەر چی ئەوی وەبیری شتێک خستەوە کە نەدەبوو ساتێک وەدەرنگ بکەوێ - ئەرکێکی گەورە بەڵام ئەو بیرکردنەوە زوو تێپەڕی و شوێنی لە سەر دانەنا و هەر خێرا لە بیری چۆوە. بەڵام ماوەیەک دواتر، وەبیری هاتەوە.

«جارێکیان وانچێکای برات گوتی» من لیبرالێکی گەمژە و ئاساییم» تۆش جارێکیان وات بە گوێمدا دا کە پیاوێکی «بێ ئابڕوو» ی. چاکە! ئێستا دەمەوێ بزانم ئەو هێژایی و خاوەن ئابڕووییەتان چییە و بە کاری چی دێ؟» ڕاکیتین بە منجەمنج ئەو ڕستەییەی لەبەر خۆیەوە گوت. پاشان بە دەنگێکی بەرز گوتی: «گوێ بگرە! وەرە با لەو ڕێگایەی پشت کلێساوە ڕاست بڕۆین بۆ شاری. لە بیرم نەبوو، دەبێ سەرێکیش لە مادام خۆخلاکۆف هەڵێنم. بیری لێبکەوە، بە سەر هاتەکەی ئەمڕۆم مووبەموو بۆ نووسیوە، بڕوام پێبکە، هەر لە ڕێوە وەڵامەکەی بۆ نووسیمەوە (ئەو سەیر شەیدای نووسینی نامە و بیرەوەرییە) «قەتم چاوەڕوانیی کردەوەیەکی ئاوا لە مرۆڤێکی خاوەن کەسایەتیی وەک باوە زووسیما نەبوو» ڕاست ئەوە قسەکەی بوو. «کردەوە.» زۆریش تووڕە و کەم جیکەڵدانە. بەڕاستی مرۆڤێکی سەیرن!» دیسان لە ناکاو گوڕاندی: «سەبرکە.» ڕاوەستا، شانی ئالیووشای گرت و ئەویشی ڕاگرت.

بیرۆکەیەکی نوێ و کتوپڕ بەزەینیدا هاتبوو، چاوی پڕ پرسیاری لە ئالیووش بڕی: «دەزانی ئالیووشکا» ئەگەر چی بەڕواڵەت پێدەکەنی، دیار بوو ناوێرێ ئەو بیرۆکە نوێیە بدرکێنێ. چونکە هێشتا باوەڕی بەو حاڵەتە سەیر و چاوەڕوان نەکراوەی ئالیووشا نەدەکرد. ئاخری شەرمەونانە و زیرەکانە گوتی: ئالیووشکا، دەزانی بۆ کوێ بچین باشە؟»

- بۆ من گرینگ نییە... هەر کوێت پێخۆشە دەچین.

ڕاکیتین کە تەواو لە ئالیووشا دڵنیا نەبوو، ئاخری بە دڵەلەرزێ درکاندی: «پێت چۆنە بچین بۆ لای گرووشنکا؟ دێی بچین؟»

ئالیووشا هەر لەڕێوە بە ئارامی وەڵامی دایەوە. «دەی زۆر چاکە با بچین بۆ لای گرووشنکا.» ئەو ڕازی بوونە خێرا و هێمنانەیە، ڕاکیتینی وا تووشی سەر سووڕمان کرد، هێندەی نەمابوو خۆی بدۆڕێنێ.

بەواق وڕماوی گوڕاندی: «هەر بەڕاست؟!» بەڵام قۆڵی خستە قۆڵی ئالیووشا و ملی ڕێیان گرت، بەڵام لە دڵەوە دەترسا نەوەک ئالیووشا پەشیمان بێتەوە. بە بێدەنگی دەڕۆیشتن. ڕاکیتین نەیدەوێرا قسە بکا. لە بن لێوەوە منجاندی: «گرووشنکا لە خۆشیانا باڵ دەگرێ» بەڵام دیسان بێدەنگی بە سەریاندا زاڵ بۆوە. لەڕاستیدا بۆ شاد کردنی دڵی نەبوو کە ئالیووشای دەبرد بۆ دیدەنیی. ئەو بەرژەوند خواز بوو و هەر کارێک قازانجی بۆی نەبوایە، بە ئامانوزامان خۆی لێنەدەدا. لەم بارەوە ئامانجێکی دوولایەنەی هەبوو هەستی تۆڵە مێشکی داگرت ولە خۆشیی ئەوەی بە تیرێک دوو نیشانە دەپێکێ، شایی لە دڵیدا دەگەڕا. سەرەتا دەیویست شەرمەزار بوونی عادڵان ببینێ و ڕووخانی ئالیووشا و وەسەر تەڵەی تاوان پەڕاندنی بە چاوی خۆی ببینێ. دووهەمیش قازانجێکی ماڵیی بۆ خۆی لە بەر چاو گرتبوو، کە دواتر بە تێروتەسەلی باسی دەکەم.

بە شادییەکی ئاوێتەی ڕەق و بێزارییەوە بیریکردەوە: «کاتی خۆیەتی. نابێ ئەو هەلە لەکیس بدەین. چونکە ڕاست ئەو شتەیە کە دەمانویست.»

## (٣)

# پیوازە قوڕۆڵە

گرووشنکا لە قەرەبالغترین گەڕەکی شار دەژیا، نزیک گۆڕەپانی کلێسەی گەورە لە ماڵۆچکەیەکی دارینی کرێنشین بوو. خاوەن ماڵەکەی بێوەژنێک بوو، مێردەکەی ناوی مارازۆف بوو. ئەو ماڵە بینایەکی بەردین و دوو نهۆم بوو. زۆر کۆن و ناحەزیش بوو. ئەو بێوەژنەش لەگەڵ دوو خوشکەزای کە ئەوانیش پیرەکچ بوون لەو ماڵەدا دەژیان. پێویستی بە کرێنشین نەبوو، بەڵام هەموو دەیانزانی چوار ساڵە گرووشنکا کرێنشینییەتی، ئەویش تەنیا لە بەردڵی سامسانۆفی بازرگان، کە خزمی خۆی بوو، ئەو پیرە پیاوە تاجرە زۆری گرووشنکا خوشدویست و سەر پەرشتی لێدەکرد. دەیانگوت بۆیە ئەو پیرە پیاوە قرنیسە «گوڵە جەرگە»کەی بردۆتە ماڵی ئەو بێوەژنە، تاکو ئاگای لێبێ و چاوی لە سەر هەڵنەگرێ. بەڵام ئەو کێشکدێرانە تەنیا ماوەیەکی خایاند و وایلێهات پیرێژن بە دەگمەن چاوی بەگرووشنکا دەکەوت و زۆری خۆ تێهەڵنەدەقورتاند. ڕاستییەکەی چوار ساڵ پیرە پیاو ئەو کچە هەژدە ساڵانە ناسک و قەد باریک و شەرمەونەی لە ناوەندی پارێزگاوە هێنابوو. لەو کاتەشەوە تا ئێستا زۆر ڕووداوی جۆراوجۆر قەومابوو. لە نێو شار کەم کەس ئاگاداری ژیان و بەسەرهاتی کچە بوون، ئەویش زۆر نامەعلووم. لە ماوەی ئەو چوار ساڵەشدا ئاگادارییەکی دیکەیان وەدەست نەکەوتبوو. تەنانەت لەو ماوەیەدا کەسانێکی زۆر عاشقی «جوانی بێ وێنە» یانی ئەوکچەی لەو ماوەیەدا بووبووە ئاگرافنا ئەلکلساندرفنا. بووبووە دەمگۆ کە لە تەمەنی حەڤدە ساڵیدا دەکەوێتە داوی ئەفسەرێکەوە و ئەو ئەفسەرەش زۆر

زوو لێی جیا دەبێتەوە و دەڕوا ژنێکی دیکە دێنێ. گرووشنکاش بە هەژاری و بەدناوی، بێکەس دەکەوێ. ئەگەر چی دەیانگوت سامسانۆف گرووشنکای لە بێکەسی و بێ ماڵوحاڵی نەجات داوە، بەڵام گرووشنکا کچی بنەماڵەیەکی ناو بەدەرەوە و بەئابڕوو بووە و بنەماڵەکەیان ڕەسەن بوون و باوکی کابرایەکی پاک و لە خوداترس بووە.

بەڵام ئێستا دوای چوار ساڵ، ئەو کچۆڵە بەستەزمان و لێقەوماوە، ئەو ناسکۆڵە قەد باریک و پەری شێوەیە، بووبووە شۆخەژنێکی نەرمونۆڵ و سوور و سپی، کاڵوکرچێکی ڕووسی. ژنێکی چاوکراوە و وریا و بادیهەوا و بێباک. بۆ مامەڵە خاوەن هۆش و سەردەرچوو. دەیانگوت لە ڕێگای حەرام یان حەڵاڵەوە توانیویەتی برە سامانێک وەسەریەک نێ. تەنیا یەک شت بوو کە هەموو لە سەری کۆک و هاوڕا بوون. دەست پێڕاگەیشتنی مەحاڵ بوو. جگە لە پارێزەرەکەی پیرەپیاوی بازرگان - هیچکەس لەو چوار ساڵەدا نەیتوانیبوو لێی نزیک بێتەوە و ئەشقێنیی لە گەڵ بکات. ئەوەش ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگر بوو، چۆنکە پیاوانێکی زۆر، بەتایبەت لە دوو ساڵی ڕابردوودا، هەوڵیان دابوو سازیبکەن و کاوی دڵی لێوەرگرن، بەڵام دەم لەپووش دەمێننەوە و دەستیان لە هیچ گیر نابێ. چونکە ژنە زۆر ئازایانە خوڕاگری دەکا و وایان بە گژدا دێتەوە و ڕووشکێنیان دەکا، ناچار دەبن هەڵێن و ئاوڕ نەدەنەوە. هەروەها دەڵێن ژنە لەم دواییانەدا دەستی داوەتە کارێک کە «سفتە بازیی» پێدەڵێن. لەم ڕێگایەشدا لێزانییەکی شایان لە خۆی نیشاندەدا کە لە نێو خەڵکدا بوو بە سرتوخورت کە ژنە دەستی جوولەکەکانیشی لە پشتەوە بەستووە. مەبەستیش ئەوە نەبوو کە ژنە پارە بە ماوە دەدا، بەڵام بۆ وێنە هەموو دەیانزانی کە ماوەیەک لەمەوبەر بە هاودەستیی کارامازۆفی پیر، سفتەکان بە نرخێکی کەم، واتە یەک لە دەی نرخی ئەسڵی، دەکڕێ و دوای ماوەیەک دە هێندەی ئەو نرخە بەهرە وەردەگرێ.

سامسانۆف پیرە پیاوی نەخۆش و کەلەلا و دەوڵەمەند، مرۆڤێکی ڕژد و چکووس و بێ بەزەیی بوو. تەنانەت ڕەحمی بە کوڕەکانی خۆشی نەدەکرد.

لە ساڵی پێشووەوە کە لاقە پەنەمیوەکانی هێزی ڕۆیشتنیان لێبڕابوو، کەوتبووە ژێر چاوەدێڕیی گرووشنکا و ئاگاداریی لێدەکرد. ئەگەرچی سەرەتا دەیویست لەو بڕە بژیوەی بۆ هەڵسووڕانی ژیانی ئەو ژنە لە بەر چاوی گرتبوو کەم بکاتەوە و بە وتەی خەڵکانی وردبین و قسە خۆش نانەکەی لەوە زیاتر بۆ چەور نەکا. بەڵام ئاخری ژنە کاری خۆی کرد و هەر چۆنێک بوو وەفاداریی خۆی پێسەڵماند و خۆی لەو دیلییە ڕزگار کرد. ئەو پیرە پیاوە کە (ماوەیەکی زۆر بە سەر مەرگیدا تێنەپەڕیوە)؛ لە کاتی خۆیدا مامەڵەی زۆر قورس و گەورەی دەکرد و ماڵ و سامانێکی زۆری پێکەوە نابوو و لە قڕنیسیشدا وێنەی نەبوو. ئەگەرچی گرووشنکا وای شوێن لە سەر دانابوو نەیدەتوانی بێ ئەو بژی. (بەتایبەت لەم دوو ساڵەی ڕابردوودا)، مشت قووچاوتر بووبوو و هیچی لە چنگ دەرنەدەهات. کاتێک گرووشنکاش هەڕەشەی تۆرانی لێکردبوو، سامسانۆف لەو بڕیارەی خۆی پاشگەز نەبۆوە. بەڵام بڕێکی پارە بەگرووشنکا دابوو کە ئەوەش کاتێک مەعلووم بوو خەڵکی تووشی سەرسووڕمان کرد. کاتێک هەشت هەزار ڕۆبڵی پێدا، گوتی: «تۆ ژنێکی تێگەیشتبووی و دەتوانی بەرەی خۆت لە قوڕاو دەرکێشی، بەڵام ئاگات لە خۆت بێ. با پێتبڵێم جگە لە مووچەی ساڵانە کە بۆم بڕیویەتەوە، هەتا ڕۆژی مەرگم لەوە زیاترت نادەمێ و لە وەسیەتنامەکەشدا هیچت بۆ بەجێناهێڵم و بە هیوای میرات مەبە.» قسەی خۆشی بردە سەر، کاتێک چاوی لێکنا هەموو ماڵ و سامانەکەی « بۆ کوڕەکانی بەجێ هێشت کە هەموو ماوەی ژیانیان بە ژن و منداڵەوە وەک خزمەتکار لە ماڵەکەیدا بوون و دەردی سەگی پێدەدان. لە وەسیەتنامەکەیدا تەنانەت ناوی گرووشنکای هەر نەهێنابوو. دواتر ڕوون بۆوە. کە بە ئامۆژگارییەکانی گرووشنکای هان داوە دەست بکا بە مامەڵەی کڕین و فرۆشتن و ماڵ و سامان پێکەوەنێ.

فیۆدۆرپاولۆویچ یەکەم جار بە بۆنەی سفتەیەکەوە لەگەڵ گرووشنکا ئاشنا بوو و سامسانۆفی پیر بە واقوڕماوی بۆی دەرکەوتبوو کە ئاشقی بووە و وەختە گیانی بۆی دەرچێ. ئەگەر چی نەخۆشینی هێزی لێبڕیبوو،

بەڵام پێکەنینی پێی هات. شایانی باسە لە تەواوی ماوەی ئاشنایەتییاندا، گرووشنکا هیچی لە پیرە پیاو نەدەشاردەوە و دواتر دەرکەوت تەنیا لەگەڵ ئەو وا بووە. لەو دواییانەدا، کاتێک دیمیتری فیۆدۆرۆویچ قوت بۆوە و بە ئالای ئەوینەوە هاتە مەیدان، پیرە پیاو پێکەنینی نەهات هیچ، بەپێچەوانە ئامۆژگارییەکی قورس و قایمی وەک گوراە لە گوێی گرووشنکا کرد.

ـ ئەگەر ناچار بووی لە نێوان ئەو باوک و کوڕەدا یەکیان هەڵبژێری، چاکتر وایە باوکەکە هەڵبژێری، بەو شەرتەی دڵنیا بی ئەو پیرە هیچوپووچە دەتخوازێ و مارەییەکی چاکی لێهەڵدەوەرێ. بەڵام واز لە جەناب سەروانی کوڕی بێنە، چونکە لەو کارەدا هیچ قازانجێکت پێناگا.

ئەوە سەرلەبەری قسەی سامسانۆفی پیر بوو، کە هەستی کردبوو پێی لە لێوی گۆڕە و لە ڕاستیدا پێنج مانگ دوای ئەو قسانە مرد.

با خێرا ئاماژەیەکیش بەوە بکەم، ئەگەرچی خەڵکێکی زۆر لەم شارەی ئێمە ئاگاداری ئەو ڕقەبەرایەتییە ڕموزنانەیەی کارامازۆف و کوڕەکەی بوون، کە ململانێیەک بوو لە سەر گرووشنکا. کەسیش نەیدەزانی لە ژێر پەردەی هەڵسوکەوتی گرووشنکادا سەبارەت بەو جووتە چیی تێدایە. تەنانەت دووکەس لە خزمەتکارانی گرووشنکا (دوای ئەو کارە ساتەی دواتر باسی دەکەین) لە دادگا شایەدییان دا کە گرووشنکا تەنیا لە ترسانا ڕێی بە دیمیتری فیۆدۆرۆویچ دەدا بچێتە ماڵێ. چونکە «هەڕەشەی کوشتنی لێکردبوو.» یەکێ لە خزمەتکارەکانی ئاشپەزێکی پیرو بێ هێز و گوێ گران بوو، کە لە ماڵە کۆنەکەی گرووشنکاوە دەهات. ئەوی دیکەشیان نەوەی ئاشپەزە پیرە بوو. کچێکی وریای بیستساڵان بوو کە ئەرکی پێشخزمەتیی لە ئەستۆ بوو. گرووشنکا زۆر بە دوای کەلوپەل و زریقە و بریقەی ماڵەوە نەبوو، هەڵەخەرجیشی نەدەکرد. ماڵەکەی سێ وەتاغی هەبوو، وەتاغی میوانداریەکەی کە بە دەستێک قەنەفەی کۆن ڕازابۆوە و بە شێوازی دروست کرابوو و هی خاوەن ماڵەکەی بوو.

ڕاکتیین و ئالیووشا چوونە ژووریَ، هەوا بەتەواوی تاریک بووبوو، بەڵام هیچکام لە وەتاغەکان چرایان لیَهەڵنەکرابوو. گرووشنکا لە ژووری میوانداری لە سەر چرپایەکی گەورە و قایم و ناقۆلا ڕاکشابوو. ڕووپۆشێکی چەرمینی کۆن و کاڵەوە بووی بە سەردا کێشرابوو. دوو باڵنجی نەرم و سپیی نابووە ژێر سەری. دەستی چەپەی نابووە ژێر سەری و لە سەر پشت تخێل بووبوو. جلەکانی جورێک بوو دەتگوت چاوەڕوانی کەسێکە. چەپکەنێکی هاوریشمینی ڕەشی لەبەردا بوو، تۆڕێکی جوانیشی دابوو بە سەریدا کە زۆری لیَدەکالآیەوە. شالێکی تۆڕیشی بە سەر شانیدا دابوو و دەرزیلەیەکی ئاڵتوونیی گەورەشی لێدابوو. سوور سوور دیار بوو چاوەڕوانی کەسێکە. لەوە دەچوو پەرۆش و بیَ ئۆقرەبیَ. ڕەنگی بزڕکاو و چاو ولێوێکی گەرم، نووکی قامکی دەستە ڕاستی بە ئارامی لە شانی چرپاکە دەدا. وەژوور کەوتنی ڕاکیتین و ئالییوشا تۆزیَ تووشی شڵەژانی کرد. لە ژووری میوانداریییەوە دەنگی ڕاچڵەکین و هەستانی گرووشنکا لە سەر چرپاکە و هاواری «کێیە؟» کەوتە بەر گوێیان. بەڵام پێشخزمەت میوانەکانی دی و خێرا هەواڵی هێنا بۆ خاتوونەکەی:

- خاتوون، ئەو نییە، هیچ نییە، کەسانێکی دیکەن هاتوون.

ڕاکیتین ئالیووشای بەرەو وەتاغی میوانداری ڕێنوێنی کرد و لە ژێر لێوەوە منجاندی: «ئەوە لێرە چ خەبەرە؟» گرووشنکا هێشتا نەهاتبۆوە سەر خۆ و لە پەنا قەرەوێڵەکەدا ڕاوەستا بوو. چەند تاڵە مووی قاوەیی تۆخ لە ژێر دەسماڵە تۆڕییەکەیەوە هاتبووە دەریَ و کەوتبووە سەر شانی ڕاستەی. بەڵام نەیزانیبوو و بەر لە دیتنی میوانەکان و ناسینیان، سەروبسکی ڕێکوپێک نەکرد.

«ئەیەڕۆ ڕاکیتکا، ئەوە تۆی؟ خوودارت کردم، کێت لە گەڵ خۆت هێناوە؟» لە گەڵ ئەوەی ئالیووشای ناسییەوە، بە واق وڕماوی گوتی: «ئەیەڕۆ خودایە گیان، ئەوت هێناوە!»

ڕاکیتین، وەک دۆستێکی زۆر خۆمانە، کە ئیختیاری فەرمانی ببێ لە ماڵەکەدا، گوتی: «پێیانبڵێ مۆم بێنن هەڵیبکەن!»

«مۆم... بەڵێ، مۆم... فینیا مۆمی بۆ بێنە...» پاشان سەری بۆ لای ئالیووشا وەرسووڕاند و دیسان بە سەر سوورمانەوە گوتی: «چاکە، کاتێکی زۆر چاکیشت بۆ هێنانی ئەو هەڵبژاردووە!!» پاشان ڕۆیی بۆ بەر ئاوێنەکە و دەستیکرد بە ڕێکوپێک کردنی سەر وقژی. لەوە دەچوو ناقایل بێ.

ڕاکیتین، کە هەتا ڕادەیەک دڵمەند بوو، پرسیی: «بۆ پێت خۆش نییە هێناومە؟»

گرووشنکا گوتی: «ڕاکیتکا، زراوت بردم، ترسام.» پاشان بە بزەیەکەوە، ڕووی لە ئالیووشا کرد. «ئالیووشای خۆشەویستم، لێم مەترسە، ناتوانی بیریشی لێبکەیتەوە بە هاتنی تۆ چەندە دڵخۆشم. بەخێر بێی میوانە خۆشەویستەکەم. بەڵام ڕاکیتکا، خووودارت کردم. پێموابوو میتایە دەیهەوێ بە زۆر بێتە ژووری. لای عەسر فریومدا، ناچارمکرد بەڵێنم پێبدا بڕوا بە قسەکانم بکا. درۆم لەگەڵ کرد؛ پێمگوت بڕیارمداوە لای عەسر بچم بۆ دیدەنیی کۆزما کۆزۆویچ و تا درەنگانێ بۆ ژماردنی پارەکانی لەوێ بم. هەمیشە حەوتووی جاریک عەسرانە دەچم بۆ لای و بە حیساب و کیتابەکانی ڕادەگەم. دەرگا لە سەر خۆمان دادەخەین و ئەو بە چۆرتە حیسابی دەکا و من لە دەفتەردا دەینووسم. جگە لە من متمانەی بە هیچ کەسی دیکە نییە. میتیا باوەڕی کرد لەوێ دەبم، بەڵام گەڕامەوە و لەو کاتەوە دەرگاکەم لە سەر خۆم گاڵە داوە و چاوەڕوانی هەواڵم. چۆن بوو فینیا ئیزنی پێدان بێنە ژووری؟ فینیا، فینیا، هەڵێ بچۆ بۆ لای دەرگای حەوشە، بیکەوە و چاو بە دەوروبەردا بگێڕە بزانە جەناب سەروان دیار نییە! ڕەنگە خۆی داشاردبێ و خەریکی سیخوڕی بێ. وەختە دڵم بتۆقێ.»

ئاگرافنا ئەلکساندرفنا، ئێرە کەسی لێنییە، هەر ئێستا چاوم لێکرد. زوو زوو دەچم و لە کونی درگاکەوە چاو لێدەکەم، منیش وەک تۆ ترسم لێنیشتووە.

«پشتی دەرگاکەت خستووە، فینیا؟ «بێتو چاوی بە ڕووناکایی بکەوێ، لەڕێوە دێ. ئالیووشا، ئەمڕۆ زۆر لە براکەت دەترسم. دەبێ پەردەکانیش دادەینەوە ـ ئاوا باشترە» خۆی پەردە قورسەکانی دادایەوە. گرووشنکا بە دەنگی بەرز قسەیدەکرد و ئەگەرچی بێئۆقرە دیار بوو، بەڵام دەتگوت شێت بووە.

ڕاکیتین پرسیی: « بۆ ئەمڕۆ ئەوەندە لە میتینکا دەترسی؟ پێموابوو ڕێزەیەکیش شەرم و شکوێ لێناکەی و بە پەڕۆیەکی پیس کلکی دەگری و فڕێی دەدەی.»

ـ ڕاستت دەوێ چاوەڕوانی هەواڵێکم، هەواڵێکی زۆر گرینگ و پڕ بایەخ، لە بەر ئەوەیە نامەوێ چاوم بە میتینکا بکەوێ. باوەڕیشی نەکرد، پێموا باوەڕی نەکرد، لە ماڵی کۆزما کۆزۆویچ دەمێنمەوە. ئێستا حەتمەن لە بۆسە دایە. لە پشت ماڵی فیۆدۆر پاولۆویچ، لە نێو باخەکەدا بۆ دیتنی من چاوەچاویەتی. ئەگەر لەوێبێ، نایەت بۆ ئێرە، ئەویش چاکتر! بەڵام بەڕاستی چووم بۆ ماڵی کۆزما کۆزۆویچ و میتیا تا ئەوێ لە گەڵم هات. پێمگوت هەتا نیوەشەو لەوێ دەبم و داوام لێکرد نیوەشەو بێت و بمهێنێتەوە بۆ ماڵێ. ڕۆیشت، منیش دەقیقەیەک لە لای کۆزما کۆزۆویچ دانیشتم و بە هەڵەداوان گەڕامەوە بۆ ماڵێ. ئەک چەندە ترسام، بڕوام پێبکەن هەتا ماڵێ هەر هەڵاتم.

ـ ئێستا بۆ ئاوا خۆت ڕازاندۆتەوە؟ چ کڵاوێکی جوانیشت لە سەر ناوە!

ـ ڕاکیتکا، تۆش زۆر سەیری! هەر ئێستا گوتم چاوەڕوانی هەواڵێکم. ئەگەر ئەو هەواڵەم پێبگا، وەک بای شەماڵ دەفڕم، لێرە دەڕۆم و ئیتر چاوتان پێم ناکەوێتەوە. هەر بۆیە خۆم ڕازاندۆتەوە بۆ ئەوەی ئامادەبم و خێرا وەڕێ بکەوم.

ـ بفەرموو بۆ کوێ دەفڕی؟

ـ ئەگەر زۆر بزانی، زوو پیر دەبی. کارت بە سەر ئەوەوە نەبێ.

ـ سەیر شاد و دڵخۆشی... قەتم ئاوا نەدیتووی. جۆرێک خۆت ڕازاندۆتەوە دەڵێی دەچی بۆ کۆڕی سەما و هەڵپەڕکێ.

ڕاکیتین چاوی لە سەرتا پای کرد.

- وا دیارە سەمای چاک دەزانی.

- تۆ خۆت چەندەی لێدەزانی؟

- کۆڕی سەمام دیتووە. پێرارەکە، کوڕی کۆزما کۆزۆویچ ژنی هێنا و من لە سەرەوە تەماشامدەکرد. ڕاکیتکا، کاتێک شازادەیەکی وا لێرە ڕاوەستابێ، پێت وایە دەتوانم قسەت لەگەڵ بکەم، میوانێکی ئاوا! ئالیووشا گیان هەر چەندە چاوت لێدەکەم باوەڕ ناکەم. خودایە گیان یانی ئەو بازەم لە سەر نیشتووە و هاتووی بۆ دیدەینم! ڕاستت دەوێ بیریشم لێنەدەکردەوە چاوم پێت بکەوێ بێی بۆ دیدەنیم. ئەگەرچی ئێستا کاتێکی باش نییە، بەڵام بە دیتنت زۆر دڵشادم. هەتاوەکەم، وەرە لە سەر ئەو قەنەفەیە دانیشە، ئا لێرە، ئەوەتا. ڕاستت دەوێ ئێستا بڕوا بە چاوی خۆم ناکەم... ڕاکیتکا، بریا دوێنێ یان پێرێ بتهێنایە! بەڵام ئاواش هەر خۆشحاڵم! ڕەنگە هەر ئێستاش کە هاتووە چاکتر بێ لە دوێنێ و پێرێ.

گرووشنکا لە پاڵ ئالیووشادا لە سەر قەنەفەکە دانیشت و بە تامەزرۆیی چاوی تێبڕی. لە ڕاستیدا زۆر شاد بوو، کاتێک گوتی خۆشحاڵم، درۆی نەدەکرد. چاوی دەبریقایەوە. زەردەی دەگرت، زەردەخەنەیەکی شیرین و پڕ لە شادی. ئالیووشا چاوەڕوانی ئەو هەموو خۆشەویستی و ڕووخۆشییەی نەبوو. ئەو هەتا ئەو ڕۆژە گرووشنکای ئاوا بە جوانی نەدیبوو، ئەوی وەک بوونەوەرێکی سامناک دەهاتە بەر چاو. دوو شەو لەمەوبەر ئەو هەڵسووکەوتە ناحەزەی دەرهەق بە کاترینا ئیوانا پێوە دیبوو و بە جارێ لە بەر چاوی ڕەش بووبوو، بۆیە ئێستا بە جارێ سەری سوڕمابوو کە ئاوا دڵۆڤان و ڕووخۆش و لە دڵەوە نزیکە. لە گەڵ ئەوەی ترس سەرتاپای داگرتبوو بە لام چاوانی بێئیختیار و بەوردی تێبڕیبوو. دەتگوت تەواوی شێوە و کردەوەی گرووشنکا لە چاو دوو ڕۆژ لەمەوبەر تووشی ئاڵوگۆڕ بووە و ئیتر ئەو ناز و ئەدا و خۆبادان و هەوەس بزوێنییەی نەماوە. ئەوەی

پیوەی دیار بوو، ساکاری و خۆڵک خۆشی بوو. هەڵسوکەوتی خێرا و ڕاست و پڕمتمانە بوو، بەڵام زۆر شڵەژاو و دڵەدوای دەنواند.

گرووشنکا گوتی: «ئاخ ئەمڕۆ هەمووشتەکان پێکەوە دێنە پێشێ.ئالیووشا، خۆشم نازانم بۆ ئەوەندە بە دینت خۆشحاڵم! ئەگەر لێم بپرسی، هیچ وەڵامێکم پێ‌نییە.»

ڕاکیتین، چزەبزەیەکی هاتێ و گوتی: «یانی نازانی بۆ خۆشحاڵی؟ ئەو هەموو پێداگرییەت بۆ هێنانی وەڕەزی کردبووم. پێموایە، قەستێکت هەبوو.»

«جارێکیان قەستێکی تایبەتم بوو، بەڵام نا، کاتی ئەوە نییە. خراپەی ئێوەم ناوێ، بەڵێ! ئێستا زۆر خۆڵک خۆش بووم. ڕاکیتکا تۆش دانیشە، بۆ بە پێوە ڕاوەستاوی؟ ها، دانیشتووی؟ نابێ ترس لە دڵتان بنیشێ کە ڕاکیتکا نەتوانێ ئاگای لە خۆی بێ. چاو لێبکە ئالیووشا، دیوتە بەرەوڕوومان دانیشتووە و لەوە دڵمەندە کە لەپێشدا خوڵکی تۆم کردووە دانیشی.» پاشان بەپێکەنینەوە گوتی: «ئامان لە دەست ڕاکیتکا ئەوەندە دڵ ناسکە. ڕاکیتکا تووڕە مەبە. ئەمڕۆ سەروڕوو خۆشم، ئالیووشچکا، تۆ بۆ ئاوا خەم دایگرتووی؟» لێم دەترسی؟» بە بزەیەکی شیرین و مانادارەوە چاوی لە چاوی بڕی. ڕاکیتین نەڕاندی: «ئەو بۆیە خەمبارە، پلە و پایەی وەدەست نەهێناوە.»

- کام پلە و پایە؟

- پیرەکەی بۆگەن تێی داوە.

«مەبەستت لە «بۆگەن» چییە؟ قسەی قۆڕ دەکەی دەتەوێ قسەیەکی ناحەز بکەی. بێدەنگ بە، گەوجە پیاو! ئالیووشا لێمگەڕێ با لە سەر ڕانت دانیشم. ئاوا.» لە ناکاو چووە پێشێ و بە پێکەنینەوە لە سەر ڕانی ئالیووشا دانیشت و وەک بەچکە پشیلە جێی خۆشکرد و باسکی ڕاستەی لە ئەستۆی وەرهێنا. «کوڕێژگە پارێزگارەکەم، ئێستا دەتگەشێنمەوە و شادتدەکەم. ئیزنم دەدەی لە سەر کۆشت دانیشم، تووڕە نابی؟ ئەگەر پێت خۆش نییە، لادەچم.»

ئالیووشا هیچی نەگوت لە ترسانا وشک بووبوو. گوێی لە قسەی ژنە بوو گوتی: «ئەگەر پێت خۆش نییە، لادەچم.» بەڵام وەڵامی نەدایەوە، سپی

هەڵگەڕابوو. بەڵام ئەو هەستەی دڵی ئالیووشای داگرتبوو و ئازای ئەندامی وشک کردبوو، شتێک نەبوو کە پیاوێکی وەک ڕاکیتین هەستییپێبکا.

لە ڕاستیدا ڕاکیتین لە سەر جێگای خۆیەوە بە قەڵافەتێکی زاڵمانە و هەوەسبازانەوە چاوی لێدەکردن. ئازارێکی گیان پڕووکێن دڵی ئالیووشای ڕێک دەگوشی و لەو کاتەدا وەک کۆلکە دارێک وشکبووبوو، هەستی بە هیچ نەدەکرد و دەترسا مەیلێکی نامۆ لە ناخیدا بڵێسە بستێنێ و هەڵیلووشێ. ئەگەر بیتوانیبایە لەو کاتەدا بە ڕوونی بیر بکاتەوە، تێدەگەیشت کە ئێستا بە هێزترین و گەورەترین قەڵغانی هەیە بۆ پارێزگاریکردن لە مەترسیی هەموو هەوەس و وەسوەسەکان. لە گەڵ ئەوەشدا چونکە خافڵ گیر کرابوو و خەمێکی گەورەش ناخی هەڵدەچۆقاند، بەوپەڕی سەرسووڕمانەوە هەستێکی تازە و غەریبی لە دڵ و ناخ هەڵدەقوڵی! ئەو ژنە «ترسناکە» نەک هەر نەیدەترساند، ئەو ترسەشی نەدەخستە دڵیەوە کە لە مێژ بوو سەبارەت بە ژنان لە دڵیدا کۆی کردبۆوە. بە پێچەوانە ئەم ژنە کە لە هەموو ژنان بەسامتر بوو، ئێستا لە سەر ڕانی دانیشتبوو و توند لە باوەشی گرتبوو، هەستێکی تەواو چاوەڕوان نەکراو و جیاواز و سەیری لە ناخیدا هەڵدەقوڵاند. هەستێکی بەهێز و بێگەرد و پڕ لە چێژ و خۆشی، بە بێ هیچ دیاردەیەک لە ترس و مەترسی کە پێشتر ئالیووشا بیری لێدەکردەوە. ئەوە بوو ئەو هەستەی کە بە شێوەیەکی غەریزی بووبووە هۆی سەرسام بوونی.

ڕاکیتین گوڕاندی: «لە ڕادەبەدەر هەڵەوەڕیت کرد، وا چاکە بڕێکمان شامپانی بۆ بێنی. ئەوەم پێ‌قەرزداری، خۆت دەزانی!»

- ئەرێ ڕاست دەکەی. دەزانی ئالیووشا، بەڵێنیم پێدابوو ئەگەر تۆ بێنێ بۆ ئێرە، لە پێش هەموو شتێکدا شامپاینی دەدەمێ؟ بڕێکیشم شامپانی هەیە! فینیا، فینیا، ئەو بترییەی میتیا بەجێی‌هێشت خیرا بیهێنە! لە بیرت نەچێ! ئەگەرچی زۆر ڕژد و مستقووچاوم، بەڵام چش لە بترییەک شامپانی. نەک بۆ تۆ، ڕاکیتکا، تۆ تەنیا چڵپەخۆرێکی و بەس، بەڵام ئەو شازادەیە! ئەگەر چی

دڵم لێوڕێژ له شتێکی تەواو جیاوازە، بەڵام له گەڵتان دەخۆمەوە. پێم خوشه تۆزێ عەیش و نۆش بکەم.

ڕاکیتین پرسیی: «ئاخرپێمبڵێ ئەو هەوڵیدەدا وا بنوێنێ، که ئاگای لەو تیرو توانجانه نییه که بەردەوام بۆی دەهاوێژن.

گرووشنکا بەدەنگێکی تامەزرۆیانەوە، لە پڕ سەری بۆ لای ڕاکیتین وەرسووڕاند و تۆزێ سینگی له سینگی ئالیووشا کردەوه و ـ بەڵام هەروا لە سەر کۆشی بوو و دەستی لە ملی کردبوو ـ گوتی: «ڕاز نییه، تۆش لەوە ئاگاداری. ئەفسەرەکەم خەریکه دێ، ڕاکیتین، ئەفسەرەکەم خەریکه دێ.»

ـ بستوومه دەیهەوێ بێت، یانی ئاوا زوو؟

ئێستا لە ماکرۆیەیه. ئەمڕۆ نامەیەکم بە دەست گەیشت. نووسیبووی لەوێوە ڕاسپاردەیەکم بۆ دەنێرێ. بۆیه سات لەدوای سات چاوەڕوانی ئەو هەواڵدەرەم.

ـ شتی وا نەڵێی! له ماکرۆیه بۆ؟

ـ باسەکەی دوور و درێژە و زۆرم بۆ گێڕاویەتەوە.

ـ جا ئەمجار چاو لە میتینکا بکه چ هەڵلا و هەنگەمەیەک وەڕێ دەخا ـ لە سەر چەندە؟ لەو جەرەیانه ئاگادارەیان نا؟

«ئەو ئاگای لەو جەرەیانه بێ! جا دیارە ئاگادار نییه. ئەگەر بزانێ، خوێن وەڕێدەخا. بەڵام ئێستا لەوە ناترسم، لە چەقۆکەی دەترسم. بێدەنگ بە، ڕاکیتکا، تکایه دیمیتری فیۆدۆرۆویچم وەبیر مەخەوە، داخی دنیای کردۆته دڵمەوە. لەم کاتەدا نامەوێ بیر لەوە بکەمەوە. دەتوانم بیر لەم ئالیووشچکایه بکەمەوە. دەتوانم چاوله ئالیووشچکا بکەم... خۆشەویستەکەم بۆم پێبکەنه، تۆزێ ئەم گرژی و مۆنییه وەلانێ. پێبکەنه، بە گەوجییەتیی من، بە دڵشادیم... ئاخ، خەریکه زەردە دەگرێ، خەریکه زەردە دەگرێ! چەندە دڵۆڤانه تێم دەڕوانێ! ئالیووشا، تا ئێستا پێموابوو لێم توورەی. له بەر پێرێ، لە بەر ئەو خاتوونه بەڕێزە. ئەو ڕۆژە ئەقڵم نەبوو، ئەرێ... بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چاک بوو وایلێهات.» گرووشنکا بە شێوەیەکی خەیاڵاوی و دڵڕفێن زەردەی گرت و

بزەکەی بۆنی دڵڕەقیی لێدەهات. «میتیا بۆی گێڕامەوە، نەڕاندوویە دەبێ قامچیی لێدەن. سووکایەتییەکی گەورەم پێکرد. ناردی بەدوامدا، دەی ویست بە سەرمدا زاڵبێ و بە چوکلێت دڵم وەدەستبێنێ... زۆرم پێخۆش بوو کارەکە گەیشتە ئەو جێگایە.»

گرووشنکا دیسان بە پێکەنینەوە گوتی: «بەڵام هێشتا دەترسم توورە بی.»

ڕاکیتین بە سەر سورمانێکی سادقانەوە هەڵیدایە: «بەڵێ، بەڕاستی ڕاست دەکا. ئالیووشا، ئەو لە جووجەڵەیەکی وەک تۆ دەترسێ.»

ـ ڕاکیتا بە بڕوای تۆ ئەو جووجەڵە نییە... چونکە ویژدانت نییە، بەڵێ ویژدانت نییە! بەڵام من بە دڵ و بە گیان خۆشم دەوێی، بەڵێ ئالیوشا، بڕوا دەکەی لە ناخی دڵمەوە خۆشم دەوێی؟

ـ ئامان لەدەست تۆ ژنی بێحەیا! ئالکسی دەیهەوێ لە دڵتدا جێی خۆی بکاتەوە!

ـ دەی، مەگین ئاسمان دەڕووخێ؟ ئەگەر خۆشمبوێ!

ـ ئەو ئەفسەرەت چدەکا؟ ئەو هەواڵە گرینگ و پڕ بایەخەی ماکرۆیە.

ـ لەگەڵ ئەوە جیاوازیی هەیە.

ـ شێوەی تێگەیشتنی ژنانە ڕەنگە وابێ!

گرووشنکا بە گوڕوتینەوە گوتی: «ڕاکیتکا، توورەم مەکە. لە گەڵ ئەو جیاوازە ئالیووشام بە شێوەیەکی دیکە خۆشدەوێ. ئالیووشا، ڕاستت دەوی پێشتر پیلانی زۆر مزیرانەم بۆ داڕشتبووی. چونکە بوونەوەرێکی ترسناک و ڕقئەستوورم. بەڵام ماوەیەکیشە تۆم وەکو ویژدانی خۆم لە بەر چاو گرتووە. بەر دەوام بە خۆمم گوتووە «چۆن دەبێ مرۆڤێکی وەک ئەو قێزی لە بوونەوەرێکی گەماری وەک من هەستێ.» پێرێ کە لە ماڵی ئەو خاتوونە دەگەڕامەوە، لە بەر خۆمەوە ئەوەم گوت ئالیووشا زۆر لە مێژە ئاوا سەبارەت بە تۆ بیرم نەکردۆتەوە، میتیاش لەوە ئاگادارە، لە لای ئەویش باسی تۆم کردووە. میتیا دەزانی، بڕوا دەکەی هێندێ جار کە تێتدەڕوانم هەست بە شەرمەزاری دەکەم، شەرم لە خۆشم دەکەم... جا چۆن و لە

کەنگێوە ئاوام سەبارەت بە تۆ بیر کردۆتەوە، ناتوانم پێتبڵێم و وەبیرم نایە...»

فینیا هاتە ژووریّ و کەشەفێکی بە بتڵێکی سەر هەڵپچڕاو و سێ پەرداخەوە لە سەر مێزەکە دانا.

ڕاکیتین هاواریکرد: «ئەوەش شامپانی! ئاگرافنا ئەلکساندرفنا، شلەژاوی و ئیتر خۆت نیی. پەرداخێک شامپانی هەڵدەی، ئامادە دەبی بۆ سەما کردن.»

پاشان چاوی لە بتڵەکە بڕی و درێژەی پێدا: «ئاخ، تەنانەت ناتوانن ئەو کارەش ئەنجامبدەن. ئەو پیرێژنە لە ئاشپەزخانە شامپانیی کردۆتە نێو پەرداخەوە، بترییەکەشی گەرم و بە بێ سەرە. بەو حاڵە شەوە، چاکتر وایە بڕێک بخۆمەوە.»

چوو بۆ لای مێزەکە، پەرداخێکی هەڵگرت، بە قومێک هەڵیدا و پەرداخێکی دیکەی بۆ خۆی تێکرد.

لێوی لستەوە و گوتی: «شامپانی زۆر گران وەگیر دەکەوێ. ئالیووشا، داتۆش پەرداخێک هەڵگرە و توانایی خۆت تاقیکەوە. بە سەلامەتیی چی هەڵیدەین؟ دەروازەکانی بەهەشت؟ گرووشنکا تۆش پەرداخێک هەڵگرە و بە سەڵامەتیی دەروازەکانی بەهەشت نۆشی کە.»

ـ کام دەوازەی بەهەشت؟

گرووشنکا پەرداخێکی هەڵگرت، ئالیووشاش پەرداخی خۆی هەڵگرت، لێوی پێوە ناو لە جێگای خۆی داینایەوە. بە دڵۆڤانی بزەیەکی هاتێ و گوتی: «نا، وا چاکە من نەخۆمەوە.»

ڕاکیتین گوڕاندی: «ئەی ئەو شاتوشووتەت لە چی بوو.»

گرووشنکا هەڵیدایە: «دەی ئەگەر وابێ منیش ناخۆمەوە. ڕاستتان دەوێ هەر ناخومەوە. ڕاکیتکا تۆ خۆت بترییەکە هەڵچۆڕێنە. ئەگەر ئالیووشا بخواتەوە، منیش دەخۆمەوە، دەنا دەمی لێنادەم.»

ڕاکیتین بە تەشەرەوە گوتی: «چەندیش دڵناسکە! لە سەر کۆشیشی دانیشتووە و قسەی واش دەکا. ئەو بۆ شتێکی دیکە خەم دایگرتووە، ئیتر تۆ

بۆ؟ ئەو خەریکە بەدژی خوداکەی ڕادەپەڕێ و ئامادەیە سۆسیسیش بخوا...»

- چۆن مەبەستت چییە؟

- پیرەکەی، باوەزووسیمای پیرۆز، ئەمڕۆ مرد.

گرووشنکا هاواریکرد: «چۆن باوە زووسیما مردووە. خودایە گیان، نەم زانیوە!» دیندارانە خاچی خۆی کێشا. «چاو منیش لە کاتێکی چۆندا لە سەر ڕانی دانیشتووم» خێرا لە سەر ڕانی خۆی خزاندە خوارێ و لە سەر قەنەفەکە دانیشت. ئالیووشا بە سەرسووڕمانەوە چاوی تێبڕی و ڕوخساری گەشایەوە. لە ناکاو، بە دەنگێکی پیاوانە و بەرز گوتی:

- ڕاکیتین، بە تەشەر و تانەوە مەڵێ لە خودا یاخی بووم. نامەوێ ڕقت لێهەڵگرم، تۆش وا چاکە زۆری قەراغ لێنەکێشی. من گەنجێکم لە دەست دەرچووە، کە بە عومراتی خۆت وێنەکەیت نەبووە و ناتوانی ئێستا حوکمم بە سەردا بکەی. وا چاکە چاو لەو خاتوونە بکەی - دیوتە چەندە بەڕەحم و دڵۆڤانە! کاتێک هاتم بۆ ئێرە پێموابوو لەگەڵ ڕۆحێکی شەیتانی بەرەوڕوو دەبم - من چاوەڕوانی بوونەوەرێکی سووکوچرووک بووم. بەڵام لەگەڵ خوشکێکی ڕاستەقینە، لە گەڵ ڕۆحێکی نەرم و دڵۆڤان ئاشنا بووم و گەنجێکم دیتەوە - دڵێکی پڕ لە خۆشەویستی. ئەو هەر ئێستا بەزەیی بە مندا هات و ڕەحمی پێکردم... ئاگرافنا ئەلکساندرفنا، باسی تۆ دەکەم، تۆ لە ناخەوە گیانت هەڵتەکاندم.

ئالیووشا لێوی دەلەرزی و کەوتبووە هەناسەبڕکێ.

ڕاکیتین، بە شێوەیەکی دزێو و مانادار پێکەنی: «لەوە دەچێ بیروارِت گۆڕابێ. ئاخردەیویست بە جارێ هەڵمەقووتت کا، بۆ نازانی؟»

گرووشنکا هەستا سەر پێ: «سەبرکە، ڕاکیتین. هەر دووکتان ڕاوەستن. ئێستا هەموو شتێکتان بۆ ڕوون دەکەمەوە. ئالیووشا دەست هەڵگرە، ئەو قسانەت تووشی شەرمەزاریم دەکا. چونکە من چاک نیم و زۆریش خراپم - بەڵێ من ئەوەم کە هەم. ڕاکیتین تۆش دان بە خۆدابگرە و واز بێنە، چونکە

درۆ دەکەی. دەمویست هەڵیلووشم و ئەو خەیاڵەم بوو، بەڵام ئێستا درۆ دەکەی، مەسەلە شتێکی دیکەیە. ڕاکیتکا ئیتر نامەوێ زمانت بگەڕێ.»

ڕاکیتین کە بە سەرسووڕمانەوە چاوی لێدەکردن، گوتی: «هەردووکیان شێت بوون. هەستدەکەم لە شێتخانەم. هەر دووکیان ئەوەندە دڵناسک بوونەوە لەوانەیە دەستبکەن بەگریان.»

گرووشنکا گوتی: «جادیارە دەستدەکەم بەگریان. ئەو منی بە خوشکی خۆی حەسێب کرد و منیش قەتم ئەوە لە بیر ناچێ. بەڵام ڕاوەستە با پێتبڵێم ڕاکیتکا هەر چەندە خراپیش بم چڵە پیوازێکم هەر کردووە بە خێر.»

- چڵە پیواز! بژیی بۆ مەزهەبت، بەڕاستی شێت بووی.

ڕاکیتین لەو کردەوە پاک و دڵە ناسکەیان سەری سووڕما بوو، زۆر دڵمەند و خەمبار بوو. ئەگەر چی وێدەچوو بیری لەو مەسەلەیە کردبێتەوە، کە هەر کام لەوان تووشی ئاڵۆزییەکی دەروونی هاتوون و هەموو ڕووداوەکان دەستیان داوەتە دەست یەک و ئەوەش بە دەگمەن لە ژیانی مرۆڤدا وەبەر چاو دەکەوێ. بەڵام ڕاکیتین ئەگەر چی بۆ کاری خۆی زۆر بەمشوور بوو، بەڵام سەبارەت بە دڵ و هەستی خەڵکی زۆر کەمتەرخەم و سەرسارد بوو - ئەویش بە هۆی لاوی و هەرزەیی و تا ڕادەیەکیش بە هۆی فیز و هەوا و خۆپەرەستییەوە بوو.

گرووشنکا بە تووڕەیی پێکەنی و ڕوویکردە ئالیووشا: «چاو لێکە، ئالیووشچکا، کاتێک بە ڕاکتییم گوت چڵە پیوازێکم کردووە بە خێر، شاتوشووت بوو. بەڵام گێڕانەوەی بەسەرهاتەکە بۆ تۆ شاتوشووت نییە. تەنیا نەقڵێکە و بەس، بەڵام نەقڵێکی خۆش. کاتێ منداڵ بووم، ماتریۆنای ئاشپەز کە ئێستاش لە لای منە، بۆی گێڕامەوە. شتێکی وەک ئەوە. "هەبوو، نەبوو، ژنێکی لادێیی بوو، زۆر خراپکار و نارەسەن بوو. کاتێک مرد ڕێزەیەکی چاکە کاری لە پاش خۆی بەجێ نەهێشت. شەیتان گرتیان و هاویشتیانە نێو دەریای ئاورەوە. هەر بۆیە فریشتەی پارێزەری بیری کردەوە و لە خۆی پرسی، کام کردەوەی چاکیم وەبیر دێتەوە و بە خودای

بڵێم. گوتی: «جارێکیان چڵە پیوازێکی لە باخچەکە هەڵکەند و دای بە ژنێکی هەژار.» خودا وەڵامی دایەوە: «کەوایە ئەو چڵە پیوازە هەڵگرە و بۆی ڕادێرە با دەستی پێوە بگرێ و بیکێشە دەرێ. ئەگەر بتوانی لەو دەریایە دەریکێشی، لێیگەڕێ بابچێتە بەهەشت، بەڵام ئەگەر گەڵا پیوازەکە بپچڕێ، ئەو ژنە ناچار دەبێ هەر لەوێ بمێنێتەوە.» فریشتە هەڵات بۆ لای ژنە و پیوازەکەی بۆلای ڕاداشت و گوتی: «ها بیگرە با دەرتکێشمە دەرێ.» پاشان زۆر لەسەرەخۆ دەستیکرد بە دەرهێنانەوەی. زۆری نەمابوو بیهێنێتە دەرێ، تاوانبارانی دیکەی نێو زەریاکە بە دیتنی ئەو چنگیان لە داوێنی گیر کرد تاکو ئەوانیش خۆیان ڕزگار بکەن. بەڵام ئەو ژنێکی خراپ و بەرچاوتەنگ بوو، دڵڕەشانە دەستیکرد بە لەقە هاویشتن: «من دەبێ دەرکێشرێمە دەرێ، نەک ئێوە. پیوازەکە هی منە، خۆ هی ئێوە نییە.» هەر کە ئەوەی گوت. پیوازەکە پچڕا و ژنە کەوتەوە نێو زەریاکە و هەتا ئەمڕۆ هەر لەوێدا دەسووتێ. هەر بۆیە فریشتەکە دەستیکرد بە گریان و سەری خۆی هەڵگرت و ڕۆیی." ئالیوشا ئەوەش حەقایەتەکەم بوو. ئەوەم بە تەواوی لەبەرە، چونکە ئەو ژنە خراپکار و نارەسەنە خۆمم. لای ڕاکیتکا خۆم هەڵکێشا کە چڵەپیوازێکم کردووە بە خێر، بەڵام بە تۆ دەڵێم: «لە تەواوی ماوەی ژیانمدا هیچ کارێکی چاکم نەکردووە، جگە لە کردنە خێری چڵەپیوازێک.» بۆیە پێتدەڵێم ئالیووشا تاریفم مەکە و بە چاکم مەزانە، من خراپم، ژنێکی خراپ و بەدزاتم، لە شەیتان خراپترم. ئەگەر تاریفم بکەی تووشی شەرمەزاریم دەکەی. دەبێ دان بە هەموو شتێکدا بنێم. گوێبگرە ئالیووشا. ئەوەندە تامەزرۆ بووم لە باوەشت گرم و هەڵتمژم، بەڵێنم بە ڕاکیتین دا ئەگەر بتهێنێ بۆ لام، بیست و پێنج ڕۆبڵی دەدەمێ. هیچ مەڵێ ڕاکیتکا، سەبر کە!» گرووشنکا بە پەلە ڕۆیی بۆ لای مێزەکە، چەکمەجەی مێزەکەی کێشایەوە و جزدانێکی دەرهێنا و گەڵایەکی بیست و پێنج ڕۆبڵیی لێدەرهێنا.

ـ ڕاکیتین پیشی کردبوو، بەڵام بە مڕومۆچی نەڕاندی: «قسەی قۆڕ، هەمووی وڕێنەیە!»

«هانێ، ڕاکیتکا، پێت قەرزدار بووم، شەرم مەکە و وەری گرە. خۆت داوات کرد.» پارەکەی بۆ فڕێدا.

ڕاکیتین، کە ڕواڵەتەن شەرمی دەکرد، بەڵام پەرۆشیی خۆی بە تاریف و خۆهەڵکێشان تەرە کرد، لە پڕدا گوڕاندی: «پێت وایە وەری ناگرم. وەک ئاو خواردنەوە وەگیرم کەوتووە. هەتا بێ ئەقڵێک نەبێ، ئاقڵێک نانی دەست ناکەوێ.»

ـ چاک دەمت گرتووە ڕاکیتکا. ئەوەی دەمهەوێ بیڵێم، گوێچکەی تۆ ئازار دەدا. لەو سووچە دانیشە و زمانت نەگەڕێ. ئەگەر چاوت بەرایی نادا بمان بینی و ناخوشت دەوێین، یان بڕۆ ملت بشکێنە، یان دەمت لێکنێ.

ڕاکیتین بە ڕق هەستاوی نەڕاندی: «چۆن دەتوانم ئێوەم خۆش بوێ؟» گەڵا بیست وپێنج ڕۆبڵییەکەی نایە گیرفانی و لە بەر چاوی ئالیووشا بە خۆداشکایەوە. لە دڵی خۆیدا لێکی دابۆوە کە دواتر هەقی خۆی وەردەگرێ و ناهێڵێ ئالیووشا ئاگادار بێ. بەڵام ئێستا هەستی بە شەرمەزاری کرد و هێندەی ڕق هەستا بوو، لەقەی لە ئاسمان دەدا. هەتا ئەو کاتە پێیوابوو دەبێ لەبەر دەستی گرووشنکادا وەک مێو وا بێ، بە هیچ شێوەیەک شەڕەدەندووکەی لەگەڵ نەکا. بەڵام ئێستا، چەقۆت لێدایە خوێنی نەدەهات:

ـ پیاو لە بەر شتێک دەتوانێ خەڵکی خۆشبوێ، بەڵام ئێوە چیتان بۆ کردووم؟

ـ وا چاکە لە بەر هیچ هۆیەک خەڵکت خۆشبوێ، ڕاست وەک ئالیووشا.

ـ چۆنی خۆشدەوێی؟ چۆنی خۆشەویستی خۆی دەربڕیوە کە ئاوا دەهۆڵی بۆ دەکوتی؟

گرووشنکا لە چەقی وەتاغەکەدا ڕاوەستا بوو، بەتین‌وتاو قسەی دەکرد و دەنگی دەلەرزی:

ـ وست بە ڕاکیتکا، سەبارەت بە ئێمە هیچ نازانی! ئیتر ئاواش قسەم لەگەڵ مەکە. چۆن دەتوانی خۆت ئاوا خۆمانە بنوێنی؟ لەو سووچە دانیشە و دەمدرێژی مەکە، وەک بەرەڵلایەکی هیچوپووچ! جا ئێستا ئالیووشا تەواوی هەقیقەتەکەت پێدەڵێم، بابزانی چەندە شەیتانم! لە گەڵ ڕاکیتکام نییە، قسە لەگەڵ تۆ دەکەم. ئالیووشا دەمویست لەڕێ هەتڵەت کەم. ڕاستییەکەی ئەوەیە. قەستی ئەوەم بوو. ئەوەندەش تامەزرۆی ئەو کارە بووم کە بۆ هێنات بەڵێنی بەرتیلم بە ڕاکیتکا دا. جا مەبەستم لەو کارە چی بوو؟ تۆ نازانی ئالیوشا لە داخی ئەوە بوو ڕووت لیێوەردەگێڕام، بە تەنیشتمدا تێدەپەڕییت و سەرت هەڵنەدەهێنا. بەر لە ئەمڕۆ سەد جارم چاو لیێکردووی، سەبارەت بە تۆ پرسیارم لە هەموو کەس کرد. ڕۆخسارت دڵی ڕفاندبووم. لە دڵی خۆمدا دەمگوت: «ڕقی لێمە، بۆیە چاویشم لێناکا.» ئەو هەستەش وای لە ناخمدا ڕیشە داکوتا کە سەرم سوڕما لەوەی کوڕێک ئاوا تووشی دڵە خورپەی کردووم. لە دڵی خومدا گوتم لەداوی دەخەم و پاشان پێی پێدەکەنم. بوغز و ڕق ناخی داگرتبووم. بڕوا دەکەی لێرە هیچکەس ناوێرێ خو لە قەرەی ئاگرافنا ئەلکساندرفنا بدا و سەر بە ماڵێدا بکا، بەقەستی شەیتانی و تۆڵازی، یان هەر بیریشی لێبکاتەوە. لێرە تەنیا کەسێک کە هاموشۆی دەکەم کۆزمای پیرە، دەست و پێیان بەستم و بەویان فرۆشتم. شەیتان ئێمەی بە یەک گەیاند. بەڵام دەستی هیچکەسی دیکەی تێدا نەبووە. بەڵام کاتێ چاوم بە تۆ کەوت، گوتم هەرچۆنێک بێ دەبێ بیخەمە داوەوە و پاشان گاڵتەی پێبکەم. دیتووتە چ بوونەوەرێکم، تۆش بە خوشکی خۆتم دەزانی! ئێستا ئەو پیاوەی کە ئەو هەموو خراپەیەی لەگەڵ کردم هاتووە و ئێستا چاوەڕێی ڕاسپاردەکەیم. دەزانی ئەو پیاوە بۆ من چ بووە؟ پێنج ساڵ لەمەوبەر کە کۆزما هێنامی بۆ ئێرە، دەرگام لە سەر خۆم گاڵە دا و نەهاتمە دەرێ، بۆ ئەوەی هیچکەس نەمبینێ و دەنگم نەبیستێ. کچێکی گەوج بووم، لێرە دادەنیشتم و هۆن هۆن دەگریام. شەو تابەیان نەدەخەوتم و لە دڵی خۆمدا دەمگوت «ئێستا بڵێی لە کوێ بێ، ئەو کابرایەی ئاوا خراپەی لەگەڵ کردم؟ لەوانەیە ئێستا لەگەڵ ژنێکی دیکە دەستی تێکەڵکردبێ و بە من پێبکەنن. چ

دەبوو بمدیتبایە، چ دەبوو لەگەڵی بەرەو ڕوو بوایەم؟ جادەمزانی چۆن هەقی خۆی بۆ بخەمە بەری دەستییەوە!» شەوانە ڕادەکشام و زوورە زووڕ دەگریام، بیرم دەکردەوە و خۆم هەڵدەگوشی و دڵی خۆمم دەخستە گوشارەوە و چێژم لەو ڕق و بۆغزەی خۆم وەردەگرت. «تۆڵەی لێدەکەمەوە!» ئەوەی شەوانە بە هاوارەوە دەرم دەبڕێ ئەمە بوو. بەڵام کاتێک بیرم لێدەکردەوە دەستم پێی ڕاناگا و هەر لەو کاتەدا خەریکە پێمپێدەکەنێ، یان ڕەنگە هەر لە بیری بردبێتمەوە، لە سەر قەرەوێڵەکەم دەهاتمە خوارێ و فرمێسکم هەڵدەوراند و هەتا کەڕەی بەیانی لە سەر زەوی ڕادەکشام و جینگڵم دەدا و دەلەرزیم. کە ڕۆژ دەبۆوە، وەک سەگی دڕ دەردەپەڕیم و دەمویست تەواوی دنیا لەتوپەت کەم و هەڵیدڕم. پێتوایە پاشان چمکرد؟ دەستمکرد بە کۆکردنەوەی پارە، دڵڕەق بووم، کەوڵم قایم بوو ـ ڕەنگە پێتوابێ ئاقڵتر بووم؟ نا، یاخودا کەس بەحاڵی من نەبێ و بە دەردی من نەچێ. کاتێ شەو بە سەردا دێ وەکو پێنج ساڵ لەمەوبەر، کە کچێکی گەوج و حەپۆل بووم، ڕادەکشێم و ددانەچیرە دەکەم، هەتا بەیانی فرمێسک هەڵدەوەرێنم و لە دڵی خۆمدا دەڵێم: «تۆڵەی لێدەکەمەوە!» گوێت لێیە؟ ئێستا تێگەیشتی چ مرۆڤێکم؟ مانگێ لەمەوبەر نامەیەکم پێگەیشت ـ ئەو دەهات، بووبووە بێوە پیاو و دەیویست چاوی پێم بکەوێ. لەوانە بوو هەناسەم ڕاوەستێ. پاشان لە ناکاو لە دڵی خۆمدا گوتم: «ئەگەر بێت و بانگمبکات، وەک سەگێکی بریندار و کوتان خواردوو، دیسان بە نووزە نووز بۆ لای دەخوشێم و دەستدەکەم بە کلکەسووتێ» بڕوام بە خۆم نەدەکرد. یانی ئەوەندە خوێڕی و سووک و چرووکم؟ بڵێی بۆلای بخوشێم یان نا؟ لەم مانگەدا هێندەم ڕق لە خۆم هەستاوە، لە پێنج ساڵ لەمەوبەر خراپترم و ئۆقرەم لێبڕاوە. ئالیووشا، ئێستا بۆت دەرکەوت چ بوونەوەرێکی قین ئەستوور و ڕق لەزگم؟ ئەوەی هەقیقەت بوو بۆم باس کردی! میتیام فریو دا و بە زمان گرتم تاکو ببێتە لەمپەری ڕێگام و نەهێڵێ ڕاکەم بۆلای ئەوی تر. «وست بە ڕاکیتکا، لە تۆ ناوشێتەوە سەبارەت بە من حوکم دەرکەی، ڕووی قسەم لە تۆ نییە. بەر لەوەی بێی بۆ ئێرە، بە

چاوەڕوانی ڕاکشابووم، بیرم دەکردەوە و سەبارەت بەژیانی داهاتووم بڕیارم دەدا. قەت نازانی لە دڵمدا چ ڕەشەبایەک هەڵیکرد و خەیاڵی چیم لە سەر دابوو. بەڵێ ئالیووشا بەو خاتوونە بەڕێزە بڵێ لە بەر ڕووداوی ئەو ڕۆژە ڕقی هەڵنەستێ... لە تەواوی دنیادا هیچکەس نییە بەقەد من ئازار بکێشێ، هیچ کاتێکیش ناتوانێ لەوە بگا... چونکە ئەمڕۆ وێدەچێ چەقۆیەک هەڵگرم. ناتوانم بڕیاربدەم...»

بە درکاندنی ئەم قسەیە گرووشنکا خەمبارانە قسەکەی خۆی بڕی. دەستی بە بەر چاوییەوە گرت و خۆی دا بە سەر دۆشەک و باڵنجی سەر چرپاکەدا و وەک منداڵێک دای لە پڕمەی گریان. ئالیووشا هەستا و چوو بۆ لای ڕاکیتین.

گوتی میشیا، تووڕە مەبە، ئەو تیروتانەی لێدای، بەڵام قەڵس مەبە. نەتبیست هەر ئێستا گوتی چی؟ نابێ ئەوەندەت چاوەڕوانی لە ڕۆحی مرۆڤ بێ. دەبێ دڵنەرم و دڵۆڤان بی.»

ئالیووشا ئەو قسەیەی لە ناخی دڵییەوە دەربڕی بە ئەرکی خۆی زانی قسە بکا و ڕووی لە ڕاکیتین کرد. ئەگەر ڕاکیتین لەوێ نەبوایە، ئەو قسانەی هەر دەکرد. بەڵام ڕاکیتین بە تەشەرەوە چاوی لێکرد و ئالیووشا بێدەنگ بوو.

ڕاکیتین بە بزەیەکی قێزەونەوە گوتی: «ئالیووشا، پیاوی خودا، ئامۆژگارییەکانی دوێشەوی حەزرەتی پیر زۆری لێوڕێژ کردووی و ئێستا دەتهەوێ هەموو بە سەر مندا خاڵی کەی!»

ئالیووشا بە دڵپڕییەوە دەنگی هەڵێنا: «ڕاکیتین پێمەکەنە، زەردە مەگرە، باسی ئەو خوالێخۆشبووە مەکە ـ ئەو لە تەواوی خەڵکی دنیا چاکتر بوو! من وەک حاکمێک قسەم لەگەڵ نەکردی، بەڵکو وەک خوێڕیترین و تاوانبارترین مرۆڤ قسەمکرد. من لە هەمبەر ئەو خاتوونەدا چیم؟ بۆ دۆزینەوەی گەندەڵیم هاتم بۆ ئێرە و لە بەر ترسەنۆکی لە دڵی خومدا گوتم: «فەرقی چییە؟» بەڵام ئەو لەدوای چوار ساڵ ڕەنج و ئازار، هەر کەسێک لە دڵەوە قسەی لە گەڵ بکا ـ هەموو شتێکی لە بیر دەچێتەوە و بە فرمێسک غەوری دڵی دەشواتەوە! پیاوێک کە ئەو هەموو خراپەی لەگەڵ کردبوو، گەڕاوەتەوە، دەنێرێ بەدوایدا و

ئەویش لە هەموو تاوانەکانی خۆش دەبێ و بەتامەزرۆیی هەڵدێ بۆ لای و چەقۆش لەگەڵ خۆی نابا. دەزانم چەقۆ هەڵناگرێ! نا، من وانیم میشیا، نازانم تۆش وای یان نا، بەڵام من وا نیم. بۆ من بۆتە پەند... ئەو زۆر لە ئێمە دلۆڤانترە... لەوەی ئێستا باسیکرد ئاگادار بووی؟ نا، چونکە ئەگەر ئاگادار بوایەی زۆر لە مێژ بوو لە ڕازی دڵی گەیشتبووی... ئەو کەسەی کە پێریش سووکایەتیی پێکرا دەبێ لێی ببووری! ئەگەر ئاگاداریش بێ حەتمەن ئەو کارە دەکا.. ئاگاداریش دەبێ.. ئەو ڕۆحە هێشتا هاودەمی هێمنایەتییە، دەبێ زۆر بە نەرمی هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکرێ... ڕەنگە ئەو ڕوحە گەنجێکی مەزنی تێدابێ...»

ئالیووشا بێدەنگبوو، چونکە کەوتبووە هەناسەبڕکێ. ڕاکیتین لەگەڵ ڕووتاڵییەکەشی، چاوێکی واقوڕماوانەی لێکرد. چاوەڕوانی ئەو ئاخاوتنە دەم پاڕاوانەیە لە ئالیووشا نەبوو.

لەگەڵ بزەیەکی ساردوسڕ گوتی: «دادە خانم پارێزەرێکی پەیدا کردووە! ئالیووشا ناکا ئاشقی بووبێتی؟ ئاگرافنا ئەلکساندرفنا، ڕاهیبەکەمان، پێموایە بەڕاستی ئاشقت بووە. ئاخری سەرکەوتنت وەدەستهێنا!»

گرووشنکا سەری لە سەر باڵنجەکەی هەڵێنا و بە بزەیەکی گەرم و شیرینەوە کە ڕوخساری هێندەی تر گەشاندەوە، ئەو ڕوخسارەی کە گریان تا ڕادەیەک هەڵیزڵەپاندبوو، لە ئالیووشای ڕوانی.

«ئالیووشا، فریشتەکەم، گوێی مەدەیە. دیوتە چ مرۆڤێکە، کوا شیاوی ئەوەیە تۆ قسەی لە گەڵ بکەی.» پاشان ڕووی لە ڕاکیتین کرد و درێژەی بەقسەکانی دا: «میخائیل ئاسپۆویچ، دەمویست لە بەر ئەو هەڵچوونەم داوای لێبوردنت لێبکەم؛ بەڵام ئیتر ئەو کارە ناکەم.» بەبزەیەکی ئاوێتەی شادییەوە داوای لە ئالیووشا کرد کە: «ئالیووشا، وەرە بۆلای من، لێرە دانیشە. ئەوەتا ئالێرە دانیشە. پێمبڵێ» دەستی ئالیووشای گرت و بە بزەیەکی شیرینەوە چاوی لە چاوی بڕی «پێمبڵێ ئەو پیاوەم خۆشدەوێ یان نا؟ بەر لەوەی بێی، لێرە لەبەر تاریکی ڕاکشابووم و لە دڵی خۆمم دەپرسی خۆشمدەوێ یان نا. ئالیووشا،

بڕیارم بۆ بدە، کاتی هاتووە، هەر چی تۆ بیڵێی ئەوە دەکەم. دەبێ لێی خۆش بم یان نا؟»

ئالیووشا، بە بزەیەکەوە گوتی: «بەڵام تۆ لێی خۆشبووی.»

گرووشنکا، خەیاڵاوی منجاندی: «بەڵێ، بە ڕاستی لێی خۆشبووم. چ دڵێکی زەبوونم هەیە! بە سەلامەتیی دڵە زەبوونەکەم!» ئەوەی گوتو پەرداخێکی پڕ لە شامپانی لە سەر مێزەکە هەڵگرت و یەکبین نای بە سەریەوە، پاشان شەق بە عەرزیدا دا و ورد و خاشی کرد. تەمێکی زاڵمانە ئاوێتەی زەردەخەنەکەی بوو.

بە لەبزێکی پڕ هەڕەشەوە گوتی: «ڕەنگە لێشی خۆش نەبووبێتم.» وەک ئەوەی قسە لەگەڵ خۆی بکا، سەری داخست. «ڕەنگە دڵم بەرە بەرە ئامادەی لێخۆشبوون بێ، لەگەڵ دڵم دەکەومە کێشە. چاو لێکە ئالیووشا، لەم پێنج ساڵەدا خووم بە فرمسێک گرتووە... ڕەنگە تەنیا ڕقی خۆمم خۆش بوێ، نەک ئەو...» ڕاکیتین هەڵیدایە: «من پێم شوورەییە هاوشانی ئەو بم.»

ـ دەی مەبە، ڕاکیتکا. تۆ قەت نابیتە هاوشانی ئەو. تۆ هەر بۆ ئەوە دەبی کەوشم بۆ بسڕی ڕاکیتکا، تەنیا شیاوی ئەوەی. هیچ کاتێک ژنێکی وەک منت بە نسیب نابێ. ڕەنگە بە نسیب ئەویش نەبێ...

ڕاکیتین بە بزەیەکی ویشک و ژەهراوییەوە گوتی: «بە نسیبی نابێ؟ ئەی کەوایە بۆ ئاوا خوت لە تەپلی گوڵێ داوە؟»

«لەبەر جلوبەرگ تانەم لێمەدە، ڕاکیتکا، تۆ ئاگات لە ڕازی دڵم نییە!» بە دەنگێکی گڕ و تووڕە گوتی: «ئەگەر ئیشتیام لێبێ هەر ئێستا ئەو جلوبەرگە زریقە و بریقەدارانە شڕ و پەتۆر دەکەم. ڕاکیتکا خۆ تۆ نازانی ئەو جلوبەرگانەم بۆ لە بەر کردووە؟ ڕەنگە بۆ ئەوە بێ کاتێک دەیبینم پێیبڵێم: «پێشتر قەتت من بەو جلوبەرگەوە دیتووە؟» ئەو کچێکی گرینۆک و وردیلە و ڕیوەڵەی حەڤدە ساڵانەی بەجێهێشت. لە پاڵیدا دادەنیشم، شەیدای دەکەم و ئاوری هەوەس لە دڵیدا هەڵدەگیرسێنم و پێیدەڵێم: «دیوتە ئێستا چۆنم؟ زۆر چاکە ئاغای بەڕێز تا ئێرە بەستە و لەمە بەولاوە چاوەڕوان دانیشتە و بسووتێ. دنیا دەوران دەورانە!» گرووشنکا بە پێکەنینێکی جادووبازانەوە ئاوا

کۆتایی بە قسەکانی هێنا: «ڕاکیتکا ڕەنگە ئەو جلوبەرگە جوان و ڕازاوەیەم بۆ ئەوە بێ. ئالیووشا من مرۆڤێکی ڕق ئەستوور و دڵڕەقم، ئەو جلو بەرگە زریقە و بریقەدارەم شڕ دەکەم، جوانیی خۆم لە نێو دەبەم. دەموچاوی خۆم دەسووتێم، برینداری دەکەم، بە چەقۆ تواتوای دەکەم، وەک سواڵکەر دەگەڕێم و دەست بۆ ئەم و ئەو پان دەکەمەوە. ئەگەر پێم خۆش بێ لەم ژوورە ناچمە دەرێ و سبەینێ تەواوی ئەو دیارییانەی کۆزما پێیداوم بۆی دەنێرمەوە و پاشماوەی ژیانم کلفەتی دەکەم و خۆم بەڕێوە دەبەم. ڕاکیتکا پێتوایە ئەو کارەم لە دەست نایە؟ دەیکەم و زۆر چاکیش دەتوانم. بەڵام کارێک مەکە ڕقم هەستێ و دۆ و دۆشاو تێکەڵ کەم... ئەگەر بێت لەو ماڵەی وەدەر دەنێم و ئاوقای چڕوچاوی دەبم و دەیڕنم، کارێک دەکەم ڕوو لەم لایە نەکاتەوە!

ئەم قسانەی دوایی زۆر بە تووڕەیی و گوڕەگوڕ دەربڕی و بێدەنگ بوو، دەستی بە بەر چاوییەوە گرت و دەمەوڕوو سەری لە باڵنجەکە هەڵچەقاند، دای لە پڕمەی گریان و شان و ملی کەوتە لەرزین. ڕاکیتین هەستا سەر پێ و گوتی:

ـ وەختی ڕۆیشتنە، درەنگە، ڕێمان نادەن لە کلێسە بچینە ژووری.

گرووشنکا لە جێی خۆی ڕاپەڕی و بە لەبزێکی خەماوی و سەرسوڕماوانە گوڕاندی:

ـ ئالیووشا، دڵنیام تۆ ناتەوێ بڕۆی! دەزانی چۆنت شڵەژاندووم و دڵت شکاندووم؟ دەتهەوێ بەو حاڵەوە بەجێمبێڵی و ئەمشەو بە تەنیایی سەر بنێمەوە؟

ڕاکیتین بە چرەبزەیەکەوە گوتی: «ناتوانێ شەوێ لە لای تۆ بمێنێتەوە! ئەگەر پێشی خۆش بێ کەیفی خۆیەتی! خۆم بە تەنیا دەڕۆم.»

گرووشنکا بە تووڕەیی گوڕاندی بە سەریدا: «تۆ دەمت لێک نێ، زڕتەبۆز! تۆ قەت نەتوێراوە ئاوا لە لای من دەمدرێژی بکەی.»

ڕاکیتین بە تووڕەیی پرسیی: پێمبڵێ بزانم ئەو چ شەکرێکی شکاندووە؟»

ـ ناتوانم بیڵێم، نازانم. نازانم چیی گوتئاوا بە دڵمەوە نیشت. بە جارێ تووشی شڵەژانی دەروونیی کردم... یەکەم کەس و تەنیا کەسێکە تا ئێستا بەزییی پێمدا هاتووە.» پاشان زۆر خاکەڕایانە و وەک کەسێکی جەزم بوو لە هەمبەر ئالیووشادا چۆکی دادا و گوتی: «فریشتەکەم، بۆ پێشتر نەدەهاتی؟ لە تەواوی ماوەی ژیانمدا چاوەڕوانی کەسێکی وەک تۆ بووم. دەمزانی کەسێکی وەک تۆ دێت و لێم دەبووری. لێم ڕوون بوو ڕۆژێک بە هۆی نارەسەنی و هیچوپووچیمەوە، نەک بە هۆی جوانیمەوە سەرنجی کەسێک ڕادەکێشم بۆ لای خۆم.»

ئالیووشا دانەوییەوە بە سەریدا و بە بزەیەکی پڕ لە خۆشەویستییەوە بە نەرمی دەستی گرت و وەڵامی دایەوە: «من چیم بۆ کردووی؟ تەنیا چڵە پیوازێکم پێداوی، جگە لە پیوازێک چیم پێداوی؟ هەر ئەوەندە و بەس!

لەگەڵ ئەو قسانە خۆشی دەستیکرد بە گریان. هەر لەو کاتەدا گوڕە و هەرایەکی کتوپڕ لە داڵانەکەوە هەستا و کەسێک خۆی بە ژووریدا کرد. گرووشنکا زۆر ترسا، هەستا سەر پێ. فینیا بە قیژە قیژ خۆی کرد بە ژووری میوانداریدا و شاد و پشووسوار هاواری کرد:

ـ خاتوون، خاتوونی بەڕێز، ڕاسپاردەیەک بە چوارناڵ گەیشتێ. کەژاوەیەکی لە ماکرۆیەوە بۆ ئێوە هێناوە، تیمووتیی عارەبانەچی بە سێ چارەوێوە. خەریکن ئەسپەکان لەگەڵ ئەسپی تازە نەفەس دەگۆڕن و لە عارەبانەکەی دەکەن... نامە، ئەوەش نامە، خاتوون.

نامەیەکی بە دەستەوە بوو لە تەواوی ماوەی قسە کردنیدا، ڕایدەوەشاند. گرووشنکا نامەکەی لە دەستی ساند و ڕۆیی بۆ لای مۆمەکە. پسولەیەکی چکۆڵە بوو و دوو سێ دێڕی لێنووسرابوو. خێرا خوێندییەوە.

سپی هەڵگەڕابوو، بە ڕەنگی پەڕیو و بزەیەکی ساردەوە هاواریکرد: «ناردوویە بە دوامدا. گوتوویە بزەڵە وردیلەکەم بگەڕێوە!»

بەڵام لە پڕدا بە دڕدۆنگی لە جێی خۆی ڕاوەستا. لە ناکاو گوشاری خوێن گەیشتە ڕوومەتی و سوور هەڵگەڕا.

هاواریکرد: «دەڕۆمەوە. خودا حافیز پێنج ساڵ تەمەنی بە فیڕۆ چووم! خودا حافیز! خودا حافیز ئالیووشا، چارەنووسم مەعلوومە و دەبێ بڕۆم. بڕۆن، بڕۆن، هەمووتان بڕۆن بەجێمبێڵن، ئیتر نامەوێ چاوم بە هیچ کامتان بکەوێ! گرووشنکا بەرە و ژیانێکی تازە باڵ دەگرێ... ڕاکیتکا، تۆش بە خراپە یادم مەکە. ڕەنگە بەرەوپیری مەرگ بچم! پەککو هەر دەڵێی مەستم!»

لە ناکاو هەموویانی بەجیهێشت و ڕۆیی بۆ وەتاغی خەوەکەی. ڕاکیتین بۆڵاندی: «وایە هیدی، ئیتر هەر بە پیاویشمان نازانێ و مێشکیشی میوان نییە! با بڕۆین. دەنا دیسان لەوانەیە گوێمان لە قیژوهۆڕی ژنانەی بێ. ئەو هەموو گریان و نووکە نوکەی جاڕزی کردم.»

ئالیووشا ئیختیاری ڕۆیشتنی دایە دەست ڕاکیتین. لە حەوشە عارەبانەیەکی سەر داپۆشراو ڕاگیرابوو. خەریک بوون خامووتیان لە ملی ئەسپەکان دادەماڵی. چەند کەس بە لەنتەرەوە بەملاو بەولادا هەڵدەسووڕان. لە دەروازەی حەوشەوە سێ ئەسپیان هێنا ژووری. بەڵام کاتێک ئالیووشا و ڕاکیتین گەیشتنە بەر پلیکانەکان، پەنجەرەی ژووری خەوەکەی گرووشنکا لە ناکاو کرایەوە و هەرای لە ئالیووشا کرد:

ـ ئالیووشچکا، سڵاوی میتینکای برات بگەیەنە و پێیبڵێ بە خراپەم یاد نەکا، ئەگەرچی تووشی ڕۆژەڕەشیم کردووە. لە زمانی منەوە پێیبڵێ: «گرووشنکا بە مرۆڤێکی هیچوپووچ براوە، نەک بە تۆی دڵپاک و نەجیم.» ئەوەشی پێیبڵێ کە گرووشنکا ئەوی تەنیا سەعاتێک خۆشویستووە. تەنیا سەعاتێک. بڵێ دەیگوت هەتا ئاخری عومری ئەو سەعاتە لە بیر نەباتەوە. هەر لە بیری بێ باشە!

قسەکانی بە قوڵپی گریانەوە کۆتایی پێهێنا و پەنجێرەکەی شەق پێوەدا.

ڕاکیتین بەپێکەنینەوە گوتی: «هەهەهە! میتیای براتی چارەڕەش کردووە و قوڕی کردووە بە سەریدا، پێشی دەڵێ تا ئاخری عومری لە بیری نەباتەوە! لەو دڵڕەقی و دڕندەییە!»

ئالیووشا وەڵامی نەدایەوە، هەر دەتگوت گوێشی لێنەبووە. بە پەلە و شان بە شانی ڕاکیتین هەنگاوی دەنا. بیر و خەیاڵ دایگرتبوو و بێئیختیار شەقاوی

هەڵدێناوە. ڕاکیتین برووسکەیەک بە دڵیدا هات و قرژ بوو، وەک ئەوەی خوێ لە برینی بپڕژێنن. بە مەبەستێکی دیکە ئالیووشای بردبوو بۆ ماڵی گرووشنکا، بەڵام چاوەڕوانییەکەی نەهاتبووە دی. بە دانبەخۆدا گرتن و ڕقەوە دیسان گوتی: «ئەو ئەفسەرە لەهێستانییە. لە ڕاستیدا ئەفسەر نییە. لە گومرکی سیبریا کاریدەکرد، لە سنووری چین ـ پێموایە لەهێستانییەکی وردیلە و زەردەڵەیە و نانی شەوێی نییە. لەبەر ئاتاجی و نەبوونی گرووشنکاوی وەبیر هاتۆتەوە و بیستوویە کۆنە ژنەکەی ماڵ و سامانێکی باشی پێکەوە ناوە، بۆیە هەڵەسوونی هێناوەتەوە ـ نهێنییەکەش ئەوەیە.»

ئالیووشا دەتگوت هیچ نابیستێ. ڕاکیتین ئیتر خەریک بوو شەق بەرێ. بە پێکەنینێکی بوغزاوییەوە گوتی: «چا بوو، تاوانبارێکت نەجات دا! ژنێکی بەستۆکەت هێنایەوە سەر ڕێگای ڕاست! حەوت دێوت لە ناخی دەرکێشا! کەوایە ئەو پەرجۆیەی چاوەڕوانی بوو، هاتە دی!»

ئالیووشا بە دڵگرانییەوە وەڵامی دایەوە: «دەمت لێک نێ ڕاکیتین.»

ـ کەوایە ئێستا لە بەر ئەو بیست و پێنج ڕۆبڵە ڕقت لێم هەستاوە؟ پێموایە هاوڕێکەی خۆمم فرۆشتووە؟ خۆ دەزانی نە تۆ مەسیحی و نە منیش یەهوودام.

ئالیووشا گوڕاندی: «ئاخ ڕاکیتین، دڵنیا بە ئەوەم هەر لە بیر نەمابوو، خۆت وەبیرت هێنامەوە...»

بەڵام ڕاکیتین دیسان هەڵچوو.

لە ناکاو دەنگی هەڵێنا: «سندان لە سەرم دا بۆ کارم، نازانم بۆ لەخۆڕا تۆم هێنا؟ داوەشێم بۆ کارم! ئیتر لەم کاتەوە نە دەمناسی و نە دەتناسم. تۆ بە ڕێی خۆت و من بە ڕێی خۆم!»

بە کۆڵانێکدا بایدایەوە و لە تاریکە شەودا لێکهەڵبڕان. ئالیووشا لە شار وەدەر کەوت و بە نێو کێڵگە و مەزرادا ڕۆیشت. گەیشتەوە کلێسە.

# (٤)

## قانای جەلیل[2]

کاتێک ئالیووشا گەیشتەوە خەڵوەتگا، بە پێی یاسای کلێسە زۆر درەنگ وەخت بوو. دەرگەوان لە درگایەکی تایبەتەوە ڕێگای دا بچێتە ژووری. زەنگی سەعات نۆ لێدرابوو ـ لە دوای ڕۆژێکی پڕ لە خەم و دڵەخورپە و ماتەم، کاتی حەسانەوە و پشوودان بوو. ئالیووشا شەرمنانە دەرگاکەی کردەوە و خۆی کرد بە حوجرەکەی حەزرەتی پیردا. هێشتا تابووتەکە هەر لەوێ داندرابوو. حوجرەکە کەسی لێنەبوو، جگە لە باوە پایسی کە بە تەنیایی ئینجیلی بە سەر تابووتەکەدا دەخوێند. پۆرفیریی تازە مریدیش کە شەڕەدەندووکە و ئاڵۆزییەکانی ئەو ڕۆژە کاسی کردبوو، لە وەتاغێکی دیکە تخێڵ بووبوو و لە حەوت ساڵان ڕاست بووبۆوە. ئەگەر چی باوە پایسی گوێی لە ترپەی پێی ئالیووشا بوو، بەڵام سەری هەڵنەهێنا. ئالیووشا ڕۆیی بۆ سووچێک و لە لای ڕاستی تابووتەکە چۆکی دادا و دەستیکرد بە دوعا و پاڕانەوە.

لە ناخەوە دەکوڵا. هەست و خەیاڵی ئاڵۆز مێشکی داگرتبوو، بەڵام هیچکام لەو هەستانە بە ڕوونی خۆیان دەرنەدەخست، هەر هەستێک دەهات خولێکی بە مێشکیدا لێدەدا و هەستێکی دیکە جێگای دەگرتەوە. بەڵام هەستی بە چێژێکی خۆش دەکرد و سەیرە تووشی سەرسوڕمانیشی نەکرد. دیسان تابووتەکەی لە هەمبەر خۆیدا دیت و ئەو تەرمە کفن کراوەش کە زۆری بە لاوە خۆشەویست بوو، بەڵام گریان و چزووی خەم وەک بەیانی ئازاری

---

2- «شارێکی بەناوبانگە مەسیح یەکەم مۆجزەی خۆی لەوێ نواند ـ یانی ئاوی کردە شەڕاب. تاقمێک قانا هەر بەو شوێنە دەزانن کە لە باکووری ناسرە هەڵکەوتووە و بە کاولە قانا بەناوبانگە.» (قامووسی کتێبی پیرۆز)

نەدەدا. لەگەڵ چوونە ژووریٚ، لە هەمبەر تابووتەکەدا بە چۆکدا هاتبوو، وەک ئەوەی لە بەردەمی مەرقەدێکی پیرۆزدا بیٚ. بەڵام شادی، بەڵیٚ شادی لە دڵ و زەینیدا دەدرەوشایەوە. تەنیا پەنجێرەی حوجرەکە کرابۆوە، هەوا خەریک بوو فێنکی دەکرد. ئالیووشا لە دڵی خۆیدا گوتی: «ڕەنگە بۆنەکە زۆرتر بووبیٚ، بۆیە ئەو پەنجێرەیان کردۆتەوە، بەڵام بیرۆکەی ئەو بۆگەنیوەش کە چەند سەعات لەمەوبەر زۆر ناخۆش بوو لە بەر چاوی، ئیتر هەستی بە داماوی یان قین و ڕق نەدەکرد لە ناخی خۆیدا. هێور هێور دەستیکرد بە پاڕانەوە، بەڵام زوو تێگەیشت بێئیختیار دەپاڕێتەوە و ئاگای لە خۆی نییە. خەیاڵ و بیرۆکە وەک ئەستێرە سریوەیان دەهات و بە سەر زەریای ڕۆحییەوە دەشنینەوە. هەرکام لەو خەیاڵانە لە ناکاو دەکوژانەوە و جێی خۆیان دەدا بە ئەستێرەیەکی دیکە. لەگەڵ ئەوانەشدا هەستێک کە ئاوێتەی تەواوەتیی شتەکانە گیانی دادەگرت ـ شتێکی خۆڕاگر و پڕ لە ئۆخژن ـ خۆشی لەوە ئاگادار بوو. هێندیٚ جار بە دڵ و گیان دوعای دەکرد، دەیویست هەموو خۆشەویستی و شوکرانەی خۆی هەڵڕێژیٚ... بەڵام کاتێک دەستیکردبوو بە پاڕانەوە، لە ناکاو بۆ لای شتێکی دیکە دەکێشرا و لە بیر و خەیاڵدا ئەوق دەبوو. پاڕانەوەکە و ئەوەی لە نێو پاڕانەوەکەدا هاتبوو لە بیری دەچۆوە. گوێی لە باوە پایسی گرت، بەڵام شەکەتی وردە وردە خەریک بوو لەگەڵ خەو ئاوێتە دەبوو و لە پەستا وێژینگی دەدا.

سیٚ ڕۆژ دوای ئەوە لە قانای جەلیل زەماوەند بوو، باوە پایسی دەیخوێندەوە. «دایکی عیساش لەویٚ بوو. عیسا و شاگردەکانیشی بۆ ئەو زەماوەندە بانگهێشتن کران[3].

«زەماوەند؟... چی؟.. زەماوەند!» لە پانتای زەینی ئالیووشادا خولی دەخوارد و دەشنییەوە.

بەختەوەری ڕووی لە گرووشنکاش کردبوو... ئەویش چووبوو بۆ ئەو زەماوەندە.. نا، چەقۆکەی لە گەڵ خۆی نەبردووە... ئەو قسەیەش تەنیا

---

3- ئینجیلی یووحەننا، بەشی دووهەم.

قسەیەکی «بەژان» بوو، چاکە دەکرێ پیاو لە قسەی ناخۆش و دژمان خۆش بێ. دەبێ خۆش بێ. قسەی تاڵ و ناخۆش خەم دەڕەوێنێ... بە بێ ئەوانە، تامڵ کردنی خەم و ئازار بۆ مرۆڤ زۆر دژوارە. ڕاکیتین لە کۆڵانەکە ئاوا بوو. هەر کاتێک ڕاکیتین بیر لە هەڵەکانی دەکاتەوە، سەر دەکا بە کۆڵانێکی تەنگەبەردا... بەڵام شاڕێ... ڕێگای ڕاست و بەرینە و وەک بلوور ڕووناکە و خۆریش لە نیوەی ڕێگادایە.. ئاخ!... ئەوە چییە دەیخوێنێتەوە؟»

کاتێک شەڕاب تەواو بوو، دایکی عیسا گوتی شەڕابمان نەماوە»... ئالیووشا گوێی لێبوو.

- ئاخ، وایە، خەریک بوو لە دەستم دەردەچوو و نەشمدەویست لە دەستم دەرچێ، ئەو کۆپلەیەم بە گیان و دڵ خۆش دەوێ. قانای جەلیل یەکەم مۆجزە!... ئاخ ئەو مۆجزەیە! ئاخ ئەو مۆجزە نازەنینە! مەسیح بۆ پرسەی خەڵکی نەدەچوو. لە شادییاندا بەشداریی دەکرد. یەکەمین مۆجزەی ئەنجامدا، تاکو بگاتە فریای شادی و خۆشیی خەڵک... «هەر کەسێک خەڵکی خۆش بوێ، شادییەکانیشیانی خۆش دەوێ»... ئەوە قسەی هەموو دەمی ئەو خوالێخۆشبووە بوو. یەکێ لە ئەندێشە سەرەکییەکانی بوو... «بە بێ شادی ژیان بوونی نییە.» میتیا دەڵێ... بەڵێ، میتیا... «هەر شتێک باش و ڕاستەقینە بێ، هەمیشە لێوڕێژە لە بەخشین و لێبوردن.» زووسیما ئەوەشی دەگوت...

عیسا پێیگوت، ژنەکە من چکارم بە تۆیە؟ منیش هێشتا ئەجەلم نەهاتووە.»

«دایکی بە نۆکەرەکەی دەگوت: «هەر چیتان پێدەڵێ، بیکەن»...

- ئەو چۆن دەڵێ وا بکەن، ئەو مەبەستی شادی و خۆشیی خەڵکی هەژار و لێقەوماو بوو. چونکە ئەوەندە هەژار و دەستەنگن تەنانەت بۆ زەماوەندەکانیشان شەڕابیان دەست ناکەوێ.

مێژوونووسان دەڵێن لە دەروبەری دەریاچەی «جێنسارت» هەژار و لێقەوماوترین خەڵک دەژیان، ئەوەندە هەژار کە ناتوانی بیری لێبکەیتەوە. بەڵام دڵی مرۆڤێکی پاکیش، دڵی دایکێکی مەزن کە دەیزانی کوڕەکەی تەنیا بۆ بەڕێوە بردنی ئەو ئەرکە پیرۆزە نەهاتووە کە پێی سپێردراوە، بەڵکو دڵە پاک

و ئاسمانییەکەی دەیتوانی ئەو چێژە پاک و بێگەردە هەستپێبکا، کە ئەو خەڵکە ساویلکە و هەژار و ڕەشوڕووتە بۆ زەماوەندەکەیان بانگێشتنیان کردووە. بە بزەیەکی نەرمونیانەوە (حەتمەن ئەو زەردەخەنە نەرمەی بۆ دایکی گرتووە) گوتی: «من هێشتا ئەجەلم نەهاتووە.» یانی بە ڕاستی بۆ زۆر کردنی شەڕاب هاتە سەر زەوی؟ هەر بۆیە ڕۆیشت و لە قسەی دایکی دەرنەچوو... ئاخ، دیسان درێژەی بە خوێندنەوە دا...

«عیسا پێیگوتن، دەفرەکان پڕکەن لە ئاو، لێواولێو پڕیان کردن.»

هەروەها پێیگوتن، ئێستا هەڵیانگرن و بیانبەن بۆ میری کۆڕەکە. ئەوانیش بردیان.

«کاتێ میری کۆڕەکە لەو ئاوەی چێشت، کە بووبووە شەڕاب، نەیزانی ئەو شەڕابە لە کوێوە هاتووە. [بەڵام ئەو نۆکەرانەی دەفرەکانیان پڕ کردبوو، دەیانزانی] ڕووی لە زاوا کرد و پێیگوت، هەموو کەس شەڕابی باش زووتر دێنێ. کاتێ سەرخۆش بوون، خراپەکە دێنێ، بەڵام تۆ تا ئێستا شەڕابە باشەکەت لە کوێ دانابوو.»

بەڵام ئەمە چییە، ئەمە چییە؟ ئەم وەتاغە بۆ ئاوا گەورە بۆتەوە؟... ئاخ، بەڵێ... زەماوەندە، شاییە... بەڵێ، بەڵێ شاییە. ئەوەش میوانەکان، ئەوەش بووک و زاوای لاو پێکەوە دانیشتوون، کۆڕەکە هەموو شاد و دڵخۆشن، ئەی میری کۆڕ کوا؟ ئەی ئەمە کێیە، ئەمە کێیە؟ دیوارەکان هەروا لە بەر یەک دەڕەوێنەوە... کێ لە سەر ئەو سفرەیە هەڵدەستێ؟ چی! ئەویش لێرەیە؟ بەڵام ئەو لە نێو تابووتەکەدایە... بەڵام ئەویش لێرەیە. هەستاوە، چاوی لە منە: خەریکە دێ بۆ لام.. خودایە گیان!

بەڵێ، هات بۆ لای. بۆ لای ئەو، ئەو پیرە پیاوە وردیلە و لاوازە، بە دەموچاوە چرچولۆچەکەیەوە، نەرم و شاد پێدەکەنی. ئیتر تابووتەکە لەوێ نەمابوو. هەر ئەو جلانەشی لە بەردا بوو کە دوێنێ لەگەڵیان دانیشتبوو، ئەو کاتەی کە زیارەتکەران دەوەریان دابوو. کفنی پێوە نەبوو، چاوی بریقەی

دەهات. کەوایە ئەوە چی بوو؟ ئەویشیان بۆ ئەو زەماوەندە بانگهێشت کردووە؟ ئەویش لە زەماوەندی کەنعاندا بەشداریی کردووە.

گوێی لە دەنگێکی ئارام بوو لە ژوور سەری دەیگوت: «بەڵێ کوڕم، منیشیان بانگهێشت کردووە. بانگیان کردووم و هێناویانم. بۆچی لێرە خۆت شاردۆتەوە؟ وەرە تۆش لەگەڵمان کەوە.»

دەنگی خۆی بوو، دەنگی باوە زووسیما. ڕاست خۆی بوو، چونکە هەر ئەو بوو بانگی کرد! پیری کلێسە دەستی ئالیووشای گرت و هەڵیستاندە سەر پێ، ئەویش بە پێوە ڕاوەستا.

پیرەپیاوی لەڕولاواز لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: «شادی دەکەین. شەڕابی تازە دەخۆینەوە، شەڕابی تازە و جێژنی گەورە، ئەو هەموو میوانەت دیوە؟ ئەوەش بووک و زاوا. ئەوەش میری زانا کە لە شەڕابە تازەکە دەچێژێ. بۆ ئاوا چاوت تێبڕیوم؟ پیوازێکم داوەتە دەست سواڵکەرێک، بۆیە منیش لێرەم. زۆر کەسیش لێرەن کە لە پیوازێکیان زیاتر نەکردۆتە خێر - تەنیا پیوازێک... بۆ تەواوی کردەوەکانمان چییە؟ تۆش کوڕەکەم، کوڕە دڵسۆزەکەم، تۆش فێر بووی کە ئەمڕۆ پیوازێک بدەیتە دەست ژنێکی برسی. کوڕە خۆشەویستەکەم، دەست بە کار بە، خۆشەویستەکەم، دەست بە کار بە و ڕامەوەستە!... «خۆرەکەمانت» دیتووە، دیووتە «ئەو» خۆرە ڕووناکە؟»

ئالیووشا منجاندی: «دەترسم... ناوێرم چاوی لێبکەم.»

- لێی مەترسە. «ئەو» لە گەورەییدا پڕشکۆیە و لەبەر مەزنی بەسامە. بەڵام لە ڕادەبەدەر دلۆڤان و خاوەن بەزەییە. لە ڕێگای خۆشەویستییەوە خۆی کردۆتە شێوەی ئێمە و لەگەڵ ئێمە شادی دەکا. ئاو دەکاتە شەڕاب لەبەر ئەوەی میوانەکان بەزم و جێژنەکەیان لێ تاڵ نەبێ و چاوەڕوانی میوانی تازەیە. بەردەوام میوانی تازە بانگهێشت دەکا و هەتا دنیا بە دنیایە ئەوە کاریەتی. دیوتە شەڕابی تازە دێنن. ئەوە پەرداخەکان ڕیز دەکەن و دەیانهێنن.

شتێک له دڵی ئالیووشادا درەوشایەوە، لە پڕێکدا دڵی کەیلی ژان بوو و فرمێسکی شادی لە چاویدا قەتیس ما... دەستی کێشا، هاوارێکی کرد و لە خەو ڕاچڵەکی.

دیسان تابووت و پەنجەرەی ئاوەڵا و خوێندنی ئارام و لەسەرەخۆی ئینجیل. بەڵام ئالیووشا گوێی لە خوێندنی ئینجیل نەبوو. سەیرە لە سەر چۆک خەوی لێکەوتبوو، بەڵام ئێستا بە پێوە بوو. لە ناکاو بە سێ هەنگاو خێرا و بەهێز ڕۆیشت بۆ لای تابووتەکە. دەتگوت بۆ پێشەوە پاڵی پێوە دەنێن. شانی لە شانی باوە پایسی درا، بە بێ ئەوەی بزانێ. باوە پایسی تاوێ چاوی لە سەر کتێبەکە هەڵگرت، بەڵام چونکە دیتی ئالیووشا تووشی شڵەژانێکی سەیر بووە، لە ناکاو سەری بۆ لایەکی دیکە وەرسووڕاند. ئالیووشا چاوی لە تابووتەکە بڕی. مردوویەکی کفن کراو بە ئارامی لە نێو تابووتەکەدا ڕاکشابوو، میداڵێکی بە سەر سینگەوە بوو و کڵاوێکی تیژی بە خاچی هەشت گۆشەوە لە سەر نرابوو. هەر ئێستا گوێی لە دەنگی بووبوو: ئەو دەنگەش هەر وا لە گوێیدا دەزرینگایەوە. گوێی ڕاگرتبوو و هەروا چاوەڕێ بوو قسە بکا، بەڵام لە ناکاو وەرسووڕا و لە حوجرەکە چووە دەرێ.

تەنانەت لە سەر پلیکانەکانیش ڕانەوەستا و بە هەڵەداوان چووە خوارێ. گیانی لە ناخەوە قوڵپی دەدا بۆ ئازادی و ڕزگار بوون ئۆقرەی لێ‌بڕابوو. میچی ئاسمان، پڕ بوو لە ئەستێرەی گەش و بەسریوە، بەرین و بێ‌سنوور لە ژوورسەری ڕاخرابوو. کاکەشان بە دوو ڕووباری شیری بە نێوان ئاسماندا هەتا ئاسۆ دەڕۆیشت. شەوێکی ئارام و فێنک و بێ‌خشپە زەویی لە خۆیەوە پێچابوو. گومبەزی و بارووی زێڕینی کلێسەی گەورە لە هەمبەر ئاسمانی پیرۆزدا دەدرەوشایەوە. گوڵاڵەی گەش و پاراوی پاییزی لە نێو باغچە و دێراوی حەوشەی کلێسەدا ملیان بە لارەوە نابوو. کڕوکپیی زەوی دەتگوت لە گەڵ بێدەنگیی ئاسمان ئاوێتە بووە. ڕازی زەوی لە گەڵ ڕازی ئەستێران لێک گرێدرابوو... ئالیووشا چاوی بە مۆلەق وێستاوی لە بەر پێی خۆی بڕی. لە ناکاو خۆی دا بە عەرزیدا.

نەیدەزانی بۆ دەیهەوێ زەوی لە ئامێز بگرێ. نەیدەزانی بۆ ئاوا تامەزرۆیە زەوی ڕامووسێ و سەرلەبەری خاکەکەی ماچبکا. بەڵام لە گەڵ پڕمەپڕمی گریان لێوی بە عەرزەکەوە نا و بە فرمێسکی چاوی ئاویدا، لە ناخی دڵ و گیانەوە بڕیاریدا و سوێندی خوارد خۆشی بوێ و هەتا دنیا بە دنیایە ئەو خۆشەویستییەی بە دڵییەوە گرێدا. «زەوی بە فرمێسکی شادی پاراو کەن و ئەو فرمێسکانەشتان خۆشبوێ.» لە ناخیدا بوو بە زایەڵە. بە سەر چیدا دەگریا؟ ئاخ، وا جەزم بووبوو تەنانەت بە سەر ئەستێرەکانی ئاسمانیشدا دەگریا کە بە ئاسمانەوە دەدرەوشانەوە. «ئەو جەزم بوونە تووشی شەرمەزاریی نەکرد.» دەتگوت لە تەواوی ئەو دنیا بێژمارە خوداوە تاڵەتیشک هەڵواسراوە و گیانی خۆی بە هەموویانەوە گرێدەدا و گیانی «لە پێوەندی لەگەڵ دنیاکانی دیکە» وەلەرزین کەوتبوو. دەیویست لە هەموو کەس خۆش بێ و لە هەموو شتێک داوای لێبووردن بکا. ئاخ، نەک هەر بۆ خۆی، بۆ تەواوی مرۆڤایەتی، لە بەر هەموو کەس و هەموو شتێک. «خەڵکانیش دوعا بۆ من دەکەن.» دیسان لە گیانیدا بوو بە زایەڵە. سات لە دوای سات بە ڕوونی و بە شێوەیەکی هەستپێکراو شتێکی خۆڕاگر و بەرین وەک کەپری ئاسمان بە ڕۆحییەوە پێوەند دەدرا. دەتگوت بیرۆکەیەک هەوساری زەینی بە دەستەوە گرتووە و هەتا ئاخری عومری و هەتا دنیا بە دنیایە بەردەوامە. لاوێکی بێهێز بوو کاتێ کەوت بە عەرزیدا، پیاوێکی ئازا و بەجەرگ هەستایە سەر پێ. ئەوەشی هەر لە پڕ و لە کاتی جەزم بوون و حاڵ لێهاتنەکەیدا هەستیپێکرد. هەتا ئاخری تەمەنیشی ئەو کاتەی لە بیر نەچۆوە. لە دوای ئەوە، بە ئیمانێکی شاراوە و بەهێز لە وتەکانیدا، دەیگوت: «لەو کاتەدا کەسێک ڕۆحی دەلاواندمەوە.»

لە دوای سێ ڕۆژ بە پێی وەسیەتی پیری کلێسە کە پێیگوتبوو «دەست لە ژیانی تەرکە دنیایی هەڵگرە» کلێسەی بەجێهێشت.